موستەفا ئیبراهیم زەڵمی

# کاروانی ژیانم

چاپی دووەم





# کاروانی ژیانم

**نووسینی**
دکتۆر مصطفى ابراهيم زەڵمی
**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
**نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ**
نەوشەهاوانی
**خەت**
نەوزاد کۆیی
**قەبارەی کتێب**
٢٤×١٧- ( ٨٧٤ ) لاپەڕە
**نۆرە و ساڵی چاپ**
دووەم ١٤٣٧ ك - ٢٠١٦ ز
**تیراژ**
٢٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپاردنی ( ٢٦٢٠ ) ی ساڵی ٢٠١٣ ی پێدراوە



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس

/TafseerOffice

+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

# پێشکەش

**بەشێك لەوەی کەبینیم و بیستم و ئەنجامدا لەماوەی کاروانی ژیانمدا پێشکەشی دەکەم بە:**

- بەو گەنجە کوردانەی کەمەبەستیانە لەهەڵەی ئێمەمانان پەند وەربگرن و بۆ هاتنەدی ئامانجەکانیان کۆڵنەدەن.

- بۆ گیانی پاکی ئەو دایك و باوکەی کەهەر لەمنداڵیەوە بردیانە مێشکمەوە کەمرۆڤ ئەگەر رێگا رێکخەر نەبوو نابێت ببێتە کۆسپ و ئەگەر گوڵ نەبوو نابێ درك بێت، راستیەکەی ئەوەیە ئەبێت گوڵ بێت و رێگا رێکخەر بێت لەژیاندا.

- بەو ئامۆزایەم کەبووە بەهاوبەشی ژیانم و لەو هەموو ساڵەی پێکەوە ژیاوین لەهەموو تەنگ و چەڵەمەیەکدا پشتیوانم بووە.

- بەو مامۆستایانەم کەلەحوجرەی فەقێیەتیەوە تاوەکو دانیشگا فێری رەوشت و زانیارییان کردم.

- بەهەموو مرۆڤێکی چاك لەم جیهانەدا کەهەردەم هەوڵ ئەدا بۆ ئەوەی ببێتە مۆمێك و کاروانی ژیانی نەتەوەکەی رووناك بکات.

# پێشەکی چاپی دووەم

بەناوی خوای گەورەوە دەست پێدەکەم، ئەو خودایەی هەر خۆی دەزانێت چ شتێك خەیری بۆ مرۆڤ تێدایە، درودو سڵاو بۆ سەر گیانی پێشەوای مرۆڤایەتی محمد کەرێنمایی کردووین درێغی نەکەین لەسوود گەیاندن بەمرۆڤایەتی.

چاپی یەکەمی کتێبی کاروانی ژیانم پێشوازییەکی باشی لێکرا لەلایەن خوێنەرانەوە، سوپاس بۆ خوا جێگای سوود و رەزامەندی زۆرێك لەمامۆستایان و رۆشنبیران بوو، لەماوەیەکی کەمدا لەکتێبخانەکاندا نەما، لەهەمان کاتدا لەلایەن زۆر دۆست و ئاشناوە تێبینی و باری سەرنج رەوانە کرا بۆم تا لەچاپی دووەمدا لێی سوودمەند ببم، زۆر سوپاسی هەموو ئەو دڵسۆزانە دەکەم، ئەمە وایکرد پێداچوونەوەیەکی تەواو بەژیان نامەکەمدا بکەم لەرووی مەبەستەوە گۆڕانکاری تێدا نەکراوە، بەڵام هەندێك شت زیاد کراوە بەمجۆرە:

١- لەناو کاغەز و دەستنووسە کۆنەکانمدا هەندێك نووسین و یادەوەری دۆزرانەوە کەسوودی تێدابێت بەپێویست زانرا بخرێتە سەر ئەم چاپە.

٢- لەو بەرنامانەی لەبارەی بەسەرهاتی ژینمانەوە بۆ تەلەفزیۆنەکان تۆمار کرابوو هەندێك یادەوەری لەو کاتانەدا هاتبوو بەخەیاڵمدا کەلەکاروانی ژیانمدا نەبوو ئەوانەش زیادکران بۆ ئەم چاپە.

٣- لەکاتی هاتنی میوان و ئەو پرسیارنەی لێم دەکرا بەتایبەتی لەبارەی پەیوەندیم لەگەڵ کەسایەتی سیاسی و رۆشنبیری و شاعیرانی ناسراوی کورد، ئەوەی کەهەبوو بۆم باس دەکردن، ئەو دڵسۆزانە پێیان باش بوو یەکی بەچەند

دیرێکیش بێت لەچاپی دووەمی کاروانی ژیانمدا تۆماری بکەم.

٤- یەکێکی تر لەوانەی بۆ ئەم چاپە زیاد کرا وێنە و ژیاننامەی ئەو مامۆستایانەیە، کە لەرۆژهەڵاتی کوردستان لەخزمەتیاندا خوێندم و توانیمان بەسەردانیان ئەو وێنە و زانیاریانەمان دەست بکەوێت، من لەبەر ئەوەی خۆم نەمتوانی بۆ ئەو مەبەستە مامۆستا رێدار ئەحمەد سەردانی هەموو ئەو مەدرەسانەی کرد کەتێیدا خوێندبووم و سەردانی بنەماڵەکانیانی کردبوو، ئەمەش ژیاننامەکەی دەوڵەمەندتر کرد و بەسوپاسەوە هەریەك لەمامۆستا ئەحمەدی نەزیری و مامۆستا ئومێدی بەهرامی نیا هاوکاری باشیان کردبوو.

٥- هەندێك رووداوی تازە لەبەرگی دووەمدا تۆمار کراوە، ئەمانە پاش چاپی یەکەم روویانداوە و بەپێویست زانراوە تۆماریان بکەم.

٦- لەزۆر جێگادا لەکاتی پێداچوونەوەدا دەستکاری ئەو زانیاریانەم نەکردووە کەپێش چەندین ساڵ نووسیومە، بۆ نمونە هەندێك مامۆستا ئەو کاتە لەژیاندا بوون و دواتر وەفاتیان کردووە، من لەسەر هەمان نووسینی پێشتر رۆشتووم، هەروەك لەهەندێ جێگادا مێژووی نووسینەکانیشم تۆمار کردووە.

لەکۆتاییدا هیوادارام توانیبێتم بەم کتێبە خزمەتێك بە رۆڵەکانی وڵاتەکەم بکەم و لەخوای گەورە داواکارم هەمووڵایەك سەرکەوتوو بکات.

**مستەفا زەڵمی**

**٢٠١٦/١/٦**

## بەناوی خوای
## بەخشندەی میهرەبان

لە بەهاری ساڵی ١٩٢٤ز لە دێی زەڵم هاتومەتە ئەم دونیایەوە، تا ئێستا کە تەمەنم ٧٧ ساڵە و[1] یاداشتەکانم دەنووسمەوە، نە لەم دونیایە گەیشتم و نە لەو کەسانەی لە گەڵیاندا ژیام، بیروباوەڕم بەخوای گەورە و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئاینی ئیسلام زۆر پتەو و بەهێزە، چونکە ئەم بیروباوەڕەم لە ڕێگەی دواکەوتنی دایك و باوکەوە نەبوو - ئیمانی تەقلیدی- بەڵکو لەماوەی ژیانمدا لە نێوان بەراوردکردنی ئایینی ئیسلام و هەموو یاسای دەوڵەتان و بیروباوەڕی جیاوازو ئاینەکانی تر زیاتر لە چل ساڵ و، تێکەڵاویم لەگەڵ خەڵکی جیاوازی جۆر بەجۆر، ئەم بیروباوەڕەم بۆ دروست بوو، شتێکم نەدی ئیسلام بڵێت مەیکە ژیری بڵێت بیکە، هەروەها بە پێچەوانەی ئەوەوە شتێکم نەدی ئیسلام بڵێت بیکە ژیری بڵێت مەیکە، گەورەترین شت بۆ ژیانی ئادەمیزاد لە ئیسلامدا ئەوەیە پەیوەندیت دەبەستیت بەهێزێکی نادیارەوە کە پێی دەوترێت - خوا- تەنها ئەو نادیارە دەتوانێت ڕۆحی نادیارمان خۆشحاڵ بکات و، هەر تەنها ئەوە دەتوانێت ڕۆحی نادیارمان لە ژەنگ و پیسیی جیهانی مادده ڕزگار بکات. تەنها ئەشقی خوای نادیارە خۆشییەکانی بێ سنوورە وەك زەریاکان.

مەبەستم لە ئیسلام نوێژ و ڕۆژو و حەج و زەکات و ڕیش هێشتنەوە نیە کە لە قورئاندا لە (١٠٠) ئایەت کەمتر باسی دەکات، زۆر کەس بیر لەوە ناکەنەوە کە بەشەکانی تری قورئانی پیرۆز باسی چی دەکات؟

---

(١) ساڵی ٢٠٠١ دەست بە نووسینی یاداشتەکان کراوە.

مەبەستم لە ئیسلام لێرەدا شتە ماددیەکان نیە، بەڵکو ئاشق بوونی ڕۆحی نادیارمانە بە خوای مەزنی نادیار.

لێرەدا دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین کە زەریای ئیسلام بە هەزاران کەشتی خۆشی و کەشتی ڕزگارکردن بۆ مرۆڤایەتی تێیدا دەسوڕێتەوە، بۆیە باسکردنی ئەم زەریا گەورەیە نەك بە من، بە هەزارانی وەك من ناکرێت.

**تەنها پێناسەکردنی دڵۆپەیەك لە زەریای ئیسلام دوو ڕاستی نیشان دەدات:**

**یەکەم:** بە هەزاران قەڵەم ناتوانن تەواوی جوانی و نهێنی ئەم زەریایە نیشان بدەن، بۆیە من تەنها بە پێناسەکردنی دڵۆپەیەك فیرار دەکەم لەم زەریا گەورەیە.

**دووەم:** کورد گوتەنی (مشتێك نموونەی خەروارێکە)، بۆیە توانای ناساندنی من تەنها ناساندنی دڵۆپەیەکە لەو زەریا گەورەیە.

(٨٠٪)ی ئادەمیزاد زیاتر لە (٦٠) ساڵ ناژین، ئەم شەست ساڵەی نیوەی بەشەو و بەخەو تەواو دەبێت، تا چوار یەکێکی تەواو دەبێت کە پانزە ساڵە مرۆڤ چاکی و خراپی نافامێ و دەستی ڕاست و چەپی لەیەك جیا ناکاتەوە، واتە ئەم ماوەیە بەژیانی ڕاستەقینە ناژمێردرێ و شەش یەکێکی لە (١٠) ساڵدا بە نەخۆشی و ئازار و ناخۆشی بەسەر دەبات کە هیچ سوود لەم ماوەیە وەرناگرێت، واتە لەو شەست ساڵەدا تەنیا (پێنج) ساڵی وەك ئادەمیزاد دەژی.

ئەمە ژیان بێت ئایا شایستەی ئەوەیە مرۆڤ جگە لەچاکە و کاری بەسوود بۆ مرۆڤایەتی هیچ کار و کردەوەیەکی دیکە ئەنجام بدات.

بەم پێشەکیە کورتە وازدەهێنم و فەرموون ئێوە و قۆناغەکانی کاروانی ژیانم.

# زەڵــــم

## زەڵم لەچیەوە هاتووە؟

تا ئێستا ساغ نەبۆتەوە بۆم کە بنچینەی ئەم ناوە لە چیەوە هاتووە؟

بەڵام لە فەرهەنگەکاندا گەڕام دەڵێن ناوی گیایەکە نە گوڵ دەکات و نە بەری هەیە.

ئەمەش دەگونجێ ئەم جۆرە گیایە بەشاخەکانی زەڵمەوە هەبێت، بەڵام نازانم چیە. هەندێك دەڵێن زەڵم ناوی ئاوەکە بووە، پێی وتراوە زێی (لولو)، ئەم مانایە



(خوا تەمەنی زیاد بکات)،
لە ماموستا مەلا عبدالکریمی مدرسم وەرگرت
فەرموی: ماموستا مەلا بەها کە پیاوێکی بە تەمەن و پیاو چاك بوو لە بیارەدا
وتی: من لە سەرچاوەیەکدا دیومە کە دەڵێن زەڵم لە (زێی لولو)ەوە هاتووە، ناوی
ئاوەکەیە و کاتێك (لۆلۆ)[1]ەکان حوکمڕانی ئەو ناوچەیان کردووە ناوەکە دراوەتە
پاڵ ئەوان و لە پاشاندا بەدرێژایی ڕۆژگار وشەکە گۆڕاوە تا بووەتە وشەی (زەڵم)،
ئەمە زۆر نزیکە لە ڕاستیەوە، چونکە هەندێك ڕووبار هەن لە عێراقدا پێیان دەوترێ
(زێ) وەك زێی بچوك و زێی گەورە کە دەچنە سەر ڕووباری دیجلە.

وشەی (زێ) واتە چەم و ڕووبار.

لە سەرچاوەیەکی دیکەم وەرگرت کە زەڵم ناوی کوڕی یەکێك لەو ئەمیرانە بووە کە لە مێژوویەکی کۆنەوە حوکمڕانی شارەزووریان کردووە، خوالێخۆشبوو مەلا جەلالی سەعاتچی نیشتەجێی ئەو گەڕەکە بوو لە سلێمانی کە من مەلای بووم لە (١٩٤٩ - ١٩٥٥)، زۆر تێکەڵی هەبوو لەگەڵم و خۆی بەخاوەنی مزگەوتەکە دەزانی، چونکە لە نەوەی مەلای پێشوی ئەو مزگەوتە بوو، کە ناوی مزگەوتی مەلای ئەحمەدی هەرمەنی بوو، کتێبێکی مێژوویی هەبوو (ناوەکەی و دانەرەکەیم لەبیر نەماوە) باسی ئەوانەی ئەکرد کە لەپێش ئیسلامدا حوکمڕانیی شارەزووریان کردووە، لەو سەرچاوەیەدا دەیوت زەڵم ناوی کوڕی یەکێك لەحوکمڕانەکانی شارەزوور بووە، کە دوو کوڕی هەبووە، یەکێکیان ناوی میر (خورماڵ) بووە و، ئەوی تریان ناوی میر (زەڵم) بووە، لەبەرئەوە ئەو شوێنەی کە ئێستا پێی ئەڵێن (خورماڵ) بەناوی ئەو کوڕەوە ناونراوە و چەمی زەڵمیش بەناوی کوڕەکەی ترەوە ناونراوە.

---

(١) لولوەکان: خوالێخۆشبوو ماموستا (محمد أمین زەکی) لە بەرگی دووەمی کتێبەکەی (تأریخ الدول والامارات الکردیة) (١٩٤٥م/مصر/ص٢) دەڵێت: حکومەتی لولوەکان شتێکی وا تا ئێستا نەدۆزراوەتەوە یان نیە کە باسی مێژووی تەواویان بکات، بەڵام ئەوەی دیارە ئەمان لەسەردەمی (سرجون) و (نرام سین) کە هەردووکیان (ئەکەد)ی بوون باسیان هاتووە، سنوری لولوەکان لای (ئاررافا=کرکوك) و (کاسیەکان) واتە ئەو جێگەیە ئێستای ناوچەی سلێمانی و دەوروبەری دەکات.

هەندێ لە دانیشتوانی دێکە دەڵێن (زەڵم) لە (سەرزێڵێ)ەوە هاتووە کە یەکەم دێیەك بووە باو و باپیرمان تیایدا جێگیر بوون بۆ یەکەم جار لە نزیکی قەڵاکەی (خان أحمد خان) کە ئێستا پێی ئەوترێت (بەرقەڵا)، کاتێك هاتونەتە چەمی زەڵم بۆ یەکەمجار لەوشوێنە خانوویان کردووە و ناوی ئەو دێیە - سەرزێڵێ - بووە دواتر گۆڕاوە بۆ زەڵم.

بەڵام لە هەموویان شیاوتر سەرچاوەی دووەمە کە زەڵم ناوی ئاوەکە بووە پێی وتراوە زێی (لۆلۆ)، هەروەك ئێستا بە دوو ڕووبارە گەورەکەی کە ئەچنە سەر دیجلە ئەوترێت زێی بچوك و زێی گەورە.

"زەڵم"[١] بەکاردەهێنرێت بۆ دێکە پێی دەوترێت دێی زەڵم و، بۆ تاڤگەکە پێی دەوترێت تاڤگەی زەڵم، هەروەها چەمەکەش هەتا تێکەڵاوی رووباری تانجەرۆ دەبێت لەدوواوان پێی دەوترێت چەمی زەڵم.

(زەڵم) بە هەڵە لە فەرمانگەی میریدا بە - ظلم- دەنوسرێت و ئەمەش راست نیە چونکە پیتی (ظ) لە کوردیدا نیە، جگە لەوەش هەندێ برادەر کە پەیوەندیان بە (ئەحمەد ئاوا)وە هەبوو کە کەوتۆتە خوارەوەی زەڵمەوە ناوی هاوینە هەوارەکەیان گۆڕی لە جیاتی (هاوینە هەواری زەڵم) کرا بە (هاوینە هەواری ئەحمەد ئاوا)، لە راستیدا هاوینەهەوارەکە هی سەرچاوەی زەڵمە، بەڵام دراوە بە ئەحمەد ئاوا، کە ئاو و باخێکی ئەوتۆی تێدا نیەو موڵکیشیان لەزەڵمدا نیە.

شاخی زەردا زیاتر لە (٢٠٠) هێلانەی (داڵ)ی تیا بوو، پاشساڵی (١٩٨٨ز) کاتێك بەر شاڵاوی کیمیاویباران کەوت داڵەکان فەوتان و نەمان و نەهاتنەوە.

---

(١) لە کتێبی (مذکرات مأمون بگ بن بیگە بگ) دەڵێت: (قلعە ظلم) کە تورکەکان وایان پێ دەوت، کە سەنتەری حوکمڕانی شارەزوور بووە، مێژوونووسانی عەرەب ناویان بردووە بە (زەڵم- زلم) (یاقوت الحموی، معجم البلدان بیروت ١٤٦،١٠،١٩٥٧)، beuetemc.xxxi.132. (مذکرات مأمون بگ بن بیگە بگ،ص٨، ترجمە محمد جمیل ڕۆژبەیانی و شکور مصطفی، بغداد/١٩٨٠).



دێی زەڵم و شاخی زەرد

ئەم دالانە ئاوی زەڵمیان نەدەخواردەوە، چونکە ئاوی زەڵم قورس بوو، دەچوون ئاوی (دالانی)یان دەخواردەوە، شاخی دالانیش بەهۆی زۆری داڵەوە ناوی دالانی بەسەردا براوە.

ناوبردنی هاوینەهەواری زەڵم بە هاوینەهەواری ئەحمە ئاوا وەك ئەوەیە کە مەولەوی دەفەرموێ:

من و (شەوال) هەردوو هام دەردین
کەلارە نشین هەناسە سەردین
غورە غورەی ئەو، صەفاش پەی غەیرێ
ئازیز قیبلەی من، وەفاش پەی غەیرێ.

واتە: ڕۆژی یەکەمی شەوال هی مانگی شەواله کەچی دراوە بە ڕەمەزان، پێی دەوترێت جەژنی ڕەمەزان، هەروەها ئازیزەکەم یار و دۆستی منە کەچی وەفاداری بۆ یەکێکی ترە کە گۆڕەکەیەتی.

زەڵم کەوتوەتە خوارووی ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانی و زیاتر لە (٧٠کم) لێیەوە دوورە، بریتیە لە دۆڵێك درێژاییەکەی نزیکەی (٢٠کم) دەبێت، ئاو بە ناوەڕاستی دۆڵەکەدا دێتە خوارەوە، تاڤگە لەسەر تاڤگە تا دەگاتە دەشتی شارەزوور و بەردەمی دێی ئەحمەدئاوا، ئەمبەر و ئەوبەری دۆڵەکە شاخ و تەپۆڵکەیە و ئەم بەرو ئەوبەری ئاوەکە کاتی خۆی باخ و باخات بوو جۆرەها میوەی تیادا بوو.

بەڵام لە ساڵی **١٩٧٩** میری هەستا بە گواستنەوەی دانیشتوانی دێیەکە و کۆچی پێ کردن، باخەکان هەمووی وشك بوون، ماوەی پێنج شەش ساڵ لەمەو پێش ئاوەدان کرایەوە، لە(١٣٠) ماڵ نزیکەی (٣٠) ماڵێك گەڕانەوە ئاواییەکە. سەرلەنوێ دەستیان کردەوە بە ئاوەدانکردنەوەی باخەکان.

دێی زەڵم لە سنوری ئێران نزیکە و هەوارێك هەیە کە پێی دەوترێت (داڵانی)، جاران مانگی سێیەمی بەهار و مانگی یەکەمی هاوین ئەوەی مەڕ و ماڵاتی هەبوایە دەچوون بۆ ئەو کوێستانە، لوتکەی ئەو داڵانیە (٢٠٠٠) پێ لە ئاستی دەریاوە بەرزەو، کانیاوێکی زۆر ساردی تێدایە وەك بەفراوە، گیای ناو شاخەکان هەموو بۆندارن و بۆنێکی زۆر خۆشیان هەیە کە لە سروشتەوە لە نێوان شاخەکاندا ڕواون، وەك (بەرزە لنگ) و (سورە هەڵاڵە) و (مێژە مێژە) و (چنور) و (شلێر)، بۆنیان ئەوەندە خۆشە عەتری فەرەنسی و ئینگلیزی نایانگاتێ، شاخی - داڵانی- چەند دۆڵێکی گەورەی تێدا دێتە خوارێ بۆ دەشتاییەکە کە پێی دەوترێت (کەڕەجاڵ)، ئەویش هەوارگەیەکە پێش ئەوەی خەڵکەکە بچنە داڵانی بۆ ماوەی دوو هەفتەیەك لە وێ دەمانەوە تا سەرماکەی داڵانی تۆزێك کەم دەبووەوە، پەناگاش بووە بۆ خۆ حەشاردان لەدوژمن.

لە باکوری دێیەکەدا شاخێکی زۆر بەرز هەیە پێی دەوترێت شاخی - زەردا-، بەرامبەر بەو شاخە بەو بەری دێیەکەوە لە باشوریەوە شاخ و تەپێکی زۆر بەرز هەیە و ئەشکەوتێکی گەورەی تیادایە کە پێی دەوترێت (ئەشکەوتی گردە)، هەروەها شاخێکی گەورە هەیە لە باشوری ڕۆژهەڵاتی دێیەکەوە پێی دەوترێت

(قەڵا سۆڵێ)، خۆشی و جوانی سروشتی دێی زەڵم بە ئاو و شاخ و باخەوە مرۆڤ ناتوانێت بەزمان یان بەقەڵەم باسی بکات.

ئاوی زەڵم دێتە خوارەوە بۆ ناو شارەزوور و بۆ کشتوکاڵ بەکاردەهێنرێت و، چەند جۆگای گەورەی لێ هەڵگیراوە:

یەکەمیان (دەیمەجۆ)، دووەم (دەڵێن)، سێیەم (جۆگەی قولنگە چین)، چوارەم (گەنەبۆ)، بەناو چەمەکەشدا هەندێك لە ئاوەکە دەمایەوە دەچوو بۆ خورماڵ، ئەو ئاوی زەڵمە بەدەشتی شارەزووردا دەهاتەخوارەوە تاوەکو لەگەڵ ئاوی تانجەڕۆ تێکەڵ دەبوو (ئاوی تانجەڕۆ دەڕژێتە ڕووباری سیروان) و سیروانیش دەرژێتە دەریاچەی دەربەندیخان، کە ئەم ڕووبارە پاش ئەوەی دەگاتە خاکی عەرەبستان پێی دەوترێت ڕووباری دیالی و، جۆگای خالصیشی لێ جیا ئەبێتەوە.

لە دەوروپشتی دێی زەڵمدا دێهاتی زۆر هەبووە، لە باکوریەوە دێی ( هانەی قوڵ ) و (ێلان پێ) و (بانی شار)، لە رۆژهەڵاتیشەوە دێی (دەرەی مەڕ)، (سەرگەت)، (گوڵپ)و، لەپشت دێی زەڵمیشەوە گوندی (دزلی) هەیە کەئەکەوێتە ئەو دیوی شاخی دالانیەوە کە بەنیشتەجێی (مەحمود خان)ی دزلی بەناوبانگە. بەڵام بەداخەوە ئەم دێهاتانە هەندێکن لەو (٤٥٠٠) دێیەی کوردستان، کە ساڵی ١٩٧٨ ڕاگوێزران و دانیشتوانەکانیان بردنە ناو بەندینخانەکانەوە کە پێیان دەوترێت (ئۆردوگای زۆرەملێ) و، بێ بەشکران لە سوود وەرگرتن لە ئاو و خاکی باو و باپیریان، کە بە هەزاران ساڵ تێیدا ژیابوون لە پێش گەلەکانی تری عێراقەوە. ئەم کردەوە نارەوایە زیانێکی زۆری بۆ هەموو گەلی عێراق بەشێوەیەکی گشتی و بۆ گەلی کورد بەشێوەیەکی تایبەتی هەبوو، چونکە دانیشتوانی ئەم دێهاتانە بەرهەمێکی زۆریان هەبوو لە کشتوکاڵ و مەڕ و مالات و باخ، جگە لەوە کەسابەتی تریان دەکرد و شتیان لە عێراقەوە دەبرد بۆ ئێران و بە پێچەوانەوە، سودێکی زۆریان وەردەگرت لەم ئالوگۆڕە.

بەڵام وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٦﴾ ﴾ الشرح: ٦

واتە: لەگەڵ هەموو تەنگانەیەك رووناکی و ئاسانیەك هەیە.

کورد لەبەرئەوەی بێ تاوان بوو، بێ گوناه بوو، ئەوەی لەگەڵ کرا، خوا دەرگایەکی تری بۆ کردەوە، ئەوەی کە ویستی بچێتەوە شوێنی خۆی لەڕێگەی ئەو دەرگایەوە گەڕایەوە، ئێستا نزیکەی (٣٠) ماڵی تیایە کە جاران زیاتر لە (١٣٠) ماڵ بوون.

سەر لە نوێ ئاوەدان کراوەتەوە و دەستیان کردووە بە درەخت ناشتن، هەندێك لەو درەختانە هاتوونەتە بەرهەم، هەروەها دەستیان کردووە بە بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات، هەروەك لە دێهاتەکانی تریشدا هەندێك لە دانیشتوانەکان گەڕاونەتەوە بۆ شوێنی باو و باپیرانیان.

هیوادارم کورد لەنێوان خۆیاندا یەك بن بۆ ئەوەی ئەو دەرگایەی بۆی کراوەتەوە جارێکی تر دانەخرێت.



# تاڤگەی زەڵم

ئەم تاڤگەیە یەکێکە لە تاڤگە سەرنج ڕاکێشەکان لە کوردستاندا، ئاوەکەی لەنزیکی لوتکەی شاخەکەوە دێتە دەرەوە، ئەو تاڤگەی لێ دروست بووە، خۆی لە ناوەوە لە ئەشکەوتێکدا هەڵدەقوڵێت و ئاوی ئەشکەوتەکە زۆر دوور و درێژە تا ئێستا دانیشتوانی دێیەکە نەیانتوانیوە بگەنە کۆتایی ئەشکەوتەکە.

دوو دەرگای تێدایە یەکێکیان ئاوەکەی پیادا دێتە دەرەوە، ئەوی تریان کەوتۆتە لاوە بەهاویناندا کە ئاو کەم دەبێت مرۆڤ دەتوانێت بچێتە ژوورەوە، هەندێك جار دانیشتوانی دێیەکە بەچرا چوونەتە ژوورەوە بۆ ماوەیەکی زۆر بەناو

ئەشکەوتەکەدا ڕۆشتوون کە وشکاییە، بەڵام تا ئێستا نەیانتوانیوە بزانن لە کوێ کۆتایی دێت، لەنزیک داڵانیەوە کونێکی هەیە کایان تێکردووە لەسەرچاوەی زەڵمەوە دەرچووە.

جوانی تاڤگەی زەڵم کەڵە شاعیرەکانی کوردی هێناوەتە گۆ، ئەوەتا حەزرەتی (مەولەوی) دەفەرموێت:

وەهــارەن، ســەیرەن، ســەوزەی دیاران
نم کەوت نە دەیدەش چون شەو بێداران[1]
پەی دڵــەی مانیــای دەروون مــەلالان
سایە بەســتەوە خــەیمــەی گــوڵاڵان[2]
بۆی یەخەی ســەحەر پــەی دەمــاخ دڵ
مــانۆ وە نەســیم جێب جەمــین گوڵ[3]
چون دێوانەی شــۆر ئــازیز نــە سەردا
شەتاو سەر هۆر گرت وە دەشــت و دەردا[4]
تووڵانی چــون هــیجر خــاتر پڕ دەردان
ڕەوان وێنــەی وەصڵ گــەردن بێ گــەردان[5]

---

(١) واتە: بەهارە وەختی تەماشایە سەوزە گیای دەشت و کێوەکان ئاوەنگ نیشتووەتە سەرچاویان، وەك پیاوانی خواپەرست کە شەو ناخەون و بیر لە خوا ئەکەنەوە فرمێسك لە چاویان ئەدرەوشێتەوە.

(٢) مانیا=ماندوو: واتە خێوەتی گوڵاڵەکان سێبەریان کردووە بۆ دڵ ماندووی دەروون پڕ لە خەفەتەکان.

(٣) مانۆ: لەوە ئەچێ، جیب: سینگ و پەڕ، واتە: بۆنی بەرەبەیان لە هەوای سنگ و بەرۆکی نازداران ئەچێت لە خۆش کردنی دەماخی دڵدا.

(٤) شور: عەشق.

(٥) تووڵانی: درێژ.

واتا لافاوی بەهار سەری خۆی هەڵگرتووەو ڕێگای دەشت و دەری گرتووەتە بەر وەك دڵدارێك کە عەشقی یار شێتی کردبێ، وە درێژە وەك دووریی یار لە دڵی عاشقی دەردەدار، وە ساف و مەنگە وەك گەیشتن بە یاری گەردن بێ گەرد.

های جە شنۆی وەش ڕۆح ئەفـــزای کاوان
ئـــای جە شـاخەی ســاف ســەراوان[١]
نەك چون تاف چـەم پڕ ئەســرین چەرخ
بارك الله چـەرخ، هــەی ئـافەرین چەرخ[٢]
چـەنی جـە هەســتیی وێت تەواســاییت
چەنی جۆش عەشق مەجــنوون ئاسـاییت[٣]
بدیـە چـۆن هــۆردان وە نــام و نەنگدا
بــێ پـەروا مــدۆ وێش وە ڕووی سەنگدا[٤]
هــای ســاقی هــەڵای ســـەرمایەی خامی
نـمـەدۆم وە دەس ڕای نـێـکنــامــــی[٥]
باوەرە وەش سا دەی هەی پەی کەی
تاف قــەڵوەزەی ســاف شیشـەی مەی[٦]

---

(١) وەش: خۆش. شاخە: هارە.

(٢) چەرخ: پێشان چەمی زەڵم پێشیان وتووە چەرخ.

(٣) هەستی: بوون. تەواسایی: بێزاربوون.

واتە: ماشەڵڵا لە شنەی خۆشی بە خۆشی بە گیان دەری سەر شاخەکان و لە هاڕەی تافی ساف و ڕەوانی ئاوەکان کە لە بەرزەوە دێنەخوار، بەڵام نەك وەك هاڕەی تافی چەمی پڕ لە فرمێسکی زەڵم کە هیچ چەمێکی پێ ناگاتەوە.

ئەنجا ڕوو ئەکاتە زەڵم و پێی ئەڵێ: ماشەڵڵات لێ بێ هەی چەمی زەڵم وە لە بێزاربوونت لە وجوودی خۆت و لە جۆشی عەشقی مەجنوون ئاسایيت.

(٤) هوردان: هەڵی داوە. مدو: ئەدا.

واتە: سەیری کە چۆن عەیبەی ناوەتە لاوەو لە ناووناتورە ناترسێ و بێ پەروا خۆی ئەدا بەو تاش و بەردانەدا.

(٥) هەلای: هێشتا. نیکنامی: ناوبانگ باشی.

(٦) باوەرە: بینە. قەلوەزە: قەڵبەز، تاڤگە.

مـــەوجـیـش بنچــینەم دبـــۆ وە هـــەم دا
هەستیم دۆ وە بــەرد هـــەرد ـەدەم دا[١]

مەولەوی لە شیعرێکی دیکەیدا کە باسی کۆچی جافەکان بۆ کوێستان دەکات، باسی زەڵمیشی کردووە و دەڵێت:

گـێج مــــەدا سـەبــوون شـارەزوور دڵ
سیروان هـوونــاو دەروونش گـوڵ گـوڵ
واژاوش مــەویــەرد نە دەمــــاخ دەم دەم
تاف مەوەست سـەراو چــەرخ "زەڵم" چەم
عەدەمش نەپووش هەستی مەکەرد ساف
منمانا چون خەس هەستیش نەرووی تاف
هەوای هاژەی تـــاف بەردەبــن هۆشــم
بەڵام ئەی چەند بەیـت مـــاما نە گۆشم:

واتە: هەناسەی گەرمی دڵی وەك بای سەبوونی شارەزوور بەتینە، گێژی ئەخوارد و خوێناوی دەروونی ئەوەندەی ئاوی سیروان زۆرە و هاتبوە کوڵ، ئەو خوێناوەی دەروونی تاوبەتاو لەبەر زۆری لە لوتیەوە سەری ئەکرد و ئاوی (چاوی) وەك چەمی زەڵم تاقگەی ئەبەست، هەوای تاقگەی ئاوی چاوی هۆشی لا نەهێشتبووم، هەرئەوەنە بوو گوێم لەم چەند شیعرە بوو لە لەشی وەك پوشیەوە بەسەر ئاوی تاقگەکەوە.

پاش ئەوە بەچەند بەیتێك مەولەوی شینەکەی بۆ کۆچی جاف تەواو دەکات.

---

(١) دو: بدا.
مەولەوی لێرەوە بە عادەتەکەی خۆی هاوار ئەباتەوە بەر مەی گێڕ و پێی هەڵێ: هێشتا سەرمایەی تێ نەگەیشتن و بێ سەلیقەیی نامداتە دەستی ڕێگای ناوبانگ باشی، کەواتە تۆ خۆت بۆ کەی هەڵگرتووە زووکە لە تاقگەی سافی شووشەی مەیەوە تافی مەی بەردەوە، با شەپۆلی بنچینەی بوونم تێك و مەکان بداو بمدا بە تاش و بەردی شاخی نەبوونیدا.
سەرچاوە: دیوانی مەولەوی، لێکدانەوەی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ل ٤٦٧-٤٦٩.

هەروەها خوالێخۆشبوو شاعیری مەزن - پیرەمێرد- لە ساڵی (١٩٥٢) ئەم پارچە شیعرەی بەسەر زەڵمدا وتووە و دەفەرموێت:

ئـاوە جـوانەکەی سـەرچاوەی زەڵم
بۆ گەلا ڕێزان سـەر بەتـەم و هـەڵم
ئەڵێی سەرچـاوەی بەخـتی کـوردانی
سـرەوتت نیـە وێـڵی هـەردانی
تاقگەکەت سەربەرز سـاردە وەك تەرزە
دانەی مرواری لەنجـەی سـەد تەرزە
لەو ئـاسـمانەوە ئەڕژێـتە خـواری
لە چاوی گەردون فرمێسـك ئەبـاری
وێنەی عـاشـقێ کـە ناڵە کاربێ
سەحرا نە وەرد بێ پەیجوری یـار بێ
وێڵ و سـەرەڕۆ بە ڕۆ ڕۆی پـڕ دەرد
بە قەڵبـەزەوە سـەر ئـەدەی لەبەرد
دەسـت لە ملانـێ لەگەڵ تـانجـەڕۆ
بە سەودای سیروان شـەیدا و ڕەنجـەڕۆ
لە دواوان دا کـە یـەك ئـەکەوی
دوو میسـرەعی بـوو بەیتی مەولەوی
سیروانی ئەم چـەم تـانجەڕۆی ئەو چەم
بدەن بەیەك دا ئەم چـەم تـا ئەو چەم
مـەوەسـتە بڕۆ بـە لم و خـاك دا
بگری لەبـارگەی سـەلمانی پاك دا
پێی بڵێ: قوربـان تۆ نـاوت پـاکە
بمـانخـەرە ڕێی یەکێتی و چـاکە

لەبەر ئـــاودێـری ئەو خـــاکە دێمـــە
کە پـــاراو ئـــەبێ بەئـــاوی ئێمـــە
بـــا گوڵ و نێـــرگز هـــەردوو پێکەوە
شـــاد بێ بـــەدڵـــی ڕێـــك و پێکـــەوە

زەڵم لەبەر سروشتی شوێنەکەی کە هەر چوار سنورەکەی بە شاخی گەورە گیراوە، وا دیارە لە کۆندا ئەوانەی کە حوکمڕانی ئەو وڵاتەیان کردووە پایتەختەکەیان لە زەڵمدا بووە، چونکە زۆر شت هەیە لە دیوار و شورای کۆن نیشانی دەدا کە ئەمە شوێنی ئەوانە بووە کە مەترسیان لە دوژمن بووە.

لە نزیکی دێیەکە شوێنێك هەیە پێی دەوترێت (تەپۆڵە)[١]، شوێنێکی زۆر بەرزە بەسەر هەموو شارەزووردا دەڕوانێت، ئەو ژوورانەی لەوێ دروست کراون، لە ژوری قەڵا و کۆشکی سەرۆکایەتی دەچن و بەردی دیوارەکانی گەورە و چوار سوچن، مرۆڤ سەری سوڕ دەمێنێ کە چۆن ئەو بەردە گەورانە لەسەر یەك دانراون.

لە نزیکی ئەو شوێنەدا لە ناوەڕاستەکەیدا شاخێکی زۆر بەرز هەیە، بەرامبەری لەسەر شاخەکەی تر کۆشکی کوڕان هەیە و دۆڵەکە پێی دەڵێن چەمی (وشکە ناو)، ژورێك تاشراوە لە پاڵ ژوورەکەدا حەوز و ئاوێك دروستکراوە، دانیشتوانی دێیەکە بەو شوێنەیان دەوت (کۆشکەو کناچا) واتە (کۆشکی کچان)، وادیارە ئەم شوێنە بۆ ژنی حوکمڕانی ئەو شوێنە دروست کراوە.

زۆر گۆڕستان لەو شوێنانەی کە لەوێ نزیکن دۆزراوەتەوە کە مردووەکانیان لە نێو کوپەی گەورەی سورەوکراوەدا نێژراون و، هەندێکیان لەگەڵ مردووەکەدا شتیان تیادایە وەك خشڵ و مورو و ئەو کەرەستانە بووە کە بۆ جەنگ لەو سەردەمەدا بەکارهاتووە.

---

(١) تەپۆڵە: ئەم شارە (زوور بن الضحاك) دروستی کردوە (قاموس المحيط).

زەڵم جێگەی حوکمڕانی ئەردەڵانیەکان بووە، ئێستا قەڵایەك هەیە لەبەردەمی شاخێکی بەرزدا لە شوێنێکی بەرزایی دا کەپێی دەوترێت قەڵای (خان ئەحمەد خان)(١).

زەڵم لە پاش هاتنی ئاینی ئیسلام سێ جار بووە بە پایتەختی ئەردەڵانیەکان لە کاتێکدا کە حوکمڕانی کوردستانی عێراق و ئێران بوون، وا دیارە ئەوکاتیش هەروەك ئێستا وا بووە هەر بەشێك لە کوردەکان یارمەتی فارس و عەرەب و تورکیان داوە لە دژی ئەوانەی کە ویستوویانە قەوارەیەك بۆ ئەم میللەتە دروست بکەن.

هەرجار کە دوژمن زۆری هێنابێت بۆ ئەردەڵانیەکان پایتەختەکەیان بردۆتە زەڵم، چونکە هەر چوار دەوری شاخ و بەرزاییە و بە هێزێکی کەم بەربەرەکانی دوژمنی پێ ئەکرێت، کاتێك بیەوێت بچێتە ئەوێ، بۆ نمونە ساڵی ١٩٧٥ کە سوپای عێراق شەڕی دەکرد لەگەڵ کورددا نەیتوانی بچێتە زەڵم تاوەکو ڕێکەوتنی جەزائیر لە نێوان عێراق و ئێران کرا دژی کورد، کەبەشدار بووانی ئەو ڕێکەوتنەی دژی کورد ئیمزا کرا بریتی بوو لە محەمەد ڕەزا شای ئێران و هەواری بومدینی جەزائیرو سەدام حوسین لە عێراق بەسەرپەرشتی ئەمریکا.

---

(١) ئەم قەڵایە، سەکۆیەك بەشاخەکە دروست کراوە کە (١٤) چین دیوار بە قسڵ و گەچ کراوە.

## ئەردەڵان لە چییەوە هاتووە

ئەردەڵانیەکان نەوەی (قوباد ئەردەڵان) بوون کە پێیان وتووە (بابا ئەردەڵ)، قوباد لە ساڵی (١٣٢ك)[١] خوراسانی ئێرانی بەجێ هێشتووەو هاتووەتە عێراق، ماوەیەك حوكمڕانی موسڵ و دیاربەكری كردووە، لە پاشا ناوچەی شارەزووری گرتۆتە دەست، بەم جۆرە زنجیرەی ئەردەڵانیەکان کە حوکمڕانی ناوچەی شارەزوور بوون تا ساڵی (٥٦٤ ك) کە پایتەختەکەی زەڵم بووە، خوالێخۆشبوو (مەردۆخ) لە مێژووەکەیدا ئەڵێت[٢]:

تا ساڵی ٥٦٤ سلسلەی ئەردەڵان : (در نواحی شهرزور حکومت داشته اندو قلعه - زلم - مقری حکمرانی فرد ساخته اند).

لە پاشا لە كاتی حوكمڕانی (كلول بەگی ئەردەڵان) كە ماوەی (٢٣) ساڵ حوكمڕانی كردووە (٦٠٦ك- ٦٢٩ك) پایتەختەکەی لە زەڵمەوە گواستۆتەوە بۆ پڵنگانی هەورامان- دیارە ئەوێ شوێنێکی سەخت و شاخاوییە- یەکێکە لە دێهاتەکانی کوردستانی ئێران.

### حوکمڕانی ئەردەڵانیەکان بۆ کوردستانی عێراق و ئێران

ئەردەڵانیەکان بۆ ماوەی زیاتر لە (٦٠٠) ساڵ حوکمڕانی هەموو کوردستانی عێراق و ئێران بوون. سنووری کوردستان ئەوکاتە بەمجۆرە بووە:

---

(١) ئەمە لە کاتێکدا بووە کە (أبو مسلم خراسانی) لە زەمانی ابو العباس (عبدالله عباس) دیارە بەجێ هێشتنی خوراسانی لەبەر بەربەرەکانی (عەباسیەکان- ابو مسلم خراسانی) بووە.

(٢) تاریخ مەردۆخ تاریخ کورد و کوردستان - بەرگی دووەم- لا ٩٠ چاپی سێیەم.

١- **ڕۆژهەڵات:** هەمەدان، ئەو شارانەی کە لە ریزی هەمەدان بوون لە لایەن ڕۆژئاواوە.

٢- **ڕۆژئاوا:** کەرکوك، هەولێر، موسڵ.

٣- **باکور:** زنجان، ئەو شارانەی لە ریزی زنجان بوون.

٤- **باشور:** کرمانشاه، ئەو شارانەی لەڕیزی ئەوبوون لە باشورەوە.

**ماوەی حوکمڕانی هەر یەکێ لە ئەردەڵانیەکان بەم جۆرەی خوارەوە بووە:**

| حوکمڕان | ماوەی حوکمەکەی بەمێژووی کۆچی |
|---|---|
| ١- کلۆڵ بەگ | ٦٠٦- ٦٢٩ |
| ٢- خدر- خضر- بەگ | ٦٢٩- ٦٦٣ |
| ٣- الیاس بەگ کوڕی خدر بەگ | ٦٦٣- ٧١٠ |
| ٤- خدر بەگ دووەم کوڕی الیاس بەگ | ٧١٠- ٧٤٦ |
| ٥- أمیر حسن کوڕی خدر بگ | ٧٤٦- ٧٨٤ |
| ٦- بابلو بەگ کوڕی أمیر حسن | ٧٨٤- ٨٢٨ |
| ٧- منذر بەگ کوڕی بابلو بەگ | ٨٢٨- ٨٦٢ |
| ٨- مامون بەگ کوڕی منذر بەگ | ٨٦٢- ٩٠٠ |
| ٩- یەکە بەگ | ٩٠٠- ٩٤٢ |
| ١٠- مەئمون بەگی دووەم کوڕی یەکە بەگ | ٩٤٢ - ٩٤٤ |
| ١١- سرخاب بەگ کوڕی مأمون بەگ یەکەم | ٩٤٤- ٩٤٧ |
| ١٢- سلطان علی بگ | ٩٤٧- ٩٧٥ |
| ١٣- بساگ بەگ کوڕی سلطان علی بەگ | ٩٧٥- ٩٨٦ |
| ١٤- تیمور خان | ٩٨٦- ٩٩٦ |
| ١٥- هەڵوخان برای تیمورخان | ٩٩٦- ١٠٢٥ |
| ١٦- خان أحمد خان | ١٠٢٥- ١٠٤٦ |
| ١٧- سلیمان خان | ١٠٤٦- ١٠٨٢ |
| ١٨- أحمد خانی دووەم | ١٠٨٢- ١٠٩١ |

| | |
|---|---|
| ١٩- خسرو خانی دووەم | ١٠٩١-١١٠٧ |
| ٢٠- محمد خان | ١١٠٧-١١١٣ |
| ٢١- حسن خان علی خان | ١١١٣-١١١٨ |
| ٢٢- حسین علی خان | ١١١٨-١١٢٠ |
| ٢٣- کەیخسرو بەگ | ١١٢٠-١١٢١ |
| ٢٤- عەباس قولی خان | ١١٢١-١١٢٩ |
| ٢٥- نەجات قولی خان | ١١٢٩-١١٣٢. |

ئینجا لێرەدا زنجیرەی حوکمڕانی ئەردەڵانیەکان ئەپچڕێ ئەکەوێتە دەستی بابانەکان:

| | |
|---|---|
| - خانە پاشا بابان[1] | ١١٣٢-١١٣٦ |
| - عەلی خان بابان | ١١٣٦-١١٤٢ |

دووبارە حوکمڕانی ئەکەوێتەوە ژێردەستی ئەردەڵانیەکان بەم جۆرە:

| | |
|---|---|
| ٢٦- عەباس قولی خانی ئەردەڵان | ١١٤٢-١١٤٣ |
| ٢٧- سبحان وێردخانی ئەردەڵان | ١١٤٣-١١٤٨ |
| ٢٨- مصطفی خان ئەردەڵان | ١١٤٨-١١٤٩ |
| ٢٩- سبحان وێردی خان ئەردەڵان (جاری دووەم) | ١١٤٩-١١٥٣ |
| ٣٠- ئەحمەد خان ئەردەڵان | ١١٥٣-١١٦١ |
| ٣١- حەسەن عەلی خان ئەردەڵان | ١١٦١-١١٦٧ |
| - سەلیم پاشای بابان | ١١٦٧-١١٦٨ |
| ٣٢- خەسرەو خان ئەردەڵان | ١١٦٨-١١٧٧ |
| - سلێمان پاشای بابان | ١١٧٧-١١٧٩. |

---

(١) ئەمانە حوکمڕانی بابان بوون.

شایەنی باسە خان احمد خان کاتێك حوکمڕانی کوردستانی عێراق و ئێرانی کردووە لە ماوەیەکی زۆردا پایتەختەکەی زەڵم بووە، خان أحمد خان زاوای (شاه عباس) بووە کە خوشکەکەی خۆی داوە پێی ناوی (زەرین کولاە) بووە کە بە کوردی پێی ئەوترێت (کلاوزەڕ).

خان احمد خان پیاوێکی زۆر ناشیرین بووە، بەڵام زۆر زۆر ئازا بووە، لەسەر داواکردنی (شا عباس) (کەرکوك و موسڵ)ی خستۆتە ژێردەسەلاتی خۆی، (٤٠) رۆژ لە موسڵ ماوەتەوە لە پاشان ئەچێت بۆ بەغداد و، هیچ بەربەرەکانیەك دووچاری نابێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە دانیشتوەکانی بەغداد پێشوازی گەرمی ئەکەن و دیاری باشی پێشکەش ئەکەن.

هەروەها وەك مەردۆخ ئەڵێت: (حەوت ساڵ و سێ مانگ) لە نێوان عەرەبەکان ماوەتەوە لە موسڵ و بەغدا، لە پاشان کە گەڕاوەتەوە، لە پاداشتی ئازایەکەیدا (شا عباس) خەنجەرێك کە (کێلان)ەکەی هەمووی ئاڵتون دەبێت لەگەڵ (١٠٠٠ تمەنی زێڕدا) بەدیاری بۆی ئەنێرێت.

خان ئەحمەد خان لە خوشکەکەی شا عباس کوڕێکی ئەبێت بە ناوی (سرخاب)، (شا عباس) هەر بە منداڵی خوشکەزاکەی ئەباتە لای خۆی و بە خوێندن و پەروەردەیەکی پاك پەروەردەی ئەکات بۆ جێگەداری باوکی.

لە ساڵی (١٠٣٨ك) شا عباس کۆچی دوایی ئەکات، (شا سفیە) دێتە جێگەکەی ئەبێتە شای ئێران، ئەویش بۆ بەرژەوەندی خۆی لە دژی تورکەکان پەیوەندییەکی زۆر بەهێز پەیدا دەکات لەگەڵ خان أحمد خان.

بەڵام بەداخەوە کورد لە بەرەبەیانی مێژووەوە بەدەستی بێگانە دوژمنی خۆی بووە، بۆ نمونە (سلێمان پاشای ئەردەلان) کە ماوەی حوکمڕانی (١٠٤٦- ١٠٨٢)بوو، بۆ ئەوەی خۆی نزیك بکاتەوە لە (شا سفیە) بە (شا سفیە) دەڵێت خوشکەزاکەی شا عباس (سرخاب کوڕی خان أحمد خان) بە تەمای جێگاکەی خاڵیەتی کە (شا عباس)ە، ئەیەوێت بەهەر جۆر بێت لەناوت بەرێت و لە جێگەی تۆ بێت بەشای ئێران، لەگەڵ ئەوەشدا کە (سلیمان خان) و (خان أحمد خان) هەردووکیان ئامۆزا بوون.

ئینجا لەبەر ئەو نارەواییەی کە سلیمان خان ئەیکات، (شا سفیه) ئەنێرێت بەدوای (سرخاب)دا ئەڵێت پێم خۆشە بێیت دیدەنی من بکەیت، کاتێك ئەگاتە ئەویَ فەرمان ئەدات کە بە زیندوویی هەردوو چاوی هەڵکۆڵن، کە هەواڵەکە دەگات بە خان أحمد خان شێت دەبێت و ئەم پارچە شیعرە دەڵێت:

بی تو أی جان جیهان بـادل خـونین چاکنم
بهر بیَ چشمیت أی چشم جیهان بین چاکنم
بیَ گنه دیده أت از حـرقه بیــرون ئــاوردند
چشم من کور بگو پـس مـن مسکین چاکنم

بۆ ماوەی یەك ساڵ بەم شێوەیە لە سەر ڕای پیاو ماقوڵان، خان أحمد خان لە ژوورێکی تایبەتدا دائەنێن، ئیسماعیل بەگ وەزیری خان وڵات بەڕێوە دەبات، دوای یەك ساڵ خان هۆشی دێتەوە سەر خۆی، بۆ تۆڵەسەندنەوە لە (شا سفیه) پەنا دەبات بۆ (سوڵتان موڕادی عوسمانی) و، دەکەوێتە شەڕ لە دژی (شا سفیه)، پاشان شارەکانی (کرماشان، سەقز، هەمەدان، گەرو، ورمیَ، خوی) دەگرێت و لەم شارانە کاربەدەستی خۆی دادەنێت و، دواتر لە چەند شەڕێکدا لە دژی (شا سفیه) لەگەڵ لەشکری عوسمانیدا هێرش دەکەن و دەشکێن، لە ساڵی (١٠٤٨ك) خان ئەحمەد خان ماڵئاوایی لە ژیان دەکا، لە نزیکی گۆڕی حەزرەتی (یونس) (درودی خوای لەسەر بێت) لەشاری موسڵ دەینێژن.[(١)]

لەدواییدا بەو هۆیەوە دوژمنایەتی ئەکەوێتە نێوان ئەوانەی لەگەڵ سرخاب بوون و ئەوانەی لەگەڵ سلێمان خان بوون و تەنیا (شا سفیه) سوودی لیَ وەردەگرێت.

زەڵم جارێکی تر ئەبێت بەبنکەی ئەردەڵانیەکان.

کاتێك فارسەکان و تورکەکان و عەرەبەکان هەروەك ئێستا پەیمان ئەبەستن لە دژی کوردەکان، بڕیار ئەدەن کۆتایی بە حوکمڕانی ئەردەڵانیەکان بێنن، ئەوانیش

---

(١) مێژووی کورد و کوردستان، مەردۆخ، بەرگی دووەم، ل١٠٣- ١١٠.

ئەچنەوە زەڵم بۆ ئەوەی خۆیان رزگار بکەن لە دەست ئەم دوژمنانە، ماوەیەك لەوێ ئەمێننەوە، هەواڵ دەنێرن بۆ کوردەکانی تر کە یارمەتیان بدەن، بەڵام هیچ کەس لە کوردی ئێران و تورکیا و عێراق ناڕوات بەدەمیانەوە، ماوەیەك ئەمێننەوە خواردەمەنیان لێ ئەبڕێت، ناچار ئەبن خۆیان تەسلیمی تورکەکان بکەن، ئەوانیش ئەیان بەن بۆ (ئەستەنبوڵ) کە ئەوکاتە پایتەختی (خلافە)ی عوسمانیەکان بووە.[1]

لە باسی مێژووی ئەردەڵانیەکان دەردەکەوێ کە لە سەرەتای مێژووەوە تا ئێستا نە کورد بووە بەهیچ کە تاقانە گەلێکە لەسەر ئەم زەمینە قەوارەیەکی نیە و هەر چوار دەوری بەدوژمنی گیراوە، خۆشی لەناو خۆیدا بەش بەش بووە و دوژمنی بەشەکەی ترە.

---

(١) کاتێك سلطان مراد سلطانی عوسمانیەکان بووە هەموو کوردەکانی راست کردەوە لە دژی خان أحمد خان بۆ ئەوەی موسڵ و کرکوك بخاتە ژێردەستی خۆی.

# باپیرە گەورەم چۆن هاتۆتە زەڵم

خوالێخۆشبوو باپیرم (سۆفی محمد أمین جوامێر) کە تەمەنی (١٢٠) ساڵ دەبوو لە ساڵی (١٩٦٤) کۆچی دوایی کرد، ساڵی ١٩٤٦ بۆی باسکردم کە چۆن باو و باپیری هاتونەتە دێی زەڵم.

دەیوت: باوکم - جوامێر- کوڕی یەحیا ئاغا کوڕی یوسف ئاغا کوڕی غازی ئاغا کوڕی رەجەب ئاغا خەڵکی کوردستانی ئێران بوو، لەدێی (بڵبەر) نیشتەجێ بوون، ئەم ناوە لەوەوە هاتوە کە دوو چاوگەی تیایە بەرامبەر یەکتر، لەبەر ئەوە پێیان وتوە بلبەر.

ئەم دێیە نزیکی هەورامانی تەختە، لەدواییدا هاتونەتە کوردستانی عێراق، جوامێریش کە باوکی باپیرمە شەش کوڕی بووە، یەکێکیان ناوی عبدالله بوو هەر بە گەنجی مردووە، کوڕەکانی تری ئەمانەبوون: (حەمەئەمین، کەریم، عەزیم، ئەحمەد، مەحمود)، باپیرم (حەمەئەمین) لە هەموویان گەورەتر بوو، بەڵام لەپاش هەموویان وەفاتی کرد.

دایکم - رەیحان - کچی محمد سلیم بووە، کە ئەویش نەوەی موسا بەگ بووە کە لە خورماڵ دانیشتووە، لەکاتی خۆیدا مزگەوتەکەی خورماڵ کە سوڵتان سەلیم بینای کردووە ئەو تازەی کردۆتەوە، ئەم تازە کردنەوەیە بەکورتی کرابوو بە شیعرێك لەسەر پارچە مەڕمەڕێك هەڵکەنرابوو، ئەم پارچە مەڕمەڕە لەسەر دەرگای مزگەوتەکە چەسپ کرابوو، هەر چەندە لەکاتی ڕووخاندنی مزگەوتەکەدا لە لایەنی میریەوە کاتێك هێرشی کردە سەر کوردستان و دێکانی

هەموو وێران کرد، بەردەکە بووەتە چوار پارچەوە، بەڵام شیعرەکە هەر دەخوێنرێتەوە کە بەم شێوەیە نوسراوە:

| | |
|---|---|
| والی ملـــك شـــا عبــــادان | سـلیمــان تخت عـــزت داد |
| مسجد کوهنه سال شاه سلیم | دیده گشت بجاه قزر و رماد |
| ید بیضـا و نمـــود موســی را | ز گلعنبرش بـــا لطـف داد |
| در بنایـــای خـیر شـد ساعی | بهر اجر ثـــواب روز معـــاد |
| از کرم چند پدره سرف شـــد | تا بیـــاف أو حســـن مـــراد |
| أین اشارت ز غیب شـد تأریخ | (بوده مسجد بذکر حق اباد) |

بەم شێوەیە ڕستەی (بوده مسجد بذکر حق اباد) (١١٦٢)ی کۆچی دەرئەچێت، بەگوێرەی پیتەکان (ابجد هوز) وئەم شیعرانە نووسراون لە پەڕاوی (محمدیە)دا کە مەلا نور الله کاکۆ زەکریائی وەری گێڕاوە لە تورکیەوە بۆ فارسی بە فەرمانی موسی بەگ وەك لە (فهرس)ی (مخطوطات مکتبة الاوقاف المرکزیة)دا لاپەڕە ٣٥٧- ٣٥٨ هاتووە.(١)

ئەم مزگەوتە زۆر گەورە بوو (نۆ) گومەزی هەبوو، شوێنەوارێکی مێژوویی نایاب بوو، بەڵام سوپای عێراق بە مادەی (T.N.T) وێرانیان کرد سەر و شوێنی نەما، هەروەها منارەکەیان دایە بەر تۆپ نیوەی نەما و نیوەکەی تریشی خەریکە ئەڕوخێت.(٢)

باوکی باپیرم و خزمەکانی پێش زیاتر لە (٢٠٠) ساڵ هاتوون بۆ زەڵم، لە کاتێکدا ئەم شوێنە ئاوەدانی تیا نەبووە، هەمووی شەخەڵ و دارستان بووە و شوێنی دڕندە بووە، لە شوێنێکی بەرزایی بەرامبەر بەدێیەکەی ئێستا، دێیەکیان دروست کردووە کە ئێستا پێی دەوترێت (دەگا کۆنی) واتە (دێ کۆن)،

---

(١) کڵپەی دەروون: نووسینی عمر أحمد نظامی، بەشی یەکەم، چاپی یەکەم، ٢٠٠٠ز، بە سوپاسەوە ئەم کتێبە بەنرخەی پێشکەش کردم.
(٢) هەمان سەرچاوە.

لەبەرئەوەی هاتووچۆ ناخۆش بووە پەڕیونەتەوە بۆ ئەوبەر لەبەر شاخی (زەردا) ئەم دێیەیان دروست کردووە کە ئێستا پێی دەوترێت (زەڵم)، ئینجا دەستیان کردووە بە سوتاندن و بڕینی ئەو شەخەڵ و درەختە بێ بەرانە و لە جێگەی ئەوان درەختیان ناشتووە و کردویانە بە باخ، هەندێك لەشوێنە شاخاویەکانیان ڕووخاندوە کردویانە بە تەلان بۆ جێگای کشتوکاڵ، شوێنی وا هەیە بە کۆڵ خاکیان بردووە بۆی لە نێوانی شاخەکاندا درەختیان تیا ناشتووە، بەم جۆرە ماوەیەك ماونەتەوە لە پاشاندا هەندێك لە بەگەکانی ئێران کە لەوێوە نزیك بوون وەك بەگەکانی دزلی، چاویان بڕیوەتە شوێنەکانیان و پێیان وتوون: یان دەبێت زەڵم بەجێ بهێڵن یان دەبێت ئێمەش بەشداربین لە بەرهەمەکاندا، ئینجا باپیرە گەورەم (جوامێر) چووە بۆ لای شێخ بهاءالدین کوڕی شێخ سراج الدين لە شێخەکانی تەوێڵە، پەنای بۆ بردووە کە کارێك بکات بەگە زۆردارەکانی ئێران دەستدرێژی نەکەنە سەریان.

شێخ بهاءالدين لەبەرئەوەی پیاوێکی گەورەی ئایینی بووە، دانیشتوانی ناوچەکە زۆر شەرمیان لێکردووە، بە بەگەکانی وتووە کە وازیان لێ بهێنن و دەستدرێژیان نەکەنە سەر، چونکە ئەوانە خۆیان بە مورید و (منسوبی) ئەو دەزانن و سەر بەشێخن.

باپیرم و خەڵکەکەش بەرامبەر بەو چاکەیە لە وەفاداری خۆیان هەموو ساڵێك لەکاتی کۆکردنەوەی بەرهەمی باخەکان هەندێك لەو بەرهەمەیان بردووە بۆ خانەقای شێخ بهاءالدين.

لە پاشدا شێخ بهاءالدين کۆچی دوایی کرد، شێخ علی حسام الدين لە جێگەی بووە بەشێخی ئیرشاد و (٦٣) ساڵ شێخایەتی کرد تا لە ساڵی ١٩٣٨ ئەویش کۆچی دوایی کرد.

## شێخ حسام الدین

پیاوێکی ژیر و زیرەك بوو، زۆر کەسایەتی خۆی ڕادەگرت، شێخەکانی تر چەند جار هاتوون بۆ بەغدا بۆ لای مەلیك یان نوری سەعید یان یەکێکی تر، ئەو باوەڕ ناکەم لە تەمەنی شێخایەتیدا جارێك سەردانی بەرپرسانی کردبێت لە بەغدا.

لە ساڵی (١٩٣٣) مەلیك فەیصەڵی یەکەم هات بۆ خورماڵ، من ئەوکاتە منداڵ بووم، بیرم دێت لەناو بازارەکەدا تاقێکیان بۆ کردبوو، بە گەڵا و گوڵی ژاڵە تاقەکەیان ڕازاندبووەوە، چرایەکی لۆکسیان پێوە کردبوو، هاتنەکەی مەلیك تەنها بۆ لای شێخ حسام الدین بوو کە ئەوکاتە ماڵیان لە خورماڵ بوو، کاتێك مەلیك هات نەچوو بەپێشوازییەوە، لە دەرگای حەوشەی ماڵەکەیان وەستاو چاوەڕوانی کرد، نەهاتە ئەم دیوی دەرگاکە، کاتێك مەلیك چووە نێو حەوشەی ماڵەکەیان، کە لە هەمان کاتدا حەوشەی مزگەوتەکە بوو، ئینجا دەست و مشتاقی لەگەڵ کرد، مزگەوتەکە کە سوڵتان سەلیم دروستی کردبوو شتێکی نایاب بوو،



شێخ علی حسام الدین

مەلیک ویستی بچێتە ناویەوە، لەگەڵ شێخ چوون، کاتێك ویستی پێڵاوەکانی دانەکەنێت بچێتە ژوورەوە، شێخ حسام الدین پێی وت:

﴿فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوًى ١٢﴾.(١)

واتە: پێڵاوەکانت دا بکەنە چونکە تۆ وا لە شوێنێکی زۆر پیرۆزدای، ئینجا دوای ئەوەی پێڵاوەکانی دانا چووە ژوورەوە.

شێخ حسام الدین مرید و سۆفیەکی زۆر زۆری هەبوو لە عێراق و ئێران و تورکیا و پاکستان، پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند بوو، موڵکێکی زۆری هەبوو لە عێراق و ئێران، هەموو هاوینێك یان دەچووە هاوینە هەوارەکەی (کراویە دۆڵ) لەسەر سنوری عێراق و ئێران یان دەهاتە زەڵم، هەر ساڵێك بهاتایەتە زەڵم بە (دە) رۆژ لەوەو پێش مام و ئامۆزاکانمی ئاگادار دەکردەوە بۆ ئەوەی جێگەی بۆ ئامادە بکەن، ئەوانیش (گۆشەی پرد) کە لە بەشی باپیرمدا بوو پاناییەکی فراوانی هەبوو، خۆشترین شوێن بوو لە زەڵمدا، بە هەر چوار دەوریدا بە گەڵا بەڕوو ئەیان تەنی و حەوت هەشت کەپریان بۆ دروست ئەکرد لە ناوەوە، شوێنێکی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ دانیشتن لە ئێواراندا کە ئێستا پێی دەڵێن (نزرگای شێخ حسام الدین)، بەو بەری ئاوەکەوە بەشە باخەکەی مامە (عظیم)م کرابوو بە خانەقا، سێ مانگەی هاوین ئەو شوێنە وەك شارێکی شارستانی لێ دەهات و


مەلیک فەیصەڵ

هەموو جۆرە میوانێك لەو دەوڵەتە ئیسلامیانەوە کە باسم کردن دەهاتن بۆ لای،

---

(١) سورة طــه.

هەفتەی سێ چوار جار لە نێوان باخەکاندا دەگەڕا و هەندێ شتی دەگۆڕی، وەك یەکێك کە ئەو باخانە هی خۆی بێت، دیارە ئێمە نازانین شێخ حسام الدین پاش ئەوەی لە جێگەی باوکی دانیشت بۆ شێخایەتی، دێی (زەڵم)ی بەناوی خۆیەوە تۆمار کردووە لە ئەستەمبوڵ کاتێك کە حوکمڕانی عوسمانیەکان بوو، ئێمەش بەم کارەساتەمان نەزانی تا ساڵی (١٩٣٧)، ئەو ساڵە هاتبوو بۆ زەڵم، کێشەیەك دروست بوو کەهیچ پەیوەندی بەئێمەوە نەبوو، پاش ئەوە شێخ فەرمانیدا هەموو ئامۆزاکانم بگرن و بیانخەنە بەندینخانەوە لە هەڵەبجە، بەڵام هیچیان لەسەر ئیسپات نەبوو بەریان دان، شێخ زیز بوو باری کرد و چۆوە باخە کۆن و لە پێش رۆشتنەوەیدا پێی وتین: ئەم باخانە هی منن، وەرەقەی (قاقانی)م هەیە کە تۆمارکراون لەسەر من، لەمەولا بە ئیجار نەبێت نابێت تێیدا بمێننەوە.

دیارە ئەمە شتێکی زۆر سەیرە، شێخێك بەڵێن بدات بە چوار پێنج ملیۆن موسڵمان کە لە رۆژی قیامەت شەفاعەتیان بۆ بکات و لە جیهاندا بیانپارێزێت لە هەموو شتێك و ئیمانیان سەلامەت بکات، لەگەڵ ئەوەشدا بە پێچەوانەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم کردەوەیە بکات، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (من أحيا أرضا ميته فهو له). واتە: هەر کەسێك زەوییەکی مردووی بێ خاوەنی زیندو و ئاوەدان کردەوە بە باخ یان کشتوکاڵ دەبێتە موڵکی تەواوی خۆی.

هەروەها یاسای دەوڵەتی عوسمانی دەڵێت: هەر کەسێك لە هەر زەوییەکدا لە هەر دۆنمێکدا (٤٠) درەخت بنێژێت و(دە) ساڵ بەرێوەی بەرێت ئەبێتە موڵکی خۆی و تۆمار دەکرێت بەناوی ئەوەوە.

دیارە وەك باسم کرد فەرموودەکەی پێغەمبەر و یاساکەی دەوڵەتی عوسمانی هەردووکیان لە باخەکانی ئێمەدا دێتە دی، چونکە کاتێك باپیرە گەورەم هاتۆتە زەڵم ئەو شوێنە هەر شەخەڵ و جەنگەڵ و جێگای دڕندە بووە و ساڵەهای ساڵ باخیان تیا کردووە، لە زۆر شوێندا بەکۆڵ خاکیان بردووە لە نێوان شاخەکاندا کردوویانە بە تەلان و درەختیان تیا ناشتووە، ئینجا داواکردنی شێخ و وەرەسەکەی بۆ ئەم باخانە لەلاپەڕەکانی دواتری ئەم یاداشتەدا باس دەکەم، کاتێك ساڵی ١٩٥٦ (تسوية) چووە زەڵم.

# یەکەم کۆسپی ژیانم

کە تەمەنم چوار ساڵ بوو کەوتمە ناو ئاگرەوە، هەموو گیانم سوتا و خوا بەلوتفی خۆی رزگاری کردم، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بوو ماڵی باپیرم گوێزیان دەتەکاند، بە لقە وشکەکانی دارەکە ئاگرێکیان کردبۆوە زۆر گەورە بوو، منیش چوو بوومە ناو ئاو هەموو جلەکانم تەڕ بووبوو، هاتمە لای ئاگرەکە خۆم وشك بکەمەوە، بە ڕوودا کەوتمە ناو ئاگرەکەوە، تا دەریان هێنام زۆر لە گیانم سوتا، هەشت مانگ لە جۆلانەدا بووم، کە ناوەکەیان پڕ کردبوو لە لۆکە و، بەدەرمانی ئەوکاتە تەداویان دەکردم.

هەروەها لە ساڵی ١٩٢٩ خوای گەورە دوچاری چاوئێشەی کردم بە درێژایی یەك ساڵ نەمتوانی تێر تەماشای شاخ و باخی زەڵم بکەم.

دیارە من لەو تەمەنەدا بێ گوناه بووم و هی ئەوە نەبووم سزا بدرێم، وەك خوا دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ﴾.[1]

واتە: خوا هێندەی گەردێك کە بچوکترین شتە ستەم لە کەس ناکات، وا دیارە ئەو سوتانە و چاوئێشەیە بۆ ئەوە بوو کە من هەر لەم تەمەنەوە ئامادەبم بۆ ئەوەی لە ماوەی ژیانمدا بەرگەی سزا و ناخۆشی و سەختی بگرم، بەڕاستی باوەڕ ناکەم لە سەدەی بیستەمدا کەس هەبێ هێندەی من ناخۆشی و ناهەمواری خوێندنی دیتبێ، وەك لەم یاداشتەدا بەدرێژی باسی دەکەم.

---

(١) سورة النساء: ٤٠.

# کۆچ کردنمان
# لە زەڵمەوە بۆ خورماڵ

ساڵی ١٩٣٢ز ماڵی باوکم و ماڵی مامە (عبدالقادر)م باوکی (مەعصومە)- کە دواتر بوو بە خێزانم- کۆچیان کرد لە زەڵمەوە بۆ خورماڵ، لەبەر ئەم هۆیە:

خوالێخۆشبوو (حەمیدە خان) کچی شێخ حسام الدین ئافرەتێکی بە شەوکەت و بەحورمەت و هەڵکەوتوو بوو، شێخ حسام الدین کەسی بەهاوتای خۆی نەدەزانی تا بیداتێ. ئەویش لەوپەڕی ژیانی خۆشیدا دەژیا، دیارە کچ لەم تەمەنەدا و لەم ژیانەدا پێی خۆشە شوو بکات.

قادر بەگ یەکێك بوو لە بەگەکانی لهۆن و حوکمڕانی تەوێڵە بوو لەو رۆژەدا، بەدزی باوکیەوە مارەی کردبوو، پاشان کە ئاشکرا بوو بە شێخ حسام الدینی وت: ئەگەر کچەکەت کە ژنی منە بەڕەزامەندی خۆت نەمدەیتێ، شەوێك کۆمەڵێك لەگەڵ خۆم دەهێنم و بەزۆر دەیبەم بۆ تەوێڵە، ئینجا شێخ حسام الدین فەرمانی دا بە باوکم و مامم کە شەو بچنە باخە کۆن و حەمیدە خان بەدزییەوە بهێنن بۆ زەڵم، لەماڵی باپیرم بێت، بۆ ئەوەی قادر بەگ توشی گێچەڵیان نەکات، ئەوانیش فەرمانەکەی شێخیان جێبەجێ کرد.

لە پاش ئەوە قادر بەگ بە عبداللە بەگی کوڕی محمود خانی وت: دەبێت تۆڵە لەو دوو پیاوە بسێنین لەسەر ئەوەی ئەو ئیشەیان کردووە، ئەوانیش ناچار بوون باریان کرد بۆ خورماڵ لەوێ دوکانیان دانا.

ماڵی ئێمە ساڵی ١٩٣٤ گەڕاینەوە بۆ زەڵم، بەڵام مامم خوالێیخۆش بێت هەر لە خورماڵ مایەوە، تا ساڵی ١٩٦٣، رۆژێك نوێژی عەسری دەکرد، تۆپی سوپای عێراق وەك گوللە دەباری بەسەر کوردا، تۆپێك دابوی بەشوێنێکی نزیکی ئەودا و شەهید بوو.

## سەرەتای خوێندنم

ساڵی ١٩٣٠ میرزا (فتح الله لهونی) کە لە (لهۆن) پیاوێکی کوشتبوو لەوێ هەڵهاتبوو بۆ ئەوەی بێت پەنا بەرێتە بەر بەگەکانی هەورامان تاکو سزای نەدەن. لەو کاتەدا لهۆن و حەسەن سانی هەر چەندە هەردووکیان هەورامی بوون، بەڵام هەردەم ناکۆکی و دوژمنایەتی لەنێوانیاندا بوو، بە جۆرێك لەهەر لایەك یەکێك شتێکی بکردایە دەچووە لاکەی تر بۆ ئەوەی پارێزگاری بکات، وەك زۆربەی عەشیرەت و تیرەکانی تری کوردستان.

میرزا فتح الله خوێندەوار بوو، قورئانی دەزانی و دەیزانی بنوسێت، لەو رۆژەدا هەر کەس کە خوێندەواری هەبوایە پێیان دەوت (میرزا)، لەبەر ئەمە بۆ یەکەمجار (حوجرە) لەدێی ئێمە دانرا و مامۆستاکەی میرزا فتح الله بوو، دێیەکەمان زیاتر لە (١٥٠) ماڵ بوو، تەنیا دوو کەسی تیادابوو بتوانێت نامە بخوێنێتەوە.

یەکەمیان خەلیفە حەمە کریم بوو کە زاوای باپیرم بوو و خەلیفەی شێخ حسام الدین بوو.

دووەم کەس باوکم بوو -خوالێیخۆشبێت- کە پێیان دەوت - مەلا ئیبراهیم - یان فەقێ ئیبراهیم، کە هەتا کتێبی - جامی - لە (نحو)دا خوێندبوو، بەڵام لە ساڵی ١٩١٤ کە گرانی گەورە پەیدا بوو، لەبەرئەوەی هیچ کەس ئەرکی فەقێی لەئەستۆ نەدەگرت، وازی لە خوێندن هێنا لە هەڵەبجە و گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی، دوای ژن هێنان دەستی کرد بە کاسبی، دوکانی هەبوو شتی دەهێنا لەئێران بۆ عێراق و بە پێچەوانەوە.

میرزا فتح الله لەماڵی خۆیدا بەرگدوور بوو، جلی دەدووری و ژوورەکەی خۆیانی کردبوو بە قوتابخانە و ئێمە منالی دێیەکە نزیکەی (٢٠) کەس چوینە ئەو قوتابخانەیەوە بەپارە دەرسی پێ دەوتین.

ئەم مامۆستایە زۆر دڵڕەق بوو، هیچ کاتێك بەزەیی بە قوتابییەکاندا نەدەهاتەوە، دەرسی ئێمە قورئانی پیرۆز بوو، هەفتەی یەکەم پیتی فێرکردین (ا.ب.ت.ث.ج) و لە سەرەتای ئەم پیتانە نوسرابوو (یا الله توفیقم بدەیت یا فتاح فتحم بدەیت یا رزاق رزقم بدەیت).

مامۆستا ئەگەر هاوین بوایە باقەیەك تولە هەناری لای خۆی دادەنا بۆ ئەوەی سەر و چاومانی پێ بشکێنێ ئەگەر زوو دەرسەکە ڕەوان نەکەین، بەزستاندا مقاشێکی دەخستە ناو ئاگرەکەوە بۆ ئەوەی سور بێتەوەو دەی هێنا بەسەر دەستی ئەو کەسەدا کە زوو دەرسەکە وەرنەگرێت، یان خۆی جگەرەکێش بوو جگەرەکەی دەنا بەبناگوێی قوتابییەکەوە.

ئامۆزایەکم هەبوو خوالێخۆشبو (محمد شریف) رۆژێك دەرسەکەی باش ڕەوان نەکردبوو، مامۆستا مەلا فتح الله جگەرەکەی نا بە پەناگوێیەوە، ئەویش زیراندی و بەگریانەوە چووەوە ماڵەوە، مامە شەریفم - خوالێیخۆشبێت - تورە بوو، دەستی محمدی گرت و هات بۆ ژووری قوتابییەکان و بە میرزا فتح الله ی وت: (هەر یەرە تەلاقەم کەوتەبۆ ئەگەر ئی کوڕەم بۆ بە ئیمامی شافیعی جارێ تر نماز و وانۆ). واتە: هەر سێ تەلاقم کەوتبێ ئەگەر ئەم کوڕەم ببێت بە ئیمامی شافعی جارێکی تر ناهێڵم بخوێنێت.

وورده ورده قوتابییەکان کەم بوونەوە تا ژمارەیەکی زۆر کەم قوتابی ماینەوە، چونکە بە چوار ساڵی سوتابووم، بەرگەی مقاشەکەی مامۆستام دەگرت کە سوری دەکردەوە دەی هێنا بەسەر دەستمدا.

## مامۆستا ژن خاتوو ( ئامینە )

بەڕاستی مامۆستا ژن گەلێك لە مامۆستا دڵرەقتر بوو، هەر چەندە دەڵێن ژن دڵنەرمترە، بەڵام دیارە ئەمە هەموو ژنێك ناگرێتەوە، لە خوێندنی حوجرەدا دوو رۆژ پشوو بوو کە رۆژی سێ شەممە و هەینی بوو، لەم دوو رۆژەدا دەبوایە قوتابییەکان هەموومان بچین بۆ ناو باخەکان کوڵەدار بێنین بۆ ماڵی مامۆستا بۆ ئەوەی نان و چێشتی پێ بکەن، چونکە ئەوکاتە هیچ هۆیەکی تر نەبوو بۆ ئامادەکردنی خواردن جگە لە دار، لەبەرئەوەی هاوڕێکانی حوجرەم زۆریان لە من گەورەتر بوون، زرت و زیندوو بوون، ئەوان دار و لقە داری باش و گەورەیان دەهێنا بۆ مامۆستا ژن، منیش داری وردم کۆدەکردەوە، کاتێك کە دارەکانمان دەهێنایەوە بۆ ماڵەوە، مامۆستا ژن لەناو دەرگاکەدا رادەوەستا و لەمن توڕە دەبوو دەیوت: (چەم شۆلگاوی جارێ تەر هێزمێ وردێ باری ماڕوشا سەر و چەماترە)، واتە: چاو ڕیپۆقاوی، ئەگەر جارێکی تر دارەکانت ورد بن دەیان شکێنم بەسەر و چاوتدا. من هەردەم چاو ئێشەم لەگەڵ بوو، وەك مامۆستا ژن دەیوت، ڕیپۆقاوی بوون.

هەر چۆن بوو توانیم دوو بەش لەسێ بەشی قورئان لای مامۆستا میرزا فتح اللە تەواو بکەم.

## گیرانی ماموٚستا فتح الله

رۆژێکیان ماموٚستا دەرسی پێ دەوتین، دوو پۆلیس لە خورماڵەوە هاتن ماموٚستایان باڵ بەست کرد و بردیان بۆ خورماڵ، لەسەر ئەو تاوانەی لە لهۆن کردبووی پیاوێکی کوشتبوو (١٥) ساڵ حوکمیان دا و بەند کرا، پێش ئەوەی ماموٚستا بگیرێت من و چەند قوتابییەك مابووین، ئێمەش بێ ماموٚستا ماینەوە، بۆ ماوەی ساڵێك کەس نەبوو دەرسمان پێ بڵێت، باوکم دەچوو لە ئێران گیسك و کاوڕی دەکڕی، منی کردبوو بەشوان لەناو باخەکاندا دەملەوەڕاندن تا قەڵەو دەبوون ئینجا دەیفرۆشتن. بەم جۆرە تا ساڵی ١٩٣٣ پیشەم شوانی بوو.

# ماوەی فەقێیەتیم

# (١٩٣٤-١٩٤٦ز)



## گەڕانەوە بۆ خوێندن

ڕۆژێك چووم بۆ مزگەوت دیم دوو کوڕی گەنج هەر یەك کەوا و سەڵتەیەکی جوانیان لەبەردایە جامەدانی سەریان لە چویت دراون و ریشوەکەیان هۆنراوەتەوە بە گوڵنکەی ورد کە دەچن بەڕێگەدا گوڵنکەکان دەلەرێنەوە، منیش پرسیم: ئەم دوو کەسە چین؟ وتیان: ئەمە فەقێن، لەوکاتەدا وەك شیشێکی سورەکراو بکەن بە جەرگمدا، ئەوەندە ئازارم پێ گەیشت کە منیش بۆچی نەمخوێند تا ببم بە فەقێ.

بەگورجی گەڕامەوە بۆماڵەوە دەستم کرد بەگریان وتم: دەبم بە فەقێ، باوکم لەبەر سودی خۆی داواکەی منی بەدڵ نەبوو، چونکە دەیویست هەر شوانی بکەم، لەبەر ئەوە وتی: ڕۆڵە کەی کەڵکی خوێندنت ماوە، منیش ئەوەندەی تر دەنگم بەرز کردەوە بەقوڵپەی گریان، وتم بەباوکم: ئەگەر نەمنێریتەوە بۆ خوێندن خۆم دەدەم بەئاوەکەی زەڵمدا، ئەویش لەترسی ئەوەی کە تووشی کارەساتێك نەبم،

ژیری کردمەوەو بەڵێنی دامێ کە لەگەڵی بچم بۆ سلێمانی، ماڵی خزمێکمان هەیە، لەماڵی ئەوان بمێنمەوەو بخوێنم.

من لەسەر داواکەی خۆم سوور بووم کەهەر دەبێت بخوێنم، ئەوە بوو لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٤ لەگەڵ باوکم بە سواری هێستر چوین بۆ سلێمانی، لە خەراجیان لەکاتی پشودان بووین، هێسترەکە لەقەیەکی دا بە بن دەستمدا لە هۆش خۆم چوم، تۆزێکی مابوو بمرم. ئەم بەسەرهاتە کاری کردە سەر باوکم و دڵی نەهات لەسلێمانی بەجێم بێڵێ بخوێنم. بۆیە لەگەڵی گەڕامەوە.

## مـامۆسـتـا
## سەید عارف و ماڵی پورم


مـامۆسـتـا سەید عـارف

مامۆستا سەید عارف زانایەکی زۆر گەورە بوو، تازە ئیجازەی لای مامۆستا شێخ عمری قەرەداغی وەرگرتبوو، بوو بە مەلای خورماڵ و لەوێ مەدرەسەیەکی دانا و دەستی کرد بە تەدریس و دەرس وتنەوە، پورە رەعنام ژنی خەلیفە حەمە کریم بوو، وەك باسم کرد کچێکی هەبوو (معصومە) مامۆستا سەید عارف خوازبێنی کرد و مارەی کرد، هێشتا نەیگواستبوەوە جار جار لەگەڵ یەك دوو فەقێ لە خورماڵەوە دەهات بۆ ماڵی خەزووری.

شەوێك چووین بۆ ماڵی پورم و باوکم باسەکەی بۆ مامۆستا سەید عارف گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: دەتوانیت هەموو رۆژێك بێیت بۆ خورماڵ بخوێنیت و ئێوارە بگەڕێیتەوە؟ وتم: بەڵێ.

منیش بەیانی کراسە کۆنێکی باوکم هەبوو کردم بە دوو کەرتەوە، کەرتێکم کرد بەبەرگ بۆ قورئانەکە و دوای مامۆستا و فەقێکان کەوتم.

کاتێك چووینە خورماڵ بردمیانە حوجرەی فەقێکان، فەقێیەکی گەورەی لێ بوو ناوی (مەلا محەمەدی عەمەڵەیی) بوو وتی: رۆڵە بۆچی هاتووی؟

وتم: من خزمی ماموّستام، هاتووم بوّ خویّندن.

وتی: بەخوا بەپەرۆی قورئانەکەتدا دیارە زۆر نەگبەتیت، ئیٚستا کە رۆژی (٢٩- ٧- ٢٠٠١)ە هیٚشتا ئیٚشی ئەو قسەیە لەدڵمدا ماوە.

لە پاشدا ماموّستا هات بوّ حوجرە، بە مەلا مەحمودی سەرگەتی - کە خزمی ماموّستا بوو - وت: هەموو رۆژیٚك لەگەڵ فەقیٚ کەریم دەرسی پیٚ بڵیٚن و زۆر چاودیٚری بکەن.

ئینجا سەرلەنویٚ دەستم کردەوە بەخویٚندنی قورئانەکەم، لە هەمان کاتدا دەرسیٚکی (گوڵستان)یان پیٚ دەوتم، کە بەزمانی فارسیە، چونکە ئەوکاتە کوردەکانی ئیٚران و عیٚراقیش لە نزیکی سنوری ئیٚراندا هەر بەفارسی نامەیان بوّ یەکتر دەنوسی، هیچ کات کوردییان بەکار نەدەهیٚنا، هەروەها کوردەکانی شارەکان و مەلاکان نوسینیان بوّ یەکتر هەر بەعەرەبی بوو، دەیان وت: (العربية في الكلام كالملح في الطعام) واتە: وشەی عەرەبی لەناو ڕستەدا وەك خویٚی ناو خواردن وایە، هەموو وتاریٚك کە بڵاو دەکریٚتەوە بەعەرەبی نەڕازیٚتەوە هیچ تام و بایەخیٚکی نیە.

ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لەناو کوردا بوو بەهوّی ئەوەی هەموو میللەتیٚك بەزمانی خوّی کارەساتی نەوەکانی بنوسیٚتەوە کەئەبیٚت بەمیٚژوو، جگە لەکورد نەبیٚت کە هیچ میٚژوویەکی راست و دروستی نیە باسی گەلەکەی بکات، بەڵکو هەر دڵسۆزی بیٚگانەیە و خزمەتی بیٚگانە دەکات بەکردەوە و بەمیٚژوو، تەنانەت زۆربەی میٚژوونوسەوەکانی عەرەب و فارس و تورکن .

ساڵی (١٩٥١) لە سلیٚمانی مەلا بووم، کتیٚبیٚکی (دابەشکردنی میرات) کە پیٚی دەوتریٚت (الفرائض) یان (المواريث) دامنا و ناردم بوّ هەندیٚ لە ماموّستاکان، وتیان: زۆر جوانە و زۆر باشە، بەڵام عەیبی ئەوەیە بەکوردی داتناوە.

## کورتەیەك لە ژیانی مامۆستا سەید عارف

"**ناوی:** حاجی مەلا سەید عارف مەلا سەید ئەبوبەکر مەلا سەید گە مەلا سەید عبدالقادر مەلا سەید عبدالغفور مەلا شێخ عبدالرحمن (باوە شێخ) مەلا سید محمود مەلا سەید عبدالرحمن مەلا سەید مصطفی مەلا سەید حسن مەلا حاجی مەلا سەید عبدالکریم حسن مەلا ئەبوبکری چۆڕی. ناسراوە بە(مامۆستا مەلا ئەبوبکری مصنف)، تاریخی مردنی خۆی داناوە لە دوو بەیتە شیعردا کە ڕستەی (خیر مقدم) بەشێکە لەو دوو بەیتە تاریخی مردنی ئەم پیاوەیە. المصنف، (الپیر خضر الشاهۆیی).

**لە دایك بوون:** ١٢مولود ١٣٢٨ کۆچی.

**شوێنی لەدایك بوون:** گوندی (پێلەنگە) لە شارەزوور، خۆرئاوای شاری هەڵەبجە سەر بەپارێزگای سلێمانی- عێراق.

**دایکی:** حلیمە کچی مەلا شێخ علی سەید محمد مەلا سەید مصطفی مەلا شێخ جلال الدین ی سەرگەت لەبنەماڵەی (سبحان ئاغا)ی سەرای سوبحان ئاغا.

**خوێندنی قۆناغی منداڵی:** قورئانی پیرۆزی لە خزمەتی خاتوو حلیمەی دایکیدا خەتم کردووە.

**خوێندنی سەرەتایی:** کتێبە وردەکانی لە خزمەتی باوکی و براکانیا خوێندوە کە هەموو خوێندەوار بوون.

**پاش وەفاتی باوکی:** لە ساڵی (١٣٣٧ك) باوکی وەفات ئەکات و تەرمەکەی ئەبرێتە (ملەی مزیار) لەنێوان هانە سورە و پریسدا ئیتر ئەمیش خولیای گەڕان بۆ خوێندن ئەکەوێتە سەری.

**سوختەیی:** لەگەڵ مەلا سەید نجم الدین سەرگەتی ئەچێتە هەڵەبجە و پریس و عەبابەیلێ و بیارە و قەرەداغ و سلێمانی.

**موستەعیدی:** لە خزمەتی ئەم مامۆستا بەڕێزانە دا خوێندوویەتی:

١- مامۆستا مەلا عبدالکریم. - بیارە-
٢- مامۆستا مەلا عزیز. - پریس-
٣- مامۆستا مەلا صالحی تریفە.
٤- مامۆستا مەلا شێخ مصطفی شێخ نجیب قەرەداغی.
٥- مامۆستا مەلا شێخ نوری شێخ باباعلی تەکیەی قەرەداغ.
٦- مامۆستا مەلا سید غفور تەکیەی سید حسن سلێمانی.
٧- مامۆستا مەلا شێخ رسول هەڵەبجە.
٨- مامۆستا مەلا شێخ حیدر عەبابەیلێ.
٩- مامۆستا مەلا شێخ مارفی قەرەداغی.
١٠- مامۆستا مەلا شێخ عمری قەرەداغی.
١١- مامۆستا مەلا شێخ بابا رسول بێدەنی.

**ئیجازەی عیلمی:** دوا ماددەکان لە خزمەتی مەلا شێخ عمری قەرەداغی ناسراو بە (ابن القرەداغی) ئەخوێنێت و هەر لە خزمەتیدا ئیجازەی عیلمی وەردەگرێت.

**دووبارە ئیجازەی عیلمی:** پاش گەڕانەوەی لە سلێمانی بۆ هەڵەبجە ئەچێتە خزمەتی شێخ بابا رسول بێدەنی بۆ زیاتر زانیاری وەرگرتن ئیتر لەوێ جارێکی تر ئیجازەی عیلمی وەردەگرێت، دوای ئەوە ئەگەڕێتەوە گوندەکەی خۆیان کە (سەیدەکان)ە لە شارەزوور نزیك (دۆلاش) و (تەپە کەل).

**ئەو جێگایانەی تیا خوێندوویەتی بەگشتی:** هەڵەبجە، بیارە، پریس، عەبابەیلێ، قەرەداغ، سلێمانی، کەرکوك، خانەقین، مەریوان، موکریان، هەولێر، کۆیە.

**هاوەڵانی کاتی خوێندن و دواتر:** مەلا عبداللەی مەلا محمدی چروستانی، مەلا رحیم پەرخی، مەلا محمد بهاء الدین بیارە، ملا مارف خاوەیی، مەلا سلام پیسکەندی، مەلا محمد گەلاڵە، مەلا مارف سەرگەڵو، مەلا محسن نوشی، مەلا خالدی مفتی سنە، مەلا رحیم همزە ئاغا، مەلا شێخ نجم الدین خانەقینی، مەلا شێخ محمدی خاڵ، مەلا حسن عەبابەیلێ، مەلا محمدی دار الاحسان،

مەلا محمدی چاومار، مەلا سید احمدی شێخ الاسلامی مەریوانی، مەلا سید محمد چێشانە، مەلا محمودی عەنەب، مەلا حسن هندی، مەلا محمدی لار، مەلا سید مجیدی شانەدەری، مەلا عارف پێنجوینی، مەلا شێخ محمدی أحمد برنە، مەلا شێخ مارف نێرگسەجاڕی، مەلا فتاحی قاینەچە، مەلا قانعی شاعر، مەلا مجیدی قطب (کرکوك)، مەلا شێخ عثمان شێخ علاءالدین، مەلا شێخ جلالی ئابلاخی، مەلا سید توفیق برزنجە، مەلا مصطفی بارزانی، مەلا أسعدی محوی، ئەو بەڕێزانەی لە خزمەتیدا بەهرەمەند بوون زۆرن بەڵام چەند ناوێکیان دەخەمە بەر دیدەی خوێنەری ئازیز:

مەلا احمدی مفتی زادە، مەلا احمد و مەلا زاهد و مەلا سعدالله نووشی، مەلا محی الدین دەگاگایی، مەلا صالحی زارای، د. مصطفی زەڵمی، د.شێخ علی القرداغی، مەلا محمد امین نینوڵی، مەلا عبدالله هورایی، مەلا عبدالله هەجیجی، مەلا عبدالرحمن (کۆڵ)، مەلا احمد و مەلا هبە الله قازی پێنجوین، مەلا کریمی مەریوانی، مەلا حسن گردە زبیری، مەلا شێخ عثمان شێخ مارف نێرگسە جاری، مەلا محمود عبدالرحمن سەرگەتی، مەلا خالد خورماڵی، مەلا عبدالله پەرخی، مەلا صدیق ملا رحیم پەرخی، مەلا شێخ بابا علی شێخ عمر قرەداغی، مەلا شێخ مصطفی شێخ معروف قەرەداغی، شێخ محمد شێخ تاڵشی، مەلا جمیل بێسارانی، مەلا هادی مفتی زادە، مەلا عبدالرحمن (عەینەك)، مەلا محمدی مل چەور، مەلا کریمی سەردەشتی، مەلا محمدی دەشتی، شێخ علی قەرەداغی، سەید حسیب نجم الدین سەرگەتی، طیب مامۆستا سید عارف، مەلا سید نجم الدین تەپی سەفا، مەلا سلام مەلا عابد، مەلا سید لطیف واژە، مەلا عبدالله قەشان، مەلا صاڵحی مەلا حەسەنی هۆرینی.

**خـــێزانی:** لەبەرئەوەی شێخ حسام الدین پورزای مەلا سید ابوبکری باوکی بووە بۆتە خەمخۆری، خوازبێنی خاتوو معصومەی کچی خلیفە حمە أمینی زەڵمی بۆ کردووە.

**مەلایەتی:** هەر بەهۆی خەمخواری شێخەوە کراوە بە مەلای خورماڵ دواتر لە (تەپەی کەل) ئینجا گوڵپ.

بەڵام بەهۆی شێخانی تاڵەبانی خزمی بوون کراوە بە مەلای تەکیەی تاڵەبانی لە سلێمانی بەشێوەیەکی ڕەسمی لە ساڵی ١٩٣٨ز دا.

**وازهێنان لە مەلایەتی:** پاش وەفاتی شێخ عبدالرحمن برا گەورەکەی لە گوندی سەیدەکان بۆ سەرپەرشتی برازاکانی ئەگەڕێتەوە سەیدەکان.

**بوونەوە بە مەلا:** شێخ حسام الدین داوای لێ ئەکات بگەڕێتەوە گوندی (تەپەی کەل) لەوێ ببێتەوە بە مەلا و جوتیاریش بکات ئیتر چەند ساڵێك لەوێ بێ فەقێ ئەبێت، لەبەرئەوە دێتە خورماڵ بۆ مەلایەتی و خەریکی کشتوکاڵ ئەبێت، لە جوتیاریدا سەرکەوتوو بوو بەتایبەتی توتن کە بە هۆیەوە دەوڵەمەند بوو.

**وەفاتی خاتوو معصومەی خێزانی:** ڕۆژی ١٩٥١/١٢/٢٥ خاتوو معصومە بەسەر سکەوە لە دنیا دەردەچێت لە گۆڕستانی (بلال) لە گوندی زەڵم بەخاك ئەسپێردرێت.

**خێزانی دووەم:** لەبەر پێویستی خێزانەکەی بەناچاری لە ماوەیەکی کورتدا خوازبێنی خاتوو مەلیحە کچی شێخ مارف قەرەداغی دەکات و ئەبێتە هاوسەری و، پیشەکەی دەگوێزێتەوە بۆ سلێمانی و ئەبێت بە (امام و مدرس) لە مزگەوتی سید نوری نقیب - مزگەوتی ئەوقاف- دواتر ئەچێتە مزگەوتی خومخانە شوێنی ماموستا مەلا حمە سعید ماموستای خۆی بە ناونیشانی ئیمام و مدرس هەروەها مدرسی مزگەوتی پاشچاوش و بەتاقیکردنەوە بردیەوە.

**خانەنشین بوونی:** پاش خانەنشین بوونی لە ماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی چوار باغ ژورێك تەرخان ئەکات بۆ مەکتەبەکەی و دەرس وتنەوە بەو بەڕێزانەی کە ئەهاتنە ماڵەوە بۆ خوێندن بە خۆڕایی.

**پەیوەندی کۆمەڵایەتی:** ڕێزێکی فراوانی لەناو خەڵکدا هەبووە بۆیە دۆست و برادەری زۆری هەبووە هەمیشە دەوری قەرەباڵغ بووە دوای دەرس وتنەوە.

**نوسین و حاشیە:** حاشیەی زۆری لەسەر هەموو ئەو کتێبانە هەیە کە دەرسی تیا وتوەتەوە لە هەموو مادەکاندا.

**نووسین:** هەندێ نوسینی لە (ریاضیات) و (منطق) و (فلکیات) هەیە، لە ساڵی (١٩٥٠ز)ەوە دەستی کردوە بەحاشیە نوسین لەسەر کتێبی (الوضوح) کە کتێبی مەلا (أبوبکری مصنف) لەسەر کتێبی (محرر) نوسیویەتی، پێکهاتووە لە (٥) مجلدی گەورە، چواریان هەموو بابەتە شەرعیەکان دەگرێتەوە بەیەکەوە بەڵام جلدێکی تایبەتی بە (میراشا)ەوە کە حاجی مەلا سید عارف حاشیەی لەسەر نەکردووە چونکە دەستی نەکەوتووە، ئیتر چوار بەرگەکەی تر جگە لەبەشی عیبادات درەنگ دەستی کەوتووە هەمووی حاشیەی لەسەر کردووە بەهەمووی پێکەوە خۆی لە (١٠) جلدی گەورە دەدات.

توانای هەبووە لە نوسینی شیعر بە کوردی و بە عەرەبی و بە فارسی بەڵام زۆر کەم خۆی پێوە ماندوو کردووە لەبەر تەدریس.

**زمان:** زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی بەچاکی زانیوە دەرسی پێ وتۆتەوە.

**قورئان:** قورئانی بەتەواوی لەبەر بوو لەکاتی بەتاڵیدا دەوری ئەکردەوە.

**شەونوێژ:** زوو ئەنوست و زوو هەڵدەستا ئەی فەرموو خوا ئێمەی بۆ شەونوێژ دروست کردووە هەمیشە نوێژی دەکرد.

**شارەزایی گشتی:** لە بابەتەکانی (منطق، فلك، عقائد، فقە، نحو، صرف، بلاغە، تفسیر، حدیث)دا زۆر بلیمەت بووە حاجی مەلا رحیم پەرخی لەکاتی کێشەیەکی نحوی ئەی فەرموو ئای بۆ (سیبویە)ەکەی خۆمان (سەید عارف).

**جورئەت:** هەرگیز رازی نەئەبوو بە (أضعف الایمان) هەمیشە لەسەر ڕاستی تووشی شەڕ ئەبوو هەمیشەش سەرکەوتوو بوو.

**سەرانە:** لەکاتی فەلاحەتیدا قەت موڵکانەی نەئەدا چونکە بەناحەقی ئەزانی و چاوپۆشیشی لێ ئەکرا.

**حـــەج:** ساڵی **١٩٦٥** چووە بۆ حەج لەگەڵ جەنابی حاجی سەید أحمدی شێخ الاسلامی مەریوانی چۆری.

**گفتوگۆ:** جارێك لە کۆنگرەیەکی ئیسلامیدا لە بەغدا لەگەڵ (آیة الله محسن

الحکیم) ئەکەوێتە گفتوگۆیەکی قورسەوە لە ئەنجامدا (آیة الله) دانی پیا دەنێت و ستایشی زۆری ئەکات و عەبایەکی عەرەبی چاکی پێ ئەبەخشێت تا ئێستا لەماڵیان ماوە.

**پلەی لەناو زانایاندا:** ئەندامێکی چالاکی بزوتنەوەی زانایانی ئیسلامی بووە، بەرپرس بووە لە زۆر کێشە زانستیەکان، سەرچاوەی (فتوی) شەرعیەکان بووە.

**پەیوەندی:** بە نامە لە زۆر شوێنەوە داوای دەربڕینی رایان کردووە لەسەر زۆر شت وەك (تفسیری ئایەت) یان (شەرحی حدیث) یان مەسەلەی شەرعی یان عقائدی و شتی تر.

**حیزبایەتی:** حەزی لە حیزبایەتی نەکردووە پەیوەندی بەهیچ حزبێکەوە نەبووە رای پەسند بووە لە بزوتنەوە ئیسلامیەکان.

**دۆستایەتی تایبەت:** دۆستایەتی لەگەڵ شێخ عبدالله محمد صراف، أمجد زهاوی، ملاجمیل رۆژبەیانی، قازی ئەتروشی، قازی شێخ محمدی خاڵ، مەلا مجید قطب، علاءالدین سجادی، هادی چاوشلی زۆر بووە.

لە شەوی ٣/٢- ١٢- ١٩٧٥ لە شاری سلێمانی لە دنیا دەرچوو، ئارامگای لە گردی سەیوانە لە سلێمانی، دوو کوڕ و کچێکی هەیە: (طیب، عبدالقادر، منیرە).

**دوا وەسێت: دوا وەسێتی بۆ کاك طیبی کوڕی:**

کوڕی خۆم لەمەودوا گوێ بگرە هەوڵ بدە خاسر الدنیا و الاخرە نەبیت، من پاش مردن چاوەڕێی ئێوەم رێبازی باپیرتان مەگۆڕن سەرفراز ئەبن، ئەوا تۆم سپارد بە لوتف و کەرەمی خوا لەگەڵ باقیا (باوکت سید عارف).

مەکتەبەی سەید عارف پێکهاتووە لە کۆمەڵێك کتێبی نایابی هەمە چەشنە پڕیەتی لە حاشیەی دەست و خەتی خۆی لەگەڵ چەند کتێبێکی دەست نووسی کۆن و نوێ."(١)

---

(١) لە بنەماڵەی مامۆستا وەرگیراوە. لەبەر فەزڵی زۆری مامۆستا بەسەرمەوە، ژیاننامەکەیم بە درێژی لێرەدا باسکردووە، هەروەك چۆن بنەماڵەی بەڕێزیان بۆیان رەوانە کردووم.

## سوختەی سوختە

فەقێی مزگەوت لە پلەی خوێندەواریدا دوو جۆرن، جۆرێکیان پێیان دەڵێن: (مستعد)، ئەمانە لای مامۆستای گەورە دەخوێنن و لە پاش تەواوکردنی (نحو) و (صرف) دەچنە ئەو پلەیەوە.

جۆری دووەم پێیان دەوترێت: (سوختە): ئەمانە لە قورئانی پیرۆزەوە تا دەگەنە (الفیە إبن المالك) کە پێی دەوترێت (سیوطی) دەخوێنن، سوختە لە هەموو مەدرەسەیەکی دینیدا دەبێت وەك خزمەتکار راتبە بکات و خزمەتی موستەعیدەکان بکات و چایان بۆ لێ بنێت و قاپ و کەوچك بشوات و گسك بدات و کاتێك دەچنە دەرەوە پێڵاوەکانیان بۆ دابنێن.

دەگێڕنەوە دەڵێن: رۆژێکی هەینی مستەعدێك نەچووە بۆ نوێژی هەینی، پێیان وتووە بۆچی نەهاتی بۆ مزگەوت، وتوویەتی: سوختەکەم لێرە نەبوو پێڵاوەکانم بۆ دابنێت، ئینجا ئۆباڵ بە ئەستۆی ئەوەی ئەمەی بۆ گێڕامەوە راست بێت یان درۆ.

منیش هەرچەند خزمی تازەی مامۆستا بووم و نان و ئاویشم لەسەر خۆم بوو، کردمیان بە سوختەی سوختە، ئەگەر مستعدێك فرمانێکی بەمن ئەکرد لام وابوو ئەمە واجبی خۆمە ئەبێ بیکەم، بەمجۆرە سێ بەشی وەختەکەم بە ئیشکردن تەواو ئەبوو، بەشێکی ئەمایەوە بۆ رەوانکردنی دەرسی قورئان و گوڵستانەکەم.

لەو مەدرەسەیەدا لەگەڵ فەقێ مەحموود، کە دوایی بوو بەمەلا محمود سەرگەتی، خزمی مامۆستا سەید عارف بوو، بووین بە دوو برادەری خۆشەویست،

هەروەك لەم نامەیەدا دەردەکەوێت، دواتر بەنازناوی (بێزار)و (بێوەیی) شیعری دەنووسی، پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات ئەم شیعرەی بۆ نووسیووم:

خــامــە هەڵسـە سابنووسە نامەیێکی نازەنین
بۆ بەڕێز و بەرز و زانا خاوەنـــی اکرام و دیـن
تۆ لەجێی من ماچکە زۆر بەخۆشی و پێکەنین
ڕێز و فەزڵی بۆ بخوازە هەم بە لەش ساغ بژین
بۆ ژیــانی خۆشی ئێوە حــەمدی رب العالمین

**کاکە مصطفی گیان السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته:**

هەواڵی سەلامەتیتان ئەپرسم و لەخوا داواکارم بۆ سەربەرزی و بەختەوەریتان احترامم بۆ مامۆستا ژن و چاوی منداڵان ماچ ئەکەم، مهروبە دەستان ماچ ئەکات، نوخشـە و بەختیاریش زیاد لە دەست ماچ کردن، ئێمە چاکین و چاکی ئێوەشمان ئاواتە.

کاکە نازانم شێخ مصطفی محمود (ئەوراقەکانی) منی نەناردووە بۆ خزمەتتان؟

بچوکتان لە سید صادق
محمود عبدالرحمن الحسینی
١٩٧٧/١٠/٢٣

لەگەڵ فەقێ کەریم هەر ئیشێکیان هەبوایە لە دەرەوەی حوجرە دەهاتن بە منیان دەکرد، من دەچوومە ژووری مزگەوتەکە دەرسەکانم ڕەوان دەکرد، فەقێ کەریم دەهات لە دەرگای مزگەوتەکەوە دەوەستا، بەدەنگێکی زۆر بەرز دەیوت: مصطفی! منیش دەموت: بەڵێ، دەیوت: قوزەڵقورت، وەرە ئەو کاسەیە ببە بۆ ئاوایی پڕی دۆ بێنە، ئیتر ئەمە ڕۆژ و دوو ڕۆژ نەبوو، هەموو ئیشەکانی ناو ئاواییان بەمن دەکرد.

## ژیانم لەماڵی مامۆستا سەید عارف

لە پاش ئەوەی مامۆستا پورزاکەمی گواستەوە پێی وتم: لەمەولا تەنها سێ شەممە و هەینی بچۆرەوە بۆ زەڵم، ئیتر منیش بۆ ماوەی شەش مانگ هەر لە ماڵی مامۆستا بووم وەك کوڕی خۆی تەماشای دەکردم، خوا گیانی پاکی بە بەهەشت شاد بکات.

## ئەوانەی کە لە خورماڵ خوێندم

لەو ماوەیەدا کە لە خورماڵ بووم ئەم بابەتانەم خوێند:

**١- قورئانی پیرۆز:** جارێکی تر پیایدا چوومەوە و مامۆستاکەم فەقێ کەریم بوو کە لە پاشدا بوو بە مەلا کەریم، ساڵی (١٩٩٠) لە مەریوان کۆچی دوایی کرد لەوێ ئیمامی جومعە بوو (خوالێی خوشبێت).

**٢- تصریفی زنجانی:** ئەم بابەتە لە زانستی (صرف)ەوە وەریانگێڕاوە بۆ زمانی کوردی و بەشێوازی (لەبەر) مامۆستاکە بەفەقێکەی دەڵێتەوە.

وایان بڵاوکردبۆوە لەناو هەندێ لە فەقێکاندا هەر کەس تەماشای کتێبەکە بکات هەردوو چاوی کوێر دەبێت، لەبەرئەوە لەدوور یان لە نزیکەوە نەمدەوێرا نزیکی ئەم کتێبە بکەمەوە یان بیخوێنمەوە لە ترسی ئەوەی کە چاوم کوێر نەبێت، ئەم بابەتە مامۆستا مەلا عبدالرحمان داربەڕولەیی پێی دەوتم کەئەو لەو کاتەدا لەخزمەت مامۆستا سەید عارفدا دەیخوێند.

ئەم کتێبە هەروەك باسم کرد مامۆستا مەلا عبدالرحمن دار بەڕولەیی پێی دەوتم کە ئێستاش لە ژیاندایە خوا تەمەنی درێژ بکات، مامۆستا لە خورماڵ ئەو کتێبەکەی دەگرت بە دەستەوەو هات و چۆی دەکرد و لەناو حەوشەی مزگەوتەکەدا بۆ منی دەخوێندەوە، منیش وەك توتی بەدوای وتەکەی ئەو دەم وتەوە تا یەك دوو جار دەبوو لەبەری بکەم و هەموو ڕۆژێك دەوری بکەمەوە تا لە بیرم نەچێتەوە، بەڵام ئەوەی پێی ئەوتم (٥٠٪)م نەدەزانی باسی چی دەکات.

**٣- عواملی جورجانی لەگەڵ (أجرومیە):** ئەویش هەر لە بابەتی (نحو)ە مامۆستا مەلا صالح زارا پێی دەوتم، پێنج ساڵ پێش ئێستا لە سید صادق کۆچی دوایی کرد (خوا لێی خۆش بێت).

بۆ جاری دووەم کە چوومەوە خورماڵ تصریفی (مەلا علی)م لای مامۆستا (مەلا محمود عەنەبی) خوێند.

جاری سێیەم (سیوطی) یان (الفیە إبن مالك)م خوێند لە خزمەت مامۆستا سەید عارف دا(خوا لێیان خۆش بێت).

## کورتەیەك لەژیانی مامۆستا مەلا عبدالرحمن داربەڕوولەیی



مامۆستا
مەلا عبدالرحمن داربەڕوولەیی

"مامۆستا مەلا عبدالرحمن لە گوندی (دار بەڕوولە) سەر بەناحیەی تانجەڕۆ لە سلێمانی لە بنەماڵەیەکی جوتیار لە (١٩١٤) هاتۆتە دنیاوە. لە تەمەنی حەوت ساڵیدا دەستی کردووە بە خوێندن لە خزمەتی مەلای دێکەیان مامۆستا مەلا عبداللە، لەسەر داب و نەریتی کوردەواری ئەوکاتە کوردستانی عێراق و ئێران گەڕاوە بەشوێنی خوێندندا. بڕوانامەی زانستی لە خزمەتی مامۆستا مەلا (عنایە اللە) وەرگرتووە و لە ڕێکەوتی (١٩٤٢/١٠/١٥) بووە بە ئیمام و مدرسی مزگەوتی خانەقای مەولانا خالد لە سلێمانی.

لە (١٩٤٢/٩/٤) بەشداری تاقی کردنەوەی کۆڕی زانستی سلێمانی کردوە و بڕوانامەی دەرچوونی وەرگرتووە، بووە بە مدرس و پێش نوێژ لە مزگەوتی (شێخ حسین قازی)، لە (١٩٤٦) گوێزراوەتەوە بۆ پەیمانگەی ئیسلامی لە مزگەوتی گەورە تا ١٩٤٧.

لە پاشان بە فەرمانی وەزارەتی ئەوقاف وکاروباری ئیسلامی هەرێمی کوردستان، مامۆستا خانەنشینەکان گەڕانەوە بۆ سەر مزگەوتەکانیان، لە (١٩٩٣) تا ئێستا لە مزگەوتەکەی خۆیدا ماوەتەوە خزمەت دەکات."[(١)]

---

(١) دەقی ئەم نوسراوە لە زاری مامۆستا خۆی وەرگیراوە.

# گەڕانەوەم بۆ زەڵم

لە ساڵی ١٩٣٦ شێخ حسام الدین مامۆستا مەلا خالیدی مفتی زادەی (سنە)ی کرد بە مەلای دێی زەڵم، منیش بەیەکجاری وازم لە خورماڵ هێنا و چوومەوە زەڵم، لەوێ لای فەقێیەکانی مامۆستا دەرسیان پێ دەوتم، دێی زەڵم لەوەو پێش فەقێ و مەلای نەبوو، جۆری ژیانی فەقێیان نەدەزانی، لەبەرئەوە مامۆستا دانیشتوانی ئاواییەکەی کۆکردەوەو وتی:

ئەم فەقێیانە لەسەر ئەرکی ئێوە ئەخوێنن، نان و چێشت و شەکر و چایان لەسەر ئێوەیە، هەر یەك بەپێی توانای خۆی و هەموو ئێوارەیەك لە پاش عەسر یەکێك لە سوختەکان دەگەڕێت بە ماڵەکاندا، هەموو ڕۆژێك هەر ماڵێك یەك نانی دەداتێ، ئەوەی ئێواران چێشتی هەبێت با قاپێك بنێرێت بۆ فەقێکان، یان فەقێکان دێن دەیبەن، مانگی جارێك ئەوەی توانای هەبوو تۆزێك یارمەتیان بدات بۆ شەکر و چا.

ئەوکاتەی مامۆستا هات بۆ زەڵم دانیشتوانی دێیەکە هەمووی لە کەپردا بوون هەر کەس لە باخی خۆیدا، کە یەکەمجار سوختەکە چوو بۆ (راتبە) واتە کۆکردنەوەی نان لە ماڵان منیان لەگەڵیدا نارد بۆ شارەزایی، چووینە ماڵێك ژنێك کەناوی پورە (ئەفرۆز) بوو:

وتمان: راتبەی فەقێ رەحمەتتان لێ بێت.

وتی: مەبەستان چییە، وتم: واتە نانێك بێنە بۆ ئەم فەقێیە، ئەویش وتی: رۆڵە نانێك عەیبە، رۆیشت ئەوەی لەناو دۆڵەگەدا هەبوو هەمووی دەرهێنا و

دای بە فەقێکە، هەرچەندە وتم یەک نان زیاتر مەهێنە گوێی نەدامێ.

بۆ ڕۆژی دوایی هەمان کات چووینەوە بۆ لای پورە ئەفرۆز وتمان: ڕاتبەی فەقێ ڕەحمەتتان لێ بێ.

ئەویش توڕەبوو وتی: (خوشمە شوانە و گاوانی نیەن دێ گر وێرەگێوە مەی دێ سەرما).

واتە: خۆ ئێوە شوانی گاگەل نین هەموو ئێوارەیەك دێنە سەرمان.

دیارە ئەمجۆرە ژیانە زۆر شتێکی ناشیرینە، بەڵام لەبەرئەوەی موسڵمانەکانی ئەوناوچەیە کە فەقێیان رادەگرت زۆر بەچاوێکی ڕێز تەماشای مەلا و فەقێیان دەکرد و ئەمانەش بەهەر جۆرێك بژیانایە هەر بەڕێز و بەچاوی بەرز تەماشایان دەکردن، بەجۆرێکی وەها بڵاو بووبووەوە لەناو هەموو کەسدا کە فەقێ کاتێك دەچێت بەڕێگەدا فریشتە باڵی بۆ ڕادەخا بەسەر باڵی فریشتەکاندا دەچن بەڕێگەدا، لەبەرئەوە پێیان دەوتین (ناڵچە) نەدەن لە ژێر پێڵاوەکان با ئازار بە فریشتەکان نەگات.

جارێك مامۆستایەك لە مامۆستاکانی ئایینی کوردستان شەوی بەرات، کە هەندێ لە موسڵمانەکان وا دەزانن ساڵی دابەشکردنی موچەیە (السنة المالية)، میکائیل دێت بە ماڵەکاندا دەگەڕێت هەر کەسێك رزقی ساڵێکی تەواوی بۆ دیاری ئەکات، مامۆستا شەو لە خەویدا دەبینێت ئەوا میکائیل کە فریشتەی (ڕۆزی) بەشکردنە هات، لەناو دێکەدا هەر کەس بەشی خۆی بۆ ماوەی ساڵێك بڕیاردا، بەڵام نەهات بۆ ماڵی ئەوان. مامۆستا کتوپڕ لە پاشی خەوەکە خەبەری دەبێتەوە، مامۆستاژنی هەڵسان وتی: ئەمساڵ من و تۆ دەمرین، مامۆستاژن وتی: بەچیدا دەزانی؟ وتی: ئێستا لە خەومدا میکائیل هات بەسەر هەموو ماڵەکاندا گەڕا هەر کەسێك (ڕۆزی) خۆی بۆ دیاری کرد و چووەوە بۆ ئاسمان نەهات بۆ ماڵی ئێمە، ئەوەش مانای ئەوەیە من و تۆ دەمرین و ڕۆزیمان بەدنیاوە نەماوە، ئەو شەوە مامۆستا و مامۆستاژن لە خەفەتاندا نەنوستن، مامۆستا، مامۆستایەکی هەبوو لە دێیەکی تر بوو، مامۆستاژن پێی وت: بچۆ بۆ لای مامۆستاکەت بزانە مانای ئەم خەوە ناهەموارە چییە؟

ئەویش بەیانی زوو ڕۆیشت بۆ ماڵی مامۆستاکەی خەوەکەی بۆ گێڕایەوە.

مامۆستاکەی پێی وت: مەلا تۆ چەند ساڵە مەلایت؟

وتی: خۆت دەزانیت من نزیکەی (٢٠) ساڵە مەلای ئەو دێیەم.

مامۆستاکە وتی: (٢٠) ساڵە مەلای هێشتا نازانیت، عەقڵت بەوە ناشکێت کە رزقی تۆ و مەلا ژن و منداڵەکانت لەسەر ئاواییەکەیە، لەسەر خوا نیە، تا میکائیل بێت بۆ ماڵتان.

ئینجا مامۆستاش دڵنیا بوو و بە دڵخۆشی گەڕایەوە ئەو مژدەیەی دا بە مامۆستاژن.

لەم باسەوە وا دیارە جگە لە لایەنی ئایینی هەر شتێك باش یان خراپ ئەگەر ماوەیەك مرۆڤ لەسەری بڕوات دەبێتە عورف و عادەت و هەر کەسێك شتێك بکات بگونجێ لەگەڵ ئەم عورف و عادەتەدا بە عەیب و ناشیرین لە قەڵەم نادرێت.

بەڵام ئێستا مامۆستا و فەقێ هەر ماون، مامۆستا لەسەر موچەی میری دەژین لەجیاتی موچەی ئاوایی و سەرفیترە و زەکات، فەقێ گەڕەکەکە یان دێیەکە هەموو مانگێك هەندێك پارەیان بۆ کۆ دەکەنەوە خۆیان شت دەکڕن و چێشت و نان دەکەن، ناچنە سەر ماڵان بۆ راتبە و بۆ چێشت چونکە عورف و عادەتەکە گۆڕا. هیوادارم هەر سەرکەوتوو و پێشکەوتوو بن بۆ خزمەتی ئایین و خزمەتی موسڵمانان و گەلەکەیان.


ماموٚستا مەلا خالیدی مفتی

## ماموٚستا
## مەلا خالیدی مفتی

ماموٚستا خالید کوڕی مەلا عەبدوڵای موفتی کوڕی مەلا مەحمودی دشەییە.

ساڵی (١٣٢٣ک.م) (١٩٠٥ز) لە گوندی دشەی هەورامان هاتوٚتە دونیاوە.

سەردەمی منداڵی و خوێندنی سەرەتایی لەسنە ژیاوە، بوٚ خوێندن چەندین شوێنی کوردستان گەڕاوە، لەرواندز لەخزمەت ماموٚستا مەلا ئەسعەدە فەندیدا (ئوصولی فیقهی) خوێندووە، لەهەولێر لای مەلا فەندی خوێندوویەتی و ئیجازەی وەرگرتووە.

پاشان چوٚتە تەوێڵە و بوٚ دەرس وتنەوە، دواتر لەسەر داوای شێخ عەلی حوسامەدین هاتە دێی زەڵم، لەلایەن ئەوقافی عێراقەوە کراوەتە ماموٚستا لەپێنجوێن و بوٚ ماوەی پێنج ساڵ لەم کارەدا بەردەوام بووە، دوای بومەلەرزەکەی پێنجوێن گەڕاوەتەوە بوٚ شاری سنە و پاش کوٚچی دوایی مەلا مەحمودی مفتی برای چوٚتە جێگای ئەو و بووە بە موفتی و حاکمی شەرعی ئەو شارە.

لە (٢٦ی رەمەزانی ساڵی ١٤٠٠ک) (١٩٨٠ز) لە تاران کوٚچی دوایی کردووە و لەسەر داوایی خوٚی لەسەر کێوی بێشکوٚ لەمەرقەدی وەیسدا ناشتویانە، ماموٚستا خالید شاعیریش بوو شیعری کوردی و فارسی هەیە.(١)

---

(١) تاریخ مشاهیر کورد ٤٦٩/٢- ٤٧٠. مێژووی زانایانی کورد، مەلا تاهیر مەلا عبداللە بەحرکەیی، ٣٢٧/١. وێنەکە بەسوپاسەوە لەماموٚستا ئەحمەد نەزیری وەرگیراوە.

## خـوێندنم لە زەڵم

کاتێك گەڕامەوە دێکەی خۆمان (زەڵم) کە مەلا و فەقێی بۆ هاتبوو دەستم کرد بە خوێندنی کتێبی (أنموذج) کە لە بابەتی (نحو)وە، مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەوبەری ئەم کتێبەی پێ دەوتم، خۆشی کتێبی (شافیە)ی لای مامۆستا مەلا خالید دەخوێند.

لەو کاتەدا مەلا محەمەدێکی تەپەکوڕەییم لێ پەیدا بوو، هەردەم ئەیوت بچۆ هەنجیری وشکم بۆ بێنە، ئەگەرنا لەناو خزمەکانتا پرسیارت لێ دەکەم و نایزانی، ئەتشکێنمەوە.

ڕۆژێ بە مامۆستاکەم وت: چۆن لەدەست مەلا محەمەد قوتارم ئەکەی؟ وتی: ڕۆژێ لە هەیوانی مزگەوت، با خەڵك زۆر وەستابن، بڵێ: مامۆستا (ذکرت الله) تەرکیبی چیە؟ ئەگەر وتی (الله) مفعولە، بڵێ: کافر بوی مامۆستا، (الله) چۆن ئەبێ بە مەفعول.

بەو جۆرە پرسیارەکەم لێکرد، ئەویش وتی: (الله) مفعولە، منیش وتم: کافر بوی، خەڵکەکە بڕوایان کرد.

ئیتر لەدەستی هەنجیری وشکی مەلا محەمەد قوتار بووم.

لەپاش سێ چوار مانگ مامۆستاکەم هەڵی خەڵەتاندم، وتی: من دەچم بۆ دەرەشیشی ژوورو بۆ لای مامۆستا مەلا عبدالله دەرەشیشی، چونکە لێرە دەرسەکەم بەدڵ نیە، تۆش لەگەڵم وەرە زۆر بە باشی فێری کتێبەکانی (نحو) و (صرف)ت دەکەم.

منیش ئەوکاتە ساویلکە بووم زوو هەڵدەخەڵەتام، لەگەڵی ڕۆیشتم، لێفەکەی خۆی و لێفەکەی من بەیەکەوە بە پەتێك بەستیان بەکۆڵی منەوە، ئەویش لەگەڵ (مستعد)ێکی تر ناوەکەم لەبیر چۆتەوە، کەوتینە ڕێ، ئەوان پێشکەوتن و من لە دوایانەوە دەڕۆیشتم بەپێ، بەیانی زوو لە زەڵم دەرچووین تا گەیشتینە دەرەشیشی خواروو، ئینجا لە دەرەشیشی خواروو بۆ دەرەشیشی ژوورو، کە هەردووکیان نزیك هەڵەبجەن، ڕێگەکەی هەوراز بوو، دوو لێفەم بە کۆڵەوە بوو، زۆر ماندوو بووم، چونکە لە ڕێگە بۆ پشوو نەوەستاین، لە هەورازەکە نەمدەتوانی من بەپێی ئەوان ڕێ بکەم، بانگم کرد ماموٚستا بەجێم مەهێڵن. مەلا ئەحمەد گەڕایەوەو لێم توڕە بوو وتی: بێنە لێفەکەم خۆم هەڵی دەگرم، وتم: ماموٚستا من نەموت لێفەکەت هەڵناگرم تۆ لە وتەکەم تێ نەگەیشتیت، وتم: بەجێم مەهێڵن، ئینجا ئەوەندەی تر لێم توڕە بوو، وتی: هەتیو من تێگەیشتنم نیە؟ وتم: من وا ناڵێم.

هەر چۆن بوو گەیشتینە دەرەشیشی ژوورو، سێ چوار مانگ لەوێ خوێندم، (أنموذج)ەکەم تەواو کرد، بەڵام ماموٚستا مەلا ئەحمەد زۆر ماندووی کردم، دەیوت کە ڕاتبە دەکەیت ڕوو نەکەیتە ئەو ژنە کە نانەکەت دەداتێ، چونکە تەماشای کراسەکەشی بکەیت زەینت کوێر دەبێت، منیش کە دەموت ڕاتبەی فەقێ ڕەحمەتی خواتان لێ بێت، ئەو ژنە یان ئەو کچە نانەکەی بۆ دەهێنام پشتم لێ دەکرد و دەستم دەبرد لە پشتەوە نانەکەم لێ وەردەگرت، زۆر جار ژنەکان توانجیان لێ دەگرتم و دەیانوت فەقێ بۆچی پشتمان تێدەکەیت؟

زۆر جار سەعاتێکی دەما بۆ نوێژی بەیانی دەیبردم بۆ مزگەوت دەستنوێژی پێ دەگرتم و شەونوێژی پێ دەکردم، بەڵام خۆم لەم ماموٚستایە رزگار کرد کە خەریك بوو لەجیاتی ئەوەی بمکات بە مەلا بەرەو دەروێشی و سۆفێتی دەبردم، من بۆ خوێندن ڕۆیشتبوم کە ئەوە خێرترە.

کاتێك گەڕامەوە زەڵم ئەم ماموٚستایەم نەبینیەوە تا ساڵی ١٩٤١ کەدواتر باسی دەکەم.

لە ساڵی ١٩٣٧ گەڕامەوە بۆ زەڵم دەستم کرد بە کتێبی (إظهار) لای ماموٚستا (مەلا سەید رحیمی خانەگایی)و تەواوم کرد، بەڵام لەوێش زۆریان

ئازاردام، من سوختە نەبووم بەڵام هەر ئیشێکیان ببوایە بەمنیان دەکردو دەیانناردم بۆ ماڵان، چونکە دانیشتوانی دێیەکە هەمووی خزمم بوون نیوەی لە باوکەوە، نیوەکەی تر لە دایکەوە.

## سکەڵفو (پشکۆ)
## لەگەڵ شا هەنجیری وشک

شەوێك لە حوجرەی فەقێکان کە دوو قات بوو دانیشتبووین، فەقێکان لە قاتی دووەم دادەنیشتن، وتیان بایاری سکەڵفو بکەین، پشکۆیەکی گەورەیان کرد بەدەرزی یەکداو دەزوویەکیشیان کرد بەکونی دەرزیەکەدا بەستیان بەبنمیچی ژوورەکەوە، هەموومان چوار دەورمان دا، هەر کەس بەتوندی فوی لێ دەکرد دەچوو بەرووی ئەوی تردا، منیش لەلای پەنجەرەکەوە دانیشتبووم، کۆتایی پاییز بوو پەنجەرەکە کرابووەوە، کە سکەڵەکە هات بەرووی مندا خەریك بوو لە دەم و چاوم بدات، چوومە دواوە، بیرم نەبوو کە من لە نزیکی پەنجەرەکەدام، ئەوەندە توند چوومە دواوە کەوتمە خوارەوە، لە خوارەوەیش هەمووی بەرد بوو، لەهۆش خۆم چوو بووم، ئینجا فەقێکان هەموو هاتنە خوارەوەو هەڵیان گرتم، ماڵی (خاڵە صادق)م خوالێی خۆشبێت لەوێوە نزیك بوو بەچوار دەستە هەڵیان گرتم بردمیانە ماڵی ئەوان.

ئینجا هۆشم هاتەوە بەرخۆم، لەبەر ئازار دەستم کرد بەهاوار کردن و هەموویان سەریان سوڕمابوو کە چۆن نەمردووم، دەیان وت ئەمە فریشتە باڵی خستۆتە ژێری بۆیە قاچ و دەست و سەری نەشکاوە، ماڵی خاڵم شاهەنجیری وشکی زۆریان هەبوو، ئەوکاتە کە هەنجیر وشك دەکراو دەیانکردە مەشکە، خاڵم وتی: مەشکەیەك بێنن بیشکێنن بۆ فەقێکان، ئەوان دەستیان کرد بە هەنجیر خواردن و پێکەنین، منیش لەبەر ئازاری خۆم هەر ناڵە و دادم بوو.

ئینجا بەم بۆنەیەوە باسی هەندێك یاری فەقێتان بۆ دەکەم.

## یاری فەقێ [١]

ئێمە ئەمانەوێ لەم باسەدا ئەم یاریانە بخەینە ڕوو وەك كەلەپورێكی میللی و بەشێكی فۆلكلۆری كورد.

یاریەكان زیاتر لە رۆژانی جومعە و سێ شەممە و شەوانی ڕەمەزان دەكران.

**یـــاریەكانی شـــەو:**

١- موسا و فیرعەون.

٢- گەنم گەنم.

٣- فڕی فڕی قەل فڕی.

٤- تەقیلە لەسەر تەقیلە.

٥- میر و گزیر یاخو پاشا و وەزیر.

٦- فەنە بێ دەنگە.

٧- تەڕكی ژێر عەبا (تەڕكی بن بەڕێ).

٨- یاپراخە دوو دوو.

٩- گۆرەوی بازی یاخود كلاوێن یان كەوشێن.

١٠- گەڕەلاوژە.

---

(١) گۆڤاری كاروان، ژمارە:٧٧، ١٩٨٤/١٠/٢٢، ل: ٨٧- ٩٦، نوسینی: مامۆستا ئیسماعیل جاف.

١١- گایەکم هەیە دەیفرۆشم.

١٢- سکڵ پف.

١٣- راوە ژیژك.

١٤- هەر کەسێ کاری خودەش باری خودەش.

**یاریەکانی رۆژ مەیدانێکی پان و بەرینی دەویست بۆیە دەچووینە دەرەوەی ئاوەدانی:**

١- سێ باز.

٢- کەوشەك یاخود یەك باز.

٣- جوغزێن.

٤- تۆپ قاڕ یاخود قەلە مردارە.

٥- گورزە کوێرە.

٦- گورز و بن مێخ.

٧- گۆشتی قەڵەو.

٨- کڵاو فڕکێنە.

٩- کێل و بەرد.[1]

---

(١) مانای ئەم یاریانە هەموویان مامۆستا اسماعیل جاف بەدرێژی باسی کردووەو لە گۆڤاری کاروان بڵاوکراوەتەوە لەسەرچاوەی باسکراو، لێرە بواری ئەوە نیە باسیان بکەین بەدرێژی.

# بــووك و تەپاڵــە

عورف و عادەتی ژن هێنان ئەوکاتە بەو جۆرە بوو، لە پاش خوازبێنی و مارەکردن ڕۆژێك دادەنرا بۆ ئەوەی بکرێت بە زەماوەند بۆ گواستنەوەی بوکێ، لە نزیك ماڵی زاوا شوێنێکیان دادەنا تەخت و ڕێك و پێك دەکرا پێیان دەوت (زەماوەندگا)، ئەیان نارد لە دێیەکانی تر پیاوێك بێت بۆ شمشاڵ لێدان، ئەم شمشاڵە نزیکەی نیو مەتر دەبێ و چەند کونێکی لەسەرە لەکاتی فووکردن بە شمشاڵەکەدا دەست دەخاتە سەر کونەکان دەنگێکی خۆشی لێ پەیدا دەبێت، ئینجا لەوێ چەند گەنجێك هەبوون کە کۆیان دەکردنەوە بۆ گۆرانی وتن و هەڵپەڕکێ، کە لە سێ ڕۆژەوە بەردەوام دەبوو بۆ حەوت ڕۆژ، بەپێی پلە و پایەی زاواکە و دەسەڵاتی، ئینجا بوکێش جلی بۆ دەکرا لە قوماشێك پێی دەوترا (خامەك)، هەر یەکە لە ڕەنگێك و کلاوێکی بۆ دروست دەکرا هەتا دەبوو بە یەك پارچە زیو، لە ناوەڕاستی ئەم کلاوەدا پێنج قرانیەك ئەدورا بەکلاوەکەوە پێی دەوترا - فێس- .

ڕۆژێك پێش ئەوەی ببرێت بۆ ماڵی زاوا دەست و قاچ و سەری لە خەنە دەگیرا و ڕۆژی دوایی لێ دەکرایەوە و بوکیان دەڕازاندەوە و دەچوون ئێسترێکیان دەهێنا (مەوجێکی) زەرد و سوریان پیادەدا بەسەریا و بوکێ سواری دەبوو، ژنێك لە پێشیەوە دەڕۆیشت کە پێیان دەوت - بەربووك- ئینجا ئاوێنەیەکی گەورەیان دادەنا لەسەر سەری بەرامبەر بەبووکەکە. بە ئاواییدا دەیانگەڕاند، لە هەندێ شوێن وا باوبوو هەر منداڵێك باوەشێ تەپاڵەی کۆ ئەکردەوە ئەچوون لەسەر بانەکان تەپاڵەکانیان ئەدا لە سەر و شانی بوکێ، هەتا

دەگەیشتە ماڵی زاوا بەسەدان سەلکە تەپاڵە ئەکەوت لەسەر و چاوی، ئەوەی بەشدار ببوایە لەو شاییەدا نانی ئێوارەی لەوێ دەخوارد، ئەوکاتە لەبەرئەوەی برنج کەم بوو، مەڕێك یان بزنێکیان سەردەبڕی لەگەڵ گەنمەکوتاو لێیان دەنا پێی دەوترا - کەشکەك- .

ڕۆژێك بووکیان دەبرد بۆ دوو ئامۆزای باوکم، حمە سەعید و حمە علی لەیەك ڕۆژدا، منیش وەك منداڵەکانی تر هەندێك تەپاڵەم کۆ کردبووەوە لەسەربان بیدەم بە سەر و چاوی ژنی ئامۆزاکانمدا، لەو کاتەدا (مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەوبەری) کە دەرسی (أنموذج)ی پێ دەوتم، وتی: وەرە بچینە مزگەوت دەرسەکەت پێ بڵێم، منیش زۆر پاڕامەوە کە ئەوەندەم مۆڵەت بدات تا بووکەکان ئەبەن، ئەویش بە رقا کەوت وتی: هەر ئەبێ ئێستا بچینە ژوورەوە لە مزگەوت دەرسەکەت پێ بڵێم، ئینجا کاتێ دەرسەکەی پێ دەوتم من هەر خەیاڵم لای تەپاڵەکان بوو، هیچی لێ تێ نەگەیشتم، ئێستاش ئازاری ئەوەم لەدڵدایە کە ئەو هەلەی لەکیس دام.

# ئوخـەی ئـاغارۆ

ئاغا و بەگەکانی ناوچەی هەورامان پیاوی خانەدانیان هەبوو، بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێکیان سزا و ئازاری ناڕەوایان هەبوو بەرامبەر بە دانیشتوانی دێیەکە و منداڵەکانیان، ئینجا خۆشەویستی کەم دەبووەوە بۆ ئاغا و هەردەم چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیان دەکرد کە رزگاریان بێت لەدەستی ئاغا.

لە دێی سەرگەت نزیکەی (١٥)کم دوورە لە زەڵمەوە، پیاوێك هەبوو ناوی ئەفراسیاو بەگ بوو، زۆر ژیر و دانا بوو بەڵام ئاغایەکی زۆردار بوو، کاتێك کۆچی دوایی کرد دانیشتوانی دێیەکە لە (١٥ ساڵیەوە تا ٨٠ ساڵ) هاتن بۆ پرسەکەی، لەپێش ماڵی ئەفراسیاو بەگدا چاڵێ قوڕاویان گرتبۆوە، ئینجا هەر کەسێك کە ئەچوو بۆ ئەو پرسەیە ئەبوایە هەندێ قوڕی بەسەرەوە بوایە یان بەسەر شانی و دوو سێ کەس ئیشیان ئەوە بوو هەندێك قوڕیان ئەدا بەسەری خەڵکدا ئینجا دەیان وت - ئاغا ڕۆ- لە هەمان کاتدا بەهێواشی ئەیان وت - ئۆخەی- .

(ڕۆ) پاشگرێکە بەکاردێت بۆ شتێ کە مرۆڤ پێی ناخۆش بێت بڕوات.

لەجیاتی ئەوەی (ئاغا، بەگ، خان) ئەوانەی کە گەورەی دێهاتەکانی کوردستان بوون چاك بن و کێشەکانی خەڵك چاك بکەن، بە پێچەوانەوە خراپترین شێوازی تۆقاندن و ترساندنیان بەکار دەهێنا، بۆ نمونە ئاغا بەندیخانەیەکی هەبوو لە تەویلەی ئاژەڵەکانیدا، یەکێکیان دەگرت لەوێدا هەتا بەردەبوو، یان هەبوو لێیان دەدا و بە - خولامانە-ی هەڵیان دەواسی واتە قژی سەر کە تۆزێك درێژ دەبێت دێتە پشت ملی.

# چوونم بۆ سلێمانی

بێینەوە سەر باسی خوێندنەکەم، جارێکی تر چوومەوە بۆ خورماڵ بۆ مەدرەسەکەی مامۆستا سەید عارف، دەستم کرد بەکتێبی (تصریفی مەلا عەلی) ئەم کتێبە لە بابەت زانستی (صرف)ەوەیە، لەلایەن یەکێك لە مەلا چاکەکان دانراوە کە خەڵکی شاری شنۆیە لەکوردستانی ئێران، ئەم کتێبە مامۆستا مەلا (مەحمود عەنەبی) بەدەرس پێی وتم، کە ئەوکاتە ئەو (مستعد) بوو لای مامۆستا سەید عارف دەیخوێند و پیاوێکی زۆر زیرەك بوو، لە پاشاندا بوو بە مەلا لە هەڵەبجە دادەنیشت تا کۆچی دوایی کرد خوالێی خۆشبێت، بەینێکیش لە عەنەب مەلابوو.

رۆژێك لەگەڵ فەقێ مەحمود (مەلا مەحمود سەرگەتی) کە ئەویش خزمی مامۆستا سەید عارف بوو لە باوکیەوە، مامۆستا سەید عارف پێی وتین بچین بۆ دۆڵاش کە دێیەکە لە شارەزوور نزیکەی (٣٠)کم لە خورماڵەوە دوورە، بۆ ئەوەی کە مانگایەکیان هەبوو لەوێ بچین بیهێنینەوە، کاتێك گەیشتینە سەر جادەی ئۆتۆمبێلەکان کە لە هەڵەبجەوە دەچوون بۆ سلێمانی وتم: مەلا مەحمود بۆچی نەچین بۆ سلێمانی بۆ خوێندن خۆمان نەجات بدەین لە دەست کێچەکانی خورماڵ، چونکە ئەوکاتە خۆڵی خورماڵ نیوەی کێچ بوو، وتی زۆر باشە و من بیست فلسم پێیە، وتم: منیش (٥٠) فلسم پێیە، ئیتر بیرمان لەوە نەکردەوە دەچینە کوێ لە کوێ نان دەخۆین و بەچی دەنوین، چونکە فەقێ لەهەر کوێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بڕۆشتایە، وەك بۆ ماڵی باوکی بگەڕێتەوە ئاوا بوو، بیری لە ژیان نەدەکردەوە، جگە لەوەی بچێتە شوێنێك مامۆستایەکی باشی

دەست بکەوێت و دەرسی باشی پێ بڵێت.

لۆریەك هات دەستمان لێ ڕاگرت وەستا، وتمان: بەچەند دەمانبەیت بۆ سلێمانی؟ وتی: یەکی (٢٠) فلس ئێمەش سواری لۆرییەکە بووین بەپێوە تا گەیشتینە سلێمانی، لەوێ خۆمان کرد بە مزگەوتی (حاجی حان)دا، ئەم مزگەوتە لەلایەن حاجی ئەحمەدی (احان)ەوە دروستکراوە کەپیاوێکی دەوڵەمەند بووە و لەزەمانی بابانەکاندا لەقەڵاچوالانەوە هاتۆتە سلێمانی و ئەم مزگەوتەی دروست کردووە بۆیە بەمزگەوتی حاجی حان ناسراوە، چوینە مزگەوت نەکەس دەناسین و نەکەس دەماننناسێت، ڕۆشتین بۆ حوجرەی فەقێکان بەخێرهاتنێکی گەرمیان کردین، نان و چایمان خوارد و تێر حەساینەوە، فەقێ لەهەر شوێنێك یەکی بگرتایە خۆیان بەبرای دایك و باوکی یەکتر دەزانی و هەردەم یارمەتی یەکتریان دەدا، ئەو شەوە هەر یەکەمان لەگەڵ یەکێکی تر بە لێفەیەك نوستین و بۆ بەیانی داوای جێگەمان کرد وتیان: جێگەی یەکێکمان هەیە، فەقێ مەحمود چوو بۆ مزگەوتێکی تر و من لەوێ مامەوە، هەندێك لە کتێبەکەی تصریفی مەلا علی مابوو لەوێ تەواوم کرد.

## دەقنەی فەقێ

ئەو فەقێیانەی لە شارەکاندا بوون وەك سلێمانی هەموو پایزێك شەوێك بەکۆمەڵ بەماڵەکانی گەڕەکەکەدا دەگەڕان دەیانوت:

دەقنەی فەقێ ڕەحمەتتان لێ بێت.

مەبەست لە (دەقنە) ئەوەی کە ئەو ماڵە دەیخوات لە ئازوقەی پاییز و زستان دەبێت بەشی فەقێشی لێ بدات لە ساوەر و ڕۆن و نیسك و نۆك و زۆر جار پارە و قاورمەشی لەگەڵ بوو.

قاورمە خواردنێکە، لە سەرەتای پاییزدا ماڵە دەوڵەمەندەکان یەك دوو مەڕیان سەردەبڕی و گۆشتەکەیان هەڵدەکزاند، لە پاشدا دەیانکردە کوپەی گەورەوە و هەڵیاندەگرت، هەرجارە هەندێکیان دەردەهێنا بۆ خواردن یان بۆ ناو چێشت، چونکە ئەوکاتە (مجمدة) و (ثلاجة) نەبوو تاوەکو گۆشتیان تیا هەڵبگیرێ، ئەوکاتە گۆشتی مەڕ بەیانیان کیلۆی بە (٢٠) فلس و ئێواران دەبوو بە (١٦) فلس، چونکە دەترسان ئەگەر بمێنێتەوە بۆگەن بکات.

لە پاش ئەوەی کە دەقنەمان کرد هەندێك پارەی زیادە هەبوو، فەقێکان لەنێوان خۆیاندا بەشیان کرد، منیش بەشەکەی خۆم برد لە بازاڕ لێفەیەکم پێ کڕی.

ئیش و کاری ناو حوجرە بەسەر سوختەکاندا دابەش دەکرێت، بەمنیان وت: تۆ چا لێ بنێ و ئەم ئێوارەیەش لەگەڵ فەقێ سەعید برۆ بۆ راتبە بۆ ئەوەی ماڵەکان شارەزا بیت، ئەگەر رۆژێك فەقێ سەعید لەوێ نەبێ یان نەخۆش کەوت تۆ لەجیاتی ئەو راتبەکە بکە.

ئەو فەقێیانەی راتبەکەیان دەکرد، بەشی فەقێکانی تریان هەڵدەگرت و زیادەکەیان دەفرۆشت، بۆ شەکر و چا و ماست، ئەو رۆژە لەگەڵ فەقێ سەعید راتبەمان کرد بایی (چوار عانە) واتە (١٦) فلس نانمان فرۆشت، پارەکەمان هێنایەوە، فەقێکان سەریان سوڕما، وتیان فەقێ سەعید: بۆچی تۆ هەموو رۆژێك دوو عانەت دەهێنایەوە، لەمەدا دەرکەوت کە فەقێ سەعید هەموو رۆژێك بایی چوار عانەی دەفرۆشت و دووانی دەهێنایەوە و دووانیشی بۆ خۆی هەڵگرتووە، لەبەرئەوە راتبەکەیان دا بە من، وتیان تۆ فەقێیەکی ئەمینی.

# نەخۆشی گرانەتا

مامۆستای گەورە لە مزگەوتی (حاجی حان)، کە ناوەکەم لەبیر نەماوە، هێشتا ژنی نەهێنابوو، بەتەنیا لە حوجرەی دەرس وتنەوەدا دەنووست و لەگەڵ فەقێکانیش نان و چایی دەخواردەوە، هەر پارە و پولێکی زیادە بوایە لای ئەو دامان دەنا، لە شوباتی ١٩٣٨ مامۆستا نەخۆشی گرانەتا (تی فۆئید)ی گرت، ئەوکاتە زۆرترین کەسانێ کە ئەو نەخۆشییەیان بگرتایە پێی دەمردن، چونکە دەرمان و چارەسەرێکی وانەبوو لە نەخۆشیەکە رزگاری بکات.

دیارە ئەم نەخۆشیەش هەر کەس بچێت بەلای نەخۆشەکەدا دەیگرێت، فەقێکان نزیکی مامۆستا نەدەکەوتن و قاپ و کەوچکی خۆیان بۆ جیاکردەوە، بۆ ئەوەی تووشی نەخۆشیەکە نەبن، ئەوەی کە دەچووە ژوورەکەی خزمەتی دەکرد تەنیا من بووم.

شەوێکیان دیم مامۆستا زۆر هیلاکە و نزیکە لەوەی کۆچی دوایی بکات، منیش لەلای دانیشتبووم زۆر ترسام، چووم بەفەقێکانم وت: ئەوا مامۆستا خەریکی گیاندانە وەرن بەلایەوە، وتیا:ن ئەوە (خاوێرێیەتی) واتە ئارەق دەکات، هەر کەسێك ئارەقی بکردایەتەوە لەو نەخۆشیە رزگاری دەبوو، منیش گەڕامەوە بۆ لای مامۆستا، هێشتا هۆشی لای خۆی مابوو وتی: تۆزێك بەفرم بۆ بێنە.

کات زستان بوو، لەدەرەوە بەفرێکی زۆر باریبوو، چووم پڕ جامێك بەفرم بۆ هێنا، بەفرەکەی خوارد، ئینجا خوێنی هەڵهێنایەوە و گیانی پاکی خۆی بەخوای گەورە سپارد، لەو کاتەدا زۆر ترسام، چووم بە فەقێکانم وت: ئەوا مامۆستا مرد.

ئینجا بەتالوکە هاتن بۆ ژورەکە، لە پێش هەموو شتێکدا کلیلەکەیان لەباخەڵی کەوا و سەڵتەکەی دەرهێناو سندوقەکەیان کردەوەو، ئەو پارەیەی لای مامۆستا بوو کە هی فەقێکان بوو، دەریان هێنا، لە پاشدا کە رۆژ بووەوە بردیان بۆ خانەی ئەو دنیا.

لەپاش دوو رۆژ، باران دەباری، راتبەم دەکرد، کە لە راتبە گەڕامەوە لەرزم لێ هات، بەشێوەیەکی وەها بەهیچ شتێك گەرمم نەدەبوومەوە، لەهۆش خۆم چوم، بۆیان دەرکەوت توشی گرانەتا بووم. هەر ئەو شەوە فەقێکان عەرەبانەیەکیان گرت، چونکە ئوتۆمبێل نەبوو، بردمیان بۆ نەخۆشخانە.

لە پاش هەفتەیەك هۆشم هاتەوە بەسەر خۆمدا، ئەبینم وام لە نەخۆشخانە، توکی سەرم هەمووی هەڵ وەریوە، باوکم (خوالێی خۆشبێت) لەگەڵ پیاوێکی تر لە دێکەمان بەسەرمەوە ڕاوەستابوون. پزیشکی نەخۆشخانەکە خەریك بوو دەرمانی دەدامێ وتی: غەم مەخۆ کفنەکەت دڕی، واتە نامری و چاك دەبیتەوە.

لەپاش ئەوە سێ هەفتە لە نەخۆشخانە مامەوە، دوایی هاتمە دەرەوە، چوومەوە مزگەوت سەیرم کرد جێگەکەمیان داوە بەیەکێکی تر، منیش لێفەکەم و کتێبەکەم هەڵگرت چووم بۆ مزگەوتی (قامیشان) لەلای مەلا (عبدالرحمن سەردەشتی) جێگەم خواست و جێگەی پێدام.

مزگەوتی (قامیشان) مامۆستای نەبوو، مەلا (عبدالرحمن سەردەشتی) لەوێ دەیخوێند دەچووە لای مەلاکانی تر دەرسی دەخوێند، لەوێ لای ئەو دەستم کرد بەکتێبی (الصمدیة) کە ئەمەش لەبابەتی زانستی (نحو)ەوە دانراوە، کتێبێکی زۆر نایابە، لای ئەم مامۆستایە کتێبەکەم تەواو کرد و دەستم کرد بە خوێندنی (وضع واستعارة)، بەڕێوەبەری مزگەوت و مەدرەسەکە ناوی شێخ محەمەدی گوڵان بوو، ئەویش ژورێکی هەبوو لەمزگەوتەکەدا، رۆژانە لەوێدا زۆرترین کاتی بەنووسین بەسەر دەبرد.

# عەبابەیلێ

جارێکی تر گەڕامەوە چووم بۆ عەبابەیلێ (ئەباعوبەیدە) لەوێ کتێبی (جامی)م خوێند، عەبابەیلێ دێیەکی زۆر خۆشبوو لە بەرزاییەکدا، بەسەر هەڵەبجە و شارەزووردا دەیڕوانی، ئەوکاتە لەوێ مامۆستای گەورە، مامۆستا (شێخ بابا رسول) و مامۆستا (مەلا حەسەن) بوون.

ئەم دێیە بەناوی ئەبو عوبەیدەی ئەنصاری ناونراوە کە گوایە کاتی خۆی هاتووەتە عێراق بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام لەوێ شەهید کراوە یان کۆچی دوایی کردووە، گۆڕێکی گەورە گومەزێکی لەسەر بوو دەیان وت ئەوە گۆڕی ئەبو عوبەیدەیە. بەڵام من لام وایە ئەمە زۆر دوورە لە راستیەوە، چونکە مێژووی ئیسلام ئەوەی تیا نیە کە (صحاب)یەکی وا گەیشتبێتە ئەوێ.

دوای ماوەیەك جارێکی تر گەڕامەوە خورماڵ، لەوێ کتێبی (سیوطی) شەرحی (الفیه إبن مالك)م لای مامۆستا سەید عارف خوێند، لە پاشان چووم بۆ بیارە کە مامۆستا (مەلا عبدالکریمی مدرس) لەوێ مەلا بوو، (مەلا حەمەئەمینی کانی سانانی) لای مامۆستا دەیخوێند، من و خوالێخۆشبوو کاك فاتح کوڕی مامۆستا مەلا کەریم، کتێبەکانی (سەید عبدالله ی صەرفی) و (عبدالله یەزدی)مان لای ئەو تەواو کرد، ئەمە لە هاوین و پاییزی ساڵی ١٩٤١ بوو، ئەوکاتە مەدرەسەکەی مامۆستا مەلا عبدالکریم هەروەك کۆلیجێکی شەریعەی ئێستا وابوو.



## تـەوێـڵـە (١٩٤١)

پاش ئەوەی لەبیارە لای ماموٚستا (مەلا حمە ئەمین کانی سانانی)، کتێبەکانی (سەید عبداللە صەرفی و عبداللە یەزدی) هەردووکم تەواو کرد، لەساڵی ١٩٤١ چووم بۆ تەوێڵە.

تەوێڵە شارێکی زۆر گەورە و خۆشبوو، هەرچەند پێیان دەوت دێی تەوێڵە، بەڵام بەڕاستی شارێکی تەواو بوو، لە شوێنێکی بەرزایی دا بوو، خانوو لەسەر خانوو، باڵەخانە لەسەر باڵەخانە، لە دوورەوە تەماشات دەکرد وات دەزانی هەمووی پلیکانەی یەك لەسەر یەك بەرەو ژوور رۆیشتووە، دەتوت تۆپە چیتی رەنگاوڕەنگە لە دوکانی بازرگان هەڵچنراوە.

ئەم شارە وەك هاوینەهەوار وابوو، بەتایبەتی لە پشتیەوە نزیکی سنووری ئێران شوێنێك هەیە پێی دەوترێت (ئاوێسەر) بەهەشتێکە بۆ خۆی بەڕووی زەمینەوە.

دانیشتوەکانی (بە ژن و پیاوەوە) باڵایان ئەتوت شمشاڵە، ڕەنگ و دیمەنیان ئەتوت خوێن و بەفرە تێکەڵ کراوە، ڕەوشتە جوانەکانیان وەك ڕەوشتی فریشتەی ئاسمان وەهابوو.

لە پیشەسازیدا پێشکەوتوترینی دانیشتوانی شارو دێکانی عێراق بوون، ژنیان هەردەم تەشی بەدەستەوە بوو خوری و مەرەزی ئەڕێسا بۆ مەوج و بەرماڵ و جاجم، پیاوەکان یەکێ پێڵاوی دروست دەکرد، یەکێ کڵاش، کڵاش و پێڵاوی تەوێڵە بەناوبانگ بوو، یەکێ چەقۆی دروست دەکرد، یەکێ قەڵەمبڕ، یەکێ بەرماڵی ئەکرد، یەکێ مەوج، یەکێ جاجم، یەکێ کڵاشی ئەچنی، یەکێ لۆکەی ئەکرد بە دەزوو...

بەهۆی جەنگی دووەمی جیهانیەوە گرانی بوو هەموو شت گران بوو، بەتایبەتی خواردەمەنی، بەڵام لە تەوێڵە هەستمان بەو گرانیە نەدەکرد، لەبەرئەوەی زۆرترینی دانیشتوانی دێیەکە خاوەنی پیشەسازی بوون، کڵاش و پێڵاو و چەقۆ و قەڵەم بڕی تەوێڵە بەناوبانگ بوو، هەروەك چۆن ئێستا پیشەسازی ڕۆژئاوا بەناوبانگە، ئەوکاتە لەهەر شوێنێك بتوتایە ئەمە لە تەوێڵە دروست کراوە، کڕیارەکە بەهەر نرخێك ببوایە دەیکڕی، ئینجا لەبەر ئەم پیشەسازییە و کڕین و فرۆشتنی ئەم دیوو ئەو دیوی عێراق و ئێران، دانیشتوانی تەوێڵە زۆریان دەوڵەمەند بوون و بە ژیانێکی باش کاتی خۆیان بەسەر دەبرد.

ئەم شارە گەورە جوانە لە ساڵی (١٩٧٩ز) ڕژێمی بەعس هەمووی وێران کرد، بۆ وێرانکردنی هەر باڵەخانەیەك (تی ئێن تی) بەکار هێنا.

لەپاش (٥٠) ساڵ، لە ئابی ١٩٩١ جارێکی تر چوومەوە بۆ زەڵم و بیارە و تەوێڵە، وێرانە بوون، بایەقوش تیایدا دەیخوێند، باخە جوانەکانی، ئەوەی دوور لە ئاوبوو یان وشکە یان نەماوە، ئەوەی نزیکی ئاوە بە تیزاب سوتاوە، دەتوت هیچ ڕۆژێك ئەم شارە ئاوەدانی تیا نەبووە، کەسی تیانەژیاوە، نە داری لەسەر دار ماوەو نە بەردی لەبن بەرد ماوە، ڕژێمی وڵاتان وڵاتەکەیان بەرەو پێشەوە دەبەن، بەڵام وڵاتە دواکەوتووەکان هەر بۆ دواوە دەمان گێڕنەوە.

لەو کاتانەدا ئەو وتە جوانەی کاك حەمەسەعید قەزازم بیرکەوتەوە، کاتێك دوو قوتابی کورد چووبون بۆ لای، پێی وتبوون: ((هەوڵ مەدەن خۆتان بەرز بکەنەوە لەسەر ئەرك و شانی گەلەکەتان، هەوڵ بدەن با گەلەکەتان بەرز بێتەوە لەسەر شان و ئەرکی ئێوە، من کە وەزیری ناوخۆم لەبەر ئەوەی گەلەکەم کیانێکی نیە، وەکو کرێکار وام، بەڵام کەمترین پیاو لە ئینگلیزەوە بێ گەورەترین پیاو بەپیرییەوە دەچێت، چونکە گەلەکەی کیانی هەیە)).

## خوێندنم لە تەوێڵە (١٩٤١)

مەلای ئەم شارە جوانە خوالێخۆشبوو مامۆستا (مەلا صاحب) بوو، کە داوای جێگەم لێکرد زۆر بەخۆشیەوە جێگەی پێدام، نزیکەی (١٠) فەقێی تری تیادا بوو بە (مستعد) و (سوختە)وە. فەقێکان هەموویان وەك کوڕە پاشا دەژیان لە خواردن و جلوبەرگەوە، بەهۆی یارمەتی دانیشتوانی تەوێڵەوە کە پەیوەندیان بە ئایینی ئیسلامەوە زۆر بەهێز بوو، زۆر ڕێزی مەلا و فەقێیان دەگرت، منیش لەوێ دەستم کرد بەخوێندنی کتێبی (اداب الكلنبوی).

بەڵام کەمتر لە چوارمانگ لەوێ مامەوە (لە تشرینی دووەم/١٩٤١ تا کانونی دووەم/١٩٤٢)، چونکە لەناوەندی ژیانێکی خۆشی بەدەنی و ژیانێکی تاڵی گیانیدا بووم، لەلایەن بەشی یەکەمەوە ژیانێکی شاهانە بوو، ژووری دانیشتن و خەوتن و دەرس خوێندن زۆر خۆش بوون، گەرم و گوڕ و پاك و پوختە و خاوێن بوون، مزگەوتێکی گەورەو فراوانی هەبوو بۆ دەورکردنەوە بە شەوو بەڕۆژ. بەڵام دەرسەکانم بەدڵی خۆم نەبوون، من دەمویست حاشیەکانی پێنجوێنی سەر (کلنبوی اداب) بخوێنم، مامۆستاش بەدڵی من لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی نەبوو.

## کورتەیەك لە ژیانی
## مامۆستا مەلا صاحب

مامۆستا مەلا صاحب، کوڕی نەزیری گچکەی کوڕی نەزیری گەورەیە، لە دەوری ساڵی ١٣٢٥ك -١٩٠٧ز هاتووەتە دنیا، منداڵ بوو باوکی کۆچی دوایی کرد، لە فەراژیی (هەراشی) بوو ناردیانە خانەقای (دورود)، ساڵی ١٣٣٧ك. تەصریفی زەنجانی لای مامۆستا عبدالکریم (مدرس) خوێند، پاشان چووە ناوچەی هەڵەبجە، دوایی چووە قەرەداغ لای شێخ نەجیب و شێخ مستەفا، مایەوە لەوێ تا ئیجازەی لە خزمەت شێخ نەجیب وەرگرت، ئەمجا گەڕاوە (تەوێڵە)و کرا پێشنوێژ و وتارخوێن و دەرس بێژ، ماوەیەکی زۆر خەریکی جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی بوو، لای خەڵکان و شێخەکان زۆر بەڕێز بوو، پاشان باری کرد بۆ هەڵەبجە، ساڵی ١٩٧٥ز کۆچی دوایی کرد."[١]

---

(١) علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤٥- ٢٤٦. بنەماڵەی زانیاران ٣٢٨- ٤٢٩. لە مێژووی زانایانی کورد، مەلا تاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی وەرگیراوە، ١/١-٢.

# حاشیەکانی پێنجوینی

هەروەك مەجنون شێتی لەیلا بوو، هەستی بەڕوت و قوتی و سەرما و گەرما و تێری و برسێتی نەدەکرد، منیش شێتی دوانزە عیلم بووم، بەتایبەتی حاشیەکانی قزڵجی لەسەر تەصریفی مەلا علی، حاشیەکانی مەلا عەبدورەحمانی پێنجوینی لەسەر (بورهان کلنبوی) و(کلنبوی اداب) و (جمع الجوامع) و، حاشیەکانی خەیاڵی لەسەر عەقائدی نەسەفی و، حاشیەکانی ئەبو طالب لەسەر سیوطی.

لەرێگای گەڕان بەدوای ئەم زانستانەدا زۆر لە ناوچەکانی کوردستانی ئێران و عێراق گەڕام، هەر مەلایەك ئەو حاشیانەی باش بزانیایە دەچووم بۆ لای و لە ماوەی دوانزە ساڵدا لە کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران لە تەوێڵە خۆشترم نەدی و، لە (دەگاگا) لە (ژاوەرۆ) لە ئێران ناخۆشترم نەدی، لەگەڵ ئەوەشدا تەوێڵەم بەجێ هێشت لەپێناوی ئەم حاشیانەدا چووم بۆ دەگاگا، چونکە لەوێ مەلایەکی کۆنی قەدرزانی لێبوو.

گرنگی پێدانی مەلا و قوتابی کوردستان بەم حاشیانە هەڵەیەکی زۆر گەورە بوو و نەخۆشیەکی بێ دەرمان بوو، هەر مەلایەك ئەم حاشیانەی نەزانیایە لەلای فەقێ بەمەلا لەقەڵەم نەدەدرا، هەر فەقێیەکیش لەم حاشیانەدا شارەزا نەبوایە وهەوڵی نەدایە بۆ خوێندنیان، بە تێنەگەیشتوو لەقەڵەم دەدرا، بە جۆرێکی وەها ئیش و کاری گرنگی قوتابیەکان ببوو بەوە بۆ یەکەمجار کە تووشی یەکتر دەبوون، یەکێکیان کتێبێکی دەخستە بەردەمی ئەوی تریانەوە پێی دەوت: مانای ئەو حاشیانە چییە؟ ئەگەر حاشیەکەی نەزانیایە بەچاوێکی سوك تەماشا دەکرا و میوان بووایە نانی پێ نەدەخورا و ماڵئاوایی لە فەقێکان دەکرد و ملی

دەنا بۆ شوێنێکی تر، ئەمجۆرە خوێندنە بوو بەهۆی ئەوەی کەس بیری لەوە نەدەکردەوە کە سوودی ئەم حاشیانە ئەوەیە مێشکی مرۆڤ تیژ دەکەن، بۆ ئەوەی سەرچاوە ئاینیەکان کە (قورئانی پیرۆز، فەرموودەکانی پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم)) لێی بکۆڵنەوە و لێی ورد ببنەوە بۆ ئەوەی پەیڕەوی لێ بکا بەجۆرێکی وەها سوودی هەبێت بۆ ئایینی ئیسلام و بۆ کوردی بێ کەسی سەر لێشێواو.

## بڕیاری دەرچوونم لەتەوێڵە

هەروەك باسم کرد منیش شەیدایەك بووم لەو شەیدایانەی کە عاشقی حاشیەکانی پێنجوینی بو بووم و، مامۆستا مەلا صاحب کە لە خزمەتی دا (کلنبوی اداب)م دەخوێند کتێبەکەی زۆر باش دەزانی، بەڵام لە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی حاشیەکانی پێنجوینیدا کە لەسەر ئەو کتێبە بوون بە جۆرێکی وانەبوو کە من باش تێی بگەم. لەبەرئەوە ئەو پڵاو و گۆشتەی کە لە تەوێڵە دەمخوارد هەمووی بە پشتمدا دەچووە خوارەوە هیچ تامێکی نەبوو. نزیکەی چوار مانگ لەوێ مامەوە، هەستم بە ژیانێکی تاڵ دەکرد لە ناوەندی خواردن و رابواردنی خۆش و دەرس خوێندنی ناخۆشدا، لە ئەنجامدا بڕیارمدا بڕۆم بۆ لای مامۆستایەکی باشتر، چونکە ئەمزانی پاشەڕۆژ کەس پێم ناڵێ چیت خواردوە، بەڵکو پێم ئەڵێن چیت خوێندوە.

بۆیە بڕیارمدا بچم بۆ (پاوە) بۆ لای مامۆستا مەلا (زاهید) خوالێیخۆشبێت کە مەلایەکی زۆر باش و بەناوبانگ بوو، لە حاشیەکانی پێنجوینیدا زۆر شارەزا بوو، لای مەلا محەمەدی گەڵاڵە ئیجازەی وەرگرتبوو.

کات زستان بوو، مانگی یەکی ساڵی (١٩٤٢)، ئەو ساڵە ئەوەندە بەفر باریبوو لە هەموو ڕێگە و بانێکدا نزیکی مەترێك باریبوو، لەبەر بەفر هیچ ڕەشاییەك لەسەر زەوی دیار نەبوو، بەجۆرێك یەکێك لە دانیشتوانی تەوێڵە بەهۆی ئەو بەفر بارینەوە وتی: (هەر یەرە تەڵاقەم کەوتەبۆ خوا بەشو شۆرباوێ ئاویش نەمەنێنە گردش کردێنە بەوەروە)، واتە: سێ تەڵاقم کەوتبێ خوا بەشی شۆربایەك ئاوی لا نەماوە هەمووی کردووە بە بەفر.

لەبەر ئەوە بەباشم زانی لەپێشان نامەیەك بنوسم بۆ مامۆستا مەلا زاهید، ئەگەر بەڵێنی دا جێگەم بداتێ ئەوا ئەڕۆم، ئەگەرنا چاوەڕوانی ئەکەم تا زستان تەواو ئەبێ و ئەچم بۆ جێگایەکی تر.

ئەوکاتە هەمووی دوو سێ مانگ بوو وەزعی ئێران تێکچوو بوو، لەبەرئەوەی ئێران لایەنگری ئەڵمانیا بوو، بۆیە کۆماری شورەوی (الاتحاد السوفیتی) لای باکوری ئێرانی داگیر کرد و ئینگلیزیش ناوەڕاست و خوارەوەی داگیر کردبوو، ڕەزا شای پەهلەوی کە شای ئێران بوو دەست بەسەریان کردبوو بردبوویان بۆ دەرەوە، ئینجا ڕێگای سنورەکان بەڕەڵا بوون، کوردی عێراق و ئێران بەئازادی هاتو و چۆیان دەکرد، هەردەم کاروان هەبوو لە نێوان تەوێڵەو پاوەدا، پیاوێکی کاروانچی بەڵێنی پێدام نامەیەکم بۆ ببا و وەڵامەکەیشی بهێنێتەوە.

## نامەکەی مەلا زاهید

شەوی سێ شەممە بوو، چاییمان لێنابوو، گیزەی سەماوەر ئەهات، دەماغم جۆشی سەند، دەستم دایە قەڵەم و نامەیەکم بەفارسی نووسی بۆ مامۆستا مەلا زاهید لە پاوە، داوام لێکرد کە جێگەم بداتێ بچم لەلای بخوێنم، نامەکەم خستە ناو زەرفێکەوە، هێشتا سەرم چەسپ نەکردبوو لەبەردەمی خۆم دانابوو، کلۆ شەکرمان لەسەر زەرفەکە دانابوو چای دیژلەمەمان دەخواردەوە، لەو کاتەدا مامۆستا مەلا صاحب خۆی کرد بە ژووری فەقێکاندا، منیش کە لەلای سەرەوە دانیشتبووم، هەڵسامەوە شوێنەکەی خۆمم بۆ چۆڵ کرد و فریا نەکەوتم نامەکە هەڵگرم، ئەویش کاتێك لە جێگەکەی من دانیشت نامەکەی لەناو بەرگەکەی دەرهێناو خوێندیەوە و خستیەوە جێگای خۆی، پاش ئەوەی چاییەکی خواردەوە، چووە دەرەوەو بانگی کردم، وتی: من بەچاوی فەقێ تەماشای تۆ ناکەم، بەڵکو وەك برا یان کوڕی خۆم تەماشات دەکەم، لەبەرچی دەچیت بۆ پاوە؟

دیارە ناتوانم بڵێم لەبەر ئەوەی تۆ وەکو من دەمەوێ پێنجوێنیەکان نازانی، بۆیە ئەوەندە شەرمەزار بووم، بەو زستان و سەرمایە ئارەقم دەردا، چونکە ئەمزانی مامۆستا زۆر ڕێزم دەگرێت، بۆیە بە زمانێکی لاڵ و ڕویەکی زەردەوە داوای لێبوردنم لێی کرد و بەڵێنم پێدا هەر لە خزمەتی ئەوەدا بم و بمێنمەوە.

## ڕۆیشتنم بۆ پاوە

دوای دوو هەفتە دووبارە کەوتمەوە ماخۆلانی حاشیەکانی پێنجوینی، هەردەم بەخۆمم دەوت: مصطفی تۆ بۆ گۆشت و چێشت خواردن هاتووی یان بۆ خوێندن، فەقێیەکم لابوو (کاك عبدالرحمن) کە لە نەوەی مەلای گەورە (نۆدشە) بوو دەرسی (إظهار)م پێ دەوت، وتم: کاك عبدالرحمن بڕیارم داوە بچم بۆ پاوە بەبێ جێگە خواستن، کاروانێك پەیدا بکە کە لەگەڵیان بڕۆین بۆ شارەزایی، ئەویش ڕۆیشت و هاتەوە وتی: کاروانێك سبەینێ بەیانی کاتژمێرێك پێش نوێژی بەیانی دەردەچێت، دوو پیاو دوو ئێستر بار دەبەن بۆ پاوە، وتیان پێمان خۆشە ئەگەر لەگەڵمان بێن، ئێمەش پێش خەوتن لێفە و کتێبمان پێچایەوە، کاتژمێرێك شەو مابوو چووین بۆ لای ئەو پیاوانە و، لە پێش بانگی بەیانی دەرچووین ڕووەوە پاوە، تاوەکو نوێژی عیشا بەپێ چووین بەڕێدا، ئینجا گەیشتینە پاوە.

نێوانی تەوێڵە و پاوە بە ئۆتۆمۆبێل دوو کاتژمێر زیاتر نابێت، لەگەڵ ئەوەش ئێمە بۆ نزیکی نوێژی عیشا گەیشتینە پاوە، لەبەرئەوەی ڕێگەکە هەمووی پڕ بوو لەبەفر، کاتێك گەیشتینە ئەوێ شەوی بەسەردا هات، چووینە ماڵی برادەری کاروانیەکان، من کە نوێژی عیشام کرد نانم پێ نەخورا و نەمتوانی دابنشیم، جێگەیان بۆ ڕاخستم هەتا بەیانی هۆشم نەهاتەوە خۆم، لەبەرئەوەی ئەمە یەکەمین سەفەری ناهەموارم بوو لە ژیانمدا.



## پـــــاوە

(پاوە) لە شارە بچووك و خۆشەكانی كوردستانی ئێران بوو لە بەرانبەری (خانەگا)وە بوو، پاوە كەوتبووە رۆژهەڵات و خانەگاش كەوتبووە رۆژئاواوە، نێوانی هەردووكیان تەڵان تەڵان بوو هەمووی باخ و باخات بوو، لە رۆژهەڵاتی پاوە شاخێكی زۆر بەرز و درێژ هەبوو پێیان دەوت شاخی (شاهۆ)، كە تا بەهارێكی درەنگ هەر مێزەری بەفری بەسەرەوەبوو، لەبەر خۆشەویستی و جوانی ئەو شاخە من كوڕی چوارەمم ناونا (شاهۆ). لە بن شاخی شاهۆدا كانیاوێكی زۆر جوان ئاوی لێ هەڵدەقوڵێت، لە نزیك كانیاوەكەدا درەختێكی گەورەی (پەڵگ) هەبوو گوریس بەدەوریدا نەدەهاتەوە، ناوەكەی بۆش بوو وەك ژووری لێ هاتبوو كرابوو بەچایخانە پێیان دەوت (هەولێ)، ئەوانەی ئەهاتن بۆ سەر ئەو كانیاوە لەوێ چاییان دەخواردەوە.

لەبەر ئەو دیمەنە جوانەی شاخی شاهۆ و کانیاوەکەی هەوڵێ، مەولەوی دەفەرموێ:

سەر ئاو چون هەوڵێ مەسکەن چون پاوە
ماچی بـەهـەشـتەن بـە ڕوی دنیـاوە.[١]

واتە: کانیاوێك وەك هەوڵێ و شارێك وەك پاوە، لەبەر ئاو و هەوای دیمەنە جوانەکەی ئەڵێی بەهەشتە بەرووی دنیاوە.

دانیشتوانی پاوە بە ژن و پیاویانەوە زۆر جوان بوون، باڵا بەرز و قەد باریك بوون، بە لەهجەی هەورامی قسەیان دەکرد، ڕەوشت جوان و قسە خۆش، هەردەم بەپێکەنین و رووی خۆشەوە قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، هەرچەندە دەستکورت بوون، غەریبیان وەك هاوڵاتی خۆیان دەزانی و زۆر بەڕێزەوە تەماشایان دەکرد.

---

(١) دیوانی مەولەوی.

## دەرس وتنەوەی
## مامۆستا مەلا زاهید



بۆ بەیانی چووین بۆ حوجرەی فەقێکان، دیم ئەو مامۆستایە (مەلا ئەحمەد) کە لە زەڵمەوە بردمی بۆ دەرەشیشی ژوورو لەوێ (مستعد) بوو، زۆر بەگەرمی یەکترمان ماچ کرد و بەخێرهاتنی کردم، بەڵام دەمزانی لەدڵیدا پێی خۆش نیە سوختەکەی خۆی ببێتەوە بەهاو مستعدی، کاتێك مامۆستا مەلا (زاهید) هات

داوای جێگەم لێکرد، زۆر پیاوانە وتی: باشە، ان شاء الله وەك فەقێکانی تر لێرە هیچ کەم و کوڕیەك نابینیت لە لایەنی خوێندن و لە لایەنی ژیانەوە.

ڕۆژی دوایی نۆرە دەرسی من هات، چووم بۆ ژوورەکەی دەستم کرد بە خوێندن و خوێندنەوەی کتێبەکە، بەڕاستی مەلایەکی زۆر باش بوو، لە بابەت حاشیەکانی پێنجوینیەوە زۆر شارەزا بوو، بەڵام دەمدی هەردەم فرمێسك بەچاویدا دەهاتە خوارەوە، لە کانگای دڵیەوە ئاهێکی دەکرد و دووکەڵی جەرگ سوتاوی لە دەم دەهاتە دەرەوە، بەجۆرێکی وەها کارێکی زۆری دەکردە سەر دەرسەکەم، منیش زۆر سەرم سوڕمابوو، دوای دەرسەکە گەڕامەوە ناو فەقێکان وتم: مامۆستا چی لێ قەوماوە؟، وتیان: ژنێکی هەبوو زۆری خۆشدەویست پێش هەفتەیەك کۆچی دوایی کرد.

لەوێش دڵم هەڵکەنرا، بڕیارم دا بچم بۆ شوێنێکی تر، وتم بە کاك عبدالرحمن: من نەشارەزام، بەرەو کوێ بڕۆین؟ وتی: خاڵێکی باوکم مەلایەکی زۆر باشە تەمەنی (٧٠) ساڵە، نەوەی مەلای نۆدشەیە، زۆرترینی ژیانی لە تەدریسدا بەخت کردووە، لە دێی (دەگاگا)یە لە ناوچەی (کەلاتەرزان)، وتم: دوورە؟ وتی: بەپێ ڕۆژ و نیوێك دەبێت، منیش وتم: کتێب و لێفەکان هەڵگرە، با مامۆستا نەزانێت و ماڵئاوایی لە فەقێکان بکەین.

# شێخی نجـار

بەیانی زوو ڕووەو دێی هەجیج و دێی ڕووار گەڕاینەوە دوواوە، هێشتا بەفر زۆر مابوو، زۆربەی ڕێگەکانی داپۆشیبوو.

نزیکی نیوەڕۆ بوو گەیشتینە دێیەك وتیان ئەمە دێی (نجار)ە، شێخێکی زۆر چاك و موسڵمانی تیادایە، ئێمەش چووین بۆ ماڵی شێخ وامانزانی تەکێ و سوفی و مورید و دەروێشی هەیە، وتیان: شێخ چووە بۆ جوت تۆزێکی تر دێتەوە.



گۆڕی شێخی نجاری



**ئەو مزگەوتەی گۆڕی شێخی نجاری لێیە**

دواتر لەژووری میوان دانیشتین، پیاوێکی رووخۆشی ئێسك سوك هات و بە گەرمی بەخێرهاتنی کردین، لام وابوو ئەمە یەکێکە لە پیاوەکانی شێخ لەماڵەوە خزمەتیان ئەکات.



وتم: جەنابی شێخ لە کوێیە؟ زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: شێخ وا لە خزمەتتانا!!

هەرچەند ئێستا بیر لەو شێخە دەکەمەوە وەك خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتاب ڕەزای خوای لێبێت دێتە بەرچاوم، کە نوێنەرەکانی هەرقل و پاشای ڕۆم چوون بۆ لای بۆ (مەدینە) پرسیان کۆشکی خەلیفە لە کوێیە؟ وتیان:

کۆشکی نیە، خانووەکەی هەروەك خانووی خەڵکییە، کاتێك گەیشتنە لای ماڵەکەی وتیان ئەو ماڵە ماڵی ئەوە، لەژێر سێبەری دیوارەکەی لەسەر حەسیرێك ڕاکشابوو، نووستبوو، پاسەوان و چاودێری لا نەبوو، وتیان: ئەمە خەلیفەیە، سەرۆکی وەفدەکە سەرسام بوو وتی: (عدلت فامنت فنمت قرير العين) واتە: دادگەریت بەتەواوی کرد، ترسی گیانت نیە بەبێ خەم نوستوویت.

ئەم شێخەی (نجار) دەستی کەسی نەبڕیوە، ناوی شێخە و هیچی لە کەس وەرنەگرتووە، خۆی کاسبی کردووە و خزمەتی موسڵمانانی کردووە.

دواتر بۆم دەرکەوت کە ئەم شێخەناوی شێخ قادرە و کوڕەزای شێخ (محمد عزيز)ی (نجار)ە کە بە (شمس العارفين) ناوبانگی دەرکردووە.

لەبارەی ئەم شێخ قادرەوە دەگێڕنەوە و دەڵێن: جارێك شێخ عەلائەدین لەبیارەوە دێت بۆ سەردانی شێخ قادر لەنجار، شێخ حوسامەدین پێی دەڵێت ئاگادار بە شێخ قادر نەتخەڵەتێنێت، ئەویش زۆر سەری سوڕ دەمێنێت، ئەڵێت باشە ئەبێت شێخ قادر بۆ بمخەڵەتێنێت؟ شێخ حوسامەدین پێی ئەڵێت من نەسیحەتی خۆم پێ وتیت تۆش ئاگات لەخۆت بێت.

کاتێ شێخ عەلادین دەگاتە نزیك دێی نجار جوتیارێك دەبینێت خەریکی درەوە بانگی لێدەکات و پاش سڵاو و چاك و چۆنی داوا دەکات ماڵی شێخ قادری نیشان بدات، پیاوەکەش زۆر بەڕێزەوە بەخێرهاتنی دەکات و دەست لەدرەوەکەی هەڵدەگرێت و دەڵێت یاشێخ خۆم دێم لەخزمەتدا پیشانت دەدەم.

کەدەگەنە دیوەخان و چا و ئاو بۆ شێخ عەلادین دێنێت و دادەنیشێت ماوەیەك تێدەپەڕێت شێخ عەلادین بەپیاوەکە دەڵێت: ئەرێ ئەوە بۆ شێخ قادر دیار نیە، من لەو ڕێ دورەوە هاتووم حورمەتی میوان چۆن وا ئەبێت؟ پیاوەکەش ئەڵێت: قوربان من خۆم شێخ قادرم و وام لەخزمەتدا، ئینجا شێخ عەلادین قسەکەی شێخ حوسامەدینی بیر دەکەوێتەوە و ئەڵێت: بەخوا ڕاستی فەرموو شێخ قادر خەڵەتاندمی.

## بەرەو ڕووی پردی وەندەن

ئەو شەوە لە خزمەت شێخ بووین، زۆر قەدر و ڕێزی گرتین، بۆ بەیانی ماڵئاواییمان لێکرد و لە دێی نجار دەرچووین ڕووەو هەجیج و ڕووار ڕۆیشتین. هەتا گەیشتینە ئاوی (دواوان) کە لە خوارەوە پێی دەوترێ (سیروان)، لە پاشان پێی دەوترێ (دیالە)، کە تەماشای ئاوەکەمان کرد ڕووخانە سورە هاتبوو، ئاوەکە ناڵەناڵی دەکرد، بەتاڤگەکاندا بازی دەدایە خوارەوە، شەپۆلی ئاوەکە وەك هەڵمەتی شێر پیاوی زیاتر ئەترساند و زاڵتر ئەبوو.

وتم: کاك عبدالرحمن پردەکە لە کوێیە بۆ پەڕینەوە؟

وتی: ئەو جۆرە پردە کە تۆ دەتەوێت نیە، ئێستا دەچینە سەرەوە.

کاتێك گەیشتینە سەر پردەکە لەترساندا هەردوو ئەژنۆم وشك بوو، بینیم جۆلانەیەك لە لقەمێو دروست کراوە، دووسێ لقی مێوی گەورە لەم بەر و لەوبەری لەژێر بەردە گەورەکان چەسپ کراون و ناوەکەیان تەنراوە، دوو کەس پێکەوە هەڵناگرێ، دەبێت یەکە یەکە بەسەریدا بپەڕینەوە.

پردەکە هەروەك دارەمەیت وابوو، ئەوسا دوو داری درێژیان دادەناو بە گوریس جۆلانەکەیان لێ دروست دەکردو مردووەکەیان دەختە سەری و چوارکەس دەچوونە ژێری دەیانبرد بۆ سەر قەبران.

وتم: چۆن دەپەڕینەوە؟ وتی: من لێفەکان دەبەمە ئەوبەر، تۆش بەدوامدا وەرە.

ئەو خەڵکی ناوچەکە بوو، گورج لەسەری پەڕیەوە، منیش مامەوە و نەمدەوێرا سەرکەوم، چونکە ئەم پردە ناهەموارە بەهۆی ناڵەناڵ و هاژەی ئاوەکەو

تاڤگەکەی زۆر سامناك بوو، ئەم بەرو ئەوبەری شاخ بوو، لەبەرئەوە شوێنەکە تۆزێك تەنگەبەری بوو، ئاوەکە دەهاتەوە یەك، منیش دەستم نا بەجەرگی خۆمدا و دەستم کرد بە (أية الكرسي) خوێندن و بە گاگۆڵکێ بەسەر پردەکەدا رۆشتم، لەناوەڕاستیدا لە ترساندا (أية الكرسي)ەکەم لەبیر چووەوە، هەرچۆنێك بوو پەڕیمەوە.

لە پاشان بۆیان گێڕامەوە کە چەند کەسێك لە دانیشتوانی (نەوسود) کە جەعفەر سوڵتان حوکمڕانی دەکردن و نزیکی ئەم شوێنەیە، لەڕیش سپیەکی زانا دەپرسن کە پردی سیرات و بەهەشت و جەهەنەم چۆنە؟

ئەویش وتبووی: (پردەو سیراتێ تەخمینەش کەردێ بە پردە وەنەنیە و بەهەشتی تەخمینەش کەردێ بەدیوەخانەکەو سانیەوە، جەهەنەمیش تەخمینەش کەردێ بە مەتبخەکەو سانیەوە).

واتە: پردی سیرات وەك پردی (وەندەن) وایە، ئەو پردەی کە پیادا دەپەڕینەوە، بەهەشتیش وەك دیوەخانەکەی سان وایە، جەهەنەمیش وەك چێشتخانەکەی سان وایە.

## هـــەجـیـج

کاتێك پەڕینەوە بەبەری شارۆچکەی (هەجیج)دا ڕۆیشتین، ئەمە هەرچەندە شار نەبوو، بەڵام وەك تەوێڵە شارێکی تر بوو لە شارە جوانەکانی کوردستانی گەورە، دانیشتوانی هەجیج هەرچی شتیان بوو خۆیان دروستیان دەکرد، جلوبەرگی پیاوان لە شاڵ دروست دەکرا کە ئەویش لە ریسی بزنە مەرەز دەیانڕێسایەوە، لەلای جۆڵاوە دەیانکرد بە چۆغەوڕانك.

جلوبەرگی ژنان لە جاو دروست دەکرا، کە لۆکەیان دەڕێسا و ئینجا دەیانچنی و دەیانکرد بە جاو، لەپاشدا ڕەنگیان دەکرد و جلی ژنانیان لێ دروست دەکرد.



قاپ و کەوچکیان لە دار دروست دەکرد پێی دەوترا (دیزە) و، مەنجەڵی چێشت لێنانیان لەقوڕی سوور دروست دەکرد، پێڵاوەکانیشیان خۆیان دروستیان دەکرد.

بەمجۆرە ئەوەی کە ئێستا پێی دەوترێت (أكتفاء ذاتي) ئەو رۆژە لە شاری هەجیجدا هەبوو، هەروەك مامۆستا مەلا محەمەدی چرۆستانی شیعرێکی جوانی داناوە لەسەر هەجیج دەفەرموێ:

داکی وەتەن سوپاسی ڕەوشتی تیرەی هەجیج دەکات
رۆڵەکەم کە لە ڕێ و شوێنی منا مـابن هـەجیجی
هەر شاڵ و کلاشی وەتەنـە جـاوو و فـەرەنجی
رەنگ و جـل و خـۆراك و زمـانی هـەموو یێکن
رۆچووو[1] لە دڵی یەکـتری یـا خۆشـی میللەتێکـن
دانیشتوو لە شـاخێکی رەق و تـەق نـەزەوی و زار
سەربەست و دلێرانە ئـەژیـن بێ غەم و بـێ گار
چەن خـۆش گـوزەرانن بەبەشـی ئـاردەتو، رازی
پـولێ بـە (رەزا)[2] نـادەن و فلسـێکی بـەغازی
لۆکە و مـەرەزە و مـوو خوری یە و وردی و شازی
کۆڵـوانـەیی شـاڵی مـەرەزە و گـازرە جـیـازی
مایەی تەشی یە و خول خولەیە کەوچـك و تیرۆك
ئـــازادە لە قـەرزاریــو کومپیـالـە و چـیرۆك[3]

---

(١) رۆژوو: چونە ناو.
(٢) رەزا: شارەزا شا، ئاردەتو: ئاردی تووی وشك، غازی: مەلیك غازی.
(٣) چیرۆك: ئیمزا، مۆر.

گوێ نـــادەنە فــەنتازی[١] و چــیت و ئــاڵ و والا
گشتی وەتـەنی، پێخــەف و بــەرگ و جــل و کالا
وەختێ کەلەتەوقی سەر ئەنێن جێی شەدە[٢] ئاغا
جــاوی وەتـــەنی، داکی وەتەن هــا لــە دەماغا
نادەم کوڵەباڵی[٣] بە هــەموو شــاڵەکی تــورمە[٤]
لای من چ کەوای شــاڵی چ ســەد تاقەیی سورمە
نایێ نەفەسی قۆریــە گــیزە لــە ســەماوەر
نابینی لەبۆ خــواردنــەوەی چــایی جـــەماوەر
چایی لەهەموو ئــەرزی هــەجیج بێ سەروشوێنە
بۆیە رەنگ و روخساری هــەموو وەك پەت وخوێنە
رۆڵـەی بــەدڵی داکی وەتــەن خێـــڵی هـــەجیجە
ئیتر ئەوی بێـژێ وەتــەنیم گـــۆڕی قلیچـــــە[٥]

---

(١) فەنتازیی: کەشخەیی، مۆدە.

(٢) شەددە: مشکی.

(٣) کوڵە باڵ: جۆرە بەرگێکی کوردەواریە لە لباد دروست دەکرێت بێ قۆڵە و تا کەمەر درێژە و هەردوو شانەکەی جوتێ قۆڵی کورتی بچوکی پێوەیە بەڵام قۆڵی پیا ناکرێ.

(٤) تورمە: جۆرێکە لە قوماش.

(٥) گۆڕی: شایەن، قلیچ: قەمە.



ماموٚستا مەلا محمد چروٚستانی

## ژیانی ماموٚستا
## مەلا محمد چروٚستانی

"ماموٚستا مەلا محەمەد چروٚستانی برای ماموٚستا مەلا عبدالله ی چروٚستانی یە، کوڕی مەلا عبدالرحیمی کوڕی عومەری کوڕی شەریفی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی محەمەد ئاغای کوڕی پیرخدری شاهوٚیە، لە عەشیرەتی میرئاودەلی یە، ساڵی ١٨٩٠ز لە گوندی ئابلاغ نزیك سلێمانی هاتوٚتە دنیاوە.

لە خزمەت باوکیدا دەستی بە خوێندن کردوە، پاشان باوکی بووە بە مەلای مەجید بەگی وەسمان پاشای جاف لە هەڵەبجە، ئەویش لەوێ لەلای فەقێکان دامەزراوە، دوایی باوکی باری کرد بوٚ بەرزنجەو لەوێ کوٚچی دوایی کرد، ماموٚستاش کوٚتایی بەخوێندن هێنا.

لە گوندی سەراوی شارباژێڕ بوو بەمەلا، پاشان چووە بادین لە پشدەر، دوایی چووە ڕانیە، لەو کاتەدا خەڵکی ناوچەکە لەدژی داگیرکاری ئینگلیز بەشەڕ هاتن، ئینگلیزیش ناوچەکەی بۆمباباران کرد، لە ئەنجامدا کتێبخانەکەی مامۆستا سووتا.

ساڵی ١٩٣٢ز چووە سلێمانی، ساڵی ١٩٣٦ کرا بە مەلای مزگەوتی نەقیب. ڕۆژی پێنج شەممەی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٦٣ کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی گردی جۆگە بەخاك سپێردرا.

مامۆستا جگە لە مەلایەتی شاعیریش بووە، نازناوی شیعری (چروستانی) بوو، دیوانێکی شیعری کوردی هەیە و چاپکراوە."(١)

پیاوێکی زۆر مەرد و قسە خۆش و زانا و ڕاست بوو، هەردەم ئەوەی لەدڵیا بوو لەسەر زمانی بوو، بەبێ ئەوەی لە کەس بترسێ و زۆر عیززەتی نەفسی هەبوو، حورمەتی خۆی ڕائەگرت، وەك هەندێ کەس بەدوای درۆ و مەراییدا نەدەڕۆیشت بۆ ئەوەی دەستکەوت بۆ خۆی پەیدا بکات.

شایەنی باسە کاتێك مزگەوتەکەی لە سلێمانی تازە دەکرایەوەماڵەکەیان نزیك مزگەوتەکەی من بوو - مزگەوتی بن تەبەق- بۆ نوێژی مەغریب ئەهاتە مزگەوتەکەی من، پاش ئەوەی لە نوێژ ئەبوینەوە پێی ئەوتم: ئێوە چیتان هەیە؟ ئەگەر شتێکمان هەبووایە و ئەوان نەیانبوایە لەگەڵم دەهاتەوە، ئەگەر ئەوان شتێکیان هەبوایە و ئێمە نەمانبوایە من لەگەڵی دەڕۆشتمەوە، هەتا دەمرم خۆشی ئەو ماوەیەم لەبیر ناچێتەوە.

مامۆستا مەلا محەمەد ئێستا کوڕە گەورەکەی کەناوی کاك مەلا یەحیای چرۆستانی یە لە بەغدا دادەنیشێت، بەڕاستی لە ڕەوشت و ئایین و مەردایەتی دا جێگای باو و باپیرانی گرتۆتەوە، خوا تەمەنی درێژ بکات.

---

(١) تاریخ مشاهیر کورد ٣٩٠/٢
مێژووی ئەدەبی کوردی ٢٣٧/٦-٢٤٨.
مێژووی زانایانی کورد، مەلا تاهیر مەلا عبداللە بەحرکەیی، ١٤٢/٣.

# دێــی ڕووار



لە پاش هەجیج بەدۆڵێکی ناو شاخ و داخ و پڕ باخدا بەرەو ژوور ڕۆشتین هەتا گەیشتینە دێی ڕووار، کە پێشتر شاعیرێکی گەورە کەبەناوی مەلا خدری ڕوار ناوبانگی دەرکردووە لەوێ مەلا بووە، مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس لە زاری هەورامیەوە کتێبێکی شیعرەکانی ئەوی گۆڕیوەتە سەر زاری سۆرانی بە ناوی (اقبال نامە)چاپی کردووە.

شەو چوینە ماڵێك، شێخ معتصم کوڕی شێخ حسام الدین لەوێ میوان بوو، لە پاش نان خواردن لێی پرسین خەڵکی کوێن و بۆ کوێ دەچن؟ من وتم: خەڵکی زەڵمم و بۆ خوێندن دەچین بۆ دەگاگا، وتی: کوڕی کێیت؟ وتم: من

کوڕەزای سۆفی حەمەئەمینم، لەبەر ئەوەی باپیرم سۆفیی باوکی بوو، زۆر ڕێزی گرتم.

وتی: کەوابوو دەبێت لە گەڵمدا بێیت بۆ شاری سنە، دەتبەم بۆ لای مەلایەکی چاك، بخوێنە و هەموو ئەرکێکی خۆت و سوختەکەت لەسەر شانی من بێت.

منیش وتم: زۆر سوپاستان دەکەم، دەچم بۆ دەگاگا، ئەگەر جێگەم دەست نەکەوت دێم بۆ لای جەنابتان.

شێخ معتصم خۆی لە شاری سنە نەبوو، بەڵکو لە دێی (دێر مۆڵی) بوو، هەم شێخ بوو هەم ئاغا بوو، لە ژیانێکی زۆر خۆشدا دەژیا و ڕێزیان دەگرت، خۆشی زۆر دەوڵەمەند بوو.

ئەو شەوە لەوێ بووین بۆ بەیانی بەڕێکەوتین بەرەو دەگاگا.



## بـەرەو دەگـاگـا

دەگاگا زۆر لە (ڕووار) دوور نەبوو، بەڵام ڕێگەکە هەمووی بەفر و شاخ بوو، دەبوو بەنێو ئەو بەفرە ناهەموارەدا بڕۆین، ڕەشەبایەکی زۆر بەهێز بەفرەکەی دەدا بە رووماندا، بەڕێکەوتین، لە ڕێگە تووشی دێیەکی تر بووین نانی نیوەڕۆمان خوارد، پێیان وتین مەڕۆن ڕێگەکە زۆر سەختە و بەفرەکە زۆرە، ئێمەش بە قسەمان نەکردن.

ڕووەو کوێستانێك ڕۆیشتین کە هەورازێکی زۆر سەخت بوو، ئەو کوێستانە هاوینەهەواری دەگاگا بوو، پێی دەوترا (بوکومارانی)، سەعاتێکم پێ بوو، تەماشام کرد هێشتا کات زۆر ماوە، نەمزانی کاتژمێرەکەم نووستووە، چونکە لەبەر بەفرو سەرماکە زۆر تێکچووین، کاتێك گەیشتینە کوێستانەکە لەپڕ تاریکی کرد و شەو داهات بەسەردا و ڕێگەمان لێ ون بوو، نەمان دەزانی لە کوێوە بچین بۆ دەگاگا، دەستمان لەگیانی خۆمان بەرداو وتم: فەقێ عبدالرحمن لێفەکان لەسەر ئەم بەفرە دادەنێین و ڕووەو قیبلە ڕادەکشێین تا دوا ساتی ژیانمان لێرەدا تەواو دەبێت، هەڵبەت خوا نوسیویەتی لەسەرمان لەم کوێستانەدا کۆچی دوایی بکەین و کەس پێمان نەزانێت و دڕندە گۆشتەکەمان بخوات و کەس نەبێت بمانخاتە گۆڕەوە.

## وەڕینی سەگێك
## ئومێدی ژیانی پێداینەوە

دەستمان کرد بە پاڕانەوە لە خوای گەورە و دوعا کردن کە ئەم جارەش ڕزگارمان بکات، بەڵام خۆمان دڵنیا بووین ئەو شەوە لەوێ لەو کوێستانەدا دەفەوتێین. بەمجۆرە بۆ ماوەی (١٠) دەقیقەیەك لە ترس و لەرزدا ماینەوە، لەپڕ لە دوورەوە سەگێك دەستی کرد بە وەڕین، وەك ئەوەی یەکێك لەئاوێکدا خەریك بێت بخنکێت خوا یەکێکی بۆ بنێرێت دەستی بگرێت و گیانی ڕزگار بکات، هەروەها وەك ئەوەی خوا ناردبێتی بۆ ئەوەی بەدەنگێکی بەرز بوەڕێت و بانگی ئێمە بکات بڵێت دێیەکە لێرەوەیە، وەخت بوو لەخۆشیاندا شادی مەرگ بین.

ئینجا ڕووەو دەنگی سەگەکە ڕۆیشتین تا نزیك بووینەوە، تەماشامان کرد ئاوایی دەگاگایە، کاتێك گەیشتینە ناو دێیەکە پرسیمان بۆ ماڵی ماموٚستا، یەکێك هات لەگەڵمان تا گەیشتینە ماڵی ماموٚستا، لەوێ ماموٚستا ڕاستەوخۆ وتی: عبدالرحمن بۆچی هاتویت؟ وتی: هاتووین بۆ خزمەتی تۆ لێرە بخوێنین.

ماموٚستا بە توڕەییەوە وتی: یەکێك بەم زستانە بەشەق دەری بکەن ناچێتە دەرێ، ئێوە دەبێت شێت بوون وا کەوتونەتە ڕێ بەم بەفر و سەرمایە.

ماموٚستا بەردەوام بوو لە قسەکردندا وتی: ڕەزاشای پەهلەوی فەقێی لەبیری ئاواییەکان بردۆتەوە، نزیکەی (٣٠) ساڵە فەقێی تیا نەماوە، لەبەرئەوە ئێوە ناتوانن لێرە بمێننەوە، دانیشتوانی ئاواییەکە ناتوانن یارمەتیتان بدەن و حوجرەی فەقێیمان نیە وکەسیش ژووری زیادەی نیە تیا بحەوێنەوە.

لە پاشدا لە منی پرسی وتی: ڕۆڵە تۆ چی دەخوێنیت؟ وتم: کلنبوی بورهان دەخوێنم بە پێنجوێنییەکانەوە، مامۆستاش زۆری پێ خۆشبوو، تۆزێك ڕووناکی کەوتەوە دەم و چاوی و گرژی لە ناوچەوانی نەما، وتی: ڕۆڵە من عاشقی پێنجوینی سەر کلنبوی بورهانم، کاتی خۆی زۆر ئەم کتێبەم وتۆتەوە لەگەڵ پێنجوینیەکان، ئاواتم ئەوە بوو پێش مردنم جارێکی تر ئەم کتێبە لەگەڵ حاشیەکاندا بە دەرس بڵێمەوە، خوا ئاواتەکەی هێنامە دی.

وتی: ڕۆڵە لێرە دانیشن خوا رازقی رزقە، بە ئاواییەکە دەڵێم یارمەتیتان بدەن، بۆ حوجرەش بەتانیەکتان دەدەمێ بیبەن سوچێکی مزگەوتەکە بکەن بە حوجرە، بەبزمار بەتانیەکە هەڵواسن بەدیواری مزگەوتەکەدا بیکەن بە پەردە و لەودیوی دانیشن، بەشەویش مزگەوتەکە گەرمە و فراوانە لەکوێدا ویستتان بخەون.

ئەو شەوە لە ماڵی مامۆستا بووین، بۆ بەیانی نانمان خوارد و بەتانیەکەمان وەرگرت، وەك مامۆستا فەرمووی لەسوچێکی مزگەوتەکەدا دوو بزمارمان داکوتاو بەنێکمان پێوەبەست و بەتانیەکەمان کرد بە پەردە و ئەو دیوەکەیمان ناونا حوجرەی فەقێ.

بۆ ئێوارە یەکێك لە کوڕەکانی مامۆستا لەگەڵ فەقێ عبدالرحمن دا چوون بۆ راتبەی فەقێ، دێیەکە زیاتر لە (٢٠٠) ماڵ بوو بە هەمویانەوە (٨) کولێرەیان پێدان و ئەم کولێرانە هەموو شتێکیان تیا بوو جگە لە گەنم و جۆ، چونکە بەهۆی جەنگی جیهانی دووەمەوە گرانی بوو، دانیشتوانی دێیەکە زۆر هەژار بوون هەر بە مەڕ و ماڵات دەژیان و جێگای کشتوکاڵیان نەبوو.

بۆ سبەینێ بەیانی بۆ دەرس خوێندن چووم بۆ لای مامۆستا، کاتێك کە دەرسەکەی وتەوە هەروەك ڕووەکێك ئاوی بدەیت بگەشێتەوە مامۆستا ئاوا گەشایەوە، منیش وەك ڕووەکەکە وردە وردە گەش بوومەوە، لە خۆشیاندا هیچ ئێش و ئازاری ڕێگەم بیر نەما، لەدڵی خۆمدا وتم: خوایە لێت بەزیا بێت کە من گەیشتم بەم مامۆستایە، کە لە پێنجوینی باشتر پێنجوینیەکان دەزانێت.

ئینجا هەموو شەوێك كوڕەكەی دەنارد بۆ ئەوەی كتێبەكە ببات و دەرسەكەی ئامادە بكات بۆ ڕۆژی دوایی و خۆشی حاشیەی دەكرد لەسەر حاشیەكانی پێنجوینی و قەرەداغی، دەست و خەتی ئەوەندە جوان بوو دەتوت گەوهەرە.

بەو جۆرە سێ مانگ لە دێیەكە مامەوە، هەموو ڕۆژێك (٨) كولێرەمان هەبوو، ئێواران كوڕەكانی مامۆستا (ئەحمەد ومحی الدین) دەهاتن دوانیان دەخوارد و شەشیان دەمایەوە، ئەم دوو كوڕەی مامۆستا دواتر دوو مەلای باشیان لێ دەرچوو.

مزگەوتەكە هەموو شەوێك پڕ دەبوو لە كاروانی، بەڕۆژدا كە ڕووناكی هەتاو دەیدا لەناو مزگەوتەكە سەیری قاڵیەكان و بەڕەكانمان دەكرد وەك شارە مێرووله ئەسپێ ڕیزی بەستووەو هات و چۆ دەكات، بەشەوان جلەكانمان هەموو لەسەر ئاگری مزگەوتەكە دەتەكاند، دەنگی تەقینەوەی ئەسپێكان دەتوت گوللەیە لەسەر یەك لەڕەشاش دەرەچێت، هەموو شەوێك لە دەست ئەسپێ ئازارمان دەدی، كە ئەو كولێرە هەرزنانەشمان دەخوارد بەبێ خواردنێكی تر دەبوو بەقوڕ لەسكماندا.

ژیانەكەمان ئەوەندە تاڵ و سەخت بوو، هەموو ڕۆژێك دەموت دوای دەرسەكە دەستی مامۆستا ماچ دەكەم و ماڵئاوایی دەكەم، بەڵام كە دەرسەكەم دەخوێند ئەوەندە شیرین دەبوو هەموو تاڵیەكی لەبیر دەبردمەوە، دەموت ئەگەر ئەسپێ هەموو ڕۆژێك كیلۆیەك لە گۆشتەكەم بخوا دەست لەم مامۆستا چاكەم هەڵناگرم، یان دەمرم یان كلنبوی بورهان لای ئەو تەواو دەكەم، بەڕاستی هەر شایانی خۆی بوو كلنبوی برهان بلێتەوە، ئەچووە ناوجەرگەی كتێبەكەوە، زۆر بە وردی حاشیەكانی پێنجوێنی و قەرەداغی شی دەكردەوە.

## کورتەیەك لەژیانی
## مامۆستا مەلا قادری جلالی


مامۆستا مەلا قادری جلالی

مامۆستا مەلا قادر کەلەگوندی دەگاگا لەخزمەتیا بەشێك لەگەلەنبەوی بورهانم خوێند ناوی عبدالقادرە و کوڕی مامۆستا مەلا جەلالەدین کوڕی عەلامە مەلا عبدالرحمن نۆدشیە و شۆرەتی بنەماڵەکەشیان جەلالی یە.

ساڵی ١٢٩٠ کۆچی هەتاوی لەدێی نۆدشە هاتۆتە دونیاوە، بۆ خوێندن چەندین مەدرەسە و ناوچەی کوردستان گەڕاوە، لەوانە لەسنە و بیارە خوێندویەتی و ماوەی دەساڵ لەبیارە ماوەتەوە.

دواتر لەگوندی دەگاگا ماوەتەوە و لەجێگەی باوکی دانیشتوە و خەریکی وانە وتنەوە و قازی شەرعی بووە تا کۆتایی ژیانی هەر لەو دێیە بووە، لەپایزی ساڵی ١٣٦٤ی کۆچی هەتاوی کۆچی دوایی کردووە.[١]

---

(١) علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣١٥.
مێژووی زانایانی کورد، مەلا تاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی، ٢٣٦/٣.

# چۆن دەگاگام بەجێ هێشت؟

لەپاش بەسەربردنی سێ مانگ لەنێوان ئازاری ئەسپێ و کولێرەی هەرزنی ئاواییەکە و شیرینی دەرسەکەی مامۆستا مەلا قادر لەسەر کتێبی کلنبوی بورهان و حاشیەکانی پێنجوینی و قەرەداغی، رۆژێك وتم بە فەقێ عبدالرحمن: (پەناباد)ێکم هەیە (دەکاتە نیو قەرانی ئێرانی) بچۆ بیدە بەشتێك با بیخۆین، چوو دوو هێلکەی هێنا، ئینجا ئێمەش بیرمان لەوە دەکردەوە کە ئەم دوو هێلکەیە چۆن بخۆین، وتم: بچۆ لە ئاوایی چنگێك ئارد بێنە لەگەڵ مەنجەڵێکی بچووك، ئینجا مەنجەڵەکەمان خستە سەر ئاگرەکە، هەندێ ئاو و ئاردمان تێ کرد، ئینجا دوو هێلکەکەمان کردە ناو هەویرەکەوە کەوچکمان تێ ڕادا هەتا خەست بووەوە، ئینجا بە کەوچك تێی بەربووین لە گۆشتی کەو خۆشتر بوو لە لامان، پاش ئەوەی خواردمان وەك پارچە بەردێکی لێهات لە سکماندا کە بەهیچ شتێك نە ئەجولا، نەخۆش کەوتم، دوو رۆژ نەمتوانی دەرس بخوێنم، بەشەو و رۆژێك وەك گۆچانی گاڵ (هەرزن) چەمامەوە.

وتم: فەقێ عبدالرحمن من لەمە زیاتر ناتوانم، خۆت ئامادە بکە و بەیانی زوو بەرەو مەریوان دەڕۆین.

لام وایە دووەم مانگی بەهار بوو (نیسانی ١٩٤٢)، رۆژێك بەیانی زوو لێفە و کتێبمان دا بە کۆڵماندا و وەك هەجیجی ڕوومان کردە مەریوان، بێ ئەوەی ماڵئاوایی لەمامۆستاکەمان بکەین، چونکە دەمانزانی ڕێگەمان پێنادات بڕۆین.

# ڕووەو مەریوان

چووین بۆ مەریوان، لەهەر شوێنێك دەمان پرسی دەیان وت ژیان لێرە زۆر سەختە بڕۆن بۆ موکریان، چەند ڕۆژێك سوڕاینەوە جێگەمان بەدڵی خۆمان دەست نەکەوت.

بەیانییەکی زوو ڕووەو بانە ڕۆیشتین تا گەیشتینە (داروخان) زۆرمان برسی بوو، خۆمان کرد بەماڵێکدا لەسەر ڕێگەکە بوو، وەك باسم کرد فەقێ خۆی بکردایە بە هەر ماڵێکدا وەك ماڵی باوکی تیایدا دەجوڵێتەوە بێ ئەوەی بزانێ خاوەن ماڵ ڕەزامەندە یان نا، ژنی خاوەن ماڵەکە هەندێك نانی خستە نانەشانێك و پڕی لەگەنێك شیر برنجی بۆ دانایین، زۆر لام خۆشبوو، چونکە لەو کاتەوەی لە تەوێڵە دەرچووبووین برنجم نەخواردبوو، وتم خوایە نەمکوژی تا ژن و ماڵێك پێکەوە دەنێم و تێر شیر برنج دەخۆم.

# شاری بانه

لە پاشان بەرەو بانە ڕۆشتین تا گەیشتینە شارەکە، بەناویدا گەڕاین، وتیان: بچن بۆ دەرەوەی شار، چونکە لێرە هیچ مەدرەسەیەکی دینی نەماوە بەهۆی رژێمی رەزا شاوە.

شاری بانە لە شارە جوانەکانی رۆژهەڵاتی کوردستانە، دیمەنێکی جوان و ئاو و هەوایەکی خۆشی هەیە، دانیشتوانەکەی زۆر بە مەردی و کوردایەتی بەناوبانگن، بەڵام ئەوکاتە ئەو شارە جوانە جگە لە سروشتەکەی هیچ نیشانەیەکی شارستانی وەك نەخۆشخانە یان کارەبا یان قوتابخانەی نەبوو، نە جادەی قیرتاو کرابوو، ئێستا دەڵێن لەو ڕووەوە زۆر باشە.

ئەوکاتە هەموو دانیشتوانەکەی لە دژی سوپای ئێران کە دەیویست بیگێڕێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی پاڵیان دابوو بەیەکەوە.

زۆرم پێ خۆشبوو لەو شارە جوانە بخوێنم، بەڵام دەچووم بۆ لای هەر مەلایەك دەیوت من دەرست پێ دەڵێم، بەڵام ئەرکی ژیانت لەسەر خۆتە کە زۆر گرانە، لە ئەنجامدا وتیان بڕۆ بۆ لای (مەلا مصطفی شوێ) مەلایەکی باشە.

# دێی شوێ

لەپاش ئەوەی لە شاری بانە دەرچووین، نزیکەی (٧)کم ڕۆیشتین ڕووەو موکریان تا گەیشتینە دێی (شوێ)، بینیمان ئاووهەوایەکی خۆشی هەیە، مەدرەسەیەکی باشی تێدایە، ئاوێکی جوان بەژێر مزگەوت و مەدرەسەکەدا دەڕۆشت.

مامۆستای مەدرەسەکە مەلا (مصطفی)بوو، یەکێ لە موستەعیدەکان شێخ عزالدین حوسەینی بوو، پیاوێکی بەڕێز و هەڵکەوتوو بوو، جێگای بۆ خواستین لە لای مامۆستا ئەویش ڕازی بوو لەسەر مانەوەمان، من نەموت کلنبوی بورهان دەخوێنم، وتم با مامۆستا تاقی بکەمەوە بزانم پێنجوینیەکان باش دەزانێت یان نا، ڕۆژی دوایی چووم گەلەنبەوی بورهانی بە مامۆستا شێخ عیزەدینی حوسەینی دەوتەوە گوێم گرت، بۆم دەرکەوت هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ مامۆستا مەلا (صاحب)ی تەوێڵەدا نیە.

لەبەرئەوە دەستم کرد بە خوێندنی کتێبی (شرح العقائد)ی نەسەفی بەبێ ئەوەی حاشیەکانی خەیالی بخوێنم، چونکە ئەوانیش وەك پێنجوینی گران بوون.
شوێنەکە زۆر خۆشبوو، ئاو و هەوایەکی زۆر خۆشی هەبوو، فەقێکان ژیانێکی زۆر خۆشیان هەبوو، هەستیان بە جەنگی جیهانی دووەم نەدەکرد، مانگێك لەوێ مامەوە.

لەپاش دوو هەفتە بڕیارم دا بچم بۆ لای مەلایەکی باشتر، بەڵام یەکەم لەبەر ئەوەی زۆر ماندوو بووم، دووەم پێم شەرم بوو زوو بڕۆم، چونکە بۆ ناوبانگی مەلاکە باش نیە. هەتا ڕۆژێك نیوەڕۆ بوو نان و چاییمان دەخوارد لە پڕ تۆپێك

دای بەناو دێیەکەدا، دار و بەردی کرد بە خۆڵ و تۆز و دووکەڵ، ئێمەش لەترساندا باوەشمان کرد بەلێفە و کتێبەکاندا و بەرەو موکریان ڕۆیشتین.

ئەو تۆپە تۆپی سوپای ئێران بوو، لەپاش ئەوەی ئێران لەلایەن ئینگلیز و روسەوە داگیرکران دەسەڵاتی شاهەنشاهی نەما، ناوچەکانی بانەو مەریوان و کەلاتەرزان و لهۆن و هەورامان هیچ سوپایەکی تیانەبوو، سوپای ئێران دەیویست ئەو شوێنانە بگرێتەوە، کوردەکانی بانەو داروخان و شوێنەکانی تر بە سەرۆکایەتی (حمە رەشید خانی داروخان) کە حوکمڕانیی شاری بانەی دەکرد، هێزێکیان پێکەوە نابوو، زۆر مەردانە بەرهەڵستی سوپای ئێرانیان دەکرد، بەڵام بەداخەوە کەس نەبوو لە کوردەکانی تری مەریوان و سەقز و موکریان یارمەتییان بدەن بۆ ئەوەی پارێزگاری بکەن لەو بەشەی کوردستان.

بۆ شەو گەیشتینە دێی (زەمبیل) و شەو لەوێ بووین، بەیانی زوو چووین بۆ (بۆکان)، لەم شارەشدا مەدرەسەی دینی تیا نەبوو بەهۆی ڕژێمی شای ئێران کە دەیویست ژیانی گەلی ئێران وەك فەرەنسا لێ بکات، بەرەو پێش بردنی ئێرانی لەوەدا دەبینی کە ژیانی کۆمەلایەتی وەك ئەوێ لێ بکات.

(بۆکان) هەر چەندە شار نەبوو بەڵام لە جوانی و پاك و پوختی و زۆری دانیشتوانی دا هیچی لە شارەکانی تر کەمتر نەبوو.

وتیان بچن بۆ (حەمامیان) لەوێ مەدرەسەیەکی باشی تیایە، بەیانی زوو لە بۆکان دەرچووین بەرەو (حەمامیان).

## ژیاننامەی
## حەمەرەشید خانی بانە

حەمەرەشید خانی بانە، یەکێك لە شۆڕشگێڕە دیارەکانی کوردستانە و لە مێژووی خۆیدا چەندین سەروەریی تۆمارکردووە، هەر لە شەڕی "ئاغا دەوەنی" دۆڵی شلێرانەوە (١٩٢٥) بگرە کە هێزێکی گەورەی شای تێکشکاند تا وەرگرتنەوەی شاری بانە (١٩٤١/٩/١) و دوای ١٣ رۆژ شاری سەقزیش ئازاد دەکا (١٩٤١/٩/١٣).


حەمەرەشید خانی بانە

رەشیدخان بەوەشەوە نەوەستا و شارەکانی سەردەشت، مەریوان و دیواندەرەشی ئازادکرد و دواتر بە هێزێکی ٢٥٠ کەسی‌یەوە بۆ بەشداریی لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان، بەرەو شاری مهاباد چوو و پێوەندیی بە پێشەوا قازی محەمەدەوە کرد و لە دامەزراندنی کۆماردا رۆڵێکی بەرچاوی گێڕا و پلەی ژێنێراڵیی پێ بەخشرا، یەکێك بوو لە چوار ژێنێراڵەکەی کۆمار. رەشیدخان لە ١٩٧٤/١٢/٤ کۆچی دوایی کرد.

# ژیاننامەی

## مامۆستا مەلا مستەفای مدرسی



مامۆستا مەلا مستەفای مدرسی کەلەشوێ لەخزمەتیا خوێندم کوڕی فەقێ حەسەنە، ساڵی ١٢٩١ ی کۆچی هەتاوی لە بنەماڵەیەکی ئاینپەروەر لەدایک بووە، سەرەتای خوێندنی لەخزمەت باوکیدا بووە، دواتر وەك زۆر مامۆستای دیکە بۆ خوێندن چەندین ناوچە لەهەردوو دیوی رۆژهەڵات و باشووری کوردستان گەڕاوە، لەوانە سنە و هەولێر و موسڵ، ساڵی ١٣١٧ی کۆچی هەتاوی لەخزمەت مەلا گەورەی کۆیە لەشاری کۆیە ئیجازەی عیلمی وەر گرتووە.

پاش ئیجازە وەرگرتنی لەگوندی شوێ کە حەوت کیلۆمەتر لەشاری بانەی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە دوورە لەمەدرەسەی ئەو گوندەدا دەستی کردووە بەوانە وتنەوە و چەندین فەقێ لەخزمەتیا بابەتە ئاینیەکانیان خوێندووە، مامۆستایەکی زانا و خۆشەویست بووە لای خەڵکی.

بۆدوا جار لەتەمەنی هەشتا و هەشتساڵیدا وپاش شەست و هەشت ساڵ لەخزمەتکردنی مەدرەسە و فەقێ و زانستی ئاینی و چارەسەری کێشەی خەڵکی لەساڵی ١٣٦٨ی کۆچی هەتاوی بەرانبەر بەساڵی ١٩٨٩ی زاینی کۆچی دوایی کردو لەگوندی شوێ بەخاک سپێردرا.




وێنەی کێڵی گۆڕەکە

## ژیاننامەی
## مامۆستا عیزەدینی حوسەینی



شێخ عیزەدین حوسەینی (١٩٢١-٢٠١١) زانایەکی ئایینی و کەسایەتییەکی سیاسیی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووە. لە ساڵی ١٩٤٣ دا بووە بە ئەندامی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان و لە پێکهاتنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد بەشداریکردووە. ماوەیەك ئیمامی نوێژی هەینیی شاری مەهاباد بووە و لە چالاکییە ڕزگاریخوازانەکانی گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە ساڵانی دوای تێکچوونی حکومەتی شا وەك سەرکردەیەکی ناسراو بەشداری بووە. شێخ عێزەدین حوسەینی ١٠ی شوباتی ٢٠١١ لە شاری ئۆپسالای سوید، لە تەمەنی ٨٩ ساڵیدا کۆچی دواییکردوە. ڕۆژی ٢٠١١/٢/١٧ تەرمەکەی لە شاری سلێمانی لەگردی سەیوان بە خاك سپێردرا.




## حـەمـامـیان

حەمامیان هەرچەند بەناو دێ بوو، بەڵام لە ڕووی ئاوەدانی و دیمەن و سروشت و رەوشت و کشتوکاڵ و ئاو و ئاوەدانییەوە هیچی لە شاری بانەو بۆکان کەمتر نەبوو، ئاغاکەی (مەحمود ئاغا) بوو، ئەم شارەش وەك شارەکانی تری کوردستان لە هەموو شارستانییەك دوور بوو.

لەوێ مەدرەسەیەکی زۆر گەورەو باش هەبوو، مامۆستا مەلا عەلی مامۆستای گەورەی ئەوێ بوو، جێگەکەیان باش بوو، فەقێکانیش ژیانیان مسۆگەر بوو، بۆیە ژمارەیان زۆرتر بوو لە شوێنەکانی تر، بەڵام تەنیا لە عیلمی فلکیات بەناوبانگ بوو، وەك (تشریح الافلاك) و، کتێبی تر، ئەگەریش دەرکەوت کە ئەم عیلمە راست نیە، بەڵام قسەی وردی جوانی تێدایە.

کاتێك چوینە حوجرەی فەقێکان تەماشام کرد یەکێ لەو فەقێیانەی کە لەوێن مامۆستا مەلا عبدالرحمن سەردەشتیە کە لە ساڵی (١٩٣٨ز) کتێبی (الصمدیة)م لای ئەو تەواو کرد لە مزگەوتی قامیشان لە سلێمانی، بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم، ئەمە دووەمین مامۆستا بوو کە لەگەڵی بووم بە مستعد لەیەك حوجرەدا لە پاش (مەلا ئەحمەدی ئەوبەری) لە پاوە.

داوای جێگام کرد، مامۆستا مەلا عەلی وتی: فەقێمان زۆرە، جێگامان نیە.

لەپاش تاوێك کورەکەی مەحمود ئاغا کە ئاغای بۆکان بوو هات بۆ حوجرەی فەقێکان لەمنی پرسی: تۆ خەڵکی کوێیت؟ وتم: من خەڵکی (زەڵم)م، وتی: زەڵمی شێخ حسام الدین؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئێستا بەدیاری دەتبەم بۆ باوکم.

باوکی و ئاغاکانی موکریان هەموویان موریدی شێخ حسام الدین بوون و یەك دوو جارێك بەهاویناندا کاتێك شێخ لەوێ بوو هاتوونەتە زەڵم.

کاتێك بردمی بۆ لای باوکی هەر لە دوورەوە وتی: ئەم دیارییەم بۆ هێناوی ئەمە لە دانیشتوانی دێی زەڵمە.



مزگەوتی حەمامیان

باوکیشی بەخێرهاتنی کردم و زۆر ڕێزی گرتم، وتی: بۆنی شێخ (حسام الدین)ی لێ دێت کە لە وڵاتەکەی ئەوەوە هاتووی، بە کوڕەکەی وت برۆ بە مەلا عەلی بڵێ ئەم دوو فەقێیە لەسەر ئەرکی من ڕایان بگرێت، هەموو شتێکیان بۆ جێبەجێ دەکەم، ئەویش دەرس بە مصطفی بڵێت، مامۆستاش داواکەی جێبەجێ کرد.

دوو هەفتە مامەوە تەماشام کرد ئەم مامۆستایە هەر خەریکی فەلەکیاتە (تشریح الافلاك) و (شرح چەقمینی) و کتێبەکانی تر کە پەیوەندیان بە زەمین و مانگ و ڕۆژەوە هەبوو، ئاگاداریەکی زۆر باشی هەبوو، مامۆستا عبدالرحمن سەردەشتی لە لای ئەو (تشریح الافلاك)ی دەخوێند، من دواتر لە ساڵی (١٩٤٥ز) ئەم کتێبەم لە لای مامۆستا مەلا محەمەدی گەلاڵە خوێند، کە هەمووی بریتی بوو لە خەیاڵات و خورافات، وێنەی مانگ و ڕۆژ و زەمین گیرا بوو، مانگ دەکرا بەسێ چوار پارچەوە، نەیان دەزانی ڕووناکیەکەی لە ڕۆژەوە وەردەگرێ، ئەم کتێبە وا دادەنێ کە زەمین ناجولێت و ڕۆژ بەدەوریدا دەسوڕێتەوە، ئەم خورافاتە کاتی خۆی لە سەردەمی عەباسیەکاندا لە یۆنانیەوە وەریان گێڕابوو بۆ عەرەبی.

لە پاش دوو هەفتە ئەوێشم بەجێ هێشت ڕووەو سابلاغ (مهاباد)، لەگەڵ فەقێ عبدالرحمن لێفە و کوڵمان دا بەشانماندا دێ بەدێ ڕۆیشتین تا گەیشتینە (مهاباد).

## سابلاغ (مهـاباد) ئەیلولی ١٩٤٢

بەڕاستی یەکێکە لەجوانترین شارەکانی کوردستان، شارێکی پاک و پوخت بوو، دانیشتوانەکەی زۆر بەڕێز و کورد پەروەر بوون، تازە بنچینەی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان و دەوڵەتی کوردی (کۆماری مهاباد) دەستی پێ کردبوو، ئەو دەوڵەتەی خوالێخۆشبوو (قازی محەمەد) بوو بە سەرۆکی، ئەو دەوڵەتەی کە ئینگلیز و ڕوس بەڵێنیان دایە کە پشتی بگرن، لەدواییدا پەشیمان بوونەوە و لەگەڵ کوڕەکەی ڕەزا شا (محەمەد پەهلوی) ڕێکەوتن و ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی ئێرانی پێدان.



هەر لەو کاتەدا بەسەردانی چووم بۆ ماڵی خوالێخۆشبوو شەهیدی کوردپەروەر (قازی محەمەد)، ماڵەکەیان لەسەر تەپۆڵکەیەکی بەرز بوو، لەوێ کانیاوێکی تیا بوو ئاوەکە بەلای ماڵەکەیدا دەهاتە خوارەوە و لە خواری ماڵەکەیان ئاوێکی زۆر هەبوو وەك ڕووبار وابوو، درەخت و قامیشێکی زۆری تیا بوو.

لەو سەردەمەدا شاری مەهاباد جوانترین شاری کوردستان بوو، ماڵی پێشەوایش جوانترین شوێن بوو لە مەهاباد، خاوەنەکەیشی جوانترین پیاو بوو لە مەردایەتیدا.

جگە لەو جارە، تا لە دێ بوکرێ ئەمخوێند لە مەنگوڕ، (١٩٤٢-١٩٤٣) چوار جاری تر چوم بۆ زیارەتی بۆ ماڵەوە.

ئەو وەختەی من لەوێ بووم، هیچ شارێك هێندەی مهاباد مەلای گەورەو بەناوبانگ و زانای بەرزی تیانەبوو، لەوانەی کەلەبیرمە (مامۆستا مەلا محەمەدی ڕەش) و (مامۆستا مەلا محەمەدی بزنیانی) و (مامۆستا مەلا صدیقی مزگەوتی ناوبازاڕ)، هەمووشیان لە بیروباوەڕی نەتەوایەتیان سودیان لە پێشەوا وەرگرتبوو، بەتایبەتی ئەیانوت مامۆستا مەلا صدیق لە مزگەوتی بازاڕ هەموو هەفتەیەك وتارێکی کۆمەڵایەتی هەبوو لە پاش نوێژی هەینی زۆرترین پیاوانی شارەکە کۆئەبونەوەو گوێیان بۆ ئەگرت ڕێگای دانیشتن نەبوو. بەڵام بەداخەوە هیچ مەدرەسەیەکی ئایینی نەمابوو لە شارەکەدا ناوی فەقێیەتی تیا سڕابووەوە.

## قـازی محـەمەد



پێشەوا قازی محەمەد، پیاوێکی سوورو سپی و باڵابەرزی هەڵکەوتوو بوو، ڕیشێکی ماش و برنجی جوانی هەبوو، هەتا بڵێی پیاوێکی نێسک سوک و نەجیب بوو، ڕوخۆش و دەم بە زەردەخەنە بوو، بەخێرهاتنی زۆر گەرمی کردم، زۆر ڕێزی گرتم، هەرچەندە من فەقێیەکی نەناسراو بووم، بەڵام دیاربوو خووڕەوشتی وەهابوو لەگەڵ میوان.

بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا کتێبی فەرەنسی و ئینگلیزیم دی لەگەڵ کتێبی ئایینی ئیسلامدا لەناو کتێبخانەکەی پێشەوا دانرابوون، جگە لەوەی کە قازی بوو، پێشەوا بوو، سیاسی بوو، مەلایەکی زۆر چاکیش بوو، بینیم ئەوکاتە فەقێ ئەچوون دەرسی (تهذیب) و (جمع الجوامع)یان لەلا ئەخوێند، بەڵام مەدرەسەی نەبوو.

بوونی کتێبی ئینگلیزی و فەرەنسی لە کتێبخانەکەیدا بەڵگەیەکی گەورەیە بۆ دووربینیی ئەم مرۆڤە گەورەیە لە وڵاتێکی دواکەوتوودا، لە بنەماڵەیەکی ئایینیدا، لەساڵی ١٩٤٢دا.

## دەوڵەتی جوانە مەرگی مەهاباد[١]

لە ساڵی ١٩٤١ز. هاوپەیمانان (روس و ئینگلیز) هاتنە ناو خاکی ئێران و بە تاوانی نازیەتی (رەزا شا)یان لەسەر حوکم لابرد و (محەمەد ڕەزا)ی کوڕیان لە جێگەی دانا، خاکی ئێرانیان بەش کرد، باکور ناوچەی ئازربایجان کەوتە ژێردەسەڵاتی ڕوسیا و بەشی ناوەڕاست و باشوور لەژێر دەسەڵاتی ئینگلیز و ئەمریکادا مایەوە.

ڕامیاری دەوڵەتی شورەوی بەپێچەوانەی ئینگلیز بوو، شورەویەکان هانی گەلانی ئێرانیان دەدا بۆ داواکردنی مافی نەتەوایەتی لە شێوەی ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆییدا.

ساڵی ١٩٤٢ حکومەتی روسیا بانگهێشتی کۆمەڵەی مەهابادی کرد بۆ باکۆ، لە وتووێژێکدا نوێنەرانی کورد داوای مافی نەتەوایەتی کوردیان کرد لە نوێنەری (روسیا) (باقرۆف)، بەڵام وتبووی لەم هەل و مەرجەدا ڕوسیا ناتوانێت پشتگیری لە کورد بکات، تەنیا وتبووی کە باسەکە دەخاتە بەردەم کۆمیتەی مەرکەزی.

بۆ جاری دووەم ساڵی ١٩٤٥ نوێنەرانی کورد بانگهێشت کران بۆ باکۆ، ئەم جارە نوێنەران بە سەرۆکایەتی (قازی محەمەد) داواکانی خۆیان بەچەند خاڵێك خستە سەر کاغەز و لەگەڵ نوێنەرانی ڕوسیا بە سەرۆکایەتی (باقرۆف) کەوتنە وتووێژ، دووبارە باقرۆف پێی وتبوون سەربەخۆیی لەم بارودۆخەدا ناگونجێت،

---

(١) یاداشتەکانم - بەشی یەکەم-، عبدالله أحمد رسول پشدەری، ١٩٩٢.

بەڵام وتبووی حکومەتی روسیا لاری لەوە نیە کە پشتیوانی کورد بکات بۆ وەرگرتنی مافی ئۆتۆنۆمی، بەمەرجێ بکەونە ژێردەسەڵاتی (فیرقەی دیموکراتی ئازربایجانی تورکەکانی تەورێز)، هەروەها بەڵێنی پێ دابوون کە چەك و تەقەمەنی و یارمەتییان بدات، بەو مەرجەی ناوی (کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان) بگۆڕن بە (حیزبی دیموکراتی ئێران).

لە کۆتایی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٤٥ز) کۆبوونەوەیەکی فراوان پێکهات، قازی محەمەد باسی گەشتەکەی کرد، بەشداربووان ڕازی نەبوون بچنە ژێر حوکمی ئازربایجان، بەڵام ڕازی بوون لەسەر گۆڕینی ناوی حیزب. مەبەستی ڕوسیا لە پشتگیری کورد و ئازەرییەکان تەنیا ئەوە بوو دەیویست فشار بخاتە سەر حکومەتی ئێران بە مەبەستی وەرگرتنی مافی دەرهێنانی نەوت لە ئێراندا[1].

سەرەتای ئەیلولی ١٩٤٥ ڕووداوی هەرە گرنگ لەو کاتەدا گەیشتنی ڕێزدار (مستەفا بارزانی) و ئەفسەرانی پسپۆڕی شۆڕشگێڕی کوردستانی عێراق بوو، خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ بوو، چونکە ئەم هێزە سنوری نێو نەتەوەیی بەزان و چووە ڕیزی پێشەوەی شەڕ لەگەڵ سوپای ئێراندا لەسەر ڕێگای (سەقز- بۆکان)[2].

لە ٢٢ کانونی دووەمی ١٩٤٦ کاتی پێش نیوەڕۆ هەموو ئەندامانی حیزبی دیموکرات و خەڵکی مەهاباد و هەموو سەرۆك عەشیرەتەکان لە مەیدانی چوارچرای شاری مەهاباد کۆبوونەوە، کۆماری کوردستان ئاشکرا کرا و ئاڵای کوردستان بەرز کرایەوە.

دوای ئەوەی چەند جارێك سوپای ئێران هێرشی کرد و بەخراپترین شێوە هێرشەکانی شکا، حکومەتی ئازەرییەکان بەبێ شەڕکردن لەگەڵ ئێران ڕێکەوت، حکومەتی ڕوسیا ئاگاداری کوردەکانی کرد کە نایەوێت لە

---

(١) کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، حوسێنی مەدەنی، بەرگی دووەم.

(٢) کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، حوسێنی مەدەنی، بەرگی دووەم، ساڵی ٢٠٠٠.

ناوچەکانیدا ئاژاوە و شەڕ ڕوویدات، بەتایبەتی سنوری خوارووی کوردستان، چونکە ناوچەی دەسەڵاتی ئینگلیز بوو، قازی محەمەد ناچار بوو کە لەگەڵ (ڕەزم ئارا) فەرماندەی گشتی سوپای ئێران کەوتە وتوێژ.

پاشان ئێران دەستی کرد بە سیاسەتی خافڵاندن[١] و ڕێگەی خۆش کرد بۆ داگیرکردنەوەی کوردستان.

(جۆرج ئالن) باڵیۆزی ئەمریکا بەئاشکرا پشتگیری خۆی بۆ حکومەتی ئێران نیشان دا، بۆیە حکومەتی سۆڤییەت بەناچاری پشتی لە کورد و لە ئازەرییەکانیش کرد، بەم جۆرە ئاسۆیەکی ڕوون نەما لە عەرز و ئاسماندا بۆ کورد، بەو جۆرە قازی محەمەد ناچار بوو کە خۆی بەدەستەوە بدات، (بەرزانی) دووجار چووە لای پێشەوا بۆ ئەوەی لەگەڵیان ڕا بکات، پێشەوا لە وەڵامدا وتی[٢]:

"من لەگەڵ خەڵکی مەهاباد دەمێنمەوە، چونکە سوێندم بۆ خواردن لەگەڵیان ببم و بیان پارێزم، حکومەتی مەرکەزی دەگەڕێتەوە ئەگەر من بگرێ داخی خۆی بەمن دەڕێژێ و لە کۆڵ خەڵکەکە دەبێتەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی شار تووشی زەرەر نەبن.."

قازی محەمەد لە بنەماڵەیەکی ئایین پەروەر بوو، زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی دەزانی بەفەڕەنسی قسەی دەکرد و لە ڕوسی دەگەیشت.

بیری ڕۆشنبیریی فراوان بوو، لە قسەکردندا زۆر بەتوانا بوو، کاتێك کە بەنهێنی دادگایی کرا، زۆربەی ئەو قسانەی کە کرا بەنهێنی مانەوە، بەڵام لەسەر زمانی شایەتێکی ناو دادگا ئەم قسانە نێردران، کە قازی لەدوا بەرگریدا لە خۆی وتبووی[٣]:

---

(١) کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، حوسێنی مەدەنی، بەرگی دووەم، ساڵی ٢٠٠٠.

(٢) کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، حوسێنی مەدەنی، بەرگی دووەم، ساڵی ٢٠٠٠.

(٣) کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، حوسێنی مەدەنی، بەرگی دووەم، ساڵی ٢٠٠٠.

"...وا بیر نەکەنەوە کە شارەزای قانوون و موقەرەرات نیم، باش لێم شارەزاییە بەر لە هاتنی ئەرتەش و هێزی مەرکەزی بۆ مەهاباد پێشگوویم کردووە کە هەر ئیعدام دەکرێم، کەوابو بۆ هەڵنەهاتم، ئەوە نەبوو کە نەمدەتوانی، شەش دەزگا ماشێنی سواری و جێبم لە ئیختیاردا بوو، هەر دەقیقە و سەعاتێك ویستبام دەمتوانی سنور ببرِم خۆم دەرباز بکەم، باش بزانن کە من وەك پیشەوەری (ژنانیلە) نەبووم هەر کە تینم بۆ هاتبا ڕام کردبا، بۆ کوێ هەڵدەهاتم؟ ئێرە وڵاتی من کوردستانە تا ئێستا (٨) پشتی من لێرە لەو خاکە نێژراون..."

(سەردار شەریفی) وەکیلی پێشەوا ئەم قسانەی درکاند و وتی: حەیف بۆ ئەو پیاوە مەزن و ژیر و زانایە، دوێنێ لەکاتی مەحکەمەدا بێ کاغەز (٤) سەعات وتاری دا بەزانست و مەنتیقی خۆی هەموومانی حەیران کردبوو، لە هەموو کەس باشتر قانوونەکانی ئێرانی دەزانی، لەڕاستیدا ئەوە قازی بوو کە مەحکەمەی موحاکەمەی دەکرد.."

پاشان سەرداری شەریفی لە ئەرتەش دەرکرا.

ڕۆژی ١٧ی مانگی کانونی یەکەمی ١٩٤٦ سوپای ئێران لەڕێگای بۆکانەوە بەرەو مەهاباد هاتە پێشەوە[١].

نیوەشەوی ٣١ی مارتی ١٩٤٧ قازی محەمەد و صدری قازی برای و سەیفی قازی ئامۆزای لەمەیدانی چوارچرا لە مەهاباد خرانە پەتی سێدارە و شەهید کران.[٢]

زانایی و دڵسۆزی قازی موحەمەد لەوەسێتنامەکەشیدا بە ڕوونی دیارە، لێرەدا بەپێویستی دەزانم دەقی وەسێتنامەکە بخەمە روو تا هەموو ئەو کەسانەی ئەم بیرەوەریانەم دەخوێننەوە سوودی لێ وەربگرن:

---

(١) کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان، حوسێنی مەدەنی، بەرگی دووەم، ساڵی ٢٠٠٠.

(٢) یاداشتەکانم، ب١، عبدالله أحمد پشدەری.

**وەسیێتنامەی پێشەوا قازی محەممەد**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نەتەوەی زۆر لێکراو، بێبەشو چەوساوەی کورد! برایانی بەڕێز! لە دوایین ساتەکانی ژیاندا بابەتگەلێتان وەك ئامۆژگاری پێ دەڵێم.

بۆ ڕەزامەندیی خودا دەست لە دوژمنیی یەکتر هەڵگرن، یەك بگرنو بۆ پشتیوانی لە یەکتر هەڵسن، لە بەرابەر دوژمندا ڕاوەستن، خۆتان بە نرخێکی کەم بە دوژمنەکان مەفرۆشن. دوژمن تەنیا بۆ گەیشتن بە قازانجەکانی ئێوەی دەوێ. پاش ئەوە ئیتر زیاتر لە تلّپەیەك نین.

دوژمنانی نەتەوەی کورد زۆرن، زۆردارن، نامەردو بێویژدانن، ڕازی سەرکەوتنی هەر نەتەوەیەك یەکیەتیو پێکەوە بوونە. ئازادیی نەتەوەیەك پێویستی بە پشتیوانیی گشت نەتەوەکەیە، نەتەوەی یەکنەگرتوو هەمیشە لە ژێر دەسەڵاتدایە.

ئێوە نەتەوەی کورد شتێکتان لە نەتەوەکانی دیکە کەم نیە. بە پێچەوانەشەوە پیاوەتی، غیرەتو ئازایەتیی ئێوە فرە زۆرترە. ئەو نەتەوانەی لە بەندی دیلی ڕزگاریان بووە یەکگرتوو بوونو تەواو.

ئێوەش دەتوانن بە یەکگرتووییو هاوپێوەندی زەنجیری دیلێتی بپچڕێنن. ئیرەیی، خەیانەتو خۆفرۆشی وەلانێن. ئیتر فریوی دوژمنان مەخۆن. دوژمنی نەتەوەی کورد لە هەر تاقمو گرووپو ڕەنگو ڕەگەزێك، هەر دوژمنە، بێ بەزەییو ویژدانە. ئێوە لەگیان یەك بەردەدا تا بە قازانجەکانی خۆی بگا، بە بەڵێنگەلی درۆزنانە، ئێوە دەخلەتێنێ.

لە ئیسماعیل ئاغای شکاك تا جەوهەر ئاغای برایو حەمزەئاغای مەنگوڕو چەندینو چەند قارەمانێکی دیکە، فریوی ئەم زۆردارە مەلعونانەیان خواردو ناپیاوانە

شەهیدکران. هەموویانیان بە قورئانو سوێند فریودا، ئاخر ئەمانە کەی لە قورئانو سوێند تێدەگەن، وەفا لە لای ئەم کۆمەڵە، شمەکی بازاڕە.

لە ڕێگەی خوداو بۆ ڕەزامەندیی ئەو پشتی یەکتر چۆڵ مەکەنو یەکگرتوو بن، دڵنیا بن ئەگەر دوژمن هەنگوێنتان پێبدا، تێکەڵ بەژەهرە. فریوی سوێندە درۆزنەکانی مەخۆن. ئەگەر هەزار جار سوێند بخۆن دووبارە هیچ ئامانجێکیان جیا لە لەنێوبردنی ئێوە نیە.

لە دوایین کاتژمێرەکانی ژیانمدا خودا بە شایەتی دەگرم کە لە ڕێگای ئازادیو بەختەوەریی ئێوەدا گیانو ماڵی خۆم بەخت کردو لە هیچ هەوڵێك کۆتاییم نەکرد. لە لای ئەمانە، کوردبوونی ئێوە تاوانە، سەرو گیانو ماڵو شەرەفی ئێوە لە لایان حەڵاڵە. ئەوان چونکە لە گۆڕەپانی شەڕدا ناتوانن لە بەرانبەر ئێوەدا ڕاوەستن، هەمیشە هانا بۆ فێڵو تەڵەکە دەبەن. شاو دەستو پێوەندییەکانی بە جاران پەیامیان نارد کە بۆ وتووێژ ئامادەنو مەیلی خوێن ڕشتنیان نیە، بەڵام من دەمزانی ئەوان درۆدەکەن. ئەگەر خەیانەت، خۆفرۆشیو فریوخواردوویی هێندێ لە سەرۆك عەشیرەکان نەبووایە، کۆمار هیچکات شکستی نەدەخوارد.

وەسیەت دەکەم منداڵەکانتان فێری زانستو عیلم بکەن. نەتەوەی ئێمە شتێکی لە نەتەوەکانی تری جیهان کەم نیە، جیا لە زانستو عیلم. فێری زانست بن تا لە کاروانی مرۆڤایەتی دوا نەکەون. زانست چەکی لەنێوبردنی دوژمنانە، دڵنیابن ئەگەر بە دوو چەکی یەکیەتیو زانست پۆشتە بن، دوژمنان کارێکیان بۆ ناچێتە پێش.

ئێوە نابێ بە مردنی منو براکانو ئامۆزاکانم ترس بچێتە دڵتانەوە. هێشتا قارەمانگەلێکی زۆر دەبێ گیان فیدا بکەن تا داری ئازادیی کوردستان بگاتە بەرهەم. دڵنیام پاش ئێمەش قارەمانگەلێکی دیکە هەن کە فریوبخۆن، بەڵام هیوادارم مەرگی ئێمە ببێتە دەرسی عیبرەت بۆ سەرجەم خەباتگێڕانی ئازادیی کوردستان.

وەسیەتێکی دیکەم بۆدڵسۆزانی نەتەوەی کورد هەیە. لە خودای گەورە داوای ئازادیی نەتەوەی خۆتان بکەن.

شایەت لە خۆتان بپرسن بۆ من سەرنەکەوتم؟ لە وەڵامدا دەبێ بڵێم بە خودا سەرکەوتووی راستەقینە منم. چ نێعمەتێك لەوە سەرترە کە سەرو ماڵو گیانم لە رێگای نەتەوەو نیشتمانمدا بەخت بکەم.

باوەڕ بکەن من جاران داوام لە خودا کردوە ئەگەر بمرم بە شێوەیەك گیان لەدەست بدەم کە بە روومەتی سوورەوە لە لای خوداو پێغەمبەرو نەتەوەکەم دا ئامادە بم. وەها مردنێك سەرکەوتنی راستەقینەیە.

هیچ کەسێك مافی ئێرەیی‌و بەخیلی نیە، هەموو لە ماڵی خۆیاندا ئازادن، هەرچی لە دەستتان دێ بۆ ئازادیی کورد کۆتایی مەکەن. ئیتر نابێ لەسەر رێگای ئەو کەسانەدا کە بەرپرسایەتی دەگرنە ئەستۆ راوەستن، لە بەرد خستنە رێگە دەست هەڵگرن‌و ئەرکەکانتان بە باشترین شێوە بەڕێوەببەن.

دڵنیابن براکوردەکەتان لە دوژمنی بێگانە زۆر باشترە. ئەگەر من بەرپرسایەتیم وەئەستۆ نەگرتبایە ئێستا لە پای چێوەی داردا نەبووم و لە لای بنەماڵەکەم رۆژەکانم دەبردەسەر، بەڵام ئەرکی من، بەرزترین ئامانجم بوو و، تا پێی گیان راوەستام. بە هیوای خوداوەندی گەورە، لە ئاکامدا بەسەر دوژمناندا سەردەکەون.

١- بڕواتان بە خوداو (ما جاء من عندالله) و پێغەمبەری ئەکرەم (صلی الله علیه وسلم) هەبێ‌و ئەرکە دینییەکانی خۆتان بە باشترین شێوە بەڕێوە ببەن.

٢- یەکیەتی‌و هاوپێوەندی، رەمزی سەرکەوتنە. ئێرەیی‌و خۆفریودان وەلابنێن‌و لە وەرگرتنی بەرپرسایەتی‌و خزمەتکردندا لەگەڵ یەکتر کێبەرکێ بکەن.

٣- زانست‌و ئاگایی خۆتان بەرنە سەرێ تا فریوی دوژمنان نەخۆن.

٤- هیچ کات دوژمن بە دۆست مەزانن چونکە دوژمنی نەتەوەو نیشتمان‌و دینتانە.

٥- خۆتان بۆ چەند رۆژ ژیان لەم دنیا لەناوچووەدا مەفرۆشن. مێژوو سەلماندوویە کە دوژمن بە چووکەترین بیانوویەك، دەست بۆ کوشتارو سەرکوت دەبا.

٦- خەیانەت بە یەکتر مەکەن، نە خەیانەتی سیاسی‌و نە خەیانەتی ماڵی‌و گیانی‌و

نامووسی، خەیانەتکار لە لای خوداو گەل رووڕەشەو، خەیانەت لە ئاکامدا بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.

٧- لەتەك ئەو کەسانەی دا، بێ خەیانەت ئەرك بەڕێوەبردن هاوکاری بکەن. خودای نەخواستە هیچکات مەبنە سیخۆڕی بێگانە.

٨- ئەو شوێنانەی لە وەسیەتنامەکەدا ئاماژەم پێ کردوون 'مزگەوت، قوتابخانەو نەخۆشخانە' هی خۆتانن، بە باشترین شێوە کەڵکیان لێوەرگرن.

٩- واز لە شۆڕش مەهێنن تا لە ژێردەستەیی دەرباز بن. ماڵی دنیا هیچ نیە، ئەگەر نیشتمانێکتان هەبێ، سەربەخۆیی‌یەکتان هەبێو ماڵو خاكو نیشانمانتان هی خۆتان بێ، ئەو کات هەموو شتێکتان دەبێ، هەم سامان هەم دەوڵەت، هەم ئابڕو و هەم نیشتمان.

١٠- گومان ناکەم جیا لە مافی خودا 'حق الله'، مافێکی دیکە لە ئەستۆم بێ، سەرەڕای ئەمەش ئەگەر کەسێك هەست دەکا قەرزێکی بەلامەوەیە بچێتە لای میراتگرانم.

تا دەست نەدەیە دەستی یەکتر، سەرکەوتن مسۆگەر نابێ. لە یەکتر زۆر مەکەن چونکە خوداوەند دوژمنی زۆردارانە.

هیوادرام وتەکانم وەرگرن، خوداوەند ئێوە بەسەر دوژمنان‌دا سەرخات.
مەبەستی ئێمە ئامۆژگاری بوو وتمان
سپاردمان بە خوداو رۆیشتین
خزمەتگوزاری نەتەوەو نیشتمان

**قازی محەممەد**

هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی پێشەوای گەلی کورد قازی موحەمەد



دێ بوکر

## لە سابڵاغەوە بۆ مەنگوڕ

لەناو شاری سابڵاغ دەچوینە هەر مزگەوتێك دەیان وت ئێمە دەرستان پێ دەڵێین، بەڵام ئەرکی ژیانتان لەسەر خۆتان بێت، چونکە ئەم شارە فەقێیەتی لەبیر چۆتەوە، دیارە ئێمەش توانای ئەوەمان نەبوو لەسەر ئەرکی خۆمان بژین، ئەوەی شایەنی باسە لە مامۆستا بەناوبانگەکانی شاری مەهاباد مامۆستا مەلا حسین و مامۆستا مەلا صدیقی مزگەوتی ناو بازاڕ بوو، کە بە کورد پەروەری بەناوبانگ بوون، هەردووکیان وتیان خوێندنتان پێ ئەڵێین بەڵام بژێوی ژیانتان لەسەر خۆتان.

لەپاشاندا ڕووەو (مەنگوڕ) ڕۆیشتین تا گەیشتینە (دێ بوکر)، شایەنی باسە ئەم دێ یە لە ناوەڕاستی چوار دۆڵی گەورەدا بوو و دانیشتوانەکەی پشتیان بەستبوو بە بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات، بەڵام کشتوکاڵەکەیان دوور بوو لە دێیەکە، دەبوایە لەدێیەکە دەربچن ڕووەو مەهاباد و ماوەیەك بڕۆن ئینجا دەگەیشتنە سەر زەوییەکانیان کە لە دەشتاییەکی گەورەدا بوو گەنم و جۆیان دەکرد.

دێهاتی مەنگوڕ هەروەك دێهاتی موکریان و لاجان و شنۆ و مەرگە و شکاك هەموو ئەو دێیانە ئەوکاتە بۆ سوتەمەنی تەنیا تەپاڵەیان بەکاردەهێنا، تەپاڵەش بریتی بوو لەپاشەڕۆ (سەنێر)ی گا و مانگا کە وشکیان دەکردەوە بەزستان لە ژوورێکدا دەیانخستە تەنوورەوە نان و چێشت و ئاو گەرم کردن و چا لێنانیان هەر لەسەر ئەوە بوو، لە زستاندا مێزێکی چوار گۆشەیان دادەنا لەسەر دەمی تەنوورەکە ئینجا لێفەیەکی زۆر گەورەیان دەهێنا دەیاندا بەسەریداو شەوان هەموو ئەو ماڵە دەچوونە ژێر ئەو لێفەیەوە دەنوستن و پێیان دەوت قورسینە.

دەگێڕنەوە دەڵێن جارێك لە ئاغاکانی ئەو ناوچەیە دەپرسن ئەڵێن: ئاغا ئەگەر گا و مانگا پاشەڕۆ نەکات ئێوە چی دەکەن؟ وتبوی ئێمە ئەوناوچەیە بەجێ دەهێڵین.

ئەوکاتە نەوتیان تەنها بۆ چرا بەکار دەهێنا و چرا کەم بوو، فتیلەیان بەکار دەهێنا پڕیان دەکرد لە نەوت و پەڕۆیەکیان تێ دەخست لەبەر ڕووناکیەکەی دادەنیشتن، فەقێکان کەڵکیان لەدوکەڵی فتیلەکە وەردەگرت و مەرەکەبیان پێ دروست دەکرد و بۆ نووسین بەکاریان دەهێنا.

لە (دێ بوکر) مەدرەسەیەکی فەقێ هەبوو، بەڵام مامۆستا مەلا حمە ئەمین قاجری هیچ فەقێی نەبوو و جێگای پێ داین و لەوێ دەستم کرد بەکتێبی (مطول) لە زانستی (بلاغە)دا، زیاتر لە ساڵێك لەم دێیە مامەوە زۆر بەخۆشی بەسەرمان برد، چونکە هەم دەرسەکەم باش بوو و هەروەها ژیانی ئەوێ زۆر باش بوو، کشتوکاڵ و مەڕ و ماڵاتی زۆریان هەبوو، هەموو زۆر

دەوڵەمەند بوون، ئاغاکەیان (خدر ئاغا) زۆری خۆش دەویستم هاوین کە دەچوون بۆ کوێستان دەبوت بچن ئەم سێ مانگەی هاوین لە دیوەخانەکەی من بن، لەبەرئەوەی کە لە شوێنێکی بەرزدا بوون ئاو و هەوایەکی زۆر خۆشی هەبوو، هاوین لە پاش ئەوەی ماڵی ئاغا باریان کرد چونە کوێستان، ئاغا بڕیاری دا کە ئێمە لەدیوەخانەکەی دانیشین وکوێخا حمە ئەمینیش بە خۆی و ماڵ و منداڵیەوە بگوێزنەوە ژورەکانی تری ماڵی ئاغا بۆ ئەوەی ئاگایان لە شت و مەکەکانیان بێت.

ئەم کوێخایە پیاوێکی زۆر باش بوو، رۆژێك پێی وتم: من وەجاغ کوێرم تەنیا یەك کچم هەیە -ئەویش ناوی (زێڕین) بوو- ماڵ و ماڵاتێکی زۆرم هەیە، هەمووی دەدەم بەتۆ و کچەکەشت دەدەمێ لێرە خوێندن تەواو بکە و بمێنەرەوە.

وتم: زۆر سوپاست دەکەم، من بۆ خوێندن هاتووم، لای خۆمان کچی جوان هەیە بەڵام دەمەوێت لە خوێندن لەم قۆناغەدا نەوەستم ئەبێت هەر دوانزە عیلمەکە تەواو بکەم.



دێ بـوکـــر

## ماموٚستا
## مەلا حمە ئەمین قاجری

ماموٚستا مەلا حمە ئەمین پیاوێکی بەڕێز و مەلایەکی باش بوو، لای جەنابی مەلای گەورەی کوٚیە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتبوو بوو بووە مەلای ئاوابییەکە، دیارە کە مەلا ئیجازە وەردەگرێ بیر لەوە دەکاتەوە کچێکی جوان بدوٚزێتەوە لەئاوابییەکەدا لە ماڵێکی بەڕێز بوٚ ئەوەی داوای بکات و مارەی بکات، لەبەرئەوە زوٚرترین (مەلا ژن) زوٚر بە ڕەوشت و جوان بوون، ماموٚستا مەلا حمە ئەمین کچێك دیاری ئەکات بوٚ ئەوەی مارەی بکات بە باوکەکەی دەڵێت، باوکی کچەکە دەڵێت من کچ بە مەلا نادەم، زوٚر هەوڵی لەگەڵ دەدەن بەڵام سودی نابێت.

لەهەندێ ناوچەی کوردستانی ئێران عورف و عادەتیان وایە ئەگەر یەکێك کچێك داوا بکات و کەس و کاری ڕازی نەبێ بیدەنێ بوٚی هەیە لەگەڵ کچەکە ڕێك بکەوێت و شەو هەڵی بگرێت و بیبات بوٚ ماڵی ئاغا، ئینجا بوٚ ماڵی کەس و کاری کچەکە هەیە پێش ئەوەی بگەنە ماڵی ئاغا کچەکە و کوڕەکە بکوژن و هیچ پرسیارێکیان لەسەر نیە، چونکە لەسەر ناموس و شەرەف ئەوەیان کردووە، بەڵام کە گەیشتنە ماڵی ئاغا ئیتر ئەو مافەیان نامێنێ و ناتوانن بەهیچ جوٚرێك ئازاری کچەکە یان کوڕەکە بدەن، بەڵکو باوکی کچەکە یان برای یان کەسێکی تر ناچار دەکەن کە کچەکە مارە بکەن لەو کەسە کە هەڵی گرتووە، بەمە دەڵێن (ڕەدوکەوتن) یان (هەڵگرتن) لەو ناوچەیە شتێکی زوٚر باو بوو بەناڕەوا لە قەڵەم نەدەدرا، ماموٚستاش یەکێك بوو لەوانەی کەبەو جوٚرە ژنی هێنا بوو، لەماڵی ئاغا باوکی کچەکە لێی مارەکردبوو.

ماموٚستا مەلا حمە ئەمین قاجری دڵی زۆر پیس بوو کە بە کوردی پێی دەوترێت (خانە گومان) لە دوور و نزیك نەیدەهێشت ژنەکەی لەگەڵ کەس قسە بکات.

رۆژێك ئەو فەقێیەی لەگەڵم بوو (فەقێ عبدالرحمن) ناردم بۆ ماڵی ماموٚستا بۆ مەقەست، ئەویش کە دەڕوات سەیرەکات هەردووکیان دانیشتوون، ئەڵێت ماموٚستا ژن هاتووم بۆ مقەستەکانتان، ماموٚستاش لێی تورە دەبێت و دەری دەکات، لە پاشان بە تورەیی هات بۆ حوجرەی فەقێکان وتی: مەلا مصطفی ئەم سوختەیە دەربکە پیاوێکی بێ ئەدەبە، وتم: بۆچی؟ ماموٚستا وتی: هاتووە شەرم ناکات بەمەلا ژن دەڵێت هاتووم بۆ مقەستەکان، منیش سەرم سوڕما وتم: جا ئەمە چی تێدایە، وتی: ئاخر بە (جمع) وتی مقەستەکان، دەبوایە بیوتایە هاتووم بۆ (مقەستەکەتان) ئینجا منیش بۆم باسکرد وتم: لە وڵاتی ئێمە (مفرد)یش (جمع) دەکرێت، مەبەستی مقەستەکەتان مقەستی جل بڕین بووە و بیروڕای بەلای شتی تردا نەچووە.

جا لەو کاتەدا وتەیەکی شێخ ڕەزام بیرکەوتەوە کە دەڵێت: رۆژێك کچێکی دی بە گورجی دەڕۆشت بەڕێگەدا، ئەویش پێی وت: لەسەر خۆت برۆ بەڕێگەدا با مقەستەکانت نەسوێن، ئەویش گورج وەڵامی ئەداتەوە دەڵێت: بەشی بەر سمێڵی تۆیان دەمێنێ.

# ئیسقاتەکەی حاجی بایز

لە ناوچەی مەنگوڕدا زۆر دێ هەبوو مەلایان نەبوو، بەڵام ئەگەر پێویستیەکی ئاینیان هەبوایە دەهاتن بۆ دێ بوکر، ئەگەر ئیشەکە گرنگ بوایە مامۆستا خۆی دەڕۆشت بەسەردەمیەوە، ئەگەر نا فەقێیەکی دەنارد بۆ جێبەجێ کردنی ئیشەکەیان.

ڕۆژێك پیاوێك هات بە سواری ئەسپێك بۆ لای مامۆستا وتی: حاجی بایز زۆر نەخۆشە فەقێیەك بنێرە بۆ ئەوەی یاسینی بەسەردا بخوێنێت و(تلقین) و ئیسقات کردنی بکات.

مامۆستا وتی: مەلا مصطفی تۆ بڕۆ لەگەڵی.

ئینجا پیاوەکە وتی: فەقێ دوو ڕێگە هەیە یەکێکیان دوور و سەلامەتە بەسەر پردی قازی ئاوادا دەپەڕینەوە، یەکێکیشیان کورتە، بەڵام دەبێ لە ڕووبارەکە بپەڕینەوە.

منیش وتم: من پیاوی ڕووبارم لە چەمی زەڵم گەورە بووم مەلە باش دەزانم لە ڕووبارەکەی تۆ ناترسێم.

ئێمەش چووین گەیشتینە سەر ڕووبارەکە بپەڕینەوە ئەوبەر،ماڵی حاجی بایز لەوبەری ڕووبارەکەوە بوو، پێیان دەوت چەمی (قازی ئاوا)، ئێستا بیستوومە دێیەکە نەماوە، کە تەماشای ڕووبارەکەم کرد ئاوەکەی زۆر بوو، بەهار بوو، ڕوخانە سورە هاتبوو، هیچ شتێك نەیدەتوانی خۆی لەبەری بگرێت، زۆریش قووڵ بوو.

وتی: فەقێ من لە پێشەوە سواری ئەسپەکە دەبم، تۆش لە پشتی منەوە سواربەو باوەشم پیا بکەو تەماشای ئەملاو ئەولای خۆت مەکە، چونکە کە گەیشتینە ناوەڕاستی ئاوەکە ئەسپەکە بە مەلە دەپەڕێتەوە، ئەگەر ئەملاو ئەولا بکەیت یان هەردووکمان دەکەوینە خوارەوە یان تۆ.

کاتێك گەیشتینە ناوەڕاستی ئاوەکە، گێژ بووم، وام دەزانی بەم لادا کەوتووم خۆم خست بەولادا، کابرا توند گرتمی وتی: فەقێ ماڵی باوکت کاول بێت، خۆت بخە بەولادا، دەکەوینە خوارەوە، منیش هەر بە پێچەوانەوە تێ گەیشتم.

هەرچۆن بوو خوا لە خنکاندنی ئەو ڕووبارە ڕزگاری کردین، هەروەك پێشتر لە پردەکەی وەندەن و کوێستانەکەی (بوکومارانی) ڕزگاری کردین.

چووینە ماڵەکەو یاسینم خوێندەوەو وەسیەتم پێ کرد، وتی: (٧٠) تمەنم بۆ بکەن بە ئیسقات، ئەم پارەیە ئەوکاتە زۆر بوو.

لە پاش سێ ڕۆژ کابرا هاتەوە وتی با مەلا مصطفی بێت (تلقین)ی بدات و(٧٠) تمەنەکە بێنێت بیکەن بە ئیسقات.

"لە بەشەکانی دواتری ئەم کتێبەدا باسی ئیسقاتم بەتەواوی کردوە".

(٧٠) تمەنەکەم دا بە مامۆستا و خستیە باخەڵیەوەو، باسی ئەوەی نەکرد کە ئیسقاتەکە بکەین بۆ حاجی بایز لە تاوانەکانی پاکی بکەینەوە، تا سێ مانگی بەسەردا چوو، مامۆستا دەیزانی کە من زۆر ڕوت و قوتم و ئەو جلانەم لەبەردایە کە دوو ساڵە هەمە لە ماڵی باوکم کە دەرچووم، چونکە شەرمم دەکرد بەیەکێ بڵێم یارمەتیم بدات.

ڕۆژێك فەقێیەك هات بۆ لام بۆ دێیەکە، لەبارەی مامۆستا باشەکانەوە زۆر شارەزا بوو، لێم پرسی کە باشترین مامۆستا لەکوردستانی ئێران یان عێراق کێ یە؟ بۆ ئەوکاتە وتی (مەلا محەمەدی ڕەئیس)ە کە مەلای دێی گەڵاڵەیە، لە شینکایەتی سەر بە سلێمانی. منیش بڕیارم دا بەناوی دیدەنی ماڵی باوکم ماڵئاوایی لە مامۆستا بکەم و بچم بۆ گەڵاڵە، پێم وت: دوو ساڵە ماڵی باوکم

نەدیوە نە من هەواڵی ئەوان دەزانم و نە ئەوان هەواڵی من دەزانن، لەبەر ئەوە تکایە مۆڵەتم بدە بچم دیدەنیان بکەم و تۆزێك پارەم بدەنێ بۆ جلوبەرگی تازە، چونکە دوو ساڵە هەر ئەوانەم لەبەر دایە، من لە کەس داوا ناکەم پارەم بداتێ، دەست پان ناکەمەوە بۆ پارە.

ماموستا وتی: باشە بەڵام شەو وەرە سەربانەکەی مزگەوت ئیسقاتەکەی حاجی بایز جێبەجێ بکەین، منیش دڵم خۆشبوو وتم ئیستا بە لایەنی کەمەوە نیوەی پارەکە دەدات بە من.

شەو لە پاش بانگی شێوان چووینە سەربانی مزگەوتەکە، کات بەهار بوو مانگە شەو بوو، حەفتا تمەنی لەگەڵ خۆی هێنابوو، دانیشتین لەماوەی کاتژمێرێکدا حاجی بایزمان لە هەموو تاوانێکی پاك کردەوە، یەکەمجار دەستمان کرد بە نوێژی فەوتاوی، ئینجا بۆ رۆژوی فەوتاوی، ئینجا سوێنی ناهەق و هەموو گوناهێکی تری.

ماموستا دەیوت: ئەوا حەفتا تمەنەکەم دا بەتۆ کەفارەتی (گوناهـ)ێکی، منیش دەم وت: قبوڵم کرد و ئەوا دامەوە بەتۆ.

ئیتر وشەی (گوناهـ) هەرجارە شتێك بوو، وەك ئەوەی لەو رۆژەی کە لە دایك بووە بەبێ ئەوەی یارمەتی هەژارێك یان یەکێك بدات، ئێمە بە (٧٠) تمەن هەموو ژیانمان پاك کردەوەو کردمان بەپەپولەی بەهەشت، ماموستاش دوو تمەنی دا بە من و (٦٨)ی بۆ خۆی هەڵگرت. هەرچەندە لە دێکەدا لەپاش ئاغا کەس لە ماموستا دەوڵەمەندتر نەبوو.

## چۆن عیلمی مەنتیقم لا خۆشەویست بوو لەنێوان ئەو ماددانەی لە مەدارسی دینیدا دەخوێندرا

ئەوکاتەی لە دێ بوکر (مطول)م دەخوێند، فەقێیەکی دیکە هات دەستی کرد بە (عبدالله یەزدی) لە مەنتیقدا، لە ئەوەڵی کتێبەکەوە کە دەرسی بە فەقێکە وت، ئەڵێ (سمی حبیب الله). مامۆستا رووی کردە من و وتی ناوی چیبوو، منیش بۆم نەهات یەکسەر بڵێم ناوی محەمەد بووە، زەردەخەنەیەکی کرد و تەماشایەکی کردم و وەك ئەوەی بڵێ تۆ متەوەل دەخوێنی و نازانی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە.

لەدوای دەرسەکە لەداخانا نانم نەخوارد، چووم بۆ نێو ئەو ئەشکەوتانە کە لە پشتی دێکەوە بوون، چوومە ئەشکەوتێك و دەستم کرد بە گریان بۆ خۆم، کە بۆچی ئەو پرسیارە ئاسانەم جواب نەدایەوە.

ئینجا خووم دایە مەنتیق، هەرچی کتێبی مەنتیق بوو خوێندبووم یان ئەمخوێند، لەبەرم دەکرد، لەبەر ئەوە شارەزاییەکی زۆرم پەیداکرد و تا ئێستاش سودی لێ وەردەگرم، دوو کتێبم هەیە لە عیلمی مەنتیقدا، یەکیان (المنطق القانوني في التصورات) و دووەمیان (الصلة بين المنطق والقانون).

دەرسێکی دیکە لە عیلمی فیقها، عیلمی میرات، زۆرم لا ناخۆش بوو، لەبەر ئەوەی زۆر بە زەحمەت فێری دەبوویت، بەڵام پاش ئەوەی فەرائیزی شێخ مەعروفم خوێند لای مامۆستا مەلا باقرِ، خوا لێی خۆش بێت، زۆر ئیهتمامم

پێکرد، کتێبەکە بریتی بوو لە ٤٠٠ شیعر، هەمووم لەبەرکردن، ڕۆژی جومعان دەچومە نێو مەقبەرەکە لەسەر کیلێك دادەنیشتم و دەرسەکەم دەور دەکردەوە.

گرنگی عیلمی مەنتیق لەوەدایە، هیچ مەوزوعێك کەس ناتوانێ تەحلیلی بکا تەحلیلێکی عیلمی دەقیق، ئەگەر مەنتیق نەزانێت. لەبەر ئەوەی عیلمێکە فێری ئەوەت دەکات عەقڵ بەکار بهێنی، بەکارهێنانی عەقڵ لە هەموو شتێکدا ئەوەڵەن لەڕێگەی قورئانەوەو دووەم لەڕێگەی مەنتیقەوە دەبێت.

هەتا صەحابەکان کە بەو شێوەیە متفوق بوون، چونکە بە مەنتیقی قورئان و مەنتیقی پێغەمبەر کاریان دەکرد.

لە کولیەش زۆر ڕقم لە بابەتی جینائی بوو، لەبەر ئەوەی عیلاقەی بە ئیعتدای شەخصێك بوو بەسەر شەخصێکی تر، بەڵام سوور بووم لەسەر ئەوەی فێری بم، بۆیە توانیم بەسەریدا زاڵ بم و کتێبیشی تێدا دابنێم.

# ئەنجومەنی
# کوردەکانی مەهاباد

ئەوکاتە من لە دێ بوکر بووم، ئەنجومەنێك پێکهاتبوو لە هەندێك ئاغاکانی موکریان و مامش و مەنگوڕ، وەك ئەنجومەنی سیادەی عێراق، کە دوای چواردەی تەمموزی (١٩٥٨ز) دامەزرا، ئەم ئەنجومەنە هەموو ئەرکی ئاسایشی ناوچەکە و ناوچەکانی کوردستانی گرتبووە ئەستۆ، بەردەوام لە مەهاباد دادەنیشتن، یەکێك لە نوێنەرەکان (عبدالله ئاغا کوڕی خدر ئاغا) سەرۆکی هۆزی مەنگوڕ بوو لە (دێ بوکر) هەفتەی جارێك دەهاتەوە بۆ ماڵەوە شەوەکەی دەهات بۆ لای من، شەوێك بۆی گێڕامەوە وتی:

دەوڵەتی شورەوی وەفدێکی نارد بۆ مەهاباد داوای کرد لە هەموو ئاغاکانی مامش و مەنگوڕ و موکریان و شنۆ و لاجان کە کۆببنەوە لە مەهاباد، وتی: لە پاش ئەم کۆبوونەوەیە وەفدەکەی دەوڵەتی شورەوی (اتحاد السوفیتی) وتارێکی دا وتی: ئێمە هاتووین داواتان لێ دەکەین کە بۆمان ڕوون بکەنەوە ئێوە چیتان دەوێت، وتی: هەر یەکێ لە ئاغاکان لیستەیەکی دەرهێنا بەناوی دێکەیەوە داوایان دەکرد کە کۆپینیان بۆ زیاد بکەن.

کۆپین بریتی بوو لە کارتی وەرگرتنی خواردەمەنی، چونکە ئەوکاتە کە دەوڵەتی شورەوی حوکمی سەرەوەی ئێرانیان دەکرد، بەپێی (کۆپین) خواردنیان دەدا.

وتی: سەرەك وەفدکە زۆر سەرسام بوو، وت:ی ئێمە هاتووین خواستەکانتان وەربگرین لە بابەت دەوڵەتی کوردییەوە و ڕزگاربن لە حوکمی فارسەکان، کەچی ئێوە داوای کۆپین دەکەن!

## ژیاننامەی مامۆستا

## مەلا حەمە ئەمین ئەحمەدییان (قاجری)



مامۆستا مەلا حەمەئەمینی قاجری کەلەگوندی دێبکر لەخزمەتیا خوێندم باوکی ناوی ئەحمەدە شۆرەتی خێزانەکەیان ئەحمەدییانە.

ساڵی ١٢٨٢ی کۆچی هەتاوی لەگوندی قاجریان لەدایك بووە، لەچەندین ناوچەی کوردستان خوێندویەتی و پاش ئیجازە وەرگرتنی لەچەند مەدرەسەیەکدا خزمەتی کردووە، ئەو کاتەی من چومە خزمەتی لەگوندی دێ بوکر بوو کە پازدە کیلۆمەتر لەمەهابادەوە دوورە.

ساڵی ١٣٥٥ی کۆچی هەتاوی لەتەمەنی حەفتا و سێ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و سێ کوڕ و سێ کچی لەپاش بەجێماوە بەناوەکانی محمد و علی و خالد و سارا و سەعدە و توبا.

# چوونم بۆ گەلاڵە

با بێینەوە سەر سەفەر کردنم لەدێ بوکر، بەیانیەك زوو هەڵسام و کتێب و لێفەکەم برد بۆ ماڵی کوێخا حمە ئەمین، لەوێ ماڵئاواییم لێکردن دەستیان کرد بەگریان، وتم: هیوادارم چاوم پێتان بکەوێتەوە، بەڵام بەداخەوە ڕێك نەکەوتەوە بچمەوە بۆ ئەو شوێنە، فەقێ عەبدولڕەحمانیش بەرەو ناوچەی خۆی گەڕایەوە.

دوای ئەوەش تمەنێك قەرزار بووم لە دوو تمەنەکە قەرزەکەم دایەوە، ئینجا لە تمەنەکەی مابوو پێنج قەرانم خەرج کرد و پێنج قەران مایەوە بۆ ئێستری ڕێگا.

دەستم کرد بەڕۆیشتن بەرەو سێو سێنایەتی لە کوردستانی عێراق، دونیا زۆر گەرم بوو زۆر جار پێڵاوەکانم دادەکەند و دەمگرت بە دەستمەوە، چونکە بن پێم هەمووی خوێناوی بوو بەهۆی بەرد و داری ڕێگە و بزمارەکانی ناو پێڵاوەکانەوە، دڕکی ڕێگە وەك سەرە دەرزی دەچوو بەپێمدا، بەڵام هەستم بە هیچ نەدەکرد، بەدوای دوانزە عیلمدا دەگەڕام.

لە پاش ڕۆیشتنی ماوەیەکی زۆر بەرەو گەلاڵەی شینکایەتی، دیم دوو کەس لە دوامەوە دێن یەکی ئێسترێکیان پێ یە بەبێ بار، کاتێك گەیشتنە لام لێیان پرسیم: تۆ چیت و بۆ کوێ دەچیت؟ وتم: من فەقێم دەچم بۆ گەلاڵە بۆ شینکایەتی بۆ خوێندن، ئیتر هیچیان نەوت تا ماوەیەك بەیەکەوە ڕۆیشتین، وتم: من ناتوانم بەپێ بڕۆم، پێنج قەرانم پێیە، بایی ئەوە سواری ئێسترەکەم بکەن، ئەوانیش پێنج قەرانەکەیان وەرگرت و سواری ئێسترەکەیان کردم هەتا گەیشتینە ئاوی زێ، بەرامبەر دێی (زەرونێ) و (سەقرە)، بەمنیان وت: ئێمە لێرەوە دەچین بۆ پشدەر، تۆش لەم پردەوە بپەڕێرەوە بڕۆ بۆ ئەوبەر، پردێکی دارینی لەسەر بوو چوومە ئەوبەر، نزیکی ئێوارە بوو، ئیتر ئەو شەوە لە زەرونێ مامەوە، بۆ

بەیانی زوو چوومە گەلاڵە. دیم تەنها یەك مستعد و یەك سوختەی تێدایە، مستعدەکە خوالێخۆشبوو مەلا ئەحمەدی لۆتەر بوو، کاتێك ماموٚستا هات و دەستم ماچ کرد، پێم وت: ماموٚستا ئەمڕۆ دوو ڕۆژە بەپێ خاوسی هاتووم بۆ لات بۆ خوێندن.

ماموٚستا زۆر بەزەیی بەمندا هاتەوە وتی: ئەم دێیە زیاتر لە (٣٠٠) ماڵی تێدایە بەماڵی ئاغاوە، بەڵام لەبەر گرانی جەنگی دووەمی جیهانی و بێ بارانی و کەمی دەغڵ و دان دێکە ناتوانن دوو فەقێ تێر بکەن.

وتم: ماموٚستا چارەم چیە؟

وتی: بڕۆ بۆ پشدەر ژیان لەوێ باشترە لای مەلایەك بخوێنە هەتا دەغڵ و دان پێدەگات و ئەوکاتە وەرەوە بۆ لام جێگەت دەدەمێ هەروەك کوڕی خۆم تەماشات دەکەم.

وتم: چ مەلایەکی باش دەناسیت لە پشدەر بچم بۆ لای.

وتی: بڕۆ بۆ لای مەلا حسێنی دەشتێوی کە مەلای دێی (نورەدین) بوو.

منیش ئەو شەوە لەوێ بووم بۆ بەیانی جارێکی تر پەڕیمەوە ئەوبەری ئاوی زێ ڕووەو پشدەر چووم بۆ (دێی نورەدین)، لە پاش نوێژی نیوەڕۆ گەیشتمە ئەوێ، چوومە ناو فەقێکان زۆر ڕێزیان گرتم، پێیان وتم جێگە هەیە، با ماموٚستا بێت داوای جێگەی لێ بکە.

پاش ئەوەی ماموٚستا هات بۆ حوجرە دەستم ماچ کرد وتم: ماموٚستا من (مطول) دەخوێنم هاتووم بۆ لای تۆ جێگام بدەرێ و دەزانم جێگایشت هەیە.

تەماشایەکی کردم سەر و سەکوتی منی دی زۆر ڕوت و قوتم و زۆر چڵکن و چەپەڵم وتی: جێگە نیە.

منیش پیاڵە چاکەم بەدەستەوە بوو دامنا، زۆر پێم ناخۆشبوو، دڵم پڕ بوو بۆ خۆم، وتم: ماموٚستا پەیمان بێت لە ڕۆژی قیامەت لای پێغەمبەری خوا شکاتت لێ بکەم!

ئەویش زەردەخەنەیەك گرتی و هەر بەخەیاڵیدا نەهات.

## گەڕانەوەم بۆ شنۆ و لاجان




بڕیارمدا بگەڕێمەوە بۆ ئەو ناوچانەی لێیان بووم، بەڵام دەبێت بچمە شوێنێکەوە زۆر دوور بێت لەمەنگوڕ، چونکە من درۆم لەگەڵ مەلا حمە ئەمین قاجری کرد کە وتم دەچمەوە ماڵی باوکم، لەبەرئەوە ڕۆیشتم بەرەو (پەسوێ).

پەسوێ وەك پایتەخت وابوو بۆ عەشیرەتی مامش، کە قەرەنی ئاغا سەرۆکی ئەو عەشیرەتە بوو، ئەمانە دێهاتێکی زۆرن بڵاو بوونەتەوە بەناو دەشتی لاجاندا، کە دەشتێکی پان و بەرینی بەپیتە، هەمووی کشتوکاڵە، بەشێکی پێی دەوترێت (شاروێران)، ئەم دەشتە بەهاویناندا پێویستی بە ئاو نیە، چونکە سروشتی زەوییەکە وا هەڵکەتووە هەموو جۆرە کشتوکاڵێکی تیا دەکرێت، بەزۆری ئەوان دەیانکرد بە چەوەندەری شەکر و دەیانناردە بۆ (میاندوواو) بۆ کارگەی شەکر،

لەویَ دەیانکرد بە کەللە شەکر. هەرچەندە ئەمە ناوی دێ بوو، بەڵام زیاتر لە (٥٠٠) ماڵی تێدا بوو، ماڵی ئاغا زۆر بەرز بوو دەیڕوانی بەسەر دێکەدا، ئەم ئاغایە لەنزیکی دێیەکە لە دەرەوە حوجرەی کردبوو بۆ فەقێکان و ژووری زیادەی هەبوو بۆ خواردەمەنی و شتومەکی فەقێکان، ئەم مەدرەسەیە وەك کۆلیجێکی شەریعەت وابوو، هەردەم لە (٣٠) فەقێ کەمتری نەبوو، لە (١٢) مستعد و (١٨) سوختە پێکهاتبوو، زۆرترین ئەرکی ئەم فەقێیانە و مامۆستا لەسەرشانی قەرەنی ئاغا بوو، بەرامبەر بە حوجرەی فەقێکان جێگای دەست بەئاو گەیاندن و حەوزی جیا هەبوو، پەیوەندی نەبوو بە مزگەوتەوە، یەکەمجار بوو کە مەدرەسەیەکی وا ببینم لەکوردستانی ئێران و عێراقدا.

مامۆستا مەلا (عبداللە ی پەسویَ) مەلایەکی زۆر چاك بوو، وەك وتم فەقێیەکی زۆری هەبوو (١٢ مستعد)، هەموو رۆژێك دەرسی بەشەشیان دەوت، شەشەکەی تر گویَ گر بوون، ئەگەر یەکێك ئیجازەی تەواوکردنی خوێندنی وەربگرتایە یەکێکی تر جێگەی دەگرتەوە.

پێیان وتم: فەقیَ یەك بەم نزیکانە ئیجازە وەردەگریَ مامۆستا جێگەکەی دەدا بەتۆ.

کاتێك مامۆستا هات داوای جێگەم لێکرد وتی: جێگە هەیە لەم رۆژانەدا یەکێك ئیجازە وەردەگریَ دەتخەمە جێگەکەی، بەڵام لەبەرئەوەی ناتناسم بچۆرە ئەم نزیکانە لە مزگەوتی دێیەك تا شەش مانگ بمێنەرەوە، ئینجا کە شارەزای رەوشتت بووم ئەوکاتە پەیمان دەدەم کەبێیتە ئێرە بخوێنیت.

منیش بەفەقێکانم وت: ئەم گومانەم لە هیچ مامۆستایەك نەبینیوە، بۆچی دەبێت گومانی خراپ لە فەقێیەك بکات بەدوای خوێندندا دەگەڕێت؟

وتیان: دڵگران مەبە پێش ماوەیەك فەقێیەك هات نامەیەکی هێنابوو لە مامۆستای گەورەی کۆیەوە، کە بەدوای خوێندندا دەسوڕێتەوە، بەڵام دواتر وا دەرنەچوو، ئیتر فەقێیەکەی دەرکرد، لەو جارەوە مامۆستا بڕیاری داوە فەقێیەك نەناسیَ جێگەی پیَ نادات.

ئینجا وتم: ڕووەو کوێ بڕۆم باشە؟ وتیان: ڕووەو ناوچەی هەرکی، لەو دیوی شاری (شنۆ)یە مەلایەکی چاکی لێیە، پێی دەڵێن (مەلا جەلالی شکاك).

منیش هەروەك جاران بەپێ ڕێگەکەم گرت، یەکەمجار چوومە شاری (شنۆ)، کە زۆر جوانە بەهۆی لێژی شارەکەوە کە بەرەو دەشتی لاجان هەمووی لەبەر کشتوکاڵ شینەو هەر چواردەوری شارەکە باخ و باخاتە، هەمووی گوێز و قەیسی و هەڵوژە و هەرمێ و سێو و جۆرەکانی تری میوەن، لە ناوەڕاستی ئەم شارەدا ئاوێك دێتە خوارەوە ئەوکاتە کە هاوین بوو زیاتر بوو لە دوو جۆگای ئاش، ئەم ئاوە سەرەتاکەی لە بەفراوی کوێستانی (گڵاس) کە لوتکەیەکە کەوتۆتە ناوەڕاستی یەکگرتنی سنوری هەرسێ وڵاتی (عێراق و ئێران و تورکیا)، هەر ئەم ئاوەیە لە پاشدا دێتە عێراق پێی دەڵێن زێی بچووك.



مزگەوتی گوندی کانی سپی (آقبلاغ) - ٢٠١٥

## مامۆستا
## مەلا جەلالی شکاك

ئەو شەوە لە شنۆ مامەوە، بۆ بەیانی ڕووەو هۆزی هەرکی رۆیشتم، بۆ نیوەڕۆ گەیشتمە دێیەکی گەورە ناوی کانی سپی (اقبلاغ) بوو، مامۆستا (مەلا جەلالی شکاك) مەلای ئەم دێیە بوو، لەپاڵ پارچە باخێکی چناردا حوجرەی فەقێکان و حوجرەی خۆی کردبوو، شوێنەکە هەمووی باخ و سەوزایی و کوێستان بوو، هاوشێوەی کەمە لەجێگە خۆشەکانی ئەوروپا.

چوومە حوجرەی فەقێکان، مامۆستا هات دەستم ماچ کردو وتم: مامۆستا من لە هەورامانەوە بەپێ هاتووم گەیشتوومەتە ئێرە و نابێت تۆش وەك مەلاکانی تر بیانووم پێ بگریت بلێیت جێگەم نیە، زۆر ماندووم توانای گەڕانم لەوە زیاتر نەماوە، جێگەم بدەیتێ یان نا من دانیشتووم لەم حوجرەیە ناچمە دەرەوە.

مامۆستا وتی: بەخێر بێیت، وادیارە بەدڵسۆزی بەدوای خوێندندا دەگەڕێیت، وەك کوڕی خۆم تەماشات دەکەم، هەتا بتەوێت لێرە بمێنیتەوە من خاوەنی ئەم حوجرەیە نیم.

منیش لەوێ دەستم کرد بەکتێبی (مطول) کە گەیشتبوومە نزیکەی نیوەی، لای سێ مامۆستا خوێندبووم، یەکەم لای مامۆستا مەلا حمە ئەمینی قاجری، دووەم لای مامۆستا مەلا جەلالی شکاك و سێهەم لای مامۆستای پایەبەرزی هەمووومان جەنابی مامۆستا مەلا (عبدالکریمی مدرس) خوا تەمەنی درێژ بکات، چونکە لەو مەلایانەیە کە کتێبەکانی سودی هەبێت بۆ ئایینی ئیسلام و کورد و کوردستان.

لە پاش (١٠) رۆژ پیاوێکی ئەسعەد ئاغای هەرکی هات بۆ لای مامۆستا دوو ئەسپی هێنا بوو، وتی: مامۆستا، ئەسعەد ئاغا زۆر نەخۆشە پێی خۆشە چاوی پێت بکەوێت، ئەم دوو ئەسپە یەکێکیان خۆت سواری ببە و ئەوی تریان فەقێیەك بێنە لەگەڵ خۆت.

ئەم ئاغایە خۆی لەئاغاکانی کوردستانی عێراق بوو، بەڵام عەشیرەتی هەرکی کە ئەو سەرۆکایەتی دەکرد لە ئێرانیش هەبوون، جگە لەوانەی لە عێراق بوون.

ئەو کوێستانە هاوینەهەوار بوو، هەموو ساڵێك بە ماڵ و منداڵەوە دەهاتە ئەوێ لەخاکی کوردستانی ئێران.

مامۆستا لە نێوان فەقێکاندا منی هەڵبژارد بۆ ئەوەی لەگەڵی بڕۆم، هەرچەندە فەقێکانی تر لەپێش مندا چەند ساڵێك بوو لەوێ بوون، دیارە ئەمە خوا خستیە دڵیەوە کە لەناو هەموویاندا منی هەڵبژارد، کاتێك کە چووینە ماڵی ئاغا، لە شوێنێکی بەرزدا بوو لە نێوان هەرسێ سنوری عێراق و ئێران و تورکیا، چوار دەواری گەورە هەڵدرا بوون، یەکێ بۆ میوانی تایبەتی، یەکێ بۆ خێزانەکەی، یەکێ بۆ پیاوەکانی و یەکێك بۆ خواردن کردن و ژنە ئیش کەرەکان.

ئابی ١٩٤٣ بوو، بەیانی کە هەڵستاین بۆ نوێژ، دنیا ئەوەندە سارد بوو لەسەرمای چلەی زستانی هەموو ئەو جێگانە ساردتر بوو کە بینیبووم، لەبەرئەوە دوو مەقەڵی خەڵوزیان دادەنا بۆ ئەوەی ناو دەوارەکە گەرم بێت و سەرمامان نەبێت، دۆڵەکانی ئەم دیو و ئەو دیوی ئەو شوێنە هەمووی بەفر بوو، لە کاتێکدا کە هاوین بوو مانگی هەشت بوو، کە گەرمترین مانگەکانی هاوینە.

یەکێ لە پیاوەکانی بەمنی وت: تۆ خەڵکی کوێیت؟

وتم: من خەڵکی کوردستانی عێراقم.

وتی: ئەو ئاوەی لە عێراق پێی دەڵێن زێی بچووك سەرچاوەکەی ئەم بەفرەیە کە لەبەر دەستایە.

مامۆستا لەو کاتەدا هەندێ دوعای خوێند بەسەر ئەسعەد ئاغادا و هەندێ دوعای فێرکرد، لە هەمان کاتدا پزیشکێك هاتبوو لە (ورمێ) هێنابوویان بۆ تەداوی.

لە پاش دوو ڕۆژ ماڵ ئاوایمان لە ئەسعەد ئاغا کرد، (١٥٠) تمەن و جوتێ پێڵاوی دا بە مامۆستا و (١٠٠) تمەنی دا بەمن، کاتێك گەڕاینەوە مۆڵەتم وەرگرت لە مامۆستا چووم لە شاری شنۆ سەرتاپا جلم کرد بە پۆشتەیی، ئەمە یەکەمجار بوو جل بگۆڕم لەوکاتەوەی لە ماڵی باوکم دەرچوو بووم.

# سەیرانی

# سەر دەریاچەی ورمێ

لە نزیکی شاری (ورمێ) کە لە دواییدا ناویان نا(ڕەزائیە)، شارێکی زۆر خۆشە دانیشتووەکانی کورد و ئازەرین، زۆرینەیان کوردن، دەریاچەیەکی گەورە هەبوو پێیان دەوت (دەریاچەی ئورمێ) و دانیشتوانی ئەو دێهاتانەی کە لێوەی نزیك بوون هەموو ساڵێك (١٠) رۆژ پێش وەرزی هاوین تەواو بێت بەماڵ و منداڵەوە دەچوون بۆ سەر دەریاچەکە و خواردنی بەشی دوو رۆژیان دەبرد، ئەمە بوو بوو بەخویەکی پیرۆز لایان.

ئێمەش مامۆستا و فەقێکان چووین بۆ دێیەك، لەوێوە بۆ سەر دەریاچەکە، ئەم بەر و ئەوبەری میوەی کشمیش و قەیسی و سێو و هەرمێ و هەڵوژە بوو، هەندێك لە شوێنەکان کرابوون بە کاڵەك و شوتی، وەك خڕەبەرد بەریان گرتبوو، شوتی ئەو شوێنە لە شیرینیدا وەك هەنگوین وا بوو، ئەم دوو رۆژە لە رۆژە خۆشە کەمەکانی ژیانم بوو.

# مەتەڵەکەی
# مامۆستا مەلا جەلال

ڕۆژێکیان مامۆستا ڕووی کردە فەقێکان وتی: مەتەڵێکم لایە هەرچەندە مەتەڵ نیە چونکە لەسەر زاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتراوە کە ئەویش دەڵێت:

(أولدت أمي أباها في بطون المعجزات وأنا طفل صغير في حضون المرضعات، وأبي شيخ كبير في علو الدرجات، فهي أمي، بنت عمي، خالتي، إحدى بناتي).

واتە: دایکم منی هێنایە دنیاوە لە سکی (معجزات)دا ومن منداڵێکی بچووک بووم لە کۆشی ئەوانەدا شیریان پێ دام و، باوکم مرۆڤێکی گەورە بوو لە پلەیەکی بەرزدایە، وە ئامینە دایکمە و کچی ماممە و یەکێکە لە کچەکانم.

ئێمەش زۆرمان بیرکردەوە و لێمان کۆڵیەوە نەمانزانی مەبەستی چییە لەم وتەیە، ڕۆژی دووەم پێش ئەوەی بگەڕێینەوە من چووم لە قەراغ ئاوەکە مەلەم کرد، ناو ئاوەکە خوێ بوو کە دەچوویە سەر لمەکە هەموو لەشت دەکزایەوە، لەبەرئەوە چومە شیوێك کە سێبەر بوو، دانیشتم بیرم لەم بابەتە کردەوە، تەماشا دەکەم ئەمە پەیوەندی هەیە بە وتەیەکی ترەوە ئەویش دروستکراوە بەناوی خواوە دەڵێت: (لولاك لولاك لما خلقت الافلاك)، واتە: لەبەر تۆ نەبوایە ئەم گەردونەم دروست نەدەکرد، دیارە ئەمە هەڵبەستراوە و پەیوەندی نیە بە فەرموودەی خواوە هەرچەندە زۆر کەسی ساویلکە باوەڕی پێی هەیە.

بەڵگەی ئەمە کە ڕاست نیە درۆیە، گەورەیی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خوا پێی داوە نەك خۆی، بەڵام ئەمە بەدەم خواوە هەڵبەستراوە، وەك مەتەڵەکەش بەدەم پێغەمبەرەوە هەڵبەستراوە.

ئەم دوو وتەیە پەیوەندیان هەیە، وەك بۆ مامۆستا و فەقێکانم باسکرد و هەموویان پەسندیان کرد.

(اولدت امي اباها من بطون المعجزات): ئامینەی دایکم باوکی خۆی هێنایە دونیاوە لەبەر ئەوەی ئەگەر من نەبوومایە ئەویش نەدەبوو، لەبەرئەوە لەو ڕووەوە من باوکیم واتە باوکی ئامینە.

(وأنا طفل صغير في حضون المرضعات): مانای ئەمە دیارە چونکە پێغەمبەر کە لەدایك بووە دایکی خۆی شیری نەبوو بەڵکو (حليمة السعدية) شیری پێدا.

(فهي أمي بنت عمي خالتي إحدى بناتي): واتە: ئامینە دایکیەتی ئەمە ئاشکرایە، کچی مامە، لەو ڕووەوە کە باوکی ئەو و باوکی من من بووم بەهۆی هاتنیان بۆ ئەم دونیایە، واتە باوکی هەردووکیان وەك باوکی من وان و ئەوانیش وەك برا وان، ئینجا بەم پێیە ئامینە دەبێتە کچی مامم و خوشکی دایکم چونکە لەو ڕووەوە من بووم بە سەبەبی هاتنیان بۆ ئەم دنیایە، هەروەها یەکێك لە کچەکانم، چونکە من بووم بەهۆی ئەوانە هاتنە دنیایەوە بەپێی لێکدانەوە بۆ مەتەڵەکەی سەرەوە.

ئینجا کە ئەم مانایەم بۆ لێکدانەوە، مامۆستا زۆری پێ خۆشبوو وتی: ئافەرین تۆ زۆر زیرەکیت، بەڕاستی ئەو مانایەی مەبەستە لەم وتانەدا ئەوەیە، ئینجا هەر کەسێك وتبێتی.

لە پاداشتی ئەوە دەتکەم بە مەلای ڕەمەزان لە دێکەی خاڵم کە ئاغای شکاکە، بۆ ئەوەی ئەو وڵاتەش ببینی و سوود لەو مەلایەتیە وەربگریت.

# مەلایـەتی
# ڕەمـەزان لـە شـکاك

مامۆستا مەلا جەلال پیاوەتی زۆری لەگەڵ کردم، یەکێکی تر لە پیاوەتیەکانی ئەوەبوو ناردمی بۆ شکاك بۆ لای خاڵی و نامەیەکی دامێ بۆ (ئیبراهیم خان) بۆ مەلایەتی ڕەمەزان لە شکاك کە دوو ڕۆژ دوور بوو بەپێ و هیچ شتێکی تر نەبوو بۆ هات و چۆ.

بەپێ بەیانی کەوتمە ڕێ، گەیشتمە دێی (گەنگە چین) لە عەشیرەتی (ژپیران)، بەڵام کاتێك عەشیرەتی هەرکیم بەجێ هێشت سنوری عێراق تەواو بوو، زنجیرە شاخێك هەبوو لە نێوان تورکیا و ئێراندا، هەموو دانیشتووەکانی کوردی تورکیا بوون، کە لە ترسی (مصطفی کمال) ڕایان کردبوو پەناهەندە بوون لە ترسی کوشتن، نوێژی مەغریب کرا و چوومە ماڵی ئاغای ئەم دێیە، دوای ئەوەی نانمان خوارد لەدیوەخان یەکێکیان، پرسی وتی: ئەمڕۆ لەکوێوە هاتوویت؟ وتم: لە کانی سپیەوە هاتووم، وتی: ماڵی باوکت بڕمێ، وڵاخە بەرزەش ناتوانێ بەرۆژێ ئەوەندە ڕێگە ببڕێ، ئەو شەوە لەوێ چایەکیان بۆ هێنام لەبەر ئەوەی زۆر ماندو بووم زۆرم لاخۆش و بەتام بوو، زۆرم حەز دەکرد چایەکی ترم بۆ بێنن، بەڵام نەمن رووم هات داوای چایەکی تر بکەم، نەئەوان بۆیان هێنام، ئێستاش ئەو چایە هەر داخە لەدڵما.

## ئیبراهیم خان و شکاک

چوومە دێیەکەی ئیبراهیم خان کە ناوەکەیم لەبەر پیری لەبیر چۆتەوە، بەڵام نزیك شاری (قونیە) بوو، لە عەشیرەتی شکاك هەرچەندە لەوێ گەنم و جۆ و گەنمە شامی دەکەن، بەڵام لەبەرئەوەی ئاوی نیە کشتوکاڵی کەمە، لە دوای عەشیرەتی شکاك عەشیرەتی جەلالی دێت کە کەوتووەتە سەر سنوری دەوڵەتی شورەوی، ئاوی (ئاراس) کەوتۆتە نێوان خاکی کوردستانی ئێران و وڵاتی شورەووی، هەرچی زەوی بەپیتی کشتوکاڵی ئێران هەیە کەوتووەتە ناوچەی کوردستانەوە، وەك زەوییە بەپیتەکانی عێراق زۆری لە کوردستانە.

من کە چوومە خاکی ئێران ساڵی (١٩٤٠ز) بەناو عەشیرەتی لهۆن و کەڵا تەرزان و مەریوان و بانە و موکریان و لاجان و هەرکی و شکاك و جەلالی، ئەمانە کە پیایدا تێپەڕیم جگە لە (کەڵا تەرزان) کە خاکی کشتوکاڵی کەمە، هەموویان لە زەوییە زۆر بەپیتەکانی جیهانن، وەك باسم کرد دەشتی لاجان (شارویران) بەهاوینان چەوەندەری شەکری تیا دەکەن و خاکەکە پێویستی بە ئاو نیە، هەمووی ترێی کشمیشی و هەرمێ و سێو و قۆخە.

## جۆری ژیانی دانیشتوانی شکاك

جلوبەرگی پیاویان وەك جلوبەرگی (پۆلیس)ی ئەوکاتە بوو، پانتۆڵەکەی لە لای قاچیان تەسکە، هەردەم دەبێت ئامادە بێت بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی دوژمنی ببێتەوە، عەشیرەتی شکاك زۆر ئازا و بەناموس و بەغیرەتن، زۆرترین خواردنیان پەتاتەیە لەگەڵ گۆشت لێی دەنێن و هەندێ شتی تری تێ دەکەن دەیخەنە ناو دیزەیەکی گەورەوە ئینجا دەخرێتە ناو تەنورەوە بەبوخاری تەنورەکە پێ دەگات و تام و لەزەتی هەرگیز تەواو نابێت.

جلوبەرگی ئافرەتیان وەك هەورامان و سلێمانی کراس و کەوای درێژە، بەڵام کڵاوێك دەکەنە سەریان نزیکەی (٣٠سم) درێژە، لە ڕووەوە زۆر بەرز نیە، ئافرەتیان زۆر بەئەدەبن و شان بەشانی پیاوەکانیان کشتوکاڵ دەکەن، جۆری نوستنی شکاك وەك هیچ جێگەیەکی تر نیە، زۆر سەیر دەنووستن، کاتی خەوتن خۆیان ڕوت و قوت دەکەنەوە وەك لە حەمامدا بێت، قورسینەك دادەنرێت لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ژێرەکەی تەنورە، لەکاتی سەرمادا ئەو تەنورە پڕ دەکەن لە پشکۆ و لێفەیەکی گەورە دەدەن بەسەر قورسینەکەدا و هەموویان خۆیان ڕوت دەکەنەوە و دەچنە ژێر قورسینەکە.

قورسین وەك مێز وایە بەڵام زۆر بەرز نیە و بەقەدەر دەمی تەنورەکەیە.

جیاوازی ئەمان لەگەڵ خەڵکی تر ئەوەیە خۆیان ڕوت و قوت دەکەنەوە و ژوورێکی جیا دەدەن بە ئافرەتەکانیان.

کە کاتی نووستن دەهات چرایان دەکوژاندەوە ئینجا خۆیان ڕوت دەکردەوە، دەهاتن بەمنیان دەوت: سەیدا بۆچی خۆت ڕوت ناکەیتەوە؟ منیان زۆر بەدوا

کەوتوو دەزانی کە بە جلەکانمەوە دەنووستم، ئینجا نازانم ئێستاش ئەو عورف و عادەتیان ماوە یان نا.

زمانیان زۆر جیاوازە لە سۆرانی و زۆربەی وشەکانیان من لێی تێ نەئەگەیشتم وەك ئەوەی بییان وتایە درێژبە دەیان وت (رازێ) یان بیان وتایە هەڵسە دەیان وت (ڕابە).

## مەولود نامەی
## شـــەوی ( لیـلـة القــدر )

هەموو ساڵێك شەوی (لیله القدر) عادەتیان وابوو (مەولود)یان دەکردو، مەولودنامەکە یەکێکیان دەیخوێندەوە.

لە پێش شەوی (لیلة القدر) مەولود نامەکەیان بۆ هێنام هەمووی شیعر بوو، وتیان سەیدا سبەینێ شەو دوای نوێژی شێوان ئەم مەولود نامەیەمان بۆ بخوێنەوە و هەموومان کۆ دەبینەوە لە ماڵی ئیبراهیم خان.

منیش کاتێك کە مەولود نامەکەم خوێندەوە لەبەر خۆمەوە سەیر دەکەم لە (١٠) وشە چوار وشەی تێ ناگەم، جگە لەوەش نەمدەزانی جۆری خوێندنەوەی و ددان پیانانی وشەکان (تلفظ)ی چۆنن. لێرەدا گیرم خوارد ناتوانم بڵێم نایزانم و ناشتوانم ڕەوانی بکەم لەو ماوە کەمەدا، هەر چۆن بوو لەیەکەم شیعرەوە پێنج شەش جار تا دوا شیعر خوێندمەوە، لەمن وایە ڕەوانم کردووە، دەتوانم بە ئاسانی بیخوێنمەوە.

کاتێك شەو هات، کۆبوونەوە، دەستم کرد بە خوێندنەوەی، دەبینم بە پیاو و ژن و منداڵ هەموویان نیوەی شیعرەکە یان هەموو شیعرەکەیان لەبەر کردووە، دوایی بە دەنگی خۆش وەك گۆرانی کاتی گێرە دەیان وت، جا لێرەدا ئیشەکە بۆ من ناخۆشتر بوو، چونکە کە پارچەیەك لە شیعرەکەم دەخوێندەوە و هەڵەم دەکرد،

منداڵە بچووکەکان دەیانوت وانیە و بەڕاستی لەبەر دەیانوت.

هەر چۆن بوو ئەو شەوە کە تەواو بوو لەبەر ئیبراهیم خان نەبوایە دەریان دەکرم دەیان وت ئەم نەخوێندەوارە چییە بووە بە مەلای ڕەمەزان.

شەوێکیان ئیبراهیم خان پاش ڕۆژو کردنەوە وتی: برادەرێکم هەیە لە دێیەکی تر بابچین بۆ لای، وتم: باشە، دوو ئەسپیان هێنا و سواربووین ڕێگەکە زۆر پان بوو، دوو ئەسپەکە بەیەکەوە دەڕۆشتن بەرێگەدا و مانگە شەو بوو، کاتێک لە ئاواییەکە دەرچووین چیرۆکێکی دوور و درێژی بۆ گێڕامەوە لە (٧٠٪)ی مەبەستەکەی تێ نەدەگەیشتم لەبەر جیاوازی زمانەکە، هەرکاتێك ئەو پێدەکەنی منیش دەستم دەکرد بەپێکەنین.

## سەرفیترە و زەکات

لەپاش نوێژی جەژن هەموو هاتن سەرفیترەکەیان پێ قەبڵاندم کە ئەمەش بەشێك بوو لەهۆی ژیانی مەلا و فەقێ، هەندێکیان زەکاتی گەنمەکەیان دا بە من، چونکە ڕەمەزان کەوتبووە کاتی خەلە و خەرمانەوە، لە پاشدا ئەوەی پێیان دام خۆیان بۆیان فرۆشتم نزیکەی (٥٠٠) تمەنیان پێ دام، ئەم پارەیە ئەوکاتە زۆر بوو.

من هیچ حیسابێکم نەکردبوو ئەو پارەیەم دەست بکەوێت، بەڵام دوای دووساڵ گەڕان و ڕۆیشتنم بۆ لای مەلا جەلال و ئەو ناردمی بۆ لای خاڵی و لەوێ بەبۆنەی ڕەمەزانەوە ئەم پارەیەم دەستکەوت، من زیاتر لە ساڵێك لەلای مەلا حمە ئەمینی قاجری خوێندم، کە باش دەیزانی من چۆن دەژیم و چیم پێیە، لە (٧٠) تمەنی ئیسقاتەکە دوو تمەنی دا بەمن، ئەم مامۆستایە کە سێ مانگ لای ئەو خوێندم و دەیتوانی یەکێکی کە بنیرێت بۆ مەلایەتی ڕەمەزان لەدێیەکەی خاڵی، بەڵام منی نارد، چونکە ئەو بۆ ماڵی دونیا دەرسی نەدەوتەوە، بەڵکو بۆ خوا بوو، خوا پاداشتی بداتەوە بە چاکە.

## ژیاننامەی
## سەیدا مەلا جەلالی ئەنصاری



مامۆستا کەلەگوندی کانی سپی لەنزیك شنۆ لەخزمەتیدا بووم ناوی جلال کوڕی مەلا نور محەمەدە، شۆرەتی بنەماڵەکەیان ئەنصاریە، ساڵی ١٣١٦ی کۆچی لەگوندی حەسەن ئاوای سەربەشارۆچکەی سۆما پارێزگای ئورمیە

لەبنەماڵەیەکی ئاینپەروەر دایك بووە.

هێشتا تەمەنی مناڵ بووە باوکی کۆچی دوایی کردووە، دایکی حەزی کردووە فێری زانستی ئاینی ببێت، بۆ ئەو مەبەستە ناردوویەتی بۆ گوندی سەیدان بۆ خزمەتی مامۆستا مەلا مەحمود کەمامی باوکی سەیدا مەلا جەلال بووە، لەوێ قورئانی خەتم کردووە، مامۆستا مەلا مەحمود دەیباتە گوندی ممکان تالەخزمەت قازی مەلا حوسەینی دۆستەکیدا بخوێنێت، دواتر بۆ خوێندن چەندین مەدرەسە لەرۆژهەڵات و باشوور و باکووری کوردستان گەڕاوە.

سەیدا مەلا جەلال پاش خوێندنی ئەو زانستانەی لەمەدرەسەکاندا دەخوێندرا لەخزمەت مامۆستا مەلا خەلیل گور عمری لەدێی میراوا لەسەردەشت لە ٢٨ی رەجەبی ساڵی ١٣٥٢ دا ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە.

دواتر گەڕاوەتەوە گوندی حەسەن ئاوا و سەرقاڵی دەرس وتنەوە بووە، ماوەی یەك ساڵ لەگوندی سنگر دەرسی وتۆتەوە و دواتر هاتۆتە کانی سپی (ئا قبلاغ) و بۆماوەی سیازدە ساڵ تێیدا ماوەتەوە و دواتر چەند ناوچەکی دیکە گەڕاوە و دەرسی تێدا وتۆتەوە و دواجار ساڵی ١٣٥٣ی کۆچی شەمسی هاتۆتەوە گوندی قۆنی و تاکۆتایی ژیانی لەوێ خزمەتی کردووە.

رۆژی سێ شەمە ٢٨ی مانگی ئەردەبیشتی ساڵی ١٣٧١ی کۆچی شەمسی لەنەخۆشخانەی تاڵەقانی لەشاری ئورمیە کۆچی دوایی کردووە.

خوای گەورە لێی خۆش بێت و جێگای بەهەشتی نەبڕاوە بێت، بەڕاستی مامۆستایەکی زانا و خەمخۆر و زانست دۆست بوو.

## گەڕانەوەم بۆ عێراق

چوومە خزمەت مامۆستا مەلا جەلال و داوای مۆڵەتم لێکرد کەئیزنم بدات بچمەوە بۆ سەردانی ماڵی باوکم، ئەویش مۆڵەتی دام، لەوکاتەدا مەلا موسای ئاکۆیی ئەویش لەلامان بوو لە شاری شنۆ یەکمان گرت، بڕیارماندا پێکەوە بگەڕێینەوە عێراق، وتی من نزیکترین ڕێ دەزانم، دەچینە ئاکۆیان دوو ڕۆژ لەماڵی ئێمە بمێنەرەوە، لەوێوە بۆ قەڵادزێ نزیکە بچۆرە ئەوێ، لەوێ ئۆتومبێل هەیە بچۆرەوە بۆ سلێمانی.

لە مانگی یەکەمی پاییزی ١٩٤٣، لە شاری (خانێ) کە کەوتووەتە نزیکی شاری شنۆ هاتینە حاجی هۆمەران لەوێ بەڕێگەیەکدا بەناو (شاخی قەندیل) ڕووەو ئاکۆیان ڕۆیشتین.

کە گەیشتینە دێکەی مەلا موسا، دیم بەهەشتێکە بەڕووی دونیاوە، پڕ لە باخ و باخات، شاهەنجیر گەرمەیەتی، هەر هەنجیرێکی پڕی چنگێك دەبێت دەتوت هەنگوینە، دووشەو لەوێ بووم، هەردوو بەیانیەکە بۆ بەرچایی دوو شانە هەنگوینی گەورەیان لەگەڵ کەرەی زەرد بۆ دانام.

مەلا موسا زۆر بەوەفا بوو، ساڵی (١٩٧٠) جارێکی تر هات سەری لێداین لەبەغدا، تەنەکەیەك لەو هەنگوینەی بۆ هێنابووین.

مەلا موسا لەگەڵمدا هاتە دەرەوەی دێیەکە و ڕێگەکەی پیشان دام و ماڵئاواییم لێ کرد، کەوتمە ناو ئەو شاخ و بەرد و دارستانە کە هەمووی دار بەڕوو بوو تا گەیشتمە قەڵادزێ، چوومە حوجرەی فەقێکانەوە، لەوێش دوو

ڕۆژ مامەوە، ئوتومبێل نەبوو بۆ سلێمانی جگە لە لۆری کە توتنی دەبرد بۆ سلێمانی.

ڕۆژی دوایی کاتژمێرێکیان هێنا بۆ لای مامۆستا پێیان وت ئەمە (لۆنجین)ە، کاتژمێرێکی زۆر جوان بوو، وتیان ئەمە خاوەنەکەی کۆچی دوایی کردووە و (وەرەسەکەی) دەیفرۆشن وکەس نیە بیکڕێت، من لەو کاتەدا (٥٠٠) تمەنم پێ بوو کڕیم بە (١٥٠) تمەن تا ماوەیەکی زۆر لام بوو، دوایی دام بە باوکم ئەویش دوایی دای بە ئامۆزایەکم.

چوومە گەراج لۆریەك وەستا بوو، وتی فەقێ لە پێشەوە جێگا نیە دەتوانیت بچیتە دواوە لەسەر فەردە توتنەکان دابنیشی، منیش بەناچاری ڕازی بووم، بەیانی زوو لە قەڵادزێ دەرچووین بۆ سلێمانی، منیش وەك چۆلەکە بەسەر دارەوە بوم، سەرما لێی دەدام لەسەر فەردەکان دانیشتم، بەڵام خۆم زۆر بە خۆشبەخت دەزانی کە لە ماوەی دوو ساڵدا ئەمە یەکەمجارە بەپێ ناچم بەڕێگەدا.

# سێوی سەردەشت

کاتێك چوومە سەر لۆریەکە دیم کە کیسەیەکی خام پڕیەتی لە سێوی لاسوری سەردەشت، بۆنی سێوەکان زۆر خۆشبوو، منیش شەیتان چووە ناو دڵمەوە بۆ یەکەمجار ئەو تاوانەم کرد، کیسەکەم کردەوە سێوێکم دەرهێنا لەبەر بۆنەکەی و ڕەنگە جوانەکەی کە لایەکی سور و لایەکی زەرد بوو.

هاتینە سلێمانی هەندێك لە پارەکەم دا بەدیاری بۆ ئەو خزمانەم کە دوو ساڵ بوو لێیان دوور بووم، جوتێك پێڵاوی گران بەهای ژنانەم کڕی بۆ دایکم، سێوەکەم خستە ناو تاکێکی پێڵاوەکە و لەگەڵ شتەکانی تر لەناو بوخچەیەکدا بردم بۆ دوکانی حاجی مەلا مصطفی سورە کە برادەری باوکم بوو، وتم: حاجی ئەم بوخچەیە لای تۆ دادەنێم لە دوکانەکەدا تا سبەینێ دەڕۆمەوە بۆ زەڵم.

کاتێك بۆ بەیانیەکەی شتەکانم وەرگرتەوە، تەماشا دەکەم مشك هێندەی پانایی سێوەکەی لە چەرمی پێڵاوەکەی خواردووە، ئینجا بۆم دەرکەوت کە تاوانبار زۆر جار سزاکەی ناکەوێتە ڕۆژی قیامەت، ئەو سێوەی کە من دزیم ئەوکاتە نرخی لە (١٠) فلس زیاتر نەبوو سزاکەی بوو بە سەد قاتی ئەوە، چونکە پێڵاوەکان کەڵکیان نەما و مشکەکە لەبەر سێوەکە نەبوایە نەدەچوو بۆ لای پێڵاوەکان.

لەمەوە بۆم دەرکەوت کە یەکێك چەند بەلایەوە شتێك بچووك بێت ئەوا سزاکەی وەردەگرێت بەچاك یان خراپ، لە ماوەی ژیانمدا نەمبینی یەکێك لەسەر چەوتی بڕوات هەتا کۆتایی سودی لێ ببینێت، نەمدی یەکێك لەسەر

ڕاستی بڕوات تاسەر توشی شتی خراپ بێت، جوتیارێك هەر تۆوێك بچێنێت هەر ئەوە دەردەچێت، جارێك نەبووە جوتیارێك گەنم بوەشێنێت و جۆ بدورێتەوە، وەك سەعدی شیرازیش دەڵێت:

راستی موجب رچای خداست
کس ندیدم که گم شد از ره راست

واتـــــه:

راستـی هـۆکاری رازیبـوونی خـوایە
کەسم نەبینیوە لەسەر رێی راست ون ببێت

## شـادبوونەوە بـە زەڵـم

کاتێك گەیشتمەوە دێی زەڵم نزیکی خۆرئاوا بوو، هەموو خزمەکانم ڕژان بەسەرمدا جگە لە باوکم، هەرچەندە چاوم گێڕا باوکم دیار نەبوو، وامزانی کۆچی دوایی کردووە، وتم: ئەوە باوکم کوا؟ وتیان: زیاتر لە (١٥) ڕۆژە چووە بەدوای تۆدا بۆ ئێران.

باوکم پیاوێکی بەکرێ گرتبوو پێیان دەوت (کەریمە شەشە)، شارەزای ناوچەی کوردستانی ئێران بوو، لەگەڵ باوکم دەرچوو بوو هاتبووە دزڵی ئینجا بانە دوایی چووبوونە مەهاباد، لە هەموو شوێنێ چووبوونە حوجرەی فەقێکان هەواڵیان پرسی بوو، وتبوویان لەمەنگوڕ دەخوێنێ، لە مەهاباد چووبوون بەرەو دێ بوکر لەپێش ئەوەی بگەنە ئاواییەکە توشی کوێخا حمەئەمین بووبوون، کە لێفەو کتێبەکانم لەماڵیان بوو، باوکم لێی پرسیبوو فەقێتان هەیە؟ ئەویش وتبووی بەخوا دەزانم لەمەوپێش فەقێمان هەبوو، بەڵام ئێستا نازانم، چونکە لەوساوە مەلا (مصطفى)ی زەڵمی ئێرەی بەجێ هێشتووە هەردوو چاوم بەرامبەر حوجرەی فەقێیەکان کوێر بووە، ناتوانم تەماشای حوجرەکە بکەم چونکە ئەوی تیادا نەماوە. باوکم پێی وتبوو باوکی ئەو مەلا (مصطفى)یە منم، ئەویش باوەشی پێداکردبوو و بردبویەوە بۆ ماڵی خۆیان و زۆر خزمەتی کردبوو، بۆ ڕۆژی دوایی ماڵئاواییان کردبوو، ئەویش لێفەو کتێبەکانی پێدابوو بیهێنێتەوە.

ئیتر باوکم زانیبووی کە من لەگەڵ مەلا موسادا گەڕاومەتەوە بۆ عێراق، بۆیە لەوێوە گەڕابووەوە بۆ زەڵم.

کە هاتەوە باوکم وتی: ئەمەندە قسەکەم پێ خۆشبوو ئەگەر مصطفى مردبێتیش خەفەتی بۆ ناخۆم، چونکە لەو شوێنانەی خوێندوویەتی بەباشە ناوی دەبەن و باسی دەکەن.

## خوێندنم لە بیارە

(١٩٤٣/١٠/٥ -١٩٤٣/١٢/١٥)



پاش ئەوەی (١٥) ڕۆژ لە ماڵی خۆمان پشووم دا، بڕیارمدا ئەمجارە دوور نەکەومەوە و بچم بۆ لای چاکترین مامۆستا بۆ خوێندن و نزیکترین شوێن لە دێی زەڵم، چوومە خزمەتی مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس لە دێی بیارە کە بەپێ ڕۆشتن کەمترە لە دوو سەعات، کاتێك ڕۆیشتم بۆ خزمەتی مامۆستا وتم: من خەڵکی زەڵمم کوڕەزای سۆفی حمە ئەمینم زۆر ڕێزی گرتم و زۆری پێ خۆشبوو، چونکە باپیرمی زۆر خۆش دەویست.

هەندێکم لە کتێبی (مطول) مابوو لە خزمەتی ئەودا بۆ ماوەی دوو مانگ تەواوم کرد.

لەو کاتەدا بیارە لەبەر ئاوەدانی شێخ علاء الدین و میوانی هەروەك شارێکی پێشکەوتوو وابوو، مەدرەسەکەی مامۆستا مەلا عبدالکریم وەك کۆلیج بوو، هەموو بابەتێك لە بابەتەکانی زانستە ئیسلامیەکان لەوێ بە دەرس دەوترایەوە، یا مامۆستا بە مستعدەکانی دەوت یان مستعد بە سوختەکانی دەوت، ئەرکی مامۆستا و ئەو مەدرەسەیە لەسەر شێخ علاء الدین بوو، خوا پاداشتی بداتەوە لە رۆژی قیامەت.



شێخ علاء الدین نانەواخانەیەکی تایبەتی دانا بوو کولێرەی گەرمی دەکرد بۆ هەموو کەسێك کەوا پێویستی بەنان ببوایە، پەنجەرەیەکی بچووك هەبوو بانگی (صۆفی حمە ئەمین) دەکرا کەنانەواکەی بەڕێوە دەبرد کولێرەی دەدایێ، زۆرترین مەلاکانی هەردوو بەشی کوردستانی ئێران و عێراق لەوێ خوێندنیان تەواو کردووە و لە دێی خۆیان مەدرەسەیان داناوە.

لەمبارەیەوە ئەم قسە خۆشەم هاتەوە یاد پێم خۆشە بۆتان بگێڕمەوە: جاریکیان کوێرێك کە قورئانی لەبەر دەبێت دەچێتە بەردەم ئەو پەنجەرەی کە سۆفی حەمەئەمین کولێرەی لێوە دەدا بەخەڵك و بە تەلەفوزێکی مەلایانە دەڵێت: صوفی حەمە ئەمین ئا کولێرڕەیەکم بدەرێ، سوفی حەمە ئەمینیش دەڵێت: مامۆستا خۆ قورئان نیە بۆ ئاوا بەتەجویدەوە داوای کولێرە دەکەیت؟ کوێرەکەش دەڵێت: ئەتەوێت بۆ کولێرڕەیەکی قەحپەباب مەخرەجمان لێ تێك بدەیت.

ئەم جارە لە بیارە وەك جاری پێشوو خوێندم، کەسوختە بووم لای مەلا حمە ئەمین کانی سانانی شەرحی (عبدالله یەزدی)م لە مەنتیق خوێند لەگەڵ هەندێك لە کتێبی (سید عبدالله صەرفی) لە عیلمی صرف دا، کە لەو کاتەدا مەلا حمە ئەمین کانی سانانی لە خزمەتی مامۆستا (شرح تجرید)ی لە فەلسەفە دەخوێند.

بەداخەوە نەمتوانی زۆر بمێنمەوە بۆ ئەوەی زۆرترین سوود لە مامۆستا عبدالکریم وەربگرم، من بەو مەبەستە رۆیشتم کە لەوێ خوێندن تەواو بکەم، بەڵام داوایان دەکردم بۆ سەربازی و منیش دواکەوتوو(متخلف) بووم، موختارەکەی زەڵم پیاوێکی نارد پێی وتم بیارە بەجێ بهێڵم، چونکە پۆلیسی خورماڵ دەیزانی لەوێم، ناچار گەڕامەوە زەڵم و ڕووم نەبوو بە مامۆستا بڵێم.

## کورتـەیەك لە ژیـانی
## مامۆسـتا مەلا عەبدولکەریمی مدرس


مامۆسـتا مەلا عەبدولکەریمی مدرس

مەلا عبدالكريمی محمد ناسراو بە (مدرس) لە ساڵی ١٩٠٥ لە دایك بووە، لە هۆزی (قازی) کە لە - سید سادق - لە سلێمانی نیشتەجێن، منداڵ بوو باوکی کۆچی دواییی کرد، زوو خرایە بەر خوێندن لە خوێندنگای ئایینیەکاندا، لەناوچەی مەریوان و هەورامان لە دێیەکەوە بۆ دێیەکی تر لەسەر سنوری عێراق و ئێران هات و چۆی دەکرد بەدوای خوێندندا دەگەڕا، لە کۆتاییدا لە شاری سلێمانی جێگیر بووە، لەسەر دەستی مامۆستای گەورە (شێخ عمر ابن القرداغی) ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە، کاتێك کە تەمەنی بیست ساڵ بوو.

ئینجا دامەزرا بە مامۆستا و ئیمامی دێی (نێرگسەجار) لە هەڵەبجە، دوای ئەوە بەرەو بیارە رۆیشت، بوو بە مامۆستای ئەو خوێندنگە بەناوبانگەی بیارە، ساڵی ١٩٥١ گەڕایەوە بەرەو سلێمانی لە خوێندنگەی حاجی حان بە مامۆستا دامەزرا.

ساڵی ١٩٥٥ گوێزرایەوە بۆ کەرکوك بۆ دێی زین العابدین کەشیعە بوون، بەڵام جەنابی شێخ جەمیلی تاڵەبانی ئەوەی پێناخۆش بوو لەبەر ئەوە هێنایەوە

تەکێی تاڵەبانی لەناو شاری کەرکوک و لەنزیك خۆی داینا و، هەتا ساڵی ١٩٦٠ لەوێ مایەوە.

دوای ئەوەش هات بۆ بەغداد، یەکەمجار بوو بە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی (أحمدی) لە گەڕەکی (مەیدان)، دواتر بوو بە مامۆستای خوێندنگەی (شێخ عبدالقادری گەیلانی)، تا وەفاتی کرد سەرۆکی زانایانی عێراق و موفتی عێراق بوو.

ژمارەیەکی زۆر لە گەورە پیاوانی ئایینی لەسەر دەستی مامۆستا مەلا عبدالکریم ئیجازەیان وەرگرتووە.

ژمارەیەکی زۆر دانراوی ئاینی و ئەدەبی و زانستی بە زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی داناوە، لەوانە وەرگێڕان و لێکدانەوەی مانای قورئانی پیرۆز بەزمانی کوردی و عەرەبی کە هەر یەکەیان حەوت بەشە، هەروەها لێکدانەوەی (تەفسیر)ی قورئانی پیرۆز بە کوردی داناوە لەسێ بەشدا.

لەبارەی - فقە- وە کتێبێکی دانا لەسەر (فقە)ی ئیسلامی لەسەر مەزهەبی شافعی بەزمانی کوردی لەچوار بەشدا.

هەروەها دانراوی (جامع الفتاوی لعلماء الاکراد) لە سێ بەشدا، هەروەها (صفوة اللالی من مستصفی الغزالی).

لە دانراوە بەنرخەکانی لە ئەدەبدا، لێکدانەوەی دیوانی هەر یەکە لە: مەولەوی، نالی، مەحوی بەزمانی کوردی کرد لەسێ دیوانی جیادا.

هەروەها لێکدانەوەی - عقائد مەولەوی- بەزمانی عەرەبی و فارسی و کوردی کردووە لەسێ کتێبدا.

چەند دانراوی تری لە بابەتی: نحو، صرف، منطق، بلاغە، چەندین نامیلکەی تری ئایینی بەکوردی داناوە.

## کۆچی دوایی مامۆستا
## مەلا عەبدولکەریمی مدرس

شەوی (٢٩-٣٠ / ٨ / ٢٠٠٥) کاتژمێر دووی شەو مامۆستا مەلا کەریم وەفاتی کرد لە ژورەکەی خۆی لە شێخ عەبدولقادری گەیلانی، کە چەند ساڵێك پێشی وەفاتی، تەمەنی خۆی لەوێ بەسەر برد.

مامۆستا مەلا کەریم زیاتر لە (٨٠) ساڵ زانستە ئیسلامیەکانی وتەوە، زیاتر لە (٤٠) کتێبی داناوە بە عەرەبی و کوردی و فارسی، هەموو کتێبەکانی زانستە ئیسلامیەکانی بە سەدان جار بەدەرس وتوەتەوە.

من ساڵی ١٩٤٣ لە خزمەتیا کتێبی (مطول)م خوێند لە عیلمی بەلاغە کە هی (سعدالدین تەفتازانی)یە.

مامۆستا مەلا کەریم پیاوێکی زۆر عاقڵ بوو، زۆر زانا بوو، زۆر کۆمەڵایەتی بوو، هەردەم لەگەڵ هەموو کەسێك قاعیدەی (کلم الناس علی قدر عقولهم)ی بەکارئەهێنا.

پێش وەفاتی بە نزیکەی مانگێك چووم بۆ خزمەتی، هەرچەند تەمەنی لە (١٠٤) ساڵ زیاتر بوو، بەڵام هۆش و گۆشێکی زۆر تەواوی هەبوو، نزیکەی سەعاتێك لە خزمەتیا بووم، لەو ماوەیەدا دەستی خستە ناو دەستمەوە هەتا هەڵسام، پەیتا پەیتا ئەیفەرموو: ئۆخەی.

بەڕاستی جێگای شانازی بوو بۆ کورد، لە چەرخی بیستەمی میلادیدا بڕواناکەم زانای وەها هەبووبێ لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا، هەرچی زانستی ئیسلامی هەبوو یان تەئلیفی تیاکردبو یان تەعلیقاتی لەسەر نوسیبوو، تەفسیری قورئانی هەیە بە عەرەبی و بە کوردی.

خوای گەورە پاداشتی بداتەوە، کوڕەکانی کاکە محمد و کاك صلاح الدین و کاك نجیب بپارێزێ، الحمدلله هەمویان پیاون، کاك محەمەد وەکو باوکی خزمەتی زانستی زۆر کردووە، بەتایبەتی لە زبانی کوردیدا و بەرهەمی زۆر بەنرخی هەیە، کاك فاتیحی کوڕیشی خوا لێی خۆش ببێت کەپێش خۆی وەفاتی کردبوو بەهەمان شێوە جێدەستی دیارە و خزمەتی زۆری کردووە.

مامۆستا لەژیانی خۆیدا قەبرێکی بۆ خۆی ئامادەکردبوو لە گۆڕستانەکەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، ڕۆژی (٣٠ / ٨ / ٢٠٠٥) لەپاش نوێژی نیوەڕۆ لەوێ ناشتیان.

## خوێنـدنم لە بـالك

## (١٩٤٣/١٢/٢٠ -١٩٤٤/١١/١٠)

لەپاش بیارە چووم بۆ بالك کە مامۆستا مەلا باقری بالك ئەوکاتە چاکترین مەلای کوردستانی ئێران بوو، کاتێك چووم بینیم مامۆستا لەبەر گرانی جەنگی دووەمی جیهانی تەنها چوار مستعدی هەیە، ئاواییەکە نەیدەتوانی لەوە زیاتر یارمەتی فەقێ بدەن کە بە ماڵی ئاغاوە زیاتر لە (٢٠٠) ماڵ بوو، لەو مەدرەسەیەدا سوختە نەبوو، چونکە سوختە دەتوانێت لە شوێنێکی باشتر بخوێنێت و جۆری خوێندنەکەی پێویست ناکات بێت لەشوێنێکی گراندا بمێنێتەوە، بەڵام مستعدەکە ناچار بوو بۆ ماوەیەك بێتە لای مامۆستا مەلا باقر، چونکە جۆری دەرسەکەی جیاواز بوو لەو مەلایانەی تری ناوچەی مەریوان، لەبەر ئەوەی سوختە نەبوو مجێوری مزگەوتەکە راتبەی دەکرد.

فەقێکان وتیان یەکێك لە ئێمە کە ناوی مەلا حەسەنی دەرەزیارەتی بوو هەفتەی پێشوو ئیجازەی وەرگرت تۆ دەتوانیت بچیتە شوێنەکەی.

کاتێك مامۆستا هات بۆ حوجرە دەستم ماچ کرد، وتم: مامۆستا هاتووم بۆ خزمەتی جەنابت تکایە جێگەم بدەرێ با سوود لە زانستی جەنابت وەربگرم، چونکە من بۆ خوێندن هاتووم.

وتی: رۆڵە تۆ (ئەمرەدی) واتە موو لە دەم و چاوت نەهاتووە لەبەرئەوە تەماشاکردنت حەرامە بۆمن ناتوانم جێگەت بدەمێ.

منیش چاکەم بەدەستەوە بوو لە خەفەتاندا دامنا و زۆرم پێ ناخۆشبوو. تەمـاشـایەکی تـری کردم وتـی: فـەقێ خەڵکی کوێیت؟


مزگەوتی بالک

وتم: خەڵکی زەڵم.
وتی: سۆفی حمە ئەمین ماوە؟
وتم: بەڵێ ماوە ئەوە باوکی باوکمە.
وتی: باپیرتە؟ وتم: بەڵێ.

ئینجا ڕووی کردە فەقێکان وتی: لەبەرئەوەی کوڕەزای سۆفی حمە ئەمینە تا ئەم فەقێیە لەم مەدرەسەیەدا بێت من خاوەنی ئەم مەدرەسەیە نیم.

ئەمەش لەبەرئەوەی ماموستا مەلا باقر سۆفی شێخ علاء الدین بوو، کە هات و چۆی دەکرد بۆ بیارە بەم سەر و بەو سەردا لە زەڵم لای باپیرم دەمایەوە، چونکە زۆر موسڵمان بوو و تەمەنی زۆری لە باخەکانی زەڵمدا بەسەر دەبرد و میواندارێتی زۆری دەکرد، هەموو ژیانی لە خوا پەرستی و خزمەتی میوان و موسڵمانان بەسەر دەبرد تا تەمەنی گەیشتە نزیکەی (١٢٠) ساڵ.

ئینجا جارێکی تر باسی ئەوە دەکەم کە وتم لەم خەڵکە تێنەگەیشتم، چونکە مەلا باقر زەیرەکترین ماموستای کوردستانی ئێران بوو، کاتێك دەرسی دەوتەوە سەیری کتێبی نەدەکرد هەمووی لەبەر بوو، زیاتر لە (٢٠) ساڵ بوو تەدریسی ئەکرد، نازانم لە ماوەی دوو سێ چرکەدا چۆن تەماشاکردنی من لە حەرامیەوە بوو بە حەڵاڵ، دیارە دەبێت لەو ڕووەوە بوبێت کە منی بەبرازای خۆی داناوە و تەماشاکردنی برازاش حەڵاڵە.

## جۆری دەرس وتنـەوەی
## مامۆستا مەلا باقر


مامۆستا مەلا باقر

مامۆستا هەموو رۆژێك پێش بانگی بەیانی نانی بەیانی لەماڵی خۆیدا دەخوارد، لە پاشدا دەهات بۆ نوێژی بەیانی بۆ مزگەوت و(ویرد و ئەورادی) دەخوێند، ئینجا سەر دەکەوت بۆ سەربانی مزگەوتەکە چونکە حوجرەی فەقێکان لەسەربانی مزگەوت بوو بە (دار عصایەك) لە دەرگای حوجرەی فەقێکانی دەدا، دەرگا دەکرایەوە فەقێ هەمووی دەشڵەژا، هەر یەکە لە ژێر لێفەی خۆی سەری قیت دەکردەوە و لێفەکەی دەخستە کەنارێکەوە، بەپەلە ئەو فەقێیەی نۆرە دەرسی بوایە بەگورجی دەچوو پشیلە شۆرێکی دەم و چاو و قاچی دەکرد و بەپەلە دوو رکات نوێژی لە مزگەوت دەکرد و دەهاتەوە حوجرەو لەسەر چۆك

دادەنیشت کتێبەکەی دەکردەوە، مامۆستاش یان ڕادەکشا یان پاڵی دەدا بە پشتیەکەوە (سەرینێکەوە) ئینجا دەیوت ڕۆڵە بخوێنەرەوە.

فەقێکە لاپەڕەیەك لە کتێبەکەی دەخوێندەوە، ئینجا مامۆستا لێرەدا دەیوت بوەستە، مامۆستا دەستی دەکرد بەلێکدانەوە و شیکردنەوەی بابەتەکە و دەچووە سەر ئەو حاشیانەی لەسەر کتێبەکە هەبوون و دەستی دەکرد بەلێکدانەوەیان بێ سەیرکردنی کتێبەکە، چونکە هەمووی لەبەر بوو، ئینجا وازی لەو کتێبە دەهێنا دەچوو بۆ کتێبەکانی تر کە لەو بابەتەدا دانرابوون، قسەکانی ئەوانیشی دەگەیاند بەو فەقێیە، ئینجا وەك یەکێك دەور بکاتەوە مامۆستا مەلا باقر لە کاتی دەرس وتنەوەدا دەوری ئەو شتانەی دەکردەوە کە لەبەری بوو، قەت تەماشای فەقێکەی نەدەکرد بزانێت ئەمە توانای هەیە کە ئەو هەموو زانستە وەربگرێت یان نا، تێ دەگات یان نا.

بۆ نمونە مەلا صاڵحی بێسارانی -یادی بەخێر هیوادارم ئێستا لە ژیاندا بێت - توانای ئەوەی نەبوو کە لە عیبارەتەکە زیاتری پێ بوترێت، کەچی مامۆستا مەلا باقر کە دەرسی (کلنبوی بورهان)ی پێ دەوتەوە، دوایی حاشیەکانی خاوەنی کتێبەکەی پێ دەوت پێیان دەوترێت (منهو) و حاشیەکانی پێنجوینی و حاشیەکانی قەرەداغی و ئینجا دەچووە سەر حاشیەکانی (شرح شمس)، لە پاش هەموویان بیروڕای خۆشی پیشان دەدا. مەلا صالح هەر ئەوەندە دەیوت بەڵێ، ئیتر جارێك پرسیارێکی لێ نەکرد و نەیدەوێرا بڵێ ئەوە تێ نەگەیشتووم.

## ئەو کتێبیانەی
## لە خزمەت مامۆستادا خوێندم

**١- جمع الجوامع (بەرگی یەکەم):** لەکاتی وتنەوەی ئەم دەرسەدا ئەوەندە شارەزا بوو جاری وا هەبوو حەوت تا هەشت (قیل) هەبوو هەموو جیاوازی ئەو (قیل)انەی دەکردنەوە بە (لفظي) واتە لە واتادا جیاواز نین، پاشان (شرحی) حاشیەکانی (بنانی) و (شربینی) دەکرد، لە پاشدا دەچوو بۆ (مختصری منتهی) پاشان بیروڕای خۆی دەوت.

**٢- (شرح العقائد)ی جلال الدین دەووانی لەگەڵ حاشیەی کلنبوی.**

**٣- خولعی (تحفه المحتاج):** باسێکی زۆر گرانە لە (فقه الامام الشافعی) ئەمەش: تەڵاق دانی ژنە بەرامبەر بەوەی شتێك بدرێت بە مێردەکەی بەمە دەوترێت (خلع).

**٤- (فرائض)ی (شێخ معروف ی نۆدێی) خوالێیخۆشبێت:** مەلایەکی زۆر شارەزا بوو و شاعیرێکی زۆر بەرز بوو، زۆر شتی لە بابەتی ئیسلامەوە کردووە بە شیعر کە ڕەوان و ئاسانن، ئەوەی پێویستی هەیە بە میرات و دابەشکردنی، هەمووی کردووە بە (٤٠٠) بەیتی شیعر، ئەم کتێبەم لای مامۆستا خوێند هەموویم لەبەر کرد.

ڕۆژێك مامۆستا مەلا حمە ئەمین کانی سانانی کە لە خزمەتیدا (عبدالله یزدی)م خوێند لەبیارە، بوو بەمیوانی فەقێیەکان لە بالك، چونکە لای مامۆستا مەلا باقر ئیجازەی وەرگرتبوو و لە (نژمار) مەلا بوو کە دێیەکە نزیکە لە (بالك)ەوە لەبەرئەوە زوو زوو دەهات بۆ لای مامۆستا.

کاتی نیوەڕۆ بو و دۆخەوایان بۆ هێنابووین هەمووومان بە کولێرەی گاڵەوە دەمانخوارد، لەو کاتەدا مامۆستا مەلا حمە ئەمین وتی: بە مامۆستا مەلا باقرم وتووە هەر شتێك بەیەكێك لەم سێ زمانە بنووسرێت بە کوردی و عەرەبی و فارسی لە دەست من رزگاری نابێت و من بۆ خۆم دەتوانم ماناکەی بزانم هەر چەند زۆریش گران بێت.

ئینجا منیش ئەوکاتە تۆزێك بێ شەرم بووم، وتم: مامۆستا سێ شیعری شێخ مەعروف هەیە لە میرات بەشکردندا، داوات لێ دەکەم کە مانایان لێکبدەیتەوە بەمەرجێ شێخ مەعروف لە سەرەتای کتێبەکەدا دەڵێت:

| | |
|---|---|
| فـهـذه أرجـــوزة مـحـــررة | جوهرة تفوق كل جوهرة |
| خلت عن الحشوی وعن تعقيد | هينـة حتى علـى البليد |

واتە: ئەم کتێبە گشتییە وەك گەوهەرێك وایە، لە سەرەتای هەموو گەوهەرێکدا بەجۆرێکی وا ئاسانە، ئاشکرایە کە هەموو کەسێك تێی دەگات هەر چەندە کەودەن بێت.

ئەمەش سێ بەیتە شیعرەکە:

| | |
|---|---|
| اما إذا تصرف منه جرى | ولم يكن اذ ذاك دين فطرا |
| بالرد بالعيب او التردي | في بئر عدوان مـع التـأدي |
| لتلف فنافذا قد رسـخا | ان ادي الديـن والا فـسخـا |

مانای ئەم سێ بەیتە شیعرە ئەوەیە ئەگەر یەكێك مرد هیچ قەرزی لەسەر نەبوو بەڵام پاش مردنی قەرزی هاتە سەر بەم جۆرە بیرێکی لە شوێنێکی نارەوا هەڵکەند و لەپاش خۆی شتێکی تێ کەوت بە (تلف) چوو ئەمە نرخەکەی لە میراتەکە دەدرێتەوە، هەروەها ئەگەر شتێکی عەیبداری فرۆشت و پارەکەی وەرگرت لە پاش مردنی مامەڵە بەتاڵ کرایەوە لەبەر عەیبەکەی پێویستە لە میراتەکە ئەو پارەیەی وەری گرتووە لە جیاتی فرۆشراوەکە دەبێت بدرێتەوە.

ئەگەر ئەم میرات گرانە لە پێش دانەوەی ئەم قەرزانە کە دوای خۆی پەیدا بوو شتێکیان فرۆشت لە میراتەکەدا ئەوا فرۆشتنەکە رادەگیرێ هەتا قەرزەکە دەدرێتەوە ئەگەر نەدرایەوە مامەڵەکە بەتاڵ دەکرێتەوە.

شێخ مەعروف مانای ئەو سێ شیعرەی نەداوەتەوە لە کتێبەکەدا، مامۆستا مەلا حمە ئەمین کتێبەکەی گرت بە دەستەوە سێ تا چوار جار شیعرەکانی خوێندەوە و ناو چاوی گرژ بوو عارەقی دەردا و سور بووەوە، ئینجا کتێبەکەی داخست و کوتای بەزەوی دا وتی: بەخوا دەمزانی بەڵام خوا ویستی بمشکێنێ، زۆر راستە نابێت خۆت بە زانای گەورە بزانیت.

زۆر کەس هەیە کە پرسیاری لێ دەکەیت بەبێ ئەوەی بزانێت ڕاستە یان هەڵەیە یەکسەر وەڵام دەداتەوە وا دەزانێت هەر خۆی راستە.

# جۆری ژیانمان له بالك

وەك باسم کرد خەڵکی بالك دەست کورت و کەم دەرامەت بوون، کاتی جەنگی جیهانی دووەم بوو، لەهەمان کاتدا وشکه ساڵی بوو، لەبەرئەوە چوار فەقێیان پێ ڕادەگیرا، که ئەو فەقێیانەش بریتی بوون له چوار مستعد، (مجەوەرەکە) ی مزگەوتەکە ئێواران دەچوو راتبەی بۆ دەکردین بە ماڵی ئاغاکەوە و ماڵە دەوڵەمەندەکانەوە بە هەموویانەوە هەشت کولێرەمان هەبوو، هەر یەکی دوو



گونـدی بـالک

کولێرەمان بەردەکەوت، لە نێوان کتێبەکاندا دامان دەنا وەك دۆلاری ئەمریکی ئێستا کە لەناو کتێبدا دادەنرێت، ئێوارە کولێرەیەکمان دەخوارد یان بە شۆرباوە یان بە دۆوە یان بە هیچەوە، هەروەها نیوەڕۆش، بەیانیان سێ خورمامان دەخوارد بەچاوە، چونکە بەهۆی گرانییەوە شەکر نەبوو، ئەوخورمایەش لە عێراقەوە دەهات.

ئەوکاتە شەکری ورد زەرد بوو سپی نەبوو، جارێك ئامۆزایەکم کیلۆیەك شەکری بۆ هێنام کردم بەکلۆ شەکر بەچای دیژلەمەوە دەخورا. بە مامۆستا مەلا عبدالرحیم خانەگاییم وت: مامۆستا شەرم دەکەم من چایی بەشەکرەوە بخۆم ئێوەش خورما دەخۆن، وتی: واللە من شەرم ناکەم و کلۆڵەیەکیش نادەم بە باوکم، منیش وەك ڕێزێك کە ماوەیەك مامۆستام بوو شەکرەکەم هەمووی بەدیاری پێدا.

ئەمەش سێیەم مامۆستام بوو کەبوومەوە هاو مستعدی، چونکە ئەو لە زەڵم (١٩٣٧ز) دەرسی (إظهار)ی پێ دەوتم و خۆی لای مامۆستا مەلا خالیدی مفتی زادە دەیخوێند، ئەوکاتە کە پێکەوە بوین لە بالك سالی (١٩٤٣ز) بوو لەگەڵ ئەوەی ژیان سەخت بوو بەڵام بەڕاستی خوێندنەکەی زۆر بەسوود بوو بۆ من.

بۆ خویندن دەچوومە گۆڕستانی گوندەکەو دەوری دەرسەکەم دەکردەوە، لەسەر گۆڕێك دادەنیشتم فەرائزی شێخ مەعروفم بۆ شەرح دەکرد.

دەڵێن: (ئەخفەش)یش بزنێکی هەبووە، ریشی بزنەکەی گرتووەو دەرسی پێ دەوتەوە. ئەگەرچی ئەوسا ئەوەم نەبیستبوو.

خەڵکی ئاواییەکە گلێنەیان دەکرد و دەیانکردە ناو حەوزەکە تا نەرم بێتەوەو بیدەن بە گاکانیان، ئێمەش لەبەر گرانی و نەبوونی شەوان دەچووین لەو گلێنانەمان دەهێنا و دەمانخوارد.

لە پاش بالك گەڕامەوە زەڵم چەند ڕۆژێك لەوێ مامەوە، پاشان چووم بۆ سنە کە بە فارسی پێی دەڵێن (سنندج) یان (کوردستان) چونکە هەموو شارەکە کوردن.



مزگەوتی دار الاحسان

## خوێندنم لە شاری سنە (کوردستان)

## ( ١٩٤٥/٣/٢٠ -١٩٤٤/١١/١٤ )

سنە شارێکە سەرەڕای ئەوەی زۆر خۆشبوو، ئاو و هەوایەکی زۆر پاکی هەبوو، لەهەمان کاتدا پاك و خاوێن بوو، لە ناوەڕاستی زستاندا هەموو جۆرە میوەیەکی هەبوو، لەبەرئەوەی مەلا خالیدی مفتی زادە لە زەڵم بوو، لە سنە چووم بۆ لای براکەی (ئاغای مفتی زادە) کە ناوی مەلا مەحموود بوو، موفتی سنە سێ کوڕی هەبوو، یەکیان ئەحمەدی موفتی زادە بوو، ژوورێك هەبوو لەبەینی دەرگای دەرەوە و دەرگای ڕەئیسی عائیلیەوە، لە مەمەڕەکە

ئەو منالاّنەیان دەخستە ئەو ژورەوەو پیاوێکیشیان دەگرت دەبوو بە (لەلە)ی ئەو مندالاّنەو فێری رەوشتی جوانی دەکردن، وەك باخچەی ساوایانی ئێستا.

لە لایەنی میرییەوە لە جێگەی باوکی کرابوو بە مفتی، پیاوێکی زانا بوو بەڵام تەدریسی کەم بوو، چونکە کاتێك ڕەزا شای پەهلەوی تەدریسی هەڵگرت لە مزگەوتەکاندا مزگەوتی (دار الاحسان)یش تەدریسی تێدا نەمابوو.

ئەم مزگەوتە لەکاتی ئەردەڵانیەکان (أمان الله خان)ی والی دروستی کردبوو و هێشتا ماوە، حوجرەیەك لە سەربانی مزگەوتەکە هەیە پێی دەڵێن حوجرەی مەولەوی، حەوشەی مزگەوتەکە لەهەر چوار لاوە ژووری فەقێی تیادا دروست کراوە، لە ناوەڕاستیدا حەوزێکی گەورە هەیە، لە تەنیشت حەوزەکەوە ژووری ماموّستا بوو کە تەدریسی تیادا دەکرد هەمووی جامخانە بوو.

کاتێك وتم بەئاغای مفتی کە لە زەڵمەوە هاتووم جێگەی دا بەمن و هیچ فەقێی تری نەبوو، ئینجا سوختەیەکم بۆ پەیدا بوو کە ناوی (محمد ئەمین نزلی) بوو لە ١٩٤٤، ئەم فەقێیە هەتا ئەم ماوانەی دوایش پەیوەندی بەئێمەوە ئەوەندە نزیك بوو وەك یەکێك لە کوڕەکان تەماشام دەکرد، زۆر راست و ئەمین بوو، ناوەڕۆکی وەك خاوەکەی وابوو، زۆر موسڵمان و قسە خۆش بوو، لە قسە قوتەکانیدا زۆر بێ شەرم و لە هەمان کاتدا زۆر بەئەدەب بوو، هەندێ لە شیعرەکانی مەولەوی لەزاری هەورامیەوە کردوویەتی بەزاری سۆرانی.

لە هەمان کاتدا سوختەیەکی تر پەیدا بوو ئەویان ناوی (ئەسعەد کوڕی شێخ محمد شێخ الاسلام) کە ئیستا پلەی (دکتۆرا)ی هەیە و ماموّستایە لە زانکۆی تاران.

وەك باسم کرد بەرگی یەکەمی (جمع الجوامع)م لای ماموّستا مەلا باقر خوێند، بەرگی دووەمی لای ئاغای موفتی تەواوم کرد.

هەر رۆژێك بەفر و باران ببوایە ماموّستا تەلەفۆنی دەکرد بۆ دوکانێك نزیك مزگەوت دەیوت با ئاغای (مصطفی) بێت لە ماڵەوە دەرسەکەی پێ دەڵێم، چونکە لەبەر سەرما نەیدەتوانی بێتە دەرەوە، لەبەرئەوە زۆر جار لە ماڵی ئەوان

دەرسەکەم دەخوێند ودوای دەرسەکە قسەی خۆشی دەکرد، هاوسەرەکەی (قەمەر نیسا) خانم زۆر خانەدان و سەنگین بوو سوێندی دەخوارد نانی نیوەڕۆ لەوێ بخۆم.

لەو شتە خۆشانەی کە ئاغای موفتی باسی کرد، ڕۆژێکیان وتی: باوکم مەلا عبدالله ی دشەیی کاتێك نزیکی کۆچی دوایی دەبێت، بە دایکم دەڵێت (٤٠) تمەن پارەی زیومان هەیە دەمەوێت پێش مردنم دابەشی بکەم بەسەر لێقەوماو و هەژاردا، دایکیشم دەڵێت تۆ (٩) کوڕت لە پاش بەجێ دەمێنێت با ئەو پارەیە بمێنێت ئەوان سوودی لێ وەربگرن، باوکم دەڵێت ئەگەر کوڕ کوڕ بێت پارەی منی ناوێت، کوڕیش نەبێت من پارەی خۆمی نادەمێ.

ئەو ڕۆژەی کە کتێبەکەم تەواو کرد وا ڕێکەوت لەماڵی ئەوان بووم، وتی: چیمان بۆ دەکەیت بۆ خاتیمانە، ئەوکاتە عادەت وابوو کە یەکێك کتێبێکی تەواو دەکرد خاتیمانەی دەکرد و یەکێك کتێبێکی تازەی دەست پێ بکردایە (مفتوحانە)ی دەکرد، وتم بە ئاغای موفتی: چی دەفەرمویت ئامادەم؟

دیارە منیش هیچم نەبوو، ئەویش وتی: لە نێو کتێبخانەی باوکمدا کتێبێك هەیە لای من لە هەموویان خۆشەویست ترە، دەیدەم بە خۆشەویسترین فەقێ لای من خوێندویەتی، ئەمەش بریتی بوو لە کتێبی (تهذیب الكلام) کە سعدالدين تفتازانی دایناوە و شێخ عبدالقادری مهاجر شرحی لەسەر کردووە، ئەم کتێبە بەخەتێکی زۆر جوان نوسراوەتەوە و خەتەکە هی ئەوەیە کتێبەکەی شەرح کردووە، ئەم کتێبە لە بابەت (أثري)یەوە، شتێکی زۆر نایاب و بەنرخە، کتێبەکەی پێ دام، لەوێ هەندێکم خوێند لای خۆی، لە پاشدا مەلا عبدالرحيم خانەگایی ئەویش هات بۆ سنە و لای موفتی دامەزرا بوو بە هاو مستعدم، لەپاش ئەوە کە مامۆستام بوو لە زەڵم.

شەو سەرم روت دەکرد و بەدەوری حەوزەکەدا دەسوڕامەوە، دەوری ئەلفیەی ئیبنومالیکم دەکردەوە، بەفریش دەباری، بەفرەکەم زۆر پێ خۆش بوو، هەستم بە سەرما نەدەکرد، بەڵکو هەستم بە خۆشی دەکرد.

لەو بیرەوەریانەی کاتی خوێندنم لەشاری سنە کەلەبیرم مابێت، رۆژێ لەگەڵ مەلا سید رحیم چووین بۆ لای مەردۆخی، ئاغای مەردۆخی کە عالمێکی زۆر گەورەبوو، دوانزە جەلد شەرحی کردبوو لەسەر توحفە.

مەلا سید رحیم سور و سپی بوو، هێشتا دانەنیشتبووین وتی پشەسوور ئەو عاسایەم بدەرێ با نزیك بێ لە دەستم نەوەك قسەی زیادە بکەی.

وتی: لەکوێ دەخوێنن؟

وتمان: لە دار الإحسان لای ئاغای موفتی دەخوێنین.

وتی: ئێوە بۆ خوێندن نەهاتوون، بۆ تەماشای کاشی کەوگ (واتا شینی کاڵ) هاتوون، ئەگەر بۆ خوێندن بهاتایەن دەهاتنە لای ئەم زەڕەی بێ میقدارە، ئەگەر رۆژی سەترێکیش ئیستفادەتان بکردایە باشتر بوو.

جارێکیان عاصف الدیوان کە یەکێك بوو لە ئەعیانەکانی سنە، موفتی دەعوەت کردبوو، ئەویش منی لەگەڵ خۆیا برد، پەنجا نەوع خواردنی لەسەر سفرەکە دانابوو، خۆیشی قاپێك شۆربایان بۆ کردبوو، لەولای خوارەوە دانیشتبوو شۆرباکەی دەخوارد، وتی: ئاغای موفتی ئیشی خوا زۆر سەیرە، ئەم هەموو نیعمەتەو سەروەت وماڵەی داوە بە من، ئەوتا غەیری شۆبا نەبێ مەعیدەم هیچی تر هەزم ناکا. وتی حەمەی خزمەتکارمان ئەگەر بەرد بخوا، بەردەکە لەنێو سکیا ئەتوێتەوە، خوا شاییەکی[1] نەداوەتێ.

---

(١) شایی: بچوکترن دراوی ئێرانی ئەوسا

## ژیاننامەی مامۆستا مەلا مەحمودی مفتی


مامۆستا مەلا مەحمودی مفتی

ماموستا مەحمود کوڕی مەلا عەبدوڵای موفتی کوڕی مەلا مەحمودی دشەیی یە، ساڵی (١٣١٦ك.م) هاتۆتە دونیاوە.

یەك لە مەلایانی ناودار ومامۆستایانی شارەزا و پایەبەرزی کوردستانە کەهەموو زانستە دینیەکانی چاك دەزانی و بەتایبەت لە فیقهو ئوصول وفەلسفەفەدا شارەزای تەواو، مامۆستایەکی زیرەك و ناودار بووە، پاش وەفاتی باوکی بووە بەموفتی و دادوەری شەرعی کوردستان، لەمەدرەسەی دار الاحسان لەشاری سنە دەرسی وتۆتەوە و چەند فەقێ لەزانستەکەی بەهرەیان وەرگرتووە. مامۆستا مەلامەحمود خۆی و بنەماڵەکەی جێگای رێز و تەقدیر بووە، مامۆستا کەسێکی حەق بێژ بووە لەناو خەڵکان قسەی وەردەگیرا، بۆ پێکهێنانەوەو ئاشت بوونەوەی هاوڵاتیان دەورێکی سەرەکی هەبوو.

لەسەر داوای زانستگای تاران بۆ دەرس وتنەوە لەدوایینیی ساڵ دادوەری چووە ئەو شارە بەڵام ساڵێ زیاتری نەخایاند و لەوچانی هاوینانی ئەو ساڵە(١٣٨٠ ك.م-١٩٦٠ز) دڵی لەلێدان کەوت و کۆچی دوایی کرد، خەریکی خزمەتی ئایین بوو تا کۆچی دوایی کرد.(١)

چەند نامیلکە و نوسراوی هەیە کەبەداخەوە چاپ نەکراون.

---

(١) تاریخ مشاهیر کورد ٢/٣٨٤.
مێژووی زانایانی کورد، مەلا تاهیر مەلا عبداللە بەحرکەیی، ل٢٨٣.

# چۆن (دار الاحسان)م جێهێشت

ڕۆژێك دانیشتبووین باسی شنۆ و لاجانم دەکرد، مەلا عبدالرحیم وتی: بەخوا دەبێت لەگەڵم بێیت بچین بۆ شنۆ و لاجان، منیش وتم: ناتوانم چونکە موفتی زۆر ڕێزم دەگرێت وەك کوڕی خۆی و دەرسەکەم زۆر باشە و ژیانم باشە.

ئاخری هەر هەڵی خەڵەتانم، منیش ڕووم نەهات ماڵئاوایی لە ئاغای موفتی بکەم، لێفە و کتێبمان دا بەشاندا چووین بۆ گەراج، سواری ئوتومبێلێك بووین دەچوو بۆ (سەقز)، هەرسێ (من و مامۆستا سید عبدالرحیم خانەگایی و فەقێ حمە ئەمین نزلی)، کاتێك گەیشتینە نیوەی ڕێگە ئوتۆمبێلەکە لە شوێنێکدا چووە خوارەوە کەوتە ناو بۆشاییەکەوە، بەڵام ئێمە سەلامەت بووین، شوفێری ئوتۆمبێلەکە نیوەی پارەکەی داینەوە، لەوێ چووین بۆ دێیەکی گەورە پێی دەوترا (حسین ئاوا)، وتمان ماڵی ئاغا لەکوێیە پیشانیان داین، چووین بۆ ماڵی ئاغا حمە یوسف زۆر ڕێزی گرتین، شەو باسی مەلا کرا وتی: مەلایەکی باشمان دەست ناکەوێت بۆ ئەم دێیە، مامۆستا عبدالرحیم خانەگایی وتی: من دەبم بە مەلاتان، ئەو شەوە مامۆستا و ئاغا ڕێکەوتن، ئینجا بە ئێمەشی وت: بچنەوە (دار الاحسان) لە سنە، منیش ڕووم نەبوو چونکە ئەوەی من کردم زۆر نابەجێ بوو (ناکر الجمیل)یش نایکات، ناچار گەڕامەوە زەڵم.

پاش ماوەیەکی کەم ئێران لەشکرێکی زۆری هێنا دەستی گرتەوە بەسەر ناوچەکانی کوردستاندا، چونکە (محمد شاه کوڕی ڕەزا پهلوی) لەگەڵ ڕووسیا و ئینگلیز ڕێکەوت کە نەوتی ئێران دەربهێنن و ئەویش لەجێگەی باوکی دابنێن، ئینجا ئەو لەشکرەی کۆنترۆڵ کرد و خەڵکی ناوچەکانی لهۆن و مەریوان و

داروخان هەمووی هاتنە عێراقەوە بوون بە پەناهەندە، لە ترسی گیانی خۆیان دەهاتن بۆ عێراق یەکێك لەوانە مامۆستا مەلا باقر بوو بوو بەمەلای شێخ محمد کوڕی شێخ حسام الدین لەدێی (گوڵپ)، منیش جارێکی تر چوومەوە لای مامۆستا مەلا باقر ومانگێك لەوێ خوێندم.

ئێران داوای کرد لە شێخ علاء الدین کە بکەوێتە نێوان شای ئێران و کوردەکانی ئێران، دواتر ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کوردەکان بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان، مامۆستا مەلا باقر یەکێك بوو لەوانەی لەگەڵ وەفدەکە بوون، گێڕایەوە وتی: سەر لەشکرەکەی ئێران وتی: هەموو گەلێك عەقڵی لەمێشکیدایە، تەنیا کورد ئەقڵی لەچاویدایە، وتی: کاتێك ئینگلیز و ڕوسیا خاکەکەی ئێمەیان داگیرکرد کوردەکان دەستیان گرت بەسەر ناوچەکانی خۆیاندا و لەسەربازە ئێرانیەکانیان دەدا و چەك و ئازوقەیان لێ بردن، وایاندەزانی ئێران ناگەڕێتەوە، ئینجا کە گەڕایەوە شوێنەکانی خۆیان هەموویان ڕایان کرد لەوە ترسان ئێمە هەموویان بکوژین و لەناویان بەرین.

## خـوێندنم لە گـەلاڵە

## (١٩٤٥/٥/٧- ١٩٤٦/١/٥)

بۆ جارێکی تر لە پاش سێ ساڵ بۆ خوێندن گەڕامەوە بۆ گەلاڵەی شینکایەتی، جاری یەکەم مانگی (٣)یەمی بەهار بوو لە ساڵی (١٩٤٣)دا، ئەم جارە مانگی دووەمی بەهار بوو لە ساڵی (١٩٤٥)، دیم ژیانی فەقێکان گۆڕاوە ڕووەو باشی، ماموٚستا (مەلا محەمەدی رەئیس) سێ چوار فەقێی باشی لە لابوو، یەکێك لەوانە کاك مەلا (سەعیدی زمناکۆ) بوو کە پیاوێکی زیرەك و ئازا و مەرد بوو، کوردێکی زۆر پاك بوو، ماوەیەکی زۆر لە سلێمانی خزمەتی ئایین و میللەتی کوردی کرد، یادی بەخێر بێت.

یەکێکی تر لەوانە فەقێی پێشوو (مەلا ئەحمەدی لۆتەر)ی بوو تازە دەستی کردبوو بە کتێبی (تهذیب الکلام) کە لە پلە کۆتاییەکانی خوێندنی مزگەوت دەخوێندرێت، زۆر کەس هەیە لەپاش ئەم کتێبە ئیجازە وەردەگرێت و هەیە دوای ئەم کتێبە زانستی فەلەکیات دەخوێنێت.

بەدوو تا سێ دەرس گەیشتمەوە مەلا ئەحمەد، ئینجا مەلا ئەحمەد وتی: ئەمە زۆر باشە هەموو رۆژێك دەتوانیت بێیت لە دەرسەکەی من ببیت بەگوێ گر، دوایی دەرسەکەی خۆشت بخوێنیت و من ئەبم بە گوێ گر.

نیوەڕۆ بوو ماموٚستا چوو بۆ نوێژی نیوەڕۆ دوای کەوتم، وتم: ماموٚستا تکایە شتێك هەیە پێت دەڵێم، دەست مەنێ بەڕوومەوە، وتی: فەرموو، وتم: من دوو کێشەم هەیە:

**یـەکەم:** دوو ساڵە دێیەکەمان مەلای نیە و دانیشتوانی دێیەکە هەموو خزمی خۆمن، لەبەر من مەلا ناگرن و زۆریش پەلەم لێ دەکەن بۆ وەرگرتنی ئیجازە و بگەڕێمەوە دێیەکە.

**دووەم:** مامم کچێکی هەیە زۆر کەس داوای دەکات نایداتێ لەبەرئەوەی بۆ منی داناوە منیش لەو باشترم دەست ناکەوێت و ئەو هەلەم لە کیس مەدە.

وتی: مەبەستت چییە؟

وتم: کتێبی (تهذیب الکلام) من لە نیوەی کتێبەکەوە دەست پێ دەکەم نیوەکەی تر لەگەڵ مەلا ئەحمەد دەیخوێنم بەشێوەی (گوێ گر) بۆ ئەوەی زوو تەواو ببم، دەست بەشتێکی تر بکەم. فەرمووی: زۆر باشە.

بەو بەهۆیەوە توانیم بەکەمتر لەچوار مانگ کتێبی (تهذیب الکلام) تەواو بکەم.

ڕۆژی دوایی کە دەستم کرد بەخوێندن کتێبەکەم لەنیوەیدا کردەوە (الباب الرابع في الجواهر)، مەلا ئەحمەدیش هاتبوو بۆ گوێگرتن، وتی: ئەوە چییە؟ وتم: من لێرەوە دەست پێ دەکەم بۆ نیوەکەی تری من گوێ لە دەرسەکەی تۆ دەگرم، ئەویش زۆر توڕە بوو کتێبەکەی دا بەیەکدا و هەڵسا ڕۆیشتەوە بۆ ژووری فەقێکان، کاتێك من چوومەوە لایان، مەلا ئەحمەد وتی: مەلا مصطفى بەو قورئانەی خوێندوومە تۆ یەك وشە تێ ناگەیت، وتم: ڕاست دەکەیت، بەچیدا دەزانیت کە تێ ناگەم، وتی: بەوەدا ڕۆشتیت کتێبەکە لە کۆتاییەوە دەخوێنیت و ماموٚستا هەرچی دەڵێت تۆ دەڵێیت (بەڵێ وایە) و جارێك ناڵێیت بۆم دووبارەکەرەوە، منیش وتم: مەلا ئەحمەد بەو قورئانە کە سوێندت پێ خوارد ڕۆژێك دێت من دەرسی ئەم کتێبە (تهذیب الکلام) بەدەرس دەڵێمەوە تۆ بەحاڵە حاڵ دەتوانی دەرسی (ئەلفیەی ابن مالك) بڵێیتەوە.

ساڵی (١٩٥٤ز) وتەکەم هاتە دی، من مەلا بووم لە مزگەوتی (بن تەبەق) لە سلێمانی، ئەم مەلا ئەحمەدە بوو بەمیوانم، لەو کاتەدا هات بۆ حوجرە بۆ لام من دەرسی (تهذیب الکلام)م دەوتەوە بە فەقێیەك کە مەلا عبدالرحمن بوو

خەڵکی موکریان بوو لای من ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت. وتم: مەلا ئەحمەد فەقێت هەیە؟ وتی: بەڵێ، وتم: چییان پێ دەڵێیت؟ وتی: یەکێکیان ئەلفیەی ابن مالك و ئەوی تریان (جامیە)ی پێ دەڵێم. ئینجا وتەکەم بیرکەوتەوە بەڵام میوان بوو نەمدا بەڕوویدا.

**ئەو کتێبانەی لە خزمەتی مەلا محمدی رەئیس دا تەواوم کردن:**

١- تهذیب الکلام.

٢- تشریح الافلاك.

٣- رساله الحساب.

٤- **اشکال التأسیس** (کتێبێکە لە بابەت - هندسە- کاتی خۆی لە یۆنانیەوە وەریان گێڕاوە بۆ عەرەبی).

# ڕاتبەی کوێستان

هەموو بەهارێك فەقێیەکانی گەڵاڵە دەچوون بۆ هاوینەهەوارەکان و ئەو شوێنانەی کە خاوەن مەڕ و ماڵاتی دێی گەڵاڵەی تیا دەمانەوە، چونکە هەر کەسێك مەڕ و ماڵاتی زۆر بوایە هاوین دەچوون بۆ کوێستان لەناو دەواردا دەژیان.

ئەم ڕاتبەیە وەك ڕاتبەی نان و دەقنە نەبوو، بەڵکو ڕاتبەی گیسك بوو، دەچوینە ماڵە خاوەن مەڕ و ماڵاتەکان ئەبوایە هەر یەکێ گیسکێکی بدات بە ئێمە، ئێمەش دەمان فرۆشت بۆ شەکر و چایی هەموو ساڵەکەمان.

کوێستانێکی زۆر خۆشبوو، زۆر بەرز بوو، هەموو شوێنێکی لێوە دیار بوو، هەمووی بەفر و بەفراو بوو، بەفری شاخەکانمان لێ دەکردەوەو دەمانخستە ناو ماستی مەڕەکانەوە دەبوو بە ماستاوێکی زۆر خۆش، لە پاش ئەوە گیسکێکی قەڵەومان هەڵدەبژارد سەرمان دەبڕی و دەمان برژاند و ئەوانی ترمان دەفرۆشت، دانیشتوانی دێکە زۆر فەقێیان خۆشدەویست، بە تایبەتی ئاغاکەیان کە (محەمەد ئاغا) بوو.

# کوێر بوونم لە گەلاڵە

کتێبەکەی تهذیب وەك باسم کرد زۆر نایاب بوو، چونکە دەست و خەتی ئەو کەسە بوو کە شەرحی کردبوو، منیش بڕیارم دا هەرچی حاشیەی پێنجوینی و قزلجی هەیە لەسەر کتێبەکەی (تهذیب)ی ماموستاوە بیانگوێزمەوە سەر کتێبەکەی خۆم، هەموو شەوێك لە هاویندا درەنگ دەنوستم، چرایەکم دەبرد لە سەربانی مزگەوتەکە، دوو سێ بەڕەی لێ ڕاخرابوو بۆ نوێژی شەوان و بەیانیان، ڕادەکشام و دەستم دەکرد بە نوسینەوەی حاشیەکان، کە خەوم دەهات بەردێکم دانابوو جامانەکەم لەسەر دادەنا و دەمخستە ژێر سەرم، بۆ خۆم خەوم لێ دەکەوت هەتا بانگی بەیانی، بەمجۆرە لەسەر ئەم ئیشە بەردەوام بووم، کاتێك لە نووسینەوەی ئەو حاشیانە تەواو بووم هەستم کرد کە چاوم زۆر بەکەمی دەبینێت، تەنها تروسکایەك لە چاومدا مابوو، بۆ ماوەی دوو هەفتە زۆر ناڕەحەت بووم، چونکە نەمدەتوانی هیچ بخوێنمەوە، ئەمجارەش خوا ڕزگاری کردم، پزیشکێك هاتبوو بۆ ماڵی (محەمەد ئاغا)، فەقێیەکان چوون بۆ لای پێیان وت: فەقێیەکمان هەیە چاوی زۆر بەکەمی دەبینێت بەهۆی زۆر نووسینەوە وای لێ هاتووە، هات بۆ لام و تەماشای چاومی کرد، دەرمانێکی پێ دام (شووشەیەکی دڵۆپی چاو بوو) لەگەڵ مەرهەمێك کە بەشەو بەکارم دەهێنا، ڕۆژی سێ جار دڵۆپەکەی چاوم بەکاردەهێنا، بەکەمتر لە هەفتەیەك سوپاس بۆ خوا چاك بوومەوە.

ماموستا مەلا محەمەدی ڕەئیس چوار کوڕی هەبوو: (عبدالرحمن، حمه علی، حمه صالح، حمه سعید)، ئەمانە ئەوکاتە منداڵ بوون، کاك عبدالرحمن

گەورەتر بوو لای باوکی کتێبی (أنموذج)ی دەخوێند، کاتێك بووم بە ئیمام و جارێکی تر یەکمان گرتەوە لە بەغدا، دوای من کاک حەمە عەلی و کاك حەمە سەعیش لەسوپای عێراقدا بوون بەئیمام، هەرسێ خێزانەکەمان وەك یەك خێزان بووین، ئەم دوو کوڕەی مامۆستا زۆر ڕێزی منیان دەگرت چونکە لە خزمەتی باوکیان خوێندم و منیش زۆر ڕێزی ئەوانم دەگرت زۆرم خۆش دەویستن، خۆشترین کۆبوونەوەمان ئەوە بوو کاك حمە علی تیادا بووایە، چونکە پیاوێکی ڕاست و قسە خۆش و دڵسۆز بوو، وێنەی ئەوم لەژیانمدا کەم بینیوە.

ئەم رۆڵە دڵسۆزەی کوردستان کاتێك ئیمام بوو لە سوپای عێراق لەسەر کوردایەتی لایان برد وکردیان بە پشکنەر (مفتش)ی مزگەوتەکان لە بەغدا، بۆ جارێکی تر کە سوپای عێراق و رژێمەکەی دەستی کردەوە بە جەنگ لەگەڵ گەلی کورد، وازی لە ئیشەکەی هێنا، ناو ماڵەکەی بەجێ هێشت و مناڵەکانی لە خوێندن بێ بەری کرد، بە دوو سێ بەتانیەوە خۆی و خێزانی و مناڵەکانی چوونە ئەو شاخانە، لەگەڵ پێشمەرگە بۆ کورد خەباتی کرد، جارێکی تر کە شۆڕشی کورد هەرەسی هێنا، هەموو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون پەرش و بڵاو بوونەوە، هاتەوە بەغداو چووەوە سەر کارەکەی، دوای ئەوەی خانەنشین کرا گەڕایەوە سلێمانی.

کاتێك ساڵی (١٩٩١) راپەڕینی ئازار بوو میللەتی کورد توانی رزگاری بێت و خۆی دەسەڵاتی کەوتە دەست، زۆر کەس لەوانەی کە لەگەڵ سوپای عێراقدا جاش بوون لەو حکومەتەدا پلەی باشیان پێدرا، بەڵام بە (کاك حمەعلی) یان وت تۆ ئیمامی سوپا بوویت پێشمەرگە ئیمامی نیە، لەبەرئەوە ئیشمان بەتۆ نیە، ئەویش ناچار بوو دوکانێکی دانا بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی، بەڵام ئەوەش دەری نەهێنا، ناچار جارێکی تر بۆ ئیش کردن گەڕایەوە بەغدا.



## شەهید بوونی
## کاک حمە عەلی

کاک حەمەعەلی لە بەغدا لەگەڵ چەند کەسێکی تردا ئوتێلێکی بەکرێ گرت، خۆی بەڕێوەبەری ئوتێلەکە بوو، شەوێك کوڕێك لەسەربازی هەڵهاتبوو هاتبووە ئوتێلەکەی وا خۆی پیشان دەدا کە ئیش بۆ میری دەکات، هاتووە لەو ئوتێلە ئیش بکات، کاک حمە علی ناچار دەبێت لە بەر پاراستنی خۆی ڕێزی بگرێت و ئیشی بداتێ.

لەشەوی ٣ لەسەر ٤ / ٤ / ١٩٩٥ کەس لای کاک حمە علی نابێت، ئەو سەربازە هەڵهاتووە نامەردە لەگەڵ ئامۆزایەکی پیلانێك بۆ کوشتنی دادەنێن و ئەیکوژن و دواتر دەیسوتێنن و لەژێر زەمینی ئوتێلەکەدا دەیشارنەوە، بەڵام پاش چەند سەعاتێکی کەم بۆن بڵاو دەبێتەوە و پێیان دەزانن.

بەیانی زوو ڕۆژی ١٩٩٥/٤/٤ کاتێك گوێم لەبانگی بەیانی بوو، دەنگی تەلەفۆنەکە هات کە هەڵم گرت مامۆستا قادر بوو، بەگریانێکی کوڵ وتی: کاک حمە علی ئەمشەو لە ئوتێلەکەی خۆی کوژراوە.

دواتر دەرکەوت کوژرانی خوالێخۆشبوو بەدەستی دوو تاوانبار بوو، یەکێکیان ناوی (نزار عبدالله)بوو، کە شەش مانگ بوو لەو ئوتێلەدا کاک حمە علی خزمەتی دەکرد، ئەویش ئاوا بەنامەردی پاداشتی دایەوە و کوشتی بۆ ئەوەی هەندێ پارە ببات.

سێ ڕۆژ لەماڵی خۆمان پرسەم بۆ دانا، خوا گیانی پاکی بە بەهەشت شاد بکات، چونکە شەهیدە.

لە پاش نزیکەی دوو ساڵ لە شەهید بوونی کاک حمە عەلی دوو تاوانبارەکە لە ١٩٩٧/٣/١٩ بەسزای خۆیان گەیشتن و لە سێدارە دران.

ئەمەش بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵەیە لە ڕۆژنامەی (الجمهورية) کە لە (١٩٩٥/٤/١٥)دا بڵاو کراوەتەوە.

لە ڕۆژی ١٩٩٧/٣/١٩ ئەم دوو تاوانبارە لەسێدارەدران

## مجرمان يقتلان صاحب فندق ويحرقان جثته

□ بغداد / نبيل الوادي : القت مفارز قوى الامن الداخلي التابعة لوزارة الداخلية القبض على عصابة للقتل والسطو المسلح على الدور والفنادق وسرقة ممتلكاتهم وخلال (٨) ساعات من الابلاغ . وذكر الرائد ( عادل عباس ابراهيم ) مدير شرطة السعدون ل (الجمهورية) في الساعة ٥٠٠ من صباح يوم ١٩٩٥/٤/٣ استخبرنا بحدوث حريق في فندق (هافال) الكائن في منطقة البتاويين وعلى الفور تم الانتقال الى محل الحادث والسنة النيران قد طالت الطابق الاول ومحتوياته وبعد انتهاء رجال الاطفاء من اخماد الحريق تمكنا من الدخول والعثور على جثة هامدة ملفوفة ببطانية ووسادات اسفنج وغالون نفط وهي بحالة متفحمة بشكل تتقزز له الابدان والضمائر تبين ان المجني عليه يدعى ( محمد علي محمد ) والبالغ من العمر (٦٠) سنة وهو صاحب الفندق وتم قتله بواسطة الة حديدية ومن ثم حرقه في سرداب الفندق بهدف اخفاء معالم الجريمة . واوضح بعد استدعاء خبير الطبعة الجرمية وتدوين اقوال المخبر ظل



الفاعل مجهول الهوية . ولاهمية الحادث وبشاعة الجريمة التي لم تسجل سجلات الشرطة مثيلا لها في الاونة الاخيرة تم تشكيل فريق عمل برئاسة النقيب ( خليفة حسن علي ) لكشف خيوط وحيثيات الجريمة التي اتسمت بالسرعة لتفويت الفرصة على هذه ( الوحوش البشرية ) المنحرفة . مندوب (الجمهورية) التقى رئيس فريق العمل الذي سلط الضوء على خفايا الجريمة بقوله .. في صباح يوم ١٩٩٥/٤/٣ انتقلت الى فندق (هافال) وتوصلنا الى ان احد النزلاء ( نزار عبدالله حسوني ) تحوم الشبهة عليه لكونه ترك الفندق بعد الحادث مباشرة فتم نصب الكمائن في عدة مناطق من بغداد والفلوجة والقي القبض عليه

واقتيد الى مقر المديرية ولدى التعمق بالتحقيق اعترف صراحة بقيامه بالاشتراك مع المتهم الثاني ( احمد سلمان حسوني ) ابن عمه في قتل المجني عليه وبدلالته القي القبض على المومأ إليه في منطقة حي الكيلاني حيث اعترف ان المجرم (نزار) كان محتاجا الى مبلغ من المال وطرح عليه فكرة قتل صاحب الفندق وسرقة محتويات (القاصة) وعند الساعة الثانية والنصف حضر المجرم (احمد) وطرق باب الفندق وعند فتح الباب قام بتوجيه لكمات الى راس المجني عليه واسقطه ارضا بعدها نزل المجرم (نزار) من غرفته وقام بسحب المجني عليه الى السرداب ووضع قدميه على رقبته وانهال المجرم (احمد . بضربه بواسطة الة حديدية على راسه حتى فارق الحياة . واوضح رئيس الفريق ان المجرمين قاما بعد ارتكاب جريمتهما بجلب بطانية ودوشك اسفنج ولفا بهما الضحية وسكبا على جثته غالونا من النفط واضرما النيران ثم سرقا محتويات القاصة وهي تبلغ (١٠٥) مائة وخمسة الاف دينار ولاذا بالفرار الى جهة مجهولة .

السبت ١٥ ذي القعدة ١٤١٥ هـ ـ ١٥ نيسان ١٩٩٥ م


مەلا محەمـەدی ڕەئیـس

## ژیاننامەی
## مەلا محەمەدی ڕەئیس

مامۆستا لە ساڵی (١٣١١) ك. کە دەکاتە (١٨٩٣-١٨٩٤) ز. لە شاری بۆکان لە دایك بووە، ئەوکاتەی کوردستانی ڕۆژهەڵات کەوتە بەر هێرشی روسیا، لە تەمەنی منداڵیدا خرایە بەر خوێندنی ئاییینی مزگەوت، لەبەر زیرەکی زۆر بەخێرایی پلەکانی خوێندنی دەبڕی، لە شارەکانی بۆکان و سابڵاغ لەبەردەستی باشترین مامۆستاکانی ئەوکاتە لە کوردستانی ئێران و عێراق خوێندنی تەواو کرد.

کاتێك هەواڵی پێ گەیشت کە لە سلێمانی زانایەکی گەورە پەیدا بووە دەرس دەڵێتەوە، ئەویش (مامۆستا شێخ عمر قەرەداغی)یە، لە (سابڵاغ)ەوە بەپێ بەرەو سلێمانی بەڕێکەوت بۆ وەرگرتنی زانستی ئەو مامۆستایە، بەڵام یەکەم ڕۆژ کە گەیشت بێ هیوا بوو، چونکە جێگەی خوێندنی لا نەما بوو، ئەو شەوە تا بەیانی نەخەوت، بۆ بەیانی یەکێك لە فەقێکان پێی وت من ڕۆژی سێ کاتژمێری بۆ دانام بۆ خوێندن و ئەم سێ کاتژمێرە بەش دەکەین لە نێوانماندا، ئەو فەقێیەش (مەلا عینایەت) بوو، ئەمە یەکێکە لە نیشانە باشەکانی ئەو پیاوانەی لەو سەردەمەدا هەبوون، مامۆستا مەلا محمدی ڕەئیس و مەلا

عینیایەت سێ کاتژمێرەکەیان بەش کرد و مامۆستا شێخ عمر ڕازی بوو.

لەسەر دەستی مامۆستا شێخ عمر قەرەداغی ئیجازەی وەرگرت و دێی (گەلاڵەی) سەر بە ناحیەی (ماوەت)ی قەزای (چوارتا)ی هەڵبژارد بەداواکاری حاجی محمد ئاغای عباس

ئاغای پشدەری خوالێخۆشبێت، لەوێ هەڵسا بەکاری دەرس وتنەوە و ئیمامەتی، دوایی کچێکی دێکەی مارە کرد کە ناوی (ئامینە خان) بوو خوالێخۆش بێت کە (٥) کوڕ و (٤) کچی لێ بوو.

حاجی محمد ئاغای عباس ئاغا ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە پێشخستنی ئەو مزگەوت و قوتابخانە ئاینییە و لە چلەکاندا هەردووکیان چوون بۆ حەج.

مامۆستا مەلا محمد زۆر بلیمەت بوو، زۆر کەسی زیرەك لە دەوری کۆ بوونەوە و دەرسی پێ وتن لە زانستەکانی (نحو، صرف، بلاغە، منطق، فقە، تەفسیری قورئانی پیرۆز و زماندا)، زۆر شارەزای مەزهەبی شافیعی بوو حەزی لە فەلەکیات بوو.

**دانراوەکانی:** نامیلکەی حەج، نامیلکەی تەجوید، شەرحی هۆنراوەی فەرائچی مەلا عەلی قزلجی، تەفسیری چەند جوز و لە قورئانی پیرۆز بەکوردی، کورتەباسی نیکاح و تەلاق و مامەڵەت لە توحفە.

**ئەوە ماوە بزانین کە نازناوی (ڕەئیس) لە چییەوە هاتووە؟**

ئەمە لە باوکیەوە کە کاتێك قوتابی بوو لای زانای گەورەی ئایین و کورد (مەلا حسن کوڕی مامۆستا مەلا علی قزلجی) خوا گیانی پاکی بە بەهەشت شاد بکات، لەوێ سەرۆکایەتی هەموو قوتابییەکان و کارەکانی دەکرد چونکە لە هەموویان زیرەکتر بوو.

ئەوانەی لای مەلا محمدی ڕەئیس خوێندنیان تەواو کردبوو زۆر بوون، هەندێك لەو بەڕێزانە ئەمانە بوون:

مەلا زاهيدى پاوە، مەلا عبداللهى گەناوى، مەلا حسين دەشتێو، حاجى مەلا عبدالرزاق ماوەتى، حاجى ڕەسولى گەلاڵى و کوڕەکەى مەلا عبدالرحمن، شێخ عبدالرؤوف بێژوەى، مەلا على دولكانى، مەلا أحمد حاجى عرە، مامۆستا علاء الدين سجادى، مەلا عبدالله جنانيە، مەلا سعيد زمناكۆ، مەلا أبوبكر وەجاغى، مەلا عبدالله حسن زادە. بەدەيان مامۆستاى تر.

ساڵى ١٩٧٠ گەلاڵەى بەجىٚ هێشت و هاتە سلێمانى لەوێ هەر خەريكى خوا پەرستى و ئامۆژگارى و (فتوى) دان بوو.

زۆر نەفس بەرز بوو، كەسايەتى خۆى زۆر ڕادەگرت، هەرگيز لەگەڵ كاربەدەستان پەيوەندى نەبوو يان داواى شتيان لىٚ بكات.

لە ڕۆژى ١٩٧٩/٤/٢٦ كۆڕى ئايينى كوردستان ئەم مامۆستا بەڕێزەى لە دەست چوو، گيانى پاكى سپارد و چووە كاروانى زانايان و پياوانى ئايين، خواى گەورە گيانى پاكى بە بەهەشت شاد بكات.

## بۆچی لە گەڵاڵە ئیجازەم وەرنەگرت؟

بڕیار وابوو یەکەم مانگی بەهارساڵی (١٩٤٦) من لە لای مامۆستا مەلا محەمەدی ڕەئیس ئیجازەی دوانزە عیلم وەربگرم، چونکە کۆتایی ئەم زانستانەم لای ئەو خوێند، من لە هەندێك فەقێ زیاترم خوێند، چونکە زۆر فەقێ هەبوو لە کۆتاییدا (فلکیات) و (ریاضیات)یان نەدەخوێند، من ئەوەشم تەواو کرد و دەبوو لە کۆتایی ئەو کتێبانەدا لای ئەو مامۆستایە ئیجازە وەربگرم، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو داب و نەریتەوە ئیجازەم وەرنەگرت لەبەر ئەم هۆیەی کە باسی دەکەم.

ئەو زستانە زستانێکی زۆر سەخت بوو، بەفرێکی زۆر باریبوو، هەروەك ئەو ساڵە وابوو کە لە تەوێڵە دەمخوێند و چووم بۆ پاوە، ئینجا لەم لاو لەولاوە هەوڵمان دەدا دار پەیدا بکەین بۆ سۆپاکەمان کە سەرمامان دەبوو، گۆڕستانێك هەبوو لە نزیکی دێکەدا داربەڕوویەکی زۆری لێ بوو وشك بوو بوو، بەڵام هیچ کەس لە دانیشتوانی ئەو دێیە نەیاندەوێرا دارەکان بهێنن بۆ سوتاندن، چونکە وا بڵاو بوو بۆوە کە (شخص)ێك هەیە لەو دارستانەدا هەر کەسێك لەو دارانە بهێنێت دەیدات بەبن دەسیدا و دەیکوژێ.

ئێمەش لەبەر ناچاری دەستمان نا بەگیانی خۆمان و وتمان (شخص)ەکە هەرچیمان لێ بکات لەوە باشترە لە سەرماندا ڕەق ببینەوە، سوختەکانمان نارد وتمان هەر یەکە باوەشێك لەو دارە وشکانەی سەر ئەو گۆڕستانە بێنن، یەکێ لە سوختەکان سوختەکەی من بوو کە ناوی (مەلا عبدالرحمن عەینەکی) بوو، (جامع)ی دەخوێند، ئەم فەقێیە زۆر قسەی نەستەق و خۆشبوو، شەرمی لە کەس نەدەکرد لەبەر ڕاستی خۆی ئەگەرنا زۆر بەئەدەب بوو.

کاتێك دارەکانیان هێنا ئاواییەکە زانیان، هەموویان چاوەڕوانی ئەوە بوون کە شتێکی خراپمان بەسەردا بێت، یان کارەساتێك ڕوبدات کە بەهیچ دوعایەك و هیچ شتێك لێی ڕزگارمان نەبێت.

یەکێك لە دانیشتووەکانی دێیەکە خۆی بەدەم سپی دێکە دادەنا لە پاش ئاغا، لە مزگەوتدا لەکاتی نوێژ دەچێت بەگژ سوختەکەدا (عبدالرحمن عەینەکی) دەچێت و دەڵێت: بۆچی ئەو دارانەتان هێناوە؟ ئێوە خۆتان بە موسڵمان نازانن؟

وتبووی: لەبەرئەوە دارەکانمان هێناوە تا سەر ورگی مردووەکان و شەخسەکە سووك ببن، چونکە داری زۆریان لەسەر بوو.

ئەویش لەبەر چاوی نوێژکەرەکان وتبووی: لەوساوە فەقێ و مەلا لەم دێیەدا پەیدا بووە کوێر و هەژاری دێیەکە تێر سکی خۆیان نانی نەخواردووە.

واتە مەلا و فەقێ موچەی هەژار و کوێر و بێ دەسەڵاتی دێیەکەیان داگیر کرد بۆ خۆیان لەجیاتی بدرێت بە هەژارەکان دەدرێت بە مەلا و فەقێ.

کاك عبدالرحمن قسەکەی بۆ گێڕاینەوە لە حوجرە، منیش ئەوەندەم پێ ناخۆشبوو، دەستم برد قورئانێکم داگرت و سوێندم خوارد بە قورئانەکە ئیجازە وەرناگرم و مەلایەتی ناکەم، دەچم کەوەر دەفرۆشم یان پێڵاو بۆیاغ دەکەم لەسەر پیشە و ڕەوشتی مەلا و مەلایەتی نارۆم.

زوتر بیستبووم (عەلی کەمال) لە بەغدا لەسەر ئەرکی خۆی فەقێی کورد دەنێرێ بۆ زانکۆی ئەزهەر لە قاهیرە، لەوێش (رواق الاكراد) هەیە کاتی خۆی (صلاح الدین ئەیوبی) خوالێخۆشبێت کردوویەتی بۆ کوردەکان بۆ ئەوەی لەوێ بخوێنن، ئینجا ئەوەی بگەیشتایەتە ئەو شوێنە خواردن و نوستن و هەموو شتێکی لەسەر ئەوێ بوو، ژووریان پێ دەدا و هەموو مانگێکیش موچەیەکی تایبەتی هەبوو، بەباشی پێی دەژیان.

منیش بڕیارم دا بچم بۆ بەغدا و ئەو ڕێگەیە بگرم لە جیاتی ئەوەی ئیجازە وەربگرم یان مەلایەتی بکەم، (مەلا ئەحمەد) فەقێیەك بوو لەگەڵمدا بە (مەلا

ئەحمەدی واحد العین) بەناوبانگ بوو، چونکە هەر لە زگماکیەوە چاوێکی کوێر بوو، وتم: مەلا ئەحمەد من بەیانی دەڕۆم ڕووەو کۆیە و لەوێشەوە ڕووەو بەغداد، تۆ دێیت لەگەڵم یان نا؟

وتی: دێم وەك تۆ نە مەلایەتی دەکەم و نە ئیجازە وەردەگرم، مادام ئێمە موچەی لێقەوماو و هەژار و بێ دەرامەت وەردەگرین.

ئەوکاتە مانگی یەك بوو لە ساڵی (١٩٤٦)، هەموو زەوی پڕ بوو لە بەفر، ئەم هەواڵەیان دا بە ماموٚستا، ئەویش هات بۆ حوجرە بۆ لام وتی: من بەچاوی باوکایەتی تەماشای تۆم کردووە، وەك کوڕەکانی خۆم مامەڵەت لەگەڵ دەکەم، هیچ کاتێك تۆم بە فەقێ دانەناوە، بۆچی دەڕۆیت؟

منیش قسەکەم بۆ گێڕاوە، وتی: بە محەمەد ئاغا دەڵێم سزای ئەو پیاوە بدات.

وتم: سزا بۆ یەکێکە تاوانبار بێت، ئەو پیاوە تاوانبار نیە چونکە ئەوەی وتی ڕاستە، مەلا و فەقێ بەسەرفیترە و زەکات دەژین، لە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر زەکات و سەرفیترە بۆ هەژار و لێقەوماوە، بۆ کەسێکە ناتوانێ بەدەستی خۆی نان پەیدا بکات، ئینجا کە پێم دەوترێ پێشەوای موسڵمانان، لە نوێژدا پێش دەکەوم و لە ڕۆیشتندا پێش دەکەوم، کەچی لە ژیانمدا لە هەموو هەژار و لێقەوماوێك خراپترم و دەچم موچەی ئەوان دەخۆم، پێم وایە بچم ڕێگەیەکی تر بگرم بۆ ژیانم کە بەشەرەف تر بێت تەمەنی خۆمی پێ بەسەر دەبەم باشترە.

ماموٚستا وتی: وا دێتە بەرچاوم تۆ شێت بوویت، چونکە یەکێك شێت نەبێت ئەم قسانە ناکات، یەکێك بەم زستانە کە هەموو ڕێگە بەفرە دەریشی بکەن دەرناچێت.

وتم: ماموٚستا من زۆر سوپاسی تۆ دەکەم زۆر سودم لێ وەرگرتیت، هەردەم هەستم دەکرد بەوەی زۆر بە لوتفیت لەگەڵمدا، بەڵام قسەیەکە کردوومەو پەشیمان نابمەوە.

بۆ بەیانی چووم دەستی ماموٚستام ماچ کرد، فرمێسك بەچاوی ئەو و مندا هاتە خوارەوە، لەگەڵ مەلا ئەحمەد نیشتینە سەر ئەو ڕێگەیە بەرەو پشدەر

ڕۆیشتین بۆ ئەوەی بچین بۆ کۆیە، ئەو ڕۆژەی لە گەلاڵە دەرچووین زۆر سەرما بوو لەبەرئەوە شەو لەدێی (نورالدین) ئەو دێیەی (مەلا حوسێن) مەلای بوو لەوێ ماینەوە، چونکە نزیکترین شوێن بوو لەسەر ڕێگەکەماندا، لەبەر سەرما نەمانتوانی بچین بۆ دێیەکی نزیکتر لەو ناوچەیەدا.

لەو کاتەدا (ماموٚستا مەلا حسێن) هات بۆ حوجرەی فەقێکان وتم: ماموٚستا دەمناسیتەوە؟ وتی: بەسەر و شێوە دەتناسمەوە، بەڵام بەناو و ناوەڕۆك هیچم لەیاد نەماوە.

وتم: من ئەو فەقێیەم پێش سێ ساڵ هاتمە خزمەتت و داوام کرد جێگەم پێ بدەی، تۆش کە خۆت بەباشترین مەلا دەزانی و بەباشترین موسڵمان لەناوچەی پشدەر دەناسرێیت، تەماشات کردم کە بینیت ڕوت و قوتم بەبێ ئەوەی بپرسی کە چی دەخوێنم و بۆچی دەگەڕێم وتت فەقێ من جێگەم نیە لەم حوجرەیەدا بیدەم بە تۆ، منیش ئەوەندە ماندوو بووم و ئەوەندە گەڕابووم وڵات بە وڵات بەدوای مەلای باشدا، تۆ لە مەلا باشەکان دانرابوویت، بەڵام کە هیوام نەما بە جەنابت فرمێسکی گەرم بەچاومدا هاتە خوارەوە، چونکە دڵم کزەی هات بۆ حاڵی خۆم و پێم وتیت: پەیمان بێت لە ڕۆژی قیامەت لە خزمەتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) شکاتت لێ بکەم، چونکە تۆ بڕیارەکەت زۆر ناڕەوا بوو، من پێشتر دەمزانی کە جێگەی فەقێ هەیە.

وتی: فەقێ بەخوا منیش دوای تۆ کزە بەجەرگمدا هات بۆ تۆ و زۆر پەشیمان بوومەوە، دەمدا بە ئەژنۆی خۆمدا کە من بۆچی ئەو هەڵەیەم لەگەڵ تۆ کرد، وتی: سوێندت دەدەم بەخوا و تکات لێ دەکەم کە ئاشت بینەوە.

وتم: ماموٚستا هەرچەندە شتێکی ناشیرینە، ئەو تاوانەی کە ئەو ڕۆژە تۆ بەرامبەر بەمنت کرد هی ئەوە نیە کە بە ئاشت بوونەوە خوا بیسڕێتەوە لە لاپەڕەی کردەوەکاندا بۆ ڕۆژی قیامەت.

دووبارە جارێکی تر وتیەوە تکات لێ دەکەم با ئاشت بینەوە.

وتم: هەروا بە خۆڕایی؟

وتی: لەبەر خاتری تۆ ئەمشەو هەموو فەقێکان دەعوەت دەکەم.

ئینجا فەقێکان ئەمەیان پێ خۆشبوو، زۆر هانیان دام کە ئاشت ببمەوە، چونکە پیاوی موسڵمان داوای لێ کراوە لە قورئانی پیرۆزدا کەلێبوردنی هەبێت بەرامبەر بەوانەی ستەمیان لێکردووە، خوا فەرمویەتی:

﴿ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ﴾.(1)

واتە: ڕەوشتی جوانی پیاوە موسڵمانەکان ئەوەیە کە رقی خۆیان بخۆنەوە و لێ بوردنیان هەبێت بۆ ئەوانەی تاوانبارن بەرامبەریان، منیش لە ژیانمدا هەرچیەکیان پێ وتبم ئەگەر خراپ نەبوبێت بەربەرەکانیم نەکردووە، بڕیارم دا کە ئاشت ببمەوە، دوای نوێژی ئێوارە چوینە ماڵی مامۆستا پاش نان خواردن دەستمان کردە ملی یەکتر و یەکترمان ماچ کرد و گەردنی یەکترمان ئازاد کرد و لە خوا داواکارم لەویش و لە منیش ببورێت.

دوای ئەوە گەیشتینە دێی (گەناو)، کتێبە نایابەکەم کە دەستوخەتی ئەو کەسە بوو کە شەرحی لەسەر کرد بوو، خۆشەویستترین کتێب بوو لە کتێبخانەی ئاغای موفتی لە (سنە)، کە پێشکەشی کرد بە خۆشەویسترین فەقێ کە من بووم، لەسەر ئەو کتێبە هەردوو چاوم کوێر بوو، کە ژمارەیەکی زۆر حاشیەم لەسەر نووسی، دام بە (مەلا صالح) مەلای گەناو، بەدینارێك. وام دەزانی دینارەکەم دۆزیوەتەوە، چونکە ئەگەر کتێبەکەم بسوتانایە دڵم ئۆخەی نەدەکرد.

بەڵام ساڵی (١٩٧٨ز) داوام لە هاوڕێ یەکی مامۆستا کرد ئەو کتێبەم بۆ بکڕێتەوە بە کێشانەی خۆی بەدینار، بەڵام ئەویش دیار بوو فرۆشتبووی بەفەرمانگەی (آثار)، منیش تا ئێستا بەدوایدا دەگەڕێم کە (استنساخ)ی بکەم، بەڵام هێشتا نەم دۆزیوەتەوە.

هەروەها کتێبی (شرح شمسی)م هەبوو بە حاشیەی پێنجوینی، پڕم کردبوو لە لاپەڕەی یەکەمەوە تا دوا لاپەڕە، ئەویشم دا بەفەقێیەك بە کڵاوێك.

---

(١) سورة آل عمران: ١٣٤

لە پاش دوو ڕۆژ بەپێ بەناو ئەو بەفرەدا گەیشتینە کۆیە، هەر حوجرەیەك دەچووین ڕایان نەدەگرتین، چونکە ئەوکاتە کێشەی کوردستانی ئێران کە قازی محمد بوو هێشتا دوایی نەهاتبوو، بەدوای خەڵکدا دەگەڕان لە ئێران و عێراق کە تووشیان بکەن، یان دەیان وت پەیوەندیتان بە کۆمەڵەوە هەیە یان هەڵهاتوون یان جاسوسن.

پاش ئەوەی کە بێ هیوا بووین چوین بۆ حوجرەی مەلای گەورە (مەلا محەمەدی جەلی زادە) کە ساڵێك پێشتر وەفاتی کردبوو، دیمان ئەو حوجرە گەورەیەی جاران تەنها یەك مستعد و یەك سوختەی تێدایە، مستعدەکە ناوی (مەلا ڕۆوف مەریوانی)یە، ئەویش وتی: من لای براکەی جەنابی مەلای خوالێخۆشبوو دەخوێنم، ڕایان سپاردووین لە لایەن میرییەوە لە لایەنی مەلاکانەوە هەر فەقێیەك نەیناسین جێگەی پێ نادرێت لە حوجرەی فەقێیەکاندا، لەپاش ئەوەی چامان خواردەوە لەمنی پرسی: تۆ خەڵکی کوێیت؟ وتم: خەڵکی هەورامانم ماڵمان لەدێی زەڵمە، وتی: مەلا مصطفی زەڵمی دەناسیت؟

وتم: بەڵێ دەیناسم، ئەی تۆ چۆنی ئەناسی؟

وتی: من نەمدیوە، بەڵام بیستوومە لای مامۆستا مەلا باقر لە مەریوان خوێندویەتی لە بالك.

وتم: من ئەو کەسەم کە تۆ پرسیاری لێ دەکەیت.

ئینجا ماچێکی کردم و وتی: من وادەکەم جێگاتان بدەنێ و بە مامۆستا دەڵێم دەیناسم لەسەر من با لێرە بن، لە خزمەتی جەنابت بخوێنن.

ئینجا لەوێ کە دامەزراین بۆ ئەوەی ڕێگەیەك بدۆزینەوە کە بمانگەیەنێتە لای عەلی کەمال لە بەغدا، لەوێ دەبوو بخوێنین، دەستم کرد بەخوێندنی (تەفسیری بەیضاوی) لای شێخ نوری برای خوالێخۆشبوو مەلای گەورە و مەلا ئەحمەد (جمع الجوامع)ی دەخوێند.

شێخ نوری پیاوێکی زیرەك بوو، بەڵام لەبەرئەوەی لەکاتی خۆیدا هەر مەلا محەمەدی جەلی زادە برا گەورەی تەدریسی کردووەو ئەم بە کشتوکاڵەوە خۆی خەریك کردبوو، زۆر بەهێز نەبوو لە دەرس وتنەوەدا.

ڕۆژێك مەلا ئەحمەد پێی وتم: تۆ (تشریح الافلاك)ت خوێندووە لای ماموّستا مەلا محەمەدی گەلاڵە، لام وایە لێی تێگەیشتوویت و من ئەم کتێبەم نەخوێندووەو باوەڕناکەم بیخوێنم، لەبەرئەوە تۆ هەموو ڕۆژێك دەرسێکم پێ بڵێ چونکە بەیانی کەس ناڵێت لای هاوڕێیەکی خۆت خوێندوتە، ئینجا بۆ ماوەیەکی کەم کتێبەکە هەر جۆر بوو بەشێکی زۆرمان لێ خوێند، وتم وابزانە کە پیای دەچینەوە بەدەرس پێت ناڵێم.

## وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی

لە پاش چەند رۆژێك مانەوەمان لە کۆیە رۆژێك کە نوێژی عەسرم دەکرد لەو حوجرەیەدا کە مەلای گەورە زیاتر لە (٥٠) ساڵ دەرسی تیا وتبووەوە، بیرم لەوە کردەوە کە مرۆڤ هەرچیەك بێت لە ژیانی دونیادا دەبێت کۆتایی ژیانی بەچی تەواو بێت، جگە لە مردن هیچی تر نیە، ئەگەر من ببم بە پاشای عێراق هەر رۆژێك ژیانم تەواو دەبێت، ماڵئاوایی لەژیانم دەکەم و دەچمە شوێنێکی تر کە پەیوەندیم بە هەموو ئادەمیزادێکەوە نامێنێت، زۆر دڵم تەنگ بوو، زۆرم بیر لە داورۆژی ژیان کردەوە، پەشیمان بوومەوە لەو سوێندەی کە وتم واز لە مەلایەتی دێنم و کەفارەتی سوێندەکەم لەسەر ئەو بڕیارە دا، بڕیارم دا لای شێخ نوری



حوجرەی مزگەوتەکەی شاری کۆیە





ئاهەنگی ئیجازەی عیلمی، ساڵی ١٩٤٦- کۆیە

لە بنەماڵەی مامۆستا شێخ نورالدین وەرگیراوە

ئیجازە وەربگرم و بگەڕێمەوە ببم بە مەلای دێیەکەمان، بەڵام سەرفیترەو زەکات نەخۆم و هەتا ماوم لەگەڵ ماڵی باوکمدا، ئەوان چۆن دەژین منیش بەوجۆرە بژیم، ئینجا منیش ئەو بیروڕایەم ئاشکرا کرد بۆ مەلا ئەحمەد و مەلا رۆوف، زۆریان پەسەند کرد، مەلا ئەحمەدیش وتی منیش دەچمەوە بۆ ئێران.

لەپاش ئەوە بە دوو مانگ بڕیاردرا کەئیجازە وەربگرم، لە مانگی ئازاری ساڵی (١٩٤٦ز) شێخ نوری (شێخ نورالدینی مەلا عەبدوڵلای جەلیزادە) بە یەك دوو بازرگانی وت کە مێزەر و جبە و عەباو جوتێك پێڵاو و ئەمانەم بۆ ئامادە بکەن بۆ رۆژی ئیجازە وەرگرتنەکە، بەهەندێکی تری وت ئەرکی ئیجازەکە بگرنە سەر شانی خۆیان.

دانیشتوانی کۆیە لەبەرئەوەی زۆر مەلایان خۆش دەویست عورف و عادەت وابوو حەوت رۆژ فەقێکان شایی و هەڵپەرکێ بکەن و بەشداری بکەن بەخوێندنەوەی قەصیدەی (بوردییە) لە کۆڵانەکاندا بەرەو قەراغی شار بۆ ئەوەی لەناو سەوزە گیادا ئەو فەقێیانە هەڵپەڕن، بەم جۆرە دەست کرا بە ئاهەنگی ئیجازەکەی من، بەڵام لەبەرئەوەی (جەلال ئاغا) کەپیاوێکی گەورەی کۆیە بوو لە رۆژی سێیەمی ئیجازەکەدا کۆچی دوایی کرد، زەماوەندەکە بوو بە پرسە بۆ ماوەی حەوت رۆژ.

کاتێك هەموو پێویستیەکانی من تەواو بوو هەموو بازرگان و پیاو ماقوڵانی کۆیە بانگ کران لە مزگەوتی گەورە، لەو شوێنەدا کە هەموو جارێك مەلای گەورە ئیجازەی تیا پێشکەش دەکرد، جەنابی شێخ نوری کاتێك هەڵسایەوە ئیجازە نامەکەی خوێندەوە دەستی کرد بە گریان، دانیشتووەکانیش هەموو گریان بۆ جەنابی مەلای گەورە، کە ئەمە یەکەم ئیجازە بوو درا بە فەقێی حوجرەکەی ئەو لە پاش کۆچی دوایی و بەجێ هێشتنی ئەم جێگایە، کە هەردەم پڕ بوو لە فەقێی کوردستانی عێراق و ئێران، بەسەدان ئیجازەی مەلای داوە و هەر یەك بووە بە مەلای شوێنێك، کاك مەسعود کوڕی جەنابی مەلای گەورە کە کۆلیجی یاسای تەواو کردبوو لە بەغدا ئەویش حازر بوو لەکاتی ئیجازە وەرگرتنەکەدا، بەم جۆرە لە کۆیە لە (١٩٤٦/٣/١٥) لای شێخ نوری جەلیزادە (برای مەلای گەورەی کۆیە) ئیجازەم وەرگرت و گەڕامەوە سلێمانی.



## ژیاننامەی مامۆستا شێخ نورالدینی مەلا عەبدوڵلای جەلیزادە[(١)]

ساڵی ١٨٨٣ ز لەدایك بووە، باوکی حاجی مەلا عەبدوڵای جەلیزادەیە، دایکی خاتوو زەینەبی کچی شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجەیە، وەك هەر فەقێیەکی دیکەی سەردەمەکەی قۆناغەکانی خوێندنی حوجرەی تەواو کردووە، سەرەتا لەخزمەت حاجی فەقێ مەهدی رومی دەستی بەخوێندن کردووە، لەخزمەت مەلای گەورەی کۆیە کەبرا گەورەی بووە ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، جگە لەمامۆستایەتی مزگەوت یەکەم مامۆستا و دامەزرێنەری قوتابخانەی سەرەتایی بووە لەکۆیە لەساڵی ١٩٢٤، ماوەی شەش مانگ بریکاری قازی بووە لەکۆیە.

ساڵی ١٩٠٨ خیزانی پێیکهێناوە (فاتمە خانی کچی شێخ مەعروفی بەرزنجە) و سێ کوڕ و دوو کچی بووە: (مامۆستا عبدالمجید- مامۆستا محمد علی- مامۆستا أمجد - و- سعادت و فوزی).

ساڵی ١٩٤٣ لە گوندی خۆران لە ناوچەی خۆشناوەتی یەکەم قوتابخانە دەکاتەوەو دەبێتە بەڕێوەبەری، پاش کۆچی دوایی مەلای گەورە دەبێتە ئیمام و

---

(١) وێنەو ژیاننامەکە لە بنەماڵەی مامۆستا وەرگیراوە.

خەتیبی مزگەوتی گەورەی کۆیە، ئیجازەی مەلایەتی بەچەندین فەقێ داوە لە ١٩٤١-١٩٤٢، لە ٢٠-٨-١٩٥٢ کوچی دوای کردووە.

## مانەوەم لە سلێمانی

دوای ئەوەی ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت، ڕووە و ماڵی خۆمان گەڕامەوە. ئەوکاتە (٤) ساڵ بەسەر (تخلف)ی سەربازیمدا تێپەڕیبوو، پێویست بوو لای مەلایەك ئیجازە وەربگرم کە مەدرەسەکەی (ڕەسمی)بێت و لە لایەن میریەوە باوەڕ پێکراو بێ (معترف)بێ و لە خزمەتی سەربازی قوتارم بکات، لەو ڕۆژەدا باشترین مەلا لە سلێمانی مامۆستا مەلا حمە سەعید دیلێژەیی بوو کە مەدرەسەکەی ڕەسمی بوو، بۆیە لە سلێمانی لام دا لای مامۆستا مەلا (حمە سەعیدی خوم خانە)((دیڵژەیی))، وتم: مامۆستا من ئێستا تەمەنم (٢٢) ساڵە، چوار ساڵە داوام دەکەن بۆ سەربازی نەچوومەتە ڕوو، چارم چیە؟ ئەویش وتی: مەدرەسەکەی من ڕەسمیە ئەو قوتابیەی لێرە ئیجازە وەردەگرێ نایکەن بە سەرباز، منیش ناچار لەوێ بۆ ماوەی دوو مانگ مامەوە تا (١٩٤٦/٥/٢٠) لە خزمەتیدا هەندێ لە فیقهی شافعیم خوێند، چونکە ئەو کتێبانەی کە باو بوون لە مەدرەسەکەی مامۆستا مەلا حمە سەعید هەموویم تەواو کردبوو، پاشان ئیجازەیەکی ترم وەرگرت، هەبوو توانجی لێ دەدام دەیوت بۆیە ئەمەی کردووە بۆ ئەوەی عەبایەکی تر وەربگرێت، منیش کێشەکەم لەگەڵ سەربازیدا بوو نەك جل وبەرگ. ئینجا چوومەوە بۆ زەڵم.

## وێنـــەی ئیجـــازەکە:

١

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي شرح صدور العلماء بأنوار البينات، وأزاح من
قلوبهم صدور الشكوك والشبهات، ورفع بعضهم فوق بعض درجات
وجعل من لدنه سلطاناً نصيراً، وفتح عليهم ابواب كنوز المعاني
وخزائن البيان، وخصصهم ببدائع الأيادي وروائع الإحسان
فصرفوا جهدهم نحو كشف القناع عن كلامه تأويلاً وتفسيراً، والهمهم
اصول الشريعة الغراء وابدعهم فروع الحنيفية البيضاء، ويؤتي الحكمة
من يشاء ومن يؤت الحكمة فقد أوتي خيراً كثيراً، فسبحان من أسس
مبادئ الدين على الكتاب والسنة، وأوضح للناس بالحجج البالغة
محجة الجنة، وكتب في أوراق الأطباق آيات ترهيبه ليتلوها منها
ويتفكروا فيها تفكيراً، فيا من تجدت لعزة جلاله جباه الأجرام

العلوية، ونطقت بشكر نواله شفاه الأنوار القدسية، صل على من ارسلته
بالهدى ودين الحق بشيراً ونذيراً، فهديت اليك بعدما وقعنا في الجهالة،
وقاد الى جنابك حيث انتقبت محجة الهدى بظلم الضلالة، سيدنا ومولانا
محمد الذي نورت الآفاق بقدمه الشريف تنويراً، وعلى روح ساء خطائر
القدس، وعظماء بقاع الأنس، وآله رواصي بها المطرين لعقائدهم
على الإخلاص، والعادلين عن وضعهم العام الى وضعه الخاص
الذين تأدبوا بآدابه وقرروا احاديثه بفصيح النطق تقريراً
أمّا بعد: فيقول خادم تراب اقدام العلماء والفضلاء،
افقر العباد الى الله جل وعلا محمد سعيد ابن الحاج
الملا احمد الدهليزي: ان العلم لواء قدره مرفوع

٢

لا يوضع، واساس عزه موضوع لا يرفع، من اعتصم به فلا
يضل ولا يشقى، ومن اعرض عنه فهي ضنك الدهر يبقى
وان من اهتدى بنور الله الى الصعود في مدارج هذه
المرتبة دون اقرانه وتجلى عليه نجم السعود في رصد
النظر الى هذه المنقبة دون اخدانه، ناقل هذه النميقة
وحامل هذه الوثيقة، العالم العامل والفاضل الكامل الجامع
من المحاسن اشتاتها، والمحيي من المكارم رفاتها، كاشف
اسرار العلوم برأيه الصائب، جامع دقائق الرسوم
بفكره الثاقب، شمس سماء العلم والمعالي، السيد مصطفى
ابن ابراهيم القزلجي، وفقه الملك المبدي الذي قد بذل من

٤

ايام دهره وصرف معظم ريعان عمره نحو اقتناء شوارد
الرسوم العقلية، واجتناء فوائد العلوم النقلية،
وطوى رداء شبابه لأحراز الفنون، وجاب مفاوز المكاره
الشدائد للوصول الى السر المكنون، حتى انه عرج معارج
التحقيق واعتلى على سنام مدارج التدقيق، وقد
التمس من المعترف بالذنوب، الحقير المقترف للخطايا
والعيوب، ان يجيزه بتدريس العلوم، ونشر الرسوم
وذلك منه حسن ظن، وان كنت لست اهلاً لذلك
الحق بالعلماء في علم من العلوم وفن، فسارعت لسؤاله
وبادرت الى تحقيق آماله، رجاء الانتظام في سلك العلماء

٥

الأكابر، وتمسكا بما ثبت في علوم الحديث من رواية الأكابر عن الأصاغر فاجزناه بتدريس فرائد العلوم، من الفروع والأصول، وبسط فوائد الرسوم من المنقول والمعقول بشرط ان يراعي الشفقة على الطالبين، ويواعي فوائد الرحمة في التعليم للمحصلين، كما اجازني العالم العامل والحبر الكامل زبدة العارفين وقدوة العالمين السيد بابا علي النكيهي زكي صلاح علا: وقد قرأ عند عمر افندي الأربيلي المعروف بجوك ملا، وهو قد قرأ عند عمر افندي الجيلاني، نوّر الله بغفرانه الرباني، وهو قد قرأ على الفاضل التقي العالم النقي نخبة المتقدمين وفخر المتأخرين، والده(1) الماجد ذي المآثر والمحامد

(1) اي والد عمر افندي الاربيلي

٦

ابي بكر الأفندي الأربيلي، عليه رحمة الملك العلي: وهما على امام الآفاق بالاتفاق، استاذ الكل في الكل على الإطلاق خطيب المتأخرين، واكمل المتبحرين، [illegible] فاق السابقين وفائد اللاحقين، العالم الرباني، محمد افندي الحلبي الشيخ سليماني وهما قرآ(1) على المولى الفاضل الكامل، والعالم العامل عبد الرحيم افندي الزيادي عليه رحمة الملك الباري، وعلى المولى العلامة والحبر الفهامة نتيجة المتبحرين وخاتمة المتأخرين، استاذ الكل عبد الرحمن افندي الروزبهاني عبد اللطيف الرباني وهما قرآ على العلامة صبغة الله افندي الزيادي نور الله ضريحه وهو على مولانا صالح افندي الحيدري الصفوي، عليه رحمة الغني القوي

(1) كذا في الاصل

٧

وهو على والده العلامة: مولانا اسماعيل عليه رحمة الملك الجليل وهو على والده العلامة ذي القلب السليم مولانا ابراهيم، وهو على والده ذي التصنيفات الفائقة والتأليفات الرائقة: الذي فاق في العلوم وبهر، الكردي الحريري مولانا حيدر، وهو على والده الذي بمآثره العلية لا يزال يحمد، مولانا احمد: وهو على والده مجمع جوامع المنطوق والمفهوم، مولانا حيدر الاول المرحوم تلميذ شيخ الإسلام مولانا [illegible] زين الدين الكردي البلاني [illegible]: تلميذ نصر الله الخلخالي، تلميذ خواجه جمال الدين محمود الشيرازي، تلميذ المولى المحقق، جلال الملة والدين محمد بن اسعد الصديقي الدواني: تلميذ محيي الدين

٨

(ت: ٨١٦هـ)

الكشكناري، تلميذ علامة الشريف الجرجاني اقدس سره تلميذ مباركشاه: تلميذ المحقق قطب الدين الرازي، تلميذ العلامة الشيرازي، تلميذ نصير الدين الطوسي، وهو كان ايضا تلميذ الكاتبي القزويني، تلميذ الامام فخر الدين الرازي، تلميذ [الامام ضياء الدين عمر تلميذ] حجة الإسلام محمد بن محمد الغزالي: تلميذ امام الحرمين عبد الملك ابي عبد الله بن يوسف الجويني، تلميذ الشيخ ابي طالب المكي، وهو اخذ الانابة والارادة ولبس الخرقة من ابي عثمان المغربي، وهو من ابي عمرو الزجاجي، وهو من برهان الملة والدين سلطان الحقيقة والتقي مروج الشريعة الغراء، ومحيي الطريقة البيضاء، سيد الطائفتين

(ت ٢٩٨)
الى ابى القاسم الجنيد البغدادى قدس سره وهو من خاله
وولى الله على المحققين ومبين مناهج الحقيقة لاهل الطريق
الى الحسن السرى بن المغلس السقطى قدس سره (ت ٢٥٣) وهو من تاج
الاولياء وارث علوم سيد الانبياء ابى محفوظ معروف الكرخى (ت ٢٠٠)
قدس سره وهو من ابى سليمان داود الطائى قدس سره (ت ١٦٥) وهو
من الحبيب العجمى قدس سره (ت ١٤٠) وهو من الحسن البصرى رضى الله عنه (ت ١١٠)
وهو من حضرة الامام الهمام والليث المقدام غوث
المحققين يعسوب الموحدين سراج الملة والدين شمس
العالمين بدر العارفين الشارب من كأس اليقين
على بن ابى طالب القرشى الهاشمى كرم الله وجهه (ت ٤٠)

وهو من حضرة درة الصدفة الوجود وواسطة عقد
المرسلين المخصوص بالمقام المحمود خليفة الله الاعظم
ومن مسجود الاملاك المخاطب بلولاك لولاك لما خلقت الافلاك
سيدنا ومولانا وملاذنا محمد المصطفى صلى الله عليه وسلم
وعظم وشرف وكرم وهو من امين الله النور المبين بواسطة
الروح الامين الممتاز من بين الملائكة المقربين برسالة
رب العالمين جبريل عليه السلام اللهم اجعل هذه الاجازة
متصلة بحبلك المتين الذى لا ينقطع محصنة بحصنك الحصين
الذى لا ينصدع واجعل هذه السهم قربا اليك
ووسيلة للوقوف بين يديك يثبت الله الذين آمنوا

بالقول الثابت فى الحياة الدنيا وفى الآخرة اللهم
افض علينا من بركاتهم واسلك بنا مسلك كراماتهم
واغفر لنا بجاههم آمين واليه خرجنا فى الكثير
والقليل حسبنا الله ونعم الوكيل
وصلى الله على سيدنا محمد وآله اجمعين

المدرس
محمد ... الله ...
.../٤/٤

# ژیاننامەی مامۆستا
# مەلا محەمەد سەعید دێلیژەیی[١]

مەلا محەمەد سەعید کوڕی حاجی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا محەمەد کوڕی مەلا حسێنی دێلیژەیە. ساڵی ١٨٩٤ز لە شاری سلێمانی بنەماڵەیەکی ئایینی پەروەر لەدایك بووە، لەلای باوکی دەستی بە خوێندن کردوە، دوای وەفاتی باوکی چۆتە لای چەندەها مەلا بۆ خوێندن، تا لەلای مامۆستا مەلا حسێنی پیسکەندی خوێندنی تەواوکردوەو ئیجازەی وەرگرتوە. بۆ ماوەیەکی کەم موچەخۆری میری بوو لە دائرەی (تاپۆ) و دوایی وازی لێ هێنا، چونکە ئەوکاتە ئیشوکاری میری بەدەست ئینگلیزەکانەوە بوو، ئەمیش لەگەڵیاندا نەدەگونجا.

هاتەوە ریزی مەلایەتی و لە مزگەوتی (حاجی عبدالرحمن بەگ) ناسراو بە (مزگەوتی خومخانە) لەشاری سلێمانی دەستی کردووە بە وتنەوەی وانە بە قوتابیانی ئایینی.

هەندێ لەو بەرێزانەی لەلای مامۆستا دەیانخوێند: (مامۆستا مەلا مستەفا زەڵمی، مامۆستا مەلا قادری کۆکۆیی، مامۆستا مەلا عەزیم ماوەتی، مامۆستا مەلا سەعید شاناخسێ و چەندەها بەرێزی تر). دوایی بووە بە سەرۆکی عولەمای سلێمانی.

مامۆستا هەرچەند شاعیر نەبووە، بەڵام چەند شیعرێکی وتوەو شیعری شاعیرەکانی بەزۆری لەبەربووەو بەمانای ئاشکراو نهێنییەوە لێکی ئەدانەوە.

---

(١) لە بنەماڵەی مامۆستا وەرگیراوە.

زیاد لە (٥٠) ساڵ خزمەتی زانست و زانیاری و ئایینی ئیسلامی کردووەو وانەی بە قوتابیان لە مزگەوت وتوەو تا کۆتایی ژیانی لە خزمەتکردن نەوەستاوە.

مامۆستا لە زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی، بێجگە لە زمانی کوردی، دەستێکی باڵای هەبووە.

لەساڵی ١٩٤٩ نامیلکەیەکی بە ناوی (رسالة فتح الرحمن في الرد على منكر الطلاق الثلاث وطلاق السكران) لەچاپ دا. نامیلکەیەکی تریشی بەناوی (فرائض کوردی) لەچاپ دا، کە باس لە پاشماوە (إرث) دەکات بەگوێرەی پەیرەوی قورئانی پیرۆز.

لە ٣ / ١٢ / ١٩٦٥ کۆچی دوایی کرد و لە گردی شێخ محی الدین بەخاك سپێردرا.

لە چەند کتێب و گۆڤاردا ستایشی ئەم مامۆستایە کراوە، وەك کتێبی (مشاهير الالويه العراقية) کە (عبدالمجيد حسن) دانەرەکەیەتی، لەلاپەڕە (١٥٧) باسی دەکات.

هەروەها لە کتێبی (علماؤنا في خدمة العلم والدين)، مامۆستا عبدالكريم المدرس بە هەمان شێوە باسی کردوە.

# گەڕانـەوەم بۆ زەڵـم

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦ز. گەڕامەوە دێکەی خۆمان، ئینجا بەناو بووم بەشتێکی تر، لە (مچەوە) بووم بە (مصطفی)، ئینجا فەقێ مصطفی، ئینجا مەلا مصطفی، بەڵام ناوەڕۆکەکەم نەگۆڕا، چونکە هەموو خوێندنی ئەو چەند ساڵەم بریتی بوو لە حاشیەکانی پێنجوینی و قزڵجی و ئەوانی تر، نەمدەزانی ژن چۆن مارە دەکرێ یان یەکێك ژنەکەی تەڵاق بدات نەمدەزانی تەڵاقەکەی کەوتووە یان نا، بۆ یەکەمجار پورە ڕەعنام (خوشکی باوکم) بوو لەگەڵ خاڵێکمدا ناکۆکیەکیان هەبوو لەسەر ئاشێك، هاتن بۆ لام نەمدەزانی کامیان خاوەن مافە، ناچاربووم پێیان بڵێم بچن بۆ بیارە بۆ خزمەتی مامۆستا مەلا عبدالکریم مدرس، ئەگەر یەکێك تاوانێکی بکردایە نەمدەزانی چۆن سزا دەدرێت، ئەگەر بچومایەتە فەرمانبەرایەتیکی میری نەمدەزانی (سکاڵایەك) بنووسم، ئەمە هەمووی بەهۆی جۆری خوێندنەکەوە بوو.

پەشیمان نیم لەو (١٢) ساڵەی خوێندن کە بە ماندوو بوون و برسێتی و ڕوتی و دووره وڵاتی و گەڕانی دێ و شاران تەواوم کرد، هەرچەندە پێم وابوو کە هیچ سوودم لە خوێندنەکە نەبینیوە، بەڵام بۆ دواڕۆژ لە زانکۆدا سوودم لێ وەرگرت، ئەو بابەتانەی کە لە حوجرەکان دەخوێنران، ئاستی بیرکردنەوەی مرۆڤ فراوان دەکەن، کە بیر بکاتەوەو بەدوای زانیاری زیاتردا بگەڕێت.

ساڵی (١٩٦٠ز) لە کۆلیجی یاسا لە زانکۆی بەغدا وەرگیرام، مامۆستاکان کە بابەتێکی یاساییان ڕوون دەکردەوە، بۆ من تێگەیشتنی زۆر ئاسان بوو، بە پێچەوانەی ئەو قوتابیانەی لەگەڵمدا بوون کە نەیاندەتوانی بەباشی بابەتەکە

بهێننە بەرچاوی خۆیان، ئەو توانایەی من بەهۆی خوێندنی مزگەوتەوە بوو، کە دواتریش توانیم سێ ماستەر و دوو دکتۆرا بەدەست بهێنم و زیاتر لە (٦٠) دانراوم هەیە و هێشتا چەند دانراوێکم هەیە کە بڵاو نەکراوەتەوە، زۆری دانراوەکان بەراوردە لەنێوان فقهی ئیسلامی و یاسادا.

ئەو خوێندنەی کە لە مزگەوت و دواتریش ئەوەی کە لە زانکۆ خوێندم وای لێکردم کە زۆر شتی ورد هەبوو لە یاسادا یان لە باسکردنی حوکمە شەرعیەکاندا بیان بینم، کردم بەو دانراوانەی کە ئێستا لە کۆلێژەکانی یاسادا دەخوێنرێن:

**لە قۆناغی یەکەمدا:** (المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية).

**قۆناغی دووەم:** (احكام الزواج والطلاق).

**قۆناغی سێهەم:** (أحكام الميراث والوصية وحق الانتقال في الفقه الاسلامي).

**قۆناغی چوارەم:** (أصول الفقه الاسلامي في نسيجة الجديد).

**لە قۆناغی ماستەردا:** (موانع المسؤلية الجنائية في الشريعة الاسلامية و التشريعات الجزائية العربية).

**لە قۆناغی دکتۆرادا:** (الالتزامات في الشريعة الاسلامية و التشريعات المدنية العربية).

دانراوی (أصول الفقه الاسلامي في نسيجة الجديد) لە زانکۆکانی وڵاتی ئوردن و یەمەن و ئەندەنوسیا و ئێران دەخوێندرێت.

ئەمانە هەمووی بەهۆی وردەکاری قۆناغی خوێندنی مزگەوتەوە بوو.

# تێبینیەکانم

## لەسەر خوێندنی مزگەوت

**لە ماوەی (١٢) ساڵی خوێندنم لە قوتابخانە ئاینیەکاندا، هەندێك تێبینیم بۆ دروست بووە لەسەر خوێندنی حوجرەو لەم بەشەدا تۆماریان دەکەم:**

**یەکـەم:**

جۆری وتنەوەی بابەتی منداڵ لە مزگەوتدا زۆر هەڵە بوو - وەك باسم کرد-، زۆر نارەوا بوو، لە (١٠٠) منداڵ دووان دەردەچوون، هەندێك لەو مەلایانە یان ئەو میرزایانەی کە قوتابخانەیان دادەنا، توڵە هەنارێکی ئامادە دەکرد، یان بە زستاندا مقاشێکی سورەوەکراوی بەکار دەهێنا بۆ سزادانی ئەو قوتابیەی هەڵەیەکی دەکرد لە وشەیەکەدا، ئەگەر جگەرەکێش بوایە جگەرەکەی دەنا بە پەنا گوێی منداڵەکەوە، وەك میرزا فتح الله جگەرەکەی نا بە پەنا گوێی (محەمەد) ی ئامۆزامەوە، مامیشم وتی ئەگەر ببیت بە ئیمامی شافعی نایەڵم بخوێنیت.

**دووەم:**

قورئانی پیرۆز گرانترین کتێبێکە بە زمانی عەرەبی، لە هەموو دانراوێکی عەرەبی (بلیغ) تر و گرانترە، قوتابی بۆ یەکەمجار لە بری ئەوەی شتێکی ئاسانی پێ بڵێن، بۆ ماوەی یەك ساڵ تەنها قورئانی پیرۆزی پێ دەڵێن، ئەویش نەیدەزانی مانای وشەکانی ئەم قورئانە چییە، لەبەرئەوە زۆر قوتابی هەبوو هەر لە سەرەتاوە وازی لە خوێندن دەهێنا، قوتابی منداڵ وردە وردە گەورە دەبێت و بیرکردنەوەی گەشە دەکات، دەبێت لە ئاسانترین زانستەوە بچێت بۆ قورسترین

زانست، قوتابی ئێستا لەناو قوتابخانەکاندا ڕێژەیەکی کەمی واز لە خوێندن دێنێت یان دەرناچێت، چونکە خوێندن پلە پلە سەر دەکەوێت، بە پێچەوانەی خوێندنی مزگەوت کە ڕێژەیەکی زۆر کەم خوێندنی تەواو دەکرد.

لە دێی زەڵمدا بە تەنها من خوێندنم تەواو کرد، ئەویش لەبەر لاساریم و هەستم بە ئێش و ئازار نەدەکردنم، بەرگەی هەموو لێدانێك و هەموو توانجێکم دەگرت، بەرگەی سەرما و گەرما و برسێتی و دووریم دەگرت.

**سـێـیەم:**

جۆری ژیانی فەقێ:

ئەوکاتە ئەو جۆرە ژیانە عەیب نەبوو لەبەر دوو شت:

١- لەبەرئەوەی عورف و عادەت بوو.
٢- لەبەرئەوەی فەقێ زۆر بەڕێز بوو لەسەر ئەو بنچینەیەی کە بۆ خوا دەخوێنێت و خزمەتی ئایین دەکات، هەموو ئێوارەیەك فەقێیەك وەك سواڵکەر دەگەڕا بەماڵاندا هەر ماڵەی نانێکی دەدایە، یان لە بەهاراندا دەچوون بۆ دێهاتەکان و دەوارەکان دەگەڕان و ڕاتبەی کەرەیان دەکرد و دەیانفرۆشت بۆ کڕینی شەکر و چا، زۆر جار سەگ دەوەڕی و ئەو کولەکەیەی وەك گۆزە بەکار دەهێنرا بۆ هەڵگرتنی کەرێیەکە دەکەوت و کەرێیەکە لەگەڵ خاك و خۆڵەکە تێکەڵ دەبو و، ڕێسی فەقێ دەبووەوە بەخوری، باشتر بوو بە شێوەیەکی تر ئەو ئیشە بکرێت، یان یەکێك لە ئاواییەکە نانەکەی کۆ بکردایەتەوە، یان هەموو شتەکان لە جێگەیەك کۆ بکرایەتەوە.

**چـــوارەم:**

جیاوازییەکی زۆر لە نێوان سوختە و مستەعددا هەبوو، بە جۆرێك کە مستعد سوختەی بە بەندە و خزمەتکار دەزانی و بەئارەزووی خۆی بەدڵی بوایە ڕای دەگرت یان دەری دەکرد، زۆرترین کاتی سوختە بە خزمەتکاری مستعد تەواو دەبوو، کە ئەمە نە لە ئیسلامدا هەیە و نەشتێکی مرۆڤایەتیە و جۆرێك بوو لە کۆیلایەتی.

**پێنجـــەم:**

مەلای مزگەوت لەگەڵ فەقێکان لە ڕێگەی خوێندن دا کاتێکی زۆر و ئازارێکی زۆر و هیلاکیەکی زۆریان دەکێشا، لەگەڵ ئەوەش بەرهەمەکەیان زۆر زۆر کەم بوو ئەگەر بەراوورد بکرێت لەگەڵ ماندووبوونەکەیان، بۆ نمونە ئەگەر مەلایەك چوار مستعدی هەبوایە هەر یەکە بەتەنها کتێبێکی دەخوێند و ئەو مەلایە بۆ ماوەی دوو کاتژمێر لەگەڵ خوێندنی ئەو فەقێیە خەریك دەبوو، واتە ڕۆژی بەلای کەمەوە هەشت کاتژمێر دەرسی بەو چوار فەقێیە دەوتەوە، کە هەر یەکە فێری یەك کتێب دەبوون، وتنەوەی ئەو کتێبە بە لای کەمەوە ماوەی یەك ساڵی دەبرد.

ئەم جۆرە دەرس وتنەوەیە گەورەترین هەڵە بوو، کە ماندووبونێکی زۆر بەرامبەر بە سودێکی کەم، ئەگەر ئەو مەلایە لە ماوەی (٨) کاتژمێر هەر چوار فەقێکە بەیەکەوە چوار ماددەی جیاوازی پێ بوتنایە، لە جیاتی (١٢) عیلمە دەبوون بە (٤) عیلمە، هەروەك خوێندنی کۆلیجەکان و پلەکانی تری خوارەوەی خوێندن لە سەرەتایی و ئامادەیی، جگە لەوە دەیتوانی ژمارەیەکی زۆرتر فەقێ فێر بکات.

لە زانکۆی ئەزهەر هەمان ئەو کتێبانەی مەلاکانی کوردستان دەیانخوێند دەوترایەوە، بەڵام بەشێوەیەکی ڕێکخراو بوو، (٥٠) قوتابی بۆ ماوەی یەك کاتژمێر گوێیان لە یەك مامۆستا دەگرت، زۆرتر بابەتی خوێندن و ژمارەیەکی زیاتر دەبوون، ئەم هەڵەیە هێشتا لە خوێندنی حوجرەی مزگەوتەکاندا هەرماوە.

**شـەشـەم:**

گرنگی نەدان بە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر و فیقهی ئیسلامی، هەرچەندە یەکەم کتێب دەخوێنرا قورئانی پیرۆز بوو، زۆر فەقێ هەبوو (١٢) عیلمەیان تەواو دەکرد بەبێ ئەوەی یەك لاپەڕە تەفسیری قورئان بخوێننەوە یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر بزانن، وەك باسی خۆمم کرد، مەلا هیچی نەدەزانی لە بابەتی شەریعەتی ئیسلامەوە.

جارێك لە مەریوان (مەحمود خان كانی سانانی) لە مەلاكەی (وولەژێر)ی پرسی مانای ئەم ئایەتە چیە؟

﴿ نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ ﴾ (١).

مەلاكەش دەڵێت ئەمە ئایەت نیە (حدیث)ی پێغەمبەرە.

دەگێڕنەوە دەڵێن: (شیخ الاسلام) لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا وەك (وەزیری داد)ی ئێستا وابوو، كە قازییەكانی لەژێردەستا بوون، جارێك دەڕوات بۆ (بصرة) بۆ ماڵی قازی، پڕی مەقەڵیەك پشكۆ دادەنێت، چونكە زستان و سەرما دەبێت، شیخ الاسلام دەڵێت: (النار فاكهە الشتاء)، واتە: ئاگر لە زستان وەك میوە وایە بۆ مرۆڤ، قازیش دەڵێت: جەنابی شیخ الاسلام ئەو ئایەتە لە چ سوڕەتێكدا هەیە، ئەویش لە داخاندا نانەكەی ناخوات و دەگەڕێتەوە بۆ بەغدا، لەوێ باسی قازی دەگێڕێتەوە، قازی بەغدا دەڵێت: ئەو نەخوێندەوارە نەیدەزانی ئەوە ئایەت نیە و فەرموودەی پێغەمبەرە، ئەویش هەتا دەتوانێت دارەكەی دەستی دەدات بەسەر قازیدا و دەگەڕێتەوە بۆ ئەستەمبوڵ.

مەلایەكی زۆر چاك لە كوردستاندا هەڵكەوتووە-نامەوێت ناوی بڵێم- چونكە بۆ پلەی ئەو ئەم قسەیە ناڕەوایە، جارێك بەیانیەك دەچێت بۆ مزگەوت لەو سەرەوە دەگەڕێتەوە ماڵەوە لەسەر ڕێگە دەبینێت لاپەڕەیەك با هێناویەتی، ئەویش دەیبینێت لاپەڕەیەكی جوان دەبێت، كە هەڵی دەگرێتەوە سەری سوڕ دەمێنێ لەو وتانەی لە لاپەڕەكەدایە و لەماڵەوە دەچێت شەرحێكی زۆری لەسەر دەنووسێت، ڕۆژێكی تر مەلایەكی تر دەبینێت دەڵێت لاپەڕەیەكم دۆزیوەتەوە نازانم هی چ كتێبێكە ئەوەندە (بلیغ)ە دەڵێی قورئانە، ئەمەش چونكە ئەو مەلایە تەمەنی خۆی بەسەر حاشیەی كتێبی (أصول الفقه) و (منطق) بەسەر بردوە، ئەویش دەڵێت ماڵت بڕمێت نازانیت ئەوە قورئانە.

---

(١) سورة البقرة: ٢٢٣.

حـەوتـەم:

ئەو مەلایانەی کە لە پاش مەلایەتی هەوڵیان دەدا بۆ خۆیان تۆزێك فێری فیقهی ئیسلام ببن، جگە لە مەزهەبی شافیعی -خوای لێ ڕازی بێت- نەیاندەویست فێری شتێکی تر ببن لە مەزهەبەکانی تر، لایان وابوو ئەوەی شافعی فەرمویەتی هەمووی ڕاستە، هیچ ڕۆژێك بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە ئیمامی شافعی ئەم حوکمەی لە چ سەرچاوەیەکەوە هێناوە تا ئەمیش بچێت سەیری ئەو سەرچاوەیە بکات تا بزانێت قسەکەی ئیمامی شافعی ڕێی تێ دەچێت کە ڕاست بێت، یان مەلاکان دەیانتوانی حوکمی زۆر شت لەو خوێندنەی خوێندوویانە یان قورئانی پیرۆز یان فەرموودەکانی پێغەمبەر وەربگرن، ئیمامی شافعی (٥٤) ساڵ ژیاوە تەنها چوار عیلمی خوێندووە کە بریتی بوو لە عیلمی (قورئان)، عیلمی (فەرموودەی پێغەمبەر)، علمی (أصول الفقه)، عیلمی (بلاغە)، کەچی مەلا (١٢) عیلمی دەخوێند و زیاتر لە ئیمامی شافعی دەژیا و زیاتر ئەم عیلمانەی بە خوێندن بەفەقێ دەوتەوە، کە پرسیاریان لێ دەکرد ئەگەر وەڵامی بدایەتەوە لە بۆچوونی ئیمامی شافعی زیاتر هیچی تری پێ نەبوو، قەت نەی دەوێرا بڵێت ئەمە ڕای خۆمە بەپێی قورئان.

ڕۆژێك چووم بۆ لای مامۆستا (مەلا عبدالکریم مدرس) دیم شێخ ئیبراهیم - کە ئێستا لە کەرکووکە- لەگەڵ دوو مەلا لەوێ بوون، یەکێك لە مەلاکان کوڕی خۆی بوو، ئەوی تریان لە سلێمانی کاتی خۆی فەقێی من بوو، کە هەڵسابن لای مامۆستا چووینە دەرەوە، من دایکی محەمەدم لە گەڵدا بوو، وتم یاشێخ بابچین ئەم نیوەڕۆیە لە خزمەتدا بین، وتی: تۆ ماڵەوەت لەگەڵدایە چیت هەیە لەماڵەوە ئامادە بێت بیخۆین، وتم: یا شێخ تۆ شێخی (تەسەوفیت) دەبێت بەهەموو شتێك ڕازی بیت، پێغەمبەری خوا لەماوەی ژیانیدا نەیفەرمووە ئەم خواردنەم پێ خۆش نیە بیگۆڕن بەخواردنێکی تر، هەرچی ئامادە بوو پێشکەشی دەکەین.

کاتێك هاتینەوە ماڵەوە نانمان خوارد هەندێك پرسیار کرا لە بابەت ئیسلامەوە، ئەو فەقێیەی کە کاتی خۆی لای من بوو وتی: مامۆستا، لە کاتی حەجدا

دەستی پیاو بەر ئافرەت بکەوێت بەپێی مەزهەبی شافعی دەستنوێژی دەشکێت، بەڵام بە مەزهەبی ئیمامی حەنەفی ناشکێت، لەبەر پێویستی دروستە کە مرۆڤ خۆی (تقلید)ی ئیمامی حەنەفی بکاتەوە؟.

وتم: جا پێویستی چیە بەتەقلید؟ شافعی فەقێی (محەمەد حەسەن شیبانی) بووە، ئەویش فەقێی (ئیمامی حەنەفی) بووە، واتە (حنفی) مامۆستای مامۆستای شافعی بووە.

شێخ ئیبراهیم ڕووی تێ کردم وتی: مامۆستا وادیارە تۆ مەیلی وەهابیت هەیە.

وتم : یاشێخ من نازانم وەهابی چییە، لەبەرئەوە من وەهابی نیم، بەڵام تۆ لە قسەکەم تێ نەگەیشتیت.

وتی: ئاخر ئیمامی شافعی لە هەموو خاوەن مەزهەبەکان زاناتر بووە.

وتم: یا شێخ تۆ دەتوانیت بڵێیت ئەو دەروێشە لە دەروێشەکەی تر باشترە یان ئەو سۆفیە سۆفیەکی باشە، بەڵام تۆ بڵێیت ئیمامی شافعی زاناتر بووە لە ئیمامی حەنەفی یان یەکێکی تر ئەوە ئیشی تۆ نیە.

من دەمەوێ ئەوە بڵێم کە زیاتر لە (٥٠) ساڵە لەگەڵ مەزهەبی شافعی دەژیم و بەردەوام بەراووردم کردووە لەگەڵ مەزهەبەکانی تر و تا دەگاتە هاوەڵانی پێغەمبەر - خوا لێیان ڕازی بێت -، تا ئێستا قسەیەکم نەدی هی ئیمامی شافعی خۆی بێت و کەسێکی تر پێش خۆی نەیوتبێت، ئەو بۆچوونانەی ئیمامی شافعی هەمووی وتەی هاوەڵانی پێغەمبەر و ئەوانەی دوایان هاتوون(تابعین)، یان هی یەکێکی ترە لە مەزهەبەکانی پێش شافعی، ئەو هەمووی کۆکردۆتەوە. ئەمە مانای ئەوە نیە من مەزهەبی شافعی بە کەم بزانم، چونکە پلەیەکی زۆر بەرزی هەیە، بەڵگە بۆ ئەمە ئەوەیە کە ئەو هەموو بیر و بۆچوونانەی کۆکردۆتەوە و باشترینیانی هەڵبژاردووە و پەسەندی کردووە.

هەرچی فەرموودەی ئیمامەکان هەیە (شافعی، حەنەفی، حەنبەلی، مالیکی، ظاهری، أباضي، شیعەی ئیمامی، شیعەی زەیدی)، هەموو ئەوانەی

لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە وەرگیراون یان لەوانەی دوای ئەوان هاتوون، قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر بە ئاشکرایی باسی کردوون.

مامۆستای ئایینی کوردستان، لەبەرئەوەی هیچ بەرهەمێکی لە (فقە)ی ئیسلامی بەجێ نەهێشت و لە زۆر مانای قورئانی پیرۆز تێ نەگەیشت، کە کۆچی دوایی دەکرد وەك چرایەکی ڕووناك دەکوژایەوە، هیچ ڕووناکیەکی بەجێ نەدەهێشت، چونکە هەموو تەمەنی خەریکی خوێندنی ئەو حاشیانە بوو کە باسی کتێبەکەی دەکرد کە دەیخوێند، بێ ئەوەی بزانێت سەرچاوەی ئەو کتێبە لەکوێوە هاتووە، یان زۆر جار لە کتێبەش تێ نەدەگەیشت.

ئەو مامۆستایانەی وەك (مامۆستا عبدالکریم مدرس، مەلای پێنجوینی، قزلجی، نۆدشە، مامۆستا شێخ عمر قەرەداغی، مەلا قادری گەورەی بیارە، مەلا ئیبن ئادم، مەلا مەحەمەدی جەلی زادە، مەلای تر) لەم مامۆستا زیرەکانە وێنەیان کەم بوو.

ئەم مامۆستایانە سوودیان لە خوێندنەکەیان وەرگرت بەتایبەتی زۆر زانستی وەك (منطق) لەوەو پێشتر نەبوو، چونکە وەرگێڕابوو، جگە لە مامۆستا ئەبوبەکری مصنف کە کتێبی (وضوح)ی بەجێ هێشت، مامۆستا مەلا عبدالکریم مدرس تەفسیری باشی کردووە لەسەر قورئانی پیرۆز، ئەو نوسراوانەی لەسەر ئاینی ئیسلام بەجێ هێشتووە، مامۆستا سەید عارف ڕوونکردنەوەی زۆر دوور و درێژی نوسیوە لەسەر (وضوح) و چەند مامۆستایەکی تر، کەس هیچی نەنووسی یان شتێکی بەجێ نەهێشت کە کورد یان ئایینی ئیسلام سودی لێ وەربگرێت.

بەڵام لەخوا بەزیاد بێت ئێستا زۆر لە زانایانی ئایینی کوردستان، بەتایبەتی مامۆستا گەنجەکان بوون بە پسپۆڕ، زۆریان دکتۆرا یان ماستەریان وەرگرتووە، زۆرێکیشیان خەریکی خوێندنی باڵان لە دەرەوە، وە زۆر پەیمانگای ئایینی لەکوردستان کراونەتەوە. زۆر وتاربێژمان هەیە بەجوانی فەرمودەکانی خواو پێغەمبەرمان بۆ ڕوون دەکەنەوە، هیوادارین ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕوو بەزیادی بن بۆ خزمەتی ئایینی ئیسلام و نەتەوەکەیان.



سەرەتای مەلایەتیم لە ١٩٤٦/٥/٢٠ دەستی پێکرد، واتە بەهار بوو هێشتا نەچووبووینە ناوباخان لە زەڵم، ئەو کاتە نزیکەی (١٥٠) ماڵ بوو، دانیشتوانی ئەم دێیە دووبەرە بوون بەرەی باوکم و بەرەی دایکم هیچ بێگانەیان تیا نەبوو، لەوێ مەدرەسەیەکم دانا کە بەردی بناغەکەی کاك مەلا حەمەئەمینی نزڵی بوو، ئەو خۆشەویستە بەوەفایە کە پێکەوە بۆ ماوەی ساڵێك لە (١٩٤٣)دا لە شاری سنە - کە لە شارە جوانەکانی کوردستانە - پێکەوە ژیاین لە مەدرەسەی مزگەوتی (دار الاحسان)، کە جەنابی مەلا مەحموودی موفتی تیایدا مدرس بوو، من لای مفتی (جمع الجوامع)م دەخوێند (بەرگی دووەم) لە أصولی فقهی شافعی لەگەڵ بەشێك لە کتێبی تهذیب، مەلا حەمەئەمینیش لای من کتێبی (صمدیە وإظهار)ی دەخوێند لە عیلمی نەحودا، ئینجا چەند فەقێیەکی تر هاتن دەستمان کرد بە تەدریس، زۆر هەستم بە خۆشی و کامەرانی کرد، کە لە پاش ئاوارەیی و دووری لە دایك و باوکم و کەس و کارم بۆ ماوەی زیاتر لە ١٢ ساڵ، خوای گەورە ئەم ئاواتە گەورەیەی بۆ بەدی هێنام.

## ژن هێنـانم

هەروەك باسم کرد دانیشتوانی دێیەکە هەمووی خزمی خۆم بوون، لەبەرئەوە من مەلایەك نەبووم کە لە دەرەوە هاتبم، هەروەها مەلایەکی موچەخۆر و سەرفیترە و زەکات خۆر نەبووم، بەڵکو لەماڵی باوکم بووم، بەڵام ئەوان خۆیان زۆر ڕێزیان دەگرتم و لە خزمەتکردنم هیچ ناتەواوییەکان نەبوو، گرنگترین شتێك کە ئەوان بیریان لێکردبێتەوە ئەوەبوو لە پێش هەموو شتێکدا ژنێك بۆ من دیاری بکەن، لەبەرئەوەی دامەزرێم لەدێیەکەدا و بەجێیان نەهێڵم. لەناو خۆیاندا وتویانە هەرچەندە ئەم مەلایە خزمی خۆمانە بەڵام هەر لە مناڵیەوە چۆتە دەرەوە و پەیوەندیەکی زۆر بەهێزی نەماوە لەگەڵمان، ئەو ژنەی بۆی دەهێنن باشتر وایە خزمی خۆمان بێت و بێگانە نەبێت، بۆ ئەوەی هانی نەدات لەسەر بەجێهێشتنی دێیەکە.



مامە عبدالقادر

ئەم ژنە دوو ساڵ لەوەو پێش دیاری کرابوو بۆم لە لایەن باوکیەوە خوالێخۆش بوو (مامە عبدالقادر)م کە ئەو کاتە ماڵیان لە خورماڵ بوو.

مامە عبدالقادر لەگەڵ باوکم باوکیان (کریم و حمەأمین) برا بوون دایکیشیان شەمام و نەبات خوشك بوون.

دیارە ئەم خزمایەتییە زۆر نزیکە هەندێ لە (فقهاء)ەکانی ئیسلام وەك شافعی - خوا لێی خۆشبێت - و پزیشکەکانی دەرونزانی و بۆماوەزانی (علم النفس والوراثة) بە چاکی نازانن کە کورو کچێك باوکیان برابێت یان پورزاو خاڵۆزا بن ببن بە ژن و مێرد، چونکە مناڵەکانیان زۆر جار یان لە بیروهۆشدا تەواو نابن یان لە لەش و تەندروستیدا، وتویانە بێگانە زۆر سەرکەوتووە، سەرەڕای ئەوانەش وتویانە خزم ئەگەر گۆشتت بخوات ئێسکت ناشکێنێ.

باوکم و هەندێ لە ئامۆزاکانم و خاڵەکانم چوون بۆ خورماڵ بەیەك ڕۆژ خوازبێنی و مارەکردنی مەعصومە (دایکی محمد)یان بۆ من تەواوکرد، ڕۆژی (١٩٤٦/٧/٢٥) شاییان بۆ کرد، ئەو کاتە لەنێو باخان بووین لەناو کەپرەکاندا، هەرچی مەلا و فەقێی بیارە و خورماڵ و دێهاتەکانی شارەزوور بوو بانگکرابوون بۆ ئەو شاییە، تا سێ ڕۆژ لە گۆشەی پرد کە پێیان دەوت هاوینە هەواری (شێخ حسام الدین) هەڵپەڕکێ و شادی کرا، بۆ ڕۆژی سێیەم (مەعصومە)یان بەبووکی هێنا بۆ دێی زەڵم.

# مانای قزڵجی

کاتێك خەریکی ئەوەبوون بووك دابەزێت بچێت بۆ ئەو کەپرەی ئامادە کرابوو بۆ بووك و زاوا، منیش لەو کاتەدا دڵم لەسەر هەزار لێدەدات، فەقێیەکی ماموستا (مەلا سەید عارف) کە ناوی (مەلا حمە أمین) بوو (شرح تجوید)ی دەخوێند، لە تەواوبووندا بوو، لەپڕ کتێبێکی دەرهێنا کە لەگەڵ خۆی هێنابووی، ئەویش تەصریفی مەلا علی ئەشنەویی بوو، وتی پێم ئادەی ئەگەر ئازایت مانای ئەم قزڵجییە چیە؟

قزڵجی بریتی بوو لە چەند حاشییەك لەسەر تەصریفی مەلا علی کرابوون، لە باتی ئەوەی ئاسانی بکات ئەوەندەی تر گرانی کردبوو.

حاشییەکە ئەوە بوو کتێبەکە دەیوت: (ونعنى بالسالم ما سلمت من الهمزة وحروف العلة)، ئینجا قزڵجیش بەلای خۆیەوە مەعنای (سلمت)ی لێك داوەتەوە فەرمویەتی: (أي خلت، فهو من قبيل إن كان قميصه قد من دبر فصدقت..).

منیش کاتی خۆی کە فەقێ بووم لەمەنگوور لە ساڵی (١٩٤١)، پێیان وتم لە سێوسێنایەتی کتێبێکی تەصریفی مەلا علی هەیە بە قزڵجیەکان خۆشکراون و ئاسانکراون بەحاشیەی (خوڕ خوڕی)، چووم بۆ سێوسێنایەتی بۆ ئەو کتێبە سێ چوار رۆژ دانیشتم لە حوجرەی فەقێیەکان تا نووسیمەوە، بۆیە زۆر ئاگام لە مانای قزڵجییەکان هەبوو.

لە وەڵامدا وتم: پرسیارەکەت منالیش دەیزانێ، ئەویش بەتوڕەیی وتی: چۆن؟ وتم: مەبەستی قزڵجی ئەوەیە هەروەك (قد من قبل) و(قد من دبر) تەعریفی

(صدق وکذب) درۆ و ڕاستی نیە، بەڵکو نیشانەی درۆ و ڕاستیە، هەروەها تەعریفەکەی مەلا علی ئەشنەوی بۆ سەلامەتی تەعریفی سەلامەتی نیە، بەڵکو عەلامەتی سەلامەتیە.

بۆ زیاد ڕوونکردنەوەی ئەم مەبەستە هەر (فعل)ێك لە زانستی (صرف)دا (ألف، واو، یاء، همزة)ەی تیادا نەبێت پێی دەوترێت (فعل سالم)، ئەگەر یەکێ لەوانەی تیادا بێت پێی دەوترێت (معتل)، ئەگەر پیتەکە لە سەرەتاوە بوو پێی دەوترێت (معتل الفاء) وەك - وعد - ئەگەر پیتەکە لە کۆتاییدا بوو پێی دەوترێت (معتل اللام) وەك -رمی- ئەگەر لە ناوەڕاستدا بوو(معتل العین) وەك - قَوَلَ -.

## ناردنی عبدالله خان بەدوامدا

ڕۆژی ١٩٤٦/٧/٢٧ عبدالله خان کوڕی محمود خانی دزڵی کە ئاغای بەشی هەورامانی ئێران و عێراق بوو لەو ناوچەیەدا، ناردی بەدوامدا کە بچم بۆ ئەو ناوچەیە، لە ڕۆژی دووەمی ژن هێنانمدا لەگەڵ مامێکم و خاڵێکم چوین بۆ دزڵی.

کاتێك چووم بۆ ئەوێ دیم مامۆستا مەلا باقریش کە لەدێی بالك بوو دوو ساڵ دەرسی پێ وتبووم لەوێیە. وتم: خان من دوێنێ ژنم هێناوە بۆچی نەتهێشت سێ چوار ڕۆژ بەلای کەمەوە لە (شهر العسل) ببەمە سەر.

وتی: دێیەکم کڕیوە بۆ ئەوەی لە پاشە ڕۆژدا بیانو بەخۆم و نەوەکانم نەگرن دەمەوێت ئێوە قەباڵەیەکم بۆ بکەنەوە.

ئەم قەباڵەیە بریتی بوو لە لاپەڕە کاغەزێکی گەورە بە دوور و درێژی دێیەکەی تیادا دەنوسرا لەگەڵ سنورەکانی، لە پاشاندا دوو شاهید و دوو مەلا ئیمزایان دەکرد، ئیتر ئەمە بەپێی ئایینی ئیسلام گەلێك بەهێزتر بوو لە (سند)ی طاپۆ یان تۆمارکردنی لە دائرەی (التسجیل العقاری) کە وەك ئێستا بەکاردەهێنرێت.

ئێمەش قەباڵەکەمان کردەوە و ئیمزامان کرد.

## فاڵگرتنەوە

لە پاشا مامۆستا مەلا باقر فەرمووی: ژنەکەت ناوی چییە؟ منیش ناوەکەم پێی وت، کاغەزێکی دەرهێنا و ناوی من و ئەوی لەناو چوار گۆشەیەکدا نووسی هەندێ پیتی لە دەوریا نووسی وەك (أ.ب.ج. و.ك.ص.ن..) ئینجا بە ژمارەی ئەبجەدی بەراووردی کرد لەگەڵ یەکتر لە ئەنجامدا وتی: بەداخەوە تۆ لەم ژن هێنانەدا سەرکەوتوو نابیت. بەپێی ئەم لێکدانەوەی من و بەپێی ناوەکەتان و ئەو پیتانەی لەگەڵ یەك بەرامبەرم کردن.

غەم و پەژارە دایگرتم کە باوەڕم بەو ئەفسانەیە کرد، منیش وەك ئەو کە (مامۆستام) بوو لەو سەردەمەدا باوەڕم بەو ئەفسانەیە هەبوو، کەچی لە پاشەرۆژدا، ئەوە زیاتر لە (٥٠) ساڵە بەسەر ژیانمدا تێپەڕی بەکامەرانی لەگەڵیدا ژیام، ئەگەر ئەو نەبوایە نەمدەتوانی لە دێیەکی دورەدەستی وەك (زەڵم)ەوە بگەمە ئەم پلە و پایەیە و، لە پاش بڕینی پلەی لیسانس لە قانووندا و تەواوکردنی خوێندنی باڵا، پلەی پرۆفیسۆریم بدرێتێ.

مامۆستا مەلا باقر هەرچەندە زانا بوو لە (منطق، فلسفة) و عیلمەکانی تردا، بەڵام زۆر باوەڕی بە خورافات بوو، بەداخەوە ئەم جۆرە زانایانە چۆن ئەم دوو شتە کۆ دەکەنەوە لای خۆیان (خورافات و زانایی)، لەمەوە دەردەکەوێت کەزانیاری جیاوازە لەگەڵ ژیریدا، هەرچەندە زانا فێری زانستەکان دەبێت، بەڵام ئەگەر فێری ژیری نەبێت ئەوا ساڵەهای ساڵ بەدەرس دەیڵێتەوە کەچی سودێکی لێ وەرناگرێت، لە لایەنی ژیری و لێکۆڵینەوە لەو شتانەی کە پەیوەندی هەیە بە ژیانی ئادەمیزادەوە.

لەبەر ئەمەیە کە (سعدالدین تفتازانی) فەرمویەتی: (عالم شودن چە ئاسان، عاقل شودن چە موشکیل). واتە: مرۆڤ ببێت بەزانا زۆر ئاسانە، بەڵام بوونی بەژیر زۆر گرانە.

بەڕاستی ئەو مامۆستایانەی کە لە خزمەتیاندا خوێندم لە مامۆستا مەلا (عبدالکریم مدرس) ژیرترم نەدی، ئەو کەم و کوڕییە لە ژێریدا پیشەی مەلا نەبووە بەتەنیا، بەڵکو (٩٠٪) موسڵمانەکانی ئەم سەرزەمینە لە هەموو چەرخێکدا پاش (خلفاء الراشدین)، بەتایبەتی لەپاش ئەوەی کە زۆر لە موسڵمانەکان دژی (معتزلە) دەوەستان، چونکە داوای کردەوەیان دەکرد بەپێی ژیری، ئێستاش هەر لەسەر ئەوە ماونەتەوە.

بۆ نمونە لە ڕێکەوتی (٢٠٠١/٨/١١) لە کۆلیجی یاسا زۆر هەوڵم دا لەگەڵ مامۆستایەك کە شتێکی خورافی لە مێشکی بکەمە دەرەوە، بەڵام نەمتوانی، چونکە هەر خوی پێوە گرتبوو و باوەڕی بەوە هەبوو.

بەم مامۆستایەم وت: قورئانی پیرۆز لە (٤٩) ئایەتدا فەرمانی بەوە داوە کە ژیری (عەقڵ) بەکاربهێنرێت، ئەگەر میللەتی عەرەب بەتایبەت و موسڵمانان بەگشتی دژی ژیری نەبووایەین، ئێستا لەجێگەی ئەمریکا ئەبوون لە داگیرکردنی بۆشایی ئاسماندا.

من کە زیاتر لە (٦٠) ساڵە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا دەژیم، زیاتر لە (٤٠) ساڵە لەگەڵ یاسای هەموو وولاتان دەژیم، زیاتر لە (٢٥) ساڵە بەراورد دەکەم لەنێوان یاسا و شەریعەتی ئیسلامدا، ئێستاش بیروباوەڕێکی جوان و ڕوون نەبووە لە یاساوە وەرمگرتبێت، کە جوانتر یان ڕوونتر بێت لەوەی کە شەریعەتی ئیسلام باسی کردووە.

ئەوەی باوەڕ ناکات ئەتوانێ خۆی بەراووردی بکات ئەزانێت نە (مبالغە)ی تێدایە و نە (تعصب).

## مەلا حەسەنی دزلی

مەلا حەسەن کوڕی مەلا موحەممەد کوڕی موحەممەدڕەزایە. لە ساڵی ١٨٥٩ (١٢٧٥ی کۆچیی هەتاوی) لە گوندی وەیسیا لە هەورامان لە بنەماڵەی مەردۆخییەکاندا لە دایکبووە. لە دەگاشێخان، شنۆولاجان، دۆڵکانە، سەنگان، هەولێر، ناوچەی بارزان و سلێمانی دەرسی ئایینیی خوێندووە. لە سەنگان و پاشان لە دزلی و هانەیقوڵ و بانیشار دەبێ بە مەلا.

لە نێوان مەلا حەسەن و چەند مەلای دیکەدا کێشەیەك لەسەر بابەتی تەڵاق دروست دەبێت، بەسەرهاتەکەش بەمجۆرەیە:



کەسێك دێت بۆلای و بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە کەچۆن لەکاتی توڕەبوون لەبابەتێکدا کەپەیوەندی بەژنەکەیەوە نەبوو لەجیاتی سوێند تەڵاقی خواردووە، مەلاکان رایان وابووە کەتەڵاقی کەوتووە، مەلا حەسەن دەڵێت: تەڵاقت نەکەوتووە، بڕۆرەوە ماڵی خۆت و ئاگاداری خۆت بە سوێند بەتەڵاق نەخۆیت.

ئەم هەواڵە بەمەلاکان دەگاتەوە، بابەتەکە دەگەیەننە حاکمی شەرعی کەرکوك و لەوێشەوە بەموفتی

بەغدا، دەچن بۆ بەغدا و لەلای موفتیی بەغدا مەلا حەسەن ئەوان دەبەزێنێ، موفتیی بەغدا زۆر پێی خۆش دەبێ و بە زانایەکی باشی دەزانێ و پێی دەڵێ چیت ئەوێ بۆت هەڵدەسوورێنم، مەلا حەسەنیش دەڵێ خەرجیەکەم بدە کە لە زانکۆی ئەلئەزهەری میسر درێژە بە خوێندن بدەم.

مەلا حەسەن ٣ ساڵ لە زانکۆی ئەزهەر دەخوێنێت و پاشان ٩ ساڵیش لەوێ تەدریس دەکات. دیسان بیری هەورامان دەکاتەوە و دەگەڕێتەوە بۆ هانەیقوڵ و پاشانیش دزڵی و تا کۆتایی ژیانی لە دزڵی مامۆستای ئایینی دەبێت. لە پیریدا ژن دێنێت و منداڵی نەبووە. لە ساڵی ١٣٦٥ی کۆچیی هەتاوی مردووە و لە گۆڕستانی ئەسحابی دزڵی ئەسپەردە کراوە.

مەلا حەسەن کۆمەڵێك هۆنراوەی بەنرخی بە شێوەزارەکانی هەورامی و سۆرانی نووسیوە. نازناوی لە شیعرەکانیدا "هیجری" بووە. مامۆستا ئەحمەد نەزیری لە ساڵی ٢٠٠١دا لە سنە کتێبی "شیعرەکانی مەلا حەسەنی دزڵی مەردۆخی" چاپ کردووە کە کۆمەڵێك لە هۆنراوەکانی مەلا حەسەنی بە شەرحەوە نووسیوە.



گۆڕی مەلا حەسەنی دزڵی

بڕوای بە تەسەوف نەبووە و ئیتاعەتی دەرەبەگ و خانی نەکردووە و هەموو کاتێ بە هەژاری ژیاوە. مەلا حەسەن عەرەبی و فارسیشی بە باشی زانیوە.

ئەمەش نمونەیەکە لەشیعرەکانی:

سەد تف و لەعنەت لە قوربان قوربان
لە "ئاغا فەرمووی" یەکجارم قینە

خۆم زەلیل ناکەم بۆ فلس و دینار
ئەویش لەسایەی غیرەتی دینە

ئیسلام و عیززەت، عیلم و کەرامەت
کورد و شەرافەت، ڕەسمی دێرینە

ناکەومە پینەی درۆی ئاغایان
کەوش و کراسی خۆم ئەکەم پینە

من هەڵۆی لووتکەی بەرزی دالآنیم
هەرگیز وەك قالاو ناکەومە چینە

حەسەن بۆ مەقام نۆکەری ناکات
سەد جار ڕیامە ئەو جۆرە ژینە

## بەختەوەری
## بەبوون و نەبوون نیە

لەپاش ژن هێنان و دانانی مەدرەسەیەکی ئایینی و ڕۆژ بەسەربردن لەگەڵ دەرس وتنەوە، هەردەم هەستم بەخۆشی و کامەرانی دەکرد، کاتێك نوێژی نیوەڕۆ دەهات، دەچووم بە جۆگەکەدا بەرەو ژوور بۆ دەستنوێژ گرتن، تەماشای شاخە بەرزەکانی ئەمبەر و ئەوبەر و ئاوەکەم دەکرد، وامدەزانی ئەو شاخانە هەموو ئاڵتونن و موڵکی منن، ئەوەندە هەستم بەبەختەوەری دەکرد، واتە دەوڵەمەندی بەتەنیا هۆی بەختیاری و دڵخۆشی نیە، هەروەها ژن هێنان و پێویستیەکانی تری ژیان نابنە هۆی بەختیاری، بەڵکو کامەرانی لەوەدایە کە تۆ قەناعەتت هەبێت و کارێك بگریت بەدەستەوە کاتی خۆت لەگەڵ ئەو کارەدا بەریتە سەر.

جارێك لە گۆڤارێکدا خوێندمەوە لە فەیلەسوفێکیان پرسی کە بەختیاری (سعادة) لەچیدایە، ئەویش وتی:

(السعادة تتحقق بثلاثة أشياء أولها المال وثانيها المال و ثالثها المال).

واتە: بەختەوەری بەسێ شت بەدی دێت، کەهەرسێکیان ماڵی دونیایە، ئەمە کاتێك کە فەیلەسوفەکە هەژار بوو، ئینجا دەوڵەمەند بوو، ئەمجارە وتی: من هەڵەم کرد کە وتم خۆشبەختی لەماڵدایە، ئەمجارە کەپرسیارەکەی لێ کرایەوە وتی: بەختیاری لە ژن دایە. کە ژنی هێنا پرسیارەکەیان لێکردەوە، وتی: ژن هێنان زۆر جار دەبێتە هۆی ناخۆشی ژیانی مرۆڤ، وتیان: ئەی ئێستا رات چیە سەبارەت بەختەوەری؟ وتی: لەوەدایە کە چەند منداڵێکت هەبێت لەگەڵیان

کاتی خۆت بەسەر بەریت، کاتێك منالّی بوو لێیان پرسیەوە وتی: زۆرترین تەنگ و چەڵەمەی ژیان بەهۆی منالّەوەیە، ئینجا وتی: من هەموو وەڵامەکانم هەڵە بوو، بەختیاری هەرکەسێك پەیوەندی هەیە بەو ئامانجەی (هەق) کە پێی سەرقالّ دەبێت، ئەگەر تەواو بوو ئامانجێکی دیکە ئەگرێتەبەر، ئەگەر ئامانجی نەما بەختیارییەکەی دەڕوات و ئەکەوێتە ناو گێژاوی غەم و خەفەتەوە.

واتە بەختیاری لەوەدایە کە تۆ ئامانجێکت هەبێ و پێوەی خەریك بیت.

هەروەها لە گۆڤارێکی تردا خوێندمەوە بەبۆنەی یادی هەشتا ساڵەی لەدایك بوونیەوە لە (ئەنیشتاین)یان پرسی: لەگەڵ پیریدا چۆنیت؟ وتی: من پیری ناناسم، وتیان: چۆن؟ وتی: هەر کاتێك پیری بیویستایە بێت بۆ لام من سەرم قالّ بوو، لەبەرئەوە کاتم نەبوو بێت بۆ لام و بیناسم.

واتە پیری لە ژیانی مرۆڤێکدا نیە کە مەبەستێکی هەبێت خۆی پێوە خەریك بکات، بەڵام ئەوەی کاتی خۆی بە تەمبەڵی بەسەر دەبات، یان بە ماڵ و سامان و پلەوپایەوە بەسەر بەرێت، زوو پیر دەبێت، چونکە هەردەم بیر لە شت دەکاتەوە کە ناتوانێت هیچ بکات بەرامبەر بەو شتانەی کە دوچاریان دەبێت، ئینجا وردە وردە بیرکردنەوە پیری دەکات و زۆر جار توشی نەخۆشی دەکات.

## مـاره بەجـاش

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویێت:

﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٍ ﴾ .[١]

واتە: ئەو تەڵاقەی کەپیاوەکە دەتوانێت ژنەکەی بێنێتەوە لەپاش تەڵاق دان دوو جارە بۆجاری سێیەم دەفەرموێ:

﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥۗ ﴾ .[٢]

واتە: کەسێك بۆ جاری سێیەم ژنەکەی تەڵاق بدات ناتوانێت بەهیچ جۆرێك بیگێڕێتەوە تاوەکو ئەو ژنە تەڵاق دراوە (شوو) نەکاتەوە بەپیاوێکی تر، ماوەیەك لەگەڵ ئەو مێردە تازەیە بژی رەوشت و هەڵسان و دانیشتنی مێردە تازەکەی بزانێت و، بەراوردی بکات لەگەڵ هی مێردەکەی پێشوو، ئەگەر بۆی دەرکەوت کە مێردە کۆنەکەی باشترە ئینجا ئەگەر ئەم مێردە تازەیەی (مرد) یان (تەڵاق)ی دایەوە دروستە شوو بکاتەوە بەمێردە کۆنەکەی.

بەڵام لە پێش هاتنی ئیسلام[٣] فێڵێکیان (حیلە) دۆزیبووەوە بۆ ئەوەی ژنەکە - کە جاری سێیەم تەڵاق درا - بەزوترین کات بگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی یەکەم، فێڵەکەش ئەوەیە کە ژنە سێ بەسێ تەڵاق دراوەکە هەر کاتێك عیدەی

---

(١) البقرة: ٢٢٩

(٢) البقرة: ٢٣٠

(٣) ئاینی حەزرەتی إبراهیم.

تەواو بوو مارەیان دەکرد لە کابرایەك بۆ سەعاتێك یان شەوێك بەدزییەوە، ئینجا ئەم کابرایە دەچووە لای ژنەکە، لەپاش بەیەکگەیشتن تەڵاقی دەدایەوە، لەپاش تەواو بوونی عیدەی مارەیان دەکردەوە لە مێردی پێشوو.

کە ئیسلام هات بڕیاری دا ئەو ژنە کە بۆ جاری سێیەم تەڵاق دەدرێت دەبێت بە ئارەزووی خۆی پیاوێك بدۆزێتەوە و شوی پێ بکات، هەروەك شوکردنەکەی جاری یەکەم بۆ ژن و مێردایەتییەکی دوور و درێژ نەك بۆ ئەوەی بۆ ماوەیەکی کەم بێت و لەبەر ڕۆشتنەوەی بۆ لای مێردی یەکەم بێت.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەم مێردە تازەیەی بەو جۆرە کە ئیمامەکان فەرمویانە لەبەر ئەوە ناوناوە (التیس المستعار) واتە: وەك سابرینێك بۆ خواستن هێناویانە بۆ ئەوەی بپەڕێتە سەر ئاژەڵێکی تر، فەرمویەتی:

(لعنة الله علی التیس المستعار).

هەروەك لەمەو پێش باسم کرد، من لە خوێندنی (١٢) ساڵدا شتێك کەڵکی هەبێت بۆ ئاینی ئیسلام فێری نەبووم، یەکێ لەوانە ئەم مەوزوعە بوو نەمدەزانی بۆچی دەبێت ژنە تەڵاق دراوەکە لە پاش سێ جار ناتوانێ بچێتەوە لای مێردی پێشوی تا شوویەکی تر نەکات.

لەماوەی ژیانمدا هەڵەی زۆرم کردووە، هەندێکی لەبەرئەوە بووە دوای یەکێکی تر کەوتوم وام زانیوە قەت هەڵە ناکات، بەم جۆرە دوو جار مارە بەجاشم کردووە لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافعی - خوا لێی ڕازی بێت -، یەکەمیان ساڵی ١٩٤٦ لەدێی زەڵم، دووەمیان ١٩٤٧ لەسەر سیان.

ئەوەی یەکەمجار لەدێی زەڵم، کاتێك لەناوباخاندا بووین، ژنی شوانی مەڕەکان سێ بەسێ تەڵاق درابوو، بۆ شەوێك مارەم کرد لە فەقێیەکی خۆم، بەجۆرێکی زۆر نهێنی، بۆ ئەوەی پیاوەکە ئاشکرا نەبێ، ئینجا کە خەڵکەکە زانیان بە فەقێکەیان دەوت (جاش)، ئیتر ئەویش دێیەکەی بەجێهیشت، منیش بەوە زۆر بێ تاقەت بووم، باوکم -خوا لێی خۆشبێت- وتی: خەفەت بۆ دەخۆیت؟ بۆ مەمنونی خودا نابیت، ئەگەر ژنەکە بیوتایە مامۆستا خۆی بووە بەجاشم چیت دەکرد؟

ساڵی (١٩٦٨) لە زانکۆی بەغدا کە ماجستێرم وەرگرت، لەسەر تەڵاق دوو بەرگم نووسی، هەرچی هەبوو لە ماوەی چوار هەزار ساڵدا لەبابەتی تەڵاقەوە لە هەموو ئاینەکان و یاساکان و داب و نەریتی پێشووەکانی کۆن نووسیم، بەقووڵی لێکۆڵینەوەی زۆرم کرد لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر((صلی الله علیه وسلم)) و هەشت مەزهەبەکەی ئێستا هەن (حەنەفی، مالیکی، شافیعی، حەنبەلی، جەعفەری، زەیدی، ئەبازی، زاهیری).

بۆم دەرکەوت کە تەڵاقی سێ بەسێ بەیەك جار ناکەوێت، بەڵکو پیاوەکە بۆی هەیە تا سێ جار ژنەکە تەڵاق بدات، لەپاش هێنانەوەی بۆ دوو جار بەبێ مارەکردنەوە، ئەگەر تەڵاقەکە (ریجعی)[1] بێت، لەپاش مارەکردنەوە وەکو جاری یەکەمی ژنهێنان، ئەگەر تەڵاقەکە (بائن)[2] بێ، بەپێی فەرمودەی خوا لە قورئانی پیرۆزدا کە فەرموویەتی: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ﴾ واتە ئەو تەڵاقەی کە دروستە لەپاش ئەوە پیاوەکە ژنەکە بهێنێتەوە لای خۆی تەنیا دوو جار بۆی هەیە، ئەگەر کردی بە سێ جار مانای وایە ئەو ژن و پیاوە پێکەوە ناگونجێن، هەتا ئەوەیان کە هۆی ئاژاوەو تەڵاقدانە دەرسێك وەرگرێت کە جارێکی تر ئەو رێگەیە نەگرێتەبەر، ئەمەش بەوەی کە ژنەکە شوو بە پیاوێکی تر بەجۆرێکی ئیعتیادی بکات، نەك بۆ شەوورۆژێك وەکو مارەبەجاش، بەڵکو ماوەیەك لەگەڵ ئەم مێردەیدا بژێت، ئەم ژیانەش بەراورد بکات لەگەڵ ژیانی ژن و مێردایەتیەکەی پێشووی، بۆ ئەوەی بزانێ لەم دوو مێردە کامیان باشترە، جا هەڵەی تەڵاقی پێشوو لە ژنەکەوە بوو بێت هەستی پێ دەکات و دەرسی لێ وەردەگرێت، بەجۆرێکی وەها ئەگەر ئەم مێردەی تەڵاقی دا یان مرد و عیددەی تەواو بوو و شووی کردەوە بە مێردی یەکەم، جارێکی تر دوچاری هەڵەی پێشوو نابێت و بەخۆشی لەگەڵ مێردەکەیدا ژیان بەسەر ئەبەن.

---

(١) تەڵاقی ریجعی ئەوەیە کە لەپاش جیماع بێت و لەسەر هیچ نەبێت، وە بۆ جاری سێهەمیش نەبێت.

(٢) تەڵاقی (بائن) ئەوەیە یان لەپێش جیماع بێ بەمجۆرە مارەی بکاو نەچێتە لای تەڵاقی بدا، یان لەسەر ماڵ بێت کە پێی دەوترێت (خلع) یان بۆ جاری سێهەم بێت.

ئەگەریش هەڵەکە لە پیاوەکەوە بێت، لەپاش شوکردنی ژنە تەڵاقدراوەکەی بەمێردێکی تر پەشیمان ئەبێتەوەو دەرسی لێ وەرئەگرێت، بەتایبەتی ئەگەر ژنێکی تر بێنێ و ژیانی لەگەڵیا بەراورد بکات لەگەڵ ژیانی ژنی پێشوویدا، زووتر هەست ئەکات بەوە ئەو گوناهبارە لە تەڵاقدانی ژنە پێشوەکەی، واتە ئەگەر بۆ جاری تر ژنی پێشوو هاتەوە لای، جارێکی تر رێگەی هەڵەی تەڵاقدان ناگرێت.

لەبەر ئەم حیکمەتەیە خوای گەورە ئەفەرموێت:

﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥ ﴾ .(١)

واتە: ئەگەر ژنەکەی تەڵاق دا بۆ جاری سێهەم بۆی نییە مارەی بکاتەوە تا شوو نەکات بە پیاوێکی تر بەجۆرێکی ئیعتیادی و لەگەڵی دروست ببێت، ئینجا ئەگەر تەڵاقی دا بەجۆرێکی ئیعتیادی یان مرد و عیددەی تەواو بوو، ئەتوانێ بچێتەوە لای مێردە پێشووەکەی بە مارەکردنێکی تازەو نوێ.

مارەبەجاش هەڵەیەکی گەورەیە کە موسڵمانەکان فێری بوون، ئەمەش لەوەوە بوە حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) کە خەلیفە بوو فەرمووی کاتێك کە ژنتان تەڵاق دا دەڵێن سێ بەسێ، لە قورئانی پیرۆزدا ژمارە سێ نیە بەڵکو ژمارەی جار هەیە، خوا فەرمویەتی: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ ﴾ نەك (إثنان) بەڵکو فەرمووی (مرتان) بۆ جاری سێ هەم فەرموی: ﴿ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖۗ ﴾ لێرەدا (تصريح باحسان) واتە جاری سێیەم و پاش ئەوە: ﴿ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوۡجًا غَيۡرَهُۥ ﴾ .

لەبەرئەوە حەزرەتی عومەر فەرمووی: هەرکەسێك ئەم ووشە نارەوایە بەکاربهێنێ لە تەڵاق دا بڵێ سێ بەسێ، هەرسێ تەڵاقی دەکەوێ، نایەڵم ژنەکەی بچێتەوە لای.

ئەم کردەوەیە ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب پێی دەوترێت سیاسەتی شەرعی، واتا بۆ وەلی ئەمر هەیە وەك خەلیفە یا سەرۆکی دەوڵەت شتێك کە دروست بێت نەیەڵێ بکرێ ئەگەر سودێکی گشتی لە مەنع کردنەکەدا

---

(١) البقرة: ٢٣٠

هەبێ، لەسەر ئەم بڕیارەی (عومەری کوڕی خەتاب) هەندێك لە مەزهەبەکان بڕیاریاندا کە تەڵاقی سێ بەسێ یەك جار سێ تەڵاقی پێ دەکەوێت.(١)

لە کاری مارەبەجاشدا هەڵە دەکرا لەفەتوادان، یەکەم کە بەوتنی سێ تەڵاقە بەیەك جار هەرسێ تەڵاقەیان دەخست، ئەم هەڵەیەشیان بە یەکێك لەدوو هەڵەی دیکە راست دەکردەوە، یەکەم ئەگەر تەڵاقەکە (تعلیق) بوایە، وەك بیوتایە - کە فڵان شت بکەی هەرسێ تەڵاقەت کەوتبێ - ئەنجا پێش ئەنجامدانی ئەو شتە بە پیاوەکەیان دەوت تەڵاقی بدە لەسەر شتێك کەپێی دەوترێت "خلع"، ئەویش تەڵاقی دەدا لەسەر ماڵێك یان لەسەر شتێك، بەژنەکەشیان دەوت برۆ ئەو ئیشە ئەنجام بدە کە پیاوەکە تەڵاقەکەی پێوە پەیوەست کردوە، ئیشەکەی ئەنجام دەدا لەکاتێکدا کەژنی ئەو نەبوو، پاش ئەوە لەپیاوەکە مارەیان دەکردەوە.

هەڵەی دووەمیان ئەوە بوو دەیانوت مارەکردنی یەکەم لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی بەتاڵبووە، چونکە بەپێی ئەو مەزهەبە ئەگەر شایەت عادل نەبێت مارەکردنەکە بەتاڵە، واتە مارەیان دەکرد لەو پیاوە بەمەزهەبی حەنەفی، لەبەر ئەوەی لای حەنەفی عەدالەت مەرج نیە بۆ شایەت، بەبێ ئەوەی بیر بکەنەوە لەمارەکردن و مەرجەکانی کەخوا دایناوە، نەك ئیمامی شافیعی و حەنەفی، تا لەفەتوادا یەکێکیان بخرێتە جێی ئەوی تریان.

مارەکردن و دروست بوونی مەرجەکانی لەلایەن خواوەیە، لەلایەن ئیمامەکانەوە نیە، سەرچاوەی شەریعەت هەر قورئانە، خوا فەرمویەتی: ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾.

وە سەرچاوەی روونکردنەوەی حوکمەکانی خوا فەرموودەکانی پێغەمبەرە، خوا ئەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ﴾.(٢)

فەرموودەی ئیمامەکان دۆزینەوەی حوکمی خوایە.

---

(١) تەماشای فەرموودەی ژمارە (١٤٧٢) لە (صحيح مسلم) بکە کە ئەفەرموێ: (كان الطلاق على عهد رسول الله وأبي بكر وسنتين من خلافة عمر طلاق الثلاث واحدة، فقال عمر بن الخطاب: إن الناس قد استعجلوا في أمر قد كان لهم فيه أناه، فلو أمضيناه عليهم فأمضاه عليهم).

(٢) النحل: ٤٤

## هۆیەکانی بەتاڵی مارەبەجاش

١- ئەو حیکمەتە کە مەبەستە لە شووکردنی ژنە تەڵاقدراوەکە لەپاش سێ جار بەمێردێکی تر لە مارەبەجاشدا نایەتەدی، هەروەکو باسمان کرد لەمەوپێش.

٢- مارەکردنەکە لە جاشەکە (مێردی یەك شەوە) بەبێ ڕەزامەندیی ژنەکەیە، چونکە ئەگەر ناچار نەبێت ئەو پیاوە قبوڵ ناکات بەشووی خۆی، وە مارەکردنی ژنی باڵغی عاقڵی بێوەژن بەبێ ڕەزامەندی بەتاڵە.

٣- مارەبەجاش بۆ وەختێکی دیاریکراوە کە ناوی ئەبرێت بە (زواج مؤقت)، ئەمەش وەکو موتعە وایەو بەتاڵە، بەپێچەوانەی فەرموودەکەی خوایە لە قورئانی پیرۆزدا.

٤- مارەبەجاش مارەکردنە بە مەرجی ئەوە کە پیاوەکە ژنەکە تەڵاق با لەپاش ئەوە کە ئەچێتە لای، هەر مارەکردنێکیش بە مەرج بێت بەتاڵە.

٥- مارەبەجاش عادەتێکی جاهیلیی پێش ئیسلامە، چونکە هەندێ لە عەرەبەکان کە لەسەر ئایینی حەزرەتی ئیسماعیل بوون، تەڵاق لای ئەوان بۆ سێ جار بوو، لەپاش سێ جارەکە بۆ دروست بوونی مارەکردنەوەی ژنەکە لە مێردە تەڵاق دەرەکەی مارە بەجاشیان بەکاردەهێنا، بەو پیاوە کە ژنەکەیان لێ مارە ئەکرد ئەوترا (تیس المستعار).

٦- پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) لە فەرموودەکانیدا لەعنەتی لەو پیاوە کردووە کە بۆ شەوێك ژنەکەی لێ مارە ئەکەن.

## بوومەلەرزەکەی ساڵی ١٩٤٦

ئەڵێن ئەو قورەی کە ئادەمی لێ دروست کرا نۆشەو و رۆژ خوا بارانی خەم و ماتەمینی بەسەردا باران، شەو و رۆژێکیش بارانی خۆشی و شادومانی بەسەردا باراند، بەپێی ئەم وەتەیە بێت کە قسەی من نیە و بیستومە واتە ژیانی ئادەمیزاد لەدەبەش نۆبەشی ناخۆشی و ترش و تاڵی و گیروگرفتە، تەنیا یەك بەشی خۆشی و ئاسودەییە.

سەعددینی تەفتازانی کەلەزانا گەورە و بەرزەکانی ئیسلامە لەدیباجەی کتێبەکەیدا (المطول)دەڵێت:

" والی الله اشتکی من الدهر، اذا اساء أصر علی اساءته، وان احسن ندم في ساعته"،

واتە: سکاڵام لەدەستی رۆژگار دەبەمە خزمەتی خوای گەورە، ئەگەر خراپەیەك بکات لەسەری بەردەوامە، ئەگەر چاکەیەك بکات دەستبەجێ بەشیمان دەبێتەوە.

خۆشی و کامەرانیەکەی منیش بەبۆنەی ژنهێنان و ژیانی ناو خزم و کەس وکارم دووهەفتەی بەسەردا تێپەڕ نەبوو، کۆسپەکانی ژیانم دەستی پێکرد بە بومەلەزەیەك، لە ساڵی ١٩٤٦ بوومەلەرزەیەکی گەورە لە کوردستان رویدا، لەناو سەد و پەنجا ماڵدا تەنیا کەپرە جوانەکەی زاوایەتی منی سەرەوژێر کرد.

ئەم بومەلەرزەیە زیانێکی گەورەی بەدانیشتوانی پێنجوێن گەیاند، لەبارەی ئەم بومەلەرزەیەوە موفتی پێنجوێنی شاعیر شیعرێکی جوانی هەیە و لێرەدا دەیخەمە روو:

پێنجـوین بەبێ تـۆ نـزیکە مــەرگم
لوبنان شکێن بووی داخێ بەجــەرگم

تـــازە بووکێ بوی بەســـەر چــیاوە
ئەهـــاتنە ســـەیرت لەم لاو لەولاوە
پارچە ئەرزێ بووی لەپارچەی بەهەشت
زەردو سوور وشین کەژو کێو ودەشـت
سەیرانگای پۆلی گەنجی عێراق بـــوی
لەم سەردەمەدا بۆنخۆشی تاك بـــوی
جێگەی هەزاران بێ نان و ئاو بـــووی
هەرچەند ناحیە بووی شاری تەواو بـووی

پێنجوین بە بێ تۆ نزیـــکە مــەرگم
لو بنان شکێن بوی داخی بە جـەرگم

بۆ هەوای ساف و ئـاوی ســاردی تۆ
ئەکەم هـەتـا هەم شـیوەن و ڕۆ ڕۆ
میوەی بەهەشت بـوو تـامی میوەکەت
کەوسەر بوو کانی وچـەم و شیوەکەت
ئێــران وعــێراق چـاویان لە تــۆ بوو
مــردووش لەنـاوتا بـەڕەنگ وبۆ بوو
سـەد دڵی سیسـت گەش ئـەکردەوە
سـەد خەمت لەبیر مـــن ئـەبردەوە
شاری غەزنە بووی بێجگە لە خــۆشیت
خۆشی بوو سەرپاك دەردو نەخــۆشیت

پێنجوین بە بێ تۆ نزیـــکە مــەرگم
لو بنان شکێن بوی داخی بە جـەرگم

تـــازە وەکـو کـەو خـاڵت ڕشـتبوو
شــارانی تــرت بــەداخ کوشــتبوو
لیــوا لـە چـاو تـۆ وێـرانــە دێ بوو
حە کیم بووی دەوای سەد دەردت پێ بوو

جار بە جار ئـە ڵێن غـەزەبی خـوابـوو
دۆعـای خـاسـان وشـێخ و مـەلابـوو
خۆتۆ بە تەنیـا بـە قـەد کوردسـتـان
بۆ خاسانی خـوا بـوو بوویتـە بێسـتـان
بێجگە لەوانـەش هەتـا دوو هـەزار
بە خـێوت ئـەکرد فـەقـیر و هـەژار
هـەر چـاوی چـڵکن کـاری تـێ کردی
وەك تـیـری قـودرەت لـە نـاوی بردی
ئێمـەش بەجـاریێ بـەخـۆشـی تـۆوە
هـەر بـەسـەرخـۆشی ئەچوین بەرێوە
بێ خـەم و مـەراق وەخـتـی ئـێواران
ئەچـوووینە چوار باخ پۆل پۆل بۆ سەیران
بێ عەرەق مەست بووین بێ شەراب سەر خۆش
ژن و پیاو یەکسـەر خۆش خۆر و تەڕ پۆش
وا ئـەمڕۆ قـەدری خۆشـیت ئەزانیـن
کـەوا پـەرگـەندەو بـێ خـانەو لانیـن

پێنجـوین بەبـێ تۆ نـزیکە مـەرگم
لوبنان شکێن بـووی داخـی بەجـەرگم

نـەك هـەرمن تەنیـا پـڕ داخ و دەردم
نەك هـەرمن تەنیا هـەناسـە سـەردم
هـەرکـەسـێ ڕۆژێ کە تـۆی بینـیـوە
وەك فـەنـەر قـەف قـەف پشتی چەمیوە
عـێراق بـە جـاریێ بـە شـار و دێـوە
مـاتەم بـاری تـۆن بە نێـرو مـێـوە
منیش بە قەدەر گشـت ئەنحـای عـێراق
وا لە سـەر شـانم مـاتـەم و مـەراق

پێنجـوین بەبـێ تۆ نـزیکە مـەرگم
لوبنان شکێن بـووی داخـی بەجـەرگم

لە ئەنجامی ئەو بومەلەرزەیەدا ئاوی چەمی زەڵم بۆ ماوەی (بیست) دەقیقە ووشك بوو، لە پاشان کە بەربووەوە وەك ڕوخانە سورەی بەهار ئەم بەر و ئەو بەری چەمەکە شەپۆلی دەدا، ئاوەکە هەمووی قوڕاو بوو هەروەك ئاوی بەهار، کاتیش سەرەتای مانگی (ئاب) بوو، هەرچی مەنجەڵە دۆ و مەنجەڵە کەرە لەم بەر و لەو بەری ئاوەکە دانرابوو هەمووی ئاو بردی، لە شاخەکانەوە هەندێك بەرد هاتنە خوارەوە.

لەو کاتەدا من و خێزانەکەم لەبن دار گوێزێك لە قەراغی جۆگەکەدا نوێژی مەغریبمان دەکرد، ئاوی حەوزەکەی بەردەممان هەڵدەقولا، بەردێکی گەورە لە شاخەکەوە کەوتە خوارەوە، دای لەو قاڵیەی کە دامان خستبوو، هەموو رۆژێك لە پاش نوێژ من و خێزانەکەم نانمان لەسەر دەخوارد، بەردێکی تری گەورە لە شاخەکەوە کەوتە سەر کەپرەکەمان، هەرچی شتی تیایا بوو هەمووی لەناوچوو، زۆر سوپاسی خوامان کرد کەخۆمانی پاراست، چونکە ئەو بومەلەرزەیە چەند دەقیقەیەك دواتر روویبدایە ئێمە لەسەر قاڵیەکە دەبووین و خۆمانی پارچەپارچە دەکرد وەك قاڵیەکە، ماڵی دونیا لەدەستیش بچێت دێتەوە جێگەی، بەڵام گیانی مرۆڤ کە رۆیشت گەڕانەوەی نیە، لەبەر ئەوە زۆر خەفەتمان نەخوارد بۆ ئەم رووداوە.

لە زەمانی شێخ حسام الدین لەم شوێنەدا کەپریان دەکرد بۆ ژنەکەی کە پێیان دەگوت ژوری حەرەم (کەیبانو)، خەڵکی ئەو کاتە دەیان وت لەناو صەد و پەنجا ماڵ دا لە زەڵم بۆیە ئێوە زەرەرمەند بوون، چونکە ئەوە جێگەی ژنەکەی شێخ بوو ئێوە کردبوتان بە کەپر بۆ خۆتان، خوا لەو شوێنەدا تۆڵەی لێ سەندن بەو بەردە کە کەوت بەسەر کەپرەکەتاندا، ئەمە لە جیاتی ئەوەی بڵێن ئەمە قەزا و قەدەر بوو کە من و خێزانەکەم سەلامەت بووین، ئەگەر چەند دەقیقەیەك بومەلەرزەکە دوا کەوتایە، من و خێزانەکەم ئەچوینە ژێر کەپرەکەوە بۆ نان خواردن و دەبوین بەژێر بەردەکەوە.

لەپاش سێ چوار رۆژ خێزانەکەم دووپشك دای بەدەستیەوە ئەوەشیان کرد بە ئیشی شێخ حسام الدین، چونکە لەجێگەی ژنەکەی شێخ کەپری کردوە، شێخ

بەو دووپشکەی وتوە کە بچێ بدا بەدەستییەوە. ئیتر نەیان ئەوت کە پێش زیاتر لە (١٠٠) ساڵ جێگە کەپری باپیرەگەورەم بوو.

دانیشتوانی زەڵم باوەڕیان وابوو کە ئەگەر شێخ ئارەزوو نەکات باران نابارێت، تۆوی کشتوکاڵ ناڕوێت، لایان وابوو شێخ دەتوانێت مردوو زیندو بکاتەوە. ئەم موسڵمانە کۆڵەوارانە بەمجۆرە شەریکیان بۆ خوا قەرار دەدا بەبێ ئەوەی بزانن مانای وتەکە چییە.

من کە ئەم باسانە دەگێڕمەوە لە بارەی شێخ حسام الدین، یان هەر شێخێکی کەوە، مەبەستم ئەوە نیە کە ئەو شێخانە بەکەم بزانم، یاخود شێخایەتی و تەصەوف لەلام ڕاست نیە، ڕێبازی تەصەوف دەبێت هەموو موسڵمانێك لەسەری بڕوات، چونکە بریتییە لەوەی کە مرۆڤ هەردەم لایەنی خوا زیاتر بگرێت لەلایەنی دونیا، تەصەوفی راستەقینە ئەوەیە کە مرۆڤ واز لە دونیا بێنێت بۆ ڕەزامەندی ئاخیرەتی، هەروەك وتویانە دونیا و قیامەت دوو هەوێنن لە هەرکامیان نزیك بیتەوە لە ئەوی تریان دور دەکەویتەوە، ئینجا شێخایەتی و تەصەوف ڕاستە لە ئیسلام دا، بەڵام نەك بەو جۆرەی کە هەندێ شێخ شێخایەتی و تەصەوفی دەکرد بەدەستمایە، بەبۆنەیەوە بەخۆشترین ژیان بژین، یان خۆیان وا لێ بکەن کە چەندەها پیاوی پیر دەست و قاچیان ماچ بکەن، بیروباوەڕێکی وایان هەبێ کە ئەوان بتوانن لەژیانی دنیا بیان پارێزن، لە نەخۆشی چاکیان بکەنەوە، لە ڕۆژی قیامەت دا شەفاعەتیان بۆ بکەن.

شێخەکانی هەورامان ئەوانەی پێشوو وەکو: شێخ سراج الدین، شێخ ضیاء الدین، شێخ بهاءالدین، شێخ نجم الدین، شێخایەتییەکەیان هەمووی بۆ خوا دەکرد بەپێی ئاینی ئیسلام، هەوڵیان نەئەدا بۆ دەوڵەمەندی و بۆ موڵك کرین و بۆ ڕابواردن و خۆشی دونیایی.

بۆ نمونە شێخ ضیاءالدین -خوا دەرەجاتی عالی بکات- جارێك نەصرەدین شاهەنشاهی ئێران چەند کەسێك دەنێرێت بۆ لای، پێی دەڵێت: خانەقاکەت زۆر فەقیرە، صۆفییەکانت زۆر بە هەژاری دەژین، لەبەرئەوە ڕازی ببە تاوەکو موچەیەك ببڕمەوە بۆ خانەقا.

شێخ ضیاءالدین ئەم شیعرە دەنوسێت بۆ نصرالدین شا:

مـا أبــروی فقر و قنـاعت نمیـمبریم
أی تل به شاه بگو که روزی مقرر أست

واتە: من ئابڕوی فەقیری و قەناعەت نابەم ئەی وەفد بەشا بڵێن کە ڕزقی ژیان خوا بڕیاری داوە لەسەری.

کاك عبدالله کانی مارانی بۆی گێڕامەوە وتی: لە دێکەی خۆمان قوتابی بوم لە پۆلی دووەمی ناوەندی دا، پیاوێکی ئێرانی بوو بەمیوانمان، دوو کەلە شەکری گەورەی هێنا بوو لەگەڵ (١٠) تمەن پارە دەی برد بۆ شێخ علاءالدینی زینوێ، جلەکانیشی دڕابون، منیش پێم وت: شێخ علاءالدین خاڵی منە، کە تۆ دەچی بۆ لای بۆچی پارەکەت نادەی بە چۆغە و ڕانکێکی تازە لەبەری بکەیت، دوکەلە شەکرەکەشت بدەیت بە مناڵەکانت بیخۆن بەچاییەوە؟ ئەویش وتی: بۆ ئەوە ئەچم بۆ لای شێخ کە لەکاتی سەرەمەرگ دا فریام بکەوێت شەیتان ئیمانەکەم نەبات.

ئەو شەوە لەوێ بوو بۆ بەیانی کاتێ ڕۆیشت پێی وتم: لەگەڵما وەرە تاوەکو لە ئاوایی دەردەچم نەوەك پۆلیسەکان بمگرن، چونکە من ئێرانیم، منیش وتم: ئەگەر شێخ علاءالدین نەتوانێ ڕزگارت بکات لەدەستی ئەو پۆلیسانە، چۆن دەتوانێ ڕزگارت بکات لە دەستی شەیتان؟ کابرا وەستا و بیری کردەوە وتی: بەخوا ڕاست دەکەی وتی دەچمەوە ماڵەوە، دوو کەلە شەکرەکەش دەفرۆشم بەئێوە.

شایانی باسە هەموو شتێك بە میرات لە باوکەوە دەچێت بۆ ڕۆڵەکانی تەنها دوو شت نەبێ:

**یەکـــەم:**

زانین و زانیاری، من ئێستا کە حەوت بڕوانامەم هەیە پێم دەوترێت پرۆ فیسۆر، ئەگەر مردم ناچێت بۆ مناڵەکانم، هیچ کوڕێکم ناتوانێ لەجێگای من لە زانکۆ دانیشێت ئەو دەرسانە بڵێتەوە کە من دەیڵێمەوە، ئێستا ئەمە شتێکی ئاشکرایە بۆ هەموو کەس.

**دووەم:**

شێخایەتی، شێخایەتی بریتییە لە تەصەوف کە هەمووی نزیك بونەوەیە لەخوا، خواپەرستییە، ساڵەهای ساڵ مرۆڤ تەصەوف پەیدا دەکات، بەڵام نازانم چۆن بەمیرات ئەڕوات بۆ کوڕەکانی، کوڕە شێخی وا هەیە لەماوەی هەموو ژیانیدا نوێژێکی نەکردووە یان بە ئارەق خواردنەوە رۆژی بەسەربردووە، کەچی پێش مردنی وەسیەت دەکات لەجێگەی خۆی دابنرێت، بە قودرەتی قادر لە ماوەی شەو و رۆژێك دا دەبێت بەشێخی تەریقەت و ئیرشاد.

شاعیری بەناوبانگی کورد خوالێخۆشبوو قانع لەم بارەیەوە دەفەرموێ:

که شێخ وەفاتی فەرموو گەیشتە جێی نیهـــانی
شێخ زادە ئەو سەعاتە ئەبێتە غەوســی ســانی
کەس نایە بۆ حیساب و کـیتــاب و ئیمتیحــانی
دەسکاری دەستی غەیبە نەجمەو نیشانی شـانی
وەك بێچوە سۆنە وانە لەگەڵ لەهێلکە دەرچوون
دەڕۆنە بەحری بێ پەی گەر ئاوی لێڵە یا ڕوون...

# هادی چاوشلی و

# بومەلەرزەکە

هادی چاوشلی پیاوێکی پیاوانە بوو، بەڕێوەبەری ناحیەی خورماڵ بوو، مرۆڤێکی زۆر ڕاست بوو، زۆر بایەخی دەدا بەدادگەری، بۆ نمونە کابرایەکی توقیف کرد بۆ ماوەی (٤٨) کاتژمێر، ئەو ماوەیە کاتژمێر سێی شەو تەواو بوو، بەفروبارانێکی زۆر بوو، لە ماڵی خۆیان هەستا چوو بۆ قەڵاکەی خورماڵ دەرگای ژورەکەی کردبووەوە و بەکابرای وت بوو ماوەکەت تەواو بوو، ئەویش زۆری لێ دەپاڕێتەوە دەڵێت جەنابی مدیر بەگ ئێستا بەم شەوە و بەم بەفرە بچمە کوێ با بمێنمەوە تا بەیانی سبەینێ زوو دەردەچم، ئەویش دەڵێت: شتی وا نیە من ئەو سەرپێچییە ناکەم لە پاش تەواوبوونی ماوەکەت بتهێڵمەوە لە بەندیخانە، دەبێت هەر بێیتە دەرەوە، ئینجا دێتە دەرەوە، کابرا دەهێنێتەوە بۆ ماڵی خۆیان تا ڕۆژ دەبێتەوە، بەیانی نان و چایی دەداتێ و دەڵێت خوات لەگەڵ بێت.

هەر لەو کاتەوە کوردێکی زۆر پاك و دڵسۆز بوو بۆ گەل، تا کاتێك بوو بە بەڕێوەبەری گشتی (مدیر عام) لە شالیاری ناوخۆیی (وزارة الداخلیة) لە ساڵی ١٩٧٤دا، ڕۆژێك ئاگری کوردایەتی جگەری دەگرێت دەچێت بۆ کوردستان، ئەوکاتە بارەگای سەرەکی سەرکردایەتی شۆڕش لە حاجی هۆمەران بوو، مەکتەبی سیاسی لە چۆمان بوو، دەچێ بۆ ئەوێ بۆ خزمەتکردن، دەڵێت: کاتێك ڕۆیشتم بۆ ئەوەی نەیەمەوە چووم بۆ مەکتەبی سیاسی، لەوێ پێیان وتم: مامۆستا لەچی دەگەڕێیت؟ وتی: منیش لەدڵی خۆمدا وتم دەستم بشکێت بۆ هاتنم، دوای نانی نیوەڕۆ یەکسەر گەڕامەوە بۆ بەغدا.

ئینجا بگەڕێینەوە سەرباسی بومەلەرزەکە.

ئەم (مدیر ناحیە)یە بیستبووی بوومەلەرزەیەك لە زەڵمی داوە و تەنها مەلای دێیەکە زیانی پێ گەیشتووە، ئەویش لەگەڵ کاتبەکەی بەپێ بەو هاوینە گەرمە هاتن بۆ زەڵم بۆ ئەوەی بزانێت چەند زیانم لێ کەوتووە و بینووسێت بۆ میری و بۆم ببژێرن و قەرەبووی بکەنەوە.

کاتێك گەیشتنە ئەوێ من دەرسم دەوتەوە، لە حوجرەی فەقێیەکان دانیشتن ئاو و دۆیەکی ساردیان خواردەوە، من ویستم دەست لە دەرس وتنەوەکە هەڵگرم، ئەویش وتی: پێم خۆشە گوێ بگرم دەرسەکە تەواو بکە، لەو کاتەدا دەرسی (منهاج)م دەوتەوە لە فقهی شافعیدا، بابەتی وانەکە ئەوەبوو کە مرۆڤ بەچی (فاسق) دەبێت، یەکێك لەو شتانەی لە کتێبەکەدا نوسرابوو هەرکەسێك سەری خۆی ڕوت بکات (فاسق) دەبێت.

کاتبەکەی مدیر وتی: باشە خۆ مدیر بەگیش سەری ڕوتە!

وتم: تۆش و مدیر بەگیش هەردووکتان فاسقن چونکە سەرتان ڕوتە.

مدیر هیچ تێك نەچوو، زەردەخەنەیەك گرتی، ئینجا بە دواکەوتویی من پێکەنی.

تێنەگەیشتنم لە ئایینی ئیسلام ئەو بێ ئەدەبیەی پێ کردم لەبەردەم دڵسۆزێك کە سەعاتەڕێیەك بەپێ بەو گەرمایە هاتووە بۆ ئەوەی بزانێت بومەلەرزەکە چەند زیانی لێ داوم بۆم ببژێرێت.

کاتێك کە ئەم وتە ناشیرینە و چەند شتێکی کاتی تێنەگەیشتن و دواکەوتوویی خۆم بیردێتەوە لە تەریقیدا هەموو گیانم ئەبێت بە ئاو.

ڕەحمەتی خوا لە شافیعی کە فەرمویەتی:

كلما أدبني الدهر أراني نقص عقلي
وكلما أزددت علما زادني علمي بجهلي

من کە پێیان دەوتم دوانزە عیلمە نەمدەزانی بۆچی ئەوەندە دواکەوتوو بووم، نەمدەزانی کەئیسلام تەمەشای دیمەنی ئینسان ناکات بەڵکو تەماشای دڵ و دەروونی دەکات، هەروەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

( إن الله لا ينظر إلى صوركم وإنما ينظر إلى قلوبكم ).

واتە: خوا تەماشای دیمەنتان ناکات بەڵکو تەماشای دڵ و دەرونتان دەکات.

هەروەها شێخی سەعدی دەڵێت: ( درويش صفت باش كلاه تترى دار).

واتە: با رەوشتت هی پیاوی باش بێت و کڵاوی تەتەر بکە سەرت.

مەبەستی لە دەروێش پیاوچاکە و مەبەست لە تەتەر ئەو نەتەوەیەیە بەناوبانگن بە خراپی.

بەداخەوە بەشێك لەو مەلایانەی کە خوێندنی مزگەوتیان تەواوکردوە زۆر درەنگ بە ژیری لە ئاین و جیهانیش دەگەن، ئەمەش لەبەر ئەمەیە:

**یەکـــەم:** خوێندنەکەی لەبازنەیەکی دیاریکراودایە، بە درێژایی ساڵ ئەو شتەی کە خوێندوویەتی دەیڵێتەوە بە فەقێیەکان بەبێ ئەوەی بزانێت ئەم خوێندن و ئەم دەرس وتنەوەیە بۆچی باشە و لە چیدا بەکاردێت، ئەو جۆرە خوێندنەش جگە لە فەرمودەکانی خوا و پێغەمبەر هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە هەزار ساڵ لەمەو پێش، هەر لەسەر ئەو ژیرییە کۆنە دەڕۆن.

**دووەم:** من خۆم (دە) ساڵ مەلایەتیم کردوە، جاران بەشێوەیەکی زۆر وابوو مەلا لەهەر شوێنێك لەناو چەند کەسێکدا دانیشتبایە ڕێگەی نەدەدا بەیەکێکی تر قسە بکات، دەبێ دانیشتوەکان گوێ بگرن ئینجا قسەکەی تەواو بێت یان ناتەواو دەبووایە ئەوان (بەڵێ)یان بکردایە، خۆ ئەگەر خوا نەخواستە یەکێك بیوتایە ئەم وتەیە ژیری پەسەندی ناکات گورج خۆی سور دەکردەوە و گرژ دەبوو، دەیووت تۆ کافری، بەمەش ئەوەی هەیەتی لە زانیاری دەیدات بەیەکێکی تر هیچ کات نایەوێ فێری شتێکی تازە بێ لە یەکێکی دیکەوە، بەپێچەوانەی ئێستاوە کە مامۆستای ئایینی زۆرباش و شارەزا و پسپۆڕ هەیە کە بڕوانامەی دکتۆرا و ماستەریان هەیە و ئاگاداری هەواڵی ڕۆژانە و رەوشی دونیان.

# پەیوەندیم بە عـبدالله خـانەوە

لە سەرەتای مانگی ئازاری ١٩٤٧ عبدالله خان ناردی بەشوێنمدا چووم بۆ دزلی، کاتێك لەگەڵ دوو پیاو ماقوڵ ڕۆشتم گەیشتمە بەردەمی ماڵەکەی، هاتە دەرەوە زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردم و ئەملا و ئەو لای ماچ کردم، لەپاش حەوانەوە و نان خواردنی نیوەڕۆ بردمیە ژورێك وتی: بۆیە ناردومە بە دواتا کە لە ئەمرۆ بەدواوە ببین بەبرا، هەر چیەکم هەیە بەشی ئەکەم لەگەڵت بە مەرجێك لایەنگیری خزمەکانت نەکەی، وتی: من باخەکانی زەڵمم گرتووە بە ئیجار، خزمەکانت ئەگەر ویستیان لەمنی ئیجار بکەنەوە، وەیا بۆ خۆم پیاو ئەنێرم بەرهەمەکەیان کۆ بکەنەوە، منیش وتم: حەفتەیەك مۆڵەتم بدە وەڵامەکەت دەدەمەوە.

کە گەڕامەوە بۆ زەڵم پاش دوو رۆژ بە هەموو ئامۆزاکانم وت: ئێوارە لەماڵی ئێمە نان دەخۆین هەندێ شت هەیە ئەمەوێ باسی بکەین، کاتێك نانی ئێوارەمان خوارد وتم:

مەرد ئەوەیە بە مەردایەتی بژی بە مەردایەتی بمرێ، (جوان مێر)ی باپیرمان بە حەوت کوڕەوە هاتۆتە ئەم زەڵمە هەمووی زەڵ و شەخەڵ و جێگەی بەراز و گورگ بووە، ئاوەدانی کردۆتەوە، ئەوا زیاتر لە سەد ساڵە ئێوە و باوك و باپیرتان بەکوڵ خاك ئەبەنە بەینی دوو بەرد یان تلێشە شاخێك پڕی دەکەن لە خاك و درەختێکی تیا ئەڕوێنن، ئەمە بە چ ئایینێك بوو بە موڵکی شێخ محمد و حەمیدەخان و ئەوانیش دایان بە عبدالله خان بە ئیجار؟ زۆر نارەوایە بۆ ئێوە کە پێتان دەڵێن باخەوان نانخۆری حەمیدەخانن، ئەوەی عبدالله خان بەمنی وت

بوو دەقا و دەق بۆم گێڕانەوە، وتیان: چار چییە؟

وتم: سبەینێ هەموتان لەگەڵم وەرن بچین بۆ بیارە بۆ خزمەتی شێخ علاءالدین، جۆگەی (دەیمەجۆ) لە ئەحمەدئاوا بە ئیجار بگرین بیکەین بە توتن و مەرەزە بۆ ئەوەی بەرهەمەکە بکەینە هۆی ژیانی ئەمسالْمان، هاوینیش لەناو دێکەدا بمێنینەوە نەچینە ناوباخەکان، هەندێ چەکمان هەیە خۆمانی پێ بپارێزین، با بزانین چ پیاوێ خۆی بەپیاو ئەزانێ دێتە ناو باخەکانمان.

خزمەکانم لە وەڵامدا هەندێکیان ڕاکەی منیان زۆر پێ خۆش بوو، هەندێکی تریان لە شەخصی عبدالله خان و سزادانی شێخ حسام الدین ئەترسان، هەر جۆر بوو ئەوانەی لە دژی بیروڕاکەی من وەستان کە پیرەکان بوون پێیان وابوو بەم کارە کافر دەبن، چونکە ئەوان موریدی شێخ حسام الدین بوون، بەچوونی ئێمە بۆ لای شێخ علاءالدین لە بیارە لە شێخ حسام الدین هەڵدەگەڕانەوە، ئەم دوو شێخە لەوکاتەدا ناکۆك بوون.

من بەپیرەکانم وت: ئەم ڕۆشتنە مانای ئەوە نیە ئێوە لە موریدی شێخێك وازبهێنن ببن بە موریدی شێخێکی تر.

ڕۆژی دواتر لەگەڵ (١٥) کەس لە پیر و گەنجەکان چوین بۆ بیارە، ڕێگەی بیارە بەگوڵپدا دەڕوات، کاتێك گەیشتینە گوڵپ ئەوانەی قسەکەی منیان بەدڵ نەبوو وتیان بچین بۆ لای شێخ محمد کە کوڕی گەورەی شێخ حسام الدین بوو بەڵکو چارەسەرێکی ئەم ئیشەمان بۆ بکات پێویستمان بە بیارە نەبێ، منیش ئەمزانی هیچ سوودی نیە بەڵام لەبەر دڵی ئەوان لەگەڵیان ڕۆیشتم.

شێخ محمد وتی: ئەم ئیشە لە لای من نیە بڕۆن بۆ لای حەمیدەی خوشکم لەگەڵ ئەو ڕێك بکەون. حەمیدەش لە باخە کۆن بوو، کە لەو ڕێگەیەوە نزیك بوو. کاتێك لە گوڵپ دەرچوین بەرەو بیارە، کۆنە موریدەکانی شێخ وتیان بابچین بۆ لای حەمیدەخان، منیش هەرچەند وتم سودی نیە خۆتان سوك مەکەن بەڵام بەقسەیان نەکردم، هەندێکیان ڕۆیشتن بۆ باخەکۆن، منیش چاوەڕێم کردن، کاتێك گەیشتنە لای لێیان بوو بە دەمەقڕە و پێی وتبوون: ئێوە باخەوانی باوکم بوون

چۆن بوون بە خاوەن باخ؟ ئەوەبوو هاتنەوە وتیان لەگەڵمان ڕێك نەکەوت.

ئێمەش کەوتینە ڕێ بەرەو بیارە، کاتێك گەیشتین چوین بۆ لای مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس لەگەڵمان هات بۆ لای شێخ علاءالدین، لە پاش ئەوەی هەموو شتێکم باس کرد بۆ شێخ.

شێخ فەرموی: ئەم ساڵ جۆگەکە بەبێ ئیجار دەتاندەمێ، بەڵام ساڵێکی تر بە ئیجار دەتان دەمێ، چونکە ئێوە ستەمتان لێ دەکەن من دەمەوێ یارمەتیتان بدەم.

لەو کاتەدا وتم: جەنابی شێخ ئەم ساڵ بە ئیجار وەری دەگرین، ئەگەر پیاو دەرچوین ساڵێکی تر بەخۆڕایی وەری دەگرین.

من ئەمەم وت چونکە دەترسام لە ئەنجامدا ئەم ڕێگەیەی من گرتوومە عبدالله خان لێم تێك بدات، کە هەرواش بوو، لەسەر ئەوە ڕێ کەوتین کەپێنج یەکی بەرهەمەکەمان بۆ ئەو بێ و گەڕاینەوە بۆ زەڵم، دوای دوو هەفتە جۆگەکەمان جۆماڵ کرد دەستمان کرد بە جوت کردنی بۆ توتن و مەرەزە و کشتوکاڵی تر لەوانەی کە بەراو بوو.

ڕۆژێك عبدالله خانی دزڵی سێ چوار پیاوی ناردبوو لە بەرزاییەکەوە کە پێیان دەوت (بابا زەردەڵە) لە ژووروی جۆگەکەوە جوتەکانیان دایە بەر شێلکی تفەنگ جوتە گایەکیان کوشتین. شەویش چووبوونە (ئەحمەد ئاوا) لەوێ خاڵە صاڵح کە خزممان بوو یارمەتی دەداین لەوێ دابوویانە بەر خەنجەر.

جارێکی تر عبدالله خان ناردی بەشوێنمدا، لەگەڵ دوو پیاوی زەڵمدا چووم بۆ دزڵی بە لالوتێکەوە بەخێرهاتنی کردم وتی:

(ئەگەر وەرو ئا پەڕۆ چەرمەیە نەبوو ئینا سەرەتۆ من پەنابادێ وم جەکیس مشۆ).

واتە: ئەگەر لەبەر ئەو مێزەرە سپیەی سەرت نەبێ من نیو قرانی ئێرانیم لەکیس دەچێت.

کە ئەو کاتە گوللەیەکی تفەنگ بە نیو قران بوو، مەبەستی ئەوە بوو بە گوللەیەك تەواوت دەکەم.

وتم: هیچ منەتت نەبێ، هەل لەمە باشترت بۆ ڕێك ناكەوێت بەپێی خۆم هاتومەتە دیوەخانەكەت، من ئەگەر توشی كارەساتی وا بووم بەدەست تۆوە لەلای خوا شەهیدم، چونكە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی:

(من قتل دون ماله فهو شهید).

واتە: یەكێ بەرگری شەرعی بكات لە ماف و ماڵی خۆی ئەگەر لەسەر ئەوە كوژرا ئەوە شەهیدە.

لەپاش هەفتەیەك لەبەردەركی ماڵەكەی خۆماندا لبادێكمان ڕاختسبوو، لەبەر هەتاو دەرسم دەوتەوە بە مەلا محمد ملا حمید پشدەری كە هەموو جارێ پێی دەوتم: زەڵم بەجێ بهێڵە بچۆ بۆ پشدەر، لەوێ دێیەكی باش هەیە كە پێی دەوترێت (سەرسیان). لەو كاتەدا عبدالله خان بەخۆی و بە چەند پیاوێكەوە هاتن بەلای ماڵەكەی ئێمەدا ڕۆشتن دەچوون بۆ عەبابەیلێ بۆ ماڵی شێخ كریم بۆ (تەعزێ)، كە هات بەلاماندا رابورد سەلامی نەكرد، نە خۆی و نە پیاوەكانی، منیش لەبەری هەڵنەسامەوە، گەیشتە ماڵی حاجی حمە جان كە ئەویش یەكێك بوو لە خزمە نزیكەكانم لە دایكەوە، لە پاشان پیاوەكانی دێیەكە ئەوانەی لەوێ بوون نەچووبوون بۆ ئیش، چوون بۆ لای خان لە ماڵی حاجی حمە جان.

منیش بیرم كردەوە وتم: فەقێ با ئێمەش بچین بەڵكو چونەكەمان خێری پێوە بێت.

شایەنی باسە ئەو چوونە گەورەترین خێری هەبوو، كاتێك چووینە ژوورەوە لەماڵی حاجی هەموو دانیشتبوون، عبدالله خان و خزمەكانم، عبدالله خان لەبەرم هەڵنەسایەوە، خزمەكانیشم هیچیان هەڵنەسان، لەبەرئەوە پێنج دەقیقە دانیشتم و هەڵسام هاتمە دەرەوە، ئەوەندە رقم لەخۆم و لە خزمەكانم هەڵسا، لەوێوە دابەزیمە خوارەوە سەرەنوێلكێك هەبوو ئاگام لەخۆم نەبوو بەناو سەرەنوێلگەكەدا ڕۆشتم بۆ ماڵی خاڵە صالح، جبە و كەواكەم هەمووی پیس بوون، وتم خاڵە سێ دینارم بدەرێ بە قەرز، وتی بۆ چیتە؟ وتم: دەمەوێت لە داخی ئێوە سەرم هەڵگرم، ئەویش پارەكەی پێ دام هەرچەند قسەكەمی پێ ناخۆش بوو.

گەڕامەوە ماڵەوە وتم بە (مەعصومە)ی خێزانم تۆ بڕۆ بۆ سلێمانی بۆ ماڵی خوشكت، خوالێخۆشبوو (حەیات) ژنی (حمە خالد) كە یەكێك بوو لە پیاوە دەوڵەمەندەكانی سلێمانی، تا من دوایی دێم بەدواتا.

# چوونم بۆ سەرسیان

# ( ١٩٤٧/٣ - ١٩٤٩/١١ )

سەرسیان دێیەکی دووسەد ماڵ بوو، سەر بە ناحیەی بنگرد بوو، بنگردیش سەر بە قەزای قەڵادزە بوو، سەرسیان و بنگرد لە دەشتی مەرگە بوو، سەرسیان لەسەر ئاوی زێی بچووك بوو، ئەو زێیە کە بە دوکاندا دەڕوا. ئێستا لەپاش بەنداوی دوکان زۆر لە دێهاتی ئەو ناوە بون بەژێر ئاوەوە، یەکێ لەوانە سەرسیان بوو.

دەشتی سەرسیان لە سەردەمی داگیرکاری ئینگلیز فڕۆکەخانە بووە، دانیشتوانی سەرسیان بە کشتوکاڵی گەنم و جۆ و بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات ئەژیان، هەندێکیان بە هاوین ئەچونە دەشتی بێتوێن لەو بەرەوە توتنەوانییان دەکرد.

لەگەڵ مەلا محمدی مەلا حمید چووین بۆ پشدەر، چوینە ماڵی ئیسماعیل ئاغای رەسوڵ ئاغا لە سەرسیان، شەو لە دیوەخان لە پاش نان خواردن وتی: ماموٚستا خێرە هاتووی، وتم: هاتووم ببم بە مەلای تۆ.

وتی: جا نە ئەتناسم نە ئەمناسی چۆن هەروا لە ڕێوە بەڵێن بدەم بەتۆ بۆ ئەوەی ببیت بە مەلای دێیەکەمان.

منیش وتم: ئاغا پیاوی ژیر بەیەك کاتژمێر پیاو ئەناسێت، من دوو رۆژ لێرە دەمێنمەوە لەلات، هەموو شەوێك وەك ئەم ئێوارەیە برنج و مریشکم بدەنێ و بەهەوەسی خۆت چی لەدڵتدایە پرسیارم لێ بکە، ئەو کاتە بۆت دەردەکەوێت من بە کەڵك دێم بۆ مەلایەتی یان بە کەڵك نایەم.

ئاغا وتی: بەڕاستی وتەکەت زۆر جوانە، هەر لەم قسەیەوە بۆم دەردەکەوێت کە تۆ بەکەڵکی ئێمە دێیت.

لە پاشان ڕۆژێك ماینەوە نەك دوو ڕۆژ، خوا وای کرد من چوومە دڵی ئاغاوە بەجۆرێکی وا پێی وتم: خۆم دێم لەگەڵتدا بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی ژن و ماڵەکەت بهێنیت بۆ ئێرە نەوەك پەشیمان ببیتەوە، وتم: ئاغا دڵنیابە بەزوترین کات دەگەڕێمەوە بۆ لات.

چومەوە بۆ سلێمانی ناردمان بۆ زەڵم ئەوەی هەمان بوو پێویست بوو هێنایان هاتین بۆ (سەرسیان) بووم بە مەلای ئەویَ.

# خانووەکەی مەلای پێشوو

بەهاری ساڵی ١٩٤٧ بوو، ئەو ڕۆژەی گەیشتینە سەرسیان، شەو میوانی ماڵی ئاغا بووین، ڕۆژی دوایی بردینیان بۆ خانوەکەی مەلای پێشوو کە بریتی بوو لە دوو ژوور، ژووری دەرەوەی جێگەی خەوتن و دانیشتن بوو، ژووری ناوەوەش جێگەی مانگا و گوێرەکە بوو.

چونکە لەوێ وەهابوو ئەو جۆرە خانوانە کە مەڕ و ماڵاتەکە لە ژوورەکانی ژوورەوە دەبوون و خۆشیان لە ژووری دەرەوە دەبوون، لەبەر دز و جەردە.

کاتێك کە دەرگای ژووری مانگا و ئاژەڵەکانمان کردەوە دیمان نیو مەتر پاشەڕۆی ئاژەڵی تیادایە ووشك بووەتەوە، ئەو ژوورەش سواغ درابوو بە سەنێر بۆ ئەوەی ئاژەڵەکان بە زستاندا سەرمایان نەبێت، لەبەر ئەوە ئەو شەوە خەومان لێ نەکەوت، کاتێ بەراوردم دەکرد لەگەڵ ئاو وهەوا و باخ و باخات و ئاوی زەڵم ئەموت خوا ئەوە بگرێت لەجێگەی خۆم هەڵیکەندم.

ئەم ماڵە نموونەی ماڵی ئەم ناوچەیە بوو، هەمووی پیس و پۆخڵ بوو، هەروەها دێیەکە لە ئاوی زێی بچوکیان دەخواردەوە کە شەش مانگ لە ساڵەکەدا هەمووی قوڕاو بوو، کە من و خێزانم چووینە خانووەکەوە هەموو شەوێك دوای نوستنی خەڵکی دێکە دەستمان دەکرد بە هەڵکەنینی ئەو پیسیەی لە ژورەکاندا هەیە و فرێدانی لە شوێنێکی دوور، دیوارەکانیشمان پاك کردەوە.

لە پاش ئەوە، لە نزیك ماڵی ئاغاوە گڵەجانێك هەبوو خاکەکەی سپی بوو، وەکو گەچ وابوو، لەماڵی دەروێش عەبدوڵای دراوسێمان پاچ و بێڵ و گوێنیمان

هێنا و، بەکۆڵ لەو گڵە سپیەمان هێنا و ئاویشمان لە زێیەکە هێناو قوڕمان گرتەوەو دیوارەکانمان پێ سواغ دا بەبێ ئەوەی کەس هەستمان پێ بکات.

حەمامەکەیش بریتی بوو لە بەردێکی پان لە سوچێکی ژورەکە دانرابوو، کونێك لە دیوارەکە هەبوو ئاوەکە پێیدا ئەچووە دەرەوە.

ئاودەستی هەموو دانیشتوانی دێیەکە لە قەراخی زێیەکە بوو، جێگای ژنان لە شوێنێك و پیاوان لە شوێنێکی تر، هەریەکە بە هەندێ کەڵەکەبەرد دەورەدرابوو.
لە دوایدا دەنگوباسی سواغدانی ژورەکان بە ئاواییەکەدا بڵاوبۆوەو خەڵکی گوندەکە دەهاتن بۆ سەیری ژورەکان و سەریان سوڕ دەما لە پاك و خاوێنی ژوورەکە.

بەم جۆرە پاك و پوختی شوێنی دانیشتن و نوستن و حەسانەوەی خۆمان بە سوکی و ئاسانی جێبەجێ کرد، کە ئەمەش نە ژیری ئەوێ و نە فەلسەفەی ئەوێ، تەنیا تۆزێ زەوقی ئەوێ، بەڵام زۆرکەس کە لەسەر شتێك ڕاهات ئیتر بیر لە چاکتر ناکاتەوە.

## کورتەیەك لە ژیانی

## ئیسماعیل ئاغا (١)



ناوی ئیسماعیل کوڕی ڕەسول کوڕی حەسەن ئاغایە، لە ١٩٠٠/٧/١ لەدایکبووە.

ئیسماعیل ئاغا لەمنداڵیەوە کەسێکی دیندار بووە و تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کردووە هەردەم بەدڵسۆزییەوە خزمەتی مزگەوت و مامۆستایانی ئاینی و حوجرەو مەدرەسەی کردووە و، سمایل ئاغا خۆی بانگی دەدا و، هەموو هەوڵی

---

(١) لە بنەماڵەی ئیسماعیل ئاغا وەرگیراوە.

خۆی خستۆتە گەڕ مەلای بەناوبانگ پەیدا بکات بۆ مزگەوتی گوندی سەرسیان، لەو مامۆستایانەشی لەمزگەوتی سەرسیان خزمەتیان کردووە: مەلا سلێمان و مەلا سەعدی و مەلا عوسمانی کۆڵە(یەك دەست) کەئەم بەڕێزانە ئێستا لەژیاندا نەماون، یەکێکی دیکە لەو مەلایانەی لەمزگەوتی سەرسیان فەقێیان هەبووە دکتۆر مستەفا زەڵمی بووە.

ئیسماعیل ئاغا پیاوێکی باڵا بەرزی گۆچان بەدەست بوو، هەردەم بەگۆچانەکەی هەڕەشەی لەو کەسانە دەکرد کە نەدەچوون بۆ نوێژی جومعە، خۆشەویستی خەڵکی نەك تەنها گوندەکە بەڵکو خۆشەویستی خەڵکی ناوچەکە بوو.

هەرچەندە ئیسماعیل ئاغا خۆی نەخوێندەوار بوو، بەڵام زۆری حەز دەکرد خەڵکی بخوێنێت و هاندەر و پشتیوانێکی گەورەی خوێندنی مزگەوت بوو، مامۆستای باشی بۆ ئامادە دەکردن، بەهۆی مامۆستا مستەفا زەڵمییەوە حەسەنی کوڕی نارده خوێندنی قوتابخانە لەسەنگەسەر و توانی خوێندن تەواو بکات و دواتریش لە بەغدا لیسانس لە قانوندا بەدەست بهێنێت.

## بنەماڵەی ئیسماعیل ئاغا

لەماوەی ژیانمدا بنەماڵەی وەها چاك و خانەدان بەپێی دەسەڵاتی خۆیان و داوێن پاك و ڕەوشت جوانم نەبینیوە لەناو ئاغا و بەگەکاندا، لەماوەی ئەو دوو ساڵەدا کەلەسەرسیان مەلای ئیسماعیل ئاغابووم، بۆم دەرکەوت کەوێنەی زۆر کەمە لەمەردی و پیاوەتی و داوێنپاکی و خانەدانی و موسڵمانێتی.

سەرسیان لەسەر ڕێگەی سلێمانی قەڵادزێ بوو، بەشەو و ڕۆژ دیوەخانەکەی جمەی دەهات لەمیوان، سەماوەرەکەی بەشەو و ڕۆژ گیزەی ئەهات تاوێك وچانی نەبوو، سێ ژەمە باشترین خواردنی ئامادە دەکرد بۆ میوانەکانی، لەگەڵ ئەوەشدا دەستکورت بوو بەبەراورد بەئاغاکانی دیکە، زۆرکات قەرزار بوو، سێ دێیان هەبوولەبەردەکۆزە حاجی ئاغای برا بچوکی تیا دادەنیشت، کاکەمینی ئامۆزایان لەخرەگرێسە دادەنیشت، یەك لەیەك پیاوتر بوون بۆ مەردی و سەخاوەتی و پیاوەتی و رەوشتیان لەگەڵ خەڵکی گوند، هیچ خۆیان وا پیشان نەئەدا کە ئاغان، زوڵم و جەوریان نەبوو، بەڵکو بەردەوام چاکەو پیاوەتییان لەگەڵ دەکردن.

ئیسماعیل ئاغا دوو ژنی هەبوون، یەکێکیان کچی بابەکر ئاغای گەورە بوو (بابەکر ئاغای سەلیم ئاغا) کە ئاغای هەموو ئاغاکانی میراودەلی (پشدەر) بوو. حاجی ئاغای برای سێ ژنی هەبوو، ژنە ئاغاکان خۆیان لە ژنە مسکێنەکانی ئاوایی جیانەئەکردەوەو فیزیان بەسەردا نەئەکردن. ئاغاکان خۆیان و کوڕەکانیان داوێن پاك بوون و ناموسی ژنانی ئاواییان ئەپاراست.

ئیسماعیل ئاغا دوو کوڕی هەبوو، حەسەن ئاغا و پیرۆت ئاغا، کاتی خوێندنی مەکتەبیان بەسەر چوبوو، دێیەکە مەکتەبی تیانەبوو، هەردووکیان

خۆم دەرسم پێ ئەوتن، وەکو خوێندنی مەکتەب نەك وەك مزگەوت، حساب و جوگرافیا و هەندێ شتی ترم پێ ئەوتن. دوایی حەسەن ئاغا کۆلیژی مافی لە بەغدا تەواوکرد.

## حوجرەی فەقێ

پاش ئەوەی چوومە سەرسیان سمایل ئاغا دوو ژووری ئامادەکرد بۆ جێگای تەدریس و مەدرەسەیەکیان بۆ پێکهێنام، چونکە هەرکەسێك لە وڵاتی خۆی بچێتە شوێنێکی تر بەنرختر دێتە بەر چاو، هەندێ فەقێی باش هاتنە لام، ئەوانیش مەلا سەید سلێمان و مەلا عبدالرحمانی بانەیی و مەلا سەید ئەحمەدی نۆڵچکەیی کەبەمەلا پەپولە ناسرابوو، ئەوانیش هەریەکە و سوختەیەکی هەبوو، سوختەکانیش بریتی بوو لەمەلا سەید مەحمود کەئێستا لەبۆسکێن دادەنیشێت و لەوەتەی هاتومەتە هەولێر دووجار دەعوەتی خێزانی بۆ کردووم پیاوێکی زۆر بەوەفایە، یەکێکی تر لەسوختەکان فەقێ محەمەدی هانە قوڵی بوو کەلەزەڵمەوە لەگەڵمان هاتبوو بۆ سەرسیان، بەداخەوە لەم کاتەدا ناوی سێیەمم بیر نەماوە.

منیش دەستم کرد بە تەدریس، یەکسەر ئەو کتێبە گرانانەم دەوتەوە وەك کلنبوی (بورهان) لە علمی منطق، (جمع الجوامع) لە عیلمی (أصول الفقه)، (مطول) لە عیلمی بلاغە.

بەڵام لەبەرئەوەی کە یەکەمجار بوو ئەم کتێبە گرانانەم بەدەرس دەوتەوە، ئێوارە دوای مەغریب نەمدەوێرا نان بخۆم لەبەرئەوەی خەو نەمباتەوە، هەروەها قۆرییەکەم لە قەراغی ئاگرەکە دادەنا لەجیاتی چا قاوەم تێ دەکرد، هەر جارێك هەستم بەخەو بکردایە پیاڵەیەك لەو قاوەیەم دەخواردەوە، ئینجا خەوەکەم دەڕۆشت،

زۆر جار نزیکی (١٢)ی شەو نانی شێوانم دەخوارد کە سارد بوو، لەسەری دەنوستم، لە پاش ماوەیەك تووشی نەخۆشی گەدە بووم. بەڵام لەبەرئەوەی زۆر ئارەزووم لە تەدریس بوو گوێم بەهیچ نەدا، بەڵام لەپاش وتنەوەی ئەم مادانە بەچەند جارێك لام ئاسان بوو، لەمەوە دەرئەکەوێت کەمرۆڤ ناچێتە ناو قوڵایی ئەو بابەتەوە کەئەیخوێنێ، بەڵام کاتێ بەدەرس دەیڵێتەوە بەقوڵی ئەچێتە ناوجەرگەی بابەتەکەوە و زۆر بەباشتر لێی تێدەگات.

دەرس وتنەوەی مزگەوتەکان لەو کاتەدا زۆر ورد و قوڵ بوو، مێشکی مرۆڤی فێری لێکۆڵینەوە و وردی دەکرد، بەڵام بەداخەوە زۆر مەلای زیرەك بە ساڵان دەرسیان دەوتەوە، لە دواییدا کۆچی دواییان دەکرد بێ ئەوەی شتێك بەجێ بهێڵن بۆ میللەتەکەیان، یان هیچ جۆرە پێشکەوتنێك لە ژیانی دا نەبوو، بەڵکو کۆمەڵێك ماددەی قورسی بەدرەس دەوتەوە و هیچی نەئەبەست بەژیانی کۆمەڵایەتیەوە و هیچ پاڵپشتێکی ماددی و مەعنەویان نەبوو جگە لەدڵسۆزی خۆیان.

## بابەکری سەلیم ئاغا

بابەکری سەلیم ئاغا سەرۆکی هۆزی میراودەلیەکان(هۆزی پشدەر) بوو، پیاوێکی زۆر ژیر و سیاسی بوو، بەڵام خوێندەوار نەبوو، پەیوەندیەکی زۆر بەهێزی لەگەڵ ئینگلیز هەبوو، لە رۆژێکەوە کە ئینگلیز لە عێراقدا بوو هەمیشە نوێنەری ئینگلیز بوو لە پشدەر، هەموو مانگێك دەچوو بۆ کەرکوك سەری لە بەڕێوەبەری نەوتەکە و نوێنەرەکانی ئینگلیز دەدا.

لەپاش مانگێك لەچوونم بۆ سەرسیان، ئێوارەیەك دوای نوێژی مەغریب پێیان وتم: (بابەکر ئاغای سەلیم ئاغا) کە خەزوری ئیسماعیل ئاغایە لە کەرکوك گەڕاوەتەوە لای داوەتە لای ماڵی ئیسماعیل ئاغا پێی خۆشە تۆ ببینێت، منیش چووم بۆ لای بۆ دیوەخان، تەوقەم لەگەڵ کرد، ویستی هەڵستێتەوە لەبەرم، بەڵام لەبەر پیری نەیتوانی بەتەواوی هەڵستێتەوە وتی: (مامۆستا کە کەر پیر بوو جۆی پێ ناخورێ).

لە پاشان پێی وتم: ئەگەر عاجز نابیت تۆزێك پرسیارت لێ ئەکەم.

منیش وتم: زۆرم پێ خۆشە.

وتی: خوا باسی کردوە لە قورئاندا کە ئاسمان حەوت تەبەقەیە، ئایا ئەم قاتانە وەك چی وان؟ ئایا وەك ساج وان یەك لەسەر یەك دانراون؟

وتم: ئاغا ئەو حەوت تەبەقە بۆشایی ئاسمانە، هەر تەبەقێکی فەزاکەی جیاوازە لەگەڵ ئەوەی تردا، کە ئەمە زانستی تازە ئیسپاتی کردووە، ئەستێرەکانی ئاسمان خوا دابەشی کردوون بەسەر ئەو حەوت تەبەقەدا کە لەبۆشایی ئاسماندا

دەجولێنەوە و دەسوڕێنەوە، یان بەدەوری خۆیاندا وەیان بەدەوری ئەستێرەیەکی گەورەتر دا، هەروەك زەمین دەسوڕێتەوە بەدەوری رۆژدا، مانگیش دەسوڕێتەوە بەدەروی زەمیندا، هەروەك خوا فەرمویەتی:

﴿كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٣٣﴾﴾ (١)

واتە: هەریەکێ لە ئەستێرەکانی ئاسمان لەنێو تەبەقەیەك هەوا دایە مەلە دەکەن.

بابەکر ئاغا قسەکەی زۆر پێ خۆش بوو، وتی: ئەمە یەکەم مەلایە دیومە کە بە ژیری و زانستی تازە وەڵام بداتەوە.

ئینجا هەندێ سەر گوزشتەی خۆی بۆ گێڕامەوە لە بابەت ژیری و تێگەیشتن.

وتی: لە ساڵی ١٩٢٤ نوێنەری ئینگلیزەکان لە رانیە دادەنیشت، ناکۆکی هەبوو لەگەڵ عبدالرحمن ئاغای کۆییدا کە ئەویش هەر لە رانیە دادەنیشت، وتی: رۆژێك بیانوویەکی پێ گرت و کوشتی، لە پاش ئەوە ئینگلیزەکە رۆشتەوە بۆ لەندەن، یەکێکی تر هاتە جێگەکەی، وتی: ئەوانەی کە دەهاتنە کوردستان لە ئێمە کوردییان باشتر دەزانی. وتی: ئەو نوێنەرە بەنوێنەرە تازەکەی وتبوو کە تۆ دەچیتە ئەوێ با پەیوەندیت لەگەڵ بابکر سلیم ئاغا دا بەهێز بێت، ئێمە ئاگادار کراین بۆ ئەو رۆژە کە ئەو نوێنەرە تازەیە دێت بۆ پشدەر من و هەندێك لە ئاغاکانی تر چووین بۆ پێشوازی، کاتێ لە فڕۆکەکە دابەزی، ئەویش کوردی باش دەزانی، پێش ئەوەی بگەین بەیەك وتی: بابکر ئاغا زەمانی زوو پیاوێکی جوان و ژنێکی جوان هەبوون، ئەوانە کێن و ئێستا گۆڕەکەیان لە کوێدایە؟ هەتا پرسیارەکەی تەواوکرد گەیشتین بەیەك دەستمان خستە ناو دەستی یەکتر دەستمان بەرنەدا تا وەڵامەکەم دایەوە، وتم: ئەو پیاوە جوانە باوکە ئادەم و ژنە جوانەکە دایکە (حەوا) بوو، ئێستا گۆڕەکەیان لە دوورگەی عەرەبیە لە مەککە، دەزانم مەبەستت لەم پرسیارە چیە، وتی: چیە؟ وتم: کە نەڵێم من کوردم و تۆ ئینگلیزی، نەشڵێم من موسڵمانم و تۆ مەسیحیت، بەڵکو هەردووکمان براین

---

(١) سورة أنبياء: ٣٣.

چونکە لە ئەولادی ئەو دایك و باوکەین، دیارە ئەمەش قورئانی پیرۆز باسی کردووە بەم جۆرە فەرموویەتی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ﴾.(١)

وتی: ئینگلیزەکە پێی وتم: بابەکر ئاغا لە کورد و کوردستاندا لە تۆ ژیر تر و زیرەکتر هەیە؟ ئەڵێ منیش پێم وت: تەماشای ئەو دەوەنانە بکە (ئەو درەختانە) لەنێو ئەو شاخانەدا، هەر بنە دەوەنێك کوردێکی تیادایە لە من ژیرتر و لەمن زیرەکترە، بەڵام لەبەرئەوەی بێ کەسین و سەرمان لێ شێواوە بەرپێی خۆمان نابینین.

شایانی باسە بابەکر ئاغا چاوێکی کوێر بوو، بە گۆشەیەکی جامەدانیەکەی سەری ئەو چاوەی دادەپۆشی، لەبەرئەوە هەر لە دوورەوە بە دەم و چاویدا دەتناسیەوە، بەو شێوەیە کابرای ئینگلیز توانیبووی بیناسێتەوە.

یەکێکی تر لەو قسانەی بۆی گێڕامەوە وتی: یەکەم مانگی بەهار بوو، ئەو ساڵە بەفرێکی زۆر باریبو، رۆژێك هەتاو بوو هەندێك ئاغای میراودەڵی میوانم بوون، وتم: با بچینە سەربان بۆ بەر هەتاوەکە تۆزێك تەماشای ئەو دەشت و دەرە بکەین، شتێکی سەیر سەرنجی راکێشاین، تەماشامان کرد هێڵێك هەیە لە دەشتی پشدەردا لە ژوری هێڵەکەوە درەخت (دەوەن) ڕواوە، بەفرەکە لە نێوان دەوەنەکاندا هێشتا نەتواوەتەوە، بەڵام لەخوارەوەی هێڵەکەوە بەدرێژایی چاو یەك درەخت نەڕواوە، وتم ئەوە لەبەر چییە؟ وتیان: بابەکر ئاغا بۆچی لە ئیشی خوادا قسە دەکەیت، وتم: هەموو ئیشێك ئیشی خودایە، بەڵام خواش بۆیە ئەقڵی داوە بە ئێمە بۆ ئەوەی بزانین هۆی ئەو شتانە چیە.

لە دواییدا بابەکر ئاغا وتی بیرم کردەوە و پێم وتن: ئەمە هۆکەی ئەوەیە کاتی خۆی ئەم دەشتی پشدەرە و جێگای هەموو دێهاتەکانمان دەریا بووە، ئەم دەریایە

---

(١) سورة الحجرات: ١٣.

لەم ئاوی زێ پێکهاتووە کە لە کاتی خۆی دا ئەم دەربەندەی پشدەرە نەپچڕاوە و ئەو زنجیرە شاخانە بەری ئاوەکەیان گرتووە، ئاوەکە پەنگی خواردۆتەوە و بووە بە دەریاچەیەك، دواتر ئەم دەریاچەیە زنجیرە شاخەکەی بڕیوە و ئەو دەربەندەی دروست کردوە، ئینجا باپیرە گەورەمان هاتووە بۆ ئێرە. دووبارە گاڵتەیان پێ کردم لەسەر ئەو وتەیە و وتیان ئەمە ئیشی خوایە.

وتی: دوومانگی بەسەردا نەچوو دوو ئینگلیز بوون بە میوانمان، ئەمانەش کە ئەم باسەم بۆ کردبوون ئەوانیش میوانمان بوون، یەکێ لە ئینگلیزەکان کە لە مێژوودا زۆر شارەزا بوو، وتی: باو و باپیری ئێوە لە ئەسڵدا لە کوێوە هاتونەتە ئێرە؟ وتم: باو و باپیری ئێمە هەر لێرە بوون، وتی: نەخێر وانیە، چونکە ئەم ناوچەیەی ئێوە لە ئەسڵدا دەریاچە بووە، تەماشای ئەو هێڵە بکە کە لەسەرەوە درەخت ڕواوە و لە خوارەوە نەڕواوە، ئەوەش لەبەرئەوەیە کە دەریاچەکە لەکاتی خۆیدا گەیشتووەتە ئەو هێڵە بەدرێژایی ساڵ هێز و توانای لەو زەوییە بڕیوە، لەبەرئەوەی ئەو شوێنانەی کە ئاوی دەریاچەکەی پێ گەیشتووە درەختی تیادا نەڕواوە، بەڵام لەوە بەرەو ژوورتر ڕواون.

ئینجا بە ئینگلیزەکانم وت: ئەم وتانەی ئێوە من پێش دوو مانگ بەم پیاوانەم وت باوەڕیان پێ نەکردم، بەڵام زۆر شت مەرج نیە خوێندەوار بیزانێ، بەڵکو بەژیری ئەتوانرێت بزانرێت.

شایەنی باسە ئاغاکانی میراودەلی (ئاغاکانی پشدەر) جیاوازییەکی زۆر زۆریان هەبوو لەگەڵ ئاغاکانی تری کوردستان، چونکە خۆیان ئامادەییەکی باشیان هەبوو بۆ شت وەرگرتن، دووەم ئەم ئاغایانە شتێکیان هەبوو، کاتێك میوانێکیان دەهات ئەو میوانە ئیشی چی بووایە ئەوا پرسیاریان لێ دەکرد، لەبەرئەوە لەگەڵ هەر ئاغایەکدا دانیشتبای لە هەموو بابەتێك شتێکی دەزانی.

یەکێکی دیکە لەڕەوشتە جوانەکانی ئاغاکانی پشدەر ئەوەبوو کەزۆربەیان داوێن پاك بوون، ژن و کچی دێهاتەکانیان بەدایك و کچ و خوشکی خۆیان ئەزانی.

ڕەوشتێکی تری جوانیان ئەوە بووو ئەگەر لەناوخۆیاندا ناکۆك بوونایە و یەکێك دەستدرێژی بکردایەتە سەر یەکێکیان، ناکۆکیەکانیان فەرامۆش دەکرد و هەموویان بەدڵ و گیان یەکیان ئەگرت و یارمەتی یەکتریان ئەدا تادەستدرێژیەکەیان نەدەهێشت.

**عەشیرەتی پشدەر دوو بەشە:**

**١- هۆزی نورالدین:** کە بەناوی گوندێکەوەیە، لە بناری پشدەر دادەنیشن، ئەمانە هەر لە کۆنەوە لەوێ بوون.

**٢- هۆزی میراودەلی:** ئەمانە لە ناوچەی جزیرە و بۆتانەوە هاتوون بەشێکیان ڕوویان کردۆتە ناوچەی هەولێر کە پێیان دەوترێت عەشیرەتی (گەردی)، هەندێکیان ڕووەو دوکان رۆشتون پێیان ئەوترێت عەشیرەتی (فیض الله)، هەندێکیان لەناوچەی پشدەر جێگیر بوون پێیان دەوترێت (میراودەلی)، بەناوی باپیرە گەورەیانەوە کە پێی دەوترێت (ئاودەل)، دوای ئەم (محمود ئاغا) دوای ئەم (محمد ئاغا)ی گەورە کە باپیری میراودەلیەکانە لە (٢٠-٢٥) ژنی هێناوە، نەوەکانی بوون بە (٧) بەشەوە ئەم جیاوازییە بەهۆی دایکەکانیانەوە بووە:

١- تایەفەی بابکر ئاغا کە کوڕە گەورەی محمد ئاغا بوو.

٢- تایەفەی محمود ئاغا.

٣- تایەفەی رسول ئاغا.

٤- تایەفەی أحمد ئاغا.

٥- تایەفەی جگزادە کە ئەمە بەناوی دایکیانەوەیە.

٦- تایەفەی علی ئاغا.

٦- تایەفەی عباس ئاغا.(١)

ئەم هۆزانە هەردەم ئازا و پیاوی مەرد بوون، ناوچەکانی خۆیان پاراستووە لە دەست درێژی و داگیرکردنی دوژمن و شەڕیان کردووە لەگەڵ تورکیای

---

(١) سەرچاوە: عبدالله پشدەر، یاداشتی ژیانی، لا ١٠-١٢.

عوسمانلی بۆ ماوەی (١٠) ساڵ (١٨٧٥-١٨٨٥ز) لە ساڵی (١٩١٩ز) کاتی شەڕی جیهانی یەکەم بەرهەڵستی روسەکانیان کردووەو نەیانهێشتووە بێتە ناوچەکەیانەوە.

کاتێك عێراق کەوتە ژێر ئینتدابی ئینگلیزەوە، بابکر ئاغای سلیم ئاغا بوو بەحوکمڕانی گشتی ناوچەی پشدەر و مەرگە و ڕانیە، زۆر پەیوەندییەکی بەهێزی بوو لەگەڵ ئینگلیزەکان -وەك باسمان کرد- مانگانەی خۆی (٢٤ لیرەی ئاڵتون بوو)، مانگانەی (٧٠٠) سوار لە خزمەکانی هەریەکێ (٨٠٠ روپیە) بوو.

هەرچەندە پەیوەندی ئاغاکانی کوردستان هەمیشە لە بەرژەوەندی میللەت نەبووە، بەڵام ئاغای مەردی تیا هەڵکەوتووە، وەك: (سمایل ئاغای شکاك) کە پێی ئەوترا (سمکۆ) زۆر کۆششی کردوە بۆ کورد و کوردستان لە ساڵی (١٩١٦-١٩٣٠) لە دژی رژێمی ستەمکاری ئێران وەستاوە، هەتا بەدەستی ئەم رژێمە شەهید کرا لە ڕێگەی نەتەوەکەیدا.

(سمکۆ) زۆر رەزامەند بوو لە ئاغاکانی پشدەر جگە لە (بابکر ئاغا)ی ناوبراو، هەروەها گلەیی بەرامبەر بە خوالێخۆشبوو (شێخ محمودی حفید) هەبوو.[1]

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، کاك عبداللە پشدەری، ل٣٢٧.

## سمكۆی شكاك[١]



ئیسماعیل ئاغای شكاك ناسراو بە(سمكۆی شكاك) ناوی ئیسماعیلەو كوڕی محەمەد پاشای كوڕی عەلی خانی كوڕی ئیسماعیل ئاغای شكاكە، بنەماڵەكەیان لەمێژەوە گەورەو دەسەڵاتداری خێڵی شكاك بوون. سمكۆ لەساڵی ١٨٨٧ لەدایكبووەو پاش مردنی باوكیو جەعفەر ئاغای برای، سەركردایەتی شكاكی گرتووەتە دەستو لەدوای جەنگی یەكەمی جیهانیشەوە هاتووەتە كۆڕی

---

(١) تێبینی: وەك پێزانینێك بۆ خەباتی سمكۆی شكاك، لێرەدا ژیاننامەكەی خراوەتە ڕوو.

خەباتو کوردایەتییەوە.

سمکۆ شۆڕشگێڕێکی کوردەو ڕێبەرایەتی هۆزی شکاکی کردووە، کە بۆ ماوەیەك دەسەڵاتی ناوچەی خۆرئاوای گۆلی ورمێی لەحکومەتی ناوەندیی ئێران سەندەوە.

هەرچەندە لەساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا سمکۆ لەهیچ چالاکییەکی سیاسی بەشدارینەکردبوو، بەڵام هێزەکانی ڕوسیا دەستگیریانکردو دووریانخستەوە بۆ شاری (تەفلیس)و دواتر ئازادیانکرد بەو مەرجەی دابنیشێو هیچ هەڵوێستێك دژی ڕوسەکان نەنوێنێت.

کە جەنگی جیهانی یەکەم کۆتاییهات، سمکۆ وەك سەرکردەیەکی سیاسی ناوی دەرکردو لەپێناو دامەزراندنی ئیدارەیەکی کوردیدا لەساڵی ١٩١٩ شۆڕشی بەرپاکردو زۆر ناوچەی گرنگی خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە.

لەساڵی ١٩٢١ لەئەنجامی لەشکرکێشییەکی گەورەی هێزەکانی حکومەتی ئێراندا، سمکۆی شکاك ناچاربوو پاشەکشێ بکاتو پەنابەرێتە بەر تورکیا. لەساڵی ١٩٢٤یشدا بەبڕیارێکی لێبوردن گەڕایەوە ئێرانو ساڵی ١٩٢٦یش جارێکی تر شۆڕشی بەرپاکردەوە، بەڵام ئەمجارەشیان شۆڕشەکەی تێکشکاو ماوەیەك لەتورکیادا بەدەستبەسەری مایەوە.

پاش ئازادکردنیشی گەڕایەوە بۆ ئێرانو ساڵی ١٩٣٠ بەپیلانێکی کاربەدەستانی ئێران لەشاری (شنۆ) کوژرا، بەمەش شۆڕشەکەی شکاك کۆتاییهات کە یانزە ساڵ درێژەی کێشا.

## مەلا و گاوان ( شکارتە )

ئیسماعیل ئاغا پێی وتم: هەموو ساڵێك بۆ مەلای گوند گەلە جوتمان کردووە، هەندێ گەنممان بۆ وەشاندوە، ئەگەر تۆش ئارەزوو دەکەیت با ئەمساڵ گەلە جوتێکت بۆ بکەین، وتم: ئاغا دیارە بەرهەمی گەلە جوتەکە گەلێ حەڵاڵترە بۆ من لە سەرفیترە و زەکات، چونکە ئەم دوانە بۆ هەژار و لێقەوماو دانراون، بۆ مەلایەك کە پێشەوای موسڵمانان بێت گەلێك نارەوایە.

شایەنی باسە گەلە جوت چۆن دەکرا بۆ مەلا، هەروا دەکرا بۆ گاوانی دێیەکە. وا رێکەوت لەیەك رۆژدا جوتەکانی ئاوایی کران بەدوو بەشەوە، بەشێك بۆ مەلا و بەشێك بۆ گاوان، هەروەها وا رێکەوت ئەو دوو زەوییەی کە دیاری کرا بۆ مەلا و گاوان لە تەنیشت یەکتردا بوون، هیچ زەوییەك لە نێوانیاندا نەبوو، ئەو رۆژەی کە گەلەجوت کرا بۆ من و گاوان رەشەباییەکی زۆر توند هەڵی کرد لەبەر تۆز و خۆڵ چاو چاوی نە ئەبینی، من خۆم لەوێ بووم کە گەلە جوتەکە کرا، بەڵام لەبەر رەشەباکە دواتر نەمزانی کام پارچە زەوییە هی منە و کامیان هی گاوانە.

لە زەوییەکانی ئەو ناوچەیەدا مشکێکی زۆر بێ شومار هەبوو، کشتوکاڵ کە سەوز دەبوو بەرزی ئەبوو بەنیو مەتر، هەموو رۆژێك ئەبوو مشکی ناو دەغڵەکە بکوژیت.

لەبەرئەوەی کە سێ شەممە و هەینی پشوو بوو لە نێو فەقێیەکاندا دەرس نەبوو، من هەموو فەقێکانم دەبرد بۆ مشك کوشتن. بەڵام یەکەمجار کە رۆیشتین لێم تێکچوو دەچووم لە زەوی گاوان مشکم دەکوشت، گاوانیش ئەمە

دەزانێت بەڵام دەنگ ناکات، هەموو جارێك کە ئەچوومە سەر زەوییەکە لەبەر خۆمەوە توانجم ئەدا لە گاوان، ئەمە تا دوو مانگ بەردەوام بوو، ئەو زەوییەی تر هەمووی مشك خواردی و زەوییەکە بەسوری مایەوە، لە پاشا کە گەنمەکەی تر لە دەستی مشك دەرباز بوو گوڵی کرد، گاوانی نامەرد بە ئیسماعیل ئاغا دەڵێ: مامۆستا لێی تێك چووە مشکی گەنمەکەی منی کوشتوە لە جیاتی مشکی گەنمەکەی خۆی، ئیسماعیل ئاغا بەمنی وت: ئەمە راستە، منیش دەستم کرد بە قسە وتن بەگاوان، وتم: درۆ دەکات من مشکی گەنمی خۆمم کوشتوە، ئاغا فەرمانی دا دوو ئەسپیان هێنا یەکێ بۆ من و یەکێك بۆ کوێخا باییز، پێکەوە چوین بۆ سەر زەوییەکە، کوێخا باییز وتی: مامۆستا ئەو گەنمەی کە مشك خواردوویەتی گەنمەکەی تۆیە. منیش کە هاتمەوە دانیشتم پارچە شیعرێکم نوسی بۆ مەلای پێشوی دێکە (مەلا سەعدی) کە لە داخان دێکەی بەجێ هێشتبوو چوو بوو لە (قەڵادزێ) دوکانی دانابوو، هەندێ لە شیعرەکانم لەبیر نەماوە بەداخەوە جگە لەم چەند دێڕە نەبێت:

**ئـاغـا وتــی:**

ئەی مامۆســتای بێ باوان
هـەی زانیــاری بێ تــاوان
بۆ چـویـتـە ریـزی گاوان
من بۆت ئەکەم بە چاوان
هەرچیت بوێ لـە گـاوان

**گاوان ئـەڵێت:**

هــەر لە رۆژی (قالوا بلى)
بـڕیــاردرا لــە بـۆ مــەلا
سەرفیترە و موچەی فــەلا
خـێر و خـێرات دفـع البلا

بۆچی لاتدا هەی مام مەلا
لەم ڕێ ڕاستەی پڕ لابەلا
مەلا هەروا بەختی کۆمە
سەری باران ژێری گۆمە
من بۆ حاڵی ڕۆڵە ڕۆمە
مشکت کوشتوە بەختی خۆمە

مەلا وتی:

گاوان پوختی نیە بەختی هەیە
تەختەی نییە تەختی هەیە
بێ قەوارە زەختی هەیە
بۆ مافی خۆی جەختی هەیە

بەڵێ ئەو گاوانی ناوە
بەڵام ئیشی لەبەر چاوە
ئەوەی کە پێی سپێرراوە
بێ منەتە و لای تەواوە

من نایکوتم چونکە جەوتە
بۆ هەندێ تر بە ڕێکەوتە
پەسەند ئەبێ ئەوەی چەوتە
وا مەزانە بە پێی ڕەوتە

بەڵێ گاوان بەختی یارە
دوور لە غەمی کێشەی کارە
مەلا نیە لێی تێ نەگەن
بۆ ناسینی زوو پێ نەگەن

دیاره ئەوەی غەمی سەختە
ئاڵۆزییەو ڕەشیی بەختە
کە هۆی ژینت ئەو کەڵکە بێ
کە لە قووتی ئەو خەڵکە بێ

زۆربەش هەژار و فەقیر بن
لێت تێنەگەن پێت زویر بن
کە ژینی تۆ چاتر نەبوو
غەمی ئەوان زیاتر نەبوو

مەلاش هەیە بێ قەزابێ
بۆ ئەوەی جێگەی ڕەزا بێ
چاوی لە چەوتیی ئەپۆشێ
ئاوی جیاوازیی ئەنۆشێ

بۆیە ئەوەی لەسەر حەقە
ئەو ژیانەی زۆر پێ لەقە

بەداخەوە هەر ئەوەندەم لەبیر نەماوە.

# جولەکەی سپڵە

لەساڵی ١٩٤٨ کە لە سەرسیان مەلا بووم، ئاوی زێی بچووك ئەوەندە زۆر بووبوو پەیوەندی (پشدەر و مەرگە) بڕا بوو لەگەڵ شاری سلێمانی، چونکە ئەو کاتە هاتووچۆ و پەڕینەوە بەسەر ئاوی زێدا بەهۆی قەیاغەوە بوو، ئەم قەیاغە بریتی بوو لە چەند تەختەیەکی تاشراو ژێرەکەیان کوندە بوو پڕ کرابوو لە هەوا، پیادە و سوارە و ئۆتومبێل یەکە یەکە بە نۆرە بەو قەیاغەیەدا ئەم بەر و ئەو بەریان دەکرد، قەیاغەکە لەمبەر و لەو بەرەوە بەسرابووەوە بە ئاسنێکەوە بۆ ئەوەی ئاو نەیبات، کاتێك کە ڕۆخانە هەڵیدەکرد لە زستان یان بەهاردا، لەبەر زۆری و هێزی ئاوەکە قەیاغەکە ئیشی پێ نەدەکرا.

لەو کاتەدا جولەکەیەك لە شاری کۆیەوە هاتبوو زەرەنگەر بوو، هەندێ خشڵی ئاڵتون و زیوی پێ بوو دەیفرۆشت، کاتێك هاتە دێی سەرسیان ڕێگەی هاتوو چۆ بڕا، جولەکەکە کەسی نەئەناسی، بەسەر لێشێواوی داما نەیدەزانی روو بکاتە کوێ، هەندێ لە دانیشتوانی دێیەکە بڕیاریان دابوو ئەم جولەکەیە ڕوت بکەنەوە، لە هەر شوێنێك بۆیان ڕێکەوت ئاڵتون و زیوەکەی لێ بسێنن، ئەگەر ملپێچی بکات بیکوژن، چونکە کافرە، منیش ئەمەم بیستەوە جولەکەکەم هێنایە ماڵی خۆمان، پاش نوێژی شێوان لەدەرگای مزگەوتەکەدا بەهەموو نوێژخوێنانم وت: هەرکەسێك دەستدرێژی بکاتە سەر ئەو جولەکەیە، دایبنێن کە دەستدرێژی کراوەتە سەر من، ئەو جولەکەیە تا ڕێگە دەکرێتەوە من پەنای دەدەم و دەیپارێزم، چونکە ئەمە ئایینی ئیسلام ڕێگەی داوە، لە ڕۆژی ئاوادا نابێت تەماشای موسڵمانێتی و جولەکایەتی بکرێت، چونکە هەموو لامان براین و لە دایك و

باوکێك بووین لەیەك مەعدەن دروست کراوین کە خاکە، وەك پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: (کلکم من ادم و ادم من تراب)، ئەوانەی تەماعیان کردبووە خشڵ و زێڕەکانی دیار بوو وتەکەمیان زۆر پێناخۆشبوو بەڵام بەقسەیان کردم، زۆر سوپاسیان دەکەم لەسەر ئەوەی کە ڕێزی منیان گرت و دەستیان درێژ نەکردە سەر ئەو جولەکەیە، ئەم جولەکەیە ماوەی پازدە رۆژ ە لەماڵی ئێمەمایەو، زۆر خزمەتیم کرد، چونکە خزمەتی میوان ئەرکێکی گەورەیە لەسەر شانی مرۆڤ بەپێی ئاینی ئیسلام و رەوشتی کوردەواری، لەپاش ئەوەی قەیاغەکە کەوتەوە ئیش ماڵئاوایم لێ کرد و تا دەرەوەی ئاوایی بەرێم کرد.

بەڵام پاداشتی چاکەی ئەم جولەکەیە بۆ من ئەوە بوو، دوو بازنەی زیوی گەورەی (مەعصومە)ی خێزانم بوون، جولەکەکە بردی کە لە کۆیە زاخاویان بکات (سپیان بکاتەوە)، لەپاشدا ئەم جولەکە سپڵەیە دەستی بەسەر بازنەکاندا گرت و نەیناردەوە.

سەرەڕای بێوەفایی ئەو جولەکەیە هێشتا من زۆر هەست بە بەختیاری دەکەم کە ماڵ و گیانی ئەو جولەکەیەم رزگار کرد، پێشینان وتویانە: (چاکە بکە و بیدە بەدەم ئاوەوە)، هەردەم خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانمان پێ دەکات بە چاکە کردن و دەفەرموێ: من پاداشتی ئەوە دەدەمەوە کە چاکە دەکات نەك پاداشتەکە لەو کەسە وەربگرمەوە کە چاکەم لەگەڵ کردووە.

## مێـوژ لەجیاتی شـەکر

بۆ جارێکی تر بۆ نزیکەی مانگێك ڕێگەی هات و چۆ بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاوەوە گیرا و شەکرمان لێ بڕا، ئێمەش لەماڵەوە کەمتر لەنیو کیلۆ شەکری کلۆمان هەبوو، شەرمم دەکرد بەیەکێ بڵێم هەندێ شەکرمان بداتێ تا دەیکڕین و دوایی دەی دەینەوە، بەڵام وەك دەڵێن خوا دەرگایەك دادەخات دەرگایەکی دیکە دەکاتەوە، فەردەیەك میوژە ڕەشەمان هەبوو، بۆ ماوەی یەك مانگ لەجیاتی شەکر مێوژە ڕەشەمان دەخوارد، هەندێ شەکرمان هەبوو کردبوومانە ناو شەکردانەوە، کاتێك کە میوان دەهات مێوژەکەمان دەشاردەوە و شەکرەکەمان دادەنا.

لام وایە هیچ شتێك لەوە جوانتر نیە ژن ومێرد هاوبەشی ژیان بن لەبوون و نەبووندا، لەخۆشی و ناخۆشیدا، بەجۆرێکی وا کە هیچ کەس لەدەرەوە بەکێشە و نهێنیان نەزانێت، ژیانی ژن و مێردایەتی وەك کۆمپانیەیەك وایە دەستمایەکەی خۆشەویستی و ڕێزی یەك گرتنە، قازانجەکەشی ئاسودەیی دڵ و کامەرانی و خۆشبەختیە، هەر ژن و مێردێك لەسەر بنەمای بەرژەوەندی مادی بەیەکەوە کۆببوبنەوە ئەوا ژیانیان تاڵ و چەواشە دەبێت، پیاو هەوڵبدات ژنێك بخوازێت خزمی خۆی بێت، بەڵام ئاموزا و پورزای نەبن، چونکە هەندێ نەخۆشی هەیە کە لەهەریەکەیاندا لەرێی بۆماوەییەوە لەمناڵەکەدا کۆدەبێتەوە و زۆرجار ناتەواو دەبێت، لەئێستادا زانستی پزیشکی هاوچەرخ چارەی ئەمەشی کردووە، بۆیە ژنی خزم باکەمێکیش دوور بێت بەباش دەزانم چونکە عەیب و عاری پیاوەکەی بەهی خۆی دەزانێت، وەك پێشینانمان وتویانە: خزم ئەگەر گۆشتیشت بخوات ئێسکت ناشکێنێ.

جا مرۆڤ ئەگەر هەر سکاڵا بکات بۆ ئەم و ئەو باش نیە، چونکە ئەوەی دۆستە پێی ناخۆشە و ئەوەی دوژمنە پێی خۆشە، باشترە چاوەڕێ بکەیت، تا خوا دەرگای ڕەحمەتت لێ دەکاتەوە.

# صغری و کبری

لەو کاتەدا من مەلا بووم لە سەرسیان شەکر و چا بە کۆپین (بیتاقە) دابەش دەکرا، بۆ هەر نەفەرێك ئەندازەیەکیان دانا بوو لە شەکر و لە چا، ئێمە ئەو کاتە منداڵمان نەبوو، لەبەرئەوە ئاغا پێی وتم: بۆ ئەوەی بەشەکەتان زۆر بێت دوو منداڵ بنووسە، منیش نازانم بۆچی ئەو هەڵە گەورەیەم کرد، ئێستاش پەشیمانم لەو کردەوەیە، چووم دوو کچم نووسی یەکێکم ناونا (صغری) و ئەوی تریان (کبری)، چونکە زۆر بەدوای (منطق)دا دەگەڕام، بە دوای (صغری و کبری) دا دەگەڕام کە دوو بابەتی زانستی مەنتیقە.

کاتی خۆی بۆ ئەم کردەوەیە (بۆرە فتوی)یەکم بۆ خۆم دۆزییەوە لە دڵی خۆمدا وتم: ئەم شەکر و چایە هی دەوڵەتە، هەموو کەسێکی موسڵمان ئەگەر نەیبێت ئەرکی لەسەر (بیت المال)ە، منیش لەبەرئەوەی میوانم زۆر بوو، ئەو بەشەی پێیان دەدایـن بەشی نەدەکردین.

ئەم جۆرە فەتوایانە پیشەی هەندێك لە مەلایانە، هەر کاتێك شتێك لە بەرژەوەندی خۆی بوو دەگەڕێت (حیله شەرعی)یەکی بۆ دەدۆزێتەوە بۆ ئەوەی حەڵاڵی بکات، هەر لەمبارەیەوە دەگێڕنەوە رۆژێکیان مەلایەك لەگەڵ پیاوێکدا بەرێگادا دەڕۆیشتن، گەیشتنە لای دەغڵێك، مەلاکە بەناو دەغەڵەکەدا رۆیشت تا زووتر بگات، پیاوەکەی کەلەگەڵی بوو بەشوێن ماموستادا نەڕۆیشت، ماموستا ئاوڕی دایەوە و پێی وت: ئەوە بۆ بەشوێن منا نایەیت؟ پیاوەکە وتی: ماموستا من نایەمە ناو دەغڵەکە و بەو رێگە دوورەدا دەڕۆم، تۆ مەلایت قیلێك بۆ خۆت دەدۆزیتەوە خۆتی پێ قوتار بکەیت، بەڵام من بەچی خۆم قوتار بکەم.

## مارە بەجاش بۆ دووەم جار

ژنێك هەبوو لە دێیەکی تر نزیکی سەرسیان سێ تەڵاقە درا بوو، هەموو مەلاکانی ئەو ناوچەیە وتیان بەمارە بەجاش نەبێت تەڵاقەکە چاك نابێتەوە، ئێستاش لەلای هەندێك مامۆستایانی ئاینی هەرکەسێ بە ژنەکەی وت برۆ سێ تەڵاقەت کەوتبێ، ئیتر سێ تەڵاقەکەی دەکەوێت بە شووکردنەوە بەیەکێکی تر یان بەمارە بەجاش نەبێت چاك نابێتەوە.

ژنەکە هاتە لام وتی: من دەمەوێت بگەڕێمەوە لای مێردەکەم، منیش وتم: تۆ لێرە بمێنەرەوە تا یەکێکت بۆ دەدۆزمەوە بەدزیەوە مارەت دەکەم و تەڵاقت دەدات، پاشان کە عیدەت تەواو بوو مارەت دەکەمەوە لە مێردە پێشووەکەت.

شەوێك دانیشتبووین من و ئەو و (مەعصومە)ی خێزانم، ژنەکە پێی وتم: مامۆستا گیان یەکێکی وەك خۆتم بۆ پەیدا بکە، وتم: بەخوا ناتوانم ئەوە بکەم، لێم ببورە بەڵام هەریەکێکت بۆ پەیدا دەکەم.

بۆ سبەینێ کوڕێکی گەنج هەبوو ناوی حمە ئەمین بوو هێشتا ژنی نەهێنا بوو، وتم: پێت خۆشە بۆ یەك شەو ژنێکت بۆ بێنم، دیار بوو زۆری پێ خۆش بوو. شەو دوو شاهیدم هێناو مارەم کرد لێی و ناردمن بۆ شوێنێك و بۆ بەیانی تەڵاقی دا.

ئەمە جاری دووەم بوو لە مەلایەتی دا ئەم هەڵەیە بکەم، جاری یەکەم لە زەڵم، جاری دووەم لە سەرسیان، بەداخەوە کە لەکاتی خۆیدا نەمدەزانی سێ

تەڵاقەکە بە یەکجار تەڵاقێکی پێ دەکەوێت، ئەمە ڕەوشتێکی (جاهلییە) لە پێش ئیسلامدا هەبووە.

**لەبەر ئەم هۆیانە مارە بەجاش لە شەریعەتی ئیسلامدا دروست نیە:**

١- ئەم مارەکردنە مەرجی پێچەوانەی شەرعی تێدایە، هەر مارەکردنێك مەرجی لەو جۆرە ناڕەوای تیا بوو بەتاڵە. چونکە بەو مەرجە مارەی دەکەن کە لە دواییدا تەڵاقی بداتەوە.

٢- ئەم مارە کردنە بۆ کاتێکی تایبەتە کە پێی دەوترێت (الزواج المؤقت) هەموو مارەکردنێك بۆ کاتێکی دیاری کراو بەتاڵە.

٣- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی مارەکردنی ئافرەتی باڵغی ژیر دەبێت بە ڕەزامەندی خۆی بێت، ئەگەر لەو ژنە تەڵاق دراوە بپرسیت پێت خۆشە ئەم جاشە مێردت بێت هەتا ماوی، دیارە وەڵامەکەی ئەوەیە کە نایەوێت ببێت بە ژنی ئەم پیاوە نەناسراوە، بەڵکو ناچار بووە شوی پێ بکات بۆ ئەوەی بچێتەوە لای مێردی پێشووی.

# مام محمد مەرگەیی

لە سەرسیان دراوسێیەکمان هەبوو ناوی (حمە مەرگەیی) بوو، تەمەنی لە (٨٠)ساڵ زیاتر بوو، ژنەکەی پێیان ئەوت (پورە فات)، زۆر جار لەگەڵ پورە فات ئەهاتن بۆ ماڵمان بە شەوان قسەی خۆشیان دەگێڕایەوە.

جارێکیان وتی: مامۆستا کاتێك مەلیك فەیصەلی یەکەم هات بۆ پشدەر لە ماڵی بابکر ئاغای سلیم ئاغا میوان بوو، قاپێکی گەورەیان هێنا بوو بۆ ئەوەی (مەلیك) کاتێك ویستی دەست بە ئاو بگەیەنێت ئەو قاپەی لەژێر دابنێت، ئەم قاپە هەر بۆ ئەوە باش بوو چێشتی ماشینەی تیا بخۆیت.

جارێکی تر وتی: مامۆستا ئەگەر بمرم هیچ خەفەت ناخۆم، چونکە هەموو دنیام بینی، وتم: مامە کوێت دی لە ماوەی (٨٠) ساڵدا؟ وتی: تا خوار سلێمانی و کەرکوکم بینیوە و بە هەموو کۆڵانەکانیدا گەڕاوم.

وتی: بۆ جاری یەکەم کە چ.ومە سلێمانی لە ئوتێل دابەزیم پارچە خەڵوزێکم پێ بوو لە گیرفانمدا. کاتێك کە دەچوومە دەرەوە بەو پارچە خەڵوزە سەر دیوارەکانم نیشانە دەکرد، ئیتر دەگەڕامەوە وون نە ئەبووم.

جارێکی تر، ئاوێنەیەکی گەورەمان هەبوو کاتێك کە میوانێك دەهات تەماشای ئاوێنەکەی دەکرد، (حمە مەرگەیی) کە سەیری ئاوێنەکەی کرد وتی: مامۆستا ئەو پیاوە کێیە لەوێ دانیشتووە؟ وتم: ئەوە تۆیت.

دیارە کورد لە هەموو کەسێك زیرەکترە، بەڵام لەبەرئەوەی کە زۆر کات کورد ژێر دەستە بووە و دوژمنی یەکتر بوون، سودی لەو زیرەکیە وەرنەگرتووە.

## بەڕێوەبەری پەروەردە
## ( مدیری مەعاریف )

لە ساڵی (١٩٤٧)دا لە مانگی تەمموز مدیری مەعاریفی سلێمانی کە ئێستا پێی دەوترێت (بەڕێوەبەری پەروەردە) چوو بۆ قەڵادزێ، لەو سەرەوە گەڕایەوە لە سەرسیان شەوێك لای دا، مزگەوتەکە نوسابوو بە دیوەخانی ئاغاوە، کاتێك کە چووم بۆ نوێژ پێیان وتم: ئەوە مدیری مەعاریفی سلێمانیە، چووم بۆ لای سەلامم لێکرد و دوای ئەوە وتی: پێم خۆشە تۆزێك دانیشین بەیەکەوە.

لە پاش دانیشتن وتی: ئەبێت پرسیارێکت لێ بکەم؟ وتم: زۆرم پێ خۆشە.

وتی: مانای ئەمە چییە؟! "رأیت الله في صورة البقرة"

وتم: ئەمە مانای ئەوەیە کە من کاتێك خوام دی لەبەر گەورەیی خوا و لەبەر بچوکی خۆم بەرامبەر بەو گەورەییە خۆم بە مانگا هاتە بەرچاو.

وتم: "في صورة بقرة" حاڵە لە (فاعیلی فیعلەکە) نەك (مفعول بە)یەکە کە (الله)یە.

وەڵامەکەی زۆر پێ خۆش بوو لەبەرئەوەی کە نەوەستام بۆ بیرکردنەوە کە مەبەستی ئەوە بوو.

وتی: تۆ بۆچی هاتویتە ئەم دێیە دواکەوتووە؟

وتم: ئەی چی بکەم من مەلایەتی دەکەم و بەمەلایەتی دەژیم لەم کاتەدا لەم ئاغایە و لەم دێیەم باشتر دەست ناکەوێت.

وتی: ئەگەر من رێگایەکت بۆ دابنێم کە پاشەڕۆژێکی بەرزی تیادا بێت بەقسەم دەکەیت؟

وتم: بەڵێ.

وتی: لە بەغدا (عەلی کەمال) کوردێکی دڵسۆزە و زۆر پیاوانەیە هەندێك لە فەقێ کوردەکانی ناردووە بۆ زانکۆی ئەزهەر لە میسر لەسەر ئەرکی خۆی، منیش دەتوانم یارمەتیت بدەم، ئەتنێرم بۆ لای هەتا وەك فەقێیەکانی تر بتنێرێت بۆ (ئەزهەر).

منیش وتم: ئەگەر لەوێ خوێندنم تەواوکرد دەبم بەچی؟

وتی: یان دەبیت بە مامۆستای زانکۆ یان قازی.

وتم: بەقسەت دەکەم زۆرم پێ خۆشە رۆژێك لە رۆژان ببم بە قازی بەڕاستی و بە دادپەروەرییەوە.

وتم: چی پێویستە کە خۆم ئامادە بکەم بۆ ئەم سەفەرە.

وتی: ئەلفیەی ئیبن مالیك (ألفیه إبن مالك) لەگەڵ نزیکەی سێ چوار جزئی قورئان لەبەر بکە، لەوێ لەم دوانەدا تاقی کردنەوەت لەگەڵ دەکەن.

لەپاش ئەوە دەستم کرد بە قورئان لەبەرکردن لەگەڵ (الفیه).

رۆژێك (مەعصومە)ی خێزانم پرسی: بۆچی (منهج)ی خوێندنی خۆت گۆڕیوە ئەم شتانە لەبەر دەکەیت؟ منیش باسەکەم بۆ گێڕایەوە ئەویش پەسەندی کرد و وتی: من دەچمەوەماڵی باوکم تا تۆ دێیتەوە، ئەو کاتە منداڵمان نەبوو ئیشەکە ئاسان بوو.

شەوێك لە خەومدا جوتێك پێڵاوی لە قوڕ دروستکراو وا لە پێمدا بە پەتێکی ڕەش بەستومە، بەبەردەم ژوورەکەی قازی سلێمانیدا رۆشتم، ژووری قازی لە بینایەی سەرادا بوو، پەنجەرەکەی رووی دەکردە گۆڕەپانی سەرا.

دیم لولەیەك لەژێر پەنجەرەی ژوورەکەی قازیدا ئاوێکی ڕەشی بۆگەنی لێ دێتە دەرەوە، منیش پرسیم ئەم ئاوە بۆگەنە چییە؟ وتیان ئەوە رزقی قازییە، منیش بەیانی پەشیمان بوومەوە لەو شتەی کە خۆم ئامادە دەکرد بۆی. باوەڕم بە خەوەکە ئەوەندە بەهێز بوو وام دەزانی کە خوای گەورە بە ئیلهام ئەوەی بەمن فەرمووە.

## کلیل ئەگەر دەرگای
## پێ نەکرێتەوە بۆچی باشە؟

ڕۆژێك لە حوجرەی فەقێیەکان دەرسی کتێبی (کلنبوی برهان)م لەزانستی (منطق)دا بە فەقێیەك دەوتەوە، لەو کاتەدا شێخ حسێنی بۆسکێن کە پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند و زۆر زیرەك و زۆر ژیر بوو، هەرچەندە خوێندەوارییەکی کەمی هەبوو، ئەو ڕۆژە بەدیدەنی هاتبوو بۆ لای ئیسماعیل ئاغا، هات بۆ لام بۆ حوجرەی فەقێیەکان، منیش ویستم دەست لە دەرسەکە هەڵگرم، ئەو سوێندی خوارد وتی: دەبێت دەرسەکە تەواو بکەیت، منیش دادەنیشم گوێ دەگرم.

کاتێك لە دەرسەکە بومەوە، وتی: مامۆستا ئەگەر پرسیارێك بکەم پێت ناخۆش نیە؟، وتم: زۆرم پێ خۆشە.

وتی: ئەم دەرسە کەڵکی چیە کە ئێوە وا خۆتانی پێوە ماندوو دەکەن، هەروەها عیلمەکانی تر کە پێی دەوترێت دوازدە عیلم؟

وتم: ئێمە بەهۆی ئەم عیلمانەوە دەتوانین لە ئاینی ئیسلام بکۆڵینەوە، لە قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەر و حوکمی ئەو شتانە بدۆزینەوە کە لەژیاندا هەیە و لە پاشە ڕۆژدا پەیدا دەبن، چونکە قورئانی پیرۆز باسی هەموو شتێکی بە کورتی کردووە لە لایەن دروستی و نادروستیەوە.

وتی: وتەکەت ڕاستە، بەڵام ئێوە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم عیلمانە بەکار دەهێنن بۆ دۆزینەوەی ئەو شتانە؟ ئەگەر شتی وا هەبێت بۆچی هەر مەلایەك پرسیاری لێ دەکرێت ناتوانێت وەڵام بداتەوە تا پەنا نەبات بەیەکێ لە کتێبەکانی فیقهی شافعی.

لە پاشا وتی: مامۆستا تۆش و مامۆستاکانی تریش لە کوردستان لەمەو پێش و لەمەو دوا بە درێژایی ساڵ خۆتان ماندو دەکەن بۆ دروست کردنی کلیلێك کە دەرگایەکی پێ بکەنەوە، کە ئەویش دەرگای قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام بەداخەوە ئەمرن و رۆژێك لە رۆژان ئەو کلیلە بەکار ناهێنن، کەوا بوو سودی کلیل چیە ئەگەر دەرگای پێ نەکرێتەوە. بوون و نەبوونی هەروەك یەك وایە ئەگەر بەکار نەهێنرێت.

بەڕاستی ئەو وتەیە کە لە مانگی حوزەیرانی ١٩٤٨ بوو تا ئێستا (١٢-٨-٢٠٠١) هەردەم ئەم وتەیە کە شێخ حسێن بۆسکێن پێی وتم بەو کەم خوێندەوارییەی خۆی لە گوێمدا دەزرنگێتەوە.

منیش بەخۆم و مامۆستاکانم دەڵێم ئەوەی ماوە و ئەوەی نەماوە و ئەوانەی لەمەودوا پەیدا دەبن بەو جۆرە تەمەنی خۆیان بەخت دەکەن لە رێگای (نحو، صرف، منطق، بلاغە، فلسفە، ..هتد)، ئەوانی تر بەدرێژایی دوانزە ساڵ زیاتر ئینجا ئەم زانستانە بەدەرس دەڵێنەوە و حاشیەیان لەسەر دەکەن، بەڵام ئەگەر کابرایەك مرد نازانن چۆن میراتەکەی بەش بکەن، ئەگەر کابرایەك ژنەکەی تەڵاق دا سێ بەسێ بەیەکجار دەڵێن ئەمە بەمارە بەجاش نەبێت چاك نابێتەوە، چونکە فلان کتێب لە (فقه)ی شافعی یان حنفی وا دەفەرمویت، ئەگەر شتێکی تازە ڕوو بدات لە ڕێگای زانستی تازەوە نازانن حەڵاڵە یان حەرامە، دروستە یان دروست نیە، چونکە ئیمامەکان و مەزهەبەکانی لەمەو پێش ئەو شتانەیان نەدیوەو باسی حوکمەکەیان نەکردووە، هەروەك (إستنساخ - clonning) (أطفال أنابيب) و شتی تری تازە، کاتێك خوێندەوارەکانی ئیسلام کۆ دەبنەوە دەست دەکەن بەشەڕە قسە، ئەم دەڵێ شافعی وای فەرمووە و ئەو دەڵێت حەنەفی وای فەرمووە و یەکێکی تر دەڵێت ئیمامی جەعفەری صادق وای فەرمووە، هەر بەو جۆرە بەدرێژایی ساڵ بە رقەبەرایەتی و تعصب بۆ مەزهەبێکی تایبەتی ناتوانن بگەن بە ئەنجام و ڕاستی حوکمی ئەو شتە تازانە کە پەیدا بوون.

زۆرترین ئەو مامۆستایانەی کە خوێندنی مزگەوتیان تەواوکردوە، لای ئەوان ئایینی ئیسلام بریتییە لە مەزهەبی شافعی، هیچ کەس نیە بچێت بەلای

قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەردا. کەچی ناوی شافعی نە لە قورئاندا هەیە و نە لە فەرمودەکانی پێغەمبەردا. ئەگەر یەکێك لە ماملۆستایەکی ئاینی بپرسێت حوکمی فلان شت چیە دەڵێت خۆت (تقلیدی) ئیمامی شافعی بکە یان ئیمامی حەنەفی.

یان بەپێی بیرکردنەوەی خۆی و جۆری حوکمەکە کە بڕیار دەدات، وەك ئەوەی لە (حەج) دەستی بەر ئافرەت بکەوێت، ماملۆستای ئاینی ئەڵێت خۆت تەقلیدی حەنەفی بکە، چونکە لە مەزهەبی شافعی دەستنوێژەکەی دەشکێت.

هیچ کات ئەو ماملۆستا ئاینیانە بیر لەوە ناکەنەوە کە لە سەدەی یەکەمی ئیسلامدا باشترین کات بوو بۆ کارکردن بە ئیسلام، موسڵمانەکان خۆیان (تەقلیدی) کەسیان نەدەکرد ئەو کاتە نە ئیمامی حەنەفی نە شافعی نە ئیمامی (مالك) یان (أحمد) و نە ئیمامەکانی تر لە دایك نەبوو بوون.

رۆژێك لەگەڵ خوا لێخۆشبوو قازی عبدالحمید ئەترووشی لە خزمەتی ماملۆستا (مەلا عبدالکریمی مدرس) دانیشتبوین لە حوجرەکەی لە شێخ عبدالقادری گیلانی، پیاوێك هات پرسیارێکی لە ماملۆستا مەلا عبدالکریم کرد. ماملۆستا وتی: برۆ خۆت تەقلیدی ئیمام ئەبی حەنیفە بکە ئینجا ئیشەکەت بکە.

کاتێك کابرا چووە دەرەوە قازی شێخ عبدالحمید وتی: ماملۆستا لە پێش لەدایك بوونی ئیمامی حەنەفی موسڵمانەکان خۆیان تەقلیدی کێ ئەکرد؟

ماملۆستا زەردەخەنەیەك گرتی و قسەی نەکرد. من دەمزانی ماملۆستا لەدڵیدا قسەکەی زۆر پێ خۆشبوو، چونکە زانا و ژیرە، بەڵام لە زمانی ئەم و ئەو دەترسێت.

جارێك لە کۆڕی زانیاری (مجمع العلمی) داوایان لێکردم کە نوسراوێك لەسەر ژیانی ماملۆستا (عبدالکریم مدرس) بنووسم بۆ ئەوەی لە گۆڤارەکەیاندا بڵاوی بکەنەوە، چوومە خزمەتی بۆ ئەوەی هەندێك شتی لێ وەربگرم لە بارەی ژیانیەوە.

وتم: ماموستا پرسیارێکت لێ دەکەم پێت ناخۆش نەبێت، من ئەزانم کە تۆ لە زانیاری و شارەزایی زانستەکانی ئیسلامدا کە هەموویان هۆی دۆزینەوەی حوکمەکانی کردەوەی ئینسانن لە قورئانی پیرۆزدا و لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا زۆر شارەزایت. بۆچی یەکێك پرسیارت لێ دەکات بە (إجتهاد)ی خۆت وەڵام نادەیتەوە، بەڵکو بەناوی (حنفی) یان (شافعی) یان (مالکی) وەڵام دەدەیتەوە؟

بەماموستام وت: ئیمامی شافیعی لەو سەردەمەدا تەنها چوار عیلمی زانیوە کە عیلمی قورئان و علیمی فەرمووده و علیمی اصول الفقه وعیلمی بەلاغە بوو، چونکە ئەو کاتە عیلمەکانی تر وەریان نەگێڕابووە سەر عەرەبی وەك مەنتیق و فەلسفە و ئاداب، تۆ دوازدە عیلمت خوێندووە و زیاتر لەحەفتا ساڵە بە دەرس دەیلێیتەوە، بەسەدان ماموستای ئاینی ئەم عیلمانەی لای تۆ خوێندووەو ئیجازەت پێداوە، بەڵام کاتێ خەڵکێ پرسیارت لێ دەکەن پەنا بۆ کتێبێك لە کتێبەکانی شوێنکەوتووانی ئیمامی شافیعی دەبەیت وەك: تحفە ومغنی المحتاج و اعانە، تۆ خۆت بۆ ئیجتیهاد ناکەیت وەك ئەوان.

ئەویش فەرمووی: ڕاست ئەکەی، بەڵام دەزانیت ماموستا ئاینیەکان و ئەوانەی لەگەڵیاندان چەند زمان درێژن و چی دەڵێن.

ئەو وتانەی من کە پەیوەندی هەیە بە قسەکەی شێخ (حسێن بۆسکێن) یەوە مانای ئەوە نیە کە من ئیمامەکان بە کەم دادەنێم یان ڕێزیان لێ ناگرم، بەڵکو ئەو ئیمامانە خزمەتێکی زۆر گەورەیان بەئاینی ئیسلام کردووە و ئێمە زۆر سودمان لە فەرمودەکانی ئەوان وەرگرتووە. بەڵام ئەوان وەك ئێمە وتویانە پێغەمبەر خاتەمی هەموو پێغەمبەرانە. بەڵام ئیمامی شافعی نەیوتوە من خاتەمی هەموو مەزهەبێکم، یان حەنەفی یان ئیمام مالیك و ئەوانی تر نەیانوتوە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بخەنە کەنارێکەوە و بە وتارەکانی ئێمە کردەوە بکەن.

هەروەها هیچ ماموستایەکی ئایینی بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەو ئیمامانە هیچیان لە ئاسمانەوە (وەحی)یان بۆ هاتبێ، بەڵکو هەریەکێك لەوانە ماموستایەکی

چاك بوون -إجتهاد-ێكی باشیان كردووه، هەریەك بەڕێی مەزهەبەكەی خۆی ڕۆیشتووه هەر شتێكی فەرمووه لە هەندێ شوێندا ڕاستە و لە هەندێ شوێندا نەیپێكاوە. چونكە حوكمی خوا یەكێكە ئەگەر ئیمامەكە لەكاتی ئیجتهادەكەیدا ئەو حوكمەی دۆزیەوە ئەوا فەرمودەكەی ڕاست دەبێت، ئەگەر نەیدۆزییەوە ئەوا بەهەڵەدا چووە نابێت موسڵمان دوای بكەوێت.

پێغەمبەری خوا ئەفەرموێت:

"الحاكم إذا حكم ثم أجتهد فأصاب فله أجران وإن حكم فاجتهد وأخطأ فله أجر".

واتە: مجتهد ئەگەر ویستی حوكم بدات بەسەر شتێكدا، لە پاشدا ئیجتهادی كرد لە پێش حوكمەكەدا، ئەگەر حوكمەكەی خودای دۆزیەوە بۆ ئەو شتە ئەوە ئیجتهادەكەی ڕاستە، ئەوە دوو پاداشتی هەیە، یەكێكیان هی ئەوەیە خۆی ماندوو كردوە بۆ دۆزینەوەی حوكمەكەی خودا، یەكێكیان هی ئەوەیە كە بە هەڵەدا نەچووە حوكمەكەی خوای دۆزیوەتەوە. بەڵام ئەوەی بەهەڵەدا چووە ئەوا یەك پاداشتی هەیە لەسەر ماندووبونەكەی.

شوێنكەوتنی مەزهەبیی تایبەتە بە هەموو مرۆڤێكی موسڵمانەوە، وەك كوردێك لەدایك دەبێت دەڵێت من شافعیم، دەژیم لەسەر مەزهەبی شافعی، دەمرم لەسەر مەزهەبی شافعی، ئەمە گەورەترین هەڵەیە هەموو موسڵمانێك دەیكات، چونكە خوای گەورە نەیفەرمووە: (فاسألوا الشافعي إن كنتم لا تعلمون)، واتە: ئەگەر شتێكتان نەزانی پرسیار لە شافعی و مەزهەبەكەی بكەن، هەروەها حەنەفی و مالكی و مەزهەبەكانی تر، بەڵكو فەرمویەتی:

﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ۝٧﴾[1].

واتە: ئەگەر شتێكتان نەزانی لە زاناكان بپرسن، ئەم زانایانە لە ئایینی ئیسلامدا دیاری نەكراون.

---

(١) سورة الانبیاء: ٧.

بەڵام بەداخەوە ئێستا ئەوەی کە ئەم قسانەی من بکات پێی دەوترێت (وەهابی) هەروەك ئەوەی کە دوای شێخێك نەکەوێت پێی دەوترێت (منکر)، لە زەمانی (معتزلەکاندا) ئەوەی بیوتایە ئەی موسڵمانەکان ژیری بەکار بهێنن جیاوازی لە نێوان ئادەمیزاد و ئاژەڵدا بەژیرییە، پێیان دەوت (زندیق). ئەم وتانە و ئەم جیاوازییەی نێوان مەزهەبەکان هەتا ئەمڕۆ هەر بەردەوامە و هەر (ڕق) ەبەرایەتی نێوان موسڵمانەکان زیاد دەکات، سەر لە هەمووی شێوا دوای چواردە سەدە لە ئیسلام بونەتە ژێر دەستەی ئەمریکا و ئینگلیز و ڕوس.

موسڵمانەکان هێشتا خەریکی گفتوگۆن کە مەزهەبی کێ ڕاستە، لە هەمان کاتدا ئەمریکا و روسیا بەنەوتی گەلانی موسڵمان کەشتی ئاسمانی ڕەوانە دەکەن بۆ مەریخ.

# دەروێشی پیرۆز

رۆژێك باران بوو، لەپاش نوێژی مەغریب من و دایکی محمد خەریکی نان خواردن بووین، لە پڕ دەروێشێك بێ ئەوەی لەدەرگا بدات خۆی کرد بە ژووردا، هەموو گیانی تەڕ بوو، هەردوو قاچی قوڕاوی بوو، سەلامی کرد و دانیشت، هەرچەندمان کرد ئەم دەروێشەمان نەناسی.

پاش نان خواردن لە پڕ وتی: مامۆستا دەزانیت مەلاکەی مزگەوتی (بن تەبەق) لە سلێمانی مرد، هەندێك مەلا خۆیان ئامادە کردووە بۆ جێگەکەی.

من لەو رۆژەوە مدیری مەعاریف پێی وتم کە بۆ ناچیتە جێگەیەك پێشکەوتوتر بێت لەم جێگەیەی خۆم، حەزم ئەکرد کە بەرەو سلێمانی بڕۆم.

دەروێش نان و چایی خوارد و رۆشت، نەمزانی لەکوێیەوە هات و چوو بۆ کوێ، نەمزانی ناویشی چیە، ئەگەر باوەڕ بەخورافات بکەم ئەوە دەڵێم ئەوە خەیری زیندە (خضر) بووە هات بۆ لام، بەڵام باوەڕم بە خورافات نیە.

هەر جۆر بوو ئەو شەوە لە خۆشیاندا نەمدەزانی چۆن بنووم تا بەیانی رۆژ بووەوە، لەپاش نان و چایی چوم بۆ لای سمایل ئاغا وتم: دەمێکە ئاگام لە ماڵی باوکم و خزمەکانم نیە، دەمەوێت بچمەوە بۆ دێی خۆمان سێ چوار رۆژ لەوێ بم دوایی دێمەوە.

ئەویش پێی وتم: خوات لەگەڵ بێت، هەرچەند دەمێنیتەوە بمێنەرەوە.

کاتێك هاتم بۆ سلێمانی بینیم دوو رۆژی ماوە بۆ ئیمتیحان، یانزە کەس خۆیان ئامادە کردووە بۆ تاقیکردنەوە لە ئەوقاف بۆ مزگەوتی بن تەبەق کە

مەلاکەی مەلا (فتح الله) بوو وەفاتی کردبوو.

چووم عەریزەیەکم دا بۆ بەشدار بوون، بەمە ژمارەی بەشداربووان لە تاقیکردنەوەکە بوو بە (١٢) کەس، یەکێ لەو دوانزەیە خوالێخۆشبوو مەلا عبدلله ی چرۆستانی بوو کە زیاتر لە (٥٠) کەس ئیجازەی دوانزە عیلمیان لا وەرگرتبوو، منیش هەرچەندە بیرم دەکردەوە زۆر بە دوورم دەزانی کە لەو تاقی کردنەوەیەدا سەر بکەوم و ببم بە مەلای ئەو مزگەوتە، چونکە ئەوان زۆر مەلای چاك و زیرەك بوون، وەك مەلا عبدلله ی چرۆستانی و مەلا عەزیزی جوانرۆیی و مەلا فاتحی مامۆستا مەلا عبدالکریم و هەندێکی تریش لە خوێندەواری چاك چاك. هەروەها ئەوان نزیکەی ١٠ رۆژ بوو خەریکی خوێندن و خۆ ئامادەکردن بوون بۆ تاقی کردنەوە، منیش یەك رۆژم هەبوو بۆ خۆ ئامادەکردن، چونکە دوو رۆژی مابوو بۆ تاقی کردنەوەکە.

هەر جۆرێك بێت پەنام بەخوای گەورە برد و رۆژی تاقی کردنەوەکە پرسیارەکانیان بەسەرماندا دابەش کرد، کە خوێندمەوە دیم زۆر گرانن. پشتم بەست بەخوای گەورە کە یارمەتیم بدات و دەستم کرد بە وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانە، وابزانم من دووەم کەس بووم پاش مەلا عەزیزی جوانرۆیی کە دەفتەرەکەم تەسلیمی لیژنەی تاقیکردنەوە کرد.

لیژنەکە بریتی بوو لە: مامۆستا مەلا حمە سەعید دێلێژەیی (خومخانە)، مامۆستا مەلا شێخ مارف قەرەداغی، مامۆستا شێخ نوری شێخ بابا علی، مأموری ئەوقاف حمە علی ئەفەندی، بەسەرۆکایەتی قازی (شێخ محمدی خاڵ).

دەفتەرەکەم دا بەدەست قازییەوە، دەستی کرد بە تەماشاکردنی، منیش لە دەرەوە راوەستابووم، لە پاش ماوەیەك




مزگەوتی (بن تەبەق)ی هەرمەنی - سلێمانی

وتی: مەلا تۆ نەڕۆیت تۆ میوانی منیت، منیش چاوەڕوانیم کرد تا تاقیکردنەوەکە تەواو بوو.

قازی هاتە دەرەوە وتی: تۆ مەلای کوێی؟

وتم: من مەلام لە سەرسیان بەڵام خەڵکی زەڵمم.

لەگەڵ خۆی چوینەماڵەوەو نانی نیوەڕۆم خوارد، ئەو رۆژە پێنج شەممە بوو. قازی عادەتی وابوو هەموو پێنج شەممەیەك لە حەوشەی مزگەوتەکەی کەپێیان دەوت مزگەوتی شێخ محەمەدی خاڵ و لەگەڕەکی سابوونکەران بوو لەگەڵ بازرگان و خەڵکی تر کۆدەبوودەوە، پاش نوێژی عەسر لەوێ دانیشتبوو منی لە لای خۆیدا دانابوو، کاتێك کە میوانەکان هاتن وتی: ئێوە ئەم مەلایە دەناسن؟ ئەوانیش وتیان: نای ناسین.

وتی: ئەم مەلایە لیرەیەکی ئاڵتونە بووە بەژێر تۆز و خۆڵەوە من دەمەوێت بیهێنمە سلێمانی، ئەگەر ئەمجارەش دەرنەچێت لە تاقیکردنەوەدا دەبێ هەر بێتە شارەکەوە قوتابییەکان سودی لێ وەربگرن، چونکە ئەم مەلایە رۆژێك پێش ئیمتیحان هاتووە لەدێیەکەوە، لەکاتی تاقیکردنەوەکەدا بۆمان دەرکەوت کە مرۆڤێکی تێگەیشتووە.

ئینجا من چوومەوە بۆ سەرسیان، لە پاش ماوەیەك هەواڵم وەرگرت کە ئەنجامی تاقیکردنەوەکە ئەوە بوو مەلا عزیزی جوانرۆیی بە یەکەم دەرچووە و منیش دووەم بووم.

دیارە مزگەوتەکە دەدەن بە یەکەم، بەڵام گەڕەکەکە یەکەمیان نەویست، بیانووەکەیان ئەوە بوو کە ماوەیەك لەو مزگەوتەی ئەوان خوێندوویەتی و ئەوان رەزامەند نین لە هەڵسان و دانیشتنی، وتیان ئێمە لێی رازی نەبووین کە فەقێ بوو، ئێستا چۆن دەیکەین بە مەلای خۆمان.

هەموو داوایەکیان نووسیبوو ئیمزایان کردبوو کە ئەو مەلایەیان ناوێت، ئەم نوسراوەیان نارد بۆ ئەوقافی بەغدا، ئەوانیش وەڵامی ئەمەیان دایەوە وتیان: ئێمە ڕەزامەندی خۆمان ڕائەگەیەنین بە داواکەتان، بەڵام ئێمە مەعاشی مەلای ئەو مزگەوتە دەبڕین، خۆتان مەلای دووەم دابنێن لەسەر ئەرکی خۆتان، ئێمە موچەی نادەینێ.



ئەو خانوەی تێیدا نیشتەجێ بوین

## بەرەو سلێمانی

هەواڵیان بۆ ناردم بچم بۆ سلێمانی، کاتێك هاتم ئەهلی گەڕەکەکە لەگەڵم کۆبوونەوە وتیان: مەعاشی مەلای مزگەوتەکەمان لە لایەن میرییەوە سێ دینار و نیوە ئێمە مانگی پێنج دینار بەتۆ دەدەین، منیش ئەوەندەم پێ خۆشبوو. وتم: ئێوە تەنیا ژورێکم بدەنێ ئیتر وازم لێ بێنن بۆ خوای گەورە إنشا و الله پەکم ناخات، لەپاش ئەوە شەرمم کرد بگەڕێمەوە ماڵئاوایی لە ئیسماعیل ئاغا بکەم کە سێ ساڵ بە دڵ و گیان خزمەتی کردم بەقەدەر زەڕڕیەك دڵی ئازار نەدام، پیاوێکی بەڕێز و خانەدان بوو.

کاتێك خەبەریان برد بوو بۆ ئیسماعیل ئاغا دەستی کردبوو بە گریان، وتبوی لە خوا داوا دەکەم کە خۆشی و رەحەتی نەبینێت، چونکە من زۆرم خۆش دەویست هیچ شتێکم لەو درێغی نەکردوە.

بەڕاستی ئیسماعیل ئاغا پیاوێکی موسڵمان بوو، چونکە دوعاکەی گیرا بوو، کە ماڵەوە ماڵەکەیان هێنا بوو بۆ سلێمانی ئەو رۆژە لە کونە کۆتر ئوتۆمبێلەکە پەنچەر بوو بوو، کاتیش پایزێکی درەنگ و زۆر سارد بوو، دایکی محمد نەخۆش کەوت و بەنەخۆشی هات بۆ سلێمانی، منالێکی لەبار چوو، توشی نەزیف بوو نەخۆشیەکەی زۆر درێژەی کێشا.

منیش خۆم دوچاری کابرایەکی ناهەمواری زۆر خراپ بووم کە دەم سپی گەڕەکەکە بوو، هەرچی نوێژم بکردایە توانجی تێ دەگرتم، لە نێوان نوێژەکاندا پێی دەوتم: تۆ نازانی نوێژەکەمان بە باشی بۆ بکەیت، ئەمەش لەبەرئەوەی کە لە پێش مندا مەلا عبداللە چرۆستانی لەوێ ئیمام بوو لە پاش مردنی مەلای پێشوو سێ مانگ ئیمامەتی بۆ کردبوون، دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو، تەجویدێکی باشی دەزانی بۆ قورئان خوێندن، منیش لەوەدا کۆڵەوار بووم، نەدەنگم خۆش بوو نە تەجویدم باش بوو، کاتێك نوێژی مەغریبمان دەکرد ئەو پیاوە لە پشت سەرمەوە نوێژی دەکرد، کە پێیان دەوت (م.ص.ج) کە لە نوێژەکە دەبومەوە دەیوت تۆ ووشەی (ولاضالین) زۆرت داکێشا، منیش لە نوێژی عیشادا کورتم ئەکردەوە دەیوت تۆ (ی)ەکەی (لاضالین) زۆرت هەڵکێشا، ئیتر بەوە هەموو نوێژێکی ئێوارە و خەوتنان ئەو کابرایە سەری لەمن شێواندبوو، چونکە نەمدەزانی وەك گۆرانی سورەتی فاتیحە بخوێنم، ئەمەش یەکێکە لە نموونەی دواکەوتنی گەلی کورد، زانین و نەزانین لای ئەوان دەنگی خۆشە و لەراندنەوەی وشەکانی قورئانی پیرۆزە.

رۆژێك ئێوارە وەختە بوو، هێشتا بانگی مەغریب نەدرابوو، (ح.ط.پ) هاتە ژوری حەوشەکە، پێی وتم: مەلا نوێژەکەمان بەباشی بۆ بکە پارە لە جگەرەوە دەردێ، ئەم پیاوە مانگی (١٠٠) فلسی دەدا.

ڕۆژێکی تر یەکێکی تریان پێی وتم: بچۆرە لای کوێرەکانی مزگەوتی گەورە نوێژەکەت ڕەوان بکە، بە مەرجێ من فەقێیەکانم هەموو خەریکی تەواوکردنی خوێندن بوون.

کەسیان بیریان لەوە نەدەکردەوە کە ئەمە أصولی ئایین نیە، من دەستەڵاتم چیە کە من دەنگم خۆش نیە، لە نوێژدا نازانم ووشەکان بلەرێنمەوە، من هەموو دەرسەکانم بەباشی دەوتەوە، بەڵام لای ئەوان زیرەکی لەوە دایە دەنگت خۆشبێ.

فەقێیەکم هەبوو، مەلا عبدالرحمن بانەیی زۆر زیرەك بوو، کتێبی (جمع الجوامع)ی دەخوێند لەلام، ڕۆژێك یەکێك لە ئەهلی گەڕەکەکە وتی: فەقێ ئیتر تۆ بانگ نەدەیت، چونکە بانگ دانەکەت لادێیانەیە. فەقێ بڕیاری دا کە مزگەوتەکە بەجێ بهێڵێت، ماڵئاوایی لێکردم بۆ جیابوونەوە، وتی: تۆ مەلایت مەجبوریت ئەم ناهەموارییە و ناڕەواییەی ئەم گەڕەکە قبوڵ بکەیت، بەڵام من مەجبور نیم قبوڵی بکەم، من نازانم جیاوازی چیە لە نێوان بانگی شاری و بانگی لادێی دا.



حوجرەی مزگەوتی بن تەبەق

پاش ئەوەی فەقێیەکە ڕۆیشت ئەوەندە ئازار چووە دڵمەوە چوومە ئەو ژوورەوە کە دەرسم تیایدا دەوتەوە قورئانێکی تیادا بوو، گرتم بەدەستەوەو ڕوومکردە ئاسمان و وتم: خوای گەورە خۆ من حەزرەتی ئەیوب نیم تا بەرگەی ئەم ئێش و ئازارە بگرم.

دانیشتم رومکردە خوا وتم: ئەی خوای گەورە ئەوە من شەش مانگە بەم دەردەوە دەناڵێنم، گوناهەکەم هەر ئەوەیە دەنگم خۆش نیە و نازانم ووشەکانی سورەتی فاتحە چۆن هەڵیان بکێشم و دایان بکێشم.

دیارە هەرکەسێك بە دڵێکی زۆر تەنگەوە بە دەرونێکی زۆر پاکەوە ڕوو بکاتە خوا، دوعاکەی قبوڵ دەبێت، ئەو پیاوەی زۆر ئازاری دەدام، توانجی لە نوێژەکەم دەگرت، ڕۆژی دوایی هات بۆ مزگەوت زۆر بێ تاقەت بوو، پێی وتم: ماموٚستا لە دوێنێوە هەر دوو گوێم کەڕبووە، منیش وتم: تازە گوێی لە دەنگی من نابێت تا ڕەخنەم لێ بگرێت.

لە پاش هەفتەیەك هەمان کەس هاتەوە وتی: لە خوا بەزیاد بێت هەر دوو گوێم بەربوو، منیش لە دڵی خۆمدا وتم: خوای گەورە من چ گوناهێکم کرد تا ئەم کابرایە بۆ جارێکی تر گوێی بکرێتەوە.

بەڵام دیار بوو من هەڵە بووم، چونکە بەکەمتر لە هەفتەیەك هەر دوو چاوی کوێر بوو، هەتا کۆچی دوایی کرد هەر لەماڵەوە کەوت و نەیدەتوانی بێت بۆ مزگەوت، زۆر جار کوڕەزاکەی دەنارد بۆ لام دەیوت با ماموٚستا بێت بۆ لام زۆر بێتاقەتم، منیش بە دڵسۆزییەوە ئەچووم بۆ لای، هەموو کردەوەکانیم لەبیرکرد، بە دڵ و بە گیان گەردنم ئازاد کرد.

شایانی باسە ئەوکاتە لەشاری سلێمانی، تەنها لە مزگەوتی گەورە نوێژی هەینی ئەکرا.

## ئاشتبونەوەم لەگەڵ ئیسماعیل ئاغا

پاش ماوەیەك چومەوە بۆ سەرسیان خۆم لەگەڵ ئیسماعیل ئاغا ئاشت کردەوە و گەردنی ئازاد کردم و وتی: هیچ نەماوە لەدڵمدا بەرامبەر بە تۆ هیوادارم لە پاشەڕۆژدا بەختەوەر بیت.

پاش ئەمە رەحمەتی خوا ڕووی تێ کردم، کاتێك گەڕامەوە سلێمانی خەڵکی گەڕەکەکە گۆڕا بوون، خزمەتیان دەکردم و ڕێزیان دەگرتم و ڕێزی فەقێیەکانیان دەگرت، لە ماوەی پێنج ساڵدا کە مەلای ئەو مزگەوتە بووم پێنج مەلام ئیجازە دا، من هەتا ماوم سوپاسی دانیشتوانی ئەو گەڕەکە دەکەم لەسەر پیاوەتی و چاکەیان، هەرچەند شەش مانگی یەکەم زۆر دڵیان ئازار دام، بەڵام ئەویش لە نەزانینەوە بوو، وایان دەزانی هەر مەلایەك دەنگی خۆش نەبێت مەلا نیە.

هەندێك لەو شتانەی پێیان وتم لە ماوەی شەش مانگی یەکەم لە سلێمانی ئەمانە بوون:

شەوێکیان هەموومان لە ماڵی حاجی مەلا مارف کۆ بووبووینەوە، بەپیاو ماقوڵەکانی گەڕەکەکەم وت: ئەو ژوورەی کە بەکرێ گرتومانە دەرگاکەی ڕوو بە گۆیژەیە، واتە ڕوو بە ڕەشەبایە، خێزانیشم نەخۆشە، بەڵکو ژورێکی ترم بۆ بدۆزنەوە کە ئەم زستانەی تیایدا بەسەر بەرین.

یەکێ لەوانەی کە لە دواییدا زۆر چاکەی لەگەڵ کردم شتێکی وت، ئێستاش ئازاری لەسەر جەرگم ماوە، وتی: (خودایا عاقبت ما را خوب گردان)،

واتە: ئەی خوایە عاقیبەتمان بەخێر بکەیت بەدەستی ئەم مەلایەوە، چونکە من کاتی خۆی پێم وتبون ژورێکم بۆ بگرن حەواڵەی خوام بکەن.

هەر ئەم پیاوە جارێکی تر قسەیەکی کرد ئەویشم هەر زۆر پێ ناخۆشبوو. رۆژێك حاجی (ص.ز) وتی: مامۆستا چیتێکی زۆر جوان هاتووە هی ئێرانە با بەشی کراسێك لەو چیتە کە پێیان دەوت (جەلسە) بنێرین بۆ مامۆستا ژن پاشان پارەکەت لێ وەردەگرین. ئەو پیاوە وەڵامی دایەوە وتی: حاجی (با ژنەکەی فێری ئەو شتانە نەبێت)، ئەو نەیدەزانی باوکی ژنەکەم بازرگانی قوماشە لەخورماڵ و باشترین قوماشی دەدا بەکچەکەی.

ئەم پیاوە کە ئەمانەی پێ وتم، دواتر کە منی ناسی و زانی کە تۆزێك خوێندەوارم و دەرس وتنەوەکەم بۆ خودایە بۆ پارە پەیداکردن نیە، بەزۆر ماڵەکەمی گواستەوەو بردمیە ماڵی خۆیان، ژورێکی دامێ بەبێ کرێ زیاتر لە ساڵێك تیایدا بووم، تا کۆچی دوایی کرد بە دڵ و گیان خۆشی دەویستم، منیش ئەوم زۆر خۆشویست، خوا پاداشتی بەخێری بداتەوە.

رۆژگاری ناهەمواری مەلا کە پێشەوای موسڵمانانە، کراوە بە موچە خۆر و سەرفیترە و زەکات خۆر، خوێندنەکەمان هەرچەندە بەپێی ئەو رۆژە سودی زۆر بوو، بەڵام ژیانی مەلا ئەمەندە ناخۆشی و ڕسوایی تیابوو، زۆر کەس وەك من وازی لە مەلایی ئەهێنا و ئەچوو ئیشێکی تری ئەکرد.

خوالێخۆش بوو کاك شێخ ئەمین نەقشبەندی ناسراو بە "بێوەی" لە بابەتی ژیانی مەلاوە شیعرێکی لەژێرناونیشانی ژینی مەلا لەکوردەواریدا نووسیوە کەئەمە دەقەکەیەتی:

بەڕاستی سەختە ژیانی مەلا
چاك گیری کردووە لەناو ئەم گەلا

لەگەڵ راتبەی نان یان چێشت خواستن
هەر رۆژێ لەم لا بۆ ئەولا گواستن

داوای شکارتە و جێگەی مـەنێ جـۆ
چـاوەڕێی زەکـات یــاخۆ چـۆڕێ دۆ

شوێنی ئیسقات و جمعانە و دەعوەت
تــەواوی عــومری ئەڕوا بەمەینــەت

ئەمە ئەم دونیا بێ دیـار ئەو دنیــا
حیســـاب و کیتــابی ژیــانی مــەلا

چونکە مەسـئولی گونـــاهی خەڵکە
چەن چاو ئەپۆشێ بۆ بەشکی و بەڵکە

ناهەق ئەبینێ چــاو ئەنـــووقـێنێ
چەن بەناهەقی خــەڵك ئەتـۆقـێنێ

بۆیــە ڕای ئـەگرن ژیــانی ئــەدەن
گەلی بۆ دێـرن خزمــەتی ئــەکەن

ڕێگای شەریعەت نیشـــاندا پێ یــان
گونــا و خــراپــە لابــدا لێ یـــان

ئاگای شەریعەت لای هیچـکام نی یە
جـوابــی مــەلا لای خــوا چــی یە؟

مەوعظــە و خــوگـبە، هاوار و فریاد
ئــەپــارێتــەوە بــەهـــاوار و داد

ئەوەن خوتبەی دا هەنـــاسەی نەما
ئێوەبن و خوا چی دەس کـەوت لەما

چونکی هەر خەڵکە و خەڵك تالآن ئەکا
پیــرە و کردەوەی مــنـدالآن ئــەکــا

بەڕاستی ســەختە ژیــنی مەلاکــان
کاش ئەیان گۆڕی هەموو ڕێی ژیــان

بەزۆری بـازوو بەنـووکی قەڵـەم
زیندەگی بکەن نان بخۆن بێ خـەم
نـانی بێ منـەت بێ خـتە و بـۆڵە
زۆر زۆر خۆشترە لەم ژینە سۆڵە[1]

شایەنی باسە کاك شێخ ئەمین شێخ عەلائەدین نەقشبەندی پیاوێکی زۆر زانا و ژیر و بەڕێز و بەوەفا بوو بۆ هەرکەسێك پەیوەندی لەگەڵ بوایە، کاتێك لە (ئەحمەد ئاوا) بوو لەپێش ١٩٥٨ دانیشتوانی دێیەکە لە هەموو لایەکەوە زۆریان خۆشدەویست، من ئەو کاتە لە دەرەوەی زەڵم بووم، برادەریم لەگەڵ نەبوو، ساڵی ١٩٨٠ کە ماڵیان هاتە بەغدا، لەگەڵ ئەوەش ماڵەکەیان دوور بوو، بەڵام هەتاکو کۆچی دوایی کرد هەواڵی ئەپرسی و سەری ئەدا، خوا گیانی پاکی بەبەهەشت شاد بکا.

ئەمەی کە کاك شێخ ئەمین نەقشبەندی باسی دەکات لە بابەت ژیانی مامۆستایانی ئایینی، منیش لەم ژیاننامەیەدا هەندێك لەبارەیەوە دواوم، تایبەتە بەو کات و سەردەمە، بەڵام لە ئێستادا سوپاس بۆ خوا ژیانی مامۆستایانی ئایینیش گۆڕانکاریی زۆری بەسەردا هاتووەو هەموویان مووچەی مانگانەیان هەیەو ژیانیان دابین کراوەو پێویستییان بە سەرفیترەو زەکات و یارمەتیی ئەم و ئەو نیە. ئەمەش وایکردووە کە خاوەن بۆچوونی خۆیان بن و لەژێر کاریگەریی کەسانی دیکەدا وتار و ئامۆژگاریی خەڵك نەکەن و، بە ڕاشکاویی ڕاستییەکان بخەنە ڕوو، خوا ژیانیان چاکتریش بکات و بەرەو پێشیان ببات بۆ خزمەتی ئایین و گەلەکەیان و پایەداریان بکات بۆ وتنی هەق و ڕاستی لە هەموو کات و سەردەمێکدا.

---

(١) دیوانی بێوەیی/ ١٩٨٧ (لا٤٠-٤١).

## مـردوو شــتن

بۆ جاری یەکەم کەلەگەڵ هەندێك لەپیاو ماقوڵانی گەڕەکەکە کۆبوومەوە بۆ باسکردنی پێویستیەکانی سەرشانی من و ئەوان، حاجی مەلا مارف پرسیاری لێکردم وتی: مردومان بۆ ئەشۆیت؟

منیش سەرم سوڕما، وتم: ئەوە بەڕاستتە؟

وتی: بەڵێ، چونکە خوا لێخۆشبوو مەلا فتح الله مەلای پێشووی مزگەوتەکە ئەوەی لەو گەڕەکەدا مردبێت، ئەگەر دەوڵەمەند بووبێت شتویەتی، ئەگەر هەژار بوبێت نەیشتووە.

منیش وتم: زۆر زۆر شتێکی ناشیرینە ئەم قسانەی ئێوە بەرامبەر بەمن دەیڵێن، من هەرچەندە مردوشۆری بەشتێکی باش دەزانم لە ڕێگەی خودا کەسێك بیکات، بەڵام ئەم کردەوەیە زۆر زۆر بۆ مەلا ناشیرینە، لەبەرئەوەی لە هەموو شوێنێك پیاوێکی هەژاری لیقەوماو هەیە مردووەکانی شوێنەکە دەشوات بۆ ئەوەی شتێکی بدەنێ پێی بژی. کامتان خۆتان زۆر بەپیاو ماقوڵ دەزانن لە گەڕەکەکەدا، ئەگەر هەرچی سامان و ماڵی هەیە لەپێش مردنیدا بیدات بەمن بۆ ئەوەی کە کاتێك مرد من بیشۆم، هەر لە دووریشەوە ڕاناوەستم لەسەری پیشانی یەکێکی بدەم کە بیشوات، هەر مەلایەك مردوو بشوات لەلای من وەکو کوفر وایە کە پێی بوترێت مەلا، چونکە هەرکەسێك پلەیەکی هەیە لە ژیان، پلەی زانیاری بەرزترین پلەیە لە ژیاندا، ئەوەی زانیاری هەبێ لە هەموو بازرگان و دەستمایەدار پیاوترە و بەنرخ ترە، ئەگەر خۆی حورمەتی خۆی ڕابگرێت.

دیارە لێرەدا گلەیی لەو خەڵکە نەزان و دواکەوتووە ناکرێت، بەڵکو گلەیی لەو مەلایە دەکرێت کە مەلای مزگەوت و مدرس بووە، بەڵام ڕێزی خۆی نەگرتووە بۆ نیو دینار یان دینارێك چووەتە ماڵان مردووی شتووە.

جۆرەها کردەوەی ناشیرینی مەلا و مەلایەتی پاڵی بەمنەوە نا کە ئەو ڕێگا و شوێنە بەجێ بهێڵم، بیر لە واز هێنان لە مەلایەتی بکەمەوە، ئەگینا زۆر هەوەسم لە دەرس وتنەوە هەبوو، خۆم نەدەگۆڕیەوە بە پاشای عێراق.

لە پاش ماوەیەك دراوسێیەکمان هەبوو بەحەمە بۆر ناسرابوو منداڵێکی یەك ساڵی هەبوو مرد، منیش خەریکی دەرس وتنەوە بووم لە حوجرەکەدا، دەبینم پیاوێك هاتە ژورەوە وتی: ماموستا منیان ناردوە کە تۆ بێیت کورەکە بشۆیت. منیش قسەی سووکم پێ وت و وتم: بچۆرە دەرەوە با لەوە زیاتر بەسوکی قسەت لەگەڵ نەکەم، لە من کەمترتان نەدۆزیەوە لە گەڕەکەکەدا بچن پێی بڵێن مردوەکەتان بشوات؟ دوای ئەوە ئەو پیاوەی منداڵەکەی مردبوو و باوکی و براکانی تا دوو ساڵ نەهاتن بۆ مزگەوت بۆ نوێژکردن.

من ئەم پیاوەم نەبینیوە تا لەحەفتاکاندا جارێ لەبەغدا چاوم پێی کەوت، وتم: ئێستا بەچیەوە خەریکیت؟ وتی لەسەر صەلاحەدینی ئەیوبی ئەنووسم، ئەزانیت پیاوێکی ئارەقخۆر و داوێن پیس بووە، منیش پێم وت: بۆ ئەم خزمەتەت پارەت لەئینگلیز وەرگرتووە یان ئەمریکا؟ صەلاحەدین زۆر لەوە بەرزترە کەمن و تۆ بیناسین، پێویستە هەموو کوردێکی شەریف شانازی پێوە بکات، من ئەم توانجە ناشیرینانەم لەهەندێ کوردی تریش بیستووە وتویانە بۆچی خزمەتی ئاینی ئیسلامی کردووە و خزمەتی کوردی نەکردووە، بەبێ بیرکردنەوە لەو ڕۆژەی ئەو زاتەی تیا ژیاوە، کە ئەوکاتە هیچ کەسێك بیر وباوەڕی ڕەگەزپەرستی لەمێشکیدا نەبووە، ڕەگەزپەرستی لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە دەستی پێکرد لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، دیارە ئەوە خەسڵەتی مرۆڤانێکە کەخۆیان هیچیان لەباردا نیە بۆ خزمەتی گەلەکەیان بیکەن، دێن و ئۆباڵەکەی دەخەنە ئەستۆی خەڵکانی پێش خۆیان.

## ڕۆژی جــەژن

ئەو کاتە لە لادێ و شارەکانی کوردستان باو بوو، لە پاش نوێژی جەژن خواردنیان دەهێنایە مزگەوت، هەرکەس لە ماڵی خۆی لە برنج و ساوەر سینییەکیان دەهێنا، ئەو کاتە لە لادێکاندا زۆرتر تەنیا برنجەکە یان ساوەرەکە بوو.

کاتێك لە زەڵم مەلا بووم، لە پاش نوێژی جەژن هەموو هەڵئەسانەوە و دەستی یەکتریان ماچ ئەکرد و بەدەنگی بەرز سەڵاواتیان ئەدا لەسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، جارجار ئەگریان و بەیەکتریان ئەوت توخوا گەردنم ئازا بکەن، بەو جۆرە ئەگەر دوو کەس ناکۆکیان لە نێوانیاندا بوایە، بەدرێژایی ساڵ قسەیان لەگەڵ یەك نەکردایە، ڕۆژی جەژن دەستی یەکیان ماچ ئەکرد و ئاشت ئەبوونەوە و گەردنی یەکیان ئازاد ئەکرد.

ئینجا پاش ئەوە پارەیان کۆ ئەکردەوە بۆ دیاریی ماڵی شێخ و خان، ڕۆژی دووەمی جەژن ئەچوون بۆ لای شێخ حسام الدین لە باخەکۆن یان شێخ علاءالدین لە بیارە، لە ڕۆژی سێیەم ئەچوون بۆ ماڵی خان ئەو کاتە (محمود خان) بوو، پاش مردنی عبدالله خان بوو، هەردوکیان لە (دزڵی) دائەنیشتن حوکمڕانی هەورامیەکانی ئەم دیو و ئەو دیویان ئەکرد.

هەروەها لە سلێمانی نانیان ئەهێنایە مزگەوت، لە پاش نان خواردن بەگەڕەکدا ئەگەڕان ماڵ بە ماڵ جەژنە پیرۆزەیان لە هەموو ماڵێك ئەکرد.

ئەو کاتە من لەوێ مەلا بووم، خوا لێخۆشبوو حاجی کریم ئاغا، کە پیاوێکی قەڵەو و قسە خۆش بوو، پێش هەموومان ئەکەوت و ماڵ بە ماڵ بە گەڕەکەکەدا

ئەگەڕاین، کە ئەگەیشتینە بەردەرگای هەر ماڵێك، کەریم ئاغا بانگی ئەکرد نوقڵەکە بێنن، چونکە ئەوەندە زۆربوین جێی دانیشتن نەبوو، ئینجا خاوەن ماڵەکە یان نوقڵ یان باسوق کە لە دۆشاوی مێوژ دروست ئەکرێ ئەیان هێنا، سەرو دەنکمان هەڵدەگرت و ئەچوین بۆ ماڵێکی تر.

## کۆکردنەوەی موچەی گەڕەك

هەروەك لەمەو پێش باسم کرد، موچەی مەلای مزگەوتەکە لەلایەن میرییەوە بڕابوو، گەڕەکەکە خۆیان ئەوەیان گرتە سەرشانی خۆیان، کە بەهەموویانەوە هەموو مانگێك پێنج دینار کۆبکەنەوەو لەباتی موچەی میری بیدەن بە من.

لە پاش دوو مانگ، ڕۆژێك نوێژی مەغریب بوو هەموو بۆ نوێژ کۆبووبوونەوە، بەڵام هێشتا نزیکی چارەکە سەعاتێکی مابوو بۆ بانگدان، یەکێك لە ئەهلی گەڕەکەکە لە ناوەڕاستی مزگەوتەکە دەستەسڕێکی ڕاخست و وتی: ڕەحمەتی خواتان لێ بێت با پارەکەی مامۆستا کۆبکەینەوە، یەکە یەکە هەڵسان یەکی درهەمێك (٥٠ فلس)یان خستە سەر دەستەسڕەکە.

لەو کاتەدا ئەگەر گیان دەرکردن بەدەستی خۆم بوایە گیانی خۆمم دەردەهێنا، بۆ ئەوەی ئەو کردەوە ناشرینە نەبینم، وتم: عەیب ناکەن شورەیی ناکەن، بۆچی من سواڵکەرم، دەرۆزە دەکەم، لێقەوماوم؟! ئەم کردەوە ناشیرینە چیە؟ بەو جۆرە پارە بۆمن کۆ دەکەنەوە، لە شوێنێکی تر لە ماڵی خۆتان یەکێك دابنێن پارەکە کۆ بکاتەوە بیهێنن، بۆ ماڵەوە یان حوجرە، لەسەر ئەو کردەوەیەی ئێوە پەیمانم داوە موچەکەی میری زیندو بکەمەوە، یان بچم کەوەر بفرۆشم مەلایەتی ناکەم.

لە پاش ئەو جارە هەموو جارێك کۆیان دەکردەوە و یەکێك دەیهێنایە ماڵەوە بۆم.

# شیرینی
## شیرینی ڕادەکێشێت

بەمەبەستی زیندوکردنەوەی موچەکەی میری، سێ چوار جار چوومە لای مەئموری ئەوقاف (محمد علی افندی) دەموت ئەفەندی رزگارم بکە لەم ژیانە تاڵە کە من تیایدا دەژیم، مەلایەکم خۆم بە خوێندەوار دەزانم، دەرس بە فەقێ بەباشی دەڵێمەوە، لە شوێنی خۆمدا حورمەتم هەبووە، ئێستا وەك سواڵکەر هەموو مانگێك هەریەك پەنجا فلسم ئەدەنێ بۆ ئەوەی خۆم و ماڵ و منالم بژین.

ئەویش هەموو جارێك بۆی دەنووسیم بۆ بەغدا بۆ زیندوکردنەوەی موچەکە، وەڵامەکە بە پێچەوانەوە دەهاتەوە.

ڕۆژێك خزمێکم دووبەرە هەنگوینێکی بۆ هێنابووم، بیرم کردەوە وتم با ئەم دووبەرەیە ببەم بۆ مەئموری ئەوقاف، بەڵکو بە دڵسۆزانە ئەو موچەیەم بۆ زیندو بکاتەوە، شەوێك دووبەرەکەم خستە بن دەستم و بردم بۆ ماڵیان. وتم: ئەمە ڕەشوە نیە بۆ تۆم هێناوە، بەدیاری بۆمن هاتووە و منیش بەدیاری هێناومە بۆ تۆ، ئیتر نەم وت یارمەتیم بدە، ئەویش وتی: سبەینێ دەتوانی بێیت بۆ ئەوقاف. وتم: سبەینێ دێم.

کە چووم وتی: عەریزەیەك بنووسە لەرێگەی منەوە بۆ ئەوقافی بەغدا، خۆی پیشانی دام کە چۆنی بنووسم، ئینجا ئەویش (تأید)ێکی لەسەر نووسی، هەردووکیانی خستە ناو زەرفێکەوە پێی وتم: کەسێك پشت ملی بخورێت خۆی بیخورێنێ باشترە تا یەکێکی تر. وتم: مەبەستت چییە؟ وتی: خۆت بڕۆ بۆ بەغدا ئەم عەریزەیە و کتابی ئەوقافە ببە بۆ مدیری عامی ئەوقاف، چونکە

ئەوکاتە هێشتا ئەوقاف وەزارەتی نەبوو.

منیش بۆ یەکەمجار ساڵی ١٩٥٠ چووم بۆ بەغدا، لەو سەردەمەدا ئەوقاف وەزارەت نەبوو خوالێخۆشبوو (شفيق العاني) بەڕێوەبەری گشتی ئەوقاف بوو، پیاوێکی زۆر چاك و زۆر مەرد و زۆر موسڵمان بوو، بەدرێژی گوێی بۆ گرتم کە باسی خزمەتی خۆمم بۆ کرد لە بارەی دەرس وتنەوە بە فەقێ و جۆری ژیانم، ئەویش خوا خستیە دڵیەوە - إضبارە-ی مزگەوتەکەی هێنا و فەرمانیدا کە موچەکەم بۆ زیندوو بکرێتەوە کە بریتی بوو لە (پێنج دینار و نیو) هەر لەوێ کتابی پێدام وتی برۆ هەر لەم مانگەوە ئەم موچەیەت بۆ سەرف بکەن، واتە لە ١٩٥٠/٧/١.

دیارە ئەمە هەمووی خوا کردی، بەڵام هەموو بەرەکەتێك حەرەکەتێکی دەوێت. ئەگەر شیرینی هەنگوینەکە نەبوایە منیش خوا ئەم شیرینیەی بۆ نەدەناردم، خوا بۆ هەموو شتێك هۆیەکی داناوە.

لەپاش ئەوەی مژدەی موافەقەتی ئەوقافم وەرگرت لەسەر زیندووبوونەوەی موچەکەم، زۆر سوپاسی خوای گەورەم کرد، لەخۆشیاندا وەکو سەرخۆشم لێ هاتبوو، بەسەر جادەی رەشیددا لەبەغدا پیاسەم دەکرد و خۆم بەکەس نەدەگۆڕیەوە، لەو کاتەدا دیم کۆمەڵێك کتێب لەقەراغی شەقامەکەدا دانراون بۆ فرۆشتن، منیش دوو کتێبم کڕی.

کاتێك لە بەغدا گەڕامەوە بۆ سلێمانی تا سەری مانگ بە کەسم نەوت، سەری مانگ چووم لە ئەوقاف مەعاشەکەم کە پێنج دینار ونیو بوو وەرمگرت، ماچم کرد و لەسەر سەرم دانا، وتم :خوایە هەزاران سوپاس و ستایش بۆ تۆ کەمنت لەموچەی گەڕەك رزگار کرد، بۆ رۆژی دوایی پیاوێك لە دانیشتوانی گەڕەکەکە موچەی گەڕەکی هێنا کە پێنج دینار بوو. وتم: ئەمە بەرەوە هەرکەسە (پەنجا فلس)ی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە، پێیان بڵێ لەم رۆژەوە موچەی ئێوەم ناوێت، خوا موچەی بێ منەتی بۆ بڕیمەوە. هەرچەندە هەوڵیان دا کە ئەو مانگە وەری بگرم قبوڵم نەکرد، ئینجا دانیشتوانی گەڕەکەکە ووردە ووردە

خۆشەویستییان بۆ من زیاتر بوو.

کە لە بەغدا گەڕامەوە هەروەك باسم کرد دوو کتێبم کڕی بوو، یەکێکیان ئایینی بوو (إبراهیم أبو الانبیاء)، دووەم ئاینی نەبوو (معرکة نفط العراق) سیاسی بوو، لەڕێگە لە تەناڵ تەفتیشیان کردم، ئەو کاتە لەبەر فراوانی و بڵاوبونەوەی فکری شیوعی بە - سلێمانی-یان ئەوت مۆسکۆی دووەم. (مفوض شورتەکە) کە جانتاکەی تەفتیش کرد وتی: ئەم کتێبە قەدەغەیە. وتم: من ئەمەم لەسەر جادەی پایتەخت کڕیوە، وتی: ئەوە خەڵکی پێ تاقی ئەکەنەوە. ئیفادەیان لێ وەرگرتم لەگەڵ کتێبەکە خستیانە زەرفەوەو دوو پۆلیسیان لەگەڵ ناردم، لە گەراج دابەزین تکام کرد لە پۆلیسەکان دوام نەکەون و تۆزێ دوور بن بۆ ئەوەی کەس نەزانێ من تاوانبارم بە قسەیان نەکردم.

کاتێك چووینە دائرەی ئەمن پێیان ئەوت (شعبە خاصە) بەڕێوەبەرەکەی کە خەڵکی سلێمانی بوو زۆر نامەرد و ناکەس بەچە بوو، وای ئەزانی گەورەترین تاوانباری گرتووە، قیژانی بەسەرماو وتی: مەلا، ئیشی تۆ قورئان خوێندنە ئەم کتێبەت بۆچی کڕیوە؟

وتم: قورئان ئەمری پێکردووم بیکڕم، وتی: مەبەستت چی یە؟ وتم: ئیسلام تەنها نوێژ و ڕۆژو نییە، بەڵکو یاسا و ڕژێمە بۆ ئادەمیزاد.

دوای ئەوە بردمیانە لای بەڕێوەبەری شورتە کە عەرەب بوو، زۆر پیاوتر بوو لە کوردەکە، وتی: ئەم مەلایە لەوەو پێش لای ئێوە ناوی هەیە؟ وتیان: نەخێر، کوردەکە وتی بیدە بەدادگا با بگات بە سزای خۆی، عەرەبەکە وتی: کەواتە هیچی لەسەر نیە بڕۆ، بەڵام دوایی کتێبەکە بسوتێنە.

ساڵی ١٩٦٢ لە کۆلیجی یاسا قۆناغی دووەم. مامۆستای مالیە (د. مەجید عزەت) داوای ڕاپۆرتی کرد لەسەر نەوت، منیش لەم کتێبەی کە بڕیاربوو بیسوتێنم ڕاپۆرتەکەم دەرهێنا بە هۆیەوە (٢٠ لە ٢٠) نمرەم وەرگرت، بەهۆی ئەوەوە لەنمرەی کۆتایی ساڵدا من لەمالیەی عامە ٩٩ م هێنابوو لەسەد، کە زۆربەی قوتابییەکان نمرەکەیان لەو وانەیەدا لە ٧٠ تێنەپەڕی بوو.

## ئیسـقاتی

## ژنەکەی حاجی سەید ئاغا

هەندێك لەزاناکان فەرموویانە: "کەسێك بمرێت، نوێژ و ڕۆژووی فەوتاوی لەسەر بێت یان درۆی کردبێت، یان سوێندی ناحەقی خواردبێت، ئەتوانێت لەپێش مردنیدا وەسیەت بکات هەندێ پارە یان شتی تر لەمیراتیەکەی بکەن بەئیسقات بۆ کەفارەتی ئەو گوناهانە، بیدەن بەفەقیر و هەژاران"، ئەم فەتوایە ئەگەر ڕاست بێت ئەوا جێبەجێکردنەکەی ڕاست نیە، چونکە فرت و فێڵی تێدا دەکرێت وەك لێرەدا دەیخەمە ڕوو:

لەماڵێك هەندێ خشڵی زیو یان ئاڵتون ئەخوازن، دواتر کۆمەڵێك مەلا دێن، یان مەلایەك و کۆمەڵێك فەقێ، بەحەلقە دادەنیشن، ئەوەیان کەخشڵەکە یان پارەکەی لایە دەیدات بەیەکەم کەس و پێی دەڵێت: من ئەمە ئەدەم بەتۆ لەبری کەفارەتی نوێژی فەوتاوی فلانە کەس (ناوی مردووەکە دەهێنن)، ئەویش ئەڵێت: وا قبوڵم کرد و وا دامەوە بەتۆ، هەر بەمجۆرە تا حەلقەکە تەواو ئەبێت، پاش ئەوە دووبارە بەسەریاندا دەگەڕێتەوە ئەمجارە بۆ کەفارەتی ڕۆژووی فەوتاوی، جارێکی تر بۆ درۆکانی، جارێك بۆ سوێندی ناحەقی، پاشان خشڵەکە ئەدەنەوە بەخاوەنەکەی و پارەی ئیسقاتەکە دابەش دەکەن بەسەرخۆیاندا، ئەم جۆرە کەفارەتە دروست نیە و جێگەی خۆی ناگرێت لەبەر ئەم هۆیانە:

١- ئەو خشڵەی کەئەیخوازن نابێت بەموڵکی مردووەکە، ئەگەر بەخشیش بێت مرۆڤ لەپاش مردنی هیچ نابێت بەموڵکی.

٢- ئەم جۆرە کردەوەیە فێڵی تێدایە، چونکە ئەم ئەیدات بەئەو، ئەویش ئەیداتەوە بەئەم، شت کەبدرێت بەکەفارەتی گوناه نابێت بدرێتەوە بەخاوەنەکەی.

٣- کەفارەت بۆ هەژار و فەقیر دانراوە، لەو شوێنە کەئەو ئیسقاتەی تێدا دەکرێت کەسی تێدایە گەلێ هەژارترە لەو مەلا و فەقێیانە، چونکە مەلا و فەقێ زۆرکەس یارمەتیان ئەدات، بەڵام ئەو هەژارە لەوانەیە کەس نەبێت یارمەتی بدات.

٤- مامۆستای ئاینی پێشەوای ئیسلامە، ئەم کارەش لەگەڵ پایە و رێزی ئەودا یەکنا گرێتەوە، لێرەدا هەندێ نمونە باس دەکەم:

رۆژێك لە حوجرە دەرسم دەوتەوە، فەقێیەك هات وتی: لە خانەقای مەولانا خالید مامۆستاکان کۆ بوونەتەوە و هاتوم بەدوای تۆدا کە بچیت بۆ ئەوێ، وتم: خێرە؟ وتی: بەڵێ خێرە، ئیسقات دەکەن بۆ ژنەکەی حاجی سەید ئاغا، کە یەکێکە لە دەوڵەمەندەکانی سلێمانی، کاتێك چووم بینیم چی مامۆستای شارەکەیە هەمووی دانیشتووە، جەنازەی خوالێخۆشبوو لە هەیوانی مزگەوتەکە دانراوە قورئانی لەسەر دەخوێنن.

کاتێك وتیان با نوێژی لەسەر بکەین مەلاکان بەجارێك بەپێ خاوسی ڕووەو جەنازەکە بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین رۆشتن، لەو کاتەدا سەرنجم دا متصرف و مدیری مەعارف لەگەڵ خەڵکەکە دانیشتبوون دەستیان کرد بە پێکەنین. ئەمە زۆر کاریگەر بوو لە دڵمدا چونکە مانای ئەم پێکەنینە ئەوەیە مامۆستاکان بۆ دەوڵەمەندەکان سەریان پێوە نیە، بەڵام بۆ هەژارێك لە حوجرەکەی خۆیان نایەنە دەرەوە و لەرێی خوادا دوای جەنازەی هەژار بکەون و بچن بۆ سەر قەبران.

هەرچی مێژەر بەسەر هەیە لە سلێمانیدا کۆبۆتەوە بەدەور و پشتی جەنازەی خێزانی حاجی سەید ئاغادا، یەکێ نوێژی لەسەر دەکات و یەکێ قورئانی لەسەر دەخوێنێ، کاتێك جەنازەکەیان برد بۆ سەر قەبران هەموو دوای کەوتن، منیش لەداخی پێکەنین بە مامۆستاکان لەلایەن متصرف و مدیری مەعاریفەوە گەڕامەوە مزگەوتەکەم.

ڕۆژی دواتر مامۆستا مەلا عبدالله کریچنەیی کە مزگەوتەکەی نزیک بوو لێمەوە، هات بەدوامدا وتی: بابچین بۆ خانەقا بۆ ئیسقاتەکە. منیش وتم: من نایەم، بەزۆر لەگەڵ خۆی بردمی، ئیسقاتەکەمان کرد. هەروەك ئەوەی لەگەڵ مەلا حمە ئەمینی قاجری لە ساڵی ١٩٤٢ کردمان، هەر مەلایەك (دینار و نیوێك)یان پێدا، کاتێك گەڕامەوە ماڵەوە لەڕێگە لەسەر دوکانێك دیم ئافتاو و لگانێك دانراوە، وتم بە خاوەنەکەی ئەوە بەچەندە؟ وتی دینار و نیوێك، وتم: ها بگرە. بەخوا نابێت ئەو پارەیە بچێتە ماڵی من، لە پاشان چومە مزگەوت دەست نوێژم گرت و چومە حوجرەکەم، قورئانەکەم داگرت وتم: قورئان بەساحێبی تۆ بەمانای تۆ سوێند ئەخۆم تا ماوم فلسێکی ئیسقات ناخۆم، ئەگەر هەموو ماڵ و منداڵم لە برسانا بمرن بە پارەی ئیسقات زیندو ببنەوە، جارێکی تر ئیسقات وەرناگرم.

## ئیسقاتی

## دەروێشەکەی قەرەداغ

ڕۆژێکی پێنج شەممە دایکی محمد پێی وتم: (٥٠) فلسمان بۆ پەیدا بکە بیدەین بە گۆشت، چونکە سلێمانی ئەو کاتە لە شەوی هەینی دا هەرماڵێك بەپێی توانای خۆی چێشتی باشی لێدەنا، وتی: هەموو جارێك دایکی حاجی (ت.ف) دەڵێت تۆ بامێی لادێیانە لێدەنێیت واتە: بامێ بەبێ گۆشت. وتم: نەك درهەمێك، فلسێکم نیە و بۆتان قەرز ناکەم.

لەو کاتەدا فەقێیەك هات وتی: مەلا عبداللە کربچنەیی ئەڵێت با بێت بۆ مزگەوتی ئێمە. منیش کاتێك چووم دیم مامۆستا مەلا سەید عارف و مامۆستا مەلا سەید غەفور و مامۆستا مەلا مارفی خاوێی لای مەلا عبداللە دانیشتوون، ئەم پێنج مامۆستایە زۆر پەیوەندیمان بەیەکەوە هەبوو.

مەلا عبداللە وتی: دەروێشێکی شێخ عبدالکریم کربچنە لە قەرەداغ مردووە (١٨دینار)یان ناردووە من لێرە بیکەم بە ئیسقات، چونکە (مەلا عبداللە) ش مریدی ئەو شێخە بوو. وتی: ١٥ دیناری بۆ ئێمە یەکی سێ دینار، سێ دینارەکەی تریشی دەدەین بە فەقێیەکان.

منیش وتم: بەشداریتان ناکەم لەم ئیسقاتەدا، ئێوە خۆتان بیکەن، پارەکەش بەسەر خۆتاندا دابەش بکەن، من ئیسقات ناخۆم.

وتەکەی منیان زۆر پێ عەجایب بوو، چونکە لەو ڕۆژەدا مامۆستای ئاینی نەبوو بڵێ من ئیسقات ناخۆم، یان من نەمبیستووە، بە تایبەتی ئەگەر

دەستکورت بوویێت. زۆریان هەوڵ دا من نەچومە ئەڵقەی ئیسقاتەکەوە بۆ ئەوەی دەروێشەکە لە هەموو گوناهێکی پاك بکەینەوە بە (١٨) دینار.

مەلا عبدالله (١٨) دینارەکەی خستە دەستە سرێکەوە یەکە یەکە دەیدا بە ماموٚستاکان دەیوت ئەوا دام بەتۆ لە کەفارەی نوێژ و رۆژوی فەوتاوی دەروێش و سوێندی ناهەقی و هەر درۆ و دەلەسەیەك کردویەتی لە ژیانیدا و هەر کردەوەیەکی خراپ. ئەویش دەیوت: ئەوا قبوڵم کرد ئەوا دامەوە بەتۆ. ئینجا ئاوا یەکە یەکە دەیدا بە ماموٚستایەك و ئەویش قبوڵی دەکرد و دەیدایەوە بە مەلا عبدالله، بەو (هەژدە دینارە) دەروێشیان کرد بە پەپولەی بەهەشت.

لە دواییدا وتیان: هەرچەندە تۆ بەشداریت نەکرد لەم ئیسقاتەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەش (سێ دینارەکەت) دەدەینێ.

وتم: با پێتان بڵێم، بەخوا ئیستا هاتم لەماڵەوە داوای درهەمێکیان لێکردم بۆ خواردن نەمبوو، ئەگەر هەموو ماڵ و منداڵم بمرن لەبرساندا من فلسێك وەرناگرم.

ئینجا سێ دینارەکەیان خستە چاکی عەباکەم، منیش عەباکەم گرت و پارەکەم فرێ دایە دەرەوە، یەکێ لە ماموٚستاکان هەڵی گرت و خستیە گیرفانیەوەو وتی: (ماڵی خۆنەخۆر بۆ چەکمە بۆر).

ئەو ماموٚستایە پیاوێکی زۆر مەرد و زۆر خانەدان و زۆر (سەخی) بوو، بەڵام لەو رۆژەدا لە هەموو عێراقدا یەکێك نەبوو لە مەلا و فەقێ کە خواردنی ئیسقات بە حەڵاڵ نەزانێ، بزانێت کە ئەمە نە لە قورئاندا نە لە فەرمودەکانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) نە لە زەمانی (خلفاء الراشدین)دا نەبووە، کە هەموویان سەرچاوەی ئیسلامن.

## مردنی ئەحمەدی کوڕم

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾.[١]

واتە: پێویستە لەسەر دایکان خۆیان شیر بدەن بە منداڵەکانیان تا تەمەنی دوو ساڵ تەواو دەکات.

**ئەم فەرمودەی خوا لەبەر ئەم هۆیانەیە:**

١- ڕوون بۆتەوە بۆ پزیشکان کەشیری دایك بۆ لەش ساغی منداڵەکە زۆر زۆر باشترە لە هەموو جۆرە شیرێکی تر. چونکە ئەو خۆراکەی منداڵەکە پێویستی پێی هەیە چەند جۆرە خوێ و ڤیتامینی تێدایە و دەیپارێزێ لە چەند جۆرێك نەخۆشی.

٢- لای زانایانی دەروون زانی (علم النفس) ڕوون بووەتەوە کە شیردانی دایك گەلێك بایەخی بۆ منداڵەکە هەیە لە پاشەرۆژدا کە گەورە دەبێت و کاریگەری دەبێت لەسەر شێوازی هەڵس و کەوتی ئەو منداڵە لەناو کۆمەڵدا، چونکە زۆر جیاوازە کاتێك دایك شیر دەدات بە منداڵ و لەبەردەم چاوی خۆی دەبێت، لەگەڵ ئەوەدا کە شیری مانگا یان مەڕ یان شیری وشك بدرێت بە منداڵەکەو لە سوچێکی ماڵەکەدا دابنرێت کەس نەبێت لە دەور و پشتی، هەر لەو کاتەوە ئەو منداڵە هەست بەوە دەکات کە فڕێ دراوە و بایەخێکی نیە، کە ئەمە بنچینەیەکە لە پاشەرۆژدا ئەو منداڵە ببێت بە مرۆڤێکی ڕوو گرژی تورە.

---

(١) سورة البقرة: ٢٣٣.

٣- زانایانی ئایینی ئیسلام بۆیان ڕوون بووەتەوە کە شیری دایك بنەمای ڕەوشتی جوانە، لەبەرئەوە هەندێك دەفەرموون ئەگەر دایك ڕەوشتی جوان نەبوو نابێت شیر بە منداڵەکەی بدات، نەوەك ئەوە بەمیرات بچێت بۆ مناڵەکە.

هەروەها خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ ﴾.

واتە: لەسەر باوکی منداڵەکە پێویستە هەموو پێویستیەکانی ژیانی دایکەکە ئامادە بکەن وەك خواردن و جێگەی پاك، چونکە شیری دایکەکە خواردنێکی تەواوە بۆ ئەو منداڵە پێی بژی.

لەبەرئەوە شیرەکەی دایکی ئەحمەد زۆر کەم بوو، ئەحمەد تێری پێ نەدەخوارد، دیارە باوکی ئەحمەد - کە مەلای مزگەوت بووم - نەیدەتوانی ئەو پێویستیانە بۆ دایکی ئەحمەد ئامادە بکات، بۆیە زۆر جار تۆزێك شەکرمان دەکردە ناو ئاوی گەرمەوە و دەمان دایە، بەڵام هیچ سودی نەبوو، زۆرجار لە برساندا هەتا بەیانی دەگریا.

من کە موچەکەم (٥ دینار و نیو) بوو سەری مانگ (١٠٠) فلسم بۆ نەدەمایەوە بیدەم بە قتوە شیرێك، چونکە دوو دینارم دەدا بەکرێ خانوو، سێ دینار و نیوەکەی تر هەر بەشی شتە پێویستەکانی دەکرد بۆ ماڵەوە چونکە زوو زوو میوانم دەهات، منیش لە دوکان شتم دەکڕی بە قەرز سەری مانگ دەمدایەوە، لەگەڵ ئەوەش ماڵی باوکم یارمەتیان دەدام، هەر نەمدەتوانی مانگی (٣٠٠) فلس بدەین بەسێ قتو شیر بۆ ئەحمەد.

کاتێك بینیمان ئەحمەد ووشك بووەتەوە بردم بۆ لای دکتۆر (هاشم دوغرمچی) کە ئەوکاتە بەڕێوەبەری تەندروستی بوو، کە سەیری کرد وتی: ئەم مناڵە هیچ نەخۆشیەکی نیە بەڵام لە برساندا وای لێهاتووە.

دوای ئەوە چووم (١٠٠) فلسم قەرز کرد دام بە یەك قتو شیر، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو ووشك ببوەوە رۆژی دوو سێ جار شیرەکەمان دەدا بە مناڵەکە. پاش ئەوە هەموو گیانی ئاوسا.

پاش سێ ڕۆژ، لە حوجرەی فەقێیەکان دەرسم دەوتەوە، ژنی دراوسێکەمان هات بۆ حوجرە، هەر لە دوورەوە ژنەکەم دی زانیم ئەحمەد مردووە.

کاتێک ئەحمەدیان لە گۆڕەکەدا دانا، ئاواتم ئەوە بوو کە منیش لەگەڵ ئەودا بمرم، چونکە ستەمێکی زۆرم لەو کرد، لە مناڵەکانی تریشم، کە ڕێگەی مەلایەتیم گرت و ژیانی خۆم و مناڵەکانم کەوتە سەر زەکات و سەرفیترە و ئیسقات و سەرقەڵەمانە.

# پرسیاری ناهەموار و وەڵامی نالەبار

کاتێك کە بازرگانەکانی گەڕەکەکە ئەچون بۆ بەغدا بۆ شت کڕین، کە ئەگەڕانەوە هەندێك لە خەڵکی گەڕەکەکە شەو ئەچوون بۆ ماڵیان بۆ بەخێر هاتنەوە، چونکە ئەو کاتە زۆر گرنگ بوو یەکێك بچێت بۆ بەغدا و بێتەوە، وەك چووبێت بۆ ئەمریکا و هاتبێتەوە وەها بوو.

لەو جۆرە دانیشتنانەدا باسی هەموو جۆرە شتێك دەکرا وەك ئایین و بازرگانی و شتی تر، خوالێخۆشبوو (کاك عومەر) پێی ئەوترا (عومەری ئایشەخان) خوشکەزای حاجی مارف بوو، لە پیاو ماقوڵەکانی گەڕەکەکە بوو، (مدیری تحریرات) بوو، کوڕێکی چاك بوو، بەڵام لە بیروباوەڕیدا بە ئایین زۆر باش نەبوو، ئینجا هەندێ جار لە دانیشتنەکاندا پرسیاری سەیر سەیری دەکرد. وەك ڕەخنە وا بوو لە بابەت ئاینی ئیسلامەوە.

ڕۆژێك لە ماڵی خاڵی دانیشتبووین، پرسی: مامۆستا ئەوە بۆچی خوا ئەوەندە باسی شەیتان ئەکات لە قورئاندا؟ منیش وەڵامێکی نالەبارم دایەوە، پێم وت: لەبەرئەوەی لە هەموو دانیشتنێکی ئاوا شەیتانێکی وەك تۆی تیایە.

هەرچەندە لەو کاتەدا هەبوو وەڵامەکەی زۆر پێ خۆشبوو، بەڵام خۆی و خاڵی زۆریان پێ ناخۆش بوو، بەڕاستی وەڵامەکەم ناشرین بوو.

ئێستا ئەگەر ئەو پرسیارەم لێ بکەنەوە دەڵێم: مەبەست لە شەیتان ئەوە نیە کە ئادەمی لە بەهەشت کردە دەرەوە، بەڵکو هەر مرۆڤێك شەیتانی تایبەتی خۆی

هەیە هەردەم وا لەگەڵیا هەمیشە هانی دەدات بۆ شتی خراپ، وەك خوا لە قورئاندا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ ﴾.(١)

ئادەمیزاد لەنێر و لە مێ خوا دوو هێزی بۆ دروست کردوون، یەکێکیان پاڵی پێوە دەنێت بۆ چاکەکردن ئەوی تریان پێی ئەوترێت -النفس یان شەیتان- هەردەم هانی ئەدات بۆ خراپە، ئەم دوانە وەك شالیار -وەزیر- وان بۆ سەرۆکێك کە پێی ئەوترێت عەقڵ، هەریەك داوای لێ دەکات کە ڕێگەیەك بگرێت پێچەوانەی ڕێگەکەی تر.

خوای گەورە باسی ئەم دوو هێزەی کردووە و دەفەرمووێ:

﴿ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾ ﴾.(٢)

واتە: سوێند بەو نەفسەی کە دروستی کردووە هێز و ئامادەیی شەڕ و چاکەی تیا دروست کردووە.

لەم ئایەتەدا مەبەست لە (نفس) ئەو کەسەیە واتە مرۆڤەکە، بەڵام لە ئایەتی پێشودا مەبەست لە هێزی شەڕ و خراپەیە.

جارێکی تر (کاك عمر) پرسی وتی: مامۆستا عەقڵ بڕوا ئەکات کە (توماس أدیسون) کە کارەبای دۆزییەوە و هەموو گۆی زەوی ڕووناك بووەوە بچێتە (جەهەنم)، بەڵام دەروێشێکی شێخ عبدالکریمی کرپچنە پرچی پڕە لە ئەسپێ بچێتە بەهەشت؟

لێرەدا وەڵامێکی ناشیرینم دایەوە، بەڵام لەبیرم نیە، ئەگەر ئێستا وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە، دەڵێم خوا فەرمویەتی:

---

(١) سورة یوسف: ٥٣.

(٢) سورە الشمس: ٧-١٠

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾.[١]

واتە: خوا خۆش ئەبێت لەوەی شەریك بۆ خوا دانەنێت.

لێرەدا دەردەکەوێت ئەوەی شەریك بۆ خوا دانەنێت، خوا لێی خۆش دەبێت با موسڵمان نەبێت، ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت.

---

(١) سورة النساء: ٤٨.

# میوانی هەنار فرۆش

میوان زۆر خۆشە و منیش زۆر میوانم خۆش دەوێت و زۆر ڕێزی دەگرم، هەرکەس بەپێی شانی خۆی، هەردەم ئەو خواردنە بەدڵمەوە نوساوە کەلەگەڵ میوان خواردوومە، هەمیشە لەدەمی ماڵ و منداڵی خۆمم گرتۆتەوە بۆ میوان، زۆرجار شتێکم کڕیوە لەمناڵەکانم شاردۆتەوە بۆ میوان، نزیکەی چل ساڵە وام لەبەغدا، ئەوەی بۆم کرابێت پێشکەشم کردووە بەو کوردانەی لەکوردستانەوە هاتوون و ماڵی منیان بەماڵی خۆیان زانیوە، بەتایبەت ئەوانەی نەخۆش بوون و بۆ سەردانی پزیشك هاتوون، یان ئەو قوتابیانەی بۆ خوێندن ڕوویان کردۆتە زانکۆکانی بەغدا.

بەڵام بەراستی میوانی ناوەخت زۆر ناخۆشە، بەتایبەت ئەگەر تۆ شوێن و جێگەت نەبێت و ئەویش شەو بۆ خەوتن بمێنێتەوە لەماڵت و تواناشت نەبێت خواردنی باشی بۆ بکەیت.

ماوەی پێنج ساڵ لەسلێمانی بووم، دەستم زۆر کورت بوو، خانوی خۆم نەبوو، دوو ژوورم گرتبوو بەکرێ یەکێکیان بۆ دانیشتن و نووستن، ئەویتریان بۆ دار و خەڵوز.

زەڵمییەکانی دێی خۆمان لە پایزدا هەنارەکانیان دەهێنا بۆ سلێمانی دەیان فرۆشت، لە پاشدا لەبەر دواکەوتن و نەزانی خۆیان یان لەبەر هەژاری نەدەچونە ئوتێل دەهاتن شەو لە ماڵی ئێمە دەمانەوە، ئەمە زۆر جار ڕووی دەدا، من لەو کاتەدا دەستکورت بوم، کاتێك کە نوێژی مەغریب رووم دەکردە دواوە دەموت بەنوێژکەرەکان (إستووا واتصلوا رحمکم الله) واتە: ڕێك بوەستن پاڵ بدەن بە

یەکەوە رەحمەتی خواتان لێبێت، تەماشام دەکرد کە بزانم هەنار فرۆشیان تێدا نیە، ئەگەر کەسم نەدیبا نوێژەکەم بەدڵ ئاسودەیی تەواو دەکرد، بەڵام زۆر جار کە لێ دەبوومەوە تەماشام دەکرد ئەوا کۆمەڵە جەواڵێك دانراوە کە هەناریان پێ هێناوە بۆ فرۆشتن.

لەخانوەکە یەك ژورمان هەبوو بۆ نووستن، ئەویش تەرخان دەکرا بۆ میوان، زۆر جار لە زستاندا من و دایکی محمد و محمد لە ژوری خەڵوزدا دەنوستین، عاباکەی خۆمان دەدا بەخۆماندا لەبەر میوان، بەمجۆرە تا لە سلێمانی بووم بەدەگمەن بێ میوان دەبوین، ئەوی نەخۆشی هەبوایە دەهاتە لای ئێمە، ئەوەی هەناری بفرۆشتایە یان گوێز نەدەچونە ئوتێل، ئەمەش نیشانەی نەزانین و دواکەوتن و هەژاریە.

زۆرجار میوانمان ئەهات و شەرمەزار ئەبووین، چونکە هیچمان نەبوو پێشکەشی بکەین، هەندێ جار سوچەکە لەخۆمەوە بوو، تووشی هەرکەسێك ئەبووم ئەموت فەرموو بابچین بۆ ماڵی ئێمە، لەکاتێکدا ئەمزانی هیچمان نیە، بۆ نمونە: ئێوارەیەك لەرێگە تووشی مەلا حەسەنی مەرگە بووم، وتم: فەرموو بابچین بۆ ماڵی ئێمە، مەلا خوا سەلامەتی بکات زۆرجار (نابێ) نازانێت، هاتینەوە بۆ مزگەوت و چوومەوە بۆماڵەوە کەشتێکمان بۆ ئامادە بکەن و ئێوارە بیخۆین، دایکی محەمەد وتی: بەوخوایە هیچمان نیە، منیش لەو کاتەدا فلسێك چی یە پێم نەبوو، وتم: بگەڕێ بەڵکو شتێك بدۆزیتەوە، وتی: یەك گوێڵ برنجمان هەیە بەشی منالێکی شیرەخۆر ناکات، وتم: لێی بنێ و لەقاپێکی بچوکدا بۆی دابنێ و من لەگەڵی ناخۆم، ئەڵێم پارێزم هەیە، کەگەڕاینەوە ماڵەوە هەروەکو وتبووم نانەکەی دانا، ئەوەندە کەم بوو لەشەرمەزاریدا ئارەقەم دەردا، لەدڵی خۆمدا وتم: ئەگەر زبان بڵێت سەر سەلامەت ئەبێت، بۆ ئەوەی تۆزێ لەشەرمەزاریەکەم کەم بێتەوە خۆم لەدایکی محەمەد تورە کرد کەبۆ چێشتی کەمت لێناوە، ئەویش وتی: لەبەر ئەوەی تۆ پارێزتە و بەشەو نان ناخۆیت، منیش ئەوەندەم بەس بوو، دواتر وتی بەمیوانەکە: مامۆستا ئەگەر ئەمزانی تۆ تەشریف دێنی مەنجەڵێك قوبڵی و مریشکم بۆ لێدەنایت.

بەراستی لەژنی باش باشتر نیە، ئەگەر ژنێکی تر بوایە لەبەردەم میوانەکە پێی ئەوتم: هەی مەلا تۆ ئەوەندەت نیە بەشی مشکێك بکات بۆ میوان دێنیتەوە؟

لە پاش راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ کاتێك شارەکانی کوردستان جویٚ بونەوە لە میری و بە سەربەخۆیی دەژیان، حکومەتی هەرێمی کوردستان محمدی کوڕمیان ناردبوو کە من بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، پێم وت: من بە شانازیەوە دەمەوێت خزمەتی گەلەکەم بکەم، بەڵام من ناتوانم لە سلێمانیدا بژیم، چونکە ئەگەر بمێنمەوە دەبێت تەکیەیەك دروست بکەم وەك شێخەکان، دوو ژنی چێشت لێنەر بەکرێ بگرم بۆ ئەوەی شەو و رۆژ چێشت و نان بکەن بۆ میوان، جگە لەوە پیر بووم توانای ئەوەم نیە لە شوێنێکدا بژیم هەردەم دانیشتوەکانی لەناو خۆیاندا پارچە پارچە بن و هەریەکێك حزبێکی تایبەتی دروست بکا و ناچارم بکەن کە دوای یەکێکیان بکەوم و توشی دڵ ئێشان ببم لەگەڵ ئەوانی تر.

## بۆچی کرام بە سەرباز (١٩٥٣)؟

وەك لەمەو پێش باسم کرد، لای مامۆستا مەلا حمە سەعید دێلێژەیی ئیجازەم وەرگرت بۆ ئەوەی نەکرێم بە سەرباز، بەڵام دیار بوو ئەمە کەڵکی نەبوو، دەبوو تاقیکردنەوەی دوانزە پۆلەی خوێندنی مزگەوتم بدایە، ئەو کاتە بەندێك دانرابوو لە یاسای سوپادا بۆ ئەوەی هەرکەس دوانزە پلە (صنف) تاقی بکەنەوە و لەو پلانەدا دەربچێت ناکرێت بەسەرباز، من ئەو تاقیکردنەوەیەم نەکردبوو، لەبەرئەوە دوای ئەوەی چومەوە بۆ زەڵم ناردیان بەشوێنمدا بچم بۆ (دائرة تجنید)ی هەڵەبجە، کاتێك چووم بۆ تجنید، وتیان: ئەوە تۆ شەش ساڵە دواکەوتیت (متخلف)، دەبێت بتکەین بە سەرباز هیچ چارێك نیە، ئینجا منیش چووم بۆ داری کەلی بۆ لای (شێخ محمود) نامەیەکم هێنا بۆ مدیری تەجنید لە سلێمانی کە خزمی ئەو بوو ناوی (شێخ مارفی شێخ حمە غەریب) بوو، ئەویش چاو پۆشی کرد لەو شەش ساڵە وتی: بچۆ بۆ (مجلس علمی ئەوقاف) عەریزەیەك بدە بۆ ئەوەی لەو دوانزە پۆلە تاقیکردنەوەت بکەن، ئەگەر دەرچویت ئەوا بچۆرەوە شوێنی خۆت ئەگەر دەرنەچویت دەتکەن بە سەرباز.

ئەنجومەنی ئەم تاقیکردنەوەیە بریتی بوو لە مامۆستاکەی خۆم مامۆستا مەلا حەمە سەعید و مامۆستا شێخ نوری باباعلی، شێخ مارف قەرەداغی، مأموری ئەوقاف بە سەرۆکایەتی قازی شێخ محمدی خاڵ. ئینجا دوانزە پرسیاریان لێکردم لە دوانزە عیلمدا، کاتێك وەڵامم دانەوە و دام پێیان، بڕوانامەیەکیان دامێ هەموویان ئیمزایان کرد، ئەوقافیش مۆری کرد بۆ دائرەی تەجنید لە سلێمانی. ئیشەکەم کەوتە لای (نائب ضابط)ێك، پێی وتم: تۆ شەش ساڵ (متخلف)

یت، وتم: (مدیری تجنید) بڕیاری بۆ داوم، وتی: ئەگەر لە تاقیکردنەوەکەدا دەرچویت ئەوە شەش ساڵەکە حساب نیە، وتی: ئەوە مخالفی یاسایە.

داوای دەکرد کە دوو بەرە هەنگوینی بۆ بەرم تا بڕوانامەکە بخاتە سەر دەفتەر خزمەتەکەم، دەفتەر خزمەتەکە و بڕوانامەکەم دایە، بەڵام هەنگوینکەکەم بۆ نەبرد و ڕۆشتمەوەو جارێکی تر نەچوومەوە لای بۆ ئەوەی بزانم کە بڕوانامەکەی خستوتە سەر دەفتەر، ئەویش نەیخستبوو، من هەروا بە (متخلف)ی مامەوە بەڵام دائرەی تەجنید داوای نەکردمەوە.

ساڵی ١٩٤٧ز کاتێك کە تۆماری گشتی (تسجیل عام)ی عێراق بوو، ئێمە ماڵمان لە سەرسیان بوو، خانەمان لەسەر ئەوێ بوو، دوای ئەوەی هاتینە سلێمانی (محمد) کاتی ئەوەی هات بچێتە قوتابخانە، دەبوایە خانەکەمان لە سەرسیانەوە بۆ سلێمانی بگوازینەوە، هەر کاتێك کە خانەی یەکێك نەقڵ دەکرێت بۆ شوێنێکی تر دەیدەن بە تەجنید، کاتێك زانیم گواستنەوەی (خانە) دراوە بە تەجنید و من لە ساڵی (١٩٤٢)ەوە متەخەلیفم.

ڕۆژێك لە حوجرەی فەقێیەکان دەرسم دەوتەوە پۆلیسێك هات سەلامی کرد وتی: مامۆستا، فەقێ (مصطفی زلّمی) لەم مزگەوتەیە لای تۆ دەخوێنێت؟ منیش وتم: بەڵێ، وتی: کوا؟ وتم: منم، پۆلیسەکە سەری سوڕما وتی: کەوابوو زەحمەت نەبێ لەگەڵم وەرە بچین بۆ لای مدیری تەجنید. ئەو کاتە مدیری تەجنید (عقید أمین) بوو زۆر توڕە و نالەبار بوو لە جولانەوەدا لەگەڵ ئەوانەی ئیشیان ببوایە بەو دائیرەیە، لەبەر ئەوە پێی ئەوترا ئەمینە شێت.

کاتێك چووم دانیشتم، وتی تۆیت مصطفی إبراهیم، تەماشای وێنەکەی مەلیك غازی کرد، وتی: من بەعەدالەت ئیش دەکەم، ئێستا (سدارە) دەکەمە سەرت و ئەو مێزەرەت پێ فڕێ دەدەم و عاقڵت دەکەم بۆ هەموو مێزەر بەسەرێك، چونکە تۆ (١٠ ساڵە) متخلفیت، لەکوێ خۆت شاردۆتەوە؟

منیش وتم: لە ساڵی ١٩٤٧ تاقیکردنەوەی پۆلی (١٢)ەم داوە، بەیاسای عێراقی من ناکرێم بە سەرباز. وتی: ئەم قسانە ناچێت بە گوێمدا.

فەرمانی دا پۆلیسێك بێت لەگەڵمدا بۆ هەڵەبجە لەوێ بمکەن بە سەرباز، ئەم پۆلیسە ماوەی نەدام بچمەوە بەماڵەوە بڵێم، بردمی بۆ هەڵەبجە، کاتێك چووین بۆ ئەوێ دەوام نەمابوو، وتیان: لەبەر مێزەر و جبەکەی مەیبەنە بەندیخانە با لای ضابط خەفەر بێت.

منیش خەبەرم نارد بۆ (شێخ محمدی قەرەداغی) کە ئەو کاتە ئیمام و (خطیب) بوو لە مزگەوتی پاشا پێش ئەوەی بێتە سلێمانی، بۆ ئەوەی بێت ببێت بە کەفیلم شەو لەو جێگەیە نەمێنمەوە، چونکە ئەوم بە برادەر و دڵسۆز زانی، بەڵام نەهات، ئیتر نازانم هۆکەی چی بوو.

لە پاشاندا هەواڵم نارد بۆ مامۆستا (مەلا محمدی عەبابەیلیێ) کە لەوێ مەلا بوو، لە پاش نیو سەعات هات و منی دی، وتی: بۆچی هاتویتە ئێرە. باسەکەم بۆ گێڕایەوە، ئینجا بە ضابط خەفەری وت: ئەمشەو دەیبەمە ماڵی خۆمان، وتی: ناتوانیت.

مامۆستا وتی: ئەگەر ئەمشەو لێرە بێت، ئێستا دەچم چی مەلا هەیە لە هەڵەبجەدا هەموویان دەهێنمە ئێرە، یان دێتە دەرەوە یان هەمومان لێرە دەمێنینەوە، پاشان رازی بوو، منیش لەگەڵ مامۆستا چووم بۆ ماڵیان شەو لەوێ بووم.

بەیانی بردمیە لای (قائمقام) وتی: ئەمە باشترین مەلایە لە سلێمانی، ئێوە چۆن دەیکەن بە سەرباز؟ وتی: بە (ضابط تجنید) بڵێ بزانە رێگەیەکی بۆ بدۆزەرەوە، ئەویش وتی: ناتوانم، چونکە ئەم بەیانیە زوو مدیری تەجنیدی سلێمانی تەلەفۆنی بۆ کردم وتی: زوو جل و پۆستاڵی لەبەر دەکەیت و جبە و عەباکەی لا دەبەیت و دەینێریتەوە بۆ سلێمانی.

دووبارە بە پۆلیسێکدا منیان ناردەوە بۆ سلێمانی، هەموو پێویستییەکی سەربازییان تەواوکرد، وتیان: هەموو بەیانیەك برۆ بۆ تدریب پێش هەتاو کەوتن، منیش هەموو بەیانیەك دەچوومە مزگەوتەکەی کانی ئاسکان کە نزیکی شوێنی (تدریب) بوو جلەکانم دەگۆڕی، لەوێ فێری (یەسیەم)یان دەکردم، ئەو هەموو

فەقێیەم هەبوو هەموو بەبێ دەرس مابوونەوە، چونکە مامۆستاکەیان فێری (الی الوراء در) دەکرا.

شایەنی باسە پۆستاڵم نەبوو قۆنەرەی سورم لەپێدا بوو، عەریف ئەمین، کە پێیان ئەوت ئەمینە شێت، مەشقی پێ دەکردین، بەیانیان کە دەهات یەکەم شت تەفتیشیان دەکردین تا بزانن قیافەتمان چۆنە، کە گەیشتە سەرەی من وتی: ئەوە بۆ قۆنەرەکانت سورن؟ وتم: نە قۆنەرەی رەشم هەیە نە بۆیاخی رەش، من مەلام بە نارەوایی منیان هێناوەتە ئێرە، وتی: من ئەوە نازانم مەلا، بەیانی بە قۆنەرەی رەشەوە دێیتە ئێرە. منیش چووم پەرۆیەکی کۆنم هێنا سریم بەرەشی مەنجەڵی چێشتەکەدا و هێنام بە قۆنەرەکاندا و بۆیاخی رەشم کردن. بەیانی کە چووم بۆ تدریب ناو ساحەکە ئاوەنگ بوو، کاتێك بەناو ئاوەنگەکەدا رۆشتم هەموو رەشیەکانی لێ بۆوە بووەوە بە سور.

ئەمینە شێت هات وتی: مەلا پێم نەوتیت بە پێڵاوی سورەوە نەیەیت بۆ تدریب، وتم: واللە رەش بوو بەیانی کە هاتم بە ئاوەنگەکەدا بووەوە بە سور، وتی: ئەمجارە قەیناکە بەڵام جارێکی تر سزات دەدەم.

کاتێك لێ بوومەوە چووم بۆ لای (امر مرکز التدریب) خوا لێ خۆشبوو رائید خەسرەو پیاوێکی باش بوو، باسی بەسەرهاتی خۆمم بۆ گێڕایەوە، وتم: پێنج رۆژ ئیجازەم بدەرێ تا خۆم دەگەیەنمە بەغدا، چونکە من بڕوانامەم هەیە بەپێی یاسا ناکرێم بە سەرباز، وتی: تۆ ئەوە سێ رۆژە بوویت بەسەرباز، هیچ کەس ناتوانێت کاتژمێرێك پشوت بداتێ، بەڵام لەسەر (مەسئولیەتی) خۆم (٧) رۆژ ئیجازە دەدەم بەتۆ برۆ ئیشی خۆت بکە.

چووم بۆ تەجنید و بەدوای بڕوانامەکەم دا گەڕام نەمدۆزیەوە، لەبەرئەوە چووم لە دائیرەی ئەوقاف دەرم هێنا، نوسخەیەکم وەرگرت و مۆریان کرد، عەریزەیەکم دا بەمدیری تەجنیدی عام، لە هەمان کاتدا (مەزبەتە)یەکم کرد و مەلاکانی شارەکە ئیمزایان کرد، بردم بۆ (عومەر عەلی)، کە ئەو کاتە متصرف (محافظ)ی سلێمانی بوو، یەك دوو مەلای باش هاتن لەگەڵم، عومەر عەلی

وتی: بۆچی سەربازی ناکەیت؟ وتم: لەبەرئەوەی مەلام و دەرس دەڵێمەوە، وتی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆی سەرباز بووە تۆ لە پێغەمبەر گەورەتریت. مەلاکان وتیان: کەڵك و سودی بۆ گەل و ئایین و ئیسلام زۆرترە کە مەلا بێت لەوەی بچێت دوو ساڵ سەربازی بکات.

(الاجازة العلمية)

العدد / ١١٨

تشكل المجلس العلمي السليماني في يوم ٧/ ١/ ١٩٤٧ برئاسة القاضي السيد محمد الخال وبحضور مامور اوقاف السليمانيه السيد محمد علي الخليفه والاعضا ٠ السيد معروف القرداغي والسيد محمد سعيد والشيخ نوري بابا علي للنظر في امر اختبار السيد مصطفي ابراهيم من مواليد / ١٩٢٤ ولدى النظر في الاوراق ظهر ان المومى اليه قدم عريضه بتاريخ ٤/ ١/ ١٩٤٧ طالبا ان يجيز المجلس العلمي في العلوم العقليه والنقليه ٠ ولدى الاختبار تبين انه عالم فاضل ونجح في الامتحانات التحريريه والشفويه وفاز بـ (١٣٢) درجه من مجموع (١٥٠) درجه ٠ فعليه وبنائا على الفقره (ب) من الماده (٦) من تعليمات مديرية التجنيد العامه المرقمه (م ٠ ت/ ع/ ٨٨٠٥) والمورخه في ١٥/ ١٠/ ١٩٤٥ ٠

قرر بالاتفاق اعطاء الشهادة لكونه عالما ٠

حرر ليوم ١٥/ صفر/ ١٣٦٦ ٠ والمصادف ٧/ ١/ ١٩٤٧ ٠

مامورية اوقاف السليمانية
الرئيس
المجلس العلمي

| العضو | العضو | العضو | العضو | رئيس المجلس العلمي |
|---|---|---|---|---|
| الشيخ نوري بابا علي | السيد محمد سعيد احمد | الشيخ معروف القرداغي | مامور الاوقاف | الشيخ محمد الخال |

الجمهورية العراقية
مامور اوقاف السليمانية
العدد
التاريخ ٢٦/ ١٠/ ١٩٦٦

هەر چۆنێك بوو قەناعەتیان پێ کرد کە کتابێکم بداتێ بۆ بەڕێوەبەری تەجنیدی عام، ئینجا خوا لێخۆشبوو (أحمد فهمی) دراوسێمان بوو، زۆر پەیوەندی هەبوو لەگەڵ قازی یەکەمی بەغدا (قازی شێخ عبدالحمید ئەتروشی)، نامەیەکی ئەوم برد بۆ قازی لە دادگا (محکمة) وتی: سبەینێ سەعات ٨ی بەیانی لە بەردەرگای وەزارەتی دیفاع چاوەڕوانم بکە.

ڕۆژی دوایی لە کاتی دیاریکراودا قازی هات و بردمی بۆ لای مدیری تەجنیدی عام و پێی وت: ئەم مەلایە باشترین مەلای سلێمانیە، بڕوانامەی هەیە، بەپێی یاسای سوپا ناکرێت بەسەرباز، لەگەڵ ئەوەش مدیری تەجنیدی سلێمانی بەرقدا کەوتووەو کردویەتی بە سەرباز.

ناردی دوو چاییان بۆ هێناین، تا چاکانمان خواردەوە فەرمانی دەرکرد بە بەتاڵ کردنەوەی سەربازیەکەم، کتابیان دامێ کە بۆ مدیری تەجنیدی سلێمانی بەرم، کە کتابەکەم برد بۆ (عقید أمین) زۆر خەجاڵەت و شەرمەزار بوو، بچوایەتە هەر شوێنێك لە سلێمانی سەرزەنشتیان دەکرد، ڕۆژێك لەماڵی مەلامەحمودی بێخود بووین هات، مامۆستا بێخود لەسەر ئەو هەڵس و کەوتەی لەگەڵ منی کردبوو زۆر قسەی پێوت، بەجۆرێك من لای خۆمەوە شەرمم ئەکرد ئەوەندە قسەی پێ وت، لەبەردەم ئەو هەموو میوانەی لەدیوەخانەکەیدا بوون پێی وت: ئەمین ئەگەر پیاو بویتایە ئاوا تەصروفت لەگەڵ ئەم مەلادا نەدەکرد کەلەمەلا هەرەباشەکانی شارەکەمانە، ئەویش سەری داخستبوو هیچ وەڵامی نەدایەوە.

# یەکەم ئیجازە

لە ماوەی (١٩٤٩-١٩٥٥ز) کە لە سلێمانی مەلا بووم و دەرسم دەوتەوە پێنج فەقێ لەلام خوێندنیان تەواوکرد و ئیجازەی مەلایەتیان وەرگرت، هەرچەند من خۆم ئەوەم پێخۆش نەبوو کە ئیجازە بدەم، چونکە نەگەیشتبوومە ئەو پلەیە، بەو فەقێیانەی کەئیجازەم پێدان دەموت بچن بۆ لای (مامۆستا مەلا عبدالکریم مدرس) ئیجازەکەتان وەربگرن، ئەوانیش وتیان لای تۆ خوێندنمان تەواوکردووە و لای تۆیش ئیجازە وەردەگرین.

**ئەو فەقێیانەش ئەمانە بوون:**

١- مەلا سەید ئەحمەد نوڵچکەیی.

٢- مەلا سەید محەمەد چنگیانی.

٣- مەلا عبدالرحمن موکریانی.

٤- مەلا محەمەد موکریانی.

ئەم دووانەی دواوە بەیەکەوە لەیەك ڕۆژدا ئیجازەیان وەرگرت.

٥- مەلا ڕەشیدی بزەینانی.

یەکەم کەس کە ئیجازەی وەرگرت لە لام مەلا سەید ئەحمەد نوڵچکەیی بوو کە فەقێیەکی زۆر تێگەیشتوو بوو زۆر بە ئەدەب و بە شەرم و حەیا بوو، ئێستا وا لە قەڵادزێ مەدرەسەیەکی هەیە دەرسی فەقێی تیا دەڵێتەوە وەك زەمانی کۆن.

ئەم یەکەم ئیجازەیە دانیشتوانی گەڕەکەکە زۆر بایەخیان پێدا، چوون مێزەر و جبەیان هێنا بۆ مەلا سەید ئەحمەد، زۆر پیاو ماقوڵی شارەکەیان بانگ کرد.

کاک محەمەدی ماموستا مەلا کریم ئەدیبێکی گەورەی کوردە شانازی پێوە دەکرێت ئەو سەرپەرشتی رێکخستنی ئاهەنگەکەی کرد، (مکبرە)یەکمان لە دەرگای حوجرەی دەرس وتنەوە دانا بۆ ئەوەی چەند وتارێك لەوێدا بوترێت و دەنگەکە بگاتە دانیشتوانی ئاهەنگەکە.

یەکەم کەسێك کە وتاری خوێندەوە کاک محەمەد بوو، کە وتارەکەی زۆر پڕ مانا بوو.

کاک محمد وتی: مەلا لەجێگەی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) نوێنەری ئەوە، پێغەمبەر لە دوو لاوە ئیشی دەکرد بۆ موسڵمانان لە لایەنی ئاینیەوە وەك پێغەمبەرێك، لەلایەنی دونیاوە وەك سەرۆك دەوڵەتێکی ئیسلامی، بەڵام زۆربەی مەلاکان ئاگایان لە کۆمەڵ نیە نازانن چی هەیە و چی نیە، تەنیا ئیش و کاریان بووەتە ئەوەی چوار رکات بەرنوێژی دەکەن لە مزگەوتەکەیاندا، ئەگەر موچەیان نەدەنێ نایەنە مزگەوت ئەو چوار رکات نوێژەش ناکەن.

لەم کاتەدا مەلا (م.ر)، کە هەردەم سەرەتابوو لە کێشە دروست کردنی شارەکەدا، هەڵسایەوە وتی دەی مەلایان با بچینە دەرەوە، کە هەڵسا شەش حەوت مەلا دوای کەوتن، لەو کاتەدا (ماموستا سەید غفور) پیاوێکی زۆر مەرد و ئازا بوو، بانگی کردن و وتی: (وامتازوا الیوم أیها المجرمون)، واتە: جیا ببنەوە لەوانەی کە باشن و حەز لە کردەوەی باش دەکەن ئەی تاوان کارەکان.

بەم شێوەیە هەندێك مەلا کە هەردەم ئارەزوویان تێکدانی ئیش و کاری خەڵکی بووە، ئاهەنگی ئیجازەکەیان تێك دا و مەجلسەکەیان بەجێ هێشت.

بەداخەوە هەردەم ئەوانەی کە خورافات و شتی هیچ و پوچ پەسەند ئەکەن گەلێك زۆرترن لەم جیهانەدا لەوانەی کە هەوڵ و کۆشش دەدەن بۆ دەرخستنی راستی و راستەقینە.

ئەم ئیجازەیە یەکەم هەنگاو بوو کە وای کرد هەندێك لەمەلاکان لە پاشەرۆژدا لە دژم وەستان، خوای گەورەش ئەو کردەوەی ئەوانی کرد بە مایەی کامەرانی و بەختەوەریم، کە ئێستا تیایدا دەژیم و گەیاندمیە ئەم پلەیەی ئێستا بە بڕوانامەی مەلایەتیەوە -٧- بڕوانامەم هەیە، وە پلەی پرۆفیسۆریم هەیە لە زانستدا.

ئێستا کە تەمەنم (٧٧) ساڵە هەرچەند بیر دەکەمەوە من لە (زەڵم) بەهۆی (عبدالله خان)ەوە دەربەدەر بووم، ئینجا لە سلێمانی بەو جۆرە بوو کە باسم کرد، ئێستا گەیشتمە ئەوەی ببم بە ماموستای زانکۆ، ئەوەی دەمناسێت ئەوەندە ڕێزم لێ دەگرێت خۆم تەریق دەبمەوە.



## ژیاننامەی مامۆستا
## مەلا سەید ئەحمەد نۆڵچکەیی
(ناسراو بەمەلا پەپوولە)


مامۆستا مەلا سەید ئەحمەد نۆڵچکەیی

مامۆستا سەید ئەحمەد ناوی (احمد عبدالفتاح محمد مستەفا) یە، لەدایک بووی ساڵی ١٩٢٦ھ لە گوندی نۆڵچکە لەناوچەی مەرگە.

مامۆستا سەید ئەحمەد کەسێکی ناودارو خاوەن کەسایەتیەکی گەورەو مامۆستایەکی شارەزا لەهەموو زانستەکان و هەمیشە خاوەن مزگەوت و حوجرەو فەقێ بووە.

زۆربەی زۆری مامۆستایانی پشدەرو بیتوێن و مەرگە و هەتا ئێرانیش سودیان لە زانستی مامۆستا وەرگرتووە.

وەك مەلایەتی لەهەر شوێنێك بوبێ مزگەوت و حوجرەو فەقێ و تەدریسی هەر هەبووە، سەروەت و سامانی ئەو علم و زانست و زانیاری بوو.

لەبەر بێ نەفسی و خۆ بەکەم گرتنی خەڵك نازناوی (مەلا پەپولە)یان لێ ناوە و بە مەلا پەپولە مەشهور بووە.

ماموّستا سەید ئەحمەد لەلای زۆر ماموّستا خوێندویەتی لە وانەش ماموّستای ڕەش و ماموّستای پایە بەرز جەنابی ماموّستا ملا عبدالکریم المدرس و ماموّستا مستەفا زەڵمی.

ئیجازەی علمیەکەی یا ئیجازەی مەلایەتیەکەی بەدەست و پەنچەی ماموّستا محمد کوڕی جەنابی ماموّستا مەلا عبدالکریم مودەریس لەساڵی ١٩٥٣ نوسراوەتەوە، لەمزگەوتی (بن تەبەق) لەسلێمانی ڕۆژی هەینی بەئامادە بوونی خەڵکێکی یەکجار زۆر لەزانایان و خەڵکی کەسایەتی و جەماوەری شار ئیجازەکەی پێدراوەو ئەوەش یەکەم ئیجازەی ماموّستا مستەفا زەڵمی بوو کە بە ماموّستا سەید ئەحمەدی بەخشی.

ماموّستا سەید ئەحمەد زۆری تەمەنی ژیانی خۆی وەك مەلایەتی لەسۆفیان و هەڵۆنە و نۆڵچکەو گەرمکان و سندۆڵان بووە، لەساڵی ١٩٦٨ هاتە قەڵادزەو لەمزگەوتی جوتکانیان بووە مەلا، دواتریش مزگەوتێکیان بۆ دروست کرد لەساڵی (١٩٧٠) هەر بەناوی خۆی (مزگەوتی مەلا سەید ئەحمەد) لەگەڵ چەند ژوور (حوجرە) بۆ فەقێ و موستەعیدەکان بۆ دەرس خوێندن و وانە ووتنەوە، کەهەتا (٢٤-٤-١٩٧٤)بەردەوام بوو، بەڵام کەبۆردومانی قەڵادزە کراو خەڵك ئاوارەو دەربەدەری ئەو دیو سنوور بوون، ماموّستاش یەکێك بوو لەو ئاوارانە، لەئۆردوگای (سەرابی گەرم) نیزیك قەسری شیرین بەجیرانەتی و دۆستایەتی جەنابی ماموّستا سەید کاکە گەیشت، لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٥ گەڕایەوە بۆ قەڵادزەو هاتەوە هەمان مزگەوت و دەستی کردەوە بەتەدریس، بەڵام بەکز بوونی چرای شۆڕشی کورد چرای زانست و زانیاریش لەحوجرەو مزگەوتەکان بەرەو کزبوون و نەمان ڕۆیی.

ماموّستا سەید ئەحمەد (١٣) جار حەجی ماڵی خودای کردوە.

لەشەوی چوارشەممە ٣- لەسەر ٤-١١-١٩٩٩ دڵە گەورەکەی لەلێدان کەوت و گیانی پاکی انشاء الله بەبەهەشت شادو کامەران و بەختەوەر بووە.[(١)]

---

(١) لە بنەماڵەی ماموّستا مەلا سەید ئەحمەد وەرگیراوە.



دیمەنێک لە ئاهەنگی نەورۆز

## ئاگری نەورۆز و مەلا

بەداخەوە هەتا ئێستاش کردنەوەی ئاگری نەورۆز لە ڕۆژی (٣/٢١) کە یادی سەری ساڵی کوردییە و جەژنی نەتەوایەتی کوردە لەلای هەندێك کەس بە کفر و ئاگر پەرستی دادەنرێت.

ئەمەش بەهۆی نەزانین و تێ نەگەیشتنە لە بەراوردکردن لەنێوان ئاگرکردنەوە و ئایینی ئیسلامدا.

ئەوەی ئەو ئاگرە دەکاتەوە مرۆڤێکە نوێژ دەکات و بڕوای بەخوا و ئایین هەیە، هیچ کەم و کوڕییەکی نیە کە بەهۆی ئاگر کردنەکەوە بێت.

هەتا ئەمرم خەفەتی ئەوەم لەدڵ دەرناچێ ساڵی (١٩٥٤) من و مامۆستا شێخ نوری شێخ بابا عەلی و مامۆستا سەید غەفور و مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مامۆستا سەید عارفی چۆڕی، بەبۆنەی جەژنی نەتەوەکەمان بڕیارماندا لە مزگەوتەکەی مامۆستا سەید غەفور کۆببینەوە، بۆ ئەوەی بەشداری بکەین لەگەڵ ئەو دڵسۆزانەدا کە ئاهەنگی نەورۆزیان دەگێڕا، لەلایەن پیرەمێردی شاعیرەوە، ئێمە ئەو پێنج مامۆستا ئاینی یە بانگهێشت کرابووین بۆ بەشداریکردن، بەڵام نەمانوێرا بڕۆین بۆ ئەوەی تاوانبار نەکرێین بە ئاگرپەرستی و کافربوون.

# بێخود و عبدالقادر بەگ و سەفەری زەڵم

ڕۆژێك ئەدیب و زانای کورد خوالێخۆشبوو (مەلا مەحمودی بێخود) فەقێیەکی نارد بۆ لام وتی: میوانێکی زۆر خۆشەویستم هاتووە (عبدالقادر بەگی دەکە) پێی خۆشە سەرچاوەی زەڵم ببینێت، ئەگەر پێت خۆشە لەگەڵمان وەرە بچین بۆ زەڵم، منیش چووم بۆ خزمەتیان، وتم: سبەینێ بەیانی زوو بەفێنکی دەڕۆین.

کاتێك چووین دووشەو لەماڵی باوکم لە زەڵم ماینەوە، ئەو دوو شەوە خوالێخۆشبوو (بێخود) ئەوەندەی قسەی خۆش بۆ گێڕاینەوە هەتا ئێستاش لەمێشکما ئەو قسە خۆشانە ئەزرنگێنەوە، چونکە وتەکانی کۆمەڵایەتی بوون و پڕبوون لە فەلسەفە و منطق، یەکێك لەو قسە خۆشانە گێڕایەوە وتی:

جارێك هەندێ (دروێش) و (دروێشە) واتە پیاو و ژن لەکوردستانی ئێرانەوە دێن بۆ عێراق ئەچن بۆ ماڵی شێخ، لەڕێگەدا دەروێشێك لەگەڵ (دەروێشە) یەك دەبن بەبرادەر، شەویان لێ دێت لە قۆپی قەرەداغ هەریەك لەبن دارێك ڕائەکشێ و ئەخەوێ، دەروێش لە پاش خەوتنی هاوڕێکانی لەسەر سك خۆی ڕائەکێشێ و ئەچێت بۆ لای (دەروێشە)، ئەویش ئەڵێت: - دەروێش - بەحەیای خۆتەوە بگەڕێرەوە با هاوار نەکەم، دەروێش ئەڵێت بۆ خاتری پێغەمبەر دەست مەنێ بەڕومەوە با بەنائومێدی نەگەڕێمەوە، (دەروێشە) ئەڵێت بەو پێغەمبەرە ئەبێت بگەڕێیتەوە. ئینجا بۆ جاری دووەم خوا ئەکات بە تکاکار، ئەویش ئەڵێت

ئەبێت بەو خوایە بگەڕێیتەوە شوێنی خۆت. بۆ جاری سێیەم ئەڵێت: تو و ئەو شێخەی ئەچین بۆ لای دەست مەنێ بە ڕوومەوە، (دەروێشە) چەپۆکێك لەناو چاوی دەروێش ئەنێت و ئەڵێت: چۆنت دۆزیەوە خوا بتگرێ، ئینجا لەبەر خاتری شێخ دڵخوازەکەی بەجێ دێنێ پاش ئەوەی نە خاتری خوا و نە خاتری پێغەمبەری گرت.

ئەمەش مانای وایە (دەروێشە) شێخی لا گەورەترە لە خوا و لە پێغەمبەر.

ئەم جۆرە بیروباوەڕە ئێستاش ماوە بەتایبەتی لەلای شیعەکان، سوێندی درۆ ئەخۆن بە (خوا و پێغەمبەر) بەڵام بە (عەلی و عەباس) نایخۆن.

لە پاشان گەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە، شەوێك میوانی خوالێخۆشبوو (حەسەن بەگی جاف) بووین، بۆ نیوەڕۆ میوانی مامۆستا (شێخ ڕەسول) بووین، یەك دوو سەعات چوینە مزگەوتەکەی مامۆستا شێخ ڕەسول، مامۆستا و بێخود و عبدالقادر بەگ خەریکی یاری (شطرنج)بوون، منیش کتێبێك لە تاقی میحرابەکە دانرابوو ژیانی پێغەمبەر بوو (صلى الله علیه وسلم) لە نووسینی زانا و ئەدیبی میسری (حسنین هیکل) دەستم کرد بە خوێندنەوەی تا ئەوان تەواو بوون، ئینجا کە تەواو بوون مامۆستا شێخ ڕەسول وتی:

**من تا ئێستا ئەم کتێبەم نەخوێندۆتەوە لەبەر دوو شت:**

**یەکەم:** کاغەزەکەی سپییە، من هەر کتێبێك کاغەزەکەی سپی بێت حەزم لێی نیە.

**دووەم:** دانەری ئەم کتێبە زۆر جار ناوی پێغەمبەر دەبات و سەڵاوات نادات لە دیاری.

منیش وتم: مامۆستا یەکەم: نرخی کتێب و سودی لەو زانیارییەدایە کە تیایدا کۆکراوەتەوە بە زەردی و سپێتی کاغەزەکەی نیە.

دووەم: دانەری ئەم کتێبە خۆی لە پێشەکی کتێبەکەدا وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوەو دەڵێت: سەڵاوات لە دیداری پێغەمبەر (سونەتە) و، ئەگەر لە شوێنێکدا چەند جارێك دووبارە بووەوە یەکجار بەسە، هەروەها دەڵێت: من زۆر شوێن هەیە

وتارەکەیم لە پیاوێکی گاورەوە گواستووەتەوە، کە ئەو ناوی (محمد)ی بردووە، دیارە ئەو کاتە سەڵاواتی لەگەڵدا باس ناکرێت.

مەبەستم لە گێڕانەوەی ئەمە جیاوازی بیروباوەڕ لە نێوان مەلا و فەقێ و لە نێوان کاغەزی سپی و زەردا، لایان وابوو ئەگەر کتێبێك کاغەزەکەی سپی بوو خوێندنەوەی ڕەوا نیە.

هەتا زۆر مەلا هەبوو نەیدەهێشت فەقێیەکەی ڕۆژنامە یان گۆڤار بخوێنێتەوە.

مامۆستا مەلا نوری فارس، کە مەلایەکی زۆر چاکە و وەرگێڕێکی زۆر بەرزە، جارێکیان هات بۆ لام وتی: من لای مامۆستا (ر.پ) دەمخوێند، دەری کردم لەسەر ئەوەی کە ڕۆژنامەم دەخوێندەوە.

ئەم جۆرە بیروڕایانە لای هەندێك مامۆستایانی ئایینی هەبوو، ئەمەش بەهێزترین هۆ بوو بۆ دواکەوتنی خوێندەواری مزگەوت، کە کاتێك ئیجازەی وەردەگرت ئاگای لە هیچ شتێك نەبوو کە پەیوەندی بە ژیانی جیهانەوە هەیە، دیارە ئەو کەسەی لە دونیا تێ نەگەیشت بە قوڵی و ووردی لە ئایینی ئیسلام تێناگات، چونکە ئەم ئاینە هاتووە بۆ ئەوەی کە بەڕێك و پێکی پەیوەندی هەر مرۆڤێك لەگەڵ یەکێکی تر ڕوون بکاتەوە بەڕاست و بە چەوتەوە بیخاتە ڕوو.



## کورتەیەك لەژیانی بێخود(١)

بێخودی شاعیر ناوی تەواوی مەحمود کوڕی موفتی حاجی مەلا ئەمینی کوڕی موفتی گەورە حاجی مەلا ئەحمەدی چاومارە، کە ناوبانگی بە (پیرحەسەن) دەرکردووە، ئەمیش کوڕی مەلا مەحمودی دێلێژەیی پیرحەسەنی کوڕی مەلا ئەحمەدی دێلێژەییە کە لە ساڵی (١٢٠٦ك)دا کۆچی دوایی کردووە، ئەمیش کوڕی مەلا محەمەدی دێلێژەییە کە بەناوبانگ بووە بە (مەلای گەورە) و لە ساڵی (١١٧٣)دا لە دێلێژە وەفاتیکردووە. ئەم زاتە خوێندنگەیەکی گەورەی هەبووە لە دێلێژەو هاوچەرخی شێخ ڕەزای دێلێژە بووە.

بێخودیش لە ساڵی ١٢٩٦ك. هاتوتە دونیاوە، لای زانایانی ناوداری ئەو سەردەمەی سلێمانی خوێندنی تەواوکردووە. ساڵی ١٩٠٠ز. کراوە بە حاکمی هەڵەبجە، لەگەڵ مامۆستایان (ڕەفیق حیلمی) (زێوەر) دا مامۆستایەتیی کردووە، بێئەوەی بەرامبەر بەوە هیچ مانگانەیەك وەربگرێت.

پێش کۆچی دوایی مەلا عەبدولعەزیزی کاکی، کە موفتی سلێمانی بوو، چەند ساڵێکی لە هەڵەبجە بەسەربردووە. ئەوجا گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و تا مردنی لە جێگاکە کاکی مفتی بووە. ١٩٥٥/٨/٢٥ بەرامبەر بە (١٣٧٦ی کۆچی) بۆ دواجار ماڵئاوایی کرد."(٢)

---

(١) تێبینی: وەك یەکێك لە هاوڕێ و کەسە نزیکەکانم پێم خۆش بوو ژیاننامەی لەم بەرگەدا دابنرێت.

(٢) بەکورتی لە ویکیپیدیاوە، ئینسکلۆپیدیای ئازاد، وەرگیراوە.

# سەفەری موسڵ ساڵی ١٩٥٤

حاجی عبدالقادر عبدالجبار (حاجی میرزا قادر) یەکێك بوو لە بازرگانەکانی سلێمانی، لەو دەوڵەمەندانە بوو هەمیشە هەستی بە پێویستی خزمەتی مزگەوت و مەلا و فەقێ دەکرد.

جارێکیان چوار مەلای هەڵبژارد لە سلێمانی بۆ ئەوەی لەسەر ئەرکی خۆی بیانبات بۆ موصل بۆ زیارەتی (نەبی یونس)، ئەم چوار مەلایە بریتی بوون لە: مەلا عبداللە چرۆستانی، مەلا رحیمی پەرخی، مەلا عبدالرحمن داربەڕولەیی، چوارەمیان من بووم.

بە ئوتۆمبێلەکەی خۆی بەڕێکەوتین بەرەو موصل، کوڕێکی خۆشی لەگەڵ خۆی هێنابوو ئەو کاتە لە شەشی سەرەتایی بوو (کاك عبداللە).

لە ڕێگا قسەی زۆر کرا و وەڵام دەدرایەوە، چونکە وەك دەڵێن قسەکردن ڕێگە نزیك دەخاتەوە.

وتیان: (حەزرەتی سلێمان) هەزار ژنی بووە، هەموو شەوێك چۆتە لای ئەم هەزار ژنە.

منیش کە لە هەموویان بچوکتر بوم لە تەمەن و لە زاناییدا، چونکە ئەوان مامۆستای مامۆستاکانم بوون. پێم وتن: ئەم شتە دوورە لە ژیرییەوە -منطق- چونکە ئەو ژنانە ریز بکەیت و هەریەکە -یەك دەقیقەی- پێ بچێت، ئەکاتە هەزار دەقیقە، دابەشی بکەیت بەسەر (٦٠)دا ئەکاتە (١٧ سەعات) لە رۆژێکدا، یان وەك ئەوان ئەڵێن لە شەوێکدا. ئینجا پێغەمبەرێك هەموو رۆژێك

(١٧) سەعات لە تەمەنی لەم ئیشەدا بەسەر بەرێت چۆن پێغەمبەرێکە؟

ئەوانیش وتیان: معجزە بووە.

وتم: شتێکی تر نەبوو کە ببێت بە معجزە لەمە زیاتر.

ئینجا وتیان: تۆ ئیمانت زەعیفە، بیروباوەڕت تەواو نیە.

وتم: ئەمە شتێکی دروست کراوە و خورافاتە، من بیروباوەڕم بەمە نیە.

کاتێك چوینە موسڵ لە پاش زیارەتی (نەبی یونس) چووین بۆ زیارەتی مەرقەدی (فتحی الموصلی)، لەڕێگە باسی (خدری زیندە) کرا.

وتم: ئەمەش یەکێکی ترە لەو خوراڧاتانەی بیروباوەڕتان پێی هەیە.

وتیان: ئەگەر تۆ ئینکاری خدری زیندە بکەیت ئەوا بیروباوەڕت هێشتا دانەمەزراوە.

وتم: لەبەر چی (خدر) دەبێ تا رۆژی قیامەت بمێنێت؟ ئەگەر لەبەرئەوەیە سودی زۆرە بۆ موسڵمانان، خۆ لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەورەتر نیە، بۆچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (٦٣) ساڵ ژیاوە، خدر دەبێ هەتا هەتایە بمێنێ، یان مانەوەی لەبەرئەوەیە چونکە خوا ناتوانێت خدرێکی تری وەها دروست بکات، ئەمەش کفر و کەم باوەڕییە بەخوا.

ئینجا ئەوان گومانیان پەیدا کرد لە موسڵمانێتی من، چونکە ئەم جۆرە چیرۆکانە ناچێتە مێشکمەوە.

کاتێك گەڕاینەوە بۆ هەولێر چوینە حوجرەکەی (مەلا صاڵحی کۆزەپانکەیی) کە مەلایەکی زۆر باش و زۆر بەناوبانگ بوو. کە دانیشتین، پاڵم دا بەدیوارەکەوە سەرم بەر کتێبەکان کەوت، منیش کتێبێکم دەرهێنا، کە دەبینم ئەمە تەفسیری مەداریکە (تفسیر النسفی)، کە کردمەوە بە ئیرادەی خوا وا رێکەوت لەسەر لاپەڕەی لای راست لەدێڕی یەکەمدا خوێندمەوە دەڵێت: (وأما قصە خضر وإلیاس فهي من الخرافات)، واتە: چیرۆکی خدر و الیاس درۆیە و خوراڧاتە.

کتێبەکەم داخستەوە وتم: بیروباوەڕتان چیە بەرامبەر بە تەفسیری مەدارك؟

وتیان: باشترین تەفسیرە.

وتم: ئەگەر ئەو شتێك بڵێت باوەڕتان پێی هەیە؟

وتیان: ئەگەر بڕوامان بەو نەبێ مانای وایە باوەڕمان بە هیچ نیە.

ئینجا کتێبەکەم دانێ و وتم: بیخوێننەوە.

کە خوێندیانەوە، خۆ ناتوانن بەویش بڵێن کافرە، هیچ وەڵامیان پێ نەبوو.

ئاینی ئیسلام هەزاران شتی ناڕاستی تێکەڵاو کراوە، پێویستە مامۆستا و مەلا جیایان بکاتەوە.

ئەوانەی لەگەڵم بوون بەدەیان ئیجازەیان داوە بە مەلا و مامۆستا، کە بە حیساب بوون بە (عالم)، بیروباوەڕیان بەو جۆرە شتانە هەر هەبوو.

کوڕەکەی حاجی قادر کە لە شەشی سەرەتایی دەیخوێند، پێی وتم: گفتوگۆ لەگەڵ ئەوانە مەکە، چونکە هەر شتێك چۆن چۆتە مێشکیانەوە هەروا دەمێنێتەوە.

## کارگەی تەڵاق چاککردنەوە

مزگەوتەکەی مامۆستا (م.ر) بەهاوبەشی هەندێ لە مامۆستاکانی دەرەوە وەك مامۆستا (ن.ب) کارگەیەکیان دانا بوو کە بریتی بوو لە حوجرەکەی مامۆستا بۆ دەرس وتنەوە و تیایدا تەڵاقیان چاك دەکردەوە، هەر کوردێکی هەژار ناکۆکی بوایە لەگەڵ ژنەکەی، لەبەر داماوی و نەبوونی رۆشنبیری چەکی تەڵاقی بەکار دەهێنا لە دژی ئەو ژنە، بەبێ ئەوەی بیر بکاتەوە لە پاشەڕۆژی خۆی و منداڵەکانی، ئەیوت بە ژنەکە: (هەر سێ تەڵاقت کەوتبێ). دوای ئەوەی پیاوەکە ڕقەکە لە دڵی دەردەچوو، پەشیمان ئەبووەوە، مەلا بە مەلا و مزگەوت بە مزگەوت ئەگەڕا بۆ ئەوەی یەکێ بڵێ تەڵاقت نەکەوتووە یان چاك دەکرێتەوە.

زۆربەی مامۆستاکانی کوردستان هەتا ئێستاش باوەڕیان وایە کە ژن بەیەکجار هەر سێ تەڵاقی ئەکەوێت، کەچی قورئانی پیرۆز زۆر بەئاشکرا دەڵێت: (تەڵاقێك کە ژن و مێردەکە نەتوانن یەك بگرنەوە بریتیە لە سێ جار)، دیارە لە پیاوێکی نەخوێندەوار بپرسە بڵێ (سێ جار) لەگەڵ (سێ ژمارە) جیاوازن یان نا؟ ئەویش ئەڵێت جیاوازە، چونکە جار لەگەڵ جار زەمان ئەکەوێتە نێوانیانەوە، بەڵام ژمارە هەرچەند بێ لەیەك کاتدا کۆئەبێتەوە.

لە سلێمانیدا مزگەوتی ناوبراو بوو بوو بە کارگەیەکی زۆر سەیر بۆ چاککردنەوەی (تەڵاق)، بۆ یەکەمجار فتوایان دەدا کە سێ تەڵاقی کەوتووە، بەڵام لە پاشان بە دەیان (فروفێڵیان) دەدۆزیەوە بۆ چاککردنەوەی.

یەکێ لەو مامۆستایانەی لەو کارگەیە بەشدار بوو بۆی گێڕامەوە: ژن و پیاوێك هاتن بۆ لامان بۆ پرسینی تەڵاقەکەیان، ئێمەش لە پیاوەکەمان پرسی:

ئەگەر ژنێکی تازە بێنێت چەندی تێ ئەچێت؟ ئەویش وتی بەلای کەمەوە (١٠٠) دینار، ئێمەش پێمان وت تۆ (٥٠) دینار بە ئێمە بدە تەڵاقەکەت بۆ چاك دەکەینەوە. ئەڵێت: پیاوەکە زۆری پێ خۆش بوو چونکە ژنەکەی زۆر خۆش دەویست ئامادە بوو هەرچەند داوا بکەن بیدات، ژنەکەی پێی وت: هەڵسە بابرۆینەوە بۆ ماڵەوە، وتیان: ئەی تەڵاقەکە چاك ناکەنەوە؟ وتی: ماموستا، ئەگەر تەڵاق کەوتبێ بە (٥٠) دینار چاك نابێتەوە، ئەگەر نەکەوتبێ (٥٠) دیناری کەرانەی خۆمان بۆ بدەین؟!

بەهەمان شێوە لە هەڵەبجە لە مزگەوتی ماموستا (ص) کارگەیەکی تر هەبوو لە جۆرێکی تر، یەکەمجار بڕیاری ئەدا سێ تەڵاقەکە کەوتووە، ئینجا ئەی وت: لەبەرئەوەی ئێوە مەزهەبتان (شافعی)یە و لای شافعی ئەبێ شاهدی نکاح عادل بێت، واتە (بێ گوناە و بێ تاوان)، لەبەرئەوە نکاحی پێشوو بەتاڵ بووە، چونکە شایەتەکان فاسق بوون، لەبەرئەوە خۆتان تەقلیدی ئیمام حەنەفی بکەن، کە لای ئەو نکاح دروستە با شایەتەکانیش فاسق بن، هەر بەو جۆرە جارێکی تر ژنەکەیان لە پیاوەکە مارە دەکردەوە بەرامبەر پارەیەك لە سەری رێك ئەکەوتن.

ئەم کردەوەیە نە خوا فەرمویەتی و نە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، زۆر بە ئاشکرا خوا فەرموویەتی: (تەڵاق بەسێ جار) ئەبێ و تەواو ئەبێ، شەریعەتی ئیسلام هی شافیعی و حەنەفی نییە، تا ئەوان ئەرکان و مەرجی بۆ دابنێن.

ئەگەر خوێندەوارە موسڵمانەکان لەسەر مانای قورئان برۆن نابنە هۆی وێران کردنی هەزاران ماڵ و سەرگەردانی هەزاران مناڵ، کە باوکەکە سێ بەسێ دایکەکە تەڵاق دەدات.

هەروەك پێشتر باسم کرد، من خۆم یەکێ بووم لەو نەزانانەو کە دووجار فتوای نارەوام داوە، هەتا ئەوکاتەی بە مەبەستی بڕوانامەی ماجستێر کتێبێکم دانا لە ژێر ناونیشانی (تەڵاق لە هەموو ئایین و یاساکانی دنیادا لە ماوەی ٤٠٠٠

ساڵدا)، تیایدا بە ووردی لەم کێشەیەم کۆڵیەوە و گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە بەپێی فەرمودەی خوا لە قورئانی پیرۆزدا، تەڵاقی (سێ بەسێ) (یەك) تەڵاقی پێ دەکەوێ، ئەمەش زۆر لە مەزهەبەکان (فتوی)یان لەسەرداوە.

هەڵەکە لەمەوە هاتووە کە لە زەمانی (خلافە)ی عمری کوڕی خطاب (رضي الله عنه) کەسی وا هەبوو بەژنەکەی دەوت - سێ بەسێ - تەڵاقت کەوتبێ، حەزرەتی عمر فەرمووی: ناوی ژمارە مەبەن چونکە ژمارە لە تەڵاقدا نیە بەڵکو جار هەیە، خوا فەرموویەتی: (ژن و پیاو لەیەك ئەپچڕن بەیەکجاریی پاش تەڵاق دان بە (٣) جار).

حەزرەتی عمر فەرمووی: ئەوەی لەمەولا بەژنەکەی بڵێ سێ تەڵاقت بکەوێ، نایەڵم ژنەکەی بچێتەوە لای لە تۆڵەی ئەوەی کە ژمارە بەکاردەهێنێ، بەم بڕیارەی حەزرەتی عمر دەوترێت (السیاسة الشرعیة) واتە: بۆ ڕابەری ئیسلام هەیە کە هەندێ شت بڕیاربدا کە خوا و پێغەمبەر نەیان فەرمووە لەبەر (سیاسەتی شەرعی). ئینجا ئەم فەرمودەی حەزرەتی عمر هەندێك لە مەزهەبەکان کردیان بەبەڵگە کە تەڵاقی سێ بەسێ بە یەکجار هەرسێ تەڵاق ئەکەوێ، لەکاتێکدا حەزرەتی عمر ئەوەی مەبەست نەبووە.

ئینجا لەسەر ئەم بڕیاری سیاسەتی شەرعی یەی عمری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) زۆرترین مەزهەبەکان بڕیاریاندا کە تەڵاقی سێ بەسێ بەیەکجار دەکەوێت، لەسەر فەتوای ئەم مەزهەبانە مەلای کورد بە هەزاران خێزانی کوردیان سەرگەردان کرد و ژن و مێردیان لەیەك پچڕاند، بە یەکجاری سەریان لێ شێواو منداڵەکانیان کەوتنە کۆڵانان، پاش ئەوە مێردەکە ژنێکی تری هێنا و ژنەکەش شویەکی تری کرد، بەبێ ئەوەی یەکێك لەو مەلایانە لە فەرمودەکەی خوا وردبێتەوە کە دەفەرمووێ: (الطلاق مرتان)[1]، واتە لەدوو مەجلیسی جیا جیادایە، نەی فەرمووە (الطلاق إثنان)، تەڵاق بە سێ جار دەکەوێ نەك بەسێ ژمارە.

---

(١) وەکو لەلاپەڕە (٢٤١) باسکراوە.

لەو شتە سەیرانەی لە ژیانمدا بینیم، جارێکیان ماموٚستا (ع.ك)، کە کاتێ لە سلێمانی مەلا بووم زۆر هاوڕێم بوو، لە سەرەتای حەفتاکاندا لە سلێمانییەوە هات بۆ بەغدا بۆ سەردانم، لە دەرگای حەوشەوە پێشوازیم لێ کرد، ئاسایی دیار نەبوو.

بەر لەوەی سەلامم لێ بکات وتی:

ماڵ خراپ، بیستومە تۆ وتوتە سێ تەڵاقە یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت؟

منش وتم: ئەوە قسەی من نیە.

وتی: ئەی ئەوە قسەی ئیبن تەیمییەیە؟

وتم: نەخێر.

وتی: ئەی قسەی شیعەی ئیمامی یە؟

وتم: نەخێر.

وتی: ئەی باشە کێ ئەمەی وتوە؟

وتم: خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا وای فەرمووە، بە نەصێك کە (قطعي الثبوت وقطعي الدلالة)یە، دەفەرموێت:

﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖ ﴾[1].

واتە ئەو تەڵاقە کە ژن و مێرد دەتوانن لەپاشاندا بەیەك بگەنەوە تەنیا دوو جارە، بەڵام لەپاش جاری سێیەم ناتوانن بەیەك بگەنەوە تا ژنەکە شویەکی تر نەکات و لەم شوەی جیابێتەوە بە تەڵاق یان بە مردن و عیدەی تەواوبێت، بە مارەکردنەوەی تازە دەچێتەوە لای مێردی پێشوو، لێرەدا (تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) جاری سێیەمە.

وتم: ماموٚستا، ئێوە ساڵانێکی زۆر زانستی (أصول الفقه) دەخوێنن و دەڵێنەوە، بەڵام بەباشی لێی ورد نابنەوە، لە قەواعیدە چەسپاوەکانی زانستە کە (لا مجال للإجتهاد في مورد النص).

---

(١) البقرة: ٢٢٩

لەو کاتەدا تەماتەفرۆشێك لەبەر دەرگا بوو، پێم وت: ئەو تەماتەفرۆشە عەرەبە بەڵام خوێندەوار نیە، با لێی بپرسین جیاوازی هەیە لەنێوان (مرتان) و (اثنان) یان (عددان)دا، دەڵێت بەڵێ، (مرتان) زەمەن لەنێوانیان هەیە، بەڵام لە (اثنان) و (عددان) زەمەن نیە.

ئەویش وتی: بەخوا ڕاست دەکەیت، من ئەگەر لەبەر شافیعی نەبوایە عەمەلم بەم ئایەتە دەکرد.

ئەمە وتەی یەکێکە لەوانەی کە ڕێگەی ئایین بەهەزاران پیشان دەدەن بەبێ ئەوەی خۆی تێ بگا و کردەوەی پێ بکات.

هەروەها سوێند خواردن بە (تەڵاق) لەگەڵ تعلیقی (تەڵاق) لە زەمانی پێغەمبەر و - خلفاء الراشدین - نەبووە، بەڵکو ئەمەویەکان دایان هێنا، کاتێك عەلەوییەکان لە ژێرەوە لەدژی ئەمەوییەکان ئیشیان دەکرد، کە ئاشکرا ئەبوون ئەیان گرتن سوێندیان نەئەیان بە قورئان، چونکە بەدرۆوە سوێندیان بەقورئان ئەخوارد، ئەمەوییەکان ئەیان وت: سوێند بخۆن بە (تەڵاق)، یان بڵێین ئەگەر لەدژی ئێوە بوەستین تەڵاقی ژنەکانمان بکەوێ.

ئینجا ئەم ئیشە کە پەیوەندی بە فەرمودەی پێغەمبەرەوە نیە، هەندێ لە مەزهەبەکان (فتوی)یان پێدا کە سوێند بە تەڵاق و - تعلیقی طلاق - تەڵاقی پێ ئەکەوێ، کەچی هیچ بەڵگەیەك و بنچینەیەك نیە جگە لە کردەوەی ئەمەوییەکان، دیارە کردەوەی ئەوان نابێت بە بەڵگەی شەرعی.

لە ساڵی ١٩٧٧ بەسەردان چومەوە بۆ زەڵم، کاك علی عبدالله هاتە لام وتی: لەگەڵ ژنەکەم ناکۆکیمان بووە هەر سێ تەڵاقەم داوە، لای هەر مەلایەك دەچم دەڵێن تەڵاقەکەت بەجاش نەبێت چاك نابێتەوە، ئێستا گیرم خواردووە، دڵم بڕوایی نادات بەم کردەوەیە ژنەکەم بێتەوە لام، لە لایەکی تریشەوە (٧) منداڵم هەیە منداڵەکان سەرگەردان دەبن و خۆم و ژنەکەشم سەرمان لێ ئەشێوێ، چارم چییە؟

منیش وتم: بچۆ ژنەکەت لەگەڵ باوکی ژنەکەت بێنە بۆ ئێرە.

کاتێك هاتن، بە خوالێخۆشبوو سۆفی ئەحمەد - باوکی ژنەکە -م وت: ئەم کچەت یەك تەڵاقی کەوتوە، بەپێی ئیسلام و فەرمودەی خوا کە فەرمویەتی: [الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ] نەی فەرمووە (الطلاق إثنان)، بۆ جاری سێیەم ئەگەر تەڵاقی دا فەرموویەتی: [فَإِن طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىَ تَنكِحَ زَوْجاً غَيْرَهُ]، واتە: کەسێك سێ جار ژنەکەی تەڵاق بدات بۆ جاری سێیەم دەبێت مێرد بکات بەیەکێکی تر، ئەگەر ئەو یەکە تەڵاقی دا یان مرد بۆی هەیە بچێتەوە لای مێردی پێشوو.

ئینجا دوو شەیەتمان هێنا و ژنەکەم لە کاك عەلی مارە کردەوە، وتم: ئێستا ئەوە تۆ لە سێ تەڵاقەکە یەك تەڵاقت ڕۆیی دوو تەڵاقت ماوە.

کاتێك گەڕامەوە بۆ بەغدا، پاش چەند ڕۆژێك کاك علی هات بۆ ماڵمان وتی: ئەوە مەلاکان هەموویان منیان بەکافر داناوە، پێیان وتوم ئەو ژنە ژنی تۆ نیە، هەر دروست بونێکت لەگەڵ ئەودا بە زینایەك لەسەرت حسابە.

منیش نامەیەکم بۆ نووسی باسی ئەو بەڵگانەم کرد لە فەرمودەی خوا و پێغەمبەر کە تەڵاقی سێ بەسێ یەکجار تەڵاقی پێ دەکەوێت، وتم پێی بیبە بۆ ئەو مامۆستایانە کە تۆ بەکافر دادەنێن، پێیان بڵێ با ڕەدی ئەم نامەیە بنووسنەوە.

ئەویش بردبوی بۆ لای خوا لێخۆشبوو مامۆستا مەلا محمدی مەلا بەها، کە مەلای خورماڵ بوو، وتبووی: من ناتوانم وەڵامی ئەمە بدەمەوە، ئەوەی نوسراوە هەمووی ڕاستە. هەروەها چوبو بۆ لای خوا لێخۆشبوو مامۆستا مەلا عوسمانی مەلا عزیز، ئەویش فەرمووبووی: من نە لە مەلا مصطفی موسڵمان ترم، نە لەو زاناترم، بێنە با ئیمزای بکەم کە ئەوەی لەم نوسراوەدایە هەمووی ڕاستە، هەروەها بردبووی بۆ لای مەلا ڕەحیمی قازی ئەویش پاش خوێندنەوەی نامەکە وتبووی بۆچی لەناو کورددا مەلای وا هەیە ئەو شتانە بزانێ بەخۆشحاڵیەوە ئەویش ئیمزای کردبوو.

## سەرفیترەی
## ئاخیر ساڵی مەلایەتیم

شایەنی باسە خوای گەورە و پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) هەندێ شتیان پێویست کردووە لەسەر ئادەمیزاد بۆ یارمەتی هەژار و لێ قەوماو، لەبەرئەوەی کە جەژنی ڕەمەزان جەژنی هەژار و لێقەوماوانە، دەبێت بەخۆشی ئەو جەژنە بەسەر بەرن، دیارە دڵ ناخۆشی ڕۆژی جەژنیش بەو بۆنەیەوە منداڵی هەژار ناتوانێت لەو ڕۆژەدا وەك منداڵی دەوڵەمەندەکان هەڵسێ و دابنیشێ بە ئارەزووی خۆی بچێت بگەڕێت بەشوێنە خۆشەکاندا، یان شتێکی خۆش بکڕێ بچێ دڵی خۆی خۆش بکات لەو ڕۆژەدا، لەبەرئەوە ئایینی ئیسلام پێویستی کردووە لەسەر موسڵمانان ڕۆژێك لە پێش جەژندا، بڕێك لەو خواردنە کە دەیخوات لە پاش ڕەمەزان، وەك گەنم یان برنج یان خورما، بۆ هەریەکێك لە خێزانەکە، بیدات بەماڵە هەژارێك، ئەگەر ماڵێك حەوت کەس بن دەبێت حەوت (صاع) لە خواردەمەنی بدەن بەماڵە هەژارێك، بۆ ئەوەی ڕۆژی جەژن هەست بە نەبوونی نەکەن، ئەمەش پێی دەوترێت سەرفیترە واتە زەکاتی سەر.

بەڵام بەداخەوە ئەوکاتە لە نێو کوردی عێراق و کوردی ئێران باو بوو، کە ئەم سەرفیترەیە نادرێت بە هەژار و لێقەوماو، بەڵکو دەبێت بدرێت بە مەلای مزگەوت، چونکە ئەو کاتە مەلا هیچ موچەیەکی نەبوو، ژیانی لەسەر سەرفیترە و زەکات و سەرقەڵەمانە و ئیسقات و خێر و خێراتی تری هەژارەکان بوو.

ساڵی ١٩٥٥ز کە دوا ساڵی مەلایەتیم بوو، کاتێك ڕەمەزان هات دانیشتوانی گەڕەکەکە وتیان بە (مجەورەکە): چەند کیلۆیەك گەنم بێنیٚ بۆ ئەوەی سەرفیترەکەمان لە لای مامۆستا بقەبڵێنین.

پێش ئەوەی دانیشتوانی گەڕەکەکە دەست بکەن بە چاککردنەوەی سەریان، پاش نوێژی شێوان بە هەموو گەڕەکەکەم ڕاگەیاند کە من ئەمساڵ سەرفیترەی کەس وەرناگرم، چونکە بیرم لەم ئیشە کردوەتەوە کە ئەمە رزق و ڕۆزی هەژار و لێقەوماوەو مەلای مزگەوت لێی داگیرکردووە.

دانیشتوانی گەڕەکەکە لەدژم وەستان و وتیان: دەتەوێت ڕێگای باوباپیرمان وون بکەیت و بیگۆڕیت.

منیش وتم: دەمەوێت ڕێگەی خوا و پێغەمبەرتان پیشان بدەم. سەرفیترە بۆ هەژار پێویست کراوە، من کە ئەو سەرفترەیە وەردەگرم بەناوی هەژاری و نەبونیەوە لێتان وەردەگرم، ئەمەش زۆر عەیبە بۆ موسڵمانێك کە پێشەوا بێت بچێتە ئەو ئاستە کە سەرفیترەی پیٚ بشێت.

زۆرم هەوڵدا تێیان بگەیەنم سوودی نەبوو، بەڵام لە ئەنجامدا وتم: من سوێندم خواردوە سەرفیترە و زەکات وەرناگرم. زۆریان هەوڵدا هەر وەرم نەگرت، هەرچەند ئەوان ئەم کردەوەیەی منیان لەلا شتێکی ناڕەوا بوو، چونکە پێچەوانەی عورف و عادەتی باوباپیران بوو.

بەداخەوە ئەم بیروڕایە لە کۆتایی مەلایەتیدا زانیم، بۆ یەکەمجار بیرم لێکردەوە نەمدەزانی، ئەگەر نا هەر لە سەرەتاوە خۆم دوور دەخستەوە لە سەرفیترە و لەسەر خۆمم حەرام دەکرد، هەروەك ئیسقاتەکەم حەرام کرد.

## تاقیکردنەوەی
## پۆلی شەشەمی سەرەتایی

کاتێك لە سەرسیان مەلا بووم زۆر هیلاك ئەبووم بە ئامادەکردنی دەرسی فەقێوە، هەموو شەوێك بۆ ئەوەی خەوم لێ نەکەوێت، نانم نە ئەخوارد لەجیاتی ئەوە قۆرییەك قاوەم لێ ئەنا ئەم خواردەوە، پاش ئامادەکردنی دەرسەکان نانی ساردم دەخوارد، ئەمەش بووە هۆی دروست بوونی ئازار لە گەدەمدا، دواتر بووە هۆی - قرحة المعدة -، لە سلێمانی رۆژێك لە کاتی نوێژی شێواندا (مغرب) لەبەر ئازاری زۆر کەوتم و بورامەوە، رۆژی دواتر پزیشك -هاشم دوغرمچی- وتی - ئەشیعە - بگرە، دەرکەوت (قرحة)ەیە. ئینجا ئامۆژگاری کردم، وتی: نابێت دەرس بڵێیتەوە. منیش فەقێکانم دابەشکرد بەسەر مەلاکاندا بۆ ئەوەی دەرس نەڵێمەوە.

بەڵام نەمدەتوانی بێ کتێب خوێندنەوە دانیشم، لەبەرئەوە لەو کاتەدا کتێبەکانی (کاك عبدالله)ی ئامۆزام دەبرد دەمخوێندەوە، کەوتە مێشکمەوە (تاقیکردنەوەی خارجی) ئەنجام بدەم، ئەم کارەش لەو رۆژەدا بۆ مەلایەکی وەك من- ئەگەر ئاشکرا ببێت - بەتاوانێکی گەورە ئەدرێتە قەڵەم، لەگەڵ ئەوەشدا بڕیارمدا تاقیکردنەوە ئەنجام بدەم، یەك پیت ئینگلیزیشم نەدەزانی، هەرچۆن بوو عەریزەمدا بە مەعاریف و لەپۆلەکانی پێش شەش تاقیکردنەوەم پێکرا و دەرچووم و داخڵی ئیمتیحانی بەکەلۆری کرام .

ئینجا بە دزیەوە تاقیکردنەوەی پۆلی شەشەمی سەرەتاییم دا، بۆ بێ شانسی من ئەو ساڵە کاتی ئیمتیحانەکان مانگی ڕەمەزان بوو، ئەبوایە هەموو شەوێك

پێشنوێژی تەراویحیشم بکردایە و وتارێکم بخوێنایەتەوە بۆیان و، دوای نوێژیش هەر شەوێك وەك عادەتی شار ئەچووین بۆ ماڵی یەکێك لەبازرگانەکانی گەڕەکەکە تا نزیکی پارشێو، منیش نەمدەوێرا بڵێم ئیمتیحانم هەیە، هەموو رۆژێك دوای پارشێو دەستم دەکرد بەخوێندن.

بەیانیان بە دزیەوە خۆم دەگۆڕی، مشکیەکم دەبەست و کەوا و سەڵتە و جبەکەم لە ماڵی (مەلا حەسەنی گردەزوبەیری) -خوا لێی خۆشبێت- دا ئەنا کەماڵیان نزیکی ئەو مەکتەبە بوو من ئیمتیحانم تیا دەکرد، وا رێککەوت ئەو مێزەی من تاقیکردنەوەم لەسەر دەکرد کەتبووە تەنیشت یەکێك ئەمناسی، ترسم هەبوو بمناسێتەوە، بەڵام باش بوو هەستی پێنەکردم، چونکە کەس لەو بڕوایەدا نەبوو من تاقیکردنەوە بکەم.

رۆژێك پێش کۆتایی تاقیکردنەوەکان رووەو ئەو قوتابخانەیە دەچووم کە تاقیکردنەوەکانی تیادا دەکرا، لەرێگە کتێبێکم بەدەستەوە بوو دەمخوێندەوە، لەپڕ لوتم نا بەلوتی یەکێك لە دانیشتوانی گەڕەکەکەمانەوە، ئینجا تەماشای یەکترمان کرد هەردووکمان حەپەساین، من لەبەرئەوەی کە ئاشکرا بووم لەم ئیشەدا کە بەشتێکی زۆر نارەوا دادەنرا، ئەویش لەلای شتێکی زۆر نامۆ بوو کە من مەلایەکم و بەم شێوەیە بمبینێ لەسەر ئەو رێگەیە.

لە پاشاندا لێی پرسیم: مامۆستا ئەمە چییە؟ وتم: تاقیکردنەوەی پۆلی شەش دەدەم، ئەویش دەنگی نەکرد و رۆشت، من پێم نەوت بۆ خەڵکی باس مەکە، دیار بوو بەدانیشتوانی گەڕەکەکەی وتبوو کە شتێکی وەهای دیووە، ئەوانیش لەبەرئەوەی خۆشیان دەویستم شتێکی وایان پێ نەوتم کە ئێش بەدڵم بگەیەنێ، بەڵام پرسیان وتیان: کە تۆ مەلایەکیت ئیجازەی دوانزە عیلمە دەدەیت بە مەلای تر، شەهادەی شەشی سەرەتاییت بۆ چیە؟.

منیش وتم: لە ئایینی ئیسلامدا فێربوونی زانیاری لە سنورێکدا ڕاناوەستێت، بەڵکو هەموو خوێنەوارێك دەبێت خۆی بەخوێنەوار بزانێت هەوڵ بدات شتی زیاتر بزانێت تا ئەو رۆژە کە لەم جیهانەدا کۆچی دوایی دەکات، چونکە وتویانە:

(العلم من المهد إلى اللحد)، بەڵکو هەندێك کەس دەڵێن ئەمە فەرمودەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) واتە: فێربونی زانیاری لە بێشکەوە دەست پێ دەکات تاکو کۆتایی دێت بە ڕۆشتنە ناو گۆڕەوە.

ئەوانیش دڵیان بەرامبەر بەمن نەگۆڕی، چونکە زۆر ڕێزیان دەگرتم و منیش خۆشم دەویستن، خۆشەویستی منیش لای ئەوان زۆر بوو.

ئەنجامی تاقیکردنەوەکە لە هەموو دەرسەکان دەرچووم، بەڵام ئینگلیزی سفرم هێنابوو، چونکە ئەلف و بای ئینگلیزیم نەئەزانی، هاوینەکەی (مامۆستا عبدالخالق) کەمامۆستای ئینگلیزی بوو لەقوتابخانەی ناوەندی لەسلێمانی دەرسی دەوتەوە، من دەرسی شەرعم بەو ئەوت ئەویش ئینگلیزی وتەوە بەمن بەو هۆیەوە توانیم لە دەوری دووەم (٧٠) نمرە وەرگرم.

التسلسل ٨٦٢٣

وزارة المعارف العراقية

شهادة الدراسة الابتدائية

إن محمد مصطفى ابراهيم من طلاب الخارجين في لواء السليمانية قد نجح في الامتحان العام للدراسة الابتدائية لسنة ١٩٥١-١٩٥٢ وأحرز ثلاثمائة تسعاً وثمانين درجة من مجموع خمسمائة درجة وبذلك عُدّ أهلاً للقبول في المدارس المتوسطة.

صادق عليها

التاريخ ٢٠/١٠/٩٥٢

مدير معارف لواء السليمانية

متصرف لواء السليمانية

| | |
|---|---|
| اسم الطالب | محمد مصطفى |
| اسم الأب والشهرة | ابراهيم محي الدين |
| تاريخ الميلاد | ١٩٢٤ |
| مسقط الرأس | قرية زلم |
| الجنسية | عراق |
| محل الاقامة | السليمانية - محلة ملكندي |

## بۆ یەکەمجار
## تەختە ڕەش لەمزگەوتدا

ڕۆژێك بە فەقێکانی شارم وت: هەمیشە مامۆستاکانی مەعاریف ڕەخنەمان لێ دەگرن چونکە ئێمە حیساب و جەبر و فیزیا و کیمیا نازانین، هەرچەندە خوێندنی ئێمە زیاتر و قورسترە لە هی ئەوان، لەبەرئەوە ڕۆژانی سێ شەممە و جومعە ئەو وانانە دەڵێمەوە لە مزگەوتەکەم کێ دەیەوێت بێت.

ئینجا تەختەیەکی ڕەشم لە مزگەوت هەڵواسی، کە ئەمە یەکەمجار بوو لە کوردستاندا شتی وا ڕوو بدات - وەکو من بزانم -، هەموو خەڵکی گەڕەکەکە دەهاتن و سەیریان دەکرد و سەرسام مابوون.

فەقێکانی شاری سلێمانی بەسوختە و موستەعیدەوە بۆ ماوەی دوومانگ، هەر هەفتەیەك دوو ڕۆژ، سێ شەمە و جومعە، لەبەیانییەوە دەهاتن بۆ مزگەوتەکەم (مزگەوتی بن تەبەق) لەسەر فەرشەکان ریز لەدوای ریز دادەنیشتن و ڕوویان ئەکردە ئەو سەبورەیەی هەڵمواسیبوو بەدیوارەکەدا، منیش لەبەردەمیاندا رادەوەستام دەرسی حساب و جەبر و هەندەسە و جوگرافیا و دەرسەکانی تری مەکتەب کەفێری بووبووم پێم دەوتن، هەرشتێك پێویستی بەنووسین بکردایە بەتەباشیر لەسەر تەختە ڕەشەکە بۆم دەنووسین.

من بۆیە ئەمە هات بەمێشکمدا -لەوەو پێش باسم کرد- کە زۆر زانای گەورە لە کورد هەڵکەوت وەك قزلجی، پێنجوینی، قەرەداغی، مەلای نۆدشە، مەلا قادری گەورەی بیارە، سەدانی تر کە هەریەکێك کەمتر نەبوو لە ئیمامەکانی

ئیسلام وەك (رافعی و رەمەلی) لە شافعییەکان، کاسانی و حەسکەفی و إبن الهمام لە حەنەفیەکان، أشهب و سحنون و مصعب لە مالکییەکان و إبن تیمیه و إبن قیم لە حەنبەلیەکان. لەگەڵ ئەوەش هیچ بەرهەمێکیان بەجێ نەهێشت، چونکە هەموو ژیانیان دابەشبوو بەسەر چەند فەقێیەك کە هەر رۆژە یەك دەرسی دەوتەوە بەو فەقێیە و هەریەکە (مەنهەجێکی) جیاوازی هەبوو.

ئینجا ئەو فەقێیە کە بەو جۆرە پێ دەگەیشت چەند ووشەیەکی لە حاشیەوە فێردەبوو، دەیکرد بە فیز و فشە بەسەر ئەوانی تردا کە نەیاندەزانی، تەنها لەو کتێبەدا دەیزانی بخوێنێتەوە، چونکە بەمەرەکەبی سور سەر و بۆری دەکرد، ئەگەر لەباتی هەمان (کتێب) کتێبێکی ترت بۆ بهێنایە نەیدەزانی بەدەرس بیلێتەوە، هەتا دوێنێش خەتیبەکانی مزگەوتەکان (إبن نباتە)یان ئەخوێندەوە کە بریتیە لە (٤٠) خوتبە هەریەکە لە جومعەیەکدا بۆ ساڵێك، چونکە لە ساڵێکدا (٤٠) هەینی هەیە.

وەك جارێکی تریش وتم، مامۆستاکان ئەوەندەی کتێبی لاوەکیان دەخوێندەوە، ئەوەندە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەریان ((صلی الله علیه وسلم)) نەئەزانی.

## بۆچی سلێمانیم بەجێ هێشت؟

**ئەم کردەوەیەی من وای کرد کە ماموستاکان لەبەر ئەم هۆیانە پیلانێك لەدژم دابنێن:**

**یەکەم:** فەقێکان هی ئەوان بوون ئەهاتن بۆ لای من.

**دووەم:** ئەم دەرس وتنەوەیەی منیان بەپێچەوانەی ڕەوشتی ئایینی ئیسلام دادەنا.

من بۆ خۆم ڕۆژێك لەگەڵ ماموستا مەلا عبدالکریم مدرس و خوالێخۆشبوو ماموستا (شێخ نوری شێخ بابا علی) ڕۆشتین بۆ ماڵی خوالێخۆشبوو (حاجی مەلا عینایەت).

کاتێك چامان دەخواردەوە حاجی مەلا عینایەت لە ماموستا عبدالکریمی پرسی: بیروباوەڕت چییە بەرانبەر بەخوێندنی مەکتەب؟

منیش پێش وەڵامەکەی ماموستا مەلا عبدالکریم کەوتم و وتم: ئەوەی منالی خۆی بخاتە مەکتەب کافر ئەبێ.

مەلا عینایەت چایەکی بەدەستەوە بوو لە داخاندا داینا، چونکە تازە دوو مندالی خستبووە مەکتەب بەزۆری ژنەکەی.

وتی: مەلا بۆچی کافر ئەبێ؟

وتم: بە منطق بۆت ئیسپات ئەکەم: ئەو مندالەی ئەچێتە مەکتەب کافر ئەبێ، هەرکەس ببێت بەهۆی کافربوونی یەکێکی تر بۆ خۆشی کافر ئەبێت.

ئەم هەڵەیە یەکێکە لە سەدان هەڵەکانی ژیانم، بەهۆی جۆری خوێندن و بیروباوەڕی چەوتەوە سەپاندم بەسەر مەلا عینایەتدا. من جگە لەوەی حوکمەکەم هەڵە بوو، لەوەشدا هەڵە بووم کە پرسیارەکە لەمن نەکرا بەڵکو لە مامۆستا مەلا عبدالکریم کرا، کە لە من گەورەتر بوو، لەمن زانا تر بوو، مامۆستام بوو، مامۆستای مامۆستاشم بوو. جگە لەمانە، لەهەمووی ناشیرینتر ئەوەیە یەکێك پرسیار لە یەکێك بکات یەکێکی تر خۆی تێ هەڵقورتێنێ وەڵامی بداتەوە.

بەسەر بردنی رۆژ و رۆژگار لەگەڵ پیاوی نەزان فێری زانایی و ژیریت ئەکات، ئەگەر بیر بکەیتەوە لە نەزانی ئەو، بەم بۆنەیەوە شتێکی خۆشتان بۆ ئەگێڕمەوە:

لە ساڵی (١٩٦٢ز) لە قۆناغی (٢) لە کۆلیجی قانون (زانکۆی بەغدا)بووم، لەکاتی پشوودا هاتمە دەرەوە، کوڕێکی گەنج ڕووبەڕووم هات بە پێکەنینەوە، سەلامێکی گەرمی کرد و زۆر بەڕێز بوو وتی: ئەمناسیت؟ وتم: نا.

وتی: من کوڕی حاجی مەلا عینایەتم، باوکم ناردوومی بۆ لای تۆ راسپاردەیەك هەیە پێتی ڕاگەیەنم. باوکم زۆر سەلامت لێ ئەکات و ئەڵێت تۆ دووجار کافریت، خۆت لە مەکتەبی و مناڵەکانیشت لە مەکتەبن.

راسپاردەکەم زۆر پێ خۆشبوو، لەبەر ئەو گۆڕانەی بەسەرما هات تۆزێ لە ئایین و لە ژیان تێگەیشتم، پیاوەتیەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ عبدالله خانی دزڵی و، هەندێك لە مامۆستاکانی سلێمانی کە منیان دەربەدەر کرد. ئەمەش بەرزی و حیکمەتی فەرموودەکەی خوا پیشان دەدات کە ئەفەرمووێ:

﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ﴾.(١)

واتە: شت هەیە لە ژیاندا ئێوە بەخراپی ئەزانن کەچی لەپاشە رۆژدا بۆتان دەرئەکەوێت چاکە.

---

(١) سورة البقرة: ٢١٦.

﴿ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ﴾.(١)

کاتێك کە عبدالله خانی دزلی بوو بەهۆی ئەوەی منماڵئاوایم لە دێی زەڵم کرد، لام وابوو ئەوە سەرەتای نائومێدییە لە ژیانمدا و ڕووە و ژیانێکی رەش دەڕۆم، چونکە زەڵم کە جێگای باوباپیرمە، بەهەشتێکە بەڕووی ئەم جیهانەوە، لێی بێبەری کرام نەیان هێشت سوود لە ژیانی دێیەکەم وەربگرم.

هەروەها هەندێك لە مامۆستاکانی سلێمانی پیلانیان بۆ گێڕام، ناچاریان کردم شارە خۆشەویستەکەم بەجێ بهێڵم و واز لە دەرس وتنەوەی ئایینی ئیسلام بهێنم، کە لەلام لە هەموو شتێك گرنگتر و شیرین تر بوو، زۆر هەستم بە بەدبەختی خۆم و تاریکی ژیانی پاشەڕۆژم کرد، کەچی بە پێچەوانەوە خوا ئەو کردەوانەی لەگەڵ مندا کران کردی بەهۆی بەختەوەریم و ژیانێکی پڕ لە کامەرانی، کە ئێستا هەستی پێ دەکەم، هەموو جار فاتحە دەخوێنم بۆ گیانی ئەو بەگانە و ئەو مامۆستایانەی کە بوون بەهۆی ئەوەی کە من دەربەدەر ببم و بکەومە خاکی عەرەبستان، بەڕاستی فەرمودەکەی خوا زۆر ئاشکرا و زۆر راستە، مرۆڤ نازانێت لە ژیانیدا چاکی و خراپی لەچییەوە پەیدا دەبێت، پێشکەوتن و دواکەوتنی هۆکانی چییە.

بێگومان مەبەستم لە مامۆستاکانی سلێمانی هەموویان نین، بەڵکو بەشێکی زۆریان پەیوەندیم لەگەڵیان زۆر باش بوو، هەردەم سەرمان لەیەکتر دەداو ئەگەر شتێك بوایە لەبابەتی ئایینەوە بە هەمومانەوە لێکۆڵینەوەمان لێ دەکرد و لەسەری رێك دەکەوتین.

**ئینجا بگەڕێینەوە سەر مامۆستاکانی سلێمانی:**

مامۆستا (م.ر) کە پیاوێکی دیار و دەرکەوتوو بوو لە شارەکەدا، زۆر تێکەڵی لەگەڵ پیاوانی میریدا هەبوو، چەند مامۆستایەکی بردبوو لەگەڵ خۆی بۆلای

---

(١) سورة النساء: ١٩.

(متصرف) و پێی وتبوو: مەلای مزگەوتی بن تەبەق هەموو هەفتەیەك دووجار فەقێکانی ناو شارەکە کۆ دەکاتەوە، بەناوی دەرس وتنەوە حیزبێکی دروست کردووە ئەم فەقێیانە پەیوەندی دەکەن بەم حیزبەوە.

(متصرف)ی سلێمانی ئەوکاتە عەرەب بوو ناوی (مزاحم ماهر)بوو، تا کاتی ئەم نووسینە لە بەغدایە لەژیاندایە، لەسەر وتەی مامۆستاکان هیچ شتێکی نەکرد دژی من، بەقازی شێخ محمدی خاڵی وتبوو: تۆ ڕات چییە لەم مەلایە؟

وتبووی: ئەمە تەنها مەلایەکە کە بە دڵ و گیان دەرس بەفەقێ دەڵێتەوە بێ گوێدان بە موچە و بەرانبەر، من و تۆ چەند دوورین لە حیزبایەتی، ئەویش ئەوەندە دوورە.

ئینجا جۆری پیلانەکەیان گۆڕی و مەنعی فەقێیەکانیان کرد بێن بۆ مزگەوتەکەم.

ئەو پیلانگێڕانە لە شارەکەدا هەموویان لە دە مەلا کەمتر بوون، ئەوانیش بۆیە ئەوەیان دەکرد، چونکە فەقێکانیان بەدزییەوە دەهاتنە لای من دەرسەکەیان دوبارە دەخوێندەوە.

ڕۆژێك قازی شێخ محەمەدی خاڵ ناردی بەشوێنمدا وتی: یەك شەیتان ئادەمی لەبەهەشت کردە دەرەوە، ئێستا لەسلێمانی چەند شەیتانێك هەن دەیانەوێت تۆ لەشارەکە بکەنە دەرەوە.

# ڕیش تاشینم بۆ یەکەمجار

لە ماوەی ژیانی فەقێیەتی و مەلایەتیمدا ریشم نە ئەتاشی، چونکە بەلامەوە ریش تاشین بۆ مەلا و فەقێ شتێکی جوان نییە، جگە لەوە کە پێغەمبەری خوا درودی خوای لێبێت ریشی بووە و فەرمانیشی داوە بەریش هێشتنەوە، بەڵام لەئەنجامدا ناچاربووم ریشم بتاشم، بۆچی؟ لەبەر ئەم هۆیانە:

هەموو ئەو مامۆستایانەی کەهەوڵیان دەدا تووشی تەنگ و چەڵەمەم بکەن لەگەڵ میریدا، کاتێك کەزانیان هیچیان بۆ ناکرێت لەدژم، رێگەیەکی تریان گرت، ئەویش ئەوە بوو کەلەناو فەقێدا بڵاویان کردەوە کەهەر فەقێیەك ئەچێت بۆ مزگەتەکەی مەلا مستەفای زەڵمی لەشوعبەی خاسەوە وێنەی دەگیرێت و محاسەبە دەکرێت، لەترسی ئەوە فەقێی شارەکە نەیاندەوێرا بێن بۆ لام، فەقێکانی خۆیشم هەر رۆژە یەکێکیان مزگەوتەکەی بەجێ دەهێشتم، ئەچوو بۆ مەدرەسەیەکی تر، بەمجۆرە لام چۆڵ بوو تەنها یەك فەقێم مابوو، ئەویش مەلا صاڵح کانی چناری بوو (جمع الجوامع)ی لام ئەخوێند.

پێم وت: بڕیارم داوە سلێمانی بەجێ بێڵم و واز لە مەلایەتی بێنم، وتی: من وەك ئەوانی تر ناچم بۆ مزگەوتی تر تا خۆت چۆڵی نەکەیت. بەڵام دیار بوو ئەویشیان ترساند، رۆژێك بەیانی بوو چووم بۆ مزگەوت، مجەوەرەکە وتی: مەلا صاڵح کتێبەکانی پێچایەوە و چوو بۆ مزگەوتی شێخ سلام.

بەخەفەتەوە دانیشتم و دەستم نایە بەر ئەژنۆم، تەماشایەکی مەدرەسەکەم کرد کە دیم چۆڵ و هۆڵە لەپاش ئەوەی لە بەیانی تا ئێوارە لەبەر فەقێ جمەی دەهات.

وتم: خوا سەبەب کار بگرێت عەهد بێت هەرچی نیشانەی مەلایەتی هەیە ئەبێت لە خۆمی دوور بخەمەوە، یەکەمیان ئەبێت ڕیش بتاشم، چونکە هەموو

ماموّستاکان ڕیشیان هەیە.

گەڕامەوە ماڵەوە، لەڕێگە موسێکم کڕی بەدوو فلس، بۆ یەکەمجار ڕیشم تاشی.

پاش نیو سەعات یەکێك لە دەرگای دا کە چوومە دەرەوە فەقێیەك وەستا بوو، وتی: شێخ عومەری هەڵەبجە باوکی شێخ محەمەدی خەتیب وەفاتی کردووە و مەلاکان لە مزگەوتی شێخ سەلام کۆبوونەتەوە ئەچن بۆ هەڵەبجە بۆ سەرەخۆشی، منیان ناردووە بەدوای تۆدا کە بچیت لەگەڵیاندا.

لەو کاتەدا نەمئەزانی چی بکەم، نابێت بەبێ ڕیش بڕۆم و ناشکرێت نەڕۆم بۆ پرسەکە.

دوایی ڕۆیشتم بۆ لای ماموّستاکان لە نێوان مەلا محمدی چرۆستانی و فەقێیەکدا دانیشتم بستێ ڕیشی هەبوو.

ماموّستا مەلا محمدی چرۆستانی - خوا لێی خۆشبێت - پیاوێکی قسە لەڕوو بوو، شەرمی لە کەس نەدەکرد، قسەکانیشی جوان و ڕاست بوون، وتی: ئێستا مەلا مصطفی زلّمی تەماشای ئەو فەقێیە دەکات کە لە تەنیشتیدا دانیشتووە و بستێك ڕیشی درێژە تەریق دەبێتەوە. وتم: بەخوا تەریق نابمەوە.

ڕووم کردە ماموّستاکان و پێم وتن: ئەمە یەکەمجارە لە ژیاندا ڕیش ئەتاشم، ئەزانن بۆچی؟

وتیان: ئێمەش سەرسام ماوین بۆچی ڕیشت تاشیوە؟

وتم: لەبەرئەوەی ئێوە ڕیشتان هەیە. بەردەوام بووم وتم: پەیمانم داوە لەگەڵ خوا هەتا ئەو ڕۆژەی دەمخەنە گۆڕەوە ڕیش بتاشم، چونکە ڕیش هێشتنەوە لای زۆرکەس بۆتە هۆی خەڵك خەڵەتاندن، بەداخەوە زۆرکەس هەیە کردەوەکەی زۆر زۆر جیاوازە لە شێوە وجل وبەرگ و پیشەکەی.

کێ دەڵێ مەولەویش بەو دەردەی من نەچووە کە ئەڵێت:

ریشـی چـەنی من نەیو حضـور
مەبۆ بتراشوش تا وە نەفخی صور

# مـەلا و مـەلایەتی

فەقێی حوجرەی مزگەوت کاتێك ئەگەیشتە دوا پلەی خوێندنەکەی، بەپێی عورف و عادەتی ئەو کاتە خۆی ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی ئەو مامۆستایەی کە لە دوا پلەی خوێندندا دەرسی پێ دەڵێت لای ئەو ئیجازە وەربگرێت، مانای ئیجازەش ئەوە بوو کە ئەو فەقێیە بۆی هەیە وەك مامۆستاکەی مەدرەسەیەکی ئایینی پێکەوە بنێت، ئەو بابەتانەی زانیاری ئایینی کە خوێندویەتی بەدەرس بیانڵێتەوە بەچینێکی تر لەفەقێی مزگەوت، هەروەها بۆی هەیە بەرنوێژی و نوێژی جومعە و فەتوا و (وعظ) و ئامۆژگاری بکات، هەروەك ئەو مامۆستایەی کە لەلای ئیجازە وەردەگرێت.

بەڵام دەبوایە لە پێش ئیجازە وەرگرتندا شوێنێك بدۆزێتەوە لەدێیەك یان لە شارێك بۆ ئەوەی بچێتە ئەو جێگەیە ببێت بە مەلای ئەو جێگەیە. ئەم جێگەیەش دەبوایە یان لە ڕێگای ئاغای ئەو شوێنەوە بوایە، یان لە ڕێگای شێخێکەوە بوایە، کە دانیشتوانی ئەو شوێنە مرید و مەنسوبی ئەو شێخەن، یان لە ڕێگای مامۆستاکەیەوە، ئەگەر ئەم مامۆستایە پەیوەندیەکی خزمایەتی یان دۆستایەتی هەبوایە لەگەڵ دانیشتوانی ئەو شوێنە، یان لە ڕێگەی خۆیەوە ئەگەر فەقێیەکە ناسراوی یان خزمایەتی هەبوایە لەگەڵ دانیشتوانی شوێنەکە.

لە پاش جێ بەجێ کردنی دۆزینەوەی ڕێ و شوێن بۆ مەلا، ئینجا بۆ ئیجازەکەی مامۆستاکە بەچەند پیاوێکی بازرگان یان دەست ڕۆشتوو لەو شوێنەدا - کە مەلای ئەوێیە - پێی ئەوتن کە یارمەتی ئەم فەقێیە بدەن بۆ تەواوکردنی پێویستیەکانی ئیجازەکە، ئەوانیش ئەرکەکەیان دابەش دەکرد بەسەر

خۆیاندا، یەکێك جبەکەی بۆ ئامادە دەکرد، یەکێك مێزەر و یەکێك جوتە پێڵاوێك، ڕۆژێکیان دیاری دەکرد بۆ ئاهەنگ و کۆبونەوەی ئیجازەکە و خوێندنەوەی بەسەر فەقێیەکەدا.

لەو ڕۆژەدا هەندێك لە مامۆستای ئاینی و فەقێ بانگ دەکران، لەگەڵ هەندێك پیاوماقوڵی شوێنەکە، لە پاشان مامۆستاکەی یان مەلایەکی تری شیاو ئیجازەنامەکەی دەخوێندەوە.

پاشان مامۆستا بۆ خۆی یان مەلایەکی تر هەڵدەستایەوە جامەدانەکەی لەسەری فەقێ ئیجازە دراوەکە دادەگرت و مێزەرەکەی دەبەست بەسەریدا و عاباکەی لەبەر دەکرد، ئینجا دەستی یەکتریان ماچ دەکرد و ئامادەبووان پیرۆزباییان لە فەقێکە دەکرد.

دواتر مامۆستاکە یان دوو فەقێ یان پیاوێکی ناسراو لەگەڵ ئەم مامۆستا تازەیەدا دەچوون بۆ ئەو شوێنەی کە بۆی دیاری کراوە.

لەپاش چەند ڕۆژێك بیریان لەوە دەکردەوە ژنێك بۆ مامۆستا بهێنن بۆ ئەوەی بەیەکجاری لەو شوێنەدا جێگیر ببێت، چونکە ژنهێنان مامۆستاکە جێگیر دەکات و بیر لەوە ناکاتەوە ئەگەر توشی تەنگ و چەڵەمەیەك بێت شوێنەکە بەجێ بهێڵێت و بچێت بۆ شوێنێکی تر.

دەڵێن لەپیاوێکیان پرسی خەڵکی کوێیت؟ لە وەڵامدا وتویەتی: هێشتا ژنم نەهێناوە، واتە ژن هێنان یەکێکە لە گەورەترین هۆی جێگیری و دامەزراندنی مرۆڤ لەو شوێنەدا کە پەیوەندی بە ژن هێنانەکەوە هەیە.

هەروەها وتویانە (الزواج نصف الایمان) واتە: ژن هێنان نیوەی ئیمانە و بیروباوەڕی ئایینی تەواو دەکات، چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی لەکردەوەی خراپ بیپارێزێت.

لە پاش تەواوکردنی ئەم پلەیەش دەبوایە بڕیارێك بدرێت بۆ ژیانی مامۆستاکە، ئەو کاتە موچەیەك نەبوو، نە لە لایەنی میریەوە نە لە لایەنی ئاغاوە یان شێخەوە

یان دانیشتوانی شوێنەکەوە، بەڵکو ئەو مامۆستایە گرنگترین هۆی ژیانی زەکات و سەرفیترەی دێیەکە و ئیسقاتی مردو و خێر و خێراتی تر، کە بۆ هەژار و فەقیر دانراوە لە ئایینی ئیسلامدا. هەندێك جار شکارتە و گەلەجوتیان بۆ مامۆستای ئاینی دەکرد، ئەگەر شوێنەکەی لە ناوچەی کشتوکاڵیدا بوایە.

جگە لەمانە دەبوایە مامۆستای ئاینی پەیوەندییەکی زۆر پتەوی هەبوایە لەگەڵ ئاغای شوێنەکە بۆ ئەوەی ژیانەکەی بەباشی بڕوات، ئاغا ببێت بە پشتیوانی و قوتاری بکات لەو تەنگ و چەڵەمانەی کە دووچاری دەبن لەماوەی ژیانیدا.

لە پاداشتی ئەم پشتیوانییەی ئاغا بۆ مامۆستای ئاینی، دەبوو مامۆستا چاوپۆشی لە هەموو کردەوەیەکی ناڕەوا بکات کە ئاغا بەرامبەر بەدانیشتوانی شوێنەکە ئەیکات، ئاغا یا بەگی وا هەبوو زیاتر لە دە دێ کاسپیان بۆ ئەو دەکرد، هەر کشتوکاڵێکیان بکردایە دەبوایە لەگەڵ ئاغا بەشی بکەن، مامۆستا جارێك لە ئاغای نەدەپرسی کە ئەم دە دێیە لە چ ڕێگەیەکەوە بونەتە موڵکی ئەو، چونکە خوا و پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) فەرمویانەی زەوی و باخ و ئاو یان بەکڕین دەبێت بە موڵکی مرۆڤ یان بەمیرات گرتن یان بەئاوەدانکردنەوەی بە کۆشش و ڕەنج، وەك پێغەمبەر((صلی الله علیه وسلم)) فەرموویەتی:

((من احـیا ارضـا میته فهي له))

واتە: هەرکەس زەوییەکی بێ خاون ئاوەدان بکاتەوە ئەبێتە هی ئەو.

ئاغاکانی کوردستان هەیان بوو دە هەزار دۆنم زەوی بەراوی هەبوو، کە لە لایەن عوسمانیەکانەوە پێی درابوو، بۆ ئەوەی ئاسایش و هێمنی ئەو دێهاتانەی کە پێی ئەدرێن رابگرێت، نەیەڵێت هیچ شتێك یان هیچ جوڵانەوەیەك لەو شوێنەدا لەدژی سەڵتەنەتی عوسمانیەکان رووبدات.

رۆژێك لە رۆژان مامۆستا نەیدەتوانی بەو ئاغا بڵێت: ئەم ئەرز و ئاوە کە دەوڵەتی عوسمانی بەتۆی داوە ئەگەر هی دەوڵەتە ئەوە کەس ناتوانێت

بیبەخشێت، چونکە پێی دەوترێت (الاموال العامة) واتە: ماڵی گشتییە و هیچ کەس ناتوانێت تصرفی تیادا بکات بەپێی یاسای خوا و پێغەمبەر و یاسای دەستکردی ئادەمیزادیش، ئەگەر ئەم ئاو و زەوییە موڵکی یەکێکی ترە، دوبارە خەلیفە ناتوانێت ماڵی یەکێك داگیر بکا و بیدات بە یەکێکی تر، چونکە ئەمەش پێی دەوترێت (غصب) غصبیش تاوانێکی زۆر گەورەیە لە ئاینی ئیسلامدا.

ئەگەر شوێنەکە ئاغای نەبوایە و دانیشتوەکان مرید و مەنسوبی شێخێك بونایە، دەبوایە ئەو مامۆستای ئایینیەش ئەو ڕێگەیەی بگرتایەتە بەر و ببوایە بە مرید و مەنسوبی ئەو شێخە، تا خۆی دڵنیا بکردایە لە ژیاندا، دانیشتوانی شوێنەکە زیاتر خزمەتیان بکردایە و ڕێزیان بگرتایە، زۆر جار هەبوو مامۆستا دەبوو بە خەلیفەی شێخەکە بۆ ئەوەی لە دوو ڕێگەوە ژیانی خۆی دابین بکات: یەکەم: لەڕێگەی مەلایەتیەوە. دووەم: لەڕێگەی خەلیفەگەریەوە. هەر مامۆستایەکی ئاینی ئەم دوو ڕێگەیەی بۆ جێ بەجێ ببوایە نانی ئەکەوتە ڕۆنەوە.

لەم ڕووەوە مامۆستای ئاینی نەیدەتوانی ڕۆژێك لە ڕۆژان بەو خەڵکە بڵێ ئێوە بۆچی زیاتر پشتتان بەشێخ بەستوە لە خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، یەکێك نەخۆش دەکەوێت دەچن بۆ لای شێخ دوعای بۆ بکات، ژنێك منداڵی نابێت دەچێت بۆ لای شێخ تا منداڵی ببێت، لە هەموو تەنگ و چەڵەمەیەکدا پەنا بەشێخ زۆرتر دەبەن تا خوا.

ئەگەر ناڕەواییەکی بدیایە لە شێخ یان لە دەست و پێوەندەکەی، نەیدەتوانی بەشێخ یان بەدانیشتوانی شوێنەکە بڵێ ئەمە ناڕەوایە، بە پێچەوانەی فەرمودەکانی خوا و پێغەمبەرەوەیە.

لەماوەی مەلایەتی و فەقێیەتیمدا، تەنها یەك مامۆستام دی کە ڕاست بێت و لەگەڵ دانیشتوانی شوێنەکە و لەگەڵ شێخ و ئاغا بەڕاستی قسە بکات، ئەویش بریتی بوو لە مامۆستا مەلا سەید عارف چۆڕی - خوا پلەی بەرز بکاتەوە لە لای خۆی-.

کاتێك کە مەلای خورماڵ بوو، هیچ وەخت ناڕەواییەکی لە شێخ یان ئاغا یان میری قبوڵ نەکردووە، بەئاشکرا بە (شێخ حسام الدین)ی دەوت: ئەوەت هەڵەیە و ئەوەت پێچەوانەی ئایینی ئیسلامە، لە کاتێکدا شێخ حسام الدین زیاتر لە چوار پێنج ملیۆن مرید و مەنسوبی لە عێراق و ئێران و تورکیا و پاکستان و سوریا هەبوو، هەموویان بەتەمای ئەوە بوون لە رۆژی قیامەت شەفاعەتیان بۆ بکات.

شایەنی باسە شێخ علاءالدینی بیارە - خوا پلەی بەرز بکاتەوە لای خۆی- خزمەتێکی زۆری مەلا و فەقێی دەکرد، یەکەم شێخێك بوو لە هەوراماندا ئەرکی فەقێ و مەلای گرتبێتە سەرشانی خۆی.

من مەبەستم ئەوە نیە کە توانج لەو شێخانە یان لە کردەوەیان بدەم، چونکە لەو رۆژەدا خزمەتێکی زۆری ئاینیان دەکرد، هەرچەندە لەلایەکی ترەوە بەکەسیان نەدەوت ژیانی مرۆڤ تەنها بۆ ئەوە نیە هەوڵ بدات بۆ بەهەشت، بەڵکو لەسەر هەموو موسڵمانێکە هەوڵ بدات بۆ ژیانی دونیا و ژیانی قیامەت.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: [وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا]. واتە: ئەو بەشەی بۆت دیاری کراوە لە جیهاندا هەوڵی بۆ بدە و لەبیری خۆتی مەبەرەوە کۆشش بکە بۆ ئەوەی لە ژیانی دونیاتدا کامەران بی و لە شارستانی و پێشکەوتندا بیت.

هەروەها وتراوە: (إعمل لدنياك كأنك تعيش أبدا وأعمل لأخرتك كأنك تموت غدا).

واتە: کار بکە بۆ ژیانی دونیات وەك ئەوەی وا بزانیت تۆ هەتا هەتایە دەژیت، بۆ قیامەتیش کۆشش بکە بەجۆرێکی وەها وابزانە سبەینێ دەمریت.

هەروەها وتراوە: (الرجل رجل الدنيا والاخرة)، واتە: مرۆڤ دەبێت پیاوی دونیا بێت و پیاوی ئایین و رۆژی ئاخرەت بێت، کردەوەکانی دەبێت بۆ هەردوو لا بێت، نابێت یەکێکیان واز لێ بهێنێت بۆ ئەوی تریان.

## مـەلا و مـزگـەوت

پەیوەندی مەلا بە مزگەوتەوە شتێکی زۆر سەیرە، چونکە پێویستییەکانی سەرشانی بەپێی ئەم پەیوەندییە ئاسانترین ئیشە کە مرۆڤ پێی هەستێت، لە هەمان کاتدا گرانترین ئیشە.

ئاسانیەکەی لەو ڕووەوەیە، ئەگەر مامۆستا ئاینییەکە دەرس بە فەقێ نەڵێتەوە، ئەرکی سەرشانی تەنها ڕۆژی پێنج جار بەرنوێژییەکەیە. ماوەی ئەنجامدانی هەر نوێژێکیان لە (١٠) دەقیقە زیاتر نیە، واتە هەمووی دەکاتە (٥٠) دەقیقە، لام وایە هەموو ئەرکێکی سەرشانی مرۆڤ ماوەکەی زیاترە لە (٥٠) دەقیقە، لەگەڵ ئەوەی ئەرکی سەرشانی بەجێدێنێت لەهەمان کاتدا مووچەی لەسەر وەردەگرێت. واتە لەم ڕووەوە پێویستی سەرشانی زۆر ئاسانە، جگە لەوەی خۆی لەسەریەتی وەك تاکێکی موسڵمان لەم پێنج کاتەدا نوێژ بکات، واتە وەك هیچی نەکردبێت وایە. چونکە جیاوازیەك نیە لە نێوان ئەوەی نوێژەکە بەتەنها بکات یان ببێت بەپێش نوێژ.

گرانیەکەشی لەو ڕووەوەیە، چونکە ڕۆژانە بۆ ماوەی زیاتر لە (١٤) کاتژمێر بەستراوە بە مزگەوتەکەوە، ئەمەش دوو هێندەی ماوەی کاری هەموو موچە خۆرێکی میرییە لە هەموو فەرمانگەکاندا.

چونکە مامۆستای ئاینی دەبێت پێش ڕۆژ بونەوە بۆ بانگی بەیانی لەخەو هەستێت و بچێت لە دەرگای مزگەوت بدات و مجەوەرەکە دەرگای بۆ بکاتەوە، لەپاش دەستنوێژ هەردەم سەیری کاتژمێرەکە بکات بزانێت کەی بانگ دەبێت، ئینجا خۆی یان مجەوەرەکە بانگ بدات و نوێژەکە بکەن، بەهەمان شێوە لەکاتی

نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا مامۆستا دەبێت لە پێش کاتی نوێژەکە چاوەڕوانی بانگ بکا، بەینی نوێژی شێوان (عیشا) و نوێژی بەیانی زیاتر نیە لە (١٠) سەعات واتە مامۆستا تەنها دە سەعات لە شەو و ڕۆژێکدا دەوامی نیە، کاتی خۆی بەمجۆرە بوو، وەك ئێستا نەبوو هەموو مزگەوتێك بانگدەری هەبێت.

بەمجۆرە ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان مامۆستا ئامادە نەبێت لە مزگەوتدا بۆ پێشنوێژی بۆڵەی بەسەردا دەکرێت، ئەوترێ ئێمە مامۆستای ئاینیمان بۆچی ڕاگرتووە.

بەرامبەر بەم دەوامە دوور و درێژەی موچەکەی ئەوکاتە بریتی بوو لە زەکات ساڵی جارێك ئەگەر هەبێت، لە سەرفیترەی ساڵی جارێك لەمانگی ڕەمەزاندا، لە سەرقەڵەمانە ئەویش خۆی و بەختی، هی وا هەبووە بەدوو مانگ هێلکەیەکی لەسەر قەڵەمانە دەست نەکەوتووە.

دیارە ئەمە بۆ هەموو مامۆستا ئاینیەکانی لادێکانە، بەڵام مامۆستای ئاینی شارەکان لەم دواییەدا - لە سەرەتای چلەکان-، هەر مامۆستایەکی ئاینی لە لایەن میریەوە (٧٥٠) فلس موچەیان بۆ بڕینەوە، هەموو سەری مانگێك دەچوو لە فەرمانگەی ئەوقاف وەری دەگرت، هەر بەو جۆرە تا ساڵی پەنجاکان خوا لێخۆشبوو (عبدالرحمن خضر) بوو بە بەڕێوەبەری گشتی ئەوقاف، چونکە ئەوکاتە ئەوقاف وەزارەتی نەبوو، ئەم پیاوە زۆر پەیوەندی بە ئایینی ئیسلامەوە بەهێز بوو، بەحاڵی ژیانی مامۆستای ئاینی دەزانی، ئەو هات موچەی هەموو مامۆستای ئاینی کرد بە (١٨) دینار، مجەوەریش بە (١٠) دینار، میری ڕازی نەبوو لەسەر ئەم زیادەیە، چونکە لەلای میری ئەمە زۆر بوو بۆ مامۆستای ئاینی، لەبەرئەوە (١٨) دینارەکەیان کرد بە (١٠) دینار بۆ مامۆستای ئاینی (١٠) دیناری مجەوەرەکەش کرا بە (٥) دینار.

شایانی باسە ئەوانەی لە شارەکان دادەنیشتن هەفتەی جارێك بەیانیان دەچوون بۆ حەمام، ئەو کاتە هیچ کەس لە ماڵی خۆیدا حەمامی نەبوو، بەڵکو

لە شارەکەدا دوو سێ حەمام هەبوون لە نوێژی بەیانیەوە تا نیوەڕۆ بۆ پیاوان بوو، لە نیوەڕۆوە تا ئێوارە بۆ ژنان بوو، من زیاتر لە (٥) ساڵ مەلا بووم لە سلێمانی لەبەر نوێژی بەیانی نەمدەتوانی بچم بۆ حەمام، ئەگەر پێویستم بە خۆشتن ببوایە دەبوایە پێش بانگی بەیانی و بەر لەوەی بچم بۆ مزگەوت، دابەزم بۆ سەر کارێزی مزگەوتەکە، کە بە(٢٠) پلیکانە دەگەیشتیە حەوزەکەی، جاری وا هەبوو کات زستان بوو، ڕێگا و بان پڕ لە بەفر بوو، کە دەچوومە ناو ئاوەکەوە و بیرم لەهاتنە دەرەوە دەکردەوە، کە ئەبێ جلەکانم بەتەڕی لەبەر بکەم و دەرەوەش زۆر سارد بوو، دەچوومە مزگەوتی چۆڵ، مجەوەرەکە ئەهات دوو سەلکە داری دەخستە ناو سۆپاکە و نەوتی بەسەردا دەکرد کە بەکاتژمێرێك گەرم نەدەبوو، من لە سەرمادا هەڵدەرزیم وەك کەوی سەربڕاو، قرچەی ددانم دەهات لەبەر سەرما، چاوەڕوانیم دەکرد یەکێك بێت بەرنوێژیەکەی بۆ بکەم.

ڕۆژێك لە ڕۆژان بە هەڵەدا چووم، بەیانی پێش نوێژ چووم بۆ حەمام، لەبەرئەوە فریای بەرنوێژی بەیانی ئەو ڕۆژە نەکەوتم، ئینجا لە دوایدا لێیان پرسیم بۆچی نەهاتی بۆ نوێژی بەیانی؟ وتم: لەبەرئەوەی چوم بۆ حەمام، ئینجا ئەم ڕۆشتنی حەمامەی من بوو بە دەنگ و باس لە گەڕەکەکەدا.

## مامۆستای ئاینی و
## رۆژی هەینی

خوای گەورە سێ کۆبونەوەی بۆ موسڵمانەکان داناوە بۆ ئەوەی ئاگایان لە یەکتر هەبێ، وەك یەك خێزان بە بوون و نەبونی یەکتر بزانن، ئاگایان لە ساغی و نەخۆشی و هەژاری و تەنگ و چەڵەمەی یەکتر هەبێت، بۆ ئەوەی یارمەتی یەکتر بدەن، وەك برا یارمەتی برا دەدات خوشك یارمەتی خوشکی دەدات، ئەمەش لەسەر فەرمودەکەی خوا لە قورئانی پیرۆزدا کە دەفەرمووێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ ﴾.

واتە: ئەی ئادەمیزاد من ئێوەم لە نێر ومێیەك دروست کردووە (لە باوك و دایکێك)، ئێوە هەریەك جۆرە زمان و جۆرە ژیانێکی تایبەتیتان هەیە ئەو (تفاوت)ە لە نێوان ئێوەدا، بە زمان و بەرەنگ و بەجێگا و بەهۆکانی ترەوە نابێت کاربکاتە سەر برا و خوشکایەتیتان، بەڵکو دەبێت یارمەتی یەکتر بدەن پشتی یەکتر بگرن هەردەم بە خۆشی و شادی و ئاشتی بژین، تواناتان یارمەتی بێ توانا بدات، دەوڵەمەندتان یارمەتی هەژار بدات، زاناتان نەزان فێری زانایی بکات، هەروەها پەیوەندیتان پتەوبێت لە هەموو جۆرە بابەتێکی ژیانەوە.

**لەم ڕووەوە خوا فەرمانی داوە بە موسڵمانان سێ جار کۆ ببنەوە:**

**یەکێکیان** کۆبونەوەی ڕۆژی پێنج جارە لە مزگەوت دا بۆ نوێژی جەماعەت بۆ ئەو کەسەی کە پێی بکرێت، چونکە نوێژی جەماعەت واجب نیە، بەڵکو سونەتە ئەگەر یەکێك بیکات پاداشتی لای خوا هەیە بە چاکەوە، ئەگەر نەیکات بە گوناهبار لە قەڵەم نادرێت لای خوا، ئەم کۆبونەوەیە لە مزگەوت سودەکەی ئەوەیە کە هەردەم دانیشتوانی دەوروبەری مزگەوتەکە ئاگاداری یەکتر ئەبن.

ئەمڕۆ کە لە چەرخی ٢١ی زاینی دا دەژین هۆی نزیك بونەوەی وڵاتەکان زۆر زۆر بووە، بەجۆرێکی وەها لە هەر دەوڵەتێك لەم جیهانەدا شتێك ڕوو بدات گەورە یان بچوك، هەموو مرۆڤێك لە دانیشتوانی سەر زەمین لە پاش کەمتر لە کاتژمێرێك ئەم هەواڵەیان پێ دەگات، نزیك بونەوەی ئادەمیزاد لە هەموو دەوڵەتەکان بەجۆرێکی وەهایە کە ئەگەر شتێکی ناهەموار لە هەر دەوڵەتێك ڕوو بدات کاریگەر دەبێت لەسەر ژیانی دانیشتوانی دەوڵەتەکانی تر.

بۆ نمونە کارەساتەکەی جەنگی کەنداو لە ساڵی (١٩٩١)دا کە دەوڵەتەکان بە سەرۆکایەتی ئەمریکا هێرشیان کردە سەر سوپای عێراق بۆ ئەوەی لە کوێت بچێتە دەرەوە، ئەم کارەساتە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە هەموو وڵاتدا تێکدا.

**کۆبونەوەی دووەم** هەفتەی جارێکە، کە بریتییە لە نوێژی هەینی، تیایدا بەپێی بارودۆخی ئەو وەختە وتارێك پێشکەش مسوڵمانان دەکرێت و لە کێشەو گرفتەکانی دەوروبەر ئاگادار دەکرێنەوە.

ئینجا لەم ڕووەوە ئەو مامۆستایەی کە دەچێتە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەبێت بابەتی وتارەکەی بریتی بێت لەو کارەساتانەی ناوخۆیی یا دەرەوە، بەجۆرێکی وەها باسی بکات کە بیبەستێتەوە بە فەرمودەیەك لە فەرمودەکانی خوا یان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

بەڵام بەداخەوە تا ماوەیەك لەمەوپێش زۆر بەدەگمەن دەست دەکەوت مامۆستایەك هەڵبسێت بەم جۆرە ئیشە، یا لەبەر نەخوێندەواری مامۆستاکە،

یان لە بەر هەست پێ نەکردنی ئەو، یان لە بێ ئاگایی لەو شتانەی کە ڕوو دەدەن لەم جیهانەدا.

لە ماوەی ئەو دوانزە ساڵەی فەقێ بووم و نزیکەی دە ساڵیش مەلا بووم لە مزگەوتەکانی کوردستاندا، کە ماموّستای ئاینی دەچووە سەر مینبەر کتێبێکی دەگرت بەدەستەوە پێیان دەوت (خوتبەکانی ئیبنولنەباتە). ئەم کتێبە بریتی بوو لە (٤٠) خوتبە بۆ ماوەی یەك ساڵ، هەر خوتبەیەك دانرا بوو بۆ ڕۆژێکی هەینی، ئەم ماموّستایە کە دەچووە سەر مینبەر کتێبەکەی دەگرت بەدەستەوە، وەك گۆرانی بلێت خوتبەکەی ئیبنونەباتەی دەخوێندەوە و دەیلەرانەوە، بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە ئەم دانیشتوانە هەموو کوردن زمانی عەرەبی نازانن، خوتبەش وانەیەکە دەوترێت بەنوێژکارەکان بۆ ئەوەی سودێکی لێ وەربگرن لە بابەت ئایینەوە یان لە بابەت ژیانیانەوە. ئەو ماموّستا ئاینییە هەرچییەکی بوتایە لەکەم و زۆر، لە چاك و خراپ، یەکێك خوێندەوار نەبووایە تێی نەدەگەیشت، چونکە بەزمانەکەی خۆی نەبوو.

بەڵام ئێستا سوپاس بۆ خوا دۆخەکە گۆڕاوەو ماموّستاکان وتار بەزمانی کوردی دەدەن و زۆربەشیان بابەتەکەیان وا بەچاکی ئامادەکردووە بێ ئەوەی کاغەز بەدەستەوە بگرن وتارەکەیان دەدەن و پەیوەستی دەکەن بەبابەت و ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەوە.

خوای گەورە ئاینی ئیسلامی بە زمانی عەرەبی ناردووە بۆ پێغەمبەری خوا، بەڵام بۆ هەر گەلێك هەیە بە زمانی خۆی مانای فەرمودەکانی خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بڵاو بکاتەوە.

لە ساڵی (١٩٥٧ز) ماڵمان لە جەلەولا بوو، بەسەردان چووم بۆ خانەقین، لەوێوە چووم بۆ لای خوا لێ خۆشبوو ماموّستا مەلا سید عبدالحکیم، ئەم مەلایە پیاوێکی زۆر چاك بوو، هەردەم ئاواتی ئەوە بوو ڕۆژێك لە ڕۆژان ژیانی کامەرانی ئەو گەلەی ببینێ، بەڵام بەداخەوە لە هەمان ساڵدا کۆچی دوایی کرد. ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەینی بوو، وتی: ئەمرۆ تۆ میوانی منی، لە پاش نوێژی

جومعە دەچینەوە بۆماڵەوە. منیش لەبەر خۆشەویستیمان نەم توانی داواکەی ڕەت بکەمەوە، کاتێك کە چووە سەر مینبەر دەبینم کتێبەکەی خوتبەکانی ئیبنولنەباتەی بەدەستەوەیە، ئەم خوتبانە هەریەکی مناسبەی هەبوو لەگەڵ مانگەکەی خۆیدا، ئەو ڕۆژە ڕۆژی شەهید کردنی ئیمامی حوسێن کوڕی ئیمامی عەلی بوو -خوا لە هەردوکیان ڕازی بێت-، بە کورتی خوتبەکە بریتی بوو لەمە:

کاتێك حوسێن شەهید کرا، لە ئاسمانەوە وەك باران خوێن دەباری، لە زەمین لە هەموو شوێنێك خوێن هەڵدەقولا، لەبەرئەوەی کە خوێنی حوسێن بەبێ تاوانی ڕژا بەسەر زەمین دا، دوا ڕۆژی ژیانیان بەبێ گوناهی و بە ناڕەوایی تەواوکرد.

کاتێك لە نوێژەکەی بوەوە و چوینەوە بۆ ماڵەوە لێم پرسی وتم: مامۆستای ئەوەی فەرمووت لە فەرمودەی ئیبنولنەباتەدا، خۆت باوەڕت پێی هەیە؟

وتی: ئەی چۆن، نازانیت ئەو کوشتنە چەند ناڕەوا بوو.

وتم: لە شەهید بوونی حوسێنەوە هەتا ئەمڕۆ بە ملیۆنەها ئادەمیزاد بەناڕەوایی کوژراوە و خوێنی ڕژاوەتە سەر زەمین، بۆچی بۆ یەکێك لەوانە لە ئاسمانەوە دڵۆپە خوێنێك نەکەوتە خوارەوە و لە زەویشەوە دڵۆپە خوێنێك هەڵنەقولا.!

وتم: مامۆستا ئەمانە هەمووی خورافیاتە، هەمووی هەڵبەستراوە، تۆ پیاوێکی خوێندەواری ژیر و زانایت، نابێت دوای ئەم شتە پڕ و پوچانە بکەویت، یان بە خەڵکی تری بڵێیت، وتم: لە ئاینی ئیسلامدا شتێك نیە بەپێچەوانەی ژیری ئادەمیزادەوە بێت.

بەداخەوە بۆم دەرکەوت مامۆستا، لەگەڵ ئەوەی پیاوێکی هەڵکەوتوو و زیرەك و ژیر بوو، لە بەر چاکی و دڵپاکی خۆی، بە گیان و بە دڵ باوەڕی بەم خورافاتە هەبوو، بەڵام دواکەوتنەکەی لە دواکەوتنی ئەو خوێندنەوە بوو کە پەیوەندیەکی زۆر کەمی هەبوو لەگەڵ ژیانی جیهان یان لەگەڵ ئایینی ئیسلام.

**کۆبونەوەی سێیەم** کۆبونەوەیەکی ساڵانەیە، ساڵێ جارێك لەمانگی (ذي الحجة) موسڵمانان پێی هەڵدەستن، بۆ ئەو موسڵمانانەی کەتوانای ماڵی هەیە یەك جار لەتەمەنیدا فەرزە، ئەویش بریتیە لە حەج.

بەداخەوە زۆر لە موسڵمانان کە چون بۆ حەج، یان لە مەولا دەچن بۆ حەج، نە لە مانای حەج گەیشتوون نەدەزانن خوای گەورە حەجی بۆچی داناوە، ئەو حاجیانەی کە بە دەور و پشتی کەعبەدا دەسوڕێنەوە بە هەموو بیروباوەڕیانەوە لایان وایە خوا لە ژوورەوە لەناو ئەم خانوەدا لەسەر کورسیەك دانیشتووە پێشوازی ئەوانە دەکات کە بەدەوریدا دەسوڕێنەوە، جاران ئەم بیروباوەڕە هەبوو، هەرچەندە ئێستا لەم رووەوە خەڵك تاڕادەیەك باشترە. هیچ بیر لەوە ناکەنەوە کە خوا شوێن و مەکانی بۆ خۆی دانەناوە، بەڵکو لە هەموو شوێنێك هەیە.

موسڵمانان کە دەچن بۆ حەج لایان وایە حەج بیتاقەیەکە دەیبرن بۆ داخڵ بوونی بەهەشت، ئیتر نازانن کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چۆن حەجی کردووە، بۆچی هاتووە بۆ حەج؟

ئەوەی بە قوڵی لە ئاینی ئیسلام بگات دەزانێت حەج کۆنگرەیەکی گشتی ئیسلامییە، نوێنەری هەموو وڵاتێك لە وڵاتە موسڵمانەکان بریتییە لەو حاجیانە، بۆ ئەوەی لەوێ کۆببنەوە لە نزیکی کەعبەدا کە نیشانەی یەکێتی موسڵمانەکانە، جل و بەرگی خۆیان لاببەن و جل و بەرگی مردوو لەبەر بکەن، کە پێی دەوترێت (إحرام)، بۆ ئەوەی هیچ جیاوازیەك نەمێنێ لە نێوان گەورە و بچوك، دەوڵەمەند و هەژاردا، لە نێوان هەموو نەتەوەکاندا، بۆ ئەوەی کەس خۆی بەزیاتر نەزانێت لە یەکێکی تر.

ئینجا لەپاش ئەنجامدانی مەراسیمی حەج، بەدڵێکی پاك دابنیشن هەرکەسێك تەنگ و چەڵەمەی وڵاتەکەی خۆی باس بکات بۆ ئەوانی تر، بۆ ئەوەی ئاگاداری بارودۆخی یەکتر بن و، بە هەموویانەوە بڕیار بدەن کە هەر گەلێك یارمەتی گەلەکانی تر بدات، لەوانەی کە ستەمیان لێ کراوە، لەوانەی کە مافەکانیان زەوت کراوە، لەوانەی کە دوچاری هەژاری و نەبوونی بوون، لەوانەی وڵاتەکەیان کشتوکاڵی نیە یان سەرچاوەی کانزایی یان شتێکی تری نیە ببێت بەهۆی بژێوی ژیانیان، هەر بڕیارێك بدرێت لەوێ دەبێت ملپێچی نەکرێت لە جێ بەجێ کردنی، ئەمەیە مەبەستی حەج کردن.

ئەمە سوودێکی گشتی کۆنگرەی گشتی حەجە.

لە سوودە تایبەتییەکانی هەر مرۆڤێك لە حەجدا ئەوەیە، بۆنموونە کە دەچێت ڕەجمی شەیتان دەکات، مانای ئەوە نیە کە شەیتان لەوێ دانیشتووە و ئەمان بچن بەردبارانی بکەن، بەڵکو مەبەست لە شەیتان نەفسی ئینسانە، هەرکەسێك شەیتانی خۆی وا لەگەڵ خۆیدا، کە خوا ناوی دەبات بە فەرمانلەری شەڕ و ناڕەوایی، وەك لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾[1].

واتە: نەفسی ئینسان هەردەم خاوەنەکەی هان دەدات بۆ خراپە و بۆ شتی ناڕەوا.

ئەو حاجیەی کە ڕەجمی شەیتان دەکات، مانای ئەوەیە پەیمان دەدات بە خودا کە من ڕەجمی ئەو نەفسە دەکەم کە هەردەم هانم دەدا بۆ خراپە، کاتێك چومەوە وڵات و شوێنی خۆم هیچ شتێك ناکەم کەناڕەوا بێت و بە پێچەوانەی فەرموودەکانی خوا و پێغەمبەر بێت.

بەڵام بەداخەوە ئەوانەی کە دەچن حەج دەکەن زۆریان بە سەفەری سیاحەتی دەزانن، یان بۆ قاچاخچێتی دەچن، یان بۆ چەند دۆلارێك دەچن کە میری دەیان داتێ بەناوی ڕێ پیشاندانی حاجیان.

بە کورتی ئەتوانم بڵێم زۆرێك لە موسڵمانان تا ئێستا لە موسڵمانێتی نەگەیشتوون، تا ئێستاش نازانن نوێژ بۆچییە و ڕۆژو بۆچییە و حەج بۆچییە؟، لەبەرئەوە ئەگەر کردەوەی موسڵمانێك بەراورد بکەی لەگەڵ کردەوەی گاورێك دا، دەبینی هەندێجار جیاوازییان زۆر کەمە، ئەویش لەبەرئەوەی ئەو موسڵمانە نازانێت بۆچی نوێژ دەکات، یان بۆچی ڕۆژو دەگرێت، یان بۆچی دەچێت بۆ حەج، دیارە ئەم جۆرە موسڵمانە لە دایك و باوکیەوە فێری ئەم شتانە بووە، هەروەك چۆن یەکێك فێری جگەرەکێشان دەبێت و عادەتی پێوە دەگرێت و دوایی ناتوانێت دەستی لێ هەڵبگرێت، واتە نوێژکردنەکەی لەبری ئەوەی عیبادەت بێت بۆتە عادەت.

---

(١) سورة يوسف : ٥٣.

## مامۆستای ئاینی و
## دەرس وتنەوەی حوجرەی مزگەوت

دێهاتەکانی کوردستانی عێراق و ئێران، هەر دێیەك نزیکەی (٥٠) ماڵ یان زیاتر بوایە مامۆستای ئاینی و مزگەوتێك و مەدرەسەیەکی ئاینی تیادا بوو، لەگەڵ هەندێك فەقێ دا کە ژمارەیان دەگەیشتە (٢-٣) فەقێ، لەمەشدا هەر دێیەك بەپێی شوێنەکەی و توانایان و زانیاریی مامۆستا ئاینیەکە، ئەمانە بە فەقێ و مامۆستای ئاینییەوە ئەرکیان دابەش کرابوو بەسەر دانیشتوانی دێیەکەدا لەگەڵ ئاغای ئەو دێیە.

بەڵام ئەگەر دێیەك (٥٠) ماڵ کەمتر بوایە، مامۆستای ئایینی و مزگەوتیان هەبوو، بەڵام کەم هەڵدەکەوت کە فەقێیان هەبێت، بەپێی هەڵکەوتنی شوێنەکە.

ئەمەش بە پێچەوانەی دێهاتەکانی عەرەبستانەوە، کە بەسەدەها دێ هەبوو زیاتر لە (١٠٠) ماڵ بوو، بەڵام نە مزگەوتی تێدا بوو نە مامۆستای ئاینی و نە فەقێ، ئەو مامۆستا ئایینیانەی لە عەرەبستان کە وەك مامۆستا ئایینیەکانی کوردستان دەرسیان دەوتەوە زۆر کەم بوون، بەتایبەتی لە شاری بەغدا کە پایتەختە، بەڵکو زۆرترینی ئەو مامۆستایانە کورد بوون، وەك خوا لێ خۆشبوو (ئەمجەد زەهاوی)، خوا لێخۆشبوو (مەلا محەمەدی قزڵجی)، خوا لێ خۆشبوو (مەلا شێخ محەمەدی بالیسانی)، خوا لێخۆشبوو (مەلا عومەر مەولود دیبەگەیی) و مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس کە تا ئێستاش ماوە خوا تەمەنی زیاد بکات.

ئاشکرایە مامۆستای ئاینی و فەقێ لە کوردستانی ئێران و عێراق سودێکی زۆریان هەبوو بۆ گەلی کورد لە بواری ئاینیی و رەوشت و رۆشنبیرییەوە، چونکە لەو کاتەدا جگە لە مامۆستای ئاینی و فەقێ خوێندەوار لە دێهاتەکاندا نەبوو، خوێندنی قوتابخانە و کۆلێج و زانکۆکان هەر لە شارە گەورەکاندا هەبوو، منداڵی دێهاتەکان جگە لە منداڵی دەوڵەمەند و دەست رۆیشتوو، بێ بەش بوون لەم جۆرە خوێندنە تازەیە.

لە هەمان کاتدا جۆری خوێندنی مەلایەتی لە مەدرەسە ئاینیەکاندا زۆر دواکەوتو بوو، لەبەر ئەو هۆیانەی کە باسمان کردن و چەند هۆیەکی تر کەلێرەدا باسیان دەکەم:

**یەکــەم:**

چەند کتێبێك دیاری کرابوون بۆ خوێندنی مەلایەتی کە پێیان دەوترا دوانزە عیلمە، ئەم کتێبانە زۆریان دووبارە بوون، وەك کتێبەکانی عیلمی (نحو، صرف، منطق)، هەر قوتابیەك بەلای کەمەوە پێنج ساڵ لە تەمەنی بەخت دەکرد لەرێگای فێربوونی نەحو و صرفدا، کەچی ئەگەر بچینە سەر بنچینەی ئەم کتێبانە دەبینین هەمویان دوبارەن. پێم وایە لەهەر بابەتێك لەو سیانە یەکێك یان دوو کتێبی کەدووبارە بوو بەزیادە دەخوێندرا.

**دووەم:**

مامۆستای ئاینی بەدرێژایی ساڵەکانی تەدریسی هەر فێری ئەو کتێبانە دەبوو کە بەدەرس دەیوتنەوە، ئیتر فێری عیلمەکە نەدەبوو، بۆ نمونە مەلای وەها هەبوو زیاتر لە (٢٠) جار کتێبی (جمع الجوامع) کە (أصول الفقه)ی شافعییەکانە دەیوتەوە، تەنیا فێری کتێبەکە و حاشیەکانی دەبوو، نەیدەتوانی قاعیدەیەك لە قەواعیدی أصولی فقه بەکار بهێنێت لە دەرهێنانی حوکم لە قورئانی پیرۆز یان فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەڵکو هەر پرسیارێکی لێ بکرایە، لەباتی ئەوەی بڵێ خوا فەرمویەتی یان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی، دەیوت شافعی یان شێخی ئیبنولحەجەر لە (توحفە)دا فەرموویەتی، یان یەکێکی تر لە شافعییەکان.

ئەگەر دەرسێکی فقهی ئیسلامی بوتایەتەوە، نەیدەزانی ئەو حوکمانە کە لەو کتێبەدا هەن چۆن لە سەرچاوەکانیان وەرگیراون کە بریتین لە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و (إجماع) و (عرف) و (قیاس) و (مصلحە) و (إستحسان) و (إستصحاب)، لەگەڵ سەرچاوەکانی تری فقەی ئیسلامی.

ئەمەی کە دەیڵێم هەمووی راستە و لە خۆمدا هاتۆتە دی، کتێبی (جمع الجوامع) کە لەلای مامۆستا ئاینییەکانی کوردستان باشترین کتێبە لە (أصول الفقە)دا، لای چاکترین مامۆستای ئاینی لە کوردستانی ئێراندا خوێندم، کە مامۆستا (مەلا باقر)ە، لەساڵی (١٩٤٧ز-١٩٥٥ز) ئەم کتێبەم هەشت جار بەفەقێی چاك چاك بەدەرس وتەوە، کەچی فێری عیلمەکە نەبوم، بەڵکو فێری کتێبەکە و شەرحەکەی و حاشیەکانی بووم، نەمتوانی مانای وشە عەرەبییەکانی ئەم کتێبە وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی و بەفەقێیەکەی بڵێم، ئەوەندە فێر نەبووم بتوانم بۆ خۆم لە ڕێگەی قواعدی ئەم عیلمەوە حوکمێك دەربهێنم لە قورئان یان فەرمودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یان یەکێك لەو سەرچاوانە کە باسم کردن.

لە ساڵی ١٩٧٧ز دا داوایان لێکردم لەگەڵ مامۆستایەکی تر کتێبێکی أصولی فقە دابنێین بۆ پۆلەکانی پێنج و شەش لە پەیمانگا ئیسلامییەکاندا، بەدانانی ئەم کتێبە تۆزێك چاوم کرایەوە.

لە ساڵی (١٩٨٠ز) داوام لێکرا کە کتێبێك لە (أصول الفقە) دابنێم بۆ قۆناغی چواری یاسا (قانون) لە کۆلێجی یاسای زانکۆی بەغدا، کە ئەو کاتە مامۆستا بووم لەوێ، منیش ئەم کتێبەم دانا (دلالات النصوص وطرق إستنباط الاحکام فط ضوء أصول الفقه الاسلامي). لە پاش ئەم کتێبە چاوم زیاتر کرایەوە کە أصولی فقە بۆ ئەوەیە کە حوکمی شەرعی پێ دەربهێنی لە سەرچاوەکانی، هەروەك ئەم مانایە تصریف دەکرێت دەوترێت (أصول الفقه قواعد كلية يستعان بها في استنباط الاحكام الشرعية الفرعية من أدلتها التفصيلية).

لە ساڵی (١٩٨٩ز) کتێبێکی ترم لە (أصول الفقه) دانا بەناوی (أصول الفقه الاسلامی فی نسیجه الجدید)، ئەم کتێبە دوو بەرگە و بریتییە لە پاڵاوتە و ناوەڕۆکی أصولی فقهی هەشت مەزهەبی ئیسلامی: (أصول الفقه الحنفی والمالكي والشافعي والحنبلي والجعفري والزيدي والظاهري والاباضي). لەهەر چلێك گولێکم لێکردەوە و خستمە ناو ئەم کتێبەوە، بەبێ ئەوەی بەنەفامی دوای یەکێك لەم مەزهەبانە بکەوم، هەوڵم ئەدا بزانم وتەی کامیان راستە دوای ئەوە دەکەوتم.

ئەم کتێبە یەکەم دانراوێکە کە نمونەکانی دوو جۆرە، جۆرێك لە شەریعەتی ئیسلام و فقەی ئیسلامیدا، جۆرێك لە بەندەکانی یاسادا، لەبەرئەوە ئێستا ئەم کتێبە بۆ ماوەی (١١) ساڵە کراوە بەبابەتێکی (منهج)ی لە کۆلێجەکانی قانون لە زانکۆکانی عێراقدا، هەروەها لە ئوردن و یەمەن و ئەندەنوسیا و مالیزیاو هەندێ وڵاتی تر لە کۆلیجەکانی شەریعە و یاسا بەدەرس دەوترێتەوە، تا ئێستا (٢٣) جار چاپکراوەتەوەو بۆ کوردی و فارسی وەریان گێڕاوە.

لە پاش گرتنەبەری ئەم رێچکەیە و تۆزێك فێربوونی عیلمی أصولی فقە، گەڕامەوە سەر جمع الجوامع، کە لە لای کوردەکان زۆر پیرۆز و زۆر بەنرخە و وێنەی نیە لە جیهاندا لە (أصول فقه)ی ئیسلامیدا، بۆم دەرکەوت بەدەیان هەڵەی گەورە لەم کتێبەدا هەیە، کە مەلای زۆر چاك چەند جار بەدەرس ئەو هەڵانەی وتوەتەوە، ئەوەندە بیروباوەڕی بەهێز بووە بەرامبەر بە دانەرەکەی، بەلای ئەو هەڵانەدا نەچووە، چونکە هیچ وەخت بیری لەوە نەکردۆتەوە کە هەموو (مجتهد)ێك وەك بەرهەمەکەی راستی تێدایە هەڵەشی تێدایە.

هەروەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(الحاكم إذا حكم فاجتهد وأصاب فله أجران وإذا حكم فاجتهد وأخطأ فله أجر).

مەبەست لە حاکم لێرەدا مجتهدە لەهەر عیلمێك دا، واتە: هەر مجتهد یان زانایەك ویستی حوکمی شتێك باس بکات بیدۆزێتەوە لەسەرچاوەکانی کە ئەویش بریتییە لە حوکمی خوا ئەگەر توانی ئەو حوکمە بدۆزێتەوە ئەوا

بڕیارەکەی ڕاستە و دوو جار پاداشتی هەیە لەلای خوا، یەکێکیان هی ڕەنج و کۆششەکەیەتی، دووەمیان هی ئەوەیە کە حوکمەکەی خوای دۆزیوەتەوەو دەری هێناوە لە سەرچاوەکانیدا. بەڵام ئەگەر بەهەڵەدا چوو گەیشتە حوکمێك جیاواز بوو لە حوکمەکەی خوا یەك پاداشتی هەیە بەرامبەر بە کۆشش و هەوڵ دانەکەی.

ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هەموو مجتهدەکانی ئیسلام دەگرێتەوە چ لە عیلمەکاندا چ لە فیقهی ئیسلامیدا.

**سـێیەم:**

زۆربەی مامۆستای ئاینی کوردستانی ئێران و عێراق بە ساڵەهای ساڵ ئەو کتێبانەیان ئەوتەوە کە لەکاتی ئەواندا کرابوون بەکتێبی منهجی لە هەموو مەدرەسە ئاینیەکاندا. نەیاندەتوانی ئەو کتێبە بگۆڕن بە کتێبێکی ئاسانتر بۆ ئەوەی قوتابییەکان بە ئاسانی فێریان ببن و بە ڕاستی لێیان تێ بگەن، بەڵکو باشترین مامۆستای ئاینی کوردستان ئەوەبوو کە هەندێ حاشیەی دەکرد لەسەر یەکێ لەو کتێبانە، لەباتی ئەوەی کە بابەتەکە رون بکاتەوە و ئاشکرای بکات، دەیکرد بە مەتەڵ، بەجۆرێکی وا دەینووسی کە تەنیا خۆی بیزانێ، ئەمەش بۆ ئەوەی خوێندەواری و پلەی زانیاریی خۆی پیشان بدات، زۆر جار لە دوای مەتەڵەکەوە دەیوت (تأمل) یان (فتأمل).

ئەمە کە دەینووسم ئەگەر هەرکەسێك بڕوای پێ ناکات با بچێ حاشیەکانی قزلّجی لە سەر (تصریف)ی مەلا عەلی بخوێنێتەوە، یان حاشیەکانی بهاءالدین عاملی لەسەر کتێبی (سیوطی) (الفیه إبن مالك)، یان حاشیەکانی خەیاڵی لەسەر عەقائدی نەسەفی، یان حاشیەکانی پێنجوینی و قەرەداغی لەسەر گەلەنبوی بورهان، تەنها چەند کەسێکی وەك شێخ عومەری ناسراو بە ئیبن قەرەداغی نەبێت کەئاسانکاری کردووە لە زۆرێك لەو کتێبە قورس و گرانانەدا.

هەروەك لەوەو پێش باسمان کردووە زۆر فەقێ هەبوو وەك من دەسوڕایەوە بە روت و قوتی و سکی برسی و پێ خاوسی و دورکەوتنەوە لە باوك و دایك و

خزم و کەس و کار، وڵات بە وڵات دەگەڕا، دەیپرسی چ مەلایەك فلانە حاشیە باش دەزانێت بۆ ئەوەی بچێتە لای ماوەیەك لە تەمەنی خۆی بەفیڕۆ بەخت بکات، بۆ شتێك نەکەڵکی ئاینی ئیسلام و نە کەڵکی گەلی کوردی تێدا بوو.

هەر لەبەر ئەم جۆرە خوێندنە دواکەوتووە مامۆستایەکی ئاینی مجتهد هەڵنەکەوت وەك ئیمامی شافعی یان ئیمامی حەنەفی یان ئیمامی مالك، لەگەڵ ئەوەش مامۆستایانی ئاینی کوردستان گەلێ گەلێ بەهێز و تواناتر بوون لەو ئیمامانە، بۆ ئەوەی هەریەکێ ببن بە مجتهیدێك و کوردەکان دوای فەتواکە و مەزهەبەکەی بکەون، بەڵام ئەوەیان نەکرد، گوایە ئەوانەی پێشوو هیچیان نەهێشتۆتەوە بێ چارەسەر.

لە کوردستانی ئێراندا خوا لێ خۆشبوو مەلا ئەبو بەکری مصنف (٩٠٠ - ٩٩٩ك) توانی بگاتە ئەو پلەیە، بەڵام بەداخەوە ئەویش بەدەگمەن نەبێت لە بازنەی فقهەکەی ئیمامی شافعی نەچووە دەرەوە، هەروەها لە عێراقدا خوا تەمەنی زیاتر درێژ بکا مامۆستا عبدالکریم مدرس کتێبێکی لە فقەی ئیسلامیدا بە کوردی دانا، ئەویش بریتی بوو لە گۆڕینی وتاری شافعیەکان لە عەرەبییەوە بۆ کوردی بەجۆرێکی روناك و ئاشکرا کە هەموو کوردێك سوودی لێ وەربگرێ، لەگەڵ ئەوەش نەیدەوێرا جارێك بڵێت خۆم بیروڕام ئەوەیە، بەڵکو وتەکەی دەدایە پاڵ شافعی یان یەکێك لە فەقیهەکانی مەزهبی شافعی، لە کاتێکدا کە ئەم پلەی زانیاری لەوان کەمتر نەبوو.

**چـــوارەم:**

هەندێك لەو کتێبانە کە کرابوون بە (منهج) لە مەدرەسە ئاینیەکاندا، مامۆستا ئاینییە چاکەکان بە ساڵەهای ساڵ لە کوردستاندا بەدەرس دەیان وتنەوە پڕبوون لە خورافات و خەیاڵ.

شایانی باسە جارێك پارچە شیعرێکی خوا لێ خۆشبوو زانای بەناوبانگ مەولەویم کەوتە بەرچاو کە نوسیویەتی بۆ شێخی (ضیاءالدین) خوا پلەی بەرز بکات، لای خۆی شێخیش وەڵامی داوەتەوە هەردوکیان بڕیاریان لەسەر ئەوەیە

کە گۆی زەمین لەسەر ئاو راوەستاوە. تا ئێستاش بانگ دەرەکانی مزگەوت لە پێش بانگی بەیانی هەندێك شت دەخوێننەوە دەڵێن: (سبحان من بسط الارض علی ماء جمد)، لە بەغدا لە بانگدەری مزگەوتەکەی لای خۆمان کە پێی دەوترێ مزگەوتی (طیبة) بەگوێی خۆم ئەمە دەبیستم، کە ئەم بانگدەرە لە پایتەختی عێراق و لە سەدەی (٢١)دا دەژی، هەموو رۆژێك گوێی لە هەواڵی جیهان دەبێت، بەڵام وتارە خورافیە کۆنەکە لە مێشکیدا جێگیر بووە.

هەروەها لەنامەکەی مەولەوی و شێخی ضیاءالدین دا کە بە شیعر نوسرابوون ئەمەی تیادایە کە زەمین لەسەر ئاوە و ئاویش لەسەر شانی نەهەنگە نەهەنگەکەیش لەسەر گایەکە، ئەمە لەبەرئەوە نا کە ئەم دوو زاتە گەورەیە لە ناتێگەیشتوێتییەوە ئەمەیان وتووە، بەڵکو لەبەر دڵپاکی خۆیان بیستویانە لە سەرچاوەکەیەوە کە ئەوان بڕوایان پێی بووە، ئیتر بیریان لەوە نەکردوەتەوە کە ئەم سەرچاوەیە هەڵەیە.

هەر بەم بۆنەیەوە یەکێکی تر لە هەڵەکانی زانا گەورەکانی مەزهەبی شافعی کە ئەویش پێی ئەوترێ شێخی (ئیبن و الحەجەر) لە کتێبی (فەتاوا)کەی دا دەڵێت: سەرچاوەی نیل لە بەهەشتەوە دێت، مەبەست لە نیل ئەو رووبارە گەورەیەیە کە بە خاکی سودان و میسردا تێ دەپەڕێت و دەچێتە دەریای سپیەوە، ئەم زانا گەورەیەش ئەم شتە خورافییەی نوسیووە، ئەمەش لە ڕوی دڵپاکییەوە لە سەرچاوەیەکەوە وەری گرتووە و بڕوای پێ کردووە، چونکە مرۆڤ کە خۆی ڕاست بێت وتەی هەموو کەس بەڕاست دەزانێت.

دەگێڕنەوە دەڵێن لەئادەمیان پرسی: تۆ چۆن باوەڕت بە شەیتان کرد و هەڵی خەڵەتاندی تا لە بەهەشت هێنایتیە دەرەوە؟ وتی: لەبەرئەوەی من هیچ کات بیرم بۆ ئەوە نەچووە کە یەکێك بەدرۆ سوێند بەخوا بخوات و نەمزانی شەیتانە، کە سوێندی خوارد بەخوا منیش باوەڕم پێ کرد.

هەروەك لەمەو پێش باسمان کرد پێویستە لەسەر هەموو ژیر و زانایەك هەرچییەکی بیست بۆ خۆی وردی بکاتەوە و لێکی بداتەوە بزانێت لە ڕاستی

و ناڕاستییەوە چەندە نزیکە، هەروەك وتویانە: (أنظر إلى ما قيل ولا تنظر إلى من قال).

واتە: هەردەم تەماشای وتەکە بکە و تەماشای خاوەنەکەی مەکە، بەڵام تەنیا لە قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەماشای خاوەنەکەیان دەکەین، جگە لەمە نابێت تەماشای خاوەنەکەی بکەیت بەڵکو دەبێت بەژیری لێی بکۆڵیەوە.

چونکە ئەگەر ئێمە باوەڕیان پێ بکەین ئەوانەی دوای ئێمەش بڕوایان پێ دەکەن لەبەرئەوەی ئەوانە جێگەی بڕوای ئێمە بوون.

# بەراوردێك لە نێوان مامۆستایانی ئاینی کوردستان و مجتهدەکانی (فقە)ی ئیسلامیدا

ئەگەر تەماشای ژیانی مامۆستای ئاینی کوردستان و مجتهدە گەورەکانی ئایینی ئیسلام بکەین بۆمان روون دەبێتەوە کە ئەو سەرچاوانەی کە مجتهدەکان (فقە)ی ئیسلامیان لێ دەرهێناون مامۆستا ئاینییە چاکەکانی کوردستان بەدەرس وتویانەتەوە بە فەقێی زۆر زیرەك، وەك لە کتێبەکانی (أصول الفقە) دا، ئەو زانستانە کە هەردەم یارمەتی مجتهدیان داوە بۆ دەرهێنانی حوکمە شەرعیەکان لە سەرچاوەکانیانەوە، مامۆستای ئاینی کوردستان دەستێکی باڵایان هەبووە تیایاندا، وەك زانستی (عیلمی بلاغە)، (معان وبیان وبدیع ونحو وصرف) و زانستی (منطق) و (أصول الفقە) و (فلسفە) بابەتەکانی تر کە بە وردی لە مەدرەسە ئایینیەکان لە کوردستانی ئێران و عێراق و تورکیا بە دەرس دەوترانەوە و بەحاشیەی ووردەکاری لەسەر ئەم زانستانەیان دەنووسی و دەچونە ناو قوڵاییانەوە کە ئەمانە پێیان دەوترێت (العلوم الالیە) واتە (زانستە ئامێرییەکان)، بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم بەراوردە بە پێویستی دەزانم بە کورتی باسی ئەو سەرچاوانە بکەم کە مجتهدەکان (فقە)ی ئیسلامیان لێ دەرهێناوە، دوای ئەوە باسی رابەری ئەو مەزهەبانە بکەم بۆ ئەوەی روونی بکەمەوە کە هەندێ مامۆستای ئاینی باش هەمیشە لە کوردستاندا بوون پایەی زانیارییان هیچ وەخت لەو (مجتهد)انە کەمتر نەبووە.

## سەرچاوەکانی (فقه)ی ئیسلامی

**١- قــورئانی پیرۆز:** یەکەم سەرچاوەیە کە هەموو حوکمێکی شەرعی لێ وەردەگیرێت، لەو ئایەتانەدا کە باسی ئەو حوکمانەیان کردووە بە ئاشکرایی.

**٢- فەرمودەکان و کردەوەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):** زۆر جار حوکمی شەرعی بە ئاشکرایی باس نەکراوە لە قورئاندا بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یان لە فەرمودەکانیدا باسی کردوە یان بە کردەوە خستویەتیە روو.

ئەم دوو سەرچاوەیە بنچینەی هەموو حوکمێکی شەریعەتی ئیسلامن، سەرچاوەکانی تر هەموویان دێنەوە سەر ئەم دوو سەرچاوەیە.

**٣- الاجــمـاع:** واتە کۆدەنگی (اتفاق)ی هەموو زانا پێشوەکانی ئیسلام لە یارانی پێغەمبەر و ئەوانەی لە دوای ئەوان هاتوون لە (مجتهد)ەکان.

**٤- (القـیـاس):** ئەگەر دوو شت هەبوون وەك یەك وابون لەهۆی حوکمەکانیاندا، بەڵام یەکێکیان قورئانی پیرۆز یان (حدیث الشریف) باسی کردبوو ئەو حوکمە دەدرێت بەوی تریان چونکە هەردوو لا وەك یەك وان لە هۆی هاتنی ئەم حوکمە، بۆ نمونە: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی: (لایرث القاتل)، واتە: ئەگەر میرات گرێك میرات لێ گیراوەکەی خۆی کوشت بێ بەش (محروم) دەکرێت لە میراتەکەی، ئینجا (مجتهد) یان قازی یان مفتی دەتوانێت بڵێت ئەگەر یەکێك وەسیەتیان بۆ کرد وەسیەت کەرەکەی کوشت بێ بەش دەکرێت لەو وەسیەتە، هەروەها ئەگەر یەکێك ماڵێکیان بۆ (وقف) کرد (وقف) کەرەکەی

کوشت ئەویش بێ بەش دەکرێت لەو (وقف)ەدا، چونکە هۆی بێ بەشکردنەکە لە میرات دا لەم دوو نمونەیەشدا دێتە دی.

کە ئەوەش بریتییە لە پاراستنی گیانی مرۆڤی بێ تاوان چونکە ئەگەر میرات گرەکە یان وەسیەت بۆ کراوەکە یان ئەوەی وەقفێکی لەسەر کرابێت بزانێت بەکردەوەی کوشتن بێ بەش دەبێت ئەو کردەوەیە ناکات.

٥- **(المصلحة) بەرژەوەندی:** مەسڵەحەت لە ئایینی ئیسلامدا بریتییە لە راکێشانی سود و نەفعێك (جلب المصلحة) یان دوورخستنەوەی زیان و زەرەرێك (درء المفسدة)، حوکمەکانی خوا هەمووی بۆ بەدیهاتنی ئەم دوو مەبەستە هاتووە.

من زیاتر لە (٦٠) ساڵە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام دەژیم بەخوێندن و دەرس وتنەوەیی و کتێب دانان و بەراوردکردن لەگەڵ یاسادا، لەم ماوەیەدا بۆم روون بوەوە هەر شتێك سودی تێدابێت بۆ ئادەمیزاد ئەوە لە ئاینی ئیسلامدا حەڵاڵە ئەگەر ئەو سوود و نەفعە زیانێکی تیادا نەبێت بۆ یەکێکی تر.

هەروەها هەر شتێك زەرەر و زیانی تیادابێت بۆ ئادەمیزاد ئەو شتە خوا حەرامی کردووە، ئەگەر ئەو زەرەرە یان ئەو زیانە سودێکی گەورەی تێدا نەبێت بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد، وەك سزای تاوانبار بە حەپس یان بەجۆرێکی تر، زیانی تێدایە بۆ خۆی بۆ خێزانەکەی بۆ گەلەکەی، بەڵام هەموو ئایینەکان و یاساکانی جیهان ئەم سزایەیان پەسەند کردووە و بڕیاریان لەسەر دروست بوونی داوە، چونکە سودێکی گەورەی لێ پەیدا دەبێت ئەویش بریتییە لە پاراستنی گیان و ماڵ و شەرەفی مرۆڤ لەناو کۆمەڵدا، چونکە ئەگەر پرسینەوە و سزا نەبێت بۆ تاوانبارەکان مرۆڤی خراپ ژیان تاڵ دەکەن لە کۆمەڵگەکەیان.

٦- **(الاستحسان):** خوای گەورە بۆ هەموو شتێك دوو حوکمی داناوە لەسەر ئادەمیزاد، یەکێکیان پێویستە لەسەری ئەنجامی بدات لە کاتێکدا هیچ عوزرێك و تەنگ و چەڵەمەیەکی نەبێت ئەمەش پێی دەوترێت (العزیمة)، حوکمەکەی تریان بۆ ئەوەیە کە پێویستە لەسەر ئادەمیزاد لە کاتێکدا کە عوزرێکی هەبێت یان لە ژیانێکی ئاسودەیی دا نەبوو ئەوا دەتوانێت پاش لاچوونی عوزرەکە

ئەنجامی بدات، بۆ نمونە خوای گەورە رۆژوی رەمەزانی واجبکردووە لەسەر هەموو مرۆڤێکی بالغ و ژیر بەڵام ئەگەر کەسێك نەخۆشبێت یان شیر بەمنداڵ بدات یان سەفەر بکات دەتوانێت رۆژوو نەگرێت لە رەمەزاندا لەو ماوەیەدا کە ئەو عوزرەی هەیە.

ئەنجامدانی حوکمی دووەم لە کاتی عوزردا هەروەك پێی دەوترێت روخسەت، واتە هەڵسان بەم حوکمە لەلای خوا شتێکی چاك و جوانە، هەروەك لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ ﴾.[١]

هەروەها خوای گەورە گۆشتی مردو و بەراز و خوێنی ئادەمیزاد یان ئاژەڵی حەرام کردووە لەسەر مرۆڤ لە کاتێکدا عوزرێکی نەبێت ئەمە پێی دەوترێت (عزیمە)، بەڵام بۆی حەڵاڵ کردووە لە کاتی عوزردا ئەمە پێی ئەوترێت روخسەت، هەروەك لەم ئایەتەدا فەرموویەتی:

﴿ حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ ﴾.[٢]

لە کۆتایی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ:

﴿ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ[٣] غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ[٤] فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾

واتە: لە کاتی ئاسودەیی و بێ عوزریدا گۆشتی مردو و بەراز و خواردنەوەی خوێن حەرامە لەسەر ئادەمیزاد چونکە توشی نەخۆشی و دەردەداری دەکات،

---

(١) سورة البقرة: ١٨٣-١٨٤

(٢) سورة المائدة: ٣

(٣) مخمصة: برسێتی.

(٤) لإثم: بەم جۆرە تەجاوزەکان لە سنوری زەرورەت و پێویستین.

بەڵام لەکاتێکدا کە گرانی بێت و خواردنی تری دەست نەکەوێت، دروستە ئەمانە بخوات بەمەرجێك ئەم خواردنە لە سنوری پێویستی تێ نەپەڕێت.

لە (فقه)ی ئیسلامیشدا ڕێسا دانراوە: (الضرورات تجيز المحظورات)، واتە: زەرورەت شتی حەرام ڕێگە پێدەدات-بۆ ماوەیەکی کاتی-.

ئینجا هەڵسان بەم حوکمە دروستە لە کاتی پێویستیدا پێی دەوترێت (روخسەت)، زاناکانی (أصول الفقه)ی ئیسلامی وتویانە: استحسان: (استثناء بعض الجزئيات من القاعدة الكلية، لما يوجب ذلك).

واتە: (استحسان) بریتییە لە حوکمێك کە وەك حوکمی روخسەت وایە بەکاردەهێنرێت لە کاتی عوزر و پێویستیدا، ئەم حوکمە لە جێگای حوکمە ئەسڵییەکەدا دادەنیشێت لە کاتی پێویستی و عوزردا.

٧-**(العــرف)**: ئەگەر شتێك لە کردەوە یان وتە زۆر جار بەکارهێنرا لەنێو گەلێکدا یان لەناو هەموو گەلاندا ئەوە پێی ئەوترێت عورف، ئینجا ئەم عورفە ئەگەر دژی ئایینی ئیسلام و یاسا نەبێت (مجتهد) یان قازی یان موفتی ئەتوانێت حوکمی لەسەر بنیاد بنێت.

وەك ئێستا لە عێراقدا مارەیی ژن نیوەی بە پێشەکی دەدرێت بە ژنەکە نیوەکەی تری لە پاش مردنی مێردەکەی پێ دەدرێت، یان لە پاش تەڵاق دانی ئەگەر تەڵاق درا.

بەڵام ئەگەر عورفەکە دژی ئایین یان یاسا بوو ئەوە دروست نیە حوکمی لەسەر بنیاد بنرێت، وەك ئەو قاعیدە فیقهیەی دەڵێت: ( العرف محكم) وەك کڕین و فرۆشتن ناکرێت بەبێ مامەڵە.

وەك سەر قوفڵانە کە ئێستا لە عێراقدا باوە یان دروستکردنی خواردن لە ڕۆژی سێیەمی پرسەدا لەسەر ئەرکی خاوەن مردووەکە، ئەمجۆرە عورفە نابێت پەیڕەوی بکرێت.

**٨- (سد الذرائع):** ئەگەر شتێك خۆی دروست بوو بەڵام ئەنجامەکەی نادروست بوو ئەوا خۆشی بە نادروست دادەنرێت و قەدەغە دەکرێت، وەك کەسێك دیاریەك بنێرێت بۆ ئافرەتێك مەبەستی لەم دیاریە ئەوە بێت پەیوەندیەکی ناڕەوای لەگەڵ ببەستێت ئەو دیاریە بە حەرام دادەنرێت دەبێ قەدەغە بکرێت، هەرچەند دیاری بۆ خۆی شتێکی زۆر باشە بەڵام ئەگەر بەکارهێنرا بۆ گەیشتن بە ئامانجی ناڕەوا خۆشی بەناڕەوا لە قەڵەم دەدرێت.

**٩- (الاستصحاب):** مرۆڤ کە لەدایك دەبێت بێ تاوان و بێ گوناهە و گەردنی ئازادە لە هەموو مافی مرۆڤێکی تر، لەبەرئەوە هەر کاتێك گەورە بوو یەکێك داوایەکی لەسەر تۆمار کرد پێویستە لەسەر قازی یان موفتی بەو جۆرە کە لە دایك بووە تەماشای بکات، نابێت رازی بێت بەو داوایە تاوەکو خاوەنەکەی بەتەواوی ساغی نەکاتەوە، سەرچاوەی ئەمەش ئەو قاعدە شەرعیەیە کە دەڵێت:

(الاصل في الانسان براءة ذمته من جميع الالتزامات المدنية والجنائية حتى يثبت خلاف ذلك).

هەر لەسەر ئەم سەرچاوەیە قاعیدەی شەرعی یاسایی کە دەڵێت: (المتهم بريء حتى تثبت إدانته)، واتە: هەموو کەسێك تۆمەتێك بدرێتە پاڵی پێویستە لەسەر قازی بەبێ تاوانی بزانێت تا تۆمەتەکەی ساغ دەکرێتەوە بەبەڵگەی شەرعی و یاسایی.

ئەگەر ژنێك شووی کرد بە پیاوێك لەپاش ماوەیەك داوای کرد لە قازی یان مامۆستای ئاینی مارەی بکات لە پیاوێکی تر پێویستە لەسەر ئەو قازیە یان ئەو مامۆستا ئاینی یە بڕیار بدات کە هێشتا ئەم ژنە پەیوەندی ماوە لەگەڵ مێردە پێشوەکەی هەتا بیسەلمێنێت کە مێردی پێشوو مردووە یان تەڵاقی داوەو عیدەی تەواو بووە.

بەڵگەی قازیەکە و مامۆستا ئاینی یەکە، سەرچاوەکەی (استصحاب)ە، واتە: (استصحاب) ئەوەیە کە هەر شتێك حوکمێکی هەبوو لەوەو پێش دادەنرێت ئەو حوکمە هەر بەرپایە تاوەکو پێچەوانەی ئەوە روون بکرێتەوە بەبەڵگەی شەرعی و ئایینی.

ئینجا ئەم سەرچاوانە کە ئیمامەکانی هەموو مەزهەبەکانی ئیسلام حوکمیان لێ دەرهێناون لەرێگای (اجتهاد)ەوە، مامۆستا ئاینی یەکانی کوردستان بە ساڵەهای ساڵ بەدەرس دەیان وتەوە لە مەدرەسە ئایینیەکاندا، بەڵام رۆژێك لە رۆژان ئەم سەرچاوانەیان بەکار نەدەهێنا بەوجۆرەی کە ئیمامەکانی مەزهەبەکان بەکاریان هێنا، بەڵکو هەرکەسێك هەر پرسیارێکی ئایینی لێ بکردایە هەڵمەتیان دەبرد بۆ کتێبێك لە کتێبەکانی مەزهەبی شافعی بۆ ئەوەی بزانن وەڵامەکەی لەناو ئەم کتێبەدا چۆنە. بەپێی ئەوە ئەوانیش وەڵامیان دەدایەوە بەمەرجێك کە ئەم مامۆستا ئاینی یە هەندێك جار گەلێك زاناتر بووە لە خاوەنی ئەو کتێبە.

ئینجا هەر بەم ۆرە زاناکانی ئایینی ئیسلام لە کوردستاندا، هەریەکێك وەك چرایەك وابوو لە ماوەی ژیانیدا کاتێك دەکوژایەوە بەکۆچی دوایی لە پاش خۆی هیچ روناکییەکی بەجێ نەدەهێشت کە ئایینی ئیسلام یان گەلەکەی سوودی لێ وەربگرێت مەگەر لەدوای خۆیان نووسینێکیان بەجێ هێشتبێ.

# ئیمامی مەزهەبەکان

**ئەو ئیمامانە کە مەزهەبەکانیان پەیڕەوی لێ دەکرێت لە وڵاتە موسوڵمانەکاندا بریتین لەمانەی خوارەوە بەپێی زنجیرەی سەردەمی هەریەکێك لەوانە:**

**یەکەم: ئیمامی جابر الاباضي (٣-٨٢ك):**

جابری کوڕی زەید یەکەم کەسێکە لە ئیسلامدا یەکەم مەزهەبی دانا کە پێی دەوترێت مەزهەبی (الاباضي). بە (تابعی) دادەنرێت لە لای عبداللهی کوڕی عەباس و ئەنەسی کوڕی مالیك و عبداللهی کوڕی عمر خوێندویەتی، خوێندنەکەی گەلێك کەمتر بووە لە خوێندنی مامۆستای ئاینی کوردستان لەگەڵ ئەوەش مەزهەبێکی سەربەخۆی بۆ خۆی دانا ئێستا لە وڵاتی (سەڵتەنەی عمان) پەیڕەوی ئەم مەزهەبە دەکرێت.

سەرچاوەکانی مەزهەبەکەی هەمان ئەو سەرچاوانەیە کە باسمان کرد.

**دووەم: ئیمامی جعفر الصادق (٨٠-١٤٨ك):**

ئیمام جەعفەر کوڕی محەمەد باقر کوڕی عەلی زین العابدین کوڕی حسین کوڕی عەلی کوڕی أبی طالب دایکی (وفره)ی کوڕەزای حەزرەتی (أبوبکر)ە، ئەو کتێبانە کە ئەم ئیمامە خوێندویەتی گەلێك کەمتر بووە لە کتێبەکانی مامۆستای ئاینی کوردستان خوێندویانە، ماوەی خوێندنەکەشی گەلێك کەمتر بووە لە خوێندنی ئەوان، لەگەڵ ئەوەش توانی مەزهەبێکی سەربەخۆ دابنێ کە پێی دەوترێت (المذهب الجعفري) - هەروەها بەمەزهەبی ئیمامیش ناسراوە - کە گەورەترین مەزهەبی شیعەیە بە ملیۆنەها موسوڵمان

لە ئێران و عێراق و وڵاتەکانی تردا بەپێی ئەم مەزهەبە دەچن بەڕێوە، سەرچاوەی ئەم مەزهەبە ئەمانەی لای خوارەوەیە:

١-قورئـــانی پیرۆز.

٢-فـــەرمودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

٣-فـــەرمودەکانی دوانزە ئیمامەی شیعە.

٤-ئیجـــماع (اجماع)ی هەموو موسوڵمانەکان یان ئیجماعی ئیمامەکانی خۆیان.

٥-عـــەقڵ و ژیـری: لای شیعە هەر کاتێك دووچاری شتێك بوون لە چوار سەرچاوەکەی پێشوودا حوکمەکەیان نەدۆزیەوە، لەرێگای عەقڵ و ژیریەوە حوکمەکەی ئەدۆزنەوە، بەو مەرجە دژی ئەو چوار سەرچاوەیە نەبێت، دیارە ئەو ژیری و عەقڵە کە ئیمامی جەعفەر بوویەتی مامۆستا ئاینییە چاکەکانی کوردستانیش بوویانە بەڵام هیچ وەخت بەکاریان نەهێناوە.

## سێیەم: ئیمامی زید (٧٦-١٢٢ك):

زیدی کوڕی عەلی زین العابدین کوڕی حسین کوڕی علی کوڕی ئەبی طالب، ئەم ئیمامە لای باوك و براکەی ئیمام محەمەد باقر و عبدللە ی کوڕی حسین و عگا مەزهەبی موعتەزیلەی خوێندووە، خوێندنەکەی هەمووی زۆر کەمتر بووە لە خوێندنی مامۆستا ئاینییە باشەکانی کوردستان، لەگەڵ ئەوەش توانی مەزهەبێکی سەربەخۆ دابنێ کە ئێستا خەڵکێکی زۆر لەوڵاتی یەمەن و چەند وڵاتێکی تر پەیڕەوی لێ دەکەن.

**سەرچاوەکانی ئەم مەزهەبە ئەمانەی خوارەوەیە:**

١- قورئانی پیرۆز.

٢- فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

٣- ئیجماع (الاجماع).

٤- قـیاس.

٥- عـــەقڵ (ژیری).

ئەم مەزهەبە هەرچەندە بەشێکە لە مەزهەبی شیعی بەڵام وەك جەعفەرییەکان (تعصب)ی تایفەگەرییان نیە، بەڵکو ئەم مەزهەبە پێکهاتووە لەو ڕایانەی کە لە هەموو چەرخێکدا پەسەند دەکرێن.

## چوارەم: ئیمامی ئەبو حەنیفە (٨٠-١٥٠ك):

ئەبو حەنیفە ناوی نعمان کوڕی ثابت کوڕی ماه لە ئەسڵدا فارس بووە، لەشاری کوفە بازرگانی کردووە بەڵام زۆری پێ خۆشبووە هەردەم لە پاش ئیش و کاری بازرگانی لە مەجلیسی زاناکانی ئایینی ئیسلام دابنیشێ گوێ بگرێت لە وتە و ڕای ئەوان، لەم ڕووەوە خۆشەویستی خوێندەواری چوەتە قوڵایی مێشکیەوە و وازی لە بازرگانی هێناوە و دەستی کردووە بە خوێندن، خوێندنی زیاتر لای حەمادی کوڕی ئەبی سلیمان بووە لە مەدرەسە ئاینیەکەی کوفەدا، ئەگەر خوێندنەکەی ئیمامی حەنەفی بەراورد بکرێت لەگەڵ خوێندنی مامۆستای ئاینی کوردستان (١٠٠٪) زیاتر نەبووە، بەڵام لەبەر ژیری خۆیی و تێگەیشتنی لە ژیانی خوێندەواری و بازرگانی مەزهەبێکی تایبەتی بۆ خۆی دروست کردووە کە ئێستا باشترین مەزهەبە لە جیهانی ئیسلامدا، ئەم مەزهەبە دەگونجێت بۆ هەموو زەمان و شوێنێك، (٥٠٪) یاساکانی باری کەسێتی و مەدەنی لە وڵاتە عەرەبیەکاندا لەم مەزهەبە وەرگیراوە، دەوڵەتی عوسمانی (خەلافەتی عوسمانیەکان) تا ئەو رۆژەی کۆتایی پێ هات پەیڕەوی ئەم مەزهەبەیان دەکرد، سەرچاوەی یاسای تایبەتیان لە هەموو شتێکدا ئەم مەزهەبە بوو.

سەرچاوەکانی ئەم مەزهەبە بریتی بوو لەو هەشتەی کە باسمان کرد، ئەبوو حەنیفە دەڵێت: ئەگەر شتێك ڕووی دا لە قورئانی پیرۆز دا دەگەڕێم بۆ حوکمەکەی، ئەگەر دەستم نەکەوت دەچمە سەر فەرمودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەگەر لەوێش دەستم نەکەوت دەچمە سەر فەرمودەی یارانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەگەر لەم سێ سەرچاوەیە دەستم نەکەوت بۆ خۆم ئیجتهاد دەکەم، لە ڕێگەی ئیجتهادەوە حوکمەکە دەدۆزمەوە هەروەك خەڵکی تر چۆن ئیجتهادی کردووە.

ئیمامی ئەبو حەنیفە هەرچەند بلیمەتێکی زۆر گەورە بووە بیروباوەڕی زۆر قوڵ بووە، بەڵام بڕوا ناکەم مەلای قزڵجی و مەلای پێنجوینی و مەلای نۆدشی و مامۆستا ئاینییە گەورەکانی کوردستان هیچ وەخت لەو کەمتر بوبن لەرووی زانست و زانیارییەوە، بەڵام ئەو مامۆستا ئاینییانە هیچ بەرهەمێکیان بەجێ نەهێشت لەبەر دوو شت:

**یەکەم:** خۆیان تەسلیمی مەزهەبی ئیمامی شافعی کرد.

**دووەم:** تەمەنی خۆیان بەدەرس وتنەوە و حاشیە دانان بەسەر کتێبەکان بەسەر بردوو زانایییەکەیان دەکوژایەوە بەکۆچی دوایی خۆیان.

## پێنجەم: ئیمامی مالك (٩٣-١٧٩ك):

ئیمامی مالیك کوڕی ئەنەس کوڕی مالیك کوڕی عامر لای عبدالرحمن کوڕی هرمز خوێندوویەتی، هەروەها لای عبدالرحمن کە پێی وتراوە (ربیعة الرأی) دەستی کردووە بە تەدریس و فەتوادان لە مەدینە کاتێك کە تەمەنی گەیشتوەتە (١٧) ساڵ، لە پاشاندا مەزهەبێکی سەربەخۆی داناوە کەسەرچاوەکانی بریتییە لەو هەشت سەرچاوەیەی کە باسمان کرد، ئەم مەزهەبە زۆر پێش کەوتووە بەهۆی جێگەکەیەوە چونکە شوێنەکەی مەدینەی پیرۆز بووە کە جێگای پێغەمبەر و یارەکانی بووە، لە لایەکی تریشەوە سودی وەرگرتووە لەو پرسیارانەی کە لە ئیمامی مالیك کراوە لە هەموو وڵاتە ئیسلامیەکانەوە لەکاتی حەجدا کە حاجییەکان چونەتە مەدینە هەر پرسیارێکیان بوبێت هی وڵاتەکەیان لەویان پرسیووە ئەمەش بۆتە هۆی پێشکەوتنی مەزهەبەکەی، یاسای مەدەنی فەرەنسی کە لە سەردەمی ناپلیۆن دانراوە واتە لە ساڵی (١٨٠٤)دا زۆر سودی وەرگرتووە لە مەزهەبی ئیمامی مالیك، ئەتوانین بڵێین ئەوەی لەم یاسایەدا هەیە (٤٠٪)ی لە مەزهەبی ئیمامی مالیك وەرگیراوە.

ئاشکرایە کە ئەم ئیمامەش لە مامۆستا ئاینییە باشەکانی کوردستان خوێندەوارتر نەبووە، بەڵام لەبەر ژیری خۆی نەبەستووەتەوە بە مەزهەبێکی

ترەوە، بەڵکو هەوڵی داوە بەخۆی و قوتابیەکانەوە جوانترین مەزهەبیان بەجێ هێشتووە بۆ موسوڵمانەکان.

**شەشەم: ئیمامی شافعی (١٥٠-٢٠٤ك):**

ناوی محەمەد کوڕی ئیدریس کوڕی عەباس کوڕی عثمان کوڕی شافع کوڕی عبدالمناف.

لە غەزە کە شارێکە لە فەلەستین لە دایك بووە، لە پاش دوو ساڵ باوکی مردووە، دایکی بردویەتیەوە بۆ مەککە چونکە باوکی خەڵکی ئەوێ بووە، هەر بە منداڵی قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە، لە زمانی عەرەبیدا زۆر بەهێز بووە، لە لای ئیمامی مالیك کتێبی (الموطأ) کە دانراوی ئیمامی مالیکە خوێندویەتی.

لە لای محەمەدی شەیبانی لە بەغداد ماوەیەك خوێندویەتی، شایانی باسە محەمەدی شەیبانی یەکێکە لە قوتابیەکانی ئیمامی ئەبو حەنیفە و زانایەکی زۆر هەڵکەوتوو بووە.

لە پاش ئەوە ئیمامی شافعی کە شارەزای مەزهەبی ئیمامی مالیك و مەزهەبی ئیمامی حەنەفی بووە. مەزهەبێکی سەربەخۆی بۆ خۆی دروست کردوە کە پێکهاتووە لە بیروڕای ئەو دوو مەزهەبە و بیروڕای مەزهەبەکانی تر. شافعی بلیمەتێکی زۆر گەورە بووە، مەزهەبەکەی لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامیەکاندا بەکار دێت، من خۆم مەزهەبم شافعیە لەرێگەی تەقلیدەوە.

ئیمامی شافعی لەلام زۆر گەورە و بەڕێزە، دەمەوێت ڕاستییەك بە ماموستایانی کورد بڵێم، کە ماوەی (٥٠) ساڵە لەگەڵ ئەم مەزهەبە دەژیم بە نووسین و دەرس وتنەوە و بەراورد کردن لەگەڵ مەزهەبەکانی تردا، تا ئێستا توشی رایەك و فەرمودەیەکی شافعی نەبووم کە لە پێش ئەودا نەوترابێت. ئینجا ئەوەی کە شافعی کردویەتی زۆر لە ماموستا چاکەکان دەیانتوانی بیکەن، کە بریتییە لە کۆکردنەوەی بیروڕای ئەم و ئەو، بەڵام ئەوان وەك ئیمامی شافعی

ژیر و بەجورئەت نەبوون، بەڵکو وەك باسم کرد ماوەی خۆیان بە دەرس وتنەوەی ئەو شتانە تەواو دەکرد، کە نە گەلەکەیان کەڵکی لێ وەرگرت نە ئایینی ئیسلام.

شایانی باسە هەندێك (حدیث)ی نادروست لە بابەت ئیمامی شافعییەوە هەڵبەستراوە بەدەمی پێغەمبەرەوە کە هیچ ئەساسێکیان نیە.

**حەوتەم: ئیمامی ئەحمەد (١٦٤-٢٤١ك):**

ناوی ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی حنبل کوڕی هلال زەهلی ناسراو بە ئیبن حەنبەلە، بەڕەچەڵەك دەچێتەوە سەر فارسەکانی شاری (مروی)، بەڵام لە بەغدا لە دایك بووە و گەورە بووە.

لە لای زانا ئاینیەکانی بەغدا و بەسرە و مەدینە و شام خوێندنی تەواوکردووە، لە تەمەنی شانزەساڵیدا قوتابی أبی یوسف بووە، کە یەکێکە لە فقهای مەزهەبی حەنەفی، هەروەها لای ئیمامی شافعی ماوەیەك خوێندویەتی لە پاش وەفاتی شافعی سەربەخۆیی وەرگرت مەزهەبێکی تایبەتی پێکەوەنا، سەرچاوەکانی زیاتر فەرمودەکانی پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ سەرچاوەکانی تر کە لەوەو پێش باسمان کردن، لە پاش خۆی دوو ئیمام پەرەیان بەم مەزهەبەدا:

**١- إبن تيميە (٦٦١-٧٢٨ك).**

ناوی (ئەحمەد کوڕی عبدالحليم کوڕی عبدالسلام)ە.

**٢- إبن القيم (٦٩١-٧٥١ك).**

ناوی (محمد کوڕی أبوبکری کوڕی أیوب کوڕی سعد)ە.

ئەم دوو ئیمامە زۆر پێشکەوتوو بوون، بەپێی ئەو زەمانە ژیری و مێشکێکی فراوانیان هەبووە، لەبەرئەوە هەندێ شتیان خستوەتە ئەم مەزهەبەوە کە ئەمڕۆ موسوڵمانەکان زۆر سودی لێ وەردەگرن، وەك ئەوەی کە تەڵاقی سێ بەسێ یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت، هەر تەڵاقێك تعليق بکرێت بەشتێکەوە ناکەوێت، یان سوێند خواردن بە تەڵاق ئەویش تەڵاقی پێ ناکەوێت چونکە سوێند خواردن بە غەیری خوا و سیفەتەکانی بە تاڵە.

شایانی باسە تعلیقی تەڵاق و سوێند خواردن بە تەڵاق لەئیسلامدا نیە، نە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هەبووە نە لە سەردەمی (خلفاء الراشدین)دا، بەڵکو ئەمەوییەکان ئەم دوو جۆرە تەڵاقەیان خستە ناو ئاینی ئیسلامەوە، کاتێك عەلەوییەکان بەربەرەکانیان دەکرد لەگەڵ ئەمەوییەکان لەسەر خەلافەتی ئیسلامی، ئەمەوییەکان شکیان لە هەرکەسێك ببوایە کە لەگەڵ عەلەوییەکان بێت لە دژی ئەوان سوێندیان ئەدا بە قورئان، دوایی بۆیان دەردەکەوت کە سوێند خۆرە عەلەوییەکە لە دژی ئەوان ئەجولێتەوە سوێندەکەی بە درۆوە خواردووە، لەبەرئەوە وازیان هێنا لە سوێنددان بە قورئان گۆڕییان بە سوێنددان بە تەڵاق بۆ ئەوەی ئەو کەسەی بەدرۆزن دەرچوو لە دوایدا ژنەکەی لێ بسێننەوە و نەیەڵن بڕواتەوە لای، بەم جۆرە بۆ یەکەمجار لە ئیسلامدا سوێند خواردن بە تەڵاق پەیدا بوو، کە مامۆستای ئاینی کوردستان بە هەزاران ماڵی کوردیان وێران کردووە بەوەی فەتوایان داوە کە سوێند بە تەڵاق تەڵاقی پێ دەکەوێت ئەگەر سوێند خۆرەکە بە پێچەوانەی سوێندەکەیەوە بجولێتەوە، لەگەڵ ئەوەیش لە هەموو سەرچاوەکانی فیقهی ئیسلامی دەڵێن سوێند بە غەیری زاتی خوا و صیفاتی خوا بەتاڵە، هەندێك دەڵێن کفرە، هەندێك دەڵێن شرکە.

هەروەها ئەمەوییەکان گومانیان لە هەرکەس بکردایە کە لەگەڵ عەلەوییەکانە پێیان دەوت بڵێ هەر وەخت لەگەڵ عەلەویەکان ئیشم کرد دژی ئێوە تەڵاقم بکەوێت، بەم جۆرە (تعلیق)یش پەیدا بوو بڵاوبووەوە لەئیسلامدا کە هیچ ئەسڵ و ئەساسێکی نیە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا.

## هەشتەم: ئیمامی داود الظاهری (٢٠٠-٢٧٠ك):

داود کوڕی علی الظاهری کوڕی خلف، لە بەغدا لە دایك بووەو خوێندنی تەواوکردووە، بەڵام بنچینەکەی خەڵکی أصفهان بووە لە ئێران، یەکێکە لە قوتابیەکانی ئیمامی شافعی، بەڵام لە پاشان وازی هێنا لە دوا کەوتنی ئیمامی شافعی بۆخۆی مەزهەبێکی سەربەخۆی پێکەوە نا کە ناو دەبرێت بە مەزهەبی (ظاهری)، چونکە سەرچاوەکانی (ظاهری)ی قورئان و فەرموودەکانی

پێغەمبەری خودایە، ئەم مەزهەبە ددان نانێت بە سەرچاوەکانی تردا جگە لە إجماعی صحابە.

پاشان یەکێك لە فەقێکانی کە ناوی إبن حزم الظاهری (٣٨٤-٤٥٦ك) پەرەی دا بەم مەزهەبە، ئەمیش ناوی عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی حزم ناسراوە بە (أبو محمد)، لە قرگبە لە دایك بووە لە ئەندەلوس واتە ئیسپانیای ئێستا کاتێك کە موسوڵمانەکان حوکمڕانی ئەو شوێنەیان دەکرد، بوبە وەزیر لە سەردەمی عبدالرحمن کوڕی هشام لە ساڵی (٤١٤ك)دا.

باوەڕناکەم لە فقهاکانی ئیسلامدا هیچ کەسێك بوبێت هێندەی ئەم شارەزا بوبێت لە هەموو جۆرە زانستێکدا.

یەکەمجار خەریکی مەزهەبی شافعی بوو، لە پاشان وازی لەم مەزهەبە هێنا کەوتە دوای داودی ظاهری، هەروەك ئەو هیچ سەرچاوەیەکی پەسەند نەکرد جگە لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر و إجماعی صحابەکانی.

شایانی باسە لەم باسە کورتەی ئەو هەشت سەرمەزهەبە کە لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا بڕوا پێکراون و بەپێی ئەوانە هەڵدەستن، بۆمان دەردەکەوێت کە هیچ یەکێك لەو سەر مەزهەبانە هێندەی مامۆستا ئاینی یە باشەکانی کورد خوێندەوار و شارەزا نەبون لەو زانستانەدا کە یارمەتی مرۆڤ دەدەن بۆ دەرهێنانی حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی لە قورئانی پیرۆز و حەدیسی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) .

بەڵام هەروەك باسمان کرد ئەو هۆیانە کە نەیانهێشت ئەو مامۆستا ئاینی یە چاکانە وەك عەرەبەکان یەکێکیان ببێت بە خاوەن مەزهەبێك، دوو شت بوون:

**یەکەم:** خۆبەستن بە مەزهەبی ئیمامی شافعییەوە و بیروباوەڕێکی زۆر بەم مەزهەبە، بەجۆرێکی وا لە لایان لە پاش خوا و پێغەمبەر تەنها ئیمامی شافعی هەیە کە هی ئەوەیە مرۆڤ دوای بکەوێت.

**دووەم:** هەڵەی خوێندن و دەرس وتنەوە لە مەدرەسە ئایینیەکانی ئیسلام لە کوردستاندا، چونکە بە ساڵەهای ساڵ مامۆستای ئاینی دەرسی دەوتەوە، هیچ

وەخت کەم تەرخەمی نەدەکرد بەسەرچاوە گەورەکانی شەریعەتی ئیسلام کە قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەرن، ئەگەر مامۆستای ئاینی بیویستایە دەرسێکی تەفسیر بە فەقێیەك بڵێت جگە لە تەفسیری (بيضاوي) هیچی تر لە لای بایەخی نەبوو، ئەم تەفسیرە زۆرترین ئەو حدیثانە کە باسیان دەکات لە کۆتایی هەموو سورەتێکدا ئەساسیان نیە و بەدەمی پێغەمبەرەوە هەڵبەستراون، کاتێ پرسیاریان لەبەیزاوی کرد ئەم فەرموودانەت بۆ بەناوی پێغەمبەرەوە دانا؟ لەوەڵامدا وتی: لەوڵاتی ئێمەدا کەس قورئانی دەخوێند و هەموو سەرقاڵی کتێبی (دليل الخيرات بوون) منیش ئەو فەرموودانەم دانا تا خەڵکە رووبکاتەوە قورئان..

دیارە ساویلکەیی کورد و دڵپاکی خۆی نەیهێشتووە هیچ وەخت پێش بکەوێت نە لە ئاییندا نە لە سیاسەتدا.

## له حەنەفییەوە بۆ شافعی
## له شافعیەوە بۆ حەنەفی

لەمەزهەبی ئیمامی حەنەفیدا ئافرەت کچ یان بێوە ژن ئەگەر باڵغ و ژیر و رەشید بێت ئەتوانێت خۆی مارە بکات لەو پیاوە کە هەڵی دەبژێرێت بۆ هاوبەشی ژیانی بەبێ ئەوەی بەڵێن لە وەلییەکی (باوکی یان باپیری یان برای یان کەسێکی تری نزیك) وەربگرێت. بەڵگەی ئیمامی حەنەفی ئەوەیە ئەڵێت هەروەك ئەم ئافرەتە ئەگەر ماڵێکی هەبێت ئەتوانێت بەسەربەخۆیی خۆی بەبێ رێپێدانی وەلییەکەی تصرف لەم ماڵەدا بکات چونکە ماڵی تایبەتی خۆیەتی بەشی کەسی پێوە نیە ئەتوانێت تصرف لە نەفسی خۆشیدا بکات بەوەی کە شوو بکات بە هەرکەسێك کە خۆی حەزی لێ بکات، بە پێچەوانەی مەزهەبی ئیمامی شافعی ئەو لای وایە خوا ئەم سەربەخۆییەی نەداوە بە ئافرەت بەڵکو هەردەم پێویستە وەلییەکەی (باوکی یان باپیری یان برای) مارەی بکات لەو کەسەی کە هەردوکیان رەزامەندبن لەسەری، چونکە ئافرەت ئەگەر ئەو سەربەخۆییەی بدرێتێ کە ئیمامی حەنەفی فەرمویەتی زۆر جار هەڵدەخەڵەتێت دەکەوێتە داوێکەوە پاشەرۆژی ژیانی ژن و مێردایەتی لێ تاڵ دەکات، جگە لەوەی قیاسی نەفسی ئافرەت ناکرێت لەسەر ماڵی چونکە ئافرەت ئەگەر بەسەربەخۆیی خۆی شوو بکات بۆ خێزانەکەی ناشیرین و نا رەوا دەبێت، ناویان لەناو خەڵکیدا بەخراپە دەبرێت، واتە شوکردن یان ژن مارەکردن هەروەك پێویستی بە دوو شایەت هەیە هەروەها پێویستیشی بە موافەقەی وەلییەکەی هەیە.

ئینجا بێینەوە سەر گۆرینی مارەکردنی حەنەفی بە شافعی زۆر جار رووئەدات ئافرەتێك حەز لە پیاوێك دەکات بەڵام پێشەکی دەزانێت وەلییەکەی

و کەس و کارەکەی رازی نابن بەم شوکردنە، یان ئەو پیاوە ژنێکی تری هەیە لەبەرئەوەی ئاژاوە پەیدا نەبێت لەماڵەکەیدا دەچێت بە دزیەوە ئەو ژنە کە لەگەڵی رێکەوتووە مارە دەکات لای مامۆستای ئاینی و بەئامادەبوونی دوو شاهێد بەمەزهەبی حەنەفی، ماوەیەك لەگەڵ ئەم ژنە بەدزیەوە ژن و مێردایەتیەکەیان بەسەر دەبەن، لە پاشاندا خۆیان بەگوناهبار دەزانن بەرامبەر بە شافعی کە بەمەزهەبەکەی ئەو مارە کردنەکە تەواو نەبووە، یان رۆژێك لە رۆژان خزم و کەس و کارەکەی ئەو یەکگرتنەیان پێ ڕەوا دەبێت، یان ژنە پێشووەکەی رازی دەبێت لەسەر ئەو مارە کردنە یان دەمرێت یان تەڵاقی دەدات، ئینجا بۆ جارێکی تر دەچنەوە لای مامۆستای ئاینی بۆ ئەوەی مارە بکرێتەوە بە مەزهەبی شافعی بە موافەقەتی وەلییەکەی و حازر بوونی دوو شاهێد.

بۆ نمونە مەلا (ع) لە سلێمانی مزگەوتەکەی نزیکی مزگەوتەکەی من بوو، زۆر برایەتیمان خۆشبوو، منیش زۆر رێزم دەگرت چونکە پیاوێکی زۆر راست بوو، ئەوەی لە دڵیدا بوو بەزمان دەیوت دووڕوویی نەبوو، منیش ئەو جۆرە پیاوانەم زۆر خۆش دەوێن، ئەم برادەرەم بوو بوو بە خەلیفەی شێخ (ع.ك) دەروێشێکی ئەم شێخە کە ناسراوی دەبێت کۆچی دوایی دەکات، ژنەکەی (أ) ئافرەتێکی بە حورمەت و بەشەوکەت بوو لەگەڵ یەکتر رێك دەکەون بەدزی ژنەکەیی و باوکی ئەو ژنەوە مارەی دەکات بە مەزهەبی حەنەفی، دوو ساڵ ژن و مێردایەتی لەگەڵ کرد بەنهێنی، لە پاشان توانی باوکی ئەو ژنە ڕەزامەند بکات کە بۆ جارێکی تر لێی مارە بکاتەوە بە شافعی، هات بۆ لای من وتی: ئیشێکی وام کردووە دەمەوێت تۆ لە حەنەفیەوە بۆم بکەیت بە شافعی لە پاش ڕەزامەندی باوکەکەی.

رۆژێکی بڕیاردا پێکەوە رۆشتین بۆ ماڵی باوکی ژنە تازەکەی، باوکی حازر بوو لەگەڵ دوو شایەت سەر لەنوێ من مارەم کردەوە لەسەر مەزهەبی شافعی، ئەو رۆژە ژنەکەی خواردنێکی زۆر خۆش و بەلەزەتی دروست کردبوو کە ئێستاش هەست بە لەزەتەکەی دەکەم، چایەکی لێ نابوو پڕی کردبوو لە هێل، کاتێك گەڕامەوە وتم بە دایکی محمد ئەمڕۆ نان و چاییەکی زۆر بەلەزەتم خواردووە بەڵام خوا پاشە رۆژی بەخێر بگێڕێ، ئەم کردەوەیە رێکەوتی مانگێك

پێش واز هێنانم بوو لە مەلایەتی و بوونم بە ئیمامی سوپا، ڕۆژێك لە حوجرەی فەقێیەكان دەرسم دەوتەوە دەبینم ژنە كۆنەكەی ماموّستا مەلا (ع) هات هەردوو دەستی گرت بەملا و ئەو لای دەرگای حوجرەكەم. وتم: فەرموو وەرە ئەمدیوو.

وتی: لە شاری سلێمانیدا لەتۆ كافر تر نەبوو كە ئەو ژنە مارە بكات لە مەلا (ع).

وتم: خوشكم مێردەكەت دوو ساڵە بە مەزهەبی حەنەفی بەنهێنی لەگەڵ ئەو ژنەدا ژن و مێردایەتیان بەسەر بردووە، من تاوانەكەم تەنها ئەوەیە لە حەنەفییەوە بۆم كردووە بە شافعی.

ئینجا هەندێك قسەی ناشیرینی وت و ڕۆشت، پاش هەفتەیەك ژنە تازەكەی هات بە هەمان جۆر ئەمبەر و ئەوبەری دەرگاكەی گرت، وتی: تۆ لە كاتی مارەكردنەكەدا بەڵێنت دا بەمن كە مێردەكەی واتە ماموّستا مەلا (ع) خانووی سەربەخۆم بۆ بگرێت تا ئێستا هیچ شتێكی نەكردووە بۆم.

وتم: خوشكم من تاوانم چییە ئێوە ئەوە دوو ساڵە لەگەڵ یەكتر ژن و مێرد بوون بۆ داوات نەكردووە خانووی سەربەخۆت بۆ بگرێ.

وتی: من تۆ ئەناسم خانووم لەتۆ ئەوێ.

ئینجا نیوەڕۆ كەچوومە ماڵەوە بۆ دایكی محمدم گێڕایەوە وتم نان و چێشتی ڕۆژی مارە كردنەكەیان لێكردم بە زەهری مار.

شایانی باسە تا ئەو مانگە تەواو بوو كە وازم لە مەلایەتی هێنا و بووم بە ئیمامی سوپا ڕۆژێك ژنە كۆنەكە ئەهاتە سەرم ڕۆژێك ژنە تازەكە، بەڵام خوا قوتاری كردم لەدەستی ئەو گوناهە كە ماموّستا مەلا (ع) پێی كردم، ژن هێنانەكەم لە حەنەفیەوە بۆ كرد بە شافعی.

لەنێوان ژیانی مەلایەتی و سەرەتای ژیانی ئیمامەتی سوپا، دەڵێم بە ماموّستایانی بەڕێزی كورد، ژنهێنان و تەڵاقدان و مەرجەكانیان، خواو پێغەمبەر بڕیاری داون، لەپێش لەدایكبوونی ئیمامی (ئەبو حەنیفە) و ئیمامی (شافیعی)، ئەم ئاڵوگۆڕییە لەكوێوە هاتووە؟!

## هۆی دواکەوتنی موسڵمانان

ئەتوانین بڵێین ئەو هۆیانەی کە بوون بە هۆی دواکەوتنی موسڵمانەکانی ئەم جیهانە لە عەرەب و غەیری عەرەب بریتییە لەم چوار هۆیانەی لای خوارەوە، کە بەکورتی باسیان دەکەین:

**یەکـــەم:** دووری لە زانیاری تازەو گرنگی نەدان بە زانینی ئەو زانیاریانەی کە خوای گەورە ناوی بردووە بە (سلطان) لەم ئایەتە پیرۆزەدا کە دەفەرموێ:

﴿ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَٰنٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ (الرحمن : ٣٣).

واتە: ئەی جین و ئادەمیزاد، ئەگەر بتانەوێت بتوانن بە هەموو شوێنەکانی ئاسمان و ئەستێرەکان و زەمین شارەزا بن و دەستیان بەسەردا بگرن و سوودیان لێ وەربگرن، ناتوانن ئەوە بکەن مەگەر لەرێگەی زانین و زانیارییەوە بێت.

دیارە ئەگەر موسڵمانان گرنگیان بدایە بەم فەرموودەیەی خوا، کە زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵە دەیدات بە گوێماندا، کە مرۆڤ دەتوانێت لەرێگەی زانیارییەوە بچێت بە ئاسمانەکاندا بگەڕێت و بگاتە ئەستێرەکانی تر، لەباتی ئەو کەشتییەی ئەمریکا کە لەسەر ئەستێرەی مەریخ دابەزی، کەشتییەکی ئیسلامی دەبوو، چونکە ئەوکاتە کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، ئەمریکیەکان وەکو ئاژەڵ دەژیان و یاسای جەنگەڵ حوکمڕانی ئەوانی دەکرد.

**دووەم:** دوورکەوتنەوە لە ژیریی و وەستانی موسڵمانان لەدژی هەرشتێکی تازە کەژیری بیخستایەتە بەرچاویان، تا ئێستاش بە ملیۆنەها موسڵمانی مێشک وشك لە وڵاتە موسڵمانەکاندا هەیە لە هەموو چەرخێکدا لەدژی هەموو شتێکی تازە ئەوەستن، هەر شتێك ژیری پیشانی بدات پێی دەوترێت ئەمە شتێکە گومڕاییەو بە پێچەوانەی ئایینی ئیسلامەوەیە.

بۆ نمونە مانگێگ لەمەوپێش داوایان لێکردم محازەرەیەك بدەم لە کۆلێجی یاسای خۆمان لە بابەت قازانج و زیانی ئەوەی تازە دۆزراوەتەوە، کە پێی دەوترێت (الجين البشرى) یان (الجين الوراثي)، دیارە ئەمە موسڵمانەکان هەموویان ئێستا دژی ئەم شتە دۆزراوە تازەیەن، منیش باسم کرد بۆیان کە قورئانی پیرۆز لەپێش زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ باسی (جینی وراثي) کردووە کە دەفەرموێ:

﴿ فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ ۖ قَالُوا۟ يَـٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا ﴿٢٧﴾ يَـٰٓأُخْتَ هَـٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ ﴾ (مريم : ٢٨).

واتە: ئەی خوشکی هارون، تۆ باوك و دایکت مرۆڤێکی خراپ نەبوون، هەتا ئەو خراپییە لەرێگەی جینی میراتیەوە بگات بە تۆ و ببیت بە ئافرەتێکی خراپ، بەجۆرێکی وەها کە منداڵێکت ببێت بەبێ ئەوەی مێردت کردبێت.

شایانی باسە حەزرەتی مریەم دایکی حەزرەتی عیسا بوو، بە فەرمانی خوا بەبێ ئەوەی شووی کردبێت سکی پڕ بوو، عیسا یەکەم کەسە لە ئادەمیزاددا کە تەنها لەرێگەی دایکەوە بووەو باوکی نەبووە، ئینجا کە عیسا لەدایك بوو، هەڵی گرت و بردیە ناو کەسوکارەکەی، ئەوانیش پێیان وت: تۆ ئەم منداڵە زۆڵەت چۆن لێ بوو، لەگەڵ ئەوەی تۆ دایك و باوکت هیچ جۆرە خراپیەکیان نەبوو لەروی جینی میراتیەوە ئەو خراپەیە بگات بە تۆ.

لەم دوو ئایەتەدا خوا بەگوێماندا دەدات کە مرۆڤی خراپ ئەگەر منداڵەکەی خراپ بێت جێگای سەرسامی نیە، چونکە لەرێگای جینەوە چاکی و خراپی ئەڕوا بۆ نەوەکانی.

**هەروەها پێغەمبەر لە پێش زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ باسی (جینی وراثي) کردووە و ناوی ناوە (عرق)، وەك لەم دوو فەرمودەیەدا دەردەکەوێت:**

**یەکـەم:** دەفەرموێت: (تَخيَّروا لنُطَفِكمْ فإنَّ العرقَ دساسٌ وقيلَ نزاعٌ).

واتە: بۆ هەڵبژاردنی ئافرەتێك بۆ هاوبەشی ژیان و ژن و مێردایەتی، ئافرەتێکی بە ڕەوشت و پاك هەڵبژێرن، چونکە ئەگەر خراپ بێت جینی وراسی ئەو ژنە دەچێت بۆ منداڵەکانی، ئەوانیش دەچنەوە سەر ئەو لە ڕەوشت خراپیدا، دیارە ئەمەش هەر لە باوکەکەشدا دێتەدی، ئەگەر خراپ بێت زۆر جار منداڵەکەی کردەوەی خراپ دەبێت.

هەروەها لە فەرمودەیەکی تریدا دەفەرموێ:

((تزوَّجـوا فـي الحِجْـرِ الصَّـالحِ فإنَّ العِـرقَ دسَّـاسٌ)).

مانای ئەم فەرمودیە وەکو فەرمودەکەی ترە، چونکە مەبەست لە (دساس و نزاع) ئەوەیە کە جینی بەشەری چاك و خراپی رادەکێشێت لە باوك و دایکەوە بۆ نەوەکانیان.

شایانی باسە لە زمانی عەرەبیدا هەر وشەیەك (ج) و (ن)ی تێدابێت، ماناکەی شتێکی نادیاریە وەکو (جن) و (جنین)، کە بەو منداڵە دەڵێن کە لە سکی دایکیدایە، (جَنّـة) واتە بەهەشت، (جنان) واتە ناو دڵ و دەرونی مرۆڤ، هەروەها وشەکانی تریش کە ئەم دوو پیتەیان تیادابێت.

زۆر لە موسڵمانە زاناکان لەم رۆژەدا دژی بەکارهێنانی (جینی وراثي) دەدوێن بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە کە هەموو شتێك چاکی هەیە و خراپیشی هەیە، مرۆڤی ژیر لە چاکیەکەدا بەکاری دەهێنێ و لە خراپیەکەدا لێی دوردەکەوێتەوە.

زاناکان لە پزیشکەکانی ئەمرۆ بیروباوەڕیان وایە کە نەخۆشی خراپ وەك (شێرپەنجە) لەوانەیە لەڕێگای جینی بۆماوەیی چارەسەر بکرێت، ئەمەش پاشەڕۆژ دەری دەخات، موسڵمانان نابێت هەر شتێکی تازەپەیدابوو لەدژی رابوەستن، لەبەر ئەوەی پێشینەکان نەیانووتووە.

من بۆ ماوەی سێ ساڵ شەوم خستە سەر ڕۆژ، بە سەدان سەرچاوەم خوێندەوە، ڕوونم کردەوە کە لە قورئانی پیرۆزدا یەك ئایەت نیە کە بەتاڵ کرابێتەوە و ئایەتەکەش هەر لە قورئاندا مابێت، چونکە ئەمە شتێکە ژیری پەسەندی ناکات، بۆ نمونە ئەگەر خاوەن یاسایەك فەرمان بدات کە بەندێك لە یاساکەی بەتاڵ بکرێتەوە، لەهەمان کاتدا فەرمان بدات بەوەی کە بەندەکە دەبێت هەر لە ناوەندی بەندەکانی تری ئەم یاسایەدا بمێنێتەوە، بە سەدان توانج و تانە لەم خاوەن یاساییە دەگیرێت لەو ڕووەوە کە چۆن دەبێت شتێك بەتاڵ بکرێتەوەو لە هەمان کاتدا پارێزگاری لێبکرێت، کەواتە شتێك کە ناشیرین بێت بۆ ئادەمیزاد چۆن دەبێت خوا بیکات، ژیری چۆن بڕوا دەکات خوا ئیشی ناشیرین بکات، یان بێ کەڵك و بێ سود.

ئەم کتێبەم دوو لیژنەی بۆ گیرا، لە مەلا نەخوێندەوارەکانی بەغدا هیچیان لە وشەکانم تێنەگەیشتن، لەبەر ئەوە بڕیاریان دا نابێت ئەم کتێبە بڵاوبکرێتەوە، چونکە دژی فەرمودەی زانا پێشوەکانی ئایینی ئیسلامە. بەڵام خۆشبەختانە ئەم دانراوەم ئێستا لە ئەمریکا هەوڵ دەدرێت بکرێت بە ئینگلیزی و لە تورکیا وەری دەگێڕنە سەر زمانی تورکی و لە ئێران بۆ زمانی فارسی و لە هیندستان بۆ زمانی هیندی.

ئەم کتێبە ناوی (التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن).

**دووەم:** دوورخستنەوەی ئایینی ئیسلام لە ڕژێمەکانی وڵاتە موسڵمانەکان، لەپاش خولەفای راشدین ئەوەی حوکمی گەلە موسڵمانەکانی کرد، ئیسلامی ئەوەندە بەکارهێنا کە سوودی بۆمانەوەی ڕژێمەکەی هەبێت، بەڵام هەر شتێك دژی کردەوەی کاربەدەستانی ڕژێمەکە بوایە دوریان دەخستەوە، هەروەك ئێستا ئەگەر یەکێك داوای ئەوە بکات کە کاروباری ڕژێمە موسڵمانەکان با جیاوازی نەبێت لەگەڵ فەرمودەکانی خواو پێغەمبەر پێی دەوترێت تیرۆریست.

شارۆن، سەرۆك وەزیرانی جولەکە ئەم تاوانبارە زیاتر لە ٣٠٠ ملیۆن عەرەب زەلیلە بە دەستیەوەو ملی شۆڕ ناکات، نە بۆ یاسای گشتی و نە بۆ هیچ

عورف و عادەتێکی چاکی گشتی، لەو رووەوە نیە کە سەرۆك وەزیرانە، بەڵکو لەو رووەوەیە کە خۆی بە (حاخام)ێکی سەهیۆنی دادەنێت و داوای زەوی میعاد دەکات و داوای زەمین و ئاو و وڵاتی باووباپیری دەکات.

ئەگەر جویەك لەئەمریکاوە بێت مێشکی پڕە لە رژێمی ئەو وڵاتە کە لێوەی هاتووە، هەروەها ئەگەر یەکێکی تر هات لە روسیاوە، ئەویش مێشکی پڕە بەو شتانە کە پەیوەندی هەیە بە رژێمی روسیەوە، ئەم دوو کەسە هەرکەسێك بیروباوەڕی خۆی لەلایەك دائەنێت و دەست دەکاتە ملی ئەوی تر و لەژێر یاسای ئاینەکەیاندا پشتی یەکتر دەگرن و لەدژی دوژمنەکانی جوو دەوەستن.

واتە ئەوەی بە بیروباوەڕی ئایینی لە دژی تۆ بوەستێت تۆش دەبێت بە بیروباوەڕی ئاینەکەی خۆت لەدژی بوەستیت، ئەگەر نا بەخۆت نازانیت پشتت دەدا بە زەویدا. ئامانجەکانی خۆی جێبەجێ دەکات، هەروەك ئەوەی خۆی دەیەوێت.

چوارەم: جیاوازی نێوان ئایینی ئیسلام و ژیانی جیهان لەلایەن خوێندەوارەکانی ئیسلامەوە وەك مەلاکانی ئێستا، لەبەر ئەوەی کاتێك دەچنە سەر مینبەری پێغەمبەر((صلی اللە علیە وسلم)) بەناوی ئیسلامەوە قسە دەکەن لەگەڵ گوێگرەکان، بەو جۆرە قسەیان لەگەڵ دەکەن وەك لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بژین، بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەنەوە کە ئەوان لە چەرخێکدا دەژین کە مرۆڤ دەچێت بۆ ناو ئاسمان و ئەستێرەکان و، زانایی بەجۆرێکی وەها پێشکەوتووە لە هەموو بابەتێکەوە کە مرۆڤ سەرسام دەمێنێ لەو شتە تازانەی دروست کراون و دۆزراونەتەوە، لەلایەکی تریشەوە مامۆستاکانی ئایینی بردویانەتە مێشکی موسڵمانانەوە کە ئایینی ئیسلام بریتییە لە پێنج شت: یەکەم نوێژ، دووەم رۆژوو، سێیەم زەکات، چوارم حەج، پێنجەم جیهاد یاخود غەزا، کە هەر ناوەکەی ماوە.

لە مێشکی موسڵماناندا چەسپاندوویانە کە ئیسلام بریتییە لەم پێنج شتەو ئەم پێنج شتە بریتییە لە ئیسلام، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە خوا و پێغەمبەر((صلی اللە علیە وسلم)) فەرمویانە، پێغەمبەری خوا ((صلی اللە علیە وسلم)) دەفەرموێ:

((بُنِـيَ الإسـلامُ علـى خَمـسٍ))

واتە: ئیسلام گیانێکە لەسەر پێنج کۆڵەکە دادەنرێت، کە بریتییە لەو پێنجانەی باسکران، چونکە ئەم پێنج شتە مرۆڤ پاك دەکەنەوەو دەیکەن بە ئاڵتونێکی پاڵێوراو، ئەوکاتە کیانی ژیانیان شاد دەبێت لەسەر ڕەوشتی جوان و زانست و برایەتی، کە لەم پێنج کۆڵەکەیەوە پەیدا دەبن، ئێستا لە هەموو جیهانی ئیسلامدا کۆڵەکەکانی هەن و دانراون بەراستی و بە چەوتی، بەڵام هیچ کیانێکی جیهانی بۆ ئەم موسڵمانانە نیە، وەك کیانی ژیانی ناموسڵمانەکان کە ئەوان کۆڵەکەشیان نیە بەڵام کیانێکی ڕێکوپێکی شارستانی و پێشکەوتوویان هەیە لە هەموو پێویستیەکانی ژیانی ئادەمیزاد.

ئەگەر بەوردی لە قورئانی پیرۆز وردبینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو ئایەتانەی باسی نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج و جیهاد دەکەن زیاتر نین لە ٥٪، لەگەڵ ئەوەشدا نە مەلایەك نە شێخێك، نە دڵسۆزێکی تری ئیسلام جارێك باسی ئەوە ناکات ٩٥٪کەی تری باسی چی دەکات و لە کوێیە؟ دیارە ئەمە موسڵمانەکان لەبیری خۆیان بردۆتەوە، یان ئەم بەشە زۆرەی قورئان لە پرسەکاندا دەخوێنرێ لەکاتی مردنی کەسێك، یان لەسەر قەبران، ئەمجۆرە کردەوەیە وا پیشان دەدات کە قورئان دەستوری مردووەکانە و هی زیندووەکان نیە.

یەکێ لەو ئایەتانە کە لەسەر مردووەکان دەخوێندرێت ئەمەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ﴾ (الأنفال : ٦٠).

واتە: ئەو چەکانەی کە بەکاردەهێنرێت لەدژی دوژمن ئێوە هەردەم ئامادەیان بکەن بۆ ئەوەی دوژمنەکەتان زاڵ نەبێت بەسەرتاندا و هەردەم دەبێت ئەوەی دوژمن هەیەتی لەلای ئێوەش زیاتر هەبێت.

مەبەست لە (رِبَاطِ ٱلْخَيْلِ ) ئەوەیە کە پێویستی جەنگ دەگوازێتەوە بۆ مەیدانی جەنگ، وەك هۆیە ئاسمانی و ئاوی و زەمینیەکان، کە ئێستا وڵاتە پێشکەوتوەکان هەیانەو موسڵمانەکان بێبەشن لێی، هەرچی بەرهەمی وڵاتەکەیانە دەیدەن بەو وڵاتە پێشکەوتوانە تا چەکیان بدەنێ، ئینجا هەر لەبەر ئەوەیە تاوانبارێکی وەك شارۆن سەرۆك وەزیرانی جولەکە یاری بە شتە پیرۆزەکانی زیاتر لە ملیارێك موسڵمان و ۳۰۰ ملیۆن عەرەب دەکات.

شایانی باسە لە کتێبێکدا خوێندومەتەوە بە ناوی (لماذا أسلمت)، ئەم دانراوە هی پیاوێکی نەمساویە، پاش موسڵمان بوون خۆی ناونا محمد، ئەوەی لە کتێبەکە باسی دەکات بەکورتی ئەمەیە:

"لە هەر شوێنێك لەگەڵ یەکێکی تر دانیشتمایە هەردەم باسی خراپی و دواکەوتوویی ئیسلامم دەکرد، لە هەموو کۆبونەوەیەکدا هێرشم دەبردە سەر ئیسلام و دەموت ئیسلام ئایینی چڵك و چەپەڵییە، ئایینی نەزانی و دواکەوتنە، ئایینی دزی و دووبەرەکی و پیاوکوشتنە، ئایینی فرۆفێڵە، هەر بەمجۆرە هەر شتێ ناشیرین و ناڕەوا بووایە دەمدایە پاڵ ئیسلام.

بەڵام خوا ویستی کە من بەراستی لەم ئایینە پاکە تێبگەم، وەك نوێنەر ناردمیان بۆ باڵیۆزی وڵاتەکەم لە دەوڵەتێکی عەرەبی، منیش هەوڵم دا و خۆم فێری زمانی عەرەبی کرد بەر لەوەی بچمە سەرچاوەکانی ئایینی ئیسلام، بۆ ئەوەی شتی خراپ و ناڕەوا بدۆزمەوەو بەکاری بهێنم لەدژی ئیسلام و موسڵمانەکان.

پاش فێربوونی زمانی عەرەبی، چوومە سەر قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر، زۆر سەرم سوڕما لەو جیاوازییە گەورەو گرانەی نێوان ئەم دوو سەرچاوە پیرۆزە و نێوان رەوشت و کردەوەی موسڵمانەکان.

بۆم دەرکەوت کە موسڵمانان وان لە شیوێکدا و ئیسلامیش لە شیوێکی تردا، هیچیان پەیوەندییان بە یەکترەوە نیە."

(محمد عبدة) لە زانا بەرزەکان و رۆشنبیرەکانی چەرخی تازەبوو، لەگەڵ (جمال الدين افغاني) داوایان کرد لە گەلی میسر و کاربەدەستەکانی با بەژیری لەگەڵ ئیسلام هەڵستن و دانیشن، چونکە ژیری و ئایینی ئیسلام دوو شتن نابێت لە یەکتر دووربخرێنەوە، هەریەکێك یارمەتی ئەوی تر دەدات بۆ سوودی ئادەمیزاد.

لەبەر ئەوە کە موسڵمانان دژی ژیرین، دەریان کردن لە میسر و چوونە فەرەنسا، لەوێ داوایان کرد موسڵمانەتی و ژیری لەیەك نەپچڕێن، (محمد عبدة) دەڵێت: (في أوروبا وجدت الإسلام ولم أجد مسلمين وعندنا وجدت مسلمين ولم أجد الإسلام). واتە: لە ئەوروپا ئیسلام هەیە و موسڵمان نیە، چونکە کردەوەی گاورەکان لە راستی و رەوشت و کردەوەدا بەپێی ئایینی ئیسلامە، بەڵام موسڵمانەکانی وڵاتە ئیسلامیەکان نوێژ و رۆژوو بە دەم دەکەن، کەچی کردەوەکانیان بەپێچەوانەی ئایینی ئیسلامە.

# بەشی سێیەم

# ژیانی ئیمامەتیم لە سوپا

## (١٩٥٥/١٠/٨-١٩٧٢/٨/٢٠ز)

دەوران دەوڵەتت لەدەست ئەستێنێ
بەڵام نـاوی چـاك تا سـەر ئەمێنێ
نیەتت چاك بێت كار ئەبەیتە سـەر
درەخت زڕ نەبێت هەر بۆت دێتە بەر

پیرەمێرد



## چۆن بووم بە ئیمام

لەپاش ئەو هەموو ناخۆشی و دژایەتیەی لەلایەن هەندێ لە مامۆستایانی ئایینی سلێمانیەوە لەگەڵم کرا، سەرەڕای تەنگ و چەڵەمەو ناخۆشیەکانی ژیان، بڕیارم دا کە بە نهێنی بچمە جۆرێکی تری ژیانەوە، بەشێوەیەکی وا کە دوورم نەخاتەوە لە ئایین، پرسم بە هەندێ دۆست و برادەر کرد، یەکێك لەوانە (ئەحمەد فەهمی جوانڕۆیی) بوو، ئەمیش ئەزموونێکی زۆری لە ژیاندا هەبوو، بە هەمووومانەوە بڕیارمان دا بچم ببم بە ئیمامی سوپا، چونکە پیشەیەکی ئایینیەو دوور ناکەومەوە لە شێوازی ژیانی مەلایەتی و تەدریس و مزگەوت.

چووم بۆ کەرکووك بۆ لای ئیمامەکانی سوپا کە هەموویان کورد بوون، بۆ ئەوەی لە هەموو ڕوویەکیەوە لەم وەزیفەیە تێبگەم، بە تایبەتی پێویستیەکانی دامەزراندنم، لەپاش ئەوە هەموو لەسەر ئەم بیروڕایە هانیان دام، نامەیەکم نووسی بۆ کاك (یحیی چروستانی) لە بەغدا، کە ئەگەر ئیمامەتی سوپا داواکرا پێم بڵێت و ئاگادارم بکاتەوە. لەپاش ماوەیەکی کەم هەواڵی بۆ ناردم کە بڕۆم داواکارییەك بنووسم بۆ وەزارەتی بەرگری (دفاع) بۆ بەشداربوونم لە تاقیکردنەوەی ئیمامی سوپا.

کاتێ چوومە بەغدا بینیم ئەم ئاگادارییەی داواکردنی سوپا بڵاوکراوەتەوەو -٤٣- کەس خۆیان ئامادەکردووە بۆ تاقیکردنەوە، بە منەوە بوون بە -٤٤- کەس، بەڵام ڕۆژی تاقیکردنەوەکە دیاری نەکرابوو.


مەلا عومەر دیبەگەیی

خوالێخۆش بوو کاك مەلا عومەردیبەگەیی، مزگەوتەکەی لەپاڵ وەزارەتی بەرگریدا بوو، تکام لێ کرد کە هەرکاتێك ڕۆژی تاقیکردنەوەکە دیاری کرا بە زووترین کات هەواڵم بداتێ، ئەویش بەڵێنی دا کە ئاگادارم بکات.

کە گەڕامەوە سلێمانی وام بەباش زانی پرسێك بە قازی شێخ محمدی خاڵ بکەم، چونکە زۆر زاناو دانابوو، زۆر منی خۆش دەویست، کاتێ کە باسەکەم بۆی کرد کە نیازێکی وام هەیە زۆر پێی تێکچوو پێی ناخۆش بوو، لە دژی ئەم بیروڕایەم وەستا، پێی وتم: ئەم ئیشە لایەقی تۆ نییە، تۆ خوێندەواری، بەڵکو بۆ فلان و فلان باشە کە بوون بە ئیمامی سوپا.

وتم: چارم نییە.

وتی: چارت لای منە، میری بەنیازە پەیمانگایەکی ئیسلامی بکاتەوە، من هەوڵ ئەدەم تۆ بکەین بە بەڕێوەبەری، وەکو جاران خزمەتی زانست و ئاین دەکەیت، ژیانیشت باشتر دەبێت، مەلایەتیشت لەکۆڵ ئەبێتەوە.

منیش بە دڵ و بە گیان بۆچوونەکەیم پەسەند کرد، بەڵێنم دایە کە نەچم بەرەوپیری ئەم ئیشەوە، لە پاشا وازم هێنا لە خۆئامادەکردن بۆ تاقی کردنەوەی ئیمامی سوپا.

بەڵام (ئەوەی لای بەندە خەیاڵە لای خوا بەتاڵە)، پێغەمبەری خوا ((صلی الله علیه وسلم)) لەسەر ئەمە فەرموویەتی:

((إذا أراد الله شيئا هيأ أسبابه))

واتە: ئەگەر خوا ویستی ئیشێ بکات لە پێشا هۆیەکانی بۆ ئامادە دەکات.

کاتێك کە نزیکی تاقیکردنەوەی ئیمامەتی هات، تەنگ و چەڵەمەیەکم تووش بوو کە پاڵی پێوەنام بۆ ئەوەی نەك تەنیا مەلایەتی بەجێ بێڵم، بەڵکو لەگەڵیا شاری سلێمانی بەجێ بهێڵم، ئەوەش ئەمە بوو:

خانوویەکم بە کرێ گرت بە (٤) دینار، لە حاجی مەلا مارف، خوارەوەی دوو ژوور بوو، دامن بەکرێ بە دوو ماڵ، هەریەکی بە دینارێك، سەرەوە دوو ژوور بوو بۆ خۆمان. کاك عبدالله ی ئامۆزام و خاڵی منداڵەکان لە ماڵی ئێمە دەمایەوە، لە پۆلی پێنجەمی ئامادەیی دەیخوێند، کە دوا قۆناغی ئامادەیی بوو ئەو کاتە، پیاوێکی بە ئەدەب، شەرمن و زیرەك بوو.

بەڵام یەکێك لە کرێچییەکانی خوارەوە، کە خەڵوزفرۆش بوو، رۆژێك پێی وتم: دەبێ عبدالله لە مزگەوت بنوێت و لەماڵی ئێوە نەبێت، منیش وتم: مەبەستت چییە؟ وتی: من ڕازی نابم پیاوی غەریبە بێتە ئەم حەوشەیەوە، وتم: عبدالله لێرە کەسی نیە لە من زیاتر، برای خێزانەکەمەو کوڕی ماممە، ئەگەر تۆ پێت خۆش نیە برۆ بۆ شوێنێکی تر خانوو بگرە، وتی: نە ئەڕۆم و نە ڕێگا ئەدەم عبدالله بێت بەم ماڵەدا.

منیش وام بەباش زانی کە لەگەڵ یەکێکی وەهادا نەچمە کێشەوە، چووم بۆ لای چەند کەسێك لە پیاوەکانی گەڕەکەکەو داوام لێ کردن کە یارمەتیم بدەن ئەم پیاوە ئەو ژوورە بەجێ بهێڵێت و بچێت بۆ ژوورێکی تر بۆ ئەوەی تووشی شەڕ و ئاژاوە نەبم، کەچی ئەم پیاوانە هەموویان لایەنگیری کابرای خەڵوزفرۆشیان کرد، وتیان: حەقی خۆیەتی کە نەچێتە دەرەوە، با ئامۆزاکەت لە مزگەوت بێ و نانی بۆ بەرن بۆ مزگەوت.

منیش کە ئەو قسەیەم لێ بیستن، لەو کاتەوە پیشەی مەلایەتیم لەبەرچاو کەوت، ئەگەر شتێکی زۆر پێویست نەبێت پێم خۆش نیە بچمەوە بۆ سلێمانی، هەرچەندە سلێمانی زۆر کەسی خۆشەویستی لێیەو کانگای کوردستانە.

خۆشبەختانە لەپاش دوو ڕۆژ بروسکەیەکم بۆ هات لەلایەن کاك مەلا عومەرەوە وتی: دوو رۆژی تر تاقیکردنەوە دەست پێدەکات، منیش لەسەر ئەو بەڵێنەی دام بە قازی شێخ محمدی خاڵ، خۆم ئامادە نەکردبوو، بەڵام پشتم بە خوا بەست و کەوتمە ڕێ بۆ بەغدا، چووم بەشداریم لەو تاقی کردنەوەیەدا کرد، لە ئەنجامدا لەو -٤٤- کەسە تەنها چوار کەس دەرچوون، دوو کورد و دوو عەرەب، کوردەکەی تر جەنابی کاك عبدالمجید شیروانی بوو (خوا لێی خۆشبێت)، خەڵکی هەولێر بوو.

لەپاشان گەڕامەوە سلێمانی، داوایان لێ کردم کە جل و بەرگی ئیمامەتی تەواو بکەم و دوای هەفتەیەك ئامادە ببم، لەو ماوەیەدا هەموو شتێکم تەواوکرد و کارێکی وام نەکرد کە کەس بزانێت، چووم بۆ بەغدا، ئیتر نەگەڕامەوە بۆ سلێمانی.

١٩٥٥/١٠/١٨ لە فەوجی -٣- لیوای -١٩- لە جەلەولا دامەزرام، عەبدولسەلام عارف فەرماندەی فەوج بوو، عەبدولکەریم قاسم فەرماندەی لیوا بوو.

# کورتەیەك دەربارەی

# ئیمام لە سـوپا

ئیمام لە سوپا پێی دەوترا ئیمام تابور، سەرەتا لە سەردەمی ئیبراتۆریەتی عوسمانی داهێنراوە، هەر لیوایەك ئیمامێکی بووە، دواتر لە سوپا عەرەبیەکاندا لە هەر فەوجێك ئیمامێکی هەبووە، ئەم ئیمامە لە سوپادا رۆڵی ئایینی دەبینێت، هەفتەی جارێك محازەرەیەکی ئایینی بۆ ماوەی نزیکەی سەعاتێك پێشکەشی هەموو فەوجەکە دەکات. لەبەر ئەوەی بە پیاوێکی ئەمین دەناسرێت، ئەندامە لە وەرگرتنی ئەرزاقی رۆژانەی فەوجەکە، سەرپەرشتی وەرگرتن و کێشانە و پێوانەیدا دەکات.

هاوشێوەی ئەمە لە سوپای وڵاتە رۆژئاواییەکانیشدا هەیە، بەڵام لای ئەوان جێگاو رێگاو رێگەی باڵاترە لە ئیمام تابوری سوپای عەرەب.

ئیمام لە سوپادا هەموو مافێکی ئەفسەری هەبوو، بۆ یەکەمجار بە ئیمامی پلە -٤- دادەمەزرێت، خەتێکی ئەدەنێ لەسەر جبەکەی لەسەر قۆڵی، هەموو مافێکی ملازم دووی سوپای هەیە، هەروەها وەکو هەموو ئەفسەرێك چوار ساڵ جارێك پلەکەی بەرز دەکرێتەوە(ترفیع) بە مەرجێك لە تاقی کردنەوەدا سەرکەوتوو بێت، لە پلە -٤- دەبێ بە -٣- وە بە -٢-، ئینجا پلە یەك، لەپاشدا دەبێت بە (درجە ممتاز) لەو پلەیەدا ڕادەوەستێت کە هەموو مافێکی ئەفسەری (مقدم)ی هەیە، واتە ئەو ئەفسەرەی کە تاج و ئەستێرەیەکی هەیە. پێش سێ ساڵ لە کۆتایی ژیانی سوپام گەشتم بە پلە نایاب (درجە ممتاز)، لە دواییدا خانەنشین بووم لە سوپا.

شایانی باسە ئیمام هەر لە زەمانی عوسمانیەکانەوە لە شیعە وەرنەگیراوە، هەموو سوننی بوون، بە تایبەتی لە زەمانی مەلیکی و زەمانی جمهوریدا،

ڕێژەیەکی زۆر کەم لە ئیمامەکان عەرەب بوون، بەڵکو زۆرترینیان کورد بوون، ئەوانەی کە ئیمام بوون لە سوپاداو ناسراویم هەبوو لەگەڵیان ئەمانە بوون:

١- مامۆستا مەلا محەمەد ئەمین عەلی مەحمود بڵباس.

٢- مامۆستا محمد شەریف دوشیوانی.

٣- مامۆستا عەبدولخالق مەعروف محەمەدئەمین.

٤- مامۆستا عەبدولمەجید محەمەد شیروانی.

٥- مامۆستا محەمەد عەلی مەلا محەمەد رەئیس.

٦- مامۆستا محەمەد سەعید مەلا محەمەد ڕەئیس.

٧- مامۆستا عەبدولکەریم غێدان مەحموود داودی (عەبدولکەریم هەکزی).

٨- مامۆستا مەلا عەبدولوەهاب محمد ئەمین مەحموود ساڵەیی.

٩- مامۆستا مەلا سەید عەبدلقادر ئەمین پیرداود.

١٠- مامۆستا مەلا عەزیز ئیبراهیم عەبدولڕەحیم.

١١- مامۆستا مەلا عەزیز قادر عەبدولڕەحمان.

١٢- مامۆستا مەلا عەلی محەمەد شێخ محەمەد مامەجلکی.

١٣- مامۆستا نوری جەباری.

١٤- مامۆستا رەحیم جەباری.

١٥- مامۆستا نوری فارس.

١٦- مامۆستا یەحیا چروستانی.

١٧- مامۆستا عەبدولڕەحمان مەلا عومەر.

١٨- مامۆستا عەبدولڕەحمان موحەدیس.

١٩- مامۆستا ئەحمەد نەقشبەندی.

٢٠- مامۆستا مەلا عەبدوڵای قزلجی.

ئەم ئیمامە کوردانە، هەرکەس بەپێی خۆی دڵسۆزی نەتەوەکەی خۆی بوو، تا حەدێکی زۆر ئیلتزامیان هەبوو بە ئایینی ئیسلامەوە.

لەم ئیمامانە دوانیان بوون بە پێشمەرگە، (محەمەد عەلی مەلا محەمەد ڕەئیس)، کە دواتر باسی دەکەین، دووەمیان (عەبدولخالق مەعروف).

# پوختەیەک لەژیانی
# ئیمامەکانی سوپا

### دکتۆر محەمەد شەریف ئەحمەد

سالّی ١٩٣٤ لەهەولێر لەدایك بووە، سالّی ١٩٥٦ ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، بۆتە ئیمام لەسوپا تا گەیشتۆتە پلەی موقەددەم، سالّی ١٩٧١ کۆلیجی یاسای لەزانکۆی موستەنسرپە تەواو کردووە، سالّی ١٩٧٩ بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێناوە، بۆتە ڕاگری کۆلیجی یاسای زانکۆی سەلاحەددین و، سەرۆکی کۆڕبەندی هزری ئیسلامی سالّی ٢٠٠٦تا ٢٠١٠ ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بوو.

### عبدالکریم غیدان محمود داودی

سالّی ١٩٠٧ لەقەزای دوزخورماتوو لەدایك بووە، سالّی ١٩٣٥ ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، بۆتە ئیمام لەسوپادا، تا گەیشتۆتە پلەی رائد، سالّی ١٩٦٨ خانەنشین کراوە، سالّی ١٩٧٤ کۆچی دوایی کردووە.

### محمد امین علی محمود بلباس

سالّی ١٩١١ لە هەولێر/ قورشاغلو لەدایك بووە، سالّی ١٩٣٨ مۆڵەتی زانستی ئایینی لەسەر دەستی مامۆستا (مەلا ڕەزای واعیز) لە شاری کەرکوك پێ بەخشراوە، لە هەمان سالّدا بە (ئیمامی عەسکەری) لە یەك لە فەوجەکانی

(منصوریه الجبل) دادەمەزرێت. دوای چەند ساڵێك دەگوازرێتەوە بۆ فەوجی یەکی لیوای چوار و لە شاری کەرکوك نیشتەجێ دەبێت.

خوالێخۆشبوو مرۆڤێکی سەرراست و بوێر و خاوەن هەڵوێست و نیشتمان پەروەر و کوردایەتی و ئایین پەروەر بوو، بۆیە لەو پێناوەدا چەندجار دوورخراوەتەوەو گوازراوەتەوەو لەژێر چاودێری بووەو ئەشکەنجە دراوە.

لەساڵی ١٩٥٣ دوورخراوەتەوە بۆ (وحدة المیدان الطبیة السابقة) لە جەلەولا، پاشان لەساڵی ١٩٦٢ گوازراوەتەوە بۆ (إمرة الادارة) لە وەزارەتی بەرگری لەگەڵ کۆمەڵە ئەفسەرانی کوردی نیشتمان پەروەر لەلایەن (عبدالکریم قاسم)ەوە، لەدوای سێ مانگ دەست بەسەری دەگوازرێتەوە بۆ (معسکر نهران عمر) نزیك شاری بەسرە.

لەساڵی ١٩٦٣ خانەنشین کرا، لەدوای بەیانی ١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ دووبارە گەڕێنرایەوە خزمەت بۆ (فەوجێك) لەشاری (إربد) لە ئوردن. ساڵی ١٩٧٤ لەسەر داوای خۆی خانەنشین کرا.

لەبەر ناخۆشی باری شاری کەرکوك، چەند جارێك لەلایەن دەزگای هەواڵگری عەسکەری و ئاسایش بانگ کرا بۆ هەڕەشەلێکردن، بۆیە ماڵی گوازتەوە شاری هەولێر.

ساڵی ١٩٩٧ کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی (شێخ أحمد) بەخاك سپاردرا.(١)

## عبدالوهاب محمد امین محمود صالحی

ساڵی ١٩١٩ لەگوندی یارمچەی سەربەشاری کەرکوك لەدایکبووە، زانستە ئیسلامیەکانی خوێندووە و بڕوانامەی لەوەزارەتی ئەوقاف بەدەست هێناوە و دواتر لەزانکۆی ئەزهەر خوێندنی تەواو کردووە، ساڵی ١٩٤٣ بۆتە ئیمام لەسوپا، تا گەیشتۆتە پلەی ئیمامی دەرجە ممتاز واتە موقەددەم، ساڵی ١٩٦٩ خانەنشین کراوە، ساڵی ١٩٩٢کۆچی دوایی کردووە.

---

(١) لە کاك عیزەت محەمەد ئەمین وەرگیراوە.

### سەید عبدالقادر امین پیرداود

ساڵی ١٩٠٨ لەگوندی قورشاغلۆ سەربەشاری هەولێر لەدایکبووە، ساڵی ١٩١٦ بۆ خوێندنی ئاینی چۆتە کەرکوك لەخزمەت ماموستا مەلا رەزای واعز خوێندویەتی و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ساڵی ١٩٤٠بۆتە ئیمام لەسوپا، تا گەیشتۆتە پلەی موقەددەم، ساڵی ١٩٧٤کۆچی دوایی کردووە.

### مەلا عزیز ابراهیم عبدالرحیم

ساڵی ١٩٠٨ لە سۆران لەدایکبووە، لەساڵانی چلەکاندا ئیجازەی مەلایەتی لەخزمەت ماموستا مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانیدا وەرگرتووە، بۆتە ئیمام لەسوپا، بەشداری جەنگی ساڵی ١٩٤٨ فەڵەستینی کردووە و لەریزی لیوای ١٥دا بووە لە تولکەرەم، لەسوپادا ماوەتەوە تا گەیشتۆتە پلەی نەقیب، ساڵی ١٩٦٠ خانەنشین کراوە، ساڵی ١٩٦٦ کۆچی دوایی کردووە.

### عبدالخالق معروف محمد امین

ساڵی ١٩٣٥ لەکەندێناوەی سەربەشاری هەولێر لەدایکبووە، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ساڵی ١٩٥٦بۆتە ئیمام لەسوپا، تا گەیشتۆتە پلەی ملازم ئەوەل، ساڵی ١٩٦٣ بووە پێشمەرگە، ساڵی ١٩٧٦لەچیکسلۆفاکیا دبلۆمی لەئامێرە ئەلکترۆنیەکان و پەیوەندییەکاندا بەدەست هێناوە، ساڵی ١٩٨٥ لەگەرەکی ئازادی شاری هەولێر لەلایەن رژێمی عێراقەوە کوژرا.

### عزیز قادر عبدالرحمن

ساڵی ١٩٣٢ لەشاری سلێمانی لەدایکبووە، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ساڵی ١٩٥٨ بۆتە ئیمام لەسوپا، ساڵی ١٩٦٣ پاش شەری هەندرێن لەسوپا دەرکراوە، چونکە ئامادە نەبووە لەو گۆشتە بخوات کەسوپا لەخەڵکی ئەو ناوچە

کوردییانەی هێنابوو، پاشان دوور خرایەوە بۆ نوگرە سەلمان، ساڵی ١٩٦٧ بەکارەساتی ئۆتۆمبێل کۆچی دوایی کردووە.

**عبدالمجید محمد شیروانی**

ساڵی ١٩٣٢ لەگوندی شێخان سەربەشاری ئاڵتون کۆپری لەدایکبووە، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ساڵی ١٩٥٦ بۆتە ئیمام لەسوپا، چۆتە سەربازگەی جەلەولا لەفەوجەکەی عەقید عبدالسلام عارف، لەبەر چالاکی سیاسی لەساڵی ١٩٦٤دا بۆ ماوەی چوار مانگ زیندانی کرا، ساڵی ١٩٧٦ خانەنشین کراوە، ساڵی ١٩٨٧ کۆچی دوایی کردووە.

**هەڵوێستەیەك لەسەر عەبدولخالق مەعروف**

کاتێ لە بەغدا بووین لەگەڵ عەبدولخالق مەعروف یەکترمان ناسی، ئەم پیاوە ئەم جیاوازییانەی هەبوو:

**یەکەم:** بتکوشتبایە وشەیەك درۆی نەدەکرد.

**دووەم:** هەرگیز بە شوێن پلەو پایەدا نەدەچوو.

**سێیەم:** دڵسۆزێکی کورد و کوردستان بوو.

**چوارەم:** لە زیرەکیدا بلیمەت بوو، تەنانەت لە بەغدا بە کەلوپەل و زانیاریی خۆی، ئیزگەیەکی دروست کرد، لەناو بەغدا کاری دەکرد، کە بووە پێشمەرگەش، ئیزگەیەکی بۆ شۆڕش دروست کرد، کە تا ئاستێکی زۆر هەواڵەکانیان لە ڕێگایەوە بڵاو دەکردەوە.

دواتر کە هاتەوە هەولێر، لەبەر ئەوەی سەرچاوەیەکی بژێوی نەبوو، دوکانێکی چاکردنەوەی رادیۆ و تەلەفزیۆنی دانا، زۆرکەس پێیان دەوت بگەڕێوە بۆ شاخ، لێرە دووچاری کێشەیەك دەبیت.

عەبدولخالق شایستەی ئەوەبوو لە بواری پیشەسازیدا سودی لێ وەربگیرێت. هەندێ لە نوسراو و تێڕوانینە ئایینیەکانی، من لەگەڵیدا نەبووم، بەڵام بەداخەوە، حکومەت زانی کە خەڵك ڕەخنەی لەسەر ئەو بابەتانەی هەیە، کردی بە پاساوێك بۆ کوشتنی. ڕۆژێك لە کۆڵانی خۆیان کوژرا بە فەرمانی حکومەتی عێراقی.



عبدالخالق معروف - مجید شێروانی - خۆم

# سەرەتای ژیانم لە سوپا



شەوی ٧-١٩٥٥/١٠/٨ بە شەمەندەفەری پلەدوو لەسەر بوودجەی سوپا لە بەغداوە چووم بۆ جەلەولا، کاتژمێر دووی شەو گەیشتم، کە دابەزیم لەوێ ئینزباتێکی سەربازی چاوەڕوانی دەکردم، بە ئۆتۆمبێلێکی سەربازی بردمی بۆ یانەی ئەفسەران، نزیکەی کاتژمێر سێی شەو بوو، بردمیان بۆ ژوورێکی پاك و خاوێن، هەموو پێویستیەکانی حەوانەوەی تیابوو.

ئەو شەوە نەخەوتم، بیرم لە ڕۆژەکانی پێشووی ژیانم دەکردەوە، وەکو فلیمێك لە مێشکمدا دەهاتەوە بەرچاوم، لە هەمان کاتدا بیرم لە پاشەڕۆژی ژیانم

دەکردەوە، بەڵام نەم دەزانی پاشەڕۆژی ئەم ژیانە چییە؟

لەو ساتەدا دیم گۆڤارێك لەسەر مێزەکەی تەنیشتم دانرابوو، کە کردمەوە بینیم وتارێکی (ابو علاء المعری) تێدایە، کە فەیلەسوف و شاعیرێکی بەناوبانگە، ناونیشانی نووسراوەکە ئەمەبوو (ما هذا التکالب علی الدنیا؟) واتە: ئەم شەڕەسەگە چییە لەسەر دونیا؟ منیش لەدڵی خۆمدا وتم ئەمە منیش دەگرێتەوە، وازم لە وتنەوەی دەرسی ئایینی هێنا، هاتمە ئەم دونیا تازەیەوە، ئینجا ئەمە بووە هۆی ئەوەی زیاتر خەوەکەم بڕوات و بزرێ.

بۆ بەیانی کە ڕێکەوتی ١٩٥٥/١٠/٨ بوو، ناونووس کرام لە فەوج، ئەو ڕۆژە چووبوونە دەرەوە بۆ مەشقکردن لە دەوروپشتی قەڵای شیروانە لە نزیکی کەلار، بەم جۆرە بۆ یەکەمجار دەرگای ژیانی مەلایەتیم لەسەر خۆم پێوەداو دەرگای ژیانی ئیمامەتی سوپام لەخۆم کردەوە.

یەکەم ڕۆژی ژیانم لە سوپادا بەمجۆرە دەستی پێکرد، بەیانی هات، نوێژم کرد و نانیان بۆ هێنام، لەپاش نان خواردن بە ئوتومبیلێکی سەربازی چووم بۆ قەڵای شیروانە، بۆ یەکەمجار چوومە لای (عەبدولسەلام عارف)، کە ئەوکاتە پلەکەی (مقدم الرکن) بوو، فەرماندەی فەوجی/٣ لیوای/١٩ بوو، زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم، پاش ئەوە خەیمەیەکیان بۆ هەڵدام، بەم شێوەیە چوومە جیهانێکی زۆر جیاوازەوە.

چەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە، هەموو ئەفسەرەکان بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە لە چێشتخانەی ئەفسەرەکان کۆدەبوونەوەو نانیان دەخوارد، هەر ئەفسەرێك کە دەهات (تحیە) سەلامی دەکرد لە ئامیر و کڵاوەکەی بە کەپرەکەوە هەڵدەواسی و بەسەری ڕوتی دادەنیشت و نانی دەخوارد.

منیش لەبەر ئەوەی سەر ڕووت کردنم بەلاوە جوان نەبوو، بە جبەو مێزەرەوە دانیشتم و نانم دەخوارد، (تحیة)شم بۆ ئامیر نەدەکرد.

لەنێوان ئەم ئەفسەرانە، کاك نوری ڕەشید کوڕی شێخ ڕەشیدی عەبابەیلێ بوو، کە بوو بە هاوڕێیەکی دڵسۆز و خۆشەویستم، ماوەی سێ ساڵ بەیەکەوە

ژیاین. عەبدولسەلام عارف پێی وتبوو: ئیمام فێری نانخواردن بکە. ئەویش بەمنی وت: کاتێك هاتیتە ژوورەوە، ئەگەر ئامیر دانیشتبوو وەکو ئەفسەرەکانی تر (تحیة) بکە، جبەو مێزەرەکەت هەڵواسە، ئینجا دابنیشە بۆ نان خواردن.

منیش بەو پێیە تکام لێ کرد هەرچی پەیوەندی هەیە بەژیانی سوپاوە پێم بڵێ، با تووشی هەڵە نەبم.

پاش هەفتەیەك کە هێشتا لە قەڵای شیروانە بووین، شەوێك لە خەومدا دیم لەسەر ئاودەست دانیشتووم، سەرم ڕووتەو مێزەرم بەسەرەوە نییە، کە بەیانی لە خەو هەستام هەر بیرم لەو خەوە دەکردەوە، چونکە خۆم بە تاوانبار دەزانی کە وازم لە تەدریس هێناوە، خۆم لەبەر خۆمەوە مانای خەوەکەم بەم جۆرە لێکدایەوە، کە ئاودەست تەماعی دنیایە، مێزەریش نیشانەی ئایینە، واتە من وازم لە ئایین هێنا بۆ تەماعی دونیا.


شێخ نوری شێخ ڕەشید

جا لەسەر ئەو بیروباوەڕە بڕیارم دا واز لە ئیمامەتی سوپا بێنم و بچمە دێیەکی باش و مەدرەسەیەکی ئایینی پێك بهێنم، لەبەر ئەوە (استقالة)یەکم نووسی بۆ وەزیری بەرگری لەڕێگەی ئامیرفەوجەوە، ڕۆشتم بۆ خێمەکەی عەبدولسەلام کە داواکارییەکەم پێشکەش بکەم. لەڕێگا تووشی کاك شێخ نوری شێخ ڕەشید بووم، کە زانی بەتەمای چیم، بردمی بۆ خێمەکەی خۆی و وتی بۆچی (استقالة) دەکەیت، منیش هۆکەیم بۆ ڕوون کردەوە.

وتی: کاتێك لە سلێمانی بووی چەند کەس لە پشتەوە نوێژی دەکرد؟

وتم: لە نیوەڕۆ و عەسردا جگە لە فەقێکان یەك کەس نوێژی دەکرد کە پێیان ئەوت (توفیق بەگ)، دوکانی دانابوو لە تەنیشت مزگەوتەکەدا، یەکێ بوو لە ئاغاو پیاوماقوڵەکانی شاری بانە، لەکاتی خۆیدا حەوت برا بوون، شەشیان بە دوژمنایەتی کوژرابوون، ئەویش لەترساندا هەڵهاتبوو بۆ سلێمانی، زۆر جار پێی دەوتم: ئەگەر من بمرم کێ نوێژ لە دواتەوە دەکات؟ بەڵام ئێواران نوێژکارەکان ئەبوون بە پەنجا کەس.

کاك نوری وتی: ئەم فەوجە کە تۆ بوویت بە ئیمامی، هەموویان موسڵمانن و ژمارەیان لە -٧٠٠- کەس زیاترە، بۆیە تۆ کراوی بە ئیمامیان، هەرچییەك پێویستی ئایین هەیە فێریان بکەیت، واتە لێرەش ئیشەکەت خزمەتی ئایین و زانیارییە. جگە لەوەش موچەکەت باشە دەتوانی منداڵەکانتی پێ پێ بگەیەنیت.

منیش پەشیمان بوومەوە، موچەم لە سوپا (٤٥) دینار بوو، لەکاتێکدا کە موچەکەم لە ئەوقاف (٩) دینار بوو، کاتێك کە وەرم دەگرت دیسان بیرم لەمە دەکردەوە دەمووت کەی حەڵاڵە؟ کەی ئەوەندە ئیش دەکەم تا حەڵاڵی بکەم. ئەمەش دیسان بوو بە خولیا لەسەرما، شەوو ڕۆژ هەر بیرم بەلای تەدریسەوە بوو، هیچ دڵم نەدەچوو بەلای پارەو پولدا، چونکە خوێندنی ئایینی ڕێگەی نەدابووم لە ژیانمدا کە پوولەکی و پارەپەرست بم.

نامەیەکم نووسیی بۆ حاجی قادری جبار لە سلێمانی کە یەکێك بوو لە خۆشەویست و دڵسۆزەکانم، داوام لێکرد بە عبداللە لوتفی بڵێت بمکات بە مەلاو مودەڕیسی ئەو مزگەوتەی دروستی دەکات لە سلێمانی مانگی بە -٢٥- دینار، لێرە موچەکەم -٤٥- دینارە، واز لە -٢٠- دیناری دێنم بۆ خوا، وەڵامی نامەکەی دامەوە وتی: -١٥- دینار دەدات بە مووچە.

جارێکی تر نامەم بۆ نووسیەوە، وتم بە -٢٠- دینار هەر ڕازیم، وەڵامی دامەوە وتی: هەر -١٥- دینار دەدات. منیش وازم لێ هێنا.



شێخ نوری شێخ ڕەشید

## کورتەیەک لەژیانی
## شێخ نوری شێخ ڕەشید عەبابەیلێی

ساڵی ۱۹۲۷ لەگوندی عەبابەیلێ هاتۆتە دنیاوە، خوێندنی سەرەتای لەساڵی ۱۹۳۸ هەڵەبجە و ناوەندی لە سلێمانی لەساڵی ۱۹٤۳ تەواوکردوە، لە ساڵی ۱۹٤۸ ئامادەیی سەربازی لە بەغدا تەواوکردوە، کەسایەتیەکی پێشکەوتنخواز و یەکێک بووە لە ڕێکخراوی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان کە هەستان بە بەرپاکردنی شۆڕشی ١٤ی تەموز، ساڵی ۱۹٤۸ بە ئەفسەری چوەتە فەلەستین، ساڵی

١٩٥٥ لەفەوجی سێی لیوای بیست کراوەتە بەڕێوەبەری ئیدارەی فەوج کەئەو فەوجە بوو منی تێدابوو، ساڵی ١٩٥٦چووە بۆ ئوردن. لە ساڵی ١٩٦٨ کراوە بە بەڕێوەبەری گشتی کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار، لە ساڵی ١٩٧٤ کراوە بە پارێزگاری سلێمانی لەسەر داوای خۆی وازی هێناوە، لە ساڵی ١٩٧٤ بوەتە ئەمینداری گشتی دارایی و ئابووری لە هەولێر، لەساڵی ١٩٧٦ خانەنشین کراوە، لە رۆژی ١٩٩٩/٦/٢٧ کۆچی دوایی کردووە، خوای گەورە بە بەهەشتی شاد بکات.

## من و مەلای جەلەولا



خۆم و فەقێکانم لە جەلەولا - ١٩٥٦

حاجی ڕەحیم خۆی و کوڕەکانی سەروکاری ڕێگای ئاسنینی شەمەندەفەری دەکرد، کە لەنێوان جەلەولا و بەغدا بوو، پیاوێکی زۆر باش بوو، کوردێکی زۆر پاك بوو، وتم: کاك حاجی من موچەکەم مانگی -٤٥- دینارە، مانگی -١٠- دیناری لە دەمی منداڵەکانم دەگێڕمەوە، دەیدەم بە دوو فەقێ بۆ ژیانیان، بۆ ئەوەی دەرسیان پێ بڵێم، بۆ ئەوەی دوور نەکەومەوە لەو ڕەوشتەی کە لەمەوپێش لەسەری بووم، تۆش بۆ خوا ژوورێکیان بۆ پەیدا بکە کە تیایدا بژین، تا منیش دوای دەوام ئێواران وانەیان پێ بڵێمەوە، ئەم ئیشە خزمەتی ئایین و کوردی تێدایە، خواش پاداشتی هەردوولامان دەداتەوە.

کاکەحاجی ژوورەکەی پەیداکرد و منیش دوو فەقێکەم پەیداکرد، بەڵام هێشتا دەستم بە ئیشەکە نەکردبوو، هەواڵەکە گەیشتە لای مەلای مزگەوتەکەی جەلەولا، (حاجی مەلا شێخ تاهیر بەرزنجی).

ئەم مەلایە پیاوێکی زۆر چاك بوو، کاتێك هاتینە جەلەولا دەعوەتی کردین و زۆری سوپاس دەکەم، بەڵام نازانم بۆچی مەلا لەناو خۆیاندا زۆر ناکۆکن لەجیاتی ئەوەی کۆمەکی یەکتری بکەن خەریکی پاشقل گرتن لە یەکترن، هەریەك وادەزانێت کە ئەوی تر زیان بە مافی دەگەیەنێت، ئەم ڕەوشتە شتێکی زۆر ناشیرینە بۆ پیاوانی ئایینی، چونکە هەرکەسێك بەڕاستی موسڵمان بێ، دەبێ فڕوفێڵ لەژێر جبەو مێزەرەکەیدا نەبێت، وەکو ئاڵتونی پاڵفتەکراو وابێت. بەڵام بەداخەوە زۆر کەسم دی لەژیانمدا وتەی جۆرێك بوو و کردەوەی جۆرێکی تر بوو.

ڕۆژێك چووم بۆ مزگەوت بۆ نوێژی عەسر، مەلا شێخ تاهیر پێی وتم: لەپاش نوێژ مەچۆرە دەرەوە ئیشم پێتە. جا لەپاشا پێی وتم: بیستومە فەقێت ڕاگرتوە و دەرسیان پێ دەڵێیت؟

وتم: بۆ ئەمە شتێکی خراپە؟ ئەگەر بەکاری دنیایی دەزانیت من زەکات و سەرفیترەی دێیەکەت لێ داگیر ناکەم، چونکە من لە سلێمانی مووچەکەم (٩) دینار بوو، لەگەڵ ئەوەش سەرفیترەو ئیسقات و خێر و خێراتی کەسم وەرنەگرتووە، ئێستا لێرە من کە ئیمامم مووچەکەم (٤٥) دینارە، مووچەی ئەفسەرێکی سوپایە، زۆری زیادە، لەبەر ئەوە زیادەکەی دەدەم بە فەقێ بۆ خزمەتی ئایین، ئەگەر ئەمە بە خزمەتی خوایی ئەزانی، دەبێت یارمەتیم بدەیت بۆ ئەوەی هەردووکمان هاوبەشی بکەین لە خزمەتی زانایی و ئایینی دا.

لە پاشان وتی: من ئەم قسانە ناچێ بە گوێمدا، من بیستومە تۆ لە سلێمانی لەسەر سیاسەت دەرکراویت، من ماموستایەکم هەیە لە خانەقین، دەتوانێ بە (جر القلم)ێ متصرف فەسڵ بکات، ئەگەر واز لەم بیروباوەڕە نەهێنیت تووشی نان بڕاویت دەکەم.

وتم: مەلا، نان خودا دەیدات، بەندە ناتوانێت بیبڕێت، خۆت و ئەو مامۆستایانەی پێی دەنازیت لەلای من هیچ بایەختان نیە، من خوا دەزانێ لەسەر چی سلێمانیم بەجێ هێشت، مەلا هەر مەلایە، هەر مەلا بوو کە لە سلێمانیش نەیهێشت تەدریس بکەم، بەڵام بزانە ئەو فەقێیەی کە من دەرسی پێ دەڵێم، دەبێت بە مەلایەکی وەکو جەنابت، لەبەر ئەوە تا ماوم دەرس بە فەقێ ناڵێمەوە.

# تەنگ و چەڵەمەی صدیق مستەفا

گیروگرفتی مەلای جەلەولا تەواو نەبوو، تا صدیق مستەفا، کە ئەوکاتە لە سوپادا مقدم بوو، یاریدەدەری عەبدولسەلام عارف بوو، تەنگ و چەڵەمەیەکی تری بۆ دروست کردم، ئەمەش بەم شێوەیە بوو.

لە سلێمانیەوە هاتین خانوویەکی دار وگڵمان بەکرێ گرت، ئەسعەدی کوڕم لەوێ لەدایك بوو، جێگەکەمان زۆر•ناخۆش بوو، ئاومان نەبوو، دەبوایە بە تەنەکە ئاومان بۆ بهێنایە، کارەبامان نەبوو.

لەو کاتەدا خانووی زۆر باشیان دروست کردبوو لەسەر ئاوی سیروان (دیالی) بۆ ئەفسەرەکان، ئەوکاتە هەر ئەفسەرێك چوار دیناری وەردەگرت بۆ کرێی خانوو، ئەگەر خانوویان بدابایەتێ، چوار دینارەکەیان لە مووچەکەی دەبڕی.

ئەو خانوانەی کرابوون هەمووی بە تەنیشت یەکەوە بوون، بەڵام چواریان بەتەنها دروست کرابوون بۆ ئامر و ئامر فەوج.

وتم بە عەبدولسەلام عارف: جێگەکەمان زۆر خراپە.

وتی: لەسەر مەسئولیەتی من بچۆرە یەکێك لەو چوار خانووەوە.

وتم: هێشتا کارەبای نیە.

وتی: بچۆرە ناوی با لەکیست نەچێت، کارەبا لە دراوسێکەت وەربگرە.

منیش کە گواستمەوە زۆر نایاب بوو، گەورە بوو، هەر چوارلای باخ بوو.

پاشان صدیق مستەفا لە هەموو خانووەکان خانووی بەرنەکەوت، چونکە لە خانوویەکی کۆنی سوپادا بوو، هەرکەس لە خانووی میریدا بوایە، خانووی تریان نەدەدایە.

ئینجا صدیق مستەفا منی بە گێلەپیاو زانی و وتی دەبێت بێیتە خانوەکەی من و من بچمە خانوەکەی تۆوە، چونکە تۆ ئیمامی و من یاریدەدەری (معاون) ئامرفەوجم.

وتم: من ئیمامم و ئەفسەرم، لە یاسای سوپادا هیچ جیاوازییەك نیە لەنێوان ئەفسەرێك و وەزیری بەرگریدا. (ئەوکاتە نوری سەعید بوو، جگە لەوەی سەرەك وەزیران بوو)، وتم: ئەو چوار دینار وەردەگرێ بۆ خانوو، منیش هەر ئەو چوار دینارە وەردەگرم. وتی: ئاخر ئەو خانووە بۆ ئامرەکان کراوە.

وتم: تۆ یاریدەدەریت، هەرکاتێك بوویت بە ئامر، بۆت چۆڵ دەکەم.

چوو شکاتی لێ کردم لای ئامر لیوا، کە (نازم تەبەقچلی) بوو، ناردی بە دوامدا، ئەوەی وتبووم بە صدیق مستەفا بەویشم وت، وتی: لەبەر دڵی من بگوێزەرەوە خانوەکەی ئەو، با تووشی تەنگ و چەڵەمە نەبیت. وتم: من ڕاهاتووم بە تەنگ و چەڵەمەو هیچ ناترسم. وتم: لە سوپا دەچمە دەرەوە بەڵام لەو خانووە ناچمە دەرەوە.

بینیان گێلەپیاو نیم، شتەکەیان کرد بە ڕەسمی، منیش دەمزانی ئەمە شتێکی ناڕەوایە، نامەیەکم نووسی بۆ قائد فرقە، خوا لێخۆشبوو (نجیب رەبیعی)، کە لەپاش شۆڕشی چواردەی تەمووز ١٩٥٨ بوو بە سەرۆکی ئەنجومەنی سیادەی عێراق، ئەویش تەلەفۆنی بۆ (نازم تەبەقچلی) کرد کە وازم لێ بهێنێ و لە خانووەکەدا بمێنمەوە.

صدیق مستەفا کە زانی دەستی لە بن هەمانەکەوە دەرچووە، هات خۆی کرد بە برادەرم، ڕۆژێك پرسیارێکی کرد و وتی: بۆچی پێغەمبەرەکان زۆریان لەناو عەرەبدا بوون؟

وتم: چونکە جێگەکەی لە ناوەڕاستی سێ پارچەی تردایە، لەبەر ئەوەی بەو شێوەیە ئەو پێغەمبەرانەو دینەکەیان بڵاوبێتەوەو روناکی ئاینەکان لە دورگەی عەرەب کە ناوەڕاستی جیهانە بەم لاو بەولادا بڵاو بێتەوە.

وتی: نا وا نیە، چونکە خوا فەرموویەتی ئەگەر عەرەبم بۆ چاك بکرێت هەموو گەلەکانی تر چاك کردنیان ئاسانە.

بەڕاستی ئەم وەڵامەی زۆر ڕاست و جوان بەسەر خۆیدا چەسپا، چونکە خۆی کە لە ١٩٦٣ بوو بە ئامرلیوا لە سلێمانی، لە دێی سیارە لەسەر ڕێگەی (دەربەندیخان - سلێمانی) ١٨ کەسی گوللەباران کرد، پەیوەندییان نەبوو بەو پێشمەرگانەوە، کە لەوەوپێش هێرشیان کردبووە سەر سوپا، هەروەها دواتر کە چووە سلێمانی، (منع التجول)ی کرد، سەدان کەسی زیندان کرد و دوایی زیندەبەچاڵی کردن.

ئەمە ئەو پیاوە موسڵمانە عەرەبە بوو کە بە ئیسلام چاك نەکرا.

## تاقیکردنەوەی سێی ناوەندی

لەپاش ئەوەی دەست بەردار بووم لە هەموو شتێك و هەموو شوێنێك، نەمتوانی هەندێ لە کاتی خۆم بەخت بکەم لەڕێی دەرس وتنەوەدا، زانیم کە ناتوانم ببم بە مامۆستا، بڕیارم دا ببم بە قوتابی، چووم بۆ لای بەڕێوەبەری قوتابخانەیەك، وتم: من بڕوانامەی شەشی سەرەتاییم هەیە، دەمەوێت تاقی کردنەوەیەکی دەرەکی سێی ناوەندی بدەم، وتی: باشە، بەڵام ئێمە تاقیکردنەوەی یەکەمی ناوەندی و دووەمی ناوەندی دەکەین، ئەگەر لەو تاقی کردنەوانەدا سەرکەوتوو بوویت، ناوەکەت دەنێرین بۆ خانەقین بۆ ئەوەی لە تاقیکردنەوەی وەزاری بەشداری بکەیت.

منیش کتێبی ئەو دوو پۆلەم پەیداکرد و خۆم ئامادەکرد بۆ ئەو تاقی کردنەوەیە، هەر ڕۆژەی دەچووم لە ژووری بەڕێوەبەردا تاقی کردنەوەی وانەیەکم دەدا، ڕۆژێك دەرسەکەم مێژوو بوو، پرسیارەکە ئەمەبوو: (ماهی اسباب الفتوحات الإسلامیە؟)، مامۆستایەکی مێژوو لە تەنیشتمدا دانیشتبوو ناوی (ضیاء) بوو، سوخرمەیەکی لێ دام وتی: (گول جوع جوع)، واتە: (برسێتی پاڵی نا بە عەرەبەوە کە شەڕ بکەن و ئەو وڵاتانەی کە ئێستا تیایدان داگیری بکەن).

دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز دەرکەوت ئەم مامۆستایە بیروباوەڕی کۆمەنیستی بوو، هەموو جارێك پێش کۆمەنیستەکان دەکەوت و دەیوت: (الحزب الشیوعي یرید الإستیلاء علی الحکم).

ئەو ڕۆژەی تاقیکردنەوەی بیرکاریم هەبوو، باوکم و هەندێ لە خزمانی ترم هاتبوون بۆ جەلەولا، لەبەر من لەڕێگەی ئەوێوە دەچوون بۆ حەج، شەو دوای

نانخواردن بەجێم هێشتن لە ژووری میوان، چوومە ژووری نووستن بۆ خوێندن، یەکێك لە خزمەکان، کە خوالێخۆشبوو (حاجی حەمەجان) بوو، هات و بە توڕەیی وتی: ئێمە بۆ لای کێ هاتووین؟ منیش وتم: بەیانی تاقیکردنەوەم هەیە، ئەگەر لای ئێوە دانیشم ناتوانم وەڵام بدەمەوە، تاقیکردنەوەکەم لەکیس دەچێت، بەڵام ئێوەم لەکیس ناچێت. وتی: ئەگەر مردین و نەهاتینەوە؟ وتم: لەجێگایەکی پیرۆز دەمرن، خوا لێتان خۆش دەبێت. هەر لە ژوورەکەی خۆم مامەوە، نەچوومە لایان.

دوای تەواوبوونی تاقی کردنەوەکان، چووم بۆ خانەقین کە تاقیکردنەوەی سێی ناوەندی لەوێ بوو، ئۆتۆمبیلەکە لەڕێ پەنچەر بوو، دواکەوتین، کاتێك گەیشتم لە قوتابخانە دەبینم قوتابیەکان (٢٠) خولەکە چوونەتە ژوورەوە، لەبەر ئەوە ڕێگەیان نەدا بچمە ژوورەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی جبەو مێزەرم بەسەرەوە بوو، بەڕێوەبەری قوتابخانەکە ڕێزی گرتم و وتی: لەسەر مەسئولیەتی من بچۆرە ژوورەوە.

ئەو رۆژەی تاقیکردنەوەی ئینگلیزیم هەبوو، خوالێخۆشبوو (مامە عبدالرحمن)م هاتبوو، ئەگەر بەجێم بهێشتایە بۆ خوێندن عاجز دەبوو، ئەگەر بەجێم نەهێشتایە، هێشتا کتێبەکەم تەواو نەکردبوو، لەبەر ئەوە بڕیارم دا ئەوەی دەیخوێنمەوە بۆی بکەم بە هەورامی. گەیشتمە سەر چیرۆکی ئەو پیاوەی گرەوی کرد کە بە (٨٠) رۆژ بە دەوری زەویدا بسوڕێتەوەو تووشی ناخۆشی بوو تا ڕزگاری بوو و گەیشتەوە شوێنی خۆی. کاتێك لە قسەکەم لێبوومەوە، مامم وتی: (ئاپیایە نما کەرێ؟) واتە: ئەم پیاوە نوێژی دەکرد؟ ئەم پرسیارەی بۆیە کرد، چونکە هەر نوێژ لە مێشکیدا هەبوو.

پاش ئەوەی پۆلی سێی ناوەندیم بڕی، لەگەڵ چەند برادەرێك پۆلی چوارمان لە پەروەردەی بەعقوبە تەواوکرد.

# تەسوییەی باخەکانی زەڵم

بەهاری ١٩٥٦ بۆ یەکەمجار لەلایەن میرییەوە بڕیاردرا کە باخەکانی زەڵم تەسوییە بکرێن و بکرێ بەناوی خاوەنەکانیان، بۆ ئەوە هەر کەسێك باخ و زەوی خۆی لەسەر خۆی ساغ بکرێتەوەو لە تۆمارگەی میریدا بەناوی ئەو تۆمار بکرێت، بەجۆرێکی وەها کەس نەتوانێ گێچەڵ بە یەکێکی تر بکات.

ئەمە هەر لەسەردەمی عوسمانیەکانەوە هەبووە کە (وەرەقەی قاقانی) دەدرا، لەپاشا ناونرا (تاپۆی ڕەش)، ئێستا پێی دەوترێت (سند التسجیل العقاري)، ماددەی (٥٠٨) لە یاسای مەدەنی عێراقیدا دەڵێت: (کڕین و فرۆشتنی هەموو



باخەکانی زەڵم

زەوی و ئاو و باخ و خانوویەك ئەگەر لە دائیرەی تاپۆ تۆمار نەکرێت بەتاڵە)، لە بەندی (٣)ی قانوونی تەسجیل عەقاری دەڵێت: (هەموو تەصەروفێکی عەقاری جگە لە وەسییەت ئەگەر لە دائیرەی تەسجیل عەقاری تۆمار نەکرێت، بەتاڵە). لە قانوونی تەسوییەدا دەڵێت: (هەر زەوییەکی میری (١٠) ساڵ بەدەستی هەر کەسێکەوە بێت، لە هەر دۆنمێك (٤٠) درەختی تیا بنێژێت، بە ناوی ئەوەوە تەسوییەو تاپۆ دەکرێت).

لەپێش هەموو قانوونێکدا پێغەمبەری مەزن ((صلی الله علیه وسلم)) فەرموویەتی: (من احیا أرضـا میتة فهي له)،لە شێوەیەکی تردا (فهو أحق بها)، واتە: هەرکەسێك زەوییەك ئاوەدان بکاتەوەو موڵکی یەکێکی تر نەبێت، بۆ خۆیەتی.

من ئەوکاتە لە جەلەولا ئیمام بووم، پێیان وتم کە بچم بۆ زەڵم، پارچە باخەکەی خۆم بەناوی (پێشاو)ە هیی وەرەسە نیەو بەپارەی خۆم کڕیبووم، بڕۆم بۆ ئەوەی تەسوییەی بکەم.

منیش نەمزانی وەرەسەی شێخ حسام الدین خزمەکانم تووشی چ گێچەڵێکم دەکەن بەهۆی تەسوییەی باخ و زەوییەکانی زەڵمەوە.

چووم بۆ خانەقین لای پارێزەر کاك عبدالوهاب باجەلانی، کتێبێکی قانوونی تەسوییەم وەرگرت و چووم بۆ زەڵم.

ڕۆژی یەکەم کە موعاونی تەسوییەی هەڵەبجە هات بۆ زەڵم، هەندێ لە وەرەسەکانی شێخ حسام الدینی لەگەڵ بوون، یەکێك لەوانە شێخ کەریمی کوڕی شێخ حسام الدین بوو، لەگەڵ نزیکەی (٢٠) کەس لە سۆفییە ڕیش درێژەکانی دێی خۆمان و هانەی قوڵ و هێلان پێ و دێهاتە نزیکەکانی دێی زەڵم، کۆیان کردبونەوە بۆ ئەوەی شایەتی بدەن کە ئێمە باخەوانی شێخ بووین، گەلایەك لەم باخانە موڵکی ئێمە نەبوون، شێخەکان خۆیان ئامادەکردبوو کە زەوی و زار و باخەکان لەسەر ئەوان تەسوییە بکرێت.

خزمەکانی بەرەی باوکم کە زیاتر لە (٧٠) ماڵ بوون، کە باپیرە گەورەمان لە پێش (٢٥٠) ساڵ هاتووە ئەم دۆڵە چۆڵ و هۆڵە پڕ لە شەخەڵ و دڕندەی ئاوەدان کردۆتەوەو بەردی بناغەی ژەڵمی داناوە لە کاتێکدا کەسی تیانەبووەو، شێخ حسام الدین هێشتا لەدایك نەبووە، بڕیاریان دابوو دەریان بکەن، لەگەڵ موعاونی تەسوییەدا ڕێکەوتبوون بە جۆرێك کە دەتوت برابەشی باوکیانە.

کاتێك لە گۆشەی پرد کۆبووینەوە، خزمەکانیشم هەموو حازر بوون، بۆ یەکەمجار (گۆشەی پرد) خوێندرایەوە، موعاونی تەسوییە وتی: هی کێیە؟ سۆفییە ڕیش درێژەکان سوێندیان خوارد بە قورئان وتیان هی شێخ حسام الدین و هەوارگەی ئەوە، ئەوەش جێ نزرگاکەیەتی، کە دارێکی درێژیان تێدا چەقاندبوو و پەڕۆیەکی سپییان پیاکردبوو، پێیان دەوت ئاڵا، کە لە کوردستاندا ئەمە نیشانەی پیرۆزیی ئەو جێگایە بوو، موعاونی تەسوییە نووسیی لەسەر شێخ حسام الدین، خزمەکانم هەرچی هاواریان کرد سوودی نەبوو.

لەپاشان ژمارە (٢) (باخی خواکەرەم)ی خوێندەوە، کە باخی خانەقای شێخ بوو، ئەویشی لەسەر شێخ نووسی.

کە ژمارە (٣) خوێندرایەوە کە پێی دەوترا (گۆشەی دۆڵێن)، لەپێش ئەوە کە بڵێ ئەمە موڵکی کێیە، دەستم گرت، وتم: تۆ هاتوویت بە یاساو شەریعەتی ئیسلام بجوڵێیتەوە، یان هاوبەشی شێخەکانی و هاتووی ستەم لەم هەژار و فەقیرانە بکەیت؟

وتم: لەم سۆفییە ڕیش درێژانە بپرسە چەند ساڵ ئەم موڵکە بەدەست ئێمەوەیە؟

کە ئەم پرسیارەم کرد لێیان، وتیان: نەك خۆمان، باوکیشمان نازانێ لەکەیەوە باپیری ئەمانە لێرە بووە.

وتم: لێیان بپرسە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دیویانە یا بیستویانە شێخ حسام الدین خۆی یا وەرەسەکەی پاچێك یان بێڵێك یان درهەمێکیان بە ئێمە دابێت؟ ئەم باخانەمان لە نەبوون دروست کردوە، ئەم شاخ و بەردەمان وەرگێڕاوە بە باخ و بەکۆڵ خاکمان بردووە، کردومانەتە ناودڕنی شاخەکان و درەختمان تیا ناشتووە؟

هەموویان وتیان: نەخێر نەمان بیستووە.

ئینجا پێم وت: جەنابی موعاون تۆ بە قانوون حوکم دەکەیت یان بە شەریعەتی ئیسلام؟ ئەگەر بەقانوون لەگەڵمان دەیکەیت ئەمە قانوونی تەسوییەیە، قانوونەکەم بۆ کردەوەو لەبەردەمیا دامنا، ئەو مادەیەم بۆ خوێندەوە کە دەڵێت: (هەرکەسێك دە ساڵ یان زیاتر تەصەروفی کرد لە زەوییەکی میریدا، لە هەر دۆنمێك چل درەختی یا زیاتری ناشت، لەسەر ئەو کەسە تاپۆ دەکرێت). ئەگەر بە شەریعەتی ئیسلام حوکم دەکەیت، پێغەمبەری خوا دەفەرموێ:

(من أحيا أرضـــا ميتة فهي له أو فهو أحق بها).

معاون و شێخەکان زانییان کە هەموو ڕێگەیەکی گەڕ و فێڵم لێ بڕین، موعاونەکە خەڵکی هەڵەبجە بوو، موعاونی تەسوییەی ئەو شوێنانە بوو کە سەر بە قەزای هەڵەبجەن، ویستی بمترسێنێ، وتی: مەلا قسەی زیادە مەکە، بە پۆلیسێکدا ئەتنێرمەوە بۆ جەلەولا.

وتم: ببورە من مەلا نیم، من ئیمامی سوپام و بەیاسا ئەفسەرم، هیچ کەس ناتوانێ کردەوەیەك لەدژی ئەفسەر بکات بە ڕەزامەندی وەزیری بەرگری نەبێت.

ئینجا پاش ئەوە موعاون ئەفەندی هیچی پێ نەما، خۆی و شێخەکان وتیان هەستە بابڕۆین، لەگەڵ سۆفییەکان ڕۆشتن ڕێگەیەکی تر بدۆزنەوە بۆ کارەکەیان.

## من و تۆمەتی کۆمۆنیستی

لەسەردەمی عەبباسیەکاندا هەرکەس رەخنەی لە خەلیفە بگرتایە کە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر هەڵناسێت و وەکو پاشای فارسەکان یان ئیمبراتۆری رۆمان دەژی، دەیان وت ئەمە (زەندیق)ەو کوشتنی واجبە، بۆ ئەوەی ببێت بە عیبرەت بۆ یەکێکی تر.

لە زەمانی شێخەکانی کوردستاندا، ئەگەر یەکێك رەخنەی لە شێخێك بگرتایەو بیوتایە شێخێتی تەرکی دنیایەو ئەم هەموو خۆشگوزەرانییە چییە کە شێخی تیایە، هەرچی ژنی جوانە شێخ و کورەکانی مارەیان دەکەن، هەرچی جلی جوانە ئەوان لەبەری دەکەن، هەرچی خواردنی باشە ئەوان دەیخۆن، هەرچی کۆشکی جوانە ئەوان ژیانی خۆیانی تیا بەسەر دەبەن، بە هەزاران دواکەوتوو و نەزان ژێر پێیان ماچ دەکەن تا رۆژی قیامەت شەفاعەتیان بۆ بکەن.

ئەگەر یەکێك ئەم جۆرە شتانەی بوتایە بە تایبەتی ئەگەر مەلا بوایە، وەکو خوالێخۆشبوو مامۆستا سید عارف، کە ئیمان و باوەری سەدقاتی ئیمانی شێخ پتەو بوو، پێیان ئەوت (منکر)، کورە شێخەکان لە کوردستاندا بەناوی منکرەوە زۆر کەسیان ون کرد.

لە چلەکانەوە شتێکی تر باوبوو لە عێراقدا، هەرکەسێ داوای مافی خۆی بکردایە، یا هاواری بکردایە لەدەست ستەمکارێك، یا بیوتایە ئەم دەوڵەمەندیەو ئەم هەموو سامانەی چۆن پێکەوە نا، کە هەژارە دراوسێیەکەی ناتوانێ تێری سکی نان بخوات، پێیان دەووت کۆمۆنیست (شیوعی).

ئینجا لێرە جێگەی خۆی بوو کە پێیان وتم: مستەفا زەڵمی کۆمۆنیستە.

موعاونی تەسوییەو شێخەکان، لەپاش ئەوە کە زەڵمیان بەجێهێشت، دەچنە لای بەڕێوەبەری ناحیەی خورماڵ (کاك جەمال بابان)، قائیمقامی هەڵەبجە (خالید نەقشبەندی)، لای متصرفی سلێمانی (عمر علی)، بە هەموویان دەڵێن ئیمامێکی سوپا (مستەفا زەڵمی) شیوعیەو لە جەلەولاوە هاتووە لە ناوچەی خورماڵدا ئاگرێکی ناوەتەوە، هەرچی جووتیار و باخەوانە هانی داون لەدژی خاوەن موڵکەکان، لەبەر ئەوە نەمانتوانی ئیشی تەسوییەکە تەواو بکەین.

پێش گەڕانەوەم بۆ جەلەولا پێیان ڕاگەیاندم کە بەڕێوەبەری ناحیەی خورماڵ داوات دەکات، منیش چووم بۆ خورماڵ سەرێکم لە مامم (خەزوورم) دا، لەپاشان چووم بۆ لای مدیر ناحییە، یەکەمجار ڕێزی گرتم، چونکە بەجبەو مێزەرەوە بووم، لەپاشا کە وتم فلان کەسم چاوی سوور بوو، هەستایە سەرپێ و بە هەردوو دەستی دەیدا بەسەر مێزەکەیداو تەماشای منی دەکرد، سەری بەرز دەکردەوە بۆ وێنەکەی مەلیك، واتە من بە یاساو یەکسانی کار دەکەم، دەیوت: بۆ بوویت بە ئاژاوەچی ئەم ناوچەیە و کێشەت دروست کردووە لەنێوان شێخەکان و باخەوانەکان؟

وتم: دەنگ بەرز مەکەرەوە بەسەرما، چیت لەمن دەوێ؟

وتی: بچۆ بۆ هەڵەبجە قائیمقام داوات دەکات.

لەپاشاندا یەکسەر لە ژوورەکەی چومە دەرەوەو چوومەوە بۆ زەڵم.

شایانی باسە کاك جەمال بابان لەرووی بێ ئاگاییەوە ئەم کردەوەیەی لەگەڵ من نواند، چونکە یەکەم منی نەدەناسی، دووەم ئاگای لە ستەم و فرۆفێڵی شێخەکان نەبوو، بنچینەی ئیشەکەیان بە پێچەوانەوە بۆ ڕون کردبوەوە، ئەگەرنا کاك جەمال بابان لەوانەبوو بەگوێرەی یاسا هەڵسوکەوت بکات، ئێستا جگە لە زانستی یاسا، نووسەرێك و ئەدیبێکی کوردە، بە دڵسۆزی لەبابەت مێژووی کورد و کوردستانەوە دەنووسێت، تەنگ و چەڵەمەی کوردایەتی دەخاتە بەرچاوی ڕۆڵەکانی کورد. ئێستە من زۆرم خۆش دەوێت، لەبەر ئەم هەڵوێستانەی کە

ئێستا دەینوێنێت لە بوارەکانی ڕامیاری و مێژوویی و یاساییدا، هیچم لەدڵدا نەماوە بۆ ئەو هەڵوێستە ناشایستەی کە نواندی بەرامبەرم لەو ڕۆژەدا.

ڕۆژی دوایی کە گەڕامەوە بۆ جەلەولا، بەرێگای هەڵەبجەدا، کاتێك گەیشتمە هەڵەبجە، وام بەباش زانی سەردانی (خالد نقشبندی) بکەم، لەپێش ئەوەی بچمە ژوورەوە فەڕاشەکەی پێی وت یەکێك هاتووە بۆ لای ناوی فلانە، کاتێك چوومە ژوورەوە، لەبەردەمی مێزەکەی وەستام، دەستم برد تەوقەی لەگەڵ بکەم، دەستی کێشایە دواوە، وتی: من لەگەڵ مەلای موشاغیب تەوقە ناکەم، بچۆ بۆ سلێمانی، (عمر عەلی) داوات دەکات، منیش وتم: پاشەڕۆژ بۆت دەردەخات موشاغیب کێیە.

لەپاش ئەم بینینەی خالید نەقشبەندی و وتی (عمر عەلی) داوات دەکات، وتم: ئیجازەکەم تەواو بووە، لەرێگەی دەربەندیخانەوە دەگەڕێمەوە جەلەولا، با ئەویش چی لەدەست دێ با لەدژی من درێغی نەکات.

# ئەنجامی
## کردەوەکەی عمر عەلی لەدژم


عمر عەلی

عومەر عەلی کرابوو بە متصرفی سلێمانی، لەبەر ئەوەی بەکەسێکی شایستە دانرابوو بۆ سەرکوتکردنی خۆپیشاندانی کۆمۆنیستەکان و ئازادیخوازەکان و کەسە هەڵگەڕاوەکانی وەکو خولەپیزە، سەربازێکی چاونەترس و وریاو ئازا بوو، ئەو کارەیان دابوویە بۆ لەناوبردنی شیوعی، بەڵام لەبەر ئەوەی کە پیاوێکی ئازاو تێگەیشتوو بوو، هیچ کردەوەیەکی لەدژی دانیشتوانی سلێمانی نەکرد، تا لە ڕەوشی ناو شار تێگەیشت بە پرسیار لەم و لەو، لەبەر ئەوە بە کاربەدەستانی بەغدای وتبوو: دەسەڵاتم بدەنێ بۆ کەمکردنەوەی هەژاری و بەتاڵی.

ئەو ئیشانەی کە کردی لەم بابەتەوە: پەیمانگەیەکی پیشەسازی دروست کرد کە ئەو قوتابیانە خوێندنی ئامادەییان تەواو نەکردبوو وازیان لە خوێندن هێنابوو، بۆ ئەوەی دوای خوێندن ئیش بکەن و نانێك پەیدا بکەن، یەکێك لەوانە کاك (حەمەعەلی چرۆستانی) بوو لە ئەڵمانیا ماجستێری تەواوکرد، ئێستا سەرۆکی ئەندازیارەکانی ئەمانەتی پایتەختی بەغدایە، هەروەها چەند پرۆژەیەکی پێکهێنا بۆ نەهێشتنی بێکاری. مەلاکانی دابەش کرد بەسەر قوتابخانەکاندا بۆ ئەوەی

دەرسی ئایین و عەرەبی بڵێنەوە، بەرامبەر بە مووچەیەك كە مەلاكان سودیان لێ وەرگرت.

ئەوەمان لەبیر نەچێت، ئەم چاكسازییەی (عمر عەلی) پێی هەستا لە شاری سلێمانی، بەشێك بوو لە پرۆژەی ئاوەدانكردنەوەی باكوری عێراق كە پێشنیازی خوالێخۆشبوو (سەعید قەزاز) وەزیری ناوخۆ بوو، دەستێكی باڵای هەبوو لە یارمەتی دانی (عومەر عەلی) بۆ پێشكەوتنی شاری سلێمانی، لەگەڵ ئەوەش لەپاش (١٤)ی تەمموزی ١٩٥٨هەندێك لە دانیشتوانی سلێمانی هاتبوونە (مەحكەمەی (شعب)ی مەهداوی، كاتێ مەحكەمەی سەعید قەزازیان كرد، داوای لەسێدارەدانی سەعید قەزاریان دەكرد. لەكاتێكدا دەبوو داوای بەرەڵاكردنی بۆ بكرێ، چونكە كەسایەتییەكی دیار و دڵسۆزی میللەتەكەی خۆی بوو.

سەعید قەزاز یەكێك بوو لەو كوردانەی ئەگەر كورد نرخی پیاوی دڵسۆزی خۆی بزانیایە، دەبوایە لە هەموو فولكەیەك لە شارەكاندا پەیكەرێكی بۆ بكەن.

سەعید قەزاز، كە بردیانە سەر قەنارەكەی، دوا وشەی پیاوانەی ئەوەبوو وتی: (اصعد على هذه المشنقة وأرى رؤوسا تحت أقدامي لا يستحقون الحياة)، واتە: من كە هاتمە سەر ئەم قەنارەیە، چەند كەسێك دەبینم لەژێر پێمدا، كە شایەنی ژیان نین، كە ئەو كاربەدەستانە بوون كە ئامادەی لەسێدارەدرانی بوون.


سەعید قەزاز

عومەر عەلی لەگەڵ ئەم تێگەیشتن و كردەوە باشانەی، شێخەكان و موعاونی تەسوییە خستبویانە مێشكییەوە كە من كۆمۆنیستم، باخەوانەكانی شێخم كردووە بە دژیان و نایەڵم باخەكان تەسوییە بكەن. بەو پێیە (استخباراتی عەسكەری) لە بەغدا ئاگادار كرابوو و ناونیشانی

منیان پێدرابوو، ئینجا بەو هۆیەوە لە بەغداوە داوایان کرد لە ئامر لیوای ١٩ (عەبدولکەریم قاسم)، کە داوا بکات لە ئامر فەوجی سێ (عەبدولسەلام عارف)، بەدرێژی راپۆرتێك لەسەر چۆنیەتی منیان بۆ بنوسێت و چاودێری بخەنە سەرم لەکاتی دەوام و دوای دەوامدا.

لەپاش دوو هەفتە بەسەر گەڕانەوەم بۆ جەلەولا، فازڵ محەمەد عەلی، کە بریکاری عەبدولسەلام عارف بوو -چونکە عەبدولسەلام نێررابوو بۆ دەرەوە بۆ دەورە لە ئەڵمانیا- دەستی گرتم و بردمیە ژوورەکەی ئامر، وتی: ئەم نووسینە بەنهێنی هاتووە لەسەر تۆ، بیخوێنەوەو بەڵام لای کەس دەنگ مەکە.

کە خوێندمەوە ئەوەی تیابوو کە لەسەرەوە باسم کرد، لەپاشا بەسەرهاتەکەی زەلم و خورماڵ و هەڵەبجەم بۆ گێڕایەوە.

وتی: لە وەڵامدا چی ئەنووسی بۆ پاکانەی خۆت بینووسە، من دەیکەم بە کتابی رەسمی و بەنهێنی دەینێرم بۆ ئامرلیوا (عەبدولکەریم قاسم).

وتم: من هیچ نانووسم، بۆ خۆت بەنهێنی وەڵامەکەی بنووسەرەوەو پیشانی منیشی مەدە، بەڵام چۆن من دەناسی و راستی چۆنە وەها بینووسە.

وەڵامی دابوەوە، من لەو وەڵامە ئاگادار نەبووم.

لەپاش هەفتەیەك عەبدولکەریم قاسم، بەمەبەستی پشکنینی فەوجەکان هات بۆ جەلەولا، چونکە مەقەڕی لیواکە ئەو کاتە لە (جبل منصور) بوو، کە هاتە فەوجەکەی ئێمە ناردی بەدوامدا، چووم بۆ لای، زۆر رێزی گرتم، وتی: لەگەڵ شێخەکان چۆنی؟ وتم: لەسایەی خواوە باش دەبم. وتی: تا من لەم لیوایە بم، رێگە نادەم کەس زیانت پێ بگەیەنێ.

بەڕاستی ڕاستی لەگەڵ کردم، چونکە پاش کوشتنی ئەو من گوازرامەوە بۆ (توجیە معنوی) لە وەزارەتی بەرگری، رۆژێك ئەفسەرێك بردمی (اضبارة شخصیة)ی خۆمی پیشاندام، دیم ئەو نووسراوەی عەبدولکەریم قاسم لەسەر من نووسیویەتی وا لە ناویدا، خوێندمەوە زۆر سەرم سوڕما، چونکە پاکانەیەکی دڵسۆزانەی بۆ نووسیبووم.

لە ئەنجامدا کێشەی باخەکانمان جێبەجێ کرا، لەپاش ئەوەی کە چەند جارێك بانگیان کردین بۆ هەڵەبجە و لێکۆڵینەوەیەکی زۆریان کرد، هەموو جارێك شێخەکان دەست و پێوەندەکانیان دەهێنا بۆ شایەتی لەدژی ئێمە، تەسوییە جارێکی تر هاتەوە بۆ زەلم، بەشی ئامۆزاکانمان لەسەر خۆیان تەسوییە کرا، بەڵام بەشەکەی باپیرم (محمد أمین جوامێر) کە پێی دەوترا باخی گەورە، کە لە سەد دۆنم زیاتر بوو، بەنیوەیی تەسوییە کرا لەسەر باپیرم و شێخەکان، کاتێك تەمیزمان کرد، شێخەکان وەرەقەی قاقانیان هێنا بۆ محکمە، کە شێخ حسام الدین لە زەمانی دەوڵەتی عوسمانیدا دێی زەڵمی لەسەر خۆی تاپۆ کردبوو.

## ئاهەنگی رەوانەکردنی لیوای (١٩)

## بۆ وولاتی ئوردنی هاشمی

لەساڵی ١٩٥٦ جمال عبدالناصر تەئمیمی قەناتی سوێسی کرد، ئەو رۆژە خوا کوڕێکی پێدایین لەجەلەولا، کاتێك چووم بۆ دەوام وتم بە عبدالسلام عارف ئەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە چونکە کوڕمان بووە و کەس نیە یارمەتیمان بدات، وتی



ئەفسەرەکانی فەوجی ٣ لیوای ١٩ - ١٩٥٦

ئەبێت ناوی بنێیت عبدالناصر لەبەر گەورەیی ئەو رۆژەی کەجمال عبدالناصر تەئمیمی قەناتی سوێسی تیا کرد، منیش بەقسەم کرد ناوم نا عبدالناصر، بەڵام لەساڵی ١٩٥٩ کە جمال عبدالناصر دەستی کرد بەپیلانەکانی لەعێراقداو

ناکۆکی خستە نێوان عبدالکریم قاسم و عبدالسلام عارفەوە کە تا ئێستاش عێراقی لێ رزگار نەبووە، هەروەها عبدالوهاب شوافی راست کردەوەو هەستا بەئینقلابێکی فاشیل، لەداخی ئەوە ناوی کوڕەکەم گۆڕی بۆ شاهۆ کەناوی شاخێکی سەرکەشی کوردستانە و دەکەوێتە پشت شاری پاوە لەرۆژهەڵاتی کوردستان، ئێستا لەماڵەوە شاهۆیە و لەرەسمیاتدا عبدالناصر.

لە (١٩٥٦/١٠/٢٩) جولەکە لەگەڵ ئینگلیز و فەرەنسا هێرشیان بردە سەر میسر، زیاترلە (١٥٠) کیلۆمەتر چوونە ناو خاکی میسرەوە و لە (١٩٥٦/١٠/٣١) کەناڵی سویس داگیر کرا، کە جمال عبدالناصر خۆماڵی کردبوو، لەپاش ئەوە لەرۆژی (١٩٥٦/١١/٣) بڕیاری (ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق) دەرچوو کە لیوای (١٩) بچێت بۆ ئوردن، چونکە مەترسی ئەوە هەبوو کە جولەکە هێرش بباتە سەر ئوردن.

ڕۆژێك پێش ڕۆشتنی لیواکە بۆ وولاتی ئوردنی هاشمی، (ئامیری مەخازنی عەسکەری) دەعوەتی ئەفسەرانی لیواکەی کرد بۆ نان خواردنی ئێوارە، لەپاش نوێژی شێوان، منیش لەگەڵ ئەفسەرێکدا رۆشتم.

کە گەیشتم بینیم سێ خێمەی گەورە لەیەك دراون وکارەبایان بۆ هێناوە، مێزێکی زۆر ریز کراوە و ژمارەیەکی زۆر بوتڵی ویسکی و شەراب لەسەر مێزەکان دانراوە، کە ئەمەم دی گەڕامەوە لەخێمەکەوە بەرەو فەوج.

ئەفسەرێکی عەقید دەستی گرتم وتی: منیش مەشروب ناخۆمەوە، بەڵام وەرە سەیر بکە بزانە ئەم ئەفسەرە گەورانە لەپاش سەرخۆشبون چۆن ئەبن بەمەیمون، هەڵئەپەڕن و قسەی ناشیرین بەیەك دەڵێن.

منیش چومە ژورەوە، ئەوەی وتی بەزیادەوە بەچاو بینیم، بەراستی هەرکەسێك ڕێزی خۆی بگرێت خۆی تووشی ئەم نەخۆشییە کۆمەڵایەتیە ناکات کەزیانی هەیە بۆ تەندروستی و ئابوری و تەنانەت رەوشتیش، جگە لەوانە عەقڵیش سوك دەکات. زیادەڕەوی لە هەر شتێکدا دەرئەنجامێکی باشی نابێ.

# پیلان دانان بۆ کوشتنی مەلیك و عەبدولئیلاهـ و نوری سەعید

زۆر بەخێرایی رووداوەکان واهاتن، -وەك باسم کرد- ئەو کاتە لە (فەوجی ٣) عەبدولسەلام ئامر فەوج بوو لە جەلەولا بوو، لەگەڵ فەوجی (١) و فەوجی (٢)، بەڵام مەقەڕی لیوا کە (عەبدولکەریم قاسم) ئامیر لیوا بوو، لەسەربازگەی (جبل حمرين - جبل منصور) بوو.

رۆژی (١٩٥٦/١٠/٦) هەرسێ فەوجەکە لە جەلەولا دەرچووین و لەبەعقوبە لەگەڵ مەقەڕی لیوا یەکمان گرت، هەر ئەو رۆژە بەناو بەغدادا تێپەڕین، مەلیك فەیصلی دووهەم لەگەڵ عەبدولئیلاهـ لەسەر رێگاکە وەستابوون بۆ پێشوازی لیواکە، بۆ شەوەکەی گەشتینە فەلوجە و لەوێ ماینەوە، رۆژی (١٩٥٦/١٠/٧) بەناو شاری رومادیدا تێپەڕین، بۆ شەو گەشتینە شوێنێك پێی دەوترا (محەمەدیان) کە لەنێوان رمادی و رتبەدایە، شەو لەوێ ماینەوە، بۆ رۆژی دوایی چوینە سەربازگای (H٣) کە دەکەوێتە ئەودیوی روتبە لەسەر سنوری عێراق-ئوردن، لەوێ چەند رۆژێك ماینەوە.

لەپێش دروستبوونی کیانی جولەکە لەفەلەستینی داگیرکرا و ساڵی ١٩٤٨ نەوتی کەرکوك بەبۆری گەورە ئەرۆیشت بۆ حەیفا کەشارێکی فەڵستینیە و دەکەوێتە سەر دەریای سپی ناوەڕاست، لەوێشەوە بەپاپۆڕ ئەبرا بۆ وڵاتانی دەرەوە، بەدرێژایی ئەم بۆڕییە چەند کۆمپانیایەك دانرابوو بۆ بەهێزکردنی پاڵنانی نەوتەکە، تا ماوەیەك ناوی ئەو کۆمپانیایانە بە پیتی (K) دەستی پێدەکرد کە رەمزی کەرکوکە، لەپاشا بە (H) کە رەمزی حەیفایە، (H١) لە دەرەوەی

کەرکوك، (H٢) لە نێوان کەرکوك و رتبە، (H٣) لەپاش رتبە بوو، (H٤) و (H٥) لەناو خاکی ئوردن بوو، بۆ هەر یەك لەم کۆمپانیایانە سەربازگەیەك دانرابوو بۆ پاراستنیان، لیوای ١٩ لەنزیك H٣ بوو.

لە رۆژی (١٩٥٦/١٠/٢٩) کە جولەکە لەگەڵ ئینگلیز و فەرەنسا هێرشیان بردە سەر میسر، دوای ئەوە لەرۆژی (١٩٥٦/١١/٣) بڕیاری (ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق) دەرچوو کە لیوای (١٩) بچێت بۆ ئوردن، لەبەر مەترسی هێرشی جولەکە بۆ سەر ئوردن.

رۆژی (١٩٥٦/١١/٤) لیواکەمان بەرەو ئوردن کەوتەرێ و، رۆژی (١٩٥٦/١١/٥) گەیشتینە شاری (مەفرەق) لەناو خاکی ئوردن، لەنێوان سنوری سوریا و ئوردن، هەر فەوجەو جێگەی خۆی گرت، لەو شوێنەدا ماینەوە، دوای زیاتر لە مانگێك گەڕاینەوە بۆ (H٣)، لەبەر ئەوەی هیچ مەترسییەك لەلایەنی جولەکەوە لەسەر ئوردن نەما.

بڕیاربوو کە رۆژی (١٩٥٧/١/١) مەلیك فیصل و عەبدولئیلاە و نوری سعید بێن بۆ سەردانمان لە (H٣)، پاش هەفتەیەك لە گەڕانەوەمان کاتی هاتنیان هات، ئەفسەرە ئازادیخوازەکان بە سەرۆکایەتی عەبدولکەریم قاسم بڕیاریان دا کە فەوجی سێ نانیان بۆ دروست بکەن، هەندێ ئەفسەر بەسەرۆکایەتی (مقدم خزعل) بەناوی پارێزگاری میوانەکانەوە چەکدارکران، تا لەکاتی نان خواردندا بیانکوژن.

کاتێك هاتن نوری سەعیدیان لەگەڵ نەبوو، کە ئەوکاتە وەزیری بەرگری بوو، لەجیاتی ئەو رەئیس ئەرکانی سوپا هاتبوو، بەگورجی پلانەکەیان بەتاڵ کردەوە، وتیان ئیشەکە سەر ناگرێ، لەبەر نەهاتنی نوری سەعید پلانەکە دواخرا بۆ هەلێکی دیکە.

دوای گەڕانەوەمان بۆ جەلەولا، رێکەوتی (١٩٥٧/١/٦) جەژنی سوپابوو، سەر لەنوێ پلان دانرایەوە بۆ هەرسێکیان لە کاتی بەشداربوونیان لە ئاهەنگی جەژنی سوپا، ئەویش سەری نەگرت و هەڵوەشایەوە، چونکە هەرسێکیان لەوکاتەدا سەرقاڵی کۆبونەوەکانی حیلفی بەغدا بوون لە تورکیا.

## کورتەیەك لە ژیان و کەسایەتی

## مەلیك فەیسەڵی یەکەم

شا فەیسەڵی یەکەم کوڕی حوسێن کوڕی عەلی هاشمی یە. لە ١٨٨٣/٥/٢٠ لەدایك بووەو لە ١٩٣٣/٨/٨ کۆچی دوایی کردووە. یەکەم پادشای عێراق بووە لە ١٩٢١-١٩٣٣.


مەلیك فەیسەڵی یەکەم

لە شاری تائیف لەدایك بووەو لەگەڵ دوو براکەیدا لەلای باوکی پەروەردەبووە، براکانی (عەلی) کە دواتر بووە پادشای حیجاز، (عبداللە) کە دواتر بووە پادشای ئوردن. خوێندنی سەرەتایی لەگەڵ دوو براکەیدا تەواوکرد، فێری خوێندنەوەو نووسینی تورکی بوون، لەگەڵ کۆچەرییەکاندا پێگەیشت و لێیانەوە فێری زمان پاراوی و ئازایەتی بوو، مەشقی لەسەر ژیانی بیابان و ناخۆشیەکانی دەکرد، فێری سوارچاکی و شمشێربازی و بەکارهێنانی چەك بوو.

ساڵی ١٨٩٦، لەسەر بانگهێشتی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم، لەگەڵ باوکیدا دەچێت بۆ ئەستانەی پایتەختی خیلافەتی عوسمانی، لەوێ فێری زمانی تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسی و مێژوو دەبێت، باوکیشی فێری قورئانی دەکات، هەر لەویش لەساڵی ١٩٠٥ ئامۆزاکەی خۆی دەخوازێت.

دوای شۆڕشی بیست لە عێراق دژ بە داگیرکاریی بەریتانی، بەریتانیا شانشینی عێراقی ڕاگەیاند و پێشنیاری کرد فەیسەڵ کوڕی حوسێن ببێت بەپادشای عێراق.

لە ١٩٢١/٦/١٢ فەیسەڵ لە بەندەری جەددە لەسەر کەشتییەکی جەنگیی بەریتانی بەرەو عێراق بەڕێکەوت، ١٩٢١/٦/٢٣ گەیشتە بەندەری بەسرە و پێشوازییەکی ڕەسمی گەرمی بۆ کرا، دواتر بە شەمەندەفەر بەرەو حیللە بەڕێکەوت و سەردانی کوفە و نەجەف و کەربەلای کرد، لە ١٩٢١/٦/٢٩ گەیشتە بەغداد، (بیرسی کۆکس) مەندوبی سامی بەریتانی و چەند جەنەراڵ و کەسایەتییەکی دیکە لە وێستگە پێشوازی لێدەکەن.

لە ١٩٢١/٧/١٦ مەندوبی سامی بەریتانی رایگەیاند کە ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی، فەیسەڵی وەکو پادشای عێراق داناوە لەسایەی حکومەتێکی دەستوری نیابیدا.

دوای دەنگدانێك کە ٪٩٦ی دەنگەکانی ئەنجومەنی بەدەست هێنا، لە ١٩٢١/٨/٢٣ تاجی پادشایەتی پێ بەخشرا.

دوای بەیعەت پێدانی وەك پادشای عێراق و لەساڵی ١٩٣٠، رێککەوتنی ساڵی ١٩٣٠ لەگەڵ بەریتانیا مۆرکرد، بەپێی ئەو رێککەوتنە پێویستە شانشینی بەریتانی کۆتایی بە حاڵەتی ئینتداب لەسەر عێراق بهێنێت و لە بوارە ئابوورییەکان هاوکاری بکات.

لە ١٩٣٣/١٠/١ بە مەبەستی چارەسەری و هەندێك پشکنینی پزیشکی سەردانی بێرن لە سویسرا دەکات، دوای هەفتەیەك راگەیەنرا کە لە ١٩٣٣/٨/٨ بە سەکتەی دڵ کۆچی دوایی کردووە.

## کورتەیەك لە ژیان و
## کەسایەتی مەلیك غازی



کوڕی مەلیك فەیسەڵی یەکەمە، ساڵی ١٩١٢ لەشاری مەکە لەدایکبووە، ساڵی ١٩٢٤ بۆتە جێنشین، لەساڵی ١٩٣٣دا عالیەی کچی حوسینی ئامۆزای هێناوە، لە ١٩٣٣/٩/٨دا لەکاتێکدا تەمەنی تەنها ٢١ ساڵ بووە بۆتە دووەم مەلیکی عێراق، تا بەرواری ١٩٣٩/٤/٤ حوکمی کردووە و بەهۆی روداوی ئۆتۆمبێلەوە کۆچی دوایی کردووە، کاك فوئاد عارف کەیاوەری تایبەتی بووە زۆر مەدحی مەلیك غازی دەکات و بەکەسێکی سادە و دڵسۆز و دوور لەدەمارگیری ناودەبات.

## کورتەیەك لە ژیان و کەسایەتی مەلیك فەیسەڵی دووەم

ناوی فەیسەڵ کوڕی مەلیك غازی کوڕی مەلیك فەیسەڵی یەکەمە.

لە ڕێکەوتی ١٩٣٥/٥/٢ لە کۆشکی زهور لە بەغدا هاتۆتە دنیاوە، دایکی ناوی (مەلیکە عالیە) بووە، خوشك و برای نەبووە.



مەلیك فەیسەڵی دووەم

فەیسەڵ هێشتا منداڵ بوو باوك و دایکی کۆچی دواییان کرد.

لە ڕێکەوتی ١٩٣٥/١١/٣ لە کۆشکی زهور ئاهەنگێکی گەورە بەرپا کرا بەبۆنەی خەتەنەکردنی فەیسەڵەوە.

(مەلیکە عالیە)ی دایکی و (شازادە عابدیە)ی پوری بەخێویان کردوە.

شەوی ٣-٤/ی نیسانی ساڵی ١٩٣٩ مەلیك غازی باوکی بەڕوداوی ئۆتۆمبیل کۆچی دوایی کرد، ئەوکاتە تەمەنی فەیسەڵ چوار ساڵ بوو.

پاش مردنی باوکی، فەیسەڵ کرا بە مەلیکی عێراق بەناوی فەیسەڵی دووەم، هەروەها (شازادە عەبدولئیلاه) کرا بە (وەصی) لەسەر عەرشی عێراق.

لەساڵی ١٩٤٢ لە بیلاتی مەلەکی شوێنێکی تایبەت ئامادەکرا وەك قوتابخانە بۆ خوێندنی مەلیك، بە چاودێریی چەند مامۆستایەکی زیرەك و زانای عێراقی و ئینگلیزی و بە سەرۆکایەتی (دکتۆر مستەفا جەواد).

لەساڵی ١٩٤٧ مەلیك فەیسەڵ خوێندنی سەرەتایی تەواوکرد، رۆژی ١٩٤٧/٧/٢٧ لە قوتابخانەی (ساند روید) لە لەندەن وەرگیرا، پاش ماوەیەکی کەم لە ١٩٤٧/١١/٨ قۆناغی یەکەمی (ساند روید)ی بەسەرکەوتوویی بەڕێکرد، لە ١٩٤٩/٥/٧ پاش تاقیکردنەوەیەك لە کۆلیجی (هارو) لە لەندەن وەرگیرا.

لە ١٩٥٠/١٢/٢١ دایکی فەیسەڵ (مەلیکە عالیە) کۆچی دوایی کرد.

لە ٢/ی مایسی ساڵی ١٩٥٣ مەلیك گەیشتە (سن الرشد) و سەڵاحیاتی دەستوریی تەواوی وەرگرت، لەم رۆژەدا کۆبونەوەیەکی گەورە رێکخرا لە هەریەکە لە (مجلس الامة - مجلس النواب - مجلس الاعیان)، مەلیك فەیسەڵ لەبەردەم هەرسێ مەجلیسەکەدا سوێندی دەستوری خوارد.

لە ٨/ی مایسی ١٩٥٣ مەلیك فەیسەڵی دووەم ئیزگەی تەلەفزیۆنی بەغدای کردەوە، ئەم ئیزگەیە یەکەم بووە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

لە ١٩٥٧/٩/١٦ ژنی دەستنیشان کرد بە ناوی (شازادە فازیلە محمد علی).

لەشوباتی ساڵی ١٩٥٨، (فازیلە)ی دەزگیرانی مەلیك بە یاوەری هەریەك لە باوکی و دایکی بە سەردانێك گەیشتە بەغدا و، بەگەرمی پێشوازییان لێکرا، ئەوکاتە (فازیلە) تەمەنی شانزە ساڵ بوو.

چەند مانگێکی پێ نەچوو، شۆرشی ١٤/ی تەمووز بەرپاکراو رژێمی پاشایەتی بنبڕ کرد. بەرەبەیانی ١٤/ی تەموزی ساڵی ١٩٥٨ مەلیك فەیسەڵ لەگەڵ هەموو کەسوکارەکەیدا کوژران و بەم جۆرە ژیانی تەواو بوو.

# کورتەیەك
# لە ژیانی نوری سەعید


نوری سەعید

فەریق نوری سەعید ناوی موحەممەد نوری کوڕی سەعید ئەفەندی یە، باوکی کاتبی (موحاسبی) ولایەت بووە، لە ١٨٨٨/١/٢ لە بەغدا لە دایکبووە، خوێندنی لە قوتابخانەی عەسکەری تەواو کردووە، ساڵی ١٩٠٣ چووە بۆ ئەستانبوڵ، ساڵی ١٩٠٤ لەوێ چووەتە خوێندنگەی سەربازی، ساڵی ١٩٠٦ دەرچووە بە پلەی (ملازم) لە سوپای شەشی تورکیا کە لە عێراق بووە، لە پاشا گەڕاوەتەوە بۆ ئەستانبول لە ساڵی ١٩١١ چووەتە خوێندنگەی ئەرکان، بەشداربووە لە شەڕی بەلقانی ساڵی ١٩١٣دا.

لەپاشان چووەتە کۆمەڵەی نهێنی (جمعية العهد)، لە پاشان هەڵهاتووە لە تورکیا چووەتە میسر لە ساڵی ١٩١٤، دەرکرا لە سوپا.

لە پاشا هاتووە بۆ عێراق و پەیوەندی کردووە بە شێخ موحەممەد سەعید نەقشبەندییەوە کە ئەوکاتە لە پیاوە گەورەکانی کورد بووە.

بە پێچەوانەوەی ئەوەی کە بەخزمەتکاری ئینگلیز ناوی دەرکردبوو، نوری سەعید پیاوێکی نیشتمانپەروەر بوو، بەڵام کەس نەبوو لەو ڕۆژانەدا دژی ئینگلیز بوەستێ، ئەگەر خزمەتکاریشی بوبێت ئەوە لەبەر بەرژەوەندی عێراق بوو، سەرۆکی حزبی (الاتحاد الدستوری) بوو.

ئەحمەد فوزی لە کتێبەکەی (شخصیات و تواقیع) لاپەڕە ٩٦ دەڵێت: وتم پاشا ئارەزووی کۆکردنەوەی ئیمزای پیاوە بە ناوبانگەکان دەکەم، ئێستا ئیمزایەکی تۆم دەوێت، پارچە کاغەزێکی دەرهێناو ئیمزای کرد، لە پاشا وتی: من لە هەموو شتێکدا ئاشکرام حەز لە دووڕوویی ناکەم.

هەندێك دەڵێن نووری سەعید کوردی خەڵکی تورکیا بووە، بەڵام خوشکەزاکەی کەناوی موقەددەم صەلاح بوو وتی: خاڵم کوردی لای مەندەلی بووە.

## نمونەیەك لە ڕەوشتی جوانی نوری سەعید

شێخ بەشیر، کە لە سەرەتای حەفتاکاندا ئەمین عامی ئەوقافی هەولێر بوو، دەگێڕێتەوە کە لە ساڵەکانی ١٩٥٣ و ١٩٥٤، قوتابی بووە لە کۆلیجی حقوق، هاوڕێیەکی هەبوو ئەندامی حزبی شیوعی عێراقی بوو، بەشداریی خۆپیشاندانەکانی دژ بە ڕژێمی پاشایەتی دەکرد، دەچووە سەر شانی قوتابیان و هیتافی دژی ڕژێم و سەرۆك وەزیران (نوری سەعید) ئەدا.

دوای تەواوکردنی کۆلێج زۆری هەوڵدا دابمەزرێ، بێسود بوو، چەند کەسێك ڕێنماییان کرد کە داواکارییەك بنووسێت و بچێت لەسەر ڕێگای هاتوچۆی نوری سەعید بوەستێت و پێشکەشی بکات.

داواکارییەکەی نووسی و لەسەر ڕێگاکەی وەستا، کە هات پێی وت: پاشا دەخیلتم، ئەویش لەگەڵ خۆی سواری ئۆتۆمبێلی دەکات و دەیبات بۆ ماڵی خۆی، پاشان لێی پرسی: چیت ئەوێ؟ وتی: دەرچوی کۆلیجی حقوقم و دوو ساڵە تەواوم کردووە، کەسم نییە، خۆم و پیرەدایکێکم هەیە، ئەویش نەخۆشە، ناتوانم داوودەرمانی بۆ بکڕم، داوای دامەزراندنیش دەکەم، لەهیچ شوێن دامنامەزرێنن.

پێی وت: بڕۆ دەست و چاوت بشۆ.

داوای لە (دایکی صەباح)ی خێزانی کرد خواردنی بۆ ئامادە بکات، چونکە نە پاسەوانی هەبوو نە خزمەتکار.

لەو کاتەدا کە خەریکی نانخواردنە، نوری سەعید دەچێت و لە ناو دۆلابێك وێنەیەك دەردەهێنێت و تۆزێك سەیری دەکات، ئینجا دەیخاتەوە شوێنی خۆی.

پاش نانخواردن، نوری سەعید فەرمانی پێکرد کە بچێتە سەر مێزێك و هوتافەکانی جاران بدات کە دەیوت: (نوری سەعید قۆندەرە و سالّح جەبر قەیتانە)، ئەویش قایل نەبوو ئەمە بکات، بەڵام نوری سەعید زۆری لێکرد و ئەویش ناچار چووە سەر مێزەکەو هوتافی داو هاواری دەکرد، نوری سەعید و خێزانەکەشی چەپڵەیان لێدەدا.

دوای تۆزێ، داوای لێکرد دابەزێت، ئینجا پێی وت: رۆڵە، نە من بووم بە قۆندەرەو نە سالّح جەبر بوو بە قەیتان. تۆ گەنجیت چیت لە سیاسەت و حزبی شیوعییە.

دەستی خستە ناو گیرفانی و دە دیناری ئەوکاتەی دەرهێناو پێیداو پێی وت: بەیانی بڕۆ دەستێك جل و بەرگی نوێ لەگەڵ جوتێك قۆنەرە بکڕە، پیرە دایکیشت ببە بۆ دکتۆر.

ئنجا لێی پرسی: تۆ دەتەوێت ببی بە چی؟ لە وەڵامدا وتی: مدیر ناحیە.

وتی: باشە، بەیانی بڕۆ بۆ لای وەزیری ناوخۆ بۆ ئەوەی داتبمەزرێنێ.

کاتێك چوو بۆ وەزارەت، پێیان وتبوو کە دەبێ بەڵگەنامەی (عدم محکومیة) بێنێت، ئەویش بەهۆی رابردووی لەگەڵ حیزبی شیوعیدا، جارێکی تر گەڕایەوە لای نوری سەعید لە ئەنجومەنی وەزیران و پێی وت: داوای (عدم محکومیە)م لێ دەکەن!

وتی: بڕۆ بە وەزیری ناوخۆ بڵێ من هەویەم نوری سەعیدە.

# أحـكام الهـمزة




ئەو ماوەیەی لە (H٣) ماینەوە، سەرقاڵی دانانی کتێبێك بووم بەناوی (احکام الهمزة)، بەبێ سەرچاوە، ئەم هەواڵەش بەنێو ئەفسەرەکاندا بڵاوبوبوەوە.

رۆژێك نانمان دەخوارد، ئێستگەی بەغدا کرابوەوە، باسی (یەکێتی سۆڤێت)ی دەکرد، کە کەشتی ئاسمانی تاقی دەکاتەوە بۆ ئەوەی بگاتە ئەستێرەکانی ئاسمان.

عەبدولسەلام عارف وتی: خەڵکی رۆشتنە ئاسمان، ئێمەش تازە خەریکی هەمزەین.

منیش بەتوندی قاپەکەم کوتا مێزەکەدا و وتم: من لە سەر هەمزە شتێکم نووسی، ئەی تۆ چیت کرد؟ ئەویش تەماشایەکی کردم و واقی وڕما، سوێندی خوارد وتی: من مەبەستم ئەو کتێبە نیە کەتۆ لەبابەت هەمزەوە داتناوە، من کە ئەو قسەیەم کرد تۆم لەخەیاڵدا نەبوو، ئەم شتە هەروا هات بەخەیاڵمدا و پەیوەندی بەتۆوە نیە، ببورە لێم من لەگەڵ خەڵکی ترمە.

تێبینی: ئەم کتێبە ساڵی ٢٠١٣ چاپکرا.

# جیاکردنەوەی
# فەوجی (٣) لە لیوای (١٩)

دیاربوو هەست کرا بوو بە جوولانی ناو سوپا بۆ گۆڕینی ڕژێم، ئەفسەرێك گێڕایەوە (ناوەکەیم بیر نەماوە) وتی: مەلیك و عەبدولئیلاهو نوری سەعید، وتیان: بیستوومانە تۆ پەیوەندیت هەیە بە هەندێ ئەفسەرەوە کە بە نهێنی لە دژی ئێمە دەجولێنەوە، ڕاستیمان پێ بڵێ، چ پلەیەکت دەوێت دەتدەینێ و چ ئاواتێکت هەیە بۆت بەدی دەهێنین، وتی منیش پێم وتن: شتی وەها نییە، ئەفسەر لە سوپای عێراقدا گەورەو بچووکی دڵسۆزە بۆ (جەلالەتی مەلیك)، پاش ئەوە نوری سەعید دەستی کرد بە گیرفانیدا شقارتەیەکی دەرهێنا، وتی: سوپای عێراق ئەم شقارتەیەیە و لە گیرفانی مندایە، ئەگەر شتێکیش هەبێت ناتوانێت لە دژمان بجولێتەوە.

هەر لەبەر ئەم گومانەبوو هەندێ گۆڕانکاری لە سوپادا کرا.

لەرێگەی گەڕانەوەمان بۆ جەلەولا، فەرمان دەرچوو بە جیاکردنەوەی هەرسێ فەوجەکەی لیوای (١٩) و پێکهێنانی لیوای (٢٠) و (ناظم تەبەقچلی) کرایە ئامری لیواکە، (عبدالکریم قاسم) مایەوە بە ئامرلیوای (١٩) و فەوجی تازەی بۆ پێکهێنرا.

هەروەها (نەجیب ئەلڕوبەیعی) کە قائید فیرقە بوو، سەرۆکی ئەفسەرە ئازادیخوازەکانیش بوو، ناردیان بۆ دەرەوەی عێراق، لام وایە کرا بە سەفیری عێراق لە سعودیە لەشاری جەدە.

هەندێ شتی تریش لە سوپا گۆڕانکاری تیاکرا.

بەڵام هەموو ئەمانە کاری نەکردە سەر کاری ئەفسەرە ئازادیخوازەکان، چونکە عەبدولکەریم قاسم جێگەی (نەجیب ئەلڕوبەیعی) گرتەوە و، پەیوەندی نێوان عەبدولکەریم و عەبدولسەلام زۆر بەهێزتر بوو، هەروەها پەیوەندییان لەگەڵ میسر و جەمال عەبدولناسر زۆر بەهێزتر کرد، بەتایبەتی کە لە ئوردون چەند نووسراوی سیاسییان نارد و دابەشکرا بەسەر رێکخراوەکانی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان دا، بۆ دانانی رێگەیەك بۆ گۆڕینی رژێمی پاشایەتی عێراق.

# ڕێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخواز چۆن دروست بوو؟

سەرەتای دروستبوونی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان ئەگەڕێتەوە بۆ شکستی شۆڕشی مایسی ١٩٤١ و لەسێدارەدانی سەرکردەکەیان (صلاح الدين صباغ)، هەروەها سەرگەردانی فەڵەستین لەساڵی ١٩٤٨، لە شەڕی فەڵەستیندا ئەوەی بەسەر سوپای عەرەبی و سوپای عێراقدا هات بووە هۆی ئەوەی ئەفسەرەکان ڕێکخراوێکی نهێنی دروست بکەن کار بۆ ڕزگاربوون لەدەست ئینگلیز و جولەکە بکات. دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ٢٣/ یۆلیۆی ١٩٥٢ لە میسر و دەرکردنی مەلیك فاروق و هاتنە سەرحوکمی جەمال عەبدولناصر، ئەم ڕێکخراوە زیاتر بەهێزبوو، هەر لەو ساڵەدا کۆمەڵێك ئەفسەر بەڵێنیان دا لەسەر جێبەجێ کردنی ئامانجە نیشتمانی و نەتەوایەتیەکانیان.

لافاوە گەورەکەی بەغدا لەساڵی ١٩٥٦ بووە هۆی کۆبونەوەی ئەفسەرە گەورەکان و یەکترناسینیان.

لەساڵی ١٩٥٦ دوژمنکارییە سێ قۆڵیەکەی کرایە سەر میصر، هاندەرێکی زۆر گرنگ بوو بۆ بەهێزکردنی سووربوونیان لەسەر ڕوخاندنی ڕژێمی پاشایەتی.

ئەم ڕێکخراوە ڕۆژبەڕۆژ لە گەشەکردن و پەرەسەندندا بوو، تا لە ١٤/ تەموزی ١٩٥٨ ڕژێمی پاشایەتی ڕوخاند.

# چۆن بووم بە ئەندامی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان

لەپێش چوونمان بۆ ئوردن بۆ ماوەی مانگێك لە(H٣) ماینەوە، عبدالسلام عارف سێ خێمەی گەورەی لێکدا و مزگەوتێکی سەفەری لێ پێکهێنا، بەمنی وت بەرنوێژیمان بۆ بکەو جومعەشمان بۆ بکە، یەکەم جومعە زۆر لەئەفسەرەکانی لیواکە هاتبوون بۆ نوێژ، منیش بەبێ ئەوەی بترسم لەپاشەرۆژ خوتبەیەکی ئاینی و سیاسیم خوێندەوە، چونکە ئەو کاتە تاحەدێك رێگای قسەکردن هەبوو، لە وتارەکەمدا هێرشم کردە سەر ئەفسەرەکان و، وتم: ئێوە لەبەر بەرژەوەندی خۆتان بیر لە بەرژەوەندی عێراق ناکەنەوەو بیر لەوە ناکەنەوە وڵاتەکەتان رزگار بکەن لەدەست داگیرکەر. بەم جۆرە خوتبەکەم لەسەر ئەو باسە بوو.

شەو کاتژمێر -١٠-، عەبدولسەلام ناردی بەشوێنمدا، گومانم کرد لێپرسینەوەم لەگەڵ بکات لەسەر وتارەکەم، کاتێ چوومە ناو خەیمەکەیەوە، مێزێکی لەبەردەمدا بوو، قورئانێکی لەسەر بوو، ئاماژەی بۆ کرد و پرسی: ئەوە چی یە لەسەر ئەو مێزە؟

وتم: قورئانە.

وتی: لەبەر ئەوەی متمانەم هەیە پێت، سوێندت نادەم، بەڵام لە ئەمڕۆوە وا دابنێ ئەندامێکی ئەفسەرە ئازادیخوازەکانیت.

وتم: شانازی دەکەم بەوەی پەیوەندی بکەم بە ئێوەوە، بەڵام دەبێت بزانم ئێوە ئامانجتان چییە و ئەرکی سەر شانی من چی یە؟

وتی: ئامانجی ئێمە ئەوەیە کە ڕژێمی پاشایەتی بگۆڕین بۆ کۆماری و حکومەتێکی ئیسلامی پێك بهێنین کە جیاوازی نەبێت لەنێوان کورد و عەرەبدا، ئەرکی تۆ لای ئێمە ئەوەیە کە تۆ بەهۆی ئەوەی جبەو عەمامەت لەبەردایە، کەس گومانت لێ ناکات، کاتێ نامە یان کتێبێکی نهێنیمان بۆ دێت تۆ دابەشی بکە بەسەر ئەفسەرە ئازادیخوازەکاندا، منیش داواکەیم قبوڵ کرد چونکە ئەوە ئامانجی هەموو موسڵمانێکی پاك و نیشتمانپەروەرە، بەڵام بەداخەوە ئەوەی کەوتی پاش ئەوەی کەگەیشتە سەر کورسی دەسەڵات هەمووی بەپێچەوانەوە جێبەجێ کرد، یەکەم دوو ئیشی گەورەی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو، بوو بە نائیبی قائدی قواتی مسەلەحە، هەوڵیدا عێراق بکات بەهێلکەیەکی پاککراو بیخاتە دەمی میسریەکان و، عێراقی وا تێکدا کە ئێستاش ئەناڵێنێ بەدەست ئەنجامەکانی ئەو تێکدانەوە، دەرکەوت ئەگەر پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر بێت - عەرەب نەبوایە ئەو ئیمانی پێ نەدەهێنا، زۆر ئیشی رەگەزپەرستانەی کرد، بۆیەکەمجار ویستی کوردەکان بخەڵەتێنێ و بانگی کردن بۆ برایەتی و پێی ئەوتن ( یا ابناء محمد)، لەپاشان زۆر پیاوماقوڵی کوردی زیندانی کرد، جارێکیان لە کولیەی عەسکەری کۆبوونەوەیەکی کرد لەگەڵ ئەفسەرەکاندا منیش ئامادە بووم تێیدا وتی: دەست ئەخەمە ناو دەستی شەیتان بۆ لەناوبردنی دوژمنانی عەرەب (مەبەستی کورد بوو)، هەروەها وتی ئاخر بستی لوتکەی شاخەکانی شیمالی عێراق هی عەرەبە.

ئەفسەرێکی گەورە کە جێگەی بڕوا بوو وتی: عبدالسلام عارف ئەفسەرە گەورەکانی کۆکردەوە لەشوێنێکی نهێنیدا و منیشیان (واتە ئەو کەسەی کەبۆی گێڕامەوە) لەگەڵدا بووم، وتی: ئەمەوێت کیمیاوی بکەم بەسەر ئەو شاخانەدا کە کوردە چەکدارەکانی تێدایە.

ئەفسەرەکە وتی یەکێك لەبەشداربووانی کۆبوونەوەکە پێی وت: ئەگەر کیمیاویەکە بکەین بەسەر شاخەکاندا هەندێکی ئەچێتە خاکی ئێرانەوە و ئەو کاتە ئێران لە نەتەوە یەکگرتووەکان شکاتمان لێ دەکات، ئەگەر بکرێت بە بنی شاخەکانیشدا ئەوا زۆر لەژن و مناڵی بێتاوان ئەکوژرێن، عبدالسلام وتی: من

لەهەردوو لاوە کیمیاوییان بەسەردا ئەکەم، با ئێران هەر شکاتی خۆی بکات، ئەو منالانەشی کە کیمیاوی ئێمە ئەیانکوژێت ئەگەر بمێنن و سبەی گەورە ببن ئەوانیش دەبنە موتەمەرید.

ئەمە نمونەیەکە لەو ئامانجانەی کەهەیبوو، بەپێچەوانەی بەڵێنەکانیەوە کەتوانی چەند کەسێکی وەکو منی پێ بخەڵەتێنێت.

بەم شێوەیە بوومە یەکێك لەئەفسەرە ئازادیخوازەکان.

## فەرەزیاتی خەلیفان

هەموو ساڵێك فەوجەکان شوێنی هەمیشەیی خۆیان بەجێ دەهێڵن، بۆ ماوەی مانگێك مەشقی جەنگی دەکەن، وەك ئەوەی شەڕ لەگەڵ دوژمن بکەن، دوژمن بە خەیاڵ دروست دەکەن و ڕێگەی لەناوبردنی بۆ دادەنێن و لە ڕۆژێکی تایبەتیدا هێرش دەبەنە سەری. ئەم فەرەزیاتە زۆرترینی لە کوردستاندا ئەکرا.

هاوینی ١٩٥٧، فەوجەکانی لیوای (٢٠) چوون بۆ فەرەزیات لە خەلیفان، عەبدولسەلام هەر ڕۆژێ ئەفسەرەکانی خۆی دەبردن بۆ شوێنێك بۆ شارەزایی ڕێگەوبانی ئەو شوێنانە، ڕۆژێك ڕۆشتین بۆ سەر پرۆژەی بەنداوی بێخمە، کە ئەو کاتە لەسەرەتایدا بوو، تا ئێوارە لەوێ بووین.

ڕۆژێکی کە بردینی بۆ بارزان، جێگە شەڕەکانی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای لەگەڵ سوپای عێراق پیشاندناین، لەسەر نەخشەی عەسکەری هەموو شوێنێکی بەدرێژی بۆ باس کردین و باسی گرنگی هەندێ شوێنی بۆ کردین لەبابەت سەرکەوتن و شکاندنی سوپاوە، منیش دەفتەرێکم پێبوو ئەوانەی کە دەیگوت دەمنووسی، کاتێ عەبدولسەلام هەستی بەوە کرد پێی ناخۆش بوو، هەموو نووسینێکی لێ قەدەغە کردم، چونکە دڵی لەکورد پیس بوو، تەنانەت لە منیش کە لەگەڵی بووم، ئەوکاتە مەلا مستەفا لە ڕوسیا بوو هیچ شتێك لە ئارادا نەبوو.

ڕۆژێکی تر چووین بۆ حاجی ئومەران، کە نزیك سنووری ئێرانە، لەسەر کانیاوە ساردەکەی چامان لێناو نانمان خوارد، تەماشای ئەو دۆڵ و دەرەمان کرد، قەبرێکی لێبوو گومەزێکی لەسەر کرابوو، هەندێ پەڕۆی سەوزو سپی پێوە هەڵواسرابوو، کە ئەمەش باوە لە خاکی کوردستاندا، کە نەخۆش یان یەکێك کێشەیەکی هەبێت ئەچێتە سەری و داوای چارەی لێ ئەکات.

عەبدولسەلام عارف وتی: ئەمەی ژێر ئەم گومەزە عەرەبە، چونکە سەیدە، کوردیش سەییدی تیا نییە، خەڵکی دێهاتی ئەم دۆڵە کاتی خۆی هەمووی عەرەب بوون، تەماشایەکی منی کردو، وتی: ئیمامیش شایەتی قسەکەمە.

وتم: لەسەر چ بنچینەیەك؟ جگە لەوەی من و تۆ خۆمان بە موسڵمان ئەزانین، ئایا لە ئیسلامدا جیاوازی هەیە لە نێوان کوردو عەرەب؟ لە پاشان نەك لێرە کە کوردستانە، بەڵکو لە عەرەبستانیش کەس هەیە کە ئەسڵی خۆی بزانێت، عێراق لەبەرەبەیانی مێژووەوە جێگای سەدان (غەزو) داگیرکردن بووە، کە دواییەکەیان داگیرکەری ئینگلیزە، ئەو چاو شین و قژە زەرد و لەش سپی و سوورە کە لەناو عەرەبدا هەیە بۆچی ئەسڵیان عەرەبن؟

ئیتر پیشی کردو کڕ بوو.

عەبدولسەلام هەرچەندە نوێژ و ڕۆژی دەکرد، بەڵام ڕەگەزپەرستی و شۆڤێنێتیەکەی لە سنوور تێپەڕیبوو.

ڕۆژێك بۆی گێڕامەوە وتی: قوتابی بووم لە پۆلی دووەمی ناوەندی، چووم بۆ لای شێخ مەحمودی حەفید (خوا لێی خۆش بێ)، کە نەفییان کردبوو بۆ (عانە)، دەستی هێنا بەسەرما، وتم: یا شێخ تۆ ئەگەر شێخ بیت کورد نیت، ئەگەر کورد بیت ئەوا شێخ نیت، وتی: تەماشای کردم پێکەنی و وەڵامی نەدامەوە.

دەردەکەوێت کە هەر لە منداڵییەوە ڕەگەزپەرستی لە مێشکیدا بووە.



(ئەفسەرەکانی فەوجی (٣) -لیوای ٢٠ لە خەلیفان / ئەیلولی ١٩٥٧ )



لەگەڵ عەبدولسەلام عارف و ئەفسەرەکانی فەوجی ٣ لە پردی بارزان



ئەفسەرەکانی فەوجی ٣ لە بێخاڵ - ئەیلولی ١٩٥٧

# یەکگرتنی هاشمی
# نێوان عـێراق و ئـوردون

جگە لەخوا کەس نازانێ چاکەو خراپە، خێر و شەڕ، قازانج و زەرەر لە چی دایە، زۆر کەس هەیە کۆشش ئەکات لە کردنی کارێك بۆ ئەوەی تووشی خێرو خۆشی بێت، کەچی لە ئەنجامدا دووچاری شەڕ ئەبێت، بە پێچەوانەی ئەوەوە هەندێجار شتێکی ناهەموار ڕوو دەکاتە مرۆڤ، بەڵام لە ئەنجامدا خوا دەیکات بە خێرو قازانجی ئەو کەسە.

من خۆم تەمەنم ئێستا (٧٧) ساڵە، بە زۆری تووشی شەڕ بووم، کەچی لە ئەنجامدا خوا کردوویەتی بە هۆی خێرو حەواندنەوە، ئەمەش مانای ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە:

﴿ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡ ﴾[1].

یەکگرتنی هاشمی نێوان عێراق و ئوردن کە پاشای هەردووکیان ئامۆزای یەکتر بوون، بۆ ئەوە کرا کە پەیوەندییان پتەو بکات و درێژە بدات بە مانەوەیان لە حکومدا، لەسەر کورسی حوکمڕانی، بەڵام بە پێچەوانەوە خوا کردی بە هۆی تیاچوونی خێزانی هاشمی لە عێراقدا.

لە پاش ئاشکراکردنی یەکگرتنەکە لە هەموو شوێنێکدا شادی کرا بۆ هەڵواسینی ئاڵای ئەم یەکێتییە و هێنانە خوارەوە ئاڵای عێراق.

---

(١) سورەتی بەقەرە: ٢١٦

ئەو ڕۆژە لە لیوای ئێمە ئەو ئاهەنگە سازکرا، پێش ئاهەنگەکە ئەفسەرەکانی فەوجی (٣) لەگەڵ عەبدولسەلام عارف نانی بەیانیمان ئەخوارد، چونکە ئەوەندە زوو هاتین فریای نانخواردنی ماڵەوە نەکەوتین، لەوکاتەدا یاریدەدەری ئامر فەوج (فازڵ محمد علی) ڕووی کردە من و وتی: ئێستا ئامر لیوا (نازم تەبەقچلی) بە تەلەفۆن پێی وتم: ئەبێ لەکاتی هەڵواسینی ئاڵای یەکگرتنەکەدا ئیمام مستەفا وتارێ بخوێنێتەوە، منیش بەبێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت بە دەنگی بەرز وتم: بەخوا ئەگەر دەرمکەن لە سوپا هیچ وتارێك نادەم.

عەبدولسەلام تەماشایەکی کردم و هیچ دەنگی نەکرد، کاتێك چووەوە ژوورەکەی ناردی بە دوامدا، وتی: ئەو قسەیەت بۆ کرد؟ نازانی لەناو ئەفسەرەکاندا جاسوس هەیەو ئەیگەیەنێت بە شوێنی خۆی، وتم: ڕاستە، ئەبوایە نەم وتایە، بەڵام ئێستاش لێی پەشیمان نیم.

هەرچی لە عەبدولسەلام بوو وای زانی کە من ئەم قسەیەم لەبەر ئەوە کرد کە پەیوەندیم هەیە بەو ئەفسەرە ئازادیخوازانەوە، بەڵام من داخی دڵم لەبەر ئەوەبوو لە ئاڵای عێراقدا نیشانەیەکی کوردی تیابوو (بریتیبوو لە ئەستێرەیەك کە پیشانی دەدات کورد لەگەڵ عەرەب هاوبەشن لە عێراقدا)، بەڵام لە ئاڵا تازەکەدا لایان برد.

کاتێك ئەفسەرەکان کۆبوونەوە، یاریدەدەرەکە (فازڵ محمد علی) کارێکی وای کرد لەو تەنگ و چەڵەمەیە ڕزگارم بکات، چووە لای ئامر لیوا، پێی وت: ئەم وتارە کە تۆ داوات کرد لە ئیمام مستەفا لەلایەن کۆنترین ئیمامەوە دەبێت بدرێت، کە ئەویش ئیمام (ئەحمەد نەقشبەندیی)یە، ئیمام ئەفەندی فەرموو وتارێك بڵێ بەم بۆنەیەوە، ئەویش گورج دەستی هەڵبڕی بۆ ئاسمان وتی: "اللهم انصر الملك، اللهم انصر الجیش، الفاتحة"، هەموو ئەفسەرەکان لە پێکەنیندا بورابوونەوە، وتیان: ئیمام ئەم فاتیحەیە بۆچی بوو؟ وتی: بۆ ڕۆحی شەهیدەکان، لە نێوان خۆیاندا وتیان ئەمە فاتیحەی هەرەسی ئەم یەکگرتنەیە، ئێمەش ئەوەی پەیوەندیی هەبوو وتمان ئەمە ڕۆحیانەتی پاکە زانیویەتی ئەمە ئەبێتە هۆی تیاچوونی مەلیك.

لە پاش دوو هەفتە غازی داغستانی قائید فیرقەی (٣) کە لیوای ئێمە سەر بەوان بوو هات بۆ جەلەولا، هەموو ئەفسەرەکانی کۆکردەوە و پێی وتین: هەموو چوارمانگ جارێ ئەبێ لیوایەك لە سوپای عێراق بچێت بۆ ئوردن و لەوێ (٤) مانگ بمێنێتەوە، وەك رێزگرتنێك بۆ یەکگرتنی هاشمی، لە بەغداوە بڕیاردراوە کە یەکەم لیوا بڕوات ئەم لیوایەیە، ئەم ڕۆشتنە تەنیا بۆ خۆتان نییە، هەموو ئەفسەرێك ئەتوانێ ماڵ و منداڵی ببات، ئێمە بە فرۆکە ماڵ و منداڵتان بۆ ئەنێرین، ئێمەش زۆرمان پێخۆشبوو، چونکە ئەمە وەك سەیرانێك وابوو، بڕیاردرا ئەم ڕۆشتنە ڕۆژی ١٩٥٨/٦/٨ بێ.

# جموجوڵی من لە لیوای (٢٠)

**ئەو کارانەی کە عەبدولسلام عارف بە منی سپارد لەو ماوەیەی کە پەیوەندیم هەبوو لەگەڵیدا زۆر کەمبوون، وەك وتم ئەترسان لە جوڵانەوەو ئیشکردن:**

١- سەرۆکی ئیمامەکانی سوپای عێراق (تۆفیق زین العابدین) یەکێ بوو لەوانەی کە پەیوەندی هەبوو بە ئەفسەرە ئازادیخوازەکانەوە، لە مەقەڕی وەزارەتی بەرگری دائەنیشت، ڕۆژێك هات بۆ جەلەولا، بۆ ئێوارە منیشی دەعوەت کرد، شەو لەگەڵ عەبدولسەلامدا زۆر شت باس کرا، لە بابەتی ڕژێمی پاشایی و بیرکردنەوە لە پاشەڕۆژ، عەبدولسەلام هەندێ ئامانجی باس کرد بۆمان کە لە پاش شۆڕش بیکات -بەڵام بە داخەوە هیچیانی ئەنجام نەدا، هیچی نەکرد جگە لە تێکدان و ماڵوێرانی-.

شەو لەگەڵ (تۆفیق زین العابدین) هاتینەوە ماڵی ئێمە، بۆ بەیانی دووبارە لەگەڵ عەبدولسەلام کۆبووینەوە، نامەیەکی دا بەمن وتی: لەگەڵ مامۆستا تۆفیق بڕۆ بۆ لای عەبدولکەریم قاسم لە (جبل منصور)، بە ئۆتۆمبێل ڕۆیشتین، نامەکەم دا بە عەبدولکەریم قاسم و ئەوم بەجێهێشت لای و گەڕامەوە جەلەولا، ئیتر نازانم لەوێ لە نێوان خۆیاندا چییان ڕێکخست.

٢- ناوی هەندێ ئەفسەری پێدام، وتی: ئەمانە لەگەڵیان هەڵسەو دابنیشە، هەڵیان بسەنگێنە بزانە چەند دڵسۆزن و تا چ ڕادەیەك پشتیان پێ دەبەسترێت، دوایی هەریەکە ڕاپۆرتێکیان لەسەر بنووسە بۆ ئەوەی پەیوندییان لەگەڵ ببەستین، منیش هەڵسام بەو ئیشە، ئیتر نازانم ئەو هەڵسا بەو ئیشە یان نا.

٣- هەندێ کتێبی نهێنی لە دەرەوە هاتبوو، جەمال عەبدولناسر ناردبووی، بە منی سپارد بۆ ئەوەی بیخوێنمەوە و پیشانی ئەو سێ ئەفسەرەی بدەم کە پەیوەندییان هەیەو پاشان بیگێڕنەوە بۆم. ئەم کتێبانە باسی ڕژێمی پاشایەتی و پاشای ئینگلیزی دەکرد، کە عەرەب سوودی لێوەر ناگرێت و، لەگەڵ هەندی فەرمانی عەسکەری.

٤- جارێکیان ناردمی بۆ لای عەقید ڕوکن (خەلیل سەعید) کە ئەفسەری ڕوکنی فیرقەکە بوو، قائید فیرقە نەجیب ئەلڕوبەیعی بوو (خوا لێی خۆشبێ)، کە سەرۆکی هەموو شانەکانی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان بوو، بەڵام گومانی لێکرا لەلایەن مەلیکەوە ناردیان بۆ سعودیەو کرا بە سەفیر، وەك باسمان کرد.

ڕۆژێ پیش شۆڕش واتە ١٩٥٨/٧/١٣ عەبدولسەلام بانگی کردم بۆ ژوورەکەی وتی: دەمانچەیەك وەرگرە لەگەڵ (٢٠) فیشەك، کاتێك دەمانچەکەم وەرگرت وتیان فیشەك نییە، بەڵام کە شەو گەشتینە شاخی حەمرین فەوجەکە وەستا، عەبدولسەلام بە کاك شێخ نوری شێخ ڕەشیدی وت کە هەریەکە (٢٠) فیشەك بدات بە من و سێ کەسی کە.

# ئێزگەی کوردی قاهیرە

وەك وتم: نازانیت خێر کامەیەو شەڕ کامەیە بە جۆرێکی وەها مرۆڤ سەرسام دەکات.

بڕیار وابوو لیواکەمان (لیوای ٢٠) شەوی (٨)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٨ لە جەلەولا بۆ ئوردن بجوڵێت، هەموو شتێك ئامادەکرابوو، بەڵام ڕۆژی دووی حوزەیرانی ١٩٥٨ واتە بە شەش ڕۆژ پێش کاتی ڕۆیشتنەکە، لە ئێستگەی قاهیرە بەشی کوردی کرایەوە، هەموو ڕۆژێك یەك سەعات بوو، سیاسییەکانی عێراق ئەمەیان بەستەوە بە گەڕانەوەی مەلا مستەفا بارزانی بۆ کوردستانی عێراق بە یارمەتی ڕوس و جەمال عەبدولناسر، لەبەر ئەوە بروسکەیەك لە (استخبارات عسکری)یەوە لە بەغدا هات نووسرابوو: (تؤجل حركة اللواء الى اجل غير مسمى). بەم شێوەیە ڕۆشتنەکەی (لیوای ٢٠) دوا خرا، نەوەك لە کورستاندا شتێك ڕوو بدات.

شایەنی باسە ئەگەر ئەم لیوایە ڕۆژی ١٩٥٨/٦/٨ بڕۆشتایە هیچی پێ نەدەکراو شۆڕشی ١٤ی تەمموز ڕووی نەدەدا، چونکە ئەو ڕۆژە مەلیك و عەبدولئیلاه لە تورکیا بوون لە کۆبوونەوەی (حلف)ی بەغدا بوون.

لە پاش هەفتەیەك بروسکەی دووەم هات و ئەمر دەرچوو کە شەوی (١٤.١٣) ی تەمووز لیواکە جەلەولا بە جێ بهێڵێت و ڕووەو ئوردن بڕوات، ئەمەش لە پاش ئەوەی بۆیان ساغ بووەوە کە ئێستگەی قاهیرە هیچ پەیوەندییەکی نییە بە مەلا مستەفا بارزانییەوە.

## کورتەیەك دەربارەی بەشی کوردی ئێستگەی قاهیرە

بەدەستپێشخەری سەرۆکی میسر جەمال عبدالناصر لە ڕۆژی (١٩٥٧/٦/١) لەئێستگەی قاهیرە بەشی کوردی کرایەوە، بارەگاکەی لەشەقامی شەریفەیین بووە لەناوەڕاستی قاهیرە، ساڵی ١٩٦٣ گوێزراوەتەوە بۆ باڵەخانەی ماسبیرۆ، ڕۆژانە یەك کاتژمێر بەرنامەی بەزمانی کوردی هەبووە، کاتژمێر چوار تا پێنجی پاش نیوەڕۆ.

بەرنامەکانی ئەدەبی و داواکاری بیسەران و، هەواڵ و، مێژووی کورد و، هونەری بوو، پەخشەکەی ناوچەکانی کوردستانی لەعێراق و ئێران و تورکیا و سوریا و ئەرمینیا و یەکێتی سۆڤیەت و لوبنان و ئوردن و تەواوی میسر دەگرتەوە.

**لەو کــوردانــەی کاریان تێــدا کرد:**

١- شێخ عومەر وەجدی ماردینی، بەرپرسی بەشی کوردی بوو.
٢- هۆشیار تاهر بابان خەڵکی شاری سلێمانی.
٣- محەمەد حسین خەڵکی هەولێر.
٤- محەمەد کەریم شەیدا خەڵکی سلێمانی.
٥- عبداللە مەعروف خەڵکی شاری مەریوان.
٦- عەدنان حەقی خەڵکی شاری قامیشلو.
٧- عبدالوهاب مەلا خەڵکی شاری عامودا.
٨- عوسمان نۆغرانی خەڵکی شاری هەولێر.
٩- عاصم حسینی خەڵکی شاری عامودا.
١٠- دکتۆر فوئاد مەعصوم.
١١- دکتۆر محەمەد ڕەمەزان عبداللە کەرکوکی.

ئەمانە لەماوەی جیاوازدا کاریان تێدا کردووە و بیسەری زۆری هەبوو رادیۆکە و ئێمەش بەردەوام گوێمان لێدەگرت.

## ئامادەسازی بۆ شۆڕش

عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف یەکیان گرت و پلانی شۆڕشی (١٤)ی تەمووزیان دانا، دوای ئەوە ئەفسەرە ئازادیخوازەکان لە بەغداو شوێنەکانی تر لە ئەرکی سەرشانیان بۆ ڕۆژی ١٤ی تەمموز ئاگادار کران.

لە بەغداوە بڕیار درابوو کە ئەم لیوایە لە کاتی جوڵانی لە جەلەولا هەتا دەگاتە (H٣) لە سنووری ئوردن هیچ جۆرە تەقەمەنییەکی پێ نەبێت، ئەم دووربینییە بۆ ئەوەبوو کاتێك سوپا بە ناو بەغدادا دەڕوات، هیچ جوڵانەوەیەك لە دژی رژێمی پاشایەتی ئەنجام نەدات، جا لەبەر ئەمەبوو نوری سەعید بە ئەفسەرەکەی وت: کە سوپای عێراق شقارتەیەکە وا لە گیرفانیدا، ئاگای لە ئایەتەکەی خوا نەبوو کە دەفەرمویت:

﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾ (الأعراف: ٣٤).

ئەوەی رۆڵی گرنگی هەبوو لە شۆڕشەکە لیوای (١٩) و لیوای (٢٠) بوون، لیوای (١٩) فەرماندەکەی زەعیم روکن عبدالكريم قاسم بوو، هەموو لیواکە لایەنگیری بوون، بەڵام لیوای (٢٠) فەرماندەکەی زەعیم روکن (احمد حقی محمد علی) بوو، ئامر فەوجی (٢) عەقید روکن (ياسين محمد رەئوف) بوو، هەروەها لیوا روکن (غازی داغستاني) قائد فیرقە بوو، ئەم سیانە نەیاری ئەفسەرانی ئازادیخواز بوون، بۆیە لەلایەن زەعیمەوە نەخشەی لابردنیان دانرا.

عەبدولسەلام عارف لە کاتی ئەرکەکانی خۆیدا بە نهێنی فەرمانیدا کە ئەو فیشەکانەی دەدرێن بە سەرباز (بۆ ڕەمیی ساڵانە) نیوەیان بدرێتێ و نیوەکەی تر بشاردرێتەوە بۆ ئەم ڕۆژە.

ڕۆژی (١٣)ی تەمووز هەر لە بەیانییەوە هەموو ئەفسەرەکان ماڵئاواییان لە ماڵ و منداڵیان کرد بۆ سەفەریان بەرەو ئوردن.

ئێوارەی ١٣-١٤ ی تەموز، لیوای ٢٠ لە جەلەولا بوو، ئامادەبوو بۆ دەرچوون و ئەم لیوایە پێکهاتبوو لەم سێ فەوجە:

فەوجی (١) ئامرفەوجەکەی عەقید عەبدوللەتیف دەراجی بوو، کوردبوو سەر بە زەعیم بوو.

فەوجی (٢) ئامر فەوجەکەی عەقید روکن یاسین محەمەد رەئوف نەیاری شۆڕش بوو.

ئەو ڕۆژە پاش عەسر قائید فرقە (غازی داغستانی) و ئامر لیوا (عەبدولکەریم قاسم) هاتن بۆ جەلەولا بۆ پشکنینی لیواکەو ئاگادار کردنەوە و ئامادەبوونیان بۆ ڕۆشتن بەرەو ئوردن.

لۆرییەکی عەسکەری نیوەمان پڕکردبوو لە سندوقە فیشەك، ئەوەی بە دزییەوە هەڵمان گرتبوو، لەسەر فیشەکەکان یاتاغی سەربازەکانمان دانابوو، غازی داغستانی تەماشایەکی ئەم لۆرییەی کرد، داوای کرد بارەکە داگیرێت و سەر لەنوێ بەتەرتیبێکی باش بخرێتەوە سەربارەکە.

عەبدولسەلام وتی: گەورەم ئێمە لە فەلوجە ئەم ناتەواویانە جێبەجێ دەکەین، بەڵام ئێستا کاتمان بەدەستەوە نەماوە. ئەویش هیچ دەنگی نەکرد.

لە پاشا هاتە سەر ئۆتۆمبێلێك تۆپێکی تیابوو، تەماشایەکی عەبدولسەلامی کردو بە پێکەنینەوە وتی: ئەڵێی خۆتان ئامادەکردووە بۆ هەڵگیرسانی شەڕ! ئێمەش ئەوانەی کە بەکارەکەمان دەزانی هەموومان لەوە ئەترساین شتێکی بەرگوێ کەوتبێت.

غازی داغستانی خۆی زیرەك بوو، هەستی دەكرد كە شتێك هەیە، ڕۆژی ١٤ی تەمووز كە شۆڕش سەری گرت و غازییان برد بۆ وەزارەتی بەرگری بۆ لای عەبدولكەریم قاسم، پێی وت: عەبدولكەریم من دوێنێ عەسر كە چووین بۆ جەلەولا ئەم شۆڕشەم لەناو چاوی تۆ و عەبدولسەلام خوێندەوە و دڵم خەبەری دامێ بەم كردەوەیە، ئێستا خەفەتم هەر ئەوەیە كە بۆچی هەڵنەستام بەكاری پێویست بۆ ئەوەهەستەم.

دوای پشكنینەكە قائید بەڕێكرا بۆ بەعقوبە، عەبدولكەریم (ڕەئیس قاسم جەنابی) ڕاسپارد لەگەڵ گەیشتنەوە لە ژوورەكەی خۆیدا بەدیلی بگرێت و بەیانی بیبات بۆ زیندانی ژمارە (١) لە بەغدا.

# شۆڕش چۆن دەستی پێکرد

لیواکە سەعات (٨)ی ئێوارە بەرەو بەغدا کەوتە جووڵە، ئەو نەخشەیەی کە من زانیم ئەوەبوو لیواکە بە هێواشی و لەسەرخۆ بڕوات، بە جۆرێکی وا سەعات (٦)ی بەیانی بگاتە بەغدا، ئامر لیوا (ئەحمەد حەقی)یان نارد بۆ ئەوە لە پێشەوە بچێت شوێنی وەستاندنی لیواکە لە نزیک فەلوجە دیاری بکات بۆ حەوانەوەو چاوەڕوانی بکات تا لیواکە سەعات (٥)ی بەیانی ئەگاتە ئەوێ، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو، چونکە ئامر لیوا پەیوەندی نەبوو بە ڕێکخستنی ئەفسەرە ئازادیخوازەکانەوە، ئاگاداری هیچ نەبوو، ئینجا بە نهێنی لە جیاتی ئەو عەبدولسەلام کرا بە ئامر لیوا.

ئەرکی سەرشانی عەبدولکەریم قاسم، کە ئامر لیوای (١٩) بوو لە (جبل منصور)، ئەوەبوو لیواکەی ئامادە بکات بۆ جووڵانەوە بە ناوی مەشقەوە، بۆ ئەوەی کاتێك لە بەغدا کاتژمێر (٦)ی بەیانی ڕۆژی (١٤)ی تەمموز دەست بە شۆڕش دەکرێت، ئەو لیواکەی ڕووەو بەغدا بێنێ بۆ یارمەتی لیوای (٢٠)، ئەفسەرەکان هەریەکەیان دەمانچەیەکیان دانێ بەبێ فیشەك، منیش یەکێك بووم لەوانەی دەمانچەیان پێدام بەبێ فیشەك.

شایەنی باسە بە سێ مانگ لەوەو پێش عەبدولسەلام پێی وتم: ئەبێ مەشق بکەیت، فێری بەکارهێنانی چەك بیت، بەڵام لەگەڵ سەربازەکان مەشق مەکە، بە (ڕەئیس عورەفا)ی وەحدەی وت: هەموو ڕۆژێك ئیمام لە فەوجەکە ببەرە دەرەوە لە شوێنێك فێری مەشق و بەکارهێنانی چەکە سووکەکانی بکە، بە ماوەی مانگێك ئەوەی پێویست بوو فێربووم و دواتر تا سێ مانگەکە تەواوبوو هەموو ڕۆژێك مەشقم دەکرد.

لەگەڵ کاک شێخ نوری شێخ ڕشید بەیەکەوە ڕۆشتین، لە سەیارەیەکی جێبدا بووین، کاتێك گەیشتینە (جبل حمرین) لیواکە وەستا، عەبدولسەلام بە کاك نوری وت: فیشەکت داوە بەو ئەفسەرانەی کە دەمانچەیان پێیە؟ وتی: نەخێر، وتی: (انت ابن العشائر)، بڕۆ یەکی (٢٠) فیشەکیان بدەرێ.

ئەمەش لەبەر ئەوەی عەبدولسەلام ئەترسا ئەگەر پێشتر فیشەکی بە ئەفسەرەکان بدابایەو غازی داغستانی شتێك بزانێت و لە بەعقوبە شتێك بقەومێت.

ئینجا وردە وردە ڕۆیشتین گەیشتینە بەعقوبە، (انضباط) بە جادەکاندا بڵاوبووبووەوە، هەموو شتێکیش ئاسایی بوو. کە لەپردەکەی بەعقوبە پەڕینەوە شووتییەکمان پێبوو خواردمان، وتم: کاك نوری لەوانەیە ئەمە ئاخیر پاروومان بێت.

کاتژمێر چواری بەیانی لیواکە گەیشتە (خان بنی سعد)، لەوێ وەستا، ئینجا دەستکرا بە دابەشکردنی فیشەکەکان بەسەر سەربازەکاندا بە ناوی ئەوەوە کە مەترسی هەیە لە بەغدا کە دژی چوونی ئەم لیوایە بۆ ئوردن خۆپیشاندان بکرێ.

کە لیواکە لە (خان بەنی سەعد) بوو، عەبدولسەلام بە ئامر لیوا (ئەحمەد حەقی محمد عەلی) وت: جەنابت بۆ ناچیت بۆ فەلوجە، لەوێ ئامادەبیت تا ئێمە دەگەین، من لەجیاتی بەڕێزتان کارەکان دەبەم بەڕێوە، ئەویش پێشنیارەکەی پەسند کرد و لەگەڵ (چابگ رکن)ەکاندا بەرەو فەلوجە کەوتەڕێ، بەم شێوەیە ئەویش دوورخرایەوە.

هەر ئەو ڕۆژە عەبدولسەلام وەستابوو، یاریدەدەرو ئەفسەری مووچەو (من) لە لایەوە وەستابووین، وتی بە ئەفسەرێك: بڕۆ ئامیر فەوجی دوو (عەقید الرکن یاسین محمد ڕەئوف) بانگ کە بۆم، بڵێ ئامیر لیوا تۆی ئەوێ، کە یاسین هات، تەماشای کرد لە جیاتی ئامیر لیوا عەبدولسەلام وەستاوە، پێی وت: ئێستا ئێمە هەڵئەسین بە شۆڕش، تۆش ئەگەر لەگەڵمان بیت ئەوا یان سەردەکەوین و هەموو ئامانجەکانمان دێتەدی، یان شکست دەهێنین و دەبێت لە

هەموو جۆرە بەرپرسیاریەتیەکی ئەو شکستە بەرپرسیار بین، ئەگەر بەشدار نابی ئەو ئۆتۆمبێلە ئامادەیە برۆرەوە بۆ جەلەولا.

عەقید یاسین بە تورەییەکەوە وتی: (أنت شنو؟ امر لواء موجود).

عەبدولسەلام دارێکی حەیزەرانی عەسکەری پێبوو (عصی تبختر) بەرزی کردەوە بەرەو ناوچەوانی یاسین و وتی: (خائن الانكليز انا امر لواء مالك)، رووی کردە یاریدەدەرەکەو ئەفسەرەی مووچەو من و وتی: باڵی ببەستن و دەمانچەکەی لێ بسێنن و بیخەنە ئەو سەیارەی لاسلکییەوە.

بەو جۆرەی پێمان وترا جێبەجێمان کرد، بە منی وت: لای شۆفێرەکە دانیشەو نەیەڵیت لە رێگە کەس پەیوندی پێوە بکات، تا ئەیگەیەننە ئەو شوێنەی لێت وەردەگرن.

ئەوەی شایەنی باسە کاتێك لیواکە گەیشتە خان بەنی سەعد، سەعات چواری بەیانی بوو، لە پێش ئەوە دەست بکەن بە دابەشکردنی ئەرکەکان و دابەشکردنی فیشەك، ئۆتۆمبێلێك لە بەغداوە هات پێنج کەسی تیابوو، پانتۆڵی خاکی و کراسی سپییان لەبەردا بوو، وتیان: ئەمە یەکێکیان (وصفی تاهیر)ە، ئەوەیە کە لەگەڵ نوری سەعیدا هاوەڵی دەکات، ئەوی تریان (ئیبراهیم لامی)یە، کە لە دادگای مەهداویدا بوو بە ئەندام، ناوی ئەوانی ترم لە بیر نەماوە، وتیان بە عەبدولسەلام لە بەغدا هەموو شتێکمان جێبەجێ کردووەو ئامادەیەو کۆنترۆڵی بنکەکانی پۆستەو گەیاندن کراوە، هیچ شتێکی وانییە جێگەی مەترسی بێت.

کاتێ عەبدولسەلام دەستی کرد بە دابەشکردنی ئەرکەکان، ئامر فەوجی یەك (عەبدوللەتیف دەراجی) لەلیوای (٢٠) ئەویش لە ئەفسەرە ئازادیخوازەکان بوو دەرکەوت و ئەفسەرەکانی فەوجەکەی خۆی کۆکردەوەو نیازی شۆرشەکەی ئاشکرا کرد، هەمان قسەکەی عەبدولسەلامی وتەوە، ئەگەر سەرکەوتین ئەوا بۆ هەمووانەو ئەگەر شکستمان هێنا بەشداری هەموو ئەنجامێکی ناخۆش دەکەین، ئێوەش بە ئارەزووی خۆتانە، ئەوی ئەیەوێت لەگەڵمان بێت، ئەوەشی نایەوێت بگەرێتەوە جەلەولا.

لە کاتی ئەم قسانەدا ئەفسەرەکان سەرسام بوون، کەس قسەی نەکرد تەنها ئەفسەرێك نەبێت (ڕەئیس ئەوەل محمد) کە لێپرسراوی ئیستیخباراتی لیوا بوو، وتی: "سیدی قضیة الانكلیز"، وتی: (احنا دراسین قضیة الانكلیز)، ئەمە دواتر باسی دەکەم.

لە خان بەنی سەعد دەرچووین بۆ کاتژمێر شەشی بەیانی گەیشتینە بەغدا، هەریەکێکمان چوو بەرەو ئەنجام گەیاندنی ئەرکی خۆی، ئەو ئۆتۆمبێلەی کە (یاسین محمود ڕەئوف)ی تێدابوو، کاتێ لە پردی (باب الشرجی) پەڕینەوە ئەوبەر، دوو ئەفسەر هاتن وتیان بە من تۆ لێرەدا دابەزە لەگەڵ سریەی یەکی فەوجی (٣) بچۆ بۆ (قوة السیار) لە صالحییە، منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم، سەربازەکانی ئەو (سریە)یە هەموو تازەو نەزان بوون، زۆر ئەترسان، دابەش کران بەسەر (قوة السیار)دا، یاردەدەری ئامیر فەوج (فازیل محمد عەلی) کە کرابوو بە ئامر فەوج لە جێی عەبدولسەلام، هات لەگەڵمان بۆ (قوة السیار)، بە پاسەوانی بەردەرگای ئێستگەی وت: کوا یاریدەدەری خەفەر؟ پاسەوانەکە ویستی دەست بکاتەوە، ئەویش تفەنگەکەی لێ سەندو چەند زللەیەکی لێدا، لە پاشاندا چووە ژوورەوە، بە یاریدەدەری خەفەری وت: کلیلی (مەشجەبەکەم) بدەرێ، لێی سەندو لە پاشدا وتی بە ئێمە: (هذا واجبكم).

ئێمەش ئەوەی لەناو دەرگاکەبووین ئامر سریە (نەجیب موحەممەد) و (ملازم عەبدوڕڕەحمان) و من بووین، کاتێ (فازیل موحەممەد عەلی) ڕۆیشت بۆ سەر خانووەکەی نووری سەعید، لەپڕ ئامر سریەکە نەما، لە مەیدانی مەشقی هێزی گەڕۆکدا ون بوو، دیاربوو خۆی شاردبووەوە، بە نیازی ئەوەی ئەگەر شۆڕشەکە سەرکەوت ئەوە یەکێکە لە پاڵەوانەکانی، ئەگەر سەرنەکەوت هیچ شتێکی ناکەوێتە سەرشان.

هەروەها (ملازم عەبدوڕڕەحمان) بە ناوی چاودێری سەربازەکانەوە دەرگاکەی بەجێ هێشت، من مامەوە بە جبەو مێزەرەوە لەگەڵ (نائیب زابتێك) کە ئەویش نائیب زابتی حانووت بوو، ناوی عەبدوڵلا بوو، چارم نەما چووم جبەو مێزەرەکەم فڕێدایە ناو سەیارەی حانووتەکەوە و، لەبەر دەرگای هێزی گەڕۆك وەستام،

تەنیا دەمانچەیەك و بیست فیشەکم پێبوو، بەڵام سەربازێك و ئەو نائیب زابتە لەگەڵم وەستان.

کە تەقە دەستی پێکرد لە شاری بەغداو یاریدەدەرەکان یەکە یەکە هاتن بۆ هێزی گەڕۆك، هەریەك ئەهات دەمانچەی پێبوو، دەمانچەکەم لێوەرئەگرت و پێم ئەوت: بچۆرە ژوورەوە لای یاریدەدەری ئێشکگر، دوانیانم خستە باخەڵی خۆمەوە، دوانیانم دایە نائب زابت عەبدوڵلا، دوایی یەکێکیانی دزی و ئینکاری کرد، سیان لە دەمانچەکانم دا بە وەهاب، کە کابرایەکی مەدەنی و لێپرسراوی حانووت بوو، وتم: ئەمانە ئەمانەتە هەڵیانگرە.

ئەو یاریدەدەرانەی دەمانچەکانم لێ سەندن هیچیان بەربەرکانییان نەکردم، یەکێك نەبێت کوردی خەڵکی سلێمانی بوو، معاون عەمید بوو، ناوی عەلی بوو، دەمانچەکەی پێ نەدام، منیش پێم وت: خۆ ئێمە سوپای داگیرکەر نین، دەمانچەکەت لێوەر دەگرم و دوایی بۆتی ئەگێڕمەوە، هەرچۆن بوو لێم وەرگرت و کردمە ژوورەوە لای یاریدەدەری خەفەر.

تا سەعات (١٠)ی بەیانی شۆڕشەکە تەواو بوو یەك ئەفسەر نەیوێرا بێت بە لای ئەو دەرگایەدا، چونکە کەس نەیدەزانی چی دەبێت و چی نابێت، لەو کاتەدا مودەڕەعەیەك هات وەستا، لەوانەبوو کە عەبدوڕڕەحمان عارف ئامریان بوو، ئەفسەرێك بەسەر مودەڕەعەکەوە بوو ناوی موسا بوو پلەی ڕائید بوو، لە مودەڕەعەکە دابەزی و ئەملاو ئەولای ماچ کردم وتی: هەموو شتێك تەواو بوو، مەلیك و عەبدولئیلاه تەواوبوون، کوژران، لیواکەی عەبدولکەریم قاسم گەیشتە بەغدا، لەگەڵ لیواکەی خۆمان کۆنترۆڵی هەموو شتێکمان کردووە.

ئینجا منیش چووم جبەو مێزەرەکەم لەبەر کردەوە، چووم بە یاریدەدەرکانم وت وەرنە دەرەوە، لەو کاتەدا بەکوردی قسەم لەگەڵ سەربازێك دەکرد، موعاون عەلی گوێی لێبوو، وتی: ئەوە تۆ بووی دەمانچەکەت لێ سەندم؟ وتم بەڵێ، وتی: بە خۆم و خزمەکانمەوە بە قوربانی ڕۆڵەی کورد بین، کورد وەك ئاردی گەنم وایە، هەموو شتێکی لێ پەیدا دەبێت.

**ئەفسەرە کوردە بەشدارەکانی شۆڕشی (١٤)ی تەمموز**

١- رەئیس مستەفا عبدالله.

٢- رەئیس نوری رەشید عەبابەیلێی.

٣- رەئیس رەسول مجید بەگ.

٤- عەقید عبدالله سعید.

٥- عقید عادل جلال (خەڵکی خانەقین).

٦- عەقید فتاح سعید شالی.

٧- مقدم علی محمد شریف (ناسراو بە حەمەعەلی خاڵە).

٨- عەبدوللەتیف الدراجی (کوردی بەغدا).

٩- زەعیم روکن محی الدین عبدالحمید (دایکی کوردە، بەغداییە).

١٠- مستەفا زەڵمی (ئیمام).

# ڕۆژانی سەرەتای سەرکەوتنی شۆڕش

## ڕوداوەکانی ١٤ ی تەمموز

سەعات پێنج و چارەکی بەیانی ئەو ڕۆژە، کۆمەڵێك لە ئەفسەر و سەربازەکانی (ف٣- ل٢٠) گەیشتنە ئێستگە و پاسەوانەکانی ئێستگەیان دەستبەسەر کرد کە چوار پۆلیس بوون، هەندێکی تر ویستیان بەربەرەکانی بکەن، بەڵام هیچیان بۆ نەکرا و بێ هیچ تەقەیەك ئێستگە گیرا.

لەپاشان دوو کەس لە موەزەفەکانی ئێستگە هاتن و وتیان ئێمە ئامادەین بۆ هەر فەرمانێك ئێوە بیدەن.

١٤ی تەمموز لە کاتژمێر ٦ ی بەیانی شۆڕش دەستی پێکرد، لە کاتژمێر ٧ ی بەیانی کارە سەرەکییەکان تەواو بوو، لەبابەت لەنابردنی خێزانی شایی و دەستکێشانی سوپا بەسەر بەغدا و شوێنەکانی تری عێراقدا.

لەپاش کاتژمێر ٧، سەرۆکی گشتی هێزە چەکدارەکان بەیانی ژمارە یەکی دەرکرد و لە بەیانەکەیا ئیعلانی جمهوریەتی عێراقی کرد و لە بەیانەکەدا وتی عێراق جمهوریەتێکی گەلییە، دەست ئەگرێ بە یەکێتی عێراقییەوە یەکیەتیەکی تەواو. ئەبەستێ -بەستنێکی برایەتی و دۆستایەتی- بە دەوڵەتە عەرەبەکان و دەوڵەتە موسڵمانەکانەوە وە بە بەندەکانی کۆمەڵە یەکگرتووەکانیش ئەچێ بەڕێوە، وە ئەبەسترێ بە پەیمان و یەکگرتنەوە بەپێی سودی نیشتمان. هەروەها بە بڕیارەکانی موئتەمەرەکانی (باندۆنغ)یشەوە.

ئەو بەیانە بۆ یەکەم جار بڵاوکرایەوە بەبۆنەی بەرپابوونی شۆڕشی پیرۆز و دامەزراندنی جمهوریەتەکە، سەعات (٩)ی بەیانی، عقید عبدالسلام لەئێزگە

بڵاوی کردەوە، ئیعلانی جمهوریەتی پیرۆز کرد و بانگی روخانی خێزانی شایی دا، داوای لە نیشتمانییەکان کرد کە بێنە دەرەوە بۆ سەر شەقامەکان و بانگەواز بکەن بە روخاندنی خێزانی پادشایی و نۆکەرەکانیان، بیرو هەست و پشتیوانی خۆیان دەربڕن بەرامبەر بە شۆڕش.

لەپاشا، عقید عبدالسلام هاتە دەرەوە لەبەر دەرگای ئێستگە، لەبەردەمی زیاتر لە هەزار نیشتمانییا وتارێکی دا، پێی وتن کەوا خوا بەدڵی گەل ئاواتەکەیانی هێنایە دی و خێزانی پادشایی و ئیستعمار و نۆکەرەکانی ئیمڕۆ دواکۆچیان بوو، بۆ جاری تر ناگەڕێنەوە، ئەمڕۆ ئەو رۆژەیە کە مۆتەکەی ئیستعمار و نۆکەرەکانی بەریداین و لەمەوپاش بەگوێرەی ئارەزوی گەل پەل ئەوەشێنین بۆ پێشەوە بۆ هاتنەدی ئاواتەکانی گەل. ئەم جمهوریەتە لە گەلەوەیە و بۆ گەلە، شان بەشانی سوپاکەتان بچنە پێشەوە بۆ پاککردنەوەی ئەم خاکە پیرۆزە لە هەموو شتێك کە زیانی بۆ ژیانی پڕ لە کامەرانی گەل بێ.

پارچەکانی سوپا لە هەموو ناوچەکانی عێراقدا پشتیوانی خۆیان راگەیاند بۆ ئەم جوڵانەوەیە، لەپاش رابوردنی یەك سەعات بەسەر شۆڕشەکەدا، هێمنی و ئاسایشێکی تەواو کەوتە ناوخۆی وڵاتەوەو فەیسەڵ و عەبدولئیلاە کوژران.






بەیانی ژمارە (٢) پێکهێنانی ئەنجومەنی سیادە بوو کە دەسەڵاتی سەرۆك کۆماری هەیە، ئەم ئەنجومەنە پێکهات بە سەرۆکایەتی فریق (نجیب ربیعی) و ئەندامانی سیادەی (محمد مهدی کبە) و سیادەی (خالد نەقشبەندی).

مەرسومی جمهوری ژمارە یەك دەرچوو بە پێکهێنانی یەکەم وەزارەتی جمهوری عێراق، بە دانانی زەعیم روکن (عبدالکریم قاسم) بە قائیدی گشتی قواتی مسلحە، بە دانانی عەقید روکن (عبدالسلام محمد عارف) بە معاونی قائیدی قواتی مسلحە، بەم گوێرەی لای خوارەوە:

| | |
|---|---|
| سەرۆکی وەزیران و وەزیری بەرگری و قائیدی قوات مسلحە | عبدالکریم قاسم |
| نائبی سەرۆك وەزیران و وەزیری ناوخۆ | عبدالسلام محمد عارف |
| وەزیری مالیە | محمد حدید |
| وەزیری دەرەوە | د. عبدالجبار جومرد |
| وەزیری عدلیە | مستەفا عەلی |
| وەزیری ئابوری (اقتصاد) | د. ابراهیم کبە |
| وەزیری زانستی (معارف) | د. جابر عمر |
| وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی | زعیم رکن ناجی تالب |
| وەزیری گواستنەوەو ئیش و کار (المواصلات والاشغال) | بابا علی شێخ محمود |

| | |
|---|---|
| وەزیری ئاوەدانکردنەوە (اعمار) | فوئاد رکابی |
| وەزیری لەش ساغی (صحە) | د. محمد صالح محمود |
| وەزیری کشتوکاڵ | هدیب حاجی حمود |
| وەزیری شارەزایی (ارشاد) | محمد صدیق شنشل |

ئەحکامی عورفی راگەیەنرا بۆ ئەوەی بێگانە هەندێ کەس نەکا بە کوتەکی دەستی بۆ تێکچونی ئیشوکاری ناوخۆ، رێگا نەدرێ هیچ بێگانەیەك جارێکی دیکە دەستدرێژی بکاتە سەر ئەم نیشتمانە، کلکەکانی ئیمپریالیزم ماوەیان پێ نەدرێ لەم کاتە ناسکەدا ببنە هۆی دوبەرەکی و تێکدانی ئاسایش.

بە مەرسومی جمهوری ژمارە دوو، (زەعیم أحمد صالح عبدی) کرا بە سەرۆکی ئەرکانی گشتی سوپا، لەگەڵ دانانی پایە سەربازییەکانی دیکە.



جمهوریەتی عێراق دانی نا بە جمهوریەتی عەرەبی یەکگرتوودا، کە حکومەتی پێشوو دانی پیا نەنابو و بە چاوی دوژمنایەتی تەماشای ئەکرد، بە هەمان چاوی جولەکە تەماشی مصر و سوریای ئەکرد، بەڵکو خراپتر. ئەو هێرشانەی ئێستگەی کۆنی بەغدا ئەیبردە سەر کاربەدەستەکانی جمهوریەتی عەرەبی یەکگرتوو، هیچ ئێستگەیەکی تر لە جیهانا هێرشی وای نەدەبردە سەر دوژمنی خۆی. هەموو ساڵێك دوو بەشی پارەی عێراق لە پیلانگێرانا بەخت ئەکرا بۆ لەناوبردنی ئەو جمهوریەتە، نەوەك رۆژێك بێ عێراقیش بەو پایە بگات.

ئەنجومەنی سیادە بەرقیەی نارد بۆ سەرۆك جەمال عبدالناصر و هەست و دان پیانان و پشتیوانی جمهوریەتی تازەی عێراقیان پیشان دا بەرامبەر بە جمهوریەتی عەرەبی یەکگرتوو.

کاتێك سەرۆك جمال عبدالناصر بانگی شۆڕشەکەی عێراقی بیست لە یۆغسلافیا بوو، ٢٤ سەعات پێش تەواوبوونی ماوەی زیارەتەکەی گەڕایەوە بۆ مصر.

سەرۆکی وەزیران هاتنەدەرەوەی عێراقی لە یەکێتی هاشمی (یەکیەتی عێراق و ئوردن) ڕاگەیاند، کە بۆ سودی ئیستعماری کرابو، بۆ پاراستنی عەرش و کورسی گڵاوی پڕ لە خیانەت کرابوو، هەرچی پەیوەندی سامانی و سوپایی لەبەینی هەردوولادا بەتاڵ کرایەوە.

هەموو نیشانەکانی دەوری روخاویان لابرد وەکو داگرتنی ڕەسمی فیصل و عبدالإله لە دائیرەکانی حکومەتا و هەرچی پەیکەری ئەوان هەبوو روخاندیان.

بڕیاردرا نوێنەری دائمی عێراق (د.عبدالمجید عباس) سحب بکرێ و لە جێگەیا (هاشم جواد) دابنرێ.

لەماوەی ١٤ و ١٥ ی تەموزدا پۆلیس هیچ شکاتێکی نەئەپرسی.

سەرچاوەیەکی بەرپرس لە ئەنجومەنی حیلفی ئەتلەسی رایگەیاند کە شۆڕشەکەی عێراق دائیرەکانی ئیستخباراتی رۆژئاوای سەرسام کرد، چونکە نەیانتوانی بەهیچ جۆرێك لەشتێك بگەن لەپێش بەرپابوونی.

(مشیر عبدالحکیم عامر) قائیدی قواتی مسلحەی جمهوریەتی عەرەبی یەکگرتوو برقیەی پیرۆزبایی نارد بۆ زەعید عبدالکریم قاسم.

رەشید عالی گەیلانی برقیەی پیرۆزبایی نارد بۆ ئەنجومەنی سیادە و نیدایەکی ئاراستەی گەلی عێراق کرد.

یەکەم دەوڵەت لە جیهاندا دانی بە جمهوریەتی عێراقدا نا، جمهوریەتی عەرەبی یەکگرتوو بوو، سەرۆك جمال عبدالناصر برقیەی دان پیانانی خۆی و گەلەکەی بە جمهوریەتی عێراق دا نارد بۆ ئەنجومەنی سیادە.

**١٦ی تەممــــوز:**

روسیا دانی نا بە جمهوریەتەکەی عێراقدا و مسیۆ خرۆشجیف سەرۆک وەزیرانی سۆڤیەتی بەرقیەیەکی پیرۆزبایی نارد بۆ عبدالکریم قاسم.

چینی میللیش دانی بەم جمهوریەتەدا نا، بەم جۆرە ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی دانیان پێدا هێنا گەیشتە سیان.

عبدالناصر هۆشیاریی دایە ئەمریکا و وتی هەر دەستدرێژییەک بکرێتە سەر جمهوریەتی عێراق، بە دەستدرێژیی دەزانین کە بکرێتە سەر جمهوریەتی عەرەبی یەکگرتوو.

فەریق نەجیب روبەیعی لە جەددەوە گەڕایەوە بۆ عێراق و عبدالکریم قاسم و عبدالسلام عارف لە فڕۆکەخانە لە پێشوازیدا بوون.

نەجیب روبەیعی یەکەم ئەندامی ئەفسەرانی ئازادیخواز بوو، بەڵکو سەرۆکی ئەفسەرەکان بوو، هەر لەسەرەتاوە خۆی و (حبیب روبەیعی) برای لەگەڵ ئەفسەرەکاندا بوون، ئەوەبوو کە هەست بە نیشتمان پەروەرییەکەی کرا، لەلایەن خێزانی پادشاییەوە دوریان خستەوەو بەناوی سەفیر ناردیان بۆ حیجاز.

بەر لەوەی بڕوات، لەگەڵ ئەفسەرە ئازادیخوازەکان کۆبۆوەو وەتی: ئەگەر ئەڵێن ئیستقالە دەکەم و ناچم، ئەمانیش وایان بەباش زانی کە بڕوات، تا بزانن هەلێک دێتە پێشەوەو بگەڕێتەوە، ئەوەبوو بەو شێوەیە گەڕایەوە.

دکتۆر جابر عمر وەزیری زانستی لە دیمەشق گەڕایەوە.

رتلی (هادی) کە برابوو بۆ ئەردەن گەڕایەوە ناو جمهوریەت.

هەر بەهۆی ئەم گۆڕانکاریەوە، (بنگریۆن) سەرۆک وەزیرانی جولەکە داوای زەماناتی تازەی لە دەوڵەتە رۆژئاواییەکان کرد.

کاربەدەستە دیبلۆماسیەکان ئاسودەیی خۆیان پیشان دا بەرامبەر بە ئارامی و ئاسایش لە جمهوریەتە تازەکەی عێراق.

**١٧ تەممـــوز:**

عبدالكريم تەلەگرافی نارد بۆ (خرشجيف) سەرۆك وەزيرانی دەوڵەتی شۆرەوی (روسيا) و (شوان لای) سەرۆك وەزيرانی چينی ميللی، داوای دوبارە دەستپێكردنەوەی ئاڵوگۆڕی نوێنەری دبلۆماسی كرد.

چوار دەوڵەتی تر دانيان بە جمهوريەتی عێراقدا نا كە بريتی بوون لە (يوغسلافيا، پۆڵەندا، چيكۆسلۆفاكيا، رۆمانيا).

**١٨ تەممـــور:**

كۆشكەكەی نوری سەعيد زۆر شتيان شكاند و برد، بەڵام شتی گرنگی كە نوسرا (٧) شێری ئاڵتونی بوو لەگەڵ ١٨ تفەنگ، هەروەها ئۆتۆمبێل و زۆر شتومەكی ناو ماڵەكەی شكێنرا.

داردەستێكی مەليك فەيسەڵم دی، وتيان پێنج هەزار ديناری تێچووە، لە ئاڵتون دروست كرابوو، لەسەرەكەی نوسرابوو:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِ ﴾[(١)].

منيش وتم: بەڕاستی مەليك فەيسەڵ لەكاتی خۆيا هەر بەپێی ئەم ئايەتە نەجولاوەتەوە.

**٢٧ ی تەممـــوز:**

دەستوری كاتی جمهوريەتی عێراق راگەيەنرا و عەبدولسەلام لە ئێستگەی تەلەفزيۆن خوێنديەوە.

---

(١) سورة النساء: ٥٨

# ئینگلیز و شۆڕشی (١٤) تەمموز

**ئەو بەڵگانەی پیشانی ئەدەن کە ئینگلیز ئاگای لە شۆڕشی (١٤)ی تەمموز بوو:**

١- ڕۆژی ١٤ی گەلاوێژ سەعات (٤)ی بەیانی لە خان بەنی سەعد ئامر فەوجی یەك عەقید (عەبدوللەتیف دەراجی) بە ئەفسەرەکانی وت کە نیازی شۆڕشی هەیە، ڕەئیس ئەوەل (ڕائید) موسا کازم وتی: "سیدی، قضیة الانکلیز؟"، ئەویش وتی: "احنا دارسین قضیة الانکلیز".

٢- نوری سەعید کە (٤٠) ساڵ خزمەتی ئینگلیزی کردبوو، دوای شۆڕشەکە سێ ڕۆژ لە ماڵان خۆی شاردەوە لەسەر ئەو بنچینەیەی کە ئینگلیز بە نهێنی ڕزگاری بکات و لە بەغدا بیباتە دەرەوە، کەچی ئینگلیز هیچی بۆ نەکرد هەتا گرتیان و کوشتیان و هەرپەلێکی لە شوێنێك فڕێدرا، قەبریشی بەنسیب نەبوو.

٣- لە (١٩٦٧-١٩٦٨) کاتێك لە بەغدا خۆم ئامادە کرد بۆ خوێندنی ماجستێر، پێویستم بە کتێبێك بوو، دەستم نەدەکەوت، پێیان وتم ئەم کتێبە لای عەبدوڵلا صۆفی هەیە، ئەم پیاوە یەکێك بوو لە بنەماڵە گەورەکان لە بەغداو پەیوەندی کۆمەلایەتی زۆری لەگەڵ نەجیب ئەلڕوبەیعی هەبوو.

ڕۆژێ چووم بۆ ماڵیان، کە زانی کوردم دەستی کرد بە هەندێ قسە لەگەڵما، وتی: ئێستاش و کاتی مەلیکیش هەر ئینگلیز حوکمان دەکات، هەر شتێك ڕای ئینگلیزی لەسەر نەبێت نە عەبدولکەریم و نە عەبدولسەلام نەیاندەتوانی بیکەن و، نە لێپرسراوەکانی ئێمەش شۆڕشیان کرد لە دژی ئینگلیز، ئێستاش بە پێی چاودێری ئینگلیز ئێمە ئەبێ بجولێینەوە، وتی: شتێکت بۆ

ئەگێڕمەوە، وتم فەرموو.

وتی: کاتێك دادگای گەل حوکمی دا بە لە سێدارەدانی نازم طبقچلی و هاوڕێکانی، ئەفسەرەکان بە منیان وت کە بچم لای نەجیب ئەلرٍوبەیعی کە سەرۆکی (مجلس السیادة) بوو، بۆ ئەوەی داوای لێ بکەم حوکمی لە سێدارەدانی لەسەر هەڵگرن، وتی: کاتێ چووم باسی بابەتەکەم لەگەڵ کردەوە، هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: تۆ چەند دەستت ئەڕوات لەم ئیشەدا، منیش ئەوەندە دەسەڵاتم هەیە، نەك هەر من بەڵکو عەبدولکەریم قاسمیش ناتوانێ ئەو حوکمە بگۆڕێ. زۆر سەرم سوڕما، هەوڵمدا پێم بڵێت بۆچی ناتوانرێت، بەڵام باسی نەکرد.

لە پاشا هەڵسام و هاتمە دەرەوە، ئەبینم خالد نەقشبەندی، کە یەکێك بوو لە ئەندامی مەجلیسی سیادە، لەبەردەرگای ژوورەکەی وەستابوو، چووم بۆ لای و سەلامم لێ کرد، پێی وتم: فەرموو تۆزێکیش لای ئێمە دانیشە، کە دانیشتم و قاوەمان خواردەوە، پێی وتم: ئیشت چیبوو بە فەریق نەجیب؟ وتم: بۆ ئیشێکی وەها هاتبووم، ئەویش وتی: ناتوانم هیچ بکەم، کاك خالید وتی: ڕاست دەکات، بڕوای پێ بکە، بەڵام پێی نەوتی لەبەر چی؟ وتم: باسی نەکرد.

وتی: کەوابوو من بۆت باس دەکەم:

کاتێ نازم تەبەقچلی لە کەرکوك قائید فیرقە بوو، کۆمۆنیستەکان هەڵسان بە گێرەشێوێنی لە کەرکوك، زۆرێك لە خەڵکی بێتاوان کوژران.

نازم کە لەوێ لێپرسراوی سوپا بوو، بروسکەیەکی دا بە عەبدولکەریم قاسم و وتی: بارودۆخ زۆر خراپەو لە کۆمپانیای نەوتەکە لایەنێك هەیە چەك و تەقەمەنی ئەدات بە کۆمۆنیستەکان، کە بەم ئیشە نارەوایانە هەڵدەستن، وتی: وەڵامیان نەدایەوە.

بۆ جاری دووەم بروسکەکەی دووبارە کردەوە، بەڵام هەر وەڵامی نەبوو، بۆ جاری سێیەم هێزێکی برد لەگەڵ خۆی بۆ کۆمپانیای نەوت، دەوری گرت، کاربەدەستەکانی گرت و دەستی گرت بەسەر چەکەکاندا، لە پاش ماوەیەك

گرتیان بە ناوی ئەوەوە کە پیلانی گێڕاوە بۆ گۆڕینی ڕژێم و لابردنی عەبدولکەریم.

وتی: ئێستاکە حوکم دراوە بەوە لە سێدارە بدرێ، لەسەر داوای ئینگلیز ئەبێ خۆی و هاوڕێکانی هەموو لەناو بچن، نە نەجیب ئەلروبەیعی و نە عەبدولکەریم قاسم ناتوانن ئەو حوکمە بگۆڕن، چونکە گۆڕینی حوکمەکە ئەبێتە هۆی گۆڕینی خۆیان.

٤- بە شایەتی شای ئێران: کاك (عەبدوڕڕەحمان خانی جیهان بەخش) ئاغای قۆرەتوو سەرۆکی هۆزی (جمور) شوێنەکەی خۆیان بەجێهێشتوو،ماڵیان هاتە بەغدا بەرامبەر ماڵی ئێمە خانوویان بە کرێ گرت، بووین بە دراوسێ، ئەم پیاوە مرۆڤێکی خانەدان و لێزان بوو، ڕەوشتی لە هی ئاغای نەدەکرد، هەردەم و لەگەڵ هەموو کەسدا بە ڕووی خۆش و لەسەرخۆ رەفتاری دەکرد.

ڕۆژێ بۆی گێڕامەوە وتی: ساڵی ١٩٥٨ لە پاش شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ کۆمۆنیستەکان لە دژی ئاغاکانی ناوچەی خانەقین و کفری و کەلار هەڵسان، ئینجا ئاغاکانی ئەم ناوچەیە لەگەڵ ئاغاکانی کەلار (جافەکان) بڕیاریاندا بە ماڵ و خێزانەوە عێراق بەجێ بهێڵن و بچنە ئێران، خوالێخۆشبوو داودبەگی جاف بە نوێنەری هەموویان ڕۆیشت بۆ لای شای ئێران (موحەممەد ڕەزا پەهلەوی) بۆ ئەوەی ڕێگەو شوێنێکیان بۆ دابنێ، شا بە داودبەگی وتبوو من زۆرم پێخۆشە هاتوونەتە ئێران و ئێرە بە وڵاتی خۆتان بزانن، من سەفەرێکم هەیە بۆ بەریتانیا (لەندەن)، کاتێك گەڕامەوە هەموو ئارەزوویەکی ئێوە بەجێ دێنم، بەڵام بە مەرجێك چەك و تەقەمەنیتان دەدەمێ کە هێزێك پێکەوە بنێن لە سنووری ئێران و عێراق بۆ ئەوەی شەپۆلی کۆمۆنیستەکان نەگاتە ئێران.

کاتێك شا گەڕایەوە، ناردی بەدوای ئێمەدا و پێی وتین: من بەڵێنێکم دا بەئێوە، ئێستا پەشیمانم، چونکە وامزانی دەوڵەتی شوورەوی پشتگیری شۆڕشی عێراقی کردووە، بە پشتیوانی ئەوەوە کراوە بۆ ڕاکێشانی عێراق ڕووەو کۆمۆنیستی، بەڵام لە لەندەن، ئینگلیزەکان دڵنیایان کردم کە پەیوەندی ئینگلیز لەگەڵ عێراق

لە پاش شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ گەلێك پتەوترە لەکاتی ڕژێمی مەلیك، ئێستاش ئێوە بە ئارەزووی خۆتان بجولێنەوە، ئەوەی ئەمێنێتەوە ئەوە ئێمە لاریمان نییە، ئەوەش دەڕواتەوە بۆ عێراق با بگەڕێتەوە.

٥- عەلی سالح سەعدی کە یەکێك بوو لە ئەندامە بالاکانی حیزبی بەعس، دوایی نێوانی لەگەڵ حیزب تێکچوو، چوو بۆ لوبنان، لەوێ لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیدا رایگەیاند کە: لە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بە شەمەندەفەری ئینگلیز هاتن، لە ١٤ی رەمەزان (١٩٦٨/٢/٨) بە شەمەندەفەری ئەمریکی هاتن.

## ڕژێمی پادشایەتی و کورد

ڕژێمی پادشایەتی چاکەی هەبوو بۆ کورد، هەروەها خراپەشی زۆر بوو، وەك لەم خاڵانەدا باسی دەکەم:



### چاکەکانی ڕژێمی پادشایی

یەکــەم: ئاسایش و ئاسوودەیی دانیشتوانی کوردستان، هەرچەندە هەژاری و نەخوێندەواری زۆر بوو بەتایبەتی دێهاتەکانی، بەڵام هەموو کەس ئێوارە کە لەئیش دەگەڕایەوە بەبێ غەم لە ماڵەوە دادەنیشت تا بەیانی ترسی لەوە نەبوو کە یەکێك بێت و دەستدرێژی بکاتە سەری، یان دزی لێ بکات، یان زیان بە مەڕو ماڵاتەکەی بگەیەنێت، ئاشکرایە ئاسایش و ئاسوودەیی دڵ لە هەموو شتێك گرنگترە بۆ ژیانی مرۆڤ.

**دووەم:** لە پاش دەوڵەتی عوسمانی هیچ کات کورد بە ئاشکرا کوردێکی نەکوشتووە، ئەگەر یەکێك یەکێکی بکوشتایە لە هەموو کوردستاندا دەنگی ئەدایەوە.

**سێیەم:** مرۆڤی کورد کاتێك لەگەڵ عەرەب کۆئەبوویەوە هەستی بە جیاوازی نەئەکرد، بەڵکو لە ڕێگای ژن و ژنخوازییەوە زۆر لە عەرەب و کورد بوون بە خزم، هەروەها لە ڕێگەی بازرگانییەوە هاتوچۆی کوردو عەرەب بۆلای یەکتر زۆر بوو، ئەم تێکەڵبوونە بێ جیاوازییە لەسەرەتای ئیسلامەوە بوو بە هۆی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بۆ نموونە: لە کاتی دوژمنایەتی عەباسییەکان و عەلەوییەکان زۆر لە عەلەوییەکان عەرەبستانیان بە جێهێشت و هاتنە کوردستان، زۆریان دەیانوت ئێمە لە نەوەکانی حەسەن و حسێنین بۆ ئەوەی ڕێزیان زیاتر بگرن.

**چوارەم:** هەر کوردێك لەسەر ئاو و زەوی باو و باپیری خۆی ئەژیا، ئەگەر هەژاریش بووایە هەستی بە ناخۆشی نەئەکرد، چونکە دڵی پەیوەندی بەستبوو بەو خاکەوە کە تیایدا پەیدابوو، هەردەم خۆی بەکامەران و بەختیار ئەزانی، هیچ ڕۆژێك ڕژێمی پادشایی داوای نەکردووە لە کوردێك شوێنەکەی خۆی بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی تر، ئەگەر شتێك بووبێت تەنیا (کەسەکە) خۆیان بردووە بۆ شوێنی تر، وەك خوالێیخۆشبێت (شێخ مەحمودی نەمر) ماوەیەك هێنایانە (عانە)، هەروەها خوالێیخۆشبێت (مەحمود خانی هەورامان) لە دزڵییەوە هێنایانە کەرکووك بۆ ماوەی چەند ساڵێك دەست بەسەر بوو.

**پێنجەم:** زۆرترین موچەخۆرەکانی دەوڵەت کورد بوون، زۆرشوێنی بەرزی گرنگ هەبوو کوردەکانی تێدا بوو، وەك خوالێیخۆشبێت (سەعید قەزاز) پێش شۆڕش (وەزیری ناوخۆ) بوو، فەریق (ڕەفیق عارف) (رئیس ارکان جیش) بوو، فوئاد عارف یاوەری تایبەتی مەلیك غازی بوو، لە بیرەوەری مندا سێ کورد بوونە وەزیری بەرگری، کە ئەمانەن: نورەددین مەحمود، بەکر صدقی، ئەحمەد موختار بابان.

پارێزگاکانی کوردستان و بەڕێوەبەری پۆلیسەکان کورد بوون، ئەتوانین بڵێین حوکمی زاتی درابوو بە کورد لە ژێر سایەی ڕژێمی مەلیکدا.

**شەشەم:** لەبەر ئەوەی کورد زیاتر هەوڵئەدات و زیرەکترە، ئەگەر ڕژێمی پاشایەتی بمایە ئێستا ژمارەیەکی زۆری کاربەدەستانی حکومەت و پزیشک و ئەندازیاران کورد ئەبوون.

**حـەوتەم:** هەموو کوردێك لەسەر خاك و ئاوی خۆی بە ئازادی ئەژیا، نیوەی زەوی و زاری کشتوکاڵی لە عێراقدا لە ناوچەکانی کوردستان بوو، بۆ نموونە: جافەکان هەتا (جبل حمرین) بە دێهات و زەوی و زاری کشتوکاڵی و ئاوەوە هەموو موڵکی ئەوان بوو، هەر لە مەندەلی تا خانەقین تا کەرکووك، تا دەشتی کەندێناوەو تەلەعفەر هەموو خاکی کوردو کوردستان بوو، کورد بەسەربەرزی تێیدا ئەژیاو کشتوکاڵی ئەکرد، تا ڕژێمی پاشایەتی مابوو بستێك لەو زەویانەیان لێ نەسەندراو نەدرا بە عەرەب.

## خراپەکانی ڕژێمی پاشایەتی بۆ کورد

**یەکەم:** هەر ئاغایەك لە شوێنی خۆی پاشایەکی تایبەت بوو بۆ خۆی، هەر جەورو ستەمێکی بکردایە لەو دێهاتانەی لە ژێر دەستی بوون کەس نەیدەتوانی بەرامبەری بوەستێت، ئەگەر شکاتی بکردایە ئەوا ستەم لێکراوەکە تاوانبار ئەکراو ئاغاکە بە بێ تاوان دەردەچوو، لەبەرئەوە ڕژێمی پاشایی هەروەکو ڕژێمی عوسمانییەکان بە هۆی ئاغاکانەوە دەستی گرتبوو بەسەر ناوچەکانی کوردستاندا، هەر ئاغایەك دەسەڵاتێکی وای پێدرابوو کە ئەبوایە لەناوچەکەیدا قائیمقام و بەڕێوەبەری ناحیە لەسەر ئارەزووی ئەوان کاروباری شوێنەکەیان ببردایە بەڕێوە.

**دووەم:** هەرکەسێك لە دانیشتووەکانی دێهاتەکان ئەگەر هاواری بکردایە، بیوتایە شێخ یان ئاغا موڵکەکەی یان زەوییەکەی داگیر کردووە، یەکسەر تاوانبار ئەکرا بەوە کە ئەمە کۆمۆنیستە، ئینجا ئەبوایە لەوێوە بیانهێنایە بۆ نوگرە سەلمان

لەویَ ماوەی ژیانی بەسەر بردایە، لە ماوەی ڕژێمی پاشایەتیدا هیچ کەس نەبوو بڵێت ئەم جیاوازییە چییە لە نێوان هەژارو دەوڵەمەندا.

**سـێیەم:** جوتیار بە درێژایی ساڵ ئیشی دەکرد بەرهەمەکەی ئاغا ئەیخوارد، چونکە هەر ئاغایەك بەلای کەمەوە (١٠) هەزار دۆنم زەوی و ئاوی لەلایەنی سوڵتانەکانی عوسمانییەوە پیَ درابوو، بۆ ئەوەی دەست بگرن بەسەر دانیشتوانی ئەو شوێنەدا، هیچ کەس سەرپێچی بەرانبەر ڕژێمی خەلافەتی عوسمانییەکان نەکات.

ئاغای وا هەبوو (١٠٠) دێی هەبوو کەس نەیدەتوانی بڵیَ (من این لك هژا؟) نە بە کڕین کڕیبووی، نە بە ڕەنجی شانی خۆی ئاوەدانی کردبووەوە، بۆ نموونە نیوەی دەشتی بتوێن موڵکی شێخ حوسەین بۆسکێنی بوو، لە ساڵی ١٩٤٧ کە لەویَ مەلابووم دانیشتوانی ئەمبەرو ئەوبەری دێکە توتنەوانی ئەو بوون، کاتێك توتنەکەی وەردەگرت دەی هێنا بۆ سلێمانی بۆ فەحس بە فەردە پارەی وەردەگرت، جوتیارەکەش دینارێکی بۆ نەدەمایەوە، ئەبوایە سەرلەنویَ دەست بکاتەوە بە قەرزکردن لە شێخ حسێن هەتا کاتی توتن دێتەوە.

**چـوارەم:** لە (٩٥٪) دێیەکانی کوردستان نە قوتابخانەیان تیابوو نە نەخۆشخانە، خوێندەواری تەنیا بریتیبوو لە خوێندنی مەلاو فەقێی مزگەوت، دەوڵەمەندەکان منداڵەکانی خۆیان ئەنارده بەغدا ئەیانخوێند، بەڵام منالّی جوتیارەکان و هەژارەکان هەر بە کوێرەوەری و نەخوێندەواری ژیانی خۆیان بەسەر ئەبرد.

**پێنجـەم:** کاتێك یەکگرتنی هاشمی کرا لە نێوان عێراق و ئوردوندا، ئاڵای عێراق ئەستێرەیەکی تیابوو کە نیشانەی برایەتی کوردو عەرەب بوو، ئەو ئەستێرەیان لابرد، ئەمە نموونە بوو بۆ ئەوەی پاشا ڕووەو ئەوە ئەڕوات کە هیچ حسابێك بۆ کورد نەکات، چونکە کاتێك ئەم یەکگرتنەیان کرد بیروڕای هیچ کوردێکیان وەرنەگرت.

**شەشەم:** مردنی هەست بە لێپرسراوی لە پاشەڕۆژی کورد.

**حەوتەم:** فێڵبازی فەیسەڵی یەکەم و کەم ئەزموونی شێخ مەحمود: کورد ئەو هەلە گەورەیەیان لە کیسدا لەپاش ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی دەوڵەتی عوسمانی،

کە ئەو میراتە گەورەیە بەجێما، هەریەك لە عەرەب و فارس بەشی خۆیان بردو، کورد لەبەر ئەوە کە ڕێبەرێکی سیاسیی نەبوو بەبێبەش مایەوە، لەگەڵ ئەوەش ئینگلیز زۆری مەبەست بوو کەوا لە عێراقدا دوو دەوڵەت هەبێت یەکێکیان عەرەب و ئەویتریان کورد بێت، هەروەك لەم بەڵگانەی خوارەوە دەردەکەوێت:

گرنگترین شتێك کە باس بکرێت لە گفتوگۆی ڕێککەوتننامەی نێوان عێراق و بەریتانیاساڵی ١٩٢١، بە پێی ئەو بەندانەی ڕێککەوتننامەی (سیڤەر) کە پەیوەندی هەیە بە کوردەوە، کێشەی کوردەکان بوو.

مەلیك فەیسەڵ ڕۆژی ١٩٢١/١٠/٢٤ لەگەڵ نێردراوی بەریتانی (مەندوبی سامی بەریتانی) کۆبووەوە.

فەیسەڵ وتی: زۆر گرانە لە گفتوگۆدا بگەین بە ئامانجی کۆتایی لە پێش وەڵامدانەوەی چوار پرسیار کە لەلایەن ئێوە (بەریتانیا) وەڵام بدرێتەوە، پرسیاری یەکەم و دووەم پەیوەندی هەیە بە پاشەڕۆژی سوپای بەریتانی لە عێراق. پرسیاری سێیەم و چوارەم پەیوەندی هەیە بە کوردەکانی کوردستانی عێراق کە ئەمەیە:

پرسیاری سێیەم: هەندێ لە عەشیرەتەکانی کوردستان دەریان بڕی کە پاڵدانیان بە عێراقەوە لەلا باشترە لە جیابوونەوەو سەربەخۆیی، ئایا حکومەتی بەریتانیا زۆریان لێ ئەکات لەسەر جیابوونەوە، ئەویش تا چ ڕاددەیەکە؟

وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بەم جۆرە وەڵامی دایەوە:

ئێمە زۆر لە کوردەکان ناکەین کە لە ئێوە جیاببنەوە، بەڵام هەر بڕیارێکمان دا ئەبێت ماوەیەك بدرێت بە کوردەکانی کوردستانی عێراق بیر لە پاشەڕۆژی خۆیان بکەنەوە.

پرسیاری چوارەم: ئەگەر بڕیاری جیاییان دا جۆری حوکمەکەیان چۆن بێت؟

وەڵام: ئەگەر یەك لە ناوچەکانی کوردستان هەڵیبژارد کە جیا ببنەوە، ئەبێت

بەڕێوەبردنیان لە ژێر چاودێری حکومەتی بەریتانیادا بێت، ئەوەك پاڵبدەن بە تورکیاوە بە نیازی یەکگرتنی کوردستانی گەورە.

دوو ڕۆژ پاش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە لەلایەن حکومەتی بەریتانیا، مەلیك فەیسەڵ نامەیەکی دا بە مەندوبی سامی بەریتانی وتی:

کاتێ ئەوە هاتووە (تتویج) بکرێم بە مەلیکی عێراق، وات تێگەیاندم کە حکومەتی بەریتانیا ساڵێك ماوەی داوە بە کوردەکان بۆ ئەوەی لەلایەن خۆیانەوە بڕیاری پاشەڕۆژیان بدەن، من ڕەزامەندم بەم بڕیارە، هەرچەندە ئەگونجێ دوایی ئەم بڕیارە لەگەڵ بەرژەوەندی من نەبێ، بەڵام من نامەوێ زۆر لە کەس بکەم بۆ ئەوەی پاڵم پێوە بداو لە ژێر حوکمڕانی مندا بێت،[1] بەڵام ئەمە هانیان ئەدات کە پاشەڕۆژ دەنگ بۆ من نەدەن، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە کوردەکانی ناوچەکانی کوردستان نوێنەری خۆیان ناردووە بۆ لام،. بەڵێنیان داوە کە دەنگم بۆ بدەن بۆ پاشایەتی، هەروەك بەڵێنی دانیشتوانی بەغداو موسڵ و بەسرەو عەشیرەتە عەرەبەکان، هەندێکی تریان پێیان خۆشە لەگەڵ من بن، بەڵام ناوێرن دەنگم بۆ بدەن.

لەگەڵ ئەوە وا ئەزانم وەڵامی پرسیاری سێیەم ڕێك ناکەوێت لەگەڵ ئەوەی کە زۆر لەکەس ناکەن، هەرکەس ئازاد بێت بۆ بڕیاری پاشەڕۆژی خۆی، من مەترسیم هەیە ئەم کوردانەش کە بەڵێنیان داوە لەگەڵ من بن لە پاشەڕۆژ پەشیمان ببینەوە ئەگەر ئێوە ماوەی زیاتریان بدەنێ بیر لە پاشەڕۆژی خۆیان بکەنەوە.

مەبەست لەو کوردانەی کە دەنگیان بۆ ئەوە داوە لەگەڵیدا بمێننەوە کوردی (عەقرە، زاخۆ، دهۆك، هەولێر)ە، لەبەر ئەوە مەلیك فەیسەڵ داوای لێکرد کە ئەو ماوەیەی دراوە بە کوردەکان بۆ بیرکردنەوە لە پاشەڕۆژی خۆیان، تەنیا بۆ

---

(١) م.ج.و، ملفات البلاط الملكي، ملفه مفاوضات المعاهده العراقية الإنكليزية، تسلسل ٣١، كتاب من المندوب السامي إلى الملك فيصل بتأريخ ٢٠/ كانون الأول ١٩٢١، الورقتين رقم (٣٦٧-٣٦٨)، نقلا عن الرسالة المذكورة السابقة المشار اليها.

کوردەکانی سلێمانی و کەرکووک بێت، با تەنیا ئەوان بڕیار بدەن لەگەڵ ئێمە بن یان جیا ببنەوە.(١)

لە وەڵامی ئەمەدا مەندوبی سامی بەریتانیی ئەم وەڵامەی دایەوە بە مەلیک فەیسەڵ:

سیاسەتی بەریتانیا لە جیاکردنەوەی ناوچە کوردنشینەکان لە عێراق تەنها لەوەوە نەهاتووە کە وەکو مەلیک دەڵێت حەزناکات کەس بەزۆر بچێتە ژێر دەسەلاتیەوە، بەڵکو لەوەوە دێت کە حکومەتی بەریتانیا هیچ پاساوێکی بەخۆی نەداوە بۆ پشتگوێ خستنی ماددەی (٦٤) لە ڕێککەوتننامەی سیڤەر، کە لە دوا ڕستەدا دەڵێت: وڵاتە هاوپەیمانەکان هیچ لارییان لەوە نییە کە ئەو کوردانەی نیشتەجێن لەو بەشەی کوردستان کە لە سنووری ویلایەتی موسڵدایە، ئەگەر ویستیان دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ پێک بێنن ئەوا ئازادن لەو هەڵبژاردنەدا"(٢).

مەلیک فەیسەڵ بیروڕای لەسەر ئەوەبوو کە هەر کوردێك دەنگی بۆ ئەو داوە یان وتوویەتی من لەگەڵ تۆم، وا دائەنرێت کە بەم دەنگدانە بەشێکە لە حکومەتی عێراق هەتا هەتایە.

واتە دەنگدانی کوردەکانی عەقرە و زاخۆ و دهۆك و هەولێر، وادائەنرێ کە وازیان هێناوە (تەنازولیان کردووە) لە هەر مافێ کە ماددەی (٦٤) لە ڕێککەوتننامەی

---

(١) م.ج.و، ملفات البلاط الملكي، ملفه مفاوضات المعاهدة العراقية الإنكليزية، تسلسل ٣١، كتاب من المندوب السامي برسي كوكس بتأريخ ٢٢/ كانون الأول ١٩٢١، الأوراق رقم (٣٨٤-٣٩٩)، نقلا عن الرسالة المذكورة السابقة المشار اليها.

(٢) كان ن المادة (٦٤) من معاهده سيفر كما يلي: "إذا حدث أثناء سنة واحدة من تأريخ العمل بهذه المعاهدة أن الشعوب الكردية في المناطق المعنية في المادة (٦٢) وجهت إلى مجلس عصبة الأمم طلبات يتضح منها أن أكثر سكان هذه المناطق يرغبون في الإستقلال عن تركيا، وإذا قرر مجلس عصبة الأمم حينئذ أن هؤلاء القوم قادرون على الإستقلال ينبغي أن يمنح لهم. فيجب على تركيا أن ترضى بتنفيذ هذا القرار وتتنازل عن كل الحقوق والتملك في تلك المناطق وتودع شروط هذا التنازل في المعاهدة المنفردة بين دول الحلفاء الرئيسه وتركيا، وحينما يقع هذا التنازل فدول الحلفاء الرئيسة لا تقيم مانعا في سبيل انضمام الأكراد الساكنين في ذلك القسم من كردستان الداخل الأن ضمن ولاية الموصل إلى دولة كردية مستقلة إذا اختاروا ذلك بأنفسهم".

سیڤەر پێی داون و هەتا هەتایە نابێ داوای مافی جیابوونەوە بکەن.

بەڵام مەندوبی سامی بەریتانی وتی: من لەم بیروڕایەدا لەگەڵ تۆ نیم، چونکە کاتی خۆی بەم کوردانە وتراوە: دەنگدان یان دەنگ نەدان بە مەلیك فەیسەڵ کە پاشای عێراق بێ هیچ گۆڕینێ پەیدا ناکات لەو مافانە کە ماددەی (٦٤) لە ڕێککەوتننامەی سیڤەر بە ئێوەی داوە.

ئەم ڕووداوانەی باسی دەکەم مەبەستم ئەوە نییە لە شایەنی کەس کەم بکەمەوە، بەڵکو باسی ئەو شتانە دەکەم کە ڕوویان داوە بۆ ئەوەی کورد سوودیان لێوەربگرێت و جارێکی تر نەکەوێتە هەڵەی باوو باپیرانی.

بەلام مەبەستم ئەوەیە کوردو عەرەب لە نیشتمانی عێراقدا وەك دووو برا وایە کە باوکیان مردبێ، خانوویەکی بەجێ هێشتبێ، هەردوو براکە تیایدا بمێننەوە، بەڵام هەردەم یەکێك لە براکان خۆی بە خاوەنی خانووەکە ئەزانێ و بە چاوی کرێچی تەماشای براکەی تری ئەکات، یان منەتی بەسەردا ئەکات کە بە خۆڕایی ڕێی داوە دانیشێ لە ناو ئەو خانووەدا.

لە هەموو مێژوودا بە ئاشکرا دیارە کە ئێمە لە پێش عەرەبدا لە عێراق بووین، عەرەب لە پاش ئیسلام هاتە عێراقەوەو بۆ ماوەیەکی زۆر پێکەوە ژیاین، بەڵام لە پاش کەوتنی دەوڵەتی عوسمانی لە عەرەبدا ڕەگەزپەرستی پەیدابوو، ئێمەیان بە هاوبەش نەزانی لەم نیشتمانەدا، بەڵکو هەر ڕژێمێك هات وای تەماشا کرد کە نیشتمانەکە هەر لەسەرەتاوە هی عەرەب بووە، بە پیاوەتی ڕێگەیان داوە کە کوردیش لەگەڵیان بژی تیایدا.

دەوڵەتی عوسمانی پێش ئەوەی بکەوێت زۆر لاواز بوو پێیان ئەوت پیاوە نەخۆشەکە (الرجل المريض) لەبەر ئەوەی زۆر بێ دەسەلات بوو بەرامبەر بەو هێزانەی دەیانویست ئەو ڕژێمە بگۆڕن، کاتێك ئەم پیاوە نەخۆشە مرد نیوەی میراتەکەی کوردستان بوو، بەشێکی کەمی هی تورك و فارس و عەرەب بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کە کورد ڕێبەری سیاسیی و دانای تیا هەڵنەکەوتبوو، ئەو میللەتانە بەشەکەی خۆیان بردو لە پاشا کوردستانیان بەسەر خۆیاندا بەش کرد.

# شۆڕشی (١٤)ی تەمموز و
# تالانی و گەندەڵی

ڕۆژی یەکەمی شۆڕشی (١٤)ی تەممووزی ١٩٥٨ هەستم کرد بە خۆشی و کامەرانی، هەستم کرد کە بەڕاستی بەیانییەکی جیاواز لە ژیانی ئادەمیزاد لە عێراق دروست بووە، گۆڕانێك کە هەموو لایەنێکی ژیانی مرۆڤایەتی ئەم وڵاتەی گۆڕی، هەستم کرد بەشداریم کردووە لە غەزای (بەدر)دا دژی بت پەرستەکان!! بەڵام بەداخەوە ئەم هەستە هەمووی (٢٤) سەعات بەردەوام نەبوو لەبەر ئەم هۆیانە:

**یەکەم:** ئەفسەرەکان دەستیان کرد بە دزی و داوێن پیسی، لە مەقەڕی فەوجەکەی عەبدولسەلام لە ئێستگەی بەغدا.

ڕۆژی (١٤)ی تەمموز لەگەڵ کاك نوری ڕەشید کراین بە چاودێر لەسەر ئێستگە بەشی کوردی و لە هەمان کاتدا هەڵئەساین بە ئەرکی عەسکەری سەرشانمان.

شەوی (١٥/١٤)ی تەمموز ئەفسەرەکانی هیچیان نەنووستن هەر بە جلوبەرگی سەربازیەوە بوون، لەوە ئەترساین کە ئینگلیز بەفرۆکە بێتە سەر بەغداو هێزی سەربازی دابەزێنێ، چونکە نوری سەعید لەو کاتەدا هێشتا مابوو، خۆی حەشاردابوو، کە ئەویش پەیوەندییەکی کۆن و بەهێزی هەبوو لەگەڵ ئینگلیزدا.

ئێمەش هەموو شت و مەك و یاتاغمان لەناو ئەو ئۆتۆمبێلانەدا بوون کە لە جەلەولاوە هاتبوون.

(کازم حەیدەر) کە بێژەری ڕادیۆ بوو، باسی جەمال عەبدولناسری ئەکرد و هەردەم توانجی لێ ئەداو قسەی ناشیرینی بڵاو ئەکردەوە، ئەم پیاوە دەستبەسەر کراو ڕۆژی (١٥)ی تەمموز خستبوویانە ئەو ئۆتۆمبێلەوە کە شتەکانی منی تێدا بوو، بردبوویان بۆ وەزارەتی بەرگری، لە ڕێگە لە شەقامی ڕەشید هێرشیان بردبووە سەری و ویستبوویان بیکوژن، هەر چۆن بوو ڕزگاریانکردبوو لە کوشتن، بەڵام لەو هێرشەدا شتەکانی من براو لەناوچوو، منیش بەم ڕووداوەم نەزانیبوو.



بە ئامرم وت: شتەکانم لەو ئۆتۆمبێلەدابوو کە دیار نەماوە، وتی: فەوجەکەمان دابەش کردووە بەسەر هەندێ شوێندا بۆ پاراستن، برۆ بۆ کۆشکی زهور (قصر الزهور) لەوانەیە لەوێ بێت، منیش بە ئۆتۆمبێلێکی عەسکەری ڕۆیشتم، نە جبەم لەبەردابوو نە مێزەرم بەسەرەوە بوو، کە گەیشتمە ئەوێ دیم پاسەوانەکان لە فەوجی ئێمە نین، منیش وتم: من ئیمامی فەوجەکەی عەبدولسلامم، شتەکانم گوم بوون هاتووم بزانم لێرە نین، وتیان نابێت بچیتە ژوورەوە، لەوکاتەدا بەبێ ئاگاداری لە خۆمەوە دەستم خستە سەر قەدم کە دەمانچەکەی پێوەبوو، وایان زانی بە تەمای شتی خراپم، گورج لوولەی ڕەشاشیان خستە سەر پشتم و بردمیانە ژوورەوە، ئەو دوو ئەفسەرەی تێدابوو کە بەسەرهاتەکەم بۆ باسکردن، دیاربوو زۆر دژی شۆڕشەکە بوون، هەرچۆن بوو ڕزگارم بوو، گەڕامەوە بۆ ئێستگە، لەوێ وتیان بچۆ بۆ کۆشکەکەی نوری سەعید، هاوڕێکانی خۆمان لەوێن لەوان بپرسە.

پاش نوێژی عەسر ڕۆیشتم، دیم لەوێ لە کۆشکەکەدا خەریکی تاڵانین، ئەم کۆشکە زۆر کەمتربوو لەو کۆشکانەی کە ئێستا شۆفێری کاربەدەستەکان هەیانە، لە قەراخی ئاوی دیجلە بوو، لەبەری کەرخ.

ڕۆژی ١٤ی تەمموز، گرتنی نووری سەعید و کۆشکەی بە فەوجەکەی ئێمە بە سپێرابوو، بەڵام نەیانوێرابوو لە ئۆتۆمبێلەکانیان دابەزن، ئەگەرچی تەنیا




یەك شورتەی پاسەوان لەوێ بوو، نووری سەعید لە ڕووی ئاوەکەوە ئەچێتە دەرەوەو بە (بەلەم) ئەپەڕێتەوە بۆ بەری (رصافە)، هەر لە دوورەوە کۆشکەکەیان دابووە بەر تۆپ، پاسەوانەکە خۆی ئەدات بە دەستەوەو ئەڵێت کەس لە ژوورەوە نییە.

من کە چوومە ژوورەوە بینیم بە ئەفسەرو سەربازەوە خەریکی دزی و تاڵانین، هەرچی شت بە کەڵك بێت بردوویانە، لەو کاتەدا یەکێك لە ئەفسەرەکانی خۆمانم بینی، جانتایەکی گەورەی دانابوو ئەویش هی نوری سعید بوو، پڕی کردبوو لە جلوبەرگی ژنانەو پیاوانە، قورئانێك کە بە زمانی ئیسپانی لە عەرەبییەوە وەریان گێڕابوو بە دیاری نێردرابوو بۆ نووری سەعید لەسەر جلەکان دانرابوو، جانتاکە دانەخرابوو، وتم: ئەو قورئانە بدە بە من، لەبەر پیرۆزی قورئانەکە داوام کرد، لە تاڵانی (١٤)ی تەمموز ئەو قورئانەم بەرکەوت، ئەفسەرەکان وتیان: مەڕۆ ئەمانەوێ قاسەکەی نوری سەعید بشکێنین، چی تێدابوو بەشی

دەکەین، وتم: بۆچی ئێمە شۆڕشمان بۆ تالآنی کرد یان بۆ خزمەتی وڵات بەم ئیشە هەڵساین؟! وتیان: ئێمە بۆیە خوێنی خۆمان کردۆتە کاسەوەو بەشداریمان کردووە لەم شۆڕشەدا کە سوودێکمان دەستگیر بێت، عەبدولکەریم و عەبدولسەلام خەریکی مەنصەب بەشکردنن، چی تێدایە ئەگەر ئێمەش پارەی نووری سەعید دابەش بکەین؟! منیش وتم: شتەکانی منیان دزیوە بۆیە هاتم بۆ ئێرە، ئێستا بەشداری ئێوە ناکەم لە هیچ شتێکدا، من ڕۆیشتم بۆ ئیستگە، دوای من قاسەکەیان شکاندبوو یەك پولی تێدا نەبوو.

شەوی (١٦/١٥) کاتژمێر یەکی شەو لە فولکەکەی بەردەمی ئێستگەدا پاسەوانیم دەکرد، دیم ئۆتۆمبێلێکی گەورەی عەسکەری دۆج هات ویستی تێپەڕێ، وتم: بوەستە، دیم فەوجی خۆمانە، وتم: بۆ کوێ ئەڕۆیت؟ وتی: ئەچم بۆ ماڵی (ئەبو ئەحمەد) واتە (عەبدولسەلام عارف)، وتم: چیت پێیە؟ مینجە مینجێکی کرد، کە تەماشای ناو ئۆتۆمبێلەکەم کرد ئەبینم پڕە لە فەرشی کاشانی ئێران و هەندێ شتی تر، وتم: ئەمەت لەکوێ هێناوە؟ وتی: لە ماڵی صەباحی کوڕی نوری سەعید.

شایانی باسە ئەو ڕۆژە بۆ بەیانیەکەی (صەباح)یان هێنایە بەردەرکی ئێزگە، بەبێ دادگایی گوللەبارانیان کردو کوشتیان، لە پێش گیان دەرچوونیدا بە هێواشی وتی: (شنو ذنبي، ليش قتلتموني؟) واتە: گوناهم چیبوو، بۆ منتان کوشت؟ لە پاش ماوەیەکی کەم گیانی دەرچوو، ئیتر نازانم بۆ کوێیان برد.

ڕۆژی (١٦)ی تەمووز ئەوەی کە لە تالآنی ڕزگاری بوو لە شتەکانی کۆشکی ڕیحاب لە ماڵی مەلیك و عەبدولئیلاە هێنایان بۆ ئێزگە لە ژوورێکدا دایان نا، بە منیان وت تۆ چاودێری ئەم شتانە بکە، ئێستا لیژنەیەك لە وەزارەتی بەرگرییەوە دێن سەرژمێری ئەکەن و وەری ئەگرن.

منیش تەماشام کرد دوو پارچە ئاڵتونی تێدایە، یەکێکیان پشتێنی ژنانە بوو بە دەستێك بەرز نەئەکرایەوە، ئەوی تریان گۆچانێکی دەستی بوو وەك هی دەستی ئەفسەران، هەندێ ئایەتی قورئانی لەسەر هەڵکەنرابوو، لەو ئایەتانە:

﴿ وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ﴾.

له ژووره‌كه دانیشتم، ماوه‌یه‌كی زۆری پێچوو لیژنه‌كه نه‌هات، له‌و كاته‌دا چووم بۆ ده‌ست به‌ئاو گه‌یاندن، نائیب عه‌ریفێكی كورد ناوی ئه‌حمه‌د بوو هێنامه جێگه‌كه‌ی خۆم، چونكه دڵنیابووم خیانه‌ت ناكات، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كورده، لێپرسراوی ناخاته سه‌ر شانی من. به‌ڵام ئامر فازیل موحه‌ممه‌د عه‌لی كه له جێگه‌ی عه‌بدولسه‌لام كرابوو به ئامر، منی دیبوو كه چووم بۆ ده‌ست به‌ئاو گه‌یاندن، خۆی گه‌یاندبووه كاك ئه‌حمه‌د، پێی وتبوو ئه‌و پشتێنه به‌ره له شوێنێك بیشاره‌وه پێش ئه‌وه‌ی ئیمام بێته‌وه من چاودێری شته‌كان ده‌كه‌م، منیش كه گه‌ڕامه‌وه چاووم به ئامر نه‌كه‌وت، پاش ئه‌وه كه ئه‌حمه‌د ڕۆیشت دیم پشتوێنه‌كه نه‌ماوه، منیش له خه‌فه‌تاندا خه‌ریكبوو ببورێمه‌وه، چونكه نه‌م ئه‌توانی ئه‌م كاره باس بكه‌م بۆ لیژنه‌كه له دوو ڕووه‌وه، یه‌كه‌م لێپرسراوی ئه‌كه‌وێته سه‌رشانی من، چونكه شته‌كان به من سپێراون، دووه‌میان ئامره‌كه پێش ئه‌وه‌ی سزا بدرێت منی له‌ناو ئه‌برد، ئیتر تا كاتی ئه‌م نووسینه كه (٤٠) ساڵی به‌سه‌ردا ڕۆیشتووه لای كه‌س باسم نه‌كردووه، به‌ڵام ماوه‌یه‌كی زۆری نه‌برد خوا تۆڵه‌ی له ئامره‌كه كرده‌وه.

پاش ماوه‌یه‌كی زۆر ئه‌فسه‌رێكی ناسیاو له‌گه‌ڵ هاوسه‌ره‌كه‌ی هاتن بۆ ماڵمان بۆ به‌غدا له پڕ چوونه ژووی میوان، له پاش ماوه‌یه‌ك چووم بۆ لایان دیم زنجیره‌یه‌كی ئاڵتونی زۆر به‌نرخ به ده‌ست هاوسه‌ره‌كه‌یه‌وه بوو له جانتاكه‌ی ده‌ری هێنا؟ وتم: كاك (ج) ئه‌م شته نایابه چییه؟ وتی: ئه‌وه ڕۆژی (١٤)ی ته‌مووز چوومه ماڵی عه‌بدولئیلاه ئه‌مه له ژێر سه‌رینی نووستنه‌كه‌دا ده‌رم هێنا، وتی: ئه‌مانه‌وێ بیفرۆشین.

ئه‌م ئه‌فسه‌ره برایه‌كی هه‌بوو له‌مریكا ده‌ژیا، گه‌ڕابووه‌وه ژنێكی كوردی له‌سلێمانی هێنابوو، ژنه‌كه‌ی له‌گه‌ڵ براكه‌ی تریدا بڕیار وا بوو شه‌و له‌سلێمانیه‌وه بێن بۆ ماڵی ئێمه و بچن بۆ ئه‌مریكا، له‌ڕێگادا سه‌یاره‌كه‌یان وه‌رگه‌ڕا و ئه‌و ئه‌فسه‌ره بوو به‌ژێر سه‌یاره‌كه‌وه و ده‌ماغی ته‌قی و ده‌ستبه‌جێ مرد، بۆ مه‌یته‌كه‌ی چووین بۆ به‌عقوبه و بردمانه‌وه بۆ سلێمانی، واته خێری لێ نه‌بینی، ماڵی دزیه‌نی وایه.

# لالوتی بەڕێوەبەرانی ئێزگە

بەڕێوەبەری بەشی کوردی ئێزگەی بەغدا کاک (کامیل ئەمین) بوو، ڕۆژی (١٥)ی تەمووز پێی وتم: پێم خۆشە وێنەیەکی خۆت بگریت بە دەمانچەوەو مێزەرەکەت بەسەرەوە بێت بۆ ئەوەی شتێکت لەسەر بنووسم و بڵاوی بکەمەوە.

ڕۆژی (١٧)ی تەمموز مەلا عومەر مەولود هات بۆ ئێزگە کە وتاری هەفتانەی هەبوو، وتی: وتارێکم پێش (١٤)ی تەمموز تۆمار کردووە، پێمخۆشە بیگۆڕم بە تۆمارێك بە بۆنەی ئەم شۆڕشەوە. لەوکاتەدا کامل لەوێ نەبوو، بەبێ ئاگاداری ئەو کردمە ژوورەوە، وتارێکی تری تازەی تۆمارکرد. کاتێك کاك کامیل هاتەوەو بەمەی زانی خۆی زۆر تورە کرد، وتی: من بەڕێوەبەرم یان تۆ؟ وتم: تۆ بەڕێوەبەری، بەڵام ئیشێکی نابەجێم نەکردووە، ئەم مەلایە مەلایەکی زۆر باشە وتارەکەی لەگەڵ ئەمرۆدا زۆر ئەگونجا.


وێنەکەم بەو شێوەیەی کاك کامیل داوای کردبوو

کاك کامیل لە دڵدا شۆڕشەکەی زۆر پێناخۆش بوو، لە هەمان کاتدا بە بوونی من و کاك نوری ڕەشید لەو شوێنەدا زۆر بێتاقەت بوو، ئەمەی کرد بە بیانوو، لێم لالووت بوو، دوایی وێنەکەم بۆ

هێنا لێی وەرنەگرتم، وتی: باش دەرنەچووە، دەمانچەکە لوولەکەی سەروخوارە، وتم: دەمانچەم بۆ ئەوە هەڵنەگرتووە ڕووی لوولەکەی بکەمە سنگی ئەم و ئەو.

لە هەمان کاتدا بەڕێوەبەری گشتیش لێم لالوتبوو، چونکە ناسراوی زۆر ئەهاتن داوای مۆڵەتی بڵاوکردنەوەی وتارەکانیان دەکرد، لە ئێزگەی کوردی و عەرەبی، بە بۆنەی ئەم شۆڕشەوە، منیش ئەبوایە وتارەکەم ببردایە بۆ ئەو پێش بڵاوکردنەوەی بۆ ئەوەی ڕەزامەندی لەسەر بدات، ڕۆژێك خۆی تووڕە کردو وتی: پیرت کردم.

وەها ڕێککەوت ڕۆژی دواتر عەبدولسەلام هات بۆ ئێزگە، ئەفسەرەکان و ئەوانەی لەوێ موچەخۆر بوون، لەگەڵ بەڕێوەبەری گشتی لە دەرگای ئێزگە پێشوازیمان کرد، کاتێك گەیشتە لامان لە پێش هەموویاندا باوەشی کرد بەمنداو بە گەرمی ئەملاو ئەولای ماچ کردم، ئینجا ڕووی کردە ئەوانی ترو وتی: (هذا مجاهد).

دوای ئەو جارە هەرکاتێك ئەچووم بۆ لای بەڕێوەبەری گشتی، بەرزە پێ لەبەرم هەڵئەساو هەتا دەرگاکە ئەهات بە پیرمەوە.

ئەمەش شتێکی نامۆ نییە بۆ کاربەدەستانی عێراق، ئەگەر یەکێك پلەیەکی هەبێت یان خاوەن پلەیەك بیناسێت، هەموو کەس ڕێزی لێ دەگرێ، ئەگەر ئەوە نەبێ بایەخی پێ نادەن.

شایەنی باسە خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا محەمەدی قزڵجی، کە وتاری هەفتانەی هەبوو لە بەشی کوردیدا، لەو سەردەمەدا هات وتارەکەی تۆمار بکات، منیش بە گەرمی پێشوازیم لێ کرد، وتم: بەوانەی لەوکاتەدا لەوێ بوون: ڕەنگە ئێوە ئەم پیاوە نەناسن، ئەمە زانایەکی بەرزی ئایینی بەناوبانگە، جگە لەوەش پیاوێکی نیشتمان پەروەرە، لە پاش ئەوە کە وتارەکەی تۆمارکرد دەستی گرتم و بردمیە دەرەوە، وتی: تکایە لەمەودوا بە هەموو شتێك باسم بکە بەڵام مەڵێ نیشتمان پەروەرە، منیش لێم نەپرسی بۆچی؟ من خۆم وام لێکدایەوە کە ئەم پیاوە خەڵکی کوردستانی ئێرانەو لەسەر کوردایەتی لە دەستی دوژمن هەڵهاتبوو بۆ عێراق، نەیدەویست کەس بەو نهێنییەی بزانێت.

## یەکەم وتارم لە ئێزگەی کوردی

ڕۆژی یەکەمی شۆڕش من وتاری خۆم لێکدانەوەی ئەم ئایەتە بوو:

﴿إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ (النمل: ٣٤).

وتاریکی دوورو درێژم نووسیبوو چەند جارێك لە ئێزگەدا بڵاوکرایەوە.

لە پاش هەفتەیەك ئاغایەکی پشدەری (نەم ئەناسی) هات بۆ ئێزگە، وتی:



زەڵمی- حافز مستەفا قازی- نوری شێخ ڕەشید - نەسرین فەخری ١٩٥٨/٧/٣٠

تۆ فلان کەسی؟ وتم: بەڵێ، وتی: من هاتووم بۆ لای تۆ پرسیارێکت لێدەکەم، وتم: فەرموو، وتی: پێش (١٤)ی تەمموز کاتێك مەلیك مابوو ئەم ئایەتە هەبوو لە قورئاندا یان نەبوو؟

منیش زانیم مەبەستی ئەوەبوو بڵێت: ئەگەر پیاوێکی ئازا بوویتایەو قسەکەشت ڕاست بووایە، ئەم ئایەتە بەسەر مەلیك فەیسەڵی دووەمدا ئەچەسپێت، ئەبوایە لە کاتی دەسەڵاتیدا بتوتایە.

منیش وتم: هەزار ڕەحمەت لە باوك و دایکت، منیش بۆ خۆم زۆر شەرمەزارم، ڕۆژێکی بەسەردا نەچوو پەشیمان بوومەوە، پێشینان ڕاستیان وتووە: (لە هەر خەسارێك عەقڵێك)، ئیمامی شافیعی فەرموویەتی: (کلما ادبنی الدهر أراني نقص عقلي)، واتە: هەر جارێ زەمانە فێری ئەدەب و ژیریی ئەکردم، ناتەواوی عەقڵی پیشان ئەدام. (وکلما أزددت علما زادني علما بجهلي) واتە: هەتا زانستم زیادی بکردایە، زیاتر دەمزانی چەند نەزانم.

# ڕۆیشتنم بۆ سلێمانی
# لەگەڵ عەبدولسەلام عارفدا

(١٤)ی ئابی ١٩٥٨ واتە بە مانگێك پاش شۆڕشی (١٤)ی تەمموز، یەكێك هات بە دوامدا بۆ ئێزگە وتی: عەبدولسەلام داوات دەكات، بڕۆ بۆ فڕۆكەخانەی بەغدا، منیش بە ئامرم وت، ئینجا ئۆتۆمبێلێكیان پێدام، كاتێك چووم دیم (عەبدولسەلام)و شێخ بابا عەلی شێخ مەحمودی حەفید و خالید نەقشبەندی و فوئاد ڕكابی و موستەفا عەبدوڵڵا لەوێ دانیشتوون، فڕۆكەیەكی سەربازی ئامادەكراوە، عەبدولسەلام وتی: لەگەڵ ئێمە وەرە ئەچین بۆ سلێمانی، ئینجا چوینە ناو فڕۆكەكەوە، وا ڕێككەوت لە تەنیشت خالید نەقشبەندییەوە دانیشتم، هەندێ پرسیاری لێكردم، لێی پرسیم خەڵكی كوێیت؟ وتم: خەڵكی دێی زەڵمم، ویستم پێی بڵێم من ئەوەم كە لە هەڵەبجە تۆ قایمقام بوویت و هاتم بۆلات دەستم برد تەوقەت لەگەڵ بكەم، وتت من لەگەڵ مەلای موشاغیبا تەوقە ناكەم، بەڵام لە پاشا بیرم كردەوە ئەمە شتێكی ناشیاوە كە ئەمە بدەمەوە لە ڕووی، جگە لەوەی شێخەكان خراپیان تێگەیاندبوو، هەرچەند ئەو لەدواییدا لەكێشەی باخەكانی ئێمە تێگەیشت و هاوكاریی كردین.

گەیشتینە فڕۆكەخانەی كەركوك، لەوێ عەبدولسەلام عارف بە تەنیا خۆی بە فڕۆكەیەكی (هەلی كۆپتەر) ڕۆیشت بۆ سلێمانی، ئێمەش بە ئۆتۆمبێل ڕۆیشتین، چونكە سلێمانی فڕۆكەخانەی تێدا نەبوو، نازم تەبەقچلی قائید فیرقە بوو لە كەركوك، لەگەڵمان هات، ڕۆشتنەكە وا تەرتیب كرا كە ئێمە پێش عەبدولسەلام عارف بگەینە ئەوێ، ئەو لە چوونەكەیدا دوا بكەوێت، كاتێ بێت

ئێمە لەوێ بین، کاتێك گەیشتینە سلێمانی دیمان هەموو شارەکە بە گەورەو بچووکەوە، بە ژن و پیاوەوە هاتوون بە پیرمانەوە، عەبدولسەلام عارف چووە سەر کۆشکەکەی نووری عەلی لەبەردەرکی سەرا، وتارێکی دەربارەی برایەتی کوردو عەرەب پێشکەش کرد، لە سەرەتادا بە چەند وشەیەکی کوردی دەستی پێکرد، کە من لە فڕۆکەکەدا فێرم کردبوو.

ئینجا چووین بۆ نوێژی هەینی بۆ مزگەوتی گەورە، خوالێخۆشبوو شێخ محمد قەرەداغی وتاربێژی مزگەوتی گەورە بوو، وتارێکی ئاینی خوێندەوە، عەبدولسەلام و ئەوانەی لەگەڵی بوون و ئێمەی خستە ڕیزی خولەفای ڕاشیدین، کەچی هەر مانگێ لەوەو پێش بوو، مەلیك فەیسەڵ هاتبوو بۆ سلێمانی، هاتنەکەی ڕێککەوتی ڕۆژی هەینی بوو، لە وتارەکەیدا ئەویشی بردبووە ڕیزی خولەفای ڕاشیدینەوە.

ئینجا چووینە (حامیە)ی سەربازی نانمان خوارد و گەڕاینەوە بۆ کەرکووک.

کاتێك لە بەغداوە هاتین بۆ کەرکووك لە فڕۆکەکەدا پێی وتم: ئەو ئایەتەت لەبەرە (کَمْ تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ..)، وتم: نەخێر، وتی: کە گەیشتینە سلێمانی بیدۆزەرەوە بۆم بۆ ئەوەی بیکەم بە سەرەتای وتارەکەم لە کەرکووك، ئایەتەکە ئەمەبوو:

﴿كَمْ تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ۝٢٥ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ۝٢٦ وَنَعْمَةٍ كَانُواْ فِيهَا فَٰكِهِينَ ۝٢٧ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ۝٢٨ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ ۝٢٩﴾ (الدخان: ٢٥ - ٢٩).

کاتێك گەڕاینەوە کەرکووك ئێوارە کاتی عەسر بوو، دانیشتوانی شارەکە هەموو هاتبوون بۆ یاریگەی گەل وەستابوون بۆ پێشوازی، لەو کاتەدا عەبدولسەلام عارف سەرکەوت، سێ جار بانگی لێکردم بۆ ئەوەی ئەو ئایەتانەی بدەمێ تا بیانکات بە سەرەتای وتارەکەی، منیش لەو کاتەدا بیرم کەوتەوە، بۆیە خۆم کرد بە نێو مەلاکاندا تا نەمبینێ، لە پاشا تۆزێکی لەبەربوو کردنی بەسەرەتا، کاتێك کە گەڕاینەوە بەغدا لە نێو فڕۆکەکەدا نەیدا لەڕووم.

لە پاش گەڕانەوەی ئێمە لە سلێمانی شێخ موحەممەدی خەتیب هات بۆ بەغدا، بۆ ئێزگە بۆ لای من، وتی: بمبە بۆلای عەبدولسەلام عارف، وتم: عەبدولسەلام زۆر سەری قاڵە ئەبێ لە پێشدا داوا بکەم لە عەبدوڵلا مەجیدی سکرتێری کاتمان بۆ وەرگرێت، وتی: نامەیەکی بۆ ئەنووسم بیدەرێ، وتم: چی ئەنووسیت؟ وتی: داوای لێ ئەکەم لە وتارێکی گشتیدا خۆی باسی من بکات بڵێ ئەوە عایدی منە، بۆ ئەوەی دانیشتوانی سلێمانی وازم لێ بێنن، وتم: ئەم داواکردنەت زۆر بێ جێیە، چونکە هیچ پەیوەندییەکی کۆنت لەگەڵ ئەو پیاوە نییەو ناتناسێت و لەگەڵت دانەنیشتووە و خزمایەتیت لەگەڵی نییە، جگە لەوە ئەمڕۆ ئەم پیاوە وەك سەرۆکی عێراق وایە چۆن لە وتاری خۆیدا باسی تۆ بکات و بڵێت ئەمە عاییدی منە؟ لەبەر ئەوە ئەتوانیت داوایەك پێشکەش بکەیت من ئەیدەم بە سکرتێرەکەیو ببیینە، ئەویش ئەوەی نووسی منیش دام بە سکرتێرەکە، ئیتر نازانم بەکوێ گەیشت؟

هەر لەو سەردەمەدا وەفدێك لەلایەن شۆڕشگێڕانی عێراقەوە ئامادەکرابوو سەردانی یەکیەتی سۆڤیەت بکات، کە منیش ئەندامێکی ئەو وەفدە بووم، بەڵام جەنابی شێخ محمد لەڕێگای هەندێ کاربەدەستەوە توانیبووی خۆی بخزێنێتە ناو ئەو وەفدەو جێگای من بگرێتەوە، وەك ئەوەی یەکێك بێت لە شۆڕشگێڕان.

هەروەها لە پاش چەند ڕۆژێك ئەو مامۆستایەی کە بوو بە هۆی ئەوەی سلێمانیم لەبەرچاو بکەوێ و بە جێی بێڵم، هات بۆ لام بۆ ئێزگە وتی: من لە سلێمانییەوە بۆ لای تۆ هاتووم، وتم: زۆر سوپاست ئەکەم، زۆر ڕێزم گرت، کردەوەکانی سلێمانیم نەدایەوە بە ڕوویدا، لە پاشا داوای لێکردم بیبەم بۆ لای عەبدولسەلام عارف، منیش وتم: عەبدولسەلام وتویەتی کەس نەهێنی بۆ لام، بەو جۆرە ئەویشم ڕەوانەکرد.

مرۆڤ ئەبێت چاوی لە پاشەڕۆژ بێت لە هەموو کردارو وتارێکدا، ئیمامی عەلی خوای لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: "ئەگەر دۆستایەتیت لەگەڵ یەکێك کرد بە شی دوژمنایەتی تیا بهێڵەرەوە، ئەگەر دوژمنایەتیت لەگەڵ یەکێك کرد بەشی ئاشتی تیا بهێڵەرەوە".

## شەڕ لەسەر کورسی دەسەڵات
## لەنێوان عەبدولکەریم و عەبدولسەلامدا



عەبدولکەریم و عەبدولسەلام

له ۱۹٥٤ تا ۱۹٥۸ عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام برایەکی گیانی بە گیانی بوون و سوێندیان بەسەری یەکتری دەخوارد، هەردەم لە ماڵی یەکتری نانیان ئەخوارد، زۆرکات بۆ گۆڕینی ڕژێمی عێراق و دوورخستنەوەی دەسەڵاتی ئینگلیز لەعێراق بە نهێنی کۆ ئەبوونەوە، هەردووکیان دوو ئەندامی زۆر ئازابوون لە بزووتنەوەی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان بەسەرۆکایەتی فەریق روکن نەجیب ئەلروبەیعی، ڕۆژی (۱۰)ی تەمموز کۆبوونەوەیەکی گەرمیان کرد لەگەڵ ئەندامەکانی تردا بۆ دانانی ڕێگەو هەستان بە شۆڕشی (۱٤)ی تەمموز.

بەیانی ڕۆژی شۆڕش، عەبدولسەلام یەکەم بەیانی بۆ گەلی عێراق خوێندەوە، لە بەیانەکەدا، لە جێگەی ڕژێمی پاشایەتی، ڕژێمی کۆماری عێراقی ڕاگەیاند، لە هەمان ڕۆژدا عەبدولکەریم قاسم بوو بە سەرۆك وەزیران و سەرۆکی هێزە چەکدارەکان، عەبدولسەلام عارف کرا بە جێگری سەرۆك وەزیران و جێگری سەرۆکی هێزە چەکدارەکان و وەزیری ناوخۆ بە وەکالەت.

عەبدولسەلام دەمێك بوو سەری ئەخورا بۆ یەکێتی عەرەبی، ئەمەش بوو بە هۆی ئەوە لە پاش بەسەرچوونی (٤) ڕۆژ بەسەر شۆڕشدا، واتە ١٨ی تەمموزی ١٩٥٨، چوو بۆ سوریا بۆ لای جەمال عەبدولناسر، کە سەرۆکی یەکێتیی میسرو سوریا (الجمهورية العربية المتحدة) بوو، کە تەمەنی تەنها یەك ساڵ بوو، دوایی تێکچووەوە.

بە گەیشتنی بۆ لای جەمال عەبدولناسر داوای کرد کە عێراقیش بخرێتە سەر میسرو سوریا لەو یەکێتیەدا، جەمال عەبدولناسر پیاوێکی هەڵەشە نەبوو لە سیاسەتدا تێگەیشتوو بوو، پێی وتبوو ئەم کارە بە پەلە ناکرێت ئەبێ لە هەموو ڕوویەکەوە بیری لێ بکەینەوە.

لە پاش ئەوەی عەبدولسەلامیان بردە کۆشکی میوانداری لە دیمەشق، صدیق شنشل خۆی گەیاندبووە لای جەمال عەبدولناسر بۆ ئەوەی پێی بڵێت بە قسەی عەبدولسەلام هەڵنەخەڵەتێ، پێی وتبوو: شۆڕشی عێراق لەم کاتەدا شتێکی گەورە بوو بۆ عێراق و عەرەب، ئێستا دوو کەس حوکمڕانی عێراق دەکەن یەکێکیان نیوە شێتە (عەبدولسەلام عارف)، ئەوەی تریان نیوە ژیرە (عەبدولکەریم قاسم).

بۆ ئێوارە لە کاتی نانخواردندا عەبدولسەلام عارف لەبەردەمی جەمال عەبدولناسرو میوانەکان بە توندی هێرش دەباتە سەر عەبدولکەریم قاسم، دەڵێت: ئەم پیاوە بە زۆر خۆی کرد بە سەرۆك، باری ناوخۆی عێراق ئەوە هەڵناگرێت کە عەبدولکەریم قاسم ئەو لێپرساوێتیەی بدرێتێ، لەبەر شیعەو کورد.

شایەنی باسە عەبدولکەریم قاسم یەکەم کەسێ بوو لە مێژووی عێراقدا کە ببێ بە هۆی ئەوەی دەستووری عێراق دان بەمافی کورددا بنێت و، بڵێت: (العرب والاکراد شرکاء في هذا الوطن).

جەمال عەبدولناسر زۆر سەرسام ما لەم هێرشەی عەبدولسەلام بۆ سەر عەبدولکەریم، زیاتر باوەڕی بە ڕاستیی قسەکەی (صدیق شنشل) کرد، زانی کە ئەم پیاوە جێگەی باوەڕپێکردن و متمانە نییە. کاتێك باسی یەکێتی عێراق لەگەڵ میسرو سوریادا هاتە پێشەوە، وتی: من بۆ هەموو یارمەتییەك ئامادەم، بەڵام ناتوانم بەڵێن بدەم بۆ هەستان بەم ئیشە، ئەم کارە ئەبێ لەسەر بڕیاری گەل بکرێت، بیروڕای گەلی عێراق و میسرو سوریا وەربگیرێت، هەڵبژاردنێکی گشتی بکرێت بۆ ئەوەی لە ئەنجامدا هەر ئیشێك ئەکرێت تێك نەچێت.

ڕۆژی ١٩٥٨/٩/١١ عەبدولکەریم قاسم کە سەرۆك وەزیران و لێپرسراوی هێزە چەکدارەکان بوو، فەرمانی دەرکرد بە لابردنی عەبدولسەلام عارف لە جێگری سەرۆکی هێزە چەکدارەکان.



عبدالکریم قاسم خەریکی ڕیش تاشینە و عبدالسلام نوێژ دەکات - ژوورەکەی عبدالکریم قاسم

ڕۆژی ١٩٥٨/٩/٣٠ عەبدولکەریم داوای کرد کە عەبدولسەلام بچێت بۆ لای، کاتێك ڕووبەڕوو بوونەوە هەریەکەیان هۆی ئەم تێکچوونەیان خستە سەرشانی ئەوی تر، لەو کاتەدا عەبدولسەلام لەپڕ دەمانچەکەی خۆی دەرهێنا، فوئاد عارف کە بەتەنیا لەو دانیشتنەدا دەبێت لەگەڵیان دەستی گرت و دەمانچەکەی لەدەست وەرگرت. عەبدولکەریم تاوانباری کرد بەوەی کە دەیویست ئەو بکوژێت، بەڵام عەبدولسەلام وتی: مەبەستم تۆ نەبوو ویستم خۆم بکوژم، درێژەی ئەم ڕووداوە لەکتێبی ژیاننامەی کاك فوئاد

عارفدا باسکراوە[1].

ئەو ڕۆژە لە کاتژمێر (١١)ی بەیانییەوە تا کاتژمێر (١٠)ی شەو لە ژوورەکەی عەبدولکەریم قاسم بەشەڕە قسە بردیانە سەر، لەپاش هەفتەیەك عەبدولکەریم قاسم فەرمانی دەرکرد بە دانانی عەبدولسەلام بە باڵیۆزی عێراق لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا لە بۆن، ئەویش ڕۆشت.

شایەنی باسە لە پاش ئەوەی عەبدولسەلام کرا بە باڵیۆزی عێراق لە ئەڵمانیا، فەوجەکەی کە لە ئێزگە بووین دەریان کردین، لەوێوە ناردیانین بۆ دەرەوەی شار لە نزیکی ئەبو غرێب و لەوێ ماینەوە، پاش ماوەیەك فەوجەکەیان چەك کردو بە شەمەندەفەر ناردینیانەوە بۆ جەلەولا، لەو ماوەیەدا کە لە ئەبوغرێب بووین ئامری فەوجەکە (مقدم حسن عبود) بوو کە لە کۆمۆنیستەکان بوو، پیاوێکی نیشتمان پەروەر و زۆر ژیرو هێمن بوو.

شەوی ٣-٤ی/١١/١٩٥٨ عەبدولسەلام عارف بەبێ ئاگاداری عەبدولکەریم قاسم کاتژمێر دووی شەو بە فڕۆکەیەکی عێراقی گەڕایەوە بەغدا، بەیانی ١١/٤ چووەوە ماڵی خۆیان.

هەر ئەو شەوە کە گەڕانەوەی عەبدولسەلام ئاشکرا بوو، سوپا هەموو هێزەکانی لە بەغدا خستە ئامادە باشییەوە، چونکە واچاوەڕوان ئەکرا عەبدولسەلام پلانێکی هەبێت لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیدان بۆ هەستان بە کودەتایەك دژی عەبدولکەریم قاسم، جا لەبەر ئەوە ئامر فەوج (مقدم حسن عبود) ئەوەی پێویست بوو کردی، تەنها چەند کەسێك لە فەوجەکەدا پشتی پێ بەستن و کاری پێ سپاردن، بە نهێنی ئەفسەرەکانەوە لەگەڵ من و کاك نوری ڕەشید کۆبووەوە، پێی وتین ئەم شەو عەبدولسەلام ئەگەڕێتەوە بۆ بەغدا نیازی خراپی هەیە، ئەمەوێت لە ڕووی دڵسۆزییەوە بە ئێوەو هەموو کوردێك بڵێم کە بیروباوەڕی عەبدولسەلام بەرامبەر بە کورد زۆر خراپە، هیچ جۆرە مافێك نادات بە کورد، دەڵێت کوردەکان لە

---

(١) مذكرات فؤاد عارف: تقديم وتعليق: الدكتور كمال مظهر. الجزء الاول / مطبعة خبات- دهوك، ص ١٩٧ وما بعده.

بنچینەدا عەرەبن، ئینجا ئێوەش دەبێت دڵسۆزانە لێپرسراوێتی بخەنە سەرشانتان لەگەڵ دڵسۆزو نیشتمانپەروەرکانی تر بۆ ئەوەی ڕێگە نەدەین حوکمی ئەم نیشتمانە بکەوێتە ژێر دەستی عەبدولسەلام.

لەبیرم نەماوە کاك نوری ڕەشید چ شتێکی پێ سپێردرا بوو، بەڵام من لەگەڵ (مدرعە)یەك ڕۆیشتم تا بەیانی ئەمسەرو ئەوسەری ئەبوغرێبمان کرد، ئامێرێکی بێتەلی تێدابوو بۆ ئەوەی هەر ڕووداوێك بوو بە گورجی ئاگاداری بکەین، ئەو شەوە یەکێك بوو لە شەوەکانی ژیانم کەهەتا بەیانی یەك چرکە خەو نەچووە چاوم، هەر دوو کیلۆمەتر دەڕۆیشتین مودەڕەعەکەم لەسەر ڕێگاکە ڕائەگرت و دائەبەزیم بەنێوان گۆماوو درەختەکاندا ئەگەڕام بۆ ئەوەی بزانم کەسێك لەم ناوەدا نییە کە لەلایەنی عەبدولسەلام نێردرابێت پەیوەندی بە ئاژاوەوە هەبێت، هیچم پێ نەبوو تەنیا دەمانچەیەك نەبێت لەگەڵ چەند فیشەکێك، لەگەڵ ئەمەدا دوایی دەرکەوت کە هەندێ لەوانەی ئەو شەوە لەگەڵ من بوون لە ژێرەوە پەیوەندییان هەبووە بە عەبدولسەلامەوە، پاش هاتنە دەرەوەی لە بەندیخانەساڵی ١٩٦٢ ئەوی ئەو شەوە کردمان بە تەواوی بۆیان گێڕابوویەوە.

بەیانییەکەی عەبدولکەریم قاسم بە تاهیر یەحیای وت، کە ئەوکاتە بەڕێوەبەری گشتی شورتە بوو: عەبدولسەلام بێنە بۆ لام، عەبدولسەلام ڕازی نەبوو، وتی: من لە ماڵی خۆم دائەنیشم پەیوەندیم بە هیچەوە نەماوە، هیچ پلەو پایەیەکم ناوێت، ئینجا عەبدولکەریم قاسم فەرمانیدا بخرێتە بەندیخانەوە، داوای کرد دادگایەکی سەربازی دەسەڵاتی بداتێ بۆ ئەوەی دادگایی عەبدولسەلام بکات.

ڕۆژی ١٩٥٩/٢/٥ بەپێی فەرمانی ژمارە (١٣٢) لە ١٩٥٨/١٢/٩ بەپێی ماددەی (٨٠) یاسای عقوباتی بەغدایی، بە تاوانی ماددەی (٢١٤) دەلالەتی ماددەی (٦٠) بە نووسراوی سەرۆکی هێزە چەکدارەکان (عەبدولکەریم قاسم) ژمارە (١٨٤) لە ١٩٥٨/١٢/٢٦ بڕیاری دادگایی درا، بە ئەندامێتی ئەمانە:

| | |
|---|---|
| ١ـ عقید فازیل عەباس مەهداوی | سەرۆك |
| ٢ـ عەبدولهادی ڕاوی | ئەندام |

٣ـ عقید فتاح سەعید شاڵی ئەندام
٤ـ مقدم شاکر محمود سەلام ئەندام
٥ـ رئیس اول ئیبراهیم لامی ئەندام
٦ـ عقید ماجد موحەممەد ئەمین مدعی عام

ئیفادەی (٣٢) شاهید وەرگیرا، وە (٢٣) دانیشتنی بۆ کرا، واتە ئەم دادگایە (٢٣) جار کۆبووەوە بۆ دادگایی عەبدولسەلام، لە کۆبوونەوەی یەکەمدا مودەعی عام وتارێکی دوورو درێژی خوێندەوە بە درێژایی باسی کارە ناڕەواییەکانی (عەبدولسەلام)ی کردو، هەروەها باسی ئەو تاوانانەی کرد کە یاسا سزای بۆ داناوە.



**لە ڕۆژی دادگاییەکەدا ئەم بڕیارەی دەکرد:**

**حكمت المحكمة على المجرم العقيد الركن المتقاعد عبدالسلام محمد عارف:**

**اولا:** بالاعدام شنقا حتى الموت وفق المادة (١١) من مرسوم الادارة العراقية رقم (١٨) في سنة ١٩٣١ وبدلالة الفقرة (٦) من المادة (٢١٤) ٦٠ من قانون العقوبات البغدادي.

**ثـــانـيا:** ان محكمتنا اذ تصدر حكمها بالاعدام على المجرم المذكور تود الرأفة به لامر

سيادة زعيمنا العبقري وحمكته وسلطته الواردة من المادة (٢٠) من قانون معاقبة المتأمرين.

**ثــالثــا:** من التهم المسندة إليه بموجب المادة (٨٠) من قانون عقوبات البغدادي.

**رابعــا:** بطرده من الجيش وفق المادة (٣٠) من قانون العقوبات العسكرية.

ئەم دادگایە بە نهێنی کرا، جگە لە سەرۆك و ئەندامەکانی دادگاو مودەعی عام و شاهیدەکان کەس ئاگادار نەکرا، لە پاشان ئاشکرا کردنی بڕیارەکە زۆر دواخرا، چونکە جیاوازییەك پەیدابوو لە بۆچوونی ئەندامەکانی دادگادا، فەتاح شاڵی و عەبدولهادی ڕاوی دژی حوکمەکە بوون، بەڵام سەرۆکی دادگا (مەهداوی) سووربوو لەسەر خنکاندنی.

دادگاییەکە تۆمارکرابوو، لە پاش ماوەیەك شەوێك لە تەلەفزیۆن پیشان درا، گوێمان لە بەرگری عەبدولسەلام ئەگرت، ئەفسەرێك هەبوو کە دوای عەبدولسەلام گوێزرابووەوە بۆ فەوجەکەمان ناوی (عەدنان جەعفەر) بوو، کۆمۆنیستی بوو، لێپرساوی ڕێکخستنی کۆمۆنیستەکانی لیوای (٢٠) بوو، کە لەو کاتەدا ئامر لیواکەمان (هاشم عەبدولجەبار) بوو، ئەویش کۆمۆنیستی بوو، ئەو ئەفسەرە تازەیە پرسی وتی: "عبدالسلام کان هیچی سخیف عندما کان امر فوج مالکم؟"، یەکێك لە ئەفسەرەکان، (نقیب ثابت نعمان) وەڵامی دایەوە بەبێ ئەوەی پرسیارەکە لەو کرابێت، وتی: (بل چان اسخف). ئەمەش لەبەر ئەوەی ماستاو بکا بۆ ئامر لیواو ئەو کۆمۆنیستانەی دانیشتبوون.

ئەو ئەفسەرەی کە ئەم وەڵامەی دایەوە لە مولازم یەکەمەوە تا بوو بە نەقیب لە هەموو تاقیکردنەوەیەکدا عەبدولسەلام یارمەتیدا بۆ بەرزبوونەوە، بۆ نووسین بە جۆرێکی وا سوودی هەبێت بۆ بەرزبوونەوەکەی، هەمیشە هەموو هەڵەو ناتەواوییەکی دادەپۆشی.

منیش پێم وت: (ابو ریاض)، وەڵامەکەت زۆر دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە ئەفسەرەکانی فەوجەکە هەموو دانیشتوون ئەزانن فەوجی عەبدولسەلام هەردەم لە پشکنیندا یەکەمی لیواکە دەردەچوو، هەردەم لە هەڵسوڕاندنی بەڕێوەبردنی

کاروباری فەوجەکەی لە ئامر فەوجەکانی تر زیرەکترو زاناترو ئازاتر بووە، وتم: عەبدولسەلام ئێستا بە مردوو ئەژمێررێت، چونکە وەك هەموومان زانیمان حوکم دراوە بە سەریا بە خنکاندن، ئەبوایە بتوتایە بۆ ئامر فەوجێ کەمتر نەبوو لە ئامرەکانی تر لە هەموو شتێکدا، بەڵام هی ئەوە نەبوو لە کتوپڕ سێ پلەی بەرزی بدرێتێ، (جێگری سەرەك وەزیران، جێگری هێزە چەکدارەکان، وەزیری ناوخۆ)، چونکە پلەی بەرز پیاو ئەبێت پلە دوای پلە وەری بگرێت، بە شارەزایی و تاقیکردنەوە بیگاتێ، ئەگینا وەکو ئێستای عەبدولسەلامی لێدێت، هەڵەکانی تووشی سزای دەکەن.

کاتێ هاتینە دەرەوە دەستی گرتم وتی: بۆچی سەرزەنشتت کردم لە بەردەمی ئەفسەرەکاندا؟ نازانیت هەموومان منداڵمان هەیەو ئەمانە ئەتوانن نانمان ببڕن.

وتم: پرسیارەکە لە تۆ نەکرا، بۆچی وەڵامت دایەوە؟ کە وەڵامت دایەوە بۆچی زۆر ڕۆیشتی؟

ڕۆژ ڕۆیشت و ڕۆژ هات، عەبدولسەلام عارف لە پاش کودەتای (١٩٦٣) کرا بەسەرەك کۆماری عێراق، بۆ یەکەمجار لە پێش ئەوەی کۆشکی کۆماری تەواو بێت عەبدولسەلام لە (بلاط) لە جێگای مەلیك دادەنیشت، ڕۆژێك بە بەردەم بیلاطەکەدا ئەڕۆیشتم، لەپڕ لەبەردەگاکەدا تووشی ئەم ئەفسەرە بووم، تەماشام کرد هەموو گیانی ئارەق بوو، ئەوەندە بەپەلە هاتبوو، لەو کاتەدا پێی وتم: (أبو محمد) تۆ نەچوویت بۆلای ئەبو ئەحمەد (عەبدولسەلام)؟ وتم: کاتێك لە بەندیخانە بەربوو، هاتە دەرەوە، هیچ کامتان لە ئەفسەرەکانی فەوجەکەی نەتان وێرا بێن بۆلای، من ڕۆژی یەکەم بە خێزانەوە چووم بۆلای، لەگەڵ چەند جاریکی تریش، ئێستاش لەو پلەیەدایە هەتا نەنێری ناچم بۆلای.

ویستم پێی بڵێم ئەمەت لەچی و ئەو قسانەت لەدژی لەچی؟ کە بە هەناسە بڕکێ هاتبوو بۆلای ئەبو ئەحمەد، بەڵام لەبەرئەوەی ئەمجۆرە خووانە زۆرترین خەڵکی عێراق خوی پێوە گرتووەو زۆر باوە وازم لێهێناو ئەویش ڕۆیشت بۆ لای.

## بەربـوونی

## عەبدولسەلام لە بەندیخانە

ساڵی ١٩٦٢ عەبدولکەریم قاسم لە عەبدولسەلام خۆشبوو، ئەنجومەنی سیادە، کە رۆڵی سەرۆك کۆماری عێراقی ئەدی، بڕیاری دەرکرد بە لێبوردنی لەو سزایەی کە درابوو بە سەریدا، عەبدولکەریم بۆ خۆی ڕۆیشت لە بەندیخانە هێنایە دەرەوە، (بەندیخانەی ژمارە یەك لە سەربازگەی ڕەشید)، بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی هێنایەوە ماڵ.

هەروەك لەمەوپێش باسم کرد کاتێك لە ئێزگە خەفەر بووم کاتژمێر یەکی شەو ئۆتۆمبێلە سەربازییەکەم ڕاگرت بینیم فەرشەکانی ماڵی صەباحی نووری سەعیدی تیابوو، دەیانبرد بۆ ماڵی عەبدولسەلام، کاتێك عەبدولکەریم فەرشەکان دەبینێت، ئەڵێ: ئەم فەرشە جوانەتان لەکوێ بوو؟ ئەویش ئەڵێ: کاتێ من لە بەندیخانە بووم، پیاوێکی میسری لە بەغدا بوو کاتێك گەڕایەوە بۆ میسر، شت و مەکی ماڵەکەی فرۆشت، دایکی ئەحمەد ئەم فەرشانەی لێ کڕیبوو.

ڕۆژی دووەمی هاتنە دەرەوەی عەبدولسەلام عارف، شەو چووم بۆ ماڵیان بۆ لای، پێیان وتم: لە وەزارەتی بەرگرییە، ڕۆژی سێیەم پاش تەواوبوونی خوێندنی ئێوارەمان، کە قوتابی بووم لە کۆلیجی یاسا، لەوێوە دووبارە چووم بۆ ماڵیان، تەماشام کرد ژووری میوان پڕە لە پیاوە گەورەکانی بەغدا، هەر گەیشتمە دەرگاکە هەستایەوەو هات ئەم لاو ئەولای ماچکردم، تەماشای دانیشتووەکانی کردو وتی: (هذا مجاهد)، پێم وت: دوێنێ هاتم بۆ لات وتیان لە وەزارەتی بەرگرییە، بە هێواشی وتی: "اني ما اجوز من الدفاع ومن اهل الدفاع".

پاش ماوەیەك جارێكی تر چوومەوە بۆ لای، داوای لێكردم ئەو نووسراوانەی كە زووتر من نووسیبووم لە بابەت شۆڕشی (١٤)ی تەمموزەوەو پێش شۆڕش، كە زۆرتری نووسینەكان پەیوەندی بەوەوە هەبوو، بینێرم بۆ لوبنان بەناوێكی نادیارەوە چاپ بكرێن و بڵاوی بكەنەوە، وتم: بە زمانی كوردی نووسیوومن، وتی بیكە بە عەرەبی، وتم: ئێستا خەریكی خوێندنم مەگەر لە پشووی هاویندا بیكەم.

جارێكی تر پاكەتێك شیرینیم برد و لەگەڵ دایكی موحەممەد چوین بۆماڵیان، لەگەڵ خۆی و خێزانەكەی تێكەڵاویمان هەبوو، شەوبوو كە چووین بۆ ماڵیان، ئەمجارەش دووبارە داواكەی بیر خستمەوە.

جارێكی تر كە چووم بۆ لای زۆر بەڕوویەكی ترش و گرژەوە تەماشای كردم، بە ساردییەكەوە بەخێرهاتنی كردم، منیش وامزانی لەبەر نووسراوەكەیە، تۆزێك دانیشتم و دوایی ماڵئاوایم لێكرد، بڕیارمدا تا ماوم لێی نزیكی نەكەوم، دوایی بۆیان گێڕامەوە یەكێك لەو سەربازانە كە ئەو شەوە لەگەڵم بوون لە ناو (مدرعەكە)دا لە ئەبو غرێب هەموو شتەكانی بۆ گێڕابووەوە.

كاتێك بوو بە سەرۆك كۆمار، لە ساڵی (١٩٦٣) لە پاش كودەتاكەی لە دژی عەبدولكەریم قاسم، بە تاوانی كوردایەتی منیان گرت، سەرۆكی ئیمامەكانی سوپا (تۆفیق زین العابدین) زۆر خۆشی دەویستم، كاتێك كە گیرام لە ئابی (١٩٦٣) چوو بۆ لای سەرۆك كۆمار عەبدولسەلام عارف پێی وتبوو: مستەفا گیراوە، كە ئیمامی تۆیەو نزیكەی شەش ساڵ لەگەڵت بووە، لەبەر ئەوە داوا دەكەم فەرمان بدەیت كە ئازاد بكرێت، ئەویش وتبووی: (یستاهل لانه انحرف الی البارزانیین)، واتە: شایەنی ئەوەیە بگیرێت، چونكە ڕێگەی چەوتی بەرزانییەكانی گرتووە، منیش لەو ڕۆژەوە بێ وەفایی ئەوم بۆ معلوم بوو.

هەرچۆن بێت دووجار تاوانبار كرام بە پارتی و گیرام، دیارە من كوردم، هەتا بمێنم دڵسۆزی كوردم، هیچ كاتێ شتێكم نەكردووە دژی بەرژەوەندیی ئەم گەلە

بێکەسە ستەم لێکراوە، بەڵام لە هەمان کاتدا هیچ کات نەبووم بەلایەنگیری حزبێك.

لە ساڵی ١٩٦٤ بە بۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)، لە یانەی ئەفسەران ئاهەنگێکی گەورە کرا لەلایەن سوپای عێراقەوە، ئەویش کە سەرۆك کۆمار بوو داوایان لێکردبوو کە لەو ئاهەنگەدا بەشداریی بکات، کاتێك هات لەگەڵ سەرۆك وەزیران (ناجی تالیب)، هەموو دانیشتوانەکە چوون بە پیریەوە، من لە جێگەکەی خۆم هەڵنەسام، کاتێك دانیشت ناوبەناو تەماشایەکی دەکردم، نازانم لە دڵیدا چی دەوت.

# کورته باسێکی
# عەبدولکەریم قاسم



عەبدولکەریم قاسم لە ساڵی ١٩١٤ لە گەڕەکی (مهدیە) لەدایك بووە، باوکی لە شێخەکانی عەشیرەتی زەیدە، دایکیشی لە شێخەکانی عەشیرەتی (تەمیم)ە، دوو برای هەبووە، واحید کە لە بازرگانیدا ئیشی ئەکردو عەبدوللەتیف کە نائیب زابت بوو لە جەیش، هەر بە نائیب زابتی مایەوە هەتاکو شۆڕشی (١٤)ی ڕەمەزانی ساڵی **١٩٦٣**. دوو خوشکی هەبوو (ئامینە)، کە ژنی موحەممەد صالح بوو، نەجیبە کە ژنی کوڕی پووری بوو لیوا (عەبدولجەبار جواد)، مامێکی زابت بوو، ناوی نەقیب عەلی ئەفەندی موحەممەد ئەلبەکر بوو، کە

لە ساڵی (١٩١٧)دا لە شەڕی جیهانی یەکەم شەهید بوو.

باپیری شەشەمی عەبدولکەریم قاسم لە یەمەنەوە هاتووە بۆ بەغدا، کاتێك کە عەبدولکەریم تەمەنی هەشت ساڵ بووە، باوکی (قاسم) لەگەڵ هەموو خێزانەکەیدا، لە بەغداوە چووە بۆ (صویرە)، واتە ساڵی ١٩٢٢، باوکی ئەو کاتە دارتاش بووە، لەوێ عەبدولکەریم چووەتە قوتابخانە، تا پۆلی چوارەمی تەواو کردووە، ساڵی ١٩٢٦ باوکی گەڕایەوە بەغدا لە گەڕەکی (مهدیە) لە (قنبر علی) دەستی کرد بە بازرگانی و وازی لە دارتاشی هێنا.

ساڵی ١٩٣١ عەبدولکەریم قاسم ئامادەیی تەواو کردووەو بووە بە مامۆستای سەرەتایی لە قوتابخانەی (شامیە) بۆ ماوەی ساڵێك، پاشان چووەتە کۆلێجی سەربازی و لە ١٩٣٤/٤/١٥دا بووە بە (ملازم) لە سوپای عێراقداو، لە پرۆژەی حلە دامەزراوە.

لە ڕۆژی ١٩٤٠/١/٢٤ چووەتە بۆ کۆلێجی ئەرکان، لە ڕۆژی ١٩٤١/١٢/١١ دەرچووە بە ئەنجامی (أ) دوو ساڵ.

نەقیب ڕوکن عەلائەددین موحەممەد مامۆستای عەبدولکەریم لە کۆلێجی ئەرکان ئەڵێت: عەبدولکەریم زۆر بە پاکی و دڵسۆزی ئەرکی سەرشانی جێ بەجێ ئەکرد لە کاتێکدا کە لەژێر ئامرێکی بەهێزدا ئیش بکات.

عەبدولکەریم قاسم ژن و ماڵی نەبوو، هەموو مووچەکەی پارەی نان خواردنی لێ جیائەکردەوە و ئەوی تری خەرج ئەکرد بۆ دروست کردنی باخچە و ناشتنی دارو درەخت لە ناو سەربازگەکەدا، کاتێ شەهیدیش کرا خانوی نەبوو، لە خانوی خوشکەکەیدا دەژیا لە بەتاوێن کە نزیك کۆشکی سپی بوو، لەپاش خۆی هیچ شتێکی بەجێ نەهێشت لە پارەو پول و زەوی.

لێرەدا جێی خۆیەتی ئەو پرسیارە بکرێت: ئایا جارێکی تر عێراق سەرکردەیەکی وای بۆ پەیدادەبێ؟

## ناوبانگ دەرکردنی عەبدولکەریم قاسم لە فەڵەستین

لە مانگی مایسی ساڵی ١٩٤٨ سوپای عێراق بۆ ڕزگارکردنی فەڵەستین چوو بۆ فەڵەستین، لەو ڕووەوە باسی ناوبانگی عەبدولکەریم قاسم ئەکەین لە شەڕی ساڵی ١٩٤٨ەوە سوپاسنامەیەکی بۆ هات لە لایەن سەرۆکی هێزە چەکدارەکانی عێراقەوە لە فەڵەستین، ئەمە دەقی بروسکەکەیە کە بۆی هات:

**لە سەرکردەی هێزە چەکدارەکانی عێراقەوە لە فەڵەستین:**

**بۆ/ ئامری رەتلی مجامع (ف١ ل١)موقەددەم روکن عەبدولکەریم قاسم لە کفر قاسم.**

پیرۆزبایی ئەکەم لەو هەموو ئازایەتی و چاونەترسییە پیاوانەیەتان، هەروەها ئازایەتی ئێوە لەو کارانەی کەپێتان سپێرراوە جێبەجێتان کردووە و رێگری هێرشی دوژمنتان کردو گێرانەوەی ئەو جێگایانەی کە داگیر کرابوون و، زۆر زیانتان لە دوژمن دا، سوپاکەمان و ئەم ئیشەی ئێوە بوون بەهۆی ئەوە کە دوژمن بە شێوەیەکی ناڕێکو پێك بکشێتەوەو ڕابکات و جێگەکانی خۆی بەجێ بهێڵێت.

## ئەو ڕۆژەی بۆی ئەگەڕا هاتە دی

لە ١٩٥٣/١٢/١٣ فەرمان دەرکرا بە دانانی عەقید ڕوکن (عەبدولکەریم قاسم) بە ئامر لیوای (١٩) لە سەربازگەی (منصوریە)، ئەم پلەیە ماوەیەکی زۆربوو خەوی پێوە ئەبینی، لەم کاتەدا نوری سەعید پەیوەندی زۆر باشبوو لەگەڵیدا، لە کاتی هێرشی سێ قۆڵی بۆ سەر میسر(العدوان الثلاثي) لە ساڵی ١٩٥٦، (لیوای ١٩) ڕۆیشت بۆ ئوردن، لەم کاتەدا عەبدولکەریم قاسم کە ئامری ئەم لیوایە بوو هەموو جوڵە و هەنگاوی گرنگی نا بۆ قسەکردن لەگەڵ ئەفسەرە ئوردونی و سورییەکان و داوای لێکردن کە بە هەموویانەوە هەوڵبدەن بۆ گۆڕانکاری لە وڵاتانی عەرەبی و دوورخستنەوەی کۆڵۆنی ئەمریکی و ئینگلیزی.

## عــەبدولکــەریم لە ئــازایــەتی عەبدولسەلام عارف قازانجی کرد

برایەتی عەبدولکەریم و عەبدولسەلام کۆنە، هەر لە کۆلێجی سەربازییەوە بوو، کاتیك کە عەبدولکەریم ئامر فەصیل بوو و عەبدولسەلام قوتابی بوو، لە پاشان لە لیوای (٧) لە بەسرە پاش شۆڕشی مایسی ١٩٤١، عەبدولکەریم موقەددەم لیوای (٧) و عەبدولسەلام ئامر فەصیڵ بوو لە فەوجی مەشق، هەموو ڕۆژێ پاش دەوام بە یەکەوە کاتیان بەسەر ئەبرد لە بەسرە، ئەم دوو کەسە هەر لەو کاتەوە حەزیان لە سیستەمی کۆماری بوو، هەوڵی سەرکردایەتییان ئەدا، هەردووکیان شارەزای خاڵی بەهێزو بێهێزی یەکتر بوون.

دواتر لە (بەڕێوەبەرێتی مەشقی سەربازی) یەکیان گرتەوە لە لقی (تمارین ومناورات) بوون بە یەك و بەیەك ئامانج، پاش ئەوەش لە لیوای(١٩) بەیەکەوە ئیشیان کرد، عەبدولکەریم ئامر لیوا بوو لە (مەنصورية) و، عەبدولسەلام ئامر فەوجی (٣) بوو لە جەلەولا، بە هەمیشەیی یەکتریان بینیوە، زۆرجار عەبدولسەلام دەستی دەخستە کاروباری (لیوا)وە بەڵام عەبدولکەریم قسەی نەئەکرد، چونکە پێویستی پێی بوو، بەڵام عەبدولکەریم زیاتر بێدەنگ بوو، شتی ئەشاردەوە.

لە ساڵی ١٩٥٥دا هێزی ئالی لە جەلەولا هەڵوەشایەوە، لە شوێنیدا لیوای (٢٠) پێکهێنرا، مەقەڕی هێزی ئالی کرا بە مەقەڕی لیوای (٢٠)، نازم تەبەقچلی کرا بە ئامری لیوای (٢٠) و تەها یاسین بوو بە ئامری (ف١ / ل٢٠) وە (ف٣ / ل١٩) بوو بە (ف٣ / ل٢٠) و عەبدولسەلام بوو بە ئامر فەوج، دوو فەوجی تازەیان دروست کرد (ف٢/ل٢٠) موقەددەم ڕوکن (یاسین موحەممەد ڕەئوف) بوو بە ئامری فەوج بە وەکالەت، لەم پێکهاتنە تازەیەدا عەبدولسەلام ڕۆڵی باشی بینی و، دەستی کرد بە ڕێکخستنی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان لە هەردوو (لیوای ١٩و ٢٠) و (عەبدولکەریم)یش دەستخۆشی لێ ئەکرد، چونکە لە بەرژەوەندی هەردوولا بوو، لەم کاتەدا ئامری (ف١ / ل٢٠) عەقید ڕوکن

(تەها یاسین) گوێزرایەوە، لە هەمان کاتدا (نازم تەبەقچلی)یش گوێزرایەوە، کەسیان لە شوێنەکەیدا دانەنا، عەبدولسەلام بوو بە وەکیلی ئامر لیوا، کۆنترۆڵی لیواکەی گرتە دەست، دەستی کرد بە مەشقی دەرەکی لە دەرەوەی سەربازگەکە.

لەم کاتەدا دووبەرەکی لەنێوان عەبدولسەلام و یەکێك لە ئامیر فەوجەکان دروست بوو لەسەر مەشقکردن، ئەم ئامر فەوجە بە نهێنی نامەیەکی نارد بۆ قائید فرقە (غازی داغستانی)، لەم کاتەشدا مەقەڕی گشتی داوایان کرد لیوای (٢٠) ئامادە بێت بۆ ڕۆیشتن بۆ ئوردون.

ئەم (ئامر فەوجە) زۆر شتی لە نامەکەدا نووسیبوو بۆ قائید فیرقە، تیایدا باسی کردبوو کە چۆن عەبدولسەلام جوێن ئەدات بە ڕژێم و ئەفسەرەکان هان ئەدات لە دژی ڕژێم و هەوڵئەدات عێراق بکات بە (کۆماری) و بچێتە پاڵ میسر. نووسیبووی کە ئەم پیاوە دین و نەتەوایەتی بەکاردەهێنێت بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی، لە کۆتاییدا داوای کردبوو کە بەزووترین کات (عەبدولسەلام) لە پلەی ئامیر لیوا دەربکرێت، چونکە زۆر مەترسی هەیە بۆ بەرژەوەندی وڵات.

پاش ئەم نامەیە، لە ١٩٥٨/٦/٩، واتە پێش شۆڕشی (١٤)ی تەمموز بە پێنج هەفتە، فەرمان دەرچوو بە دانانی زەعیم ڕوکن (ئەحمەد حقی موحەممەد عەلی) بە ئامر لیوای (٢٠). دامەزراندنی (ئەحمەد حقی) تۆزێك جێگەو دەسەڵاتی عەبدولسەلامی لاواز کرد، بەڵام ئەوەندەی نەبرد کە عەقید عەبدوللەتیف ئەلدراجی بوو بە ئامری (ف١/ل٢٠)، ئەمە بۆ عەبدولسەلام زۆر باش بوو، چونکە عەبدوللەتیف لە ئەفسەرە ئازادیخوازەکان بوو، هاوڕێی عەبدولسەلام بوو، بەمجۆرە عەبدولسەلام دەسەڵاتی زیاد بووەوە بەسەر لیوای (٢٠)داو شۆڕشی (١٤)ی تەمموزی ئەنجام داو عێراقی کرد بە کۆماری.

## دڵ فراوانی عەبدولکەریم قاسم

کاتێ لەئوردن بووین، عەبدولکەریم قاسم لەوێ بوو، پیاوێك لەشاری (سفرت)ەوە کەنزیك لیواکە بوو بۆ هات بۆ ناو ئەفسەرەکان و بە عەبدولکەریم قاسمی وت: من عێراقیم، چەند ساڵێك لەم شارە دوکاندار بووم، ئێستا لێم قەوماوە یارمەتیم بدە.

وتی: فەرموو دانیشە.

(زابتی رەواتب)ی بانگ کرد وتی: بڕۆ قاسەکە بکەرەوە هەرچی پارەی تێدایە کەم و زۆر بیهێنە، دوایی لە موچەکەی من ببڕن و بیخەنە جێگەی ئەو پارەیە؟

کە هاتەوە وتی: (٨٠)دینار و (٦٠٠) فلسی تێدابوو.

هەمووی هێنا بۆ عەبدولکەریم قاسم، ئەویش دایی بە پیاوەکە، وتی: لەباتی ئەم ٨٠ دینارە، ئەگەر (٨٠٠) دیناریشی تیدابوایە بڕیارم دابوو هەمووی بدەم بەتۆ.

## کۆتایی عەبدولکەریم قاسم

سەعات نۆ و (٣٠) دەقیقەی سەر لە بەیانی ڕۆژی هەینی (٨/ شوباتی/ ١٩٦٣)، سێ فڕۆکە هێرشیان کردە سەر وەزارەتی بەرگری و سەربازگەی ڕەشید، یەکێك لە فڕۆکەکان جۆری (هنتر) بوو، (منذر الونداوي) فڕۆکەوانی بوو، دوو فڕۆکەکەی تر جۆری (مێگ ١٧) بوون، فڕۆکەوانەکانی دوو ملازمی هێزی ئاسمانی (فهد عبدالخالق السعدون)و (وائل عبدالله ڕەمەزان) بوو، دەستیان کرد بە بۆردومانکردنی مەقەڕی عەبدولکەریم قاسم لە وەزارەتی بەرگری.

وەك لە کەسانی نزیکم بیست، ڕۆژی (٧و ٨)ی شوبات ئەنجومەنی وەزیران لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم کۆبوونەوەی هەبوو، ئەم کۆبوونەوانە سەعات (١٢,٣٠) پاش نیوە شەو تەواو بوون، لە پاشان عەبدولکەریم لە وەزارەتی بەرگری دەرچوو



بۆ گەڕان بەناو بەغدا، چونکە هەمیشە ئەم گەڕانەی دەکرد، ئەو شەوە چوو بەرەو ماڵی (یحیی جدە) برای (عەبدولکەریم جدە) ئامیر ئینزیباتی سەربازی، کە ماڵیان بەرانبەر ماڵی عەبدولسەلام بوو، عەبدولکەریم هیچ شتێکی نەبینی کە نائاسایی بێت، پاش ئەم سەردانە سەعات (٣,٣٠)ی شەو گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی و نووست، بەیانی زوو تەلەفۆن لێیدا، یەکێك بە عەبدولکەریمی وت: گەورەم کۆمەڵێك بنکەی شورتەی (مأمون)یان لە کەرخ داگیر کردووە، بە خێرا هەڵساو جلی لەبەرکرد، لەم کاتەدا مورافیقی عەبدولکەریم هاتە ژوورەوە وتی: ئێزگە (بەیان) دەرئەکات، دیسان تەلەفۆن لێدا کە عەبدولکەریم قاسم هەڵی گرت بەڕێوەبەری ئاسایش قسەی کرد، عەبدولمەجید جەلیل وتی: کودەتایە، لەم کاتەدا عەبدولکەریم بە مورافیقەکەی وت: با بچین بۆ سەربازگەی ڕەشید، تەلەفۆن بکە بۆ لیوای (١٩) کە ئامرەکەی عەمید ڕوکن فازیل عەباس خەلیفە بوو، عەبدولکەریم پێی وت: ئامادەبن ئەوا من هاتم بۆ لاتان، لەم کاتەدا زەعیم ڕوکن تەها شێخ ئەحمەد گەیشتە ماڵی عەبدولکەریم، چونکە ماڵی نزیکبوو، وتی: گەورەم با بڕۆین بۆ وەزارەتی بەرگری ئەمانە هیچ نین، چەند کەسێکی (بەعسی)ن هیچ ڕۆڵیان نییە، عەبدولکەریم ڕازی بوو.

عەبدولکەریم لەماڵەوە دەرچوو لە (باب الشرقی)ەوە بۆ شەقامی کۆماری بەرەو وەزارەتی بەرگری، بینی هەموو شتێك ئاساییە، خەڵکەکە سەلامیان لێ ئەکردو ئەمیش وەڵامی ئەدایەوە، گەیشتە وەزارەت و چووە ژوورەکەی، پاشان چوو بۆ یانەی ئینزیباتی سەربازی و بە زۆر کۆبوونەوەیەکی کرد لەگەڵیان، پلانێکیان دانا بۆ کۆنترۆڵکردنی بەغداد، بەڵام عەبدولکەریم ڕازی نەبوو بە پلانەکە، لەم کاتەدا خەڵکێکی زۆر کۆبوونەوە لە بەردەم وەزارەتی بەرگریدا داوای چەکیان دەکرد، عەبدولکەریم وتی: من نایکەم بە شەڕی ناوخۆ، دەستی کرد بە فەرمان دەرکردن بۆ یەکە سەربازییەکانی بەغدا، هەموویان وتیان باشە ئێمە ئامادەین، بەڵام لە ئەنجامدا هیچیان نەکرد، ئینجا عەبدولکەریم تەلەفۆنی کرد بۆ لیوای (١٩)، لیواکەی خۆی، تەها شەکرچی بە شێوەیەکی ناشیرین وەڵامی دایەوە.

عەبدولکەریم سواری ئۆتۆمبێلەکەی بوو کە بڕوات بۆ لیوای (١٩)، بەڵام لە ڕێگای وەزارەتی بەرگری پاسەوانەکانی وتیان مەڕۆ، چونکە فڕۆکە بۆردومان دەکات، عەبدولکەریم گەڕایەوە ناو وەزارەت و تەلەفۆنی کرد بۆ یەکە سەربازییەکان بێن بۆ یارمەتی، بەڵام کەس نەهات، تەنها ئەو کۆمەڵە سەربازەی وەزارەت بەبێ هیچ سەرکردەیەك شەڕیان کرد، جا لەمەدا دەرکەوت کە عەبدولکەریم هیچ پلانێکی باری نائاسایی دانەناوە، لەگەڵ ئەوەی کە خۆی سەربازو ئەفسەر بووەو پلەیەکی بەرزی هەبووەو لە زۆر شەڕدا بەشداری کردووە.

عەبدولکەریم تەلەفۆنی کرد بۆ ئێزگەو تەلەفزیۆن، وتی: ئێستا دێم بەیان دەخوێنمەوە، لەو کاتەدا بەرنامەی ڕادیۆو تەلەفزیۆن ئاسایی بوون، بەڵام تەها شێخ ئەحمەد نەیهێشت بڕوات، وتی: نامەیەك تۆمار بکەو بینێرە با بڵاوی بکەنەوە، ئەمیش بە قسەی کردو لەسەر شریتێك وتەیەکی تۆمار کرد، دەرکەوت کە باش تۆمار نەکراوەو قسەکانی تەواو نەبوو، چونکە ئەترسا، هەروەها دەنگی بۆمباران دەرچووبوو.

ئەمەش دەقی وتەکە بوو:

**سڵاوتان لێبێت ئەی ڕۆڵەکانی گەل:**

ئەی ئەفسەرەکان، ئەی ڕۆڵەکانی گەل، هەندێك لە نۆکەرەکانی کۆلۆنیزم و خائینان ئەیانەوێت کۆمارە خۆشەویستەکەمان بڕوخێنن، بەڵام گەلەکەمان گەلی (١٤)ی گەلاوێژ ئازایانە بەرامبەریان ڕاوەستاوە، ئەی گەلی ئازای عێراق، سەرکەوتن لەگەڵتانە و ئێمە بڕیارمان داوە کە داگیرکەران لەم وڵاتەدا نەهێڵین.

ئەی ئەفسەرە ئازاکان، تۆڵە لە خائینان بکەنەوە، من عەبدولکەریم قسەتان لەگەڵ ئەکەم، من لەگەڵ هەژارەکانم، هەموو کاتێ سەرکەوتن هەر بۆ گەلی عێراقی بەشەرەفە(ان شاء الله).

ئەم وشانەی نارد بۆ ئێزگە، بەڵام نەیانهێشت بڵاوی بکەنەوە، لەم کاتەدا بۆردومانی فڕۆکەکان زۆر بوو، ناچاری کردن کە دابەزنە خوارەوە بۆ ناو ژێر زەمین (ملجأ)، عەبدولکەریم زۆر لەسەرخۆبوو، پێئەکەنی و نیشانەی ترسانی پێوە دیار نەبوو، زۆر زۆر ئارام بوو، ئەیویست وورەی دەورو‌پشتی بەرز بکاتەوە، ئەو ژێرزەمینەی کە تیایدابوون زۆر تاریك بوو، لەبەر ئەوەی کارەبا نەبوو، چرایەکی کزیان دانابوو، عەبدولکەریم دەستی کرد بە قسەکردن بۆ ئەو کۆمەڵەی لەگەڵیدا بوون، کە ئەم قسانە دوا وتەی بوو:

"شۆڕشی (١٤)ی گەلاوێژ نامرێ و ئێمە لەسەر هەقین، ئەم وڵاتەمان ڕزگار کرد لە داگیرکەران و بنکەی (شوعیب و حەبانیە)مان گرتەوە، ئەم کۆمەڵە بەدەست و پاڵپشتی گەل نین پشت بەخوا لە ناویان دەبەین".

ئینجا هەموو چەپڵەیان لێدا کە ئەمە دوا چەپڵەبوو بۆ عەبدولکەریم لێ بدرێت.

بەیانی ڕۆژی (٩)ی شوباتی ١٩٦٣ عەبدولکەریم زوو ڕیشی تاشی، بەڕۆژوو بوو، هیچ هیوای بە ڕزگاربوون نەمابوو، لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاریدا کە هەتا مردن شەڕ بکات.

(یونس طائي) خاوەنی ڕۆژنامەی (الثورة) زۆر برادەری عەبدولکەریم بوو، هەوڵیدا لەگەڵ عەبدولکەریم و وتی: خۆت بدە بە دەستەوە من هەوڵئەدەم

لەگەڵ برادەرەکانت ڕزگارت بکەم، بەڵام عەبدولکەریم وەڵامی نەدایەوە، شەڕەکە بەردەوام بوو، پاشان عەبدولکەریم تەلەفۆنی کرد بۆ کۆمەڵی کودەتاکە، وتی: من ئامادەم خۆم بدەم بەدەستەوە.

عەبدولسەلام عارف ئەگێڕێتەوە ئەڵێت: لەم کاتەدا عەبدولکەریم لە (هۆڵی گەل) بوو کە پەیوەندی پێوە کردم، وتی: "عەبدولسەلام تۆ برامی، من ئەو نان و خوێیەی بەیەکەوە خواردوومانە لەبیرم ناچێتەوە، برایەتی من و تۆ هەموو شتێکە"، ئەڵێت من لە وەڵامدا پێم وت: "عەبدولکەریم من لاریم لەو برایەتییە نییە وەك تۆ دانت پێدا نا"، وتم: "ئەنجومەنی نیشتمانیی بڕیاری داوە کە خۆت بدەیت بە دەستەوە، وەك ئەسیر دەست بەرز بکەیتەوە و پلەکانی سەرشانت لا بدەیت"، لە پاشان عەبدولکەریم دەستی کرد بە پاڕانەوە لێم و وتی: سەلام، برایەتییەکەمانت لەبیر چووەوە! ئەڵێت وەڵامم دایەوەو وتم: من هەموو شتێکم لەبیرە، بەڵام ئەمە بڕیاری نیشتمانە بۆ ئەوەی ڕزگاری بکەین لە تۆ.

عەبدولسەلام ئەڵێت: تەلەفۆنی بۆ کردمەوە وتی: ئەمەویٚ ڕێزم بگرن، چونکە شتی زۆر گرنگم لا هەیە، بە کەڵکی ئەم وڵاتەمان دێت، هەوڵبدە بەڵکو بچمە دەرەوەی عێراق.

لە سەعات (١٢,٤٠)ی نیوەڕۆی (٩) شوباتی ١٩٦٣، تەقە کردن وەستا، لە وەزارەتی بەرگری سەربازەکانی عەبدولسەلام ناو وەزارەتیان پاك کردەوە، گەیشتنە (هۆڵی گەل) کە عەبدولکەریم و کۆمەڵەکەی لەویٚ بوون، (٥) کەس بوون خۆیان دا بەدەستەوە، عەبدولکەریم قاسم لە پێشەوە دوو سەرباز دەستیان گرتبوو، ڕادیۆیەکی ترانزستۆری بچووك بە دەستی چەپییەوە بوو، بەدوایەوە (تەها شێخ ئەحمەد، قاسم الجنابی، فازیل مەهداوی، کەنعان خەلیل حەداد)، ئەم پێنج کەسە سواری مودەڕەعە کران، بە پاسەوانی ئەفسەرێك کە (حرس قومي) بوو، ناردنیان بۆ ئێزگە لە صالحیە، بە شەقامی ڕەشیددا ڕۆشتن، چونکە مەقەڕی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە صالحیە بوو.

تێبینی: کاتێ چەکدارەکانی کودەتا بەرەو وەزارەتی بەرگری دەچوون بەناو خەڵکدا وێنەی عەبدولکەریم قاسمیان لێ دابوو، بۆ ئەوەی خەڵکەکە ڕێیان لێ نەگرن و وابزانن کە ئەمانە بۆ هاوکاری عەبدولکەریم دەچنە ژوورەوە.

## دادگایی عەبدولکەریم

سەعات یەکی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی شەممە (٩)ی شوباتی ١٩٦٣ عەبدولکەریم قاسم و برادەرەکانی گەیشتنە ئێزگە لە صالحیە بە سواری دوو مودەڕەعە، کاتێك عەبدولکەریم دابەزی، (رئیس عرفا)یەك ناوی عەزیز شەهاب بوو، چووە پێشەوە بۆی و یەك زللەی لێداو وتی: ئەمە لە جیاتی (نازم تەبەقچلی)یە، سدارەکەی عەبدولکەریم کەوتە سەر زەوی، ئەو ئەفسەرەی لەگەڵ عەبدولکەریم لەناو مودەڕەعەکەدا بوو ناوی (رائید ڕوکن صبحی عەبدولحەمید) بوو، سدارەکەی هەڵگرتەوەو دایە دەست عەبدولکەریم، ئەویش وتی: زۆر سوپاس، ئینجا ڕائیدەکە بە رەئیس عورەفاکەی وت پێویست ناکات بۆ لێی ئەدەیت.

لەو کاتەدا عەبدولکەریم لەڕێڕەوی ئێزگەوە چووە ژوورەوە، صاڵح مەهدی عەمماشی بینی پیرۆزبایی لێکرد لە شۆڕشە تازەکەو چوونە ژوورەوە، ڕائید صبحی عەبدولحەمید کورسی بۆ دانان و عەبدولکەریم زۆر سوپاسی کردو دانیشت.

پاش ئەوە ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی سەرکردایەتی شۆڕش هاتنە ژوورەوە (عەبدولسەلام عارف، ئەحمەد حەسەن بەکر، عەبدولستار عەبدوللەتیف، عەلی صاڵح ئەلسەعدی و هەندێك لە وەزیرەکان).

یەکێك لەو کۆمەڵە وتی: ئەگەر عەبدولکەریم نەکوژین و شیوعییەکان بزانن ماوە شۆڕشەکەمان سەر ناگرێت، کوشتنی پێویستە، باقی کۆمەڵەکە وتیان ڕاست ئەکەیت، کاتێ عەبدولسەلام هاتە ژوورەوە، عەبدولکەریم وتی: سەلام، من تۆم نەکوشت، تۆش من مەکوژە قازانج ئەکەیت لە من.

مەحمود شیت خەتتاب ئەڵێت: ئەم قسانەی عەبدولکەریم زۆر زۆر کاری کردە سەر عەبدولسەلام، وای کرد کە نەیکوژێت، بەڵام یەکێك لە کۆمەڵەکە هاواری کرد بەسەر عەبدولسەلامداو وتی: ئەم کاتە زۆر ناسکە چاوەڕوانی چی ئەکەن، چونکە لەو کاتەدا زۆر لە خەڵك دروشمیان دەدا بەناوی عەبدولکەریم قاسم و دەوری ئێزگەیان دابوو داوای مانی عەبدولکەریم-یان دەکرد، عەبدولسەلام ناچار بوو، وتی: من یەکێکم لە ئێوە، ئێوە چی بڕیار ئەدەن بیدەن.

عەبدولکەریم بەخێرایی ڕووی کردە کۆمەڵەکەو وتی: من خزمەتی گەلەکەم کردو شۆڕشمان کرد، خزمەتی هەژارم کرد، خانووم بۆ کردن، ئەم چەکەی ئێوە بەکاری دێنن من هێنام، بمنێرن بۆ دەرەوە مەمکوژن، بەکەڵکتان دێم، بمنێرن بۆ تورکیا.

عەبدولسەلام وتی: عەبدولکەریم هەموو ئیشەکانت لە دژی نەتەوەی عەرەب و ئیسلام بوو، عەبدولکەریم وەڵامی دایەوە وتی: من نەتەوەی عەرەبم خۆش ویستووە.

عەبدولسەلام ڕووی کردە تەها شێخ ئەحمەد پێی وت: من و کەریم نان و خوێ لە نێوانماندا هەیە، تورە ئەبین لەیەکترو ئاشت دەبینەوە، برای یەکترین. بەڵام لە نێوانی من و تۆدا چی هەیە، بۆ ڕقت لە من بوو؟ یەك زللەی بە توندی لێدا و وتی: جولەکە کوڕی جوولەکە.

پاشان عەبدولکەریم داوای کرد کە بە دادوەری و ڕاست دادگایی بکرێت، عەبدولسەلام وتی: داوا ئەکەم (کوشتنی عەبدولکەریم دوا بخرێت) بەڵام وەڵامیان دایەوە وتیان نابێت هەر ئەبێت بکوژرێت، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاریداوە.

دوای ئەوە هەموو دەنگیان داو هەموو دوا قسەیان کرد، عەبدولسەلام وتی: من بخەنە دواوە، لە دواییدا هەموو بڕیاریانداو عەبدولسەلام وتی: (حالی حالکم) ڕازی بوو.

وا دەرکەوت کە پەیوەندی نێوان عەبدولسەلام و عەبدولکەریم بەهێزبوو، هەروەها ئەو قسانەی کە عەبدولکەریم کردی، وتی: "سەلام، من تۆم نەکوشت تۆش من مەکوژە". زۆر کاری کردە سەر عەبدولسەلام.

پاش دەرچوونی ئەنجومەنی شۆڕش لە هۆڵەکە، سەرۆکی دادگا هاتە ژوورەوەو ڕایگەیاند کە لە سێدارە ئەدرێن و وەسیەت بکەن. هەموو ڕەتیان کردەوەو وەسیەتیان نەکرد، کورسی (خەیزران)یان دانا بە ڕیز و، عەبدولکەریم قاسم و کۆمەڵەکەی دانیشتن لەسەری، دەم و چاویان بەستن، بەڵام عەبدولکەریم وتی: نامەوێ دەموچاوم ببەستن، سەرۆکی دادگا داوای کرد کە شایەتمان بێنن و ئیمان بهێنن، بەڵام عەبدولکەریم هیچ قسەی نەکرد و ڕەنگی زەرد بوو.

تەها شێخ ئەحمەد وتی: بژی حیزبی شیوعی، هەروەها فازیل عەباس مەهداوی بەدوایدا وتیەوە.

ئەفسەرێك بەرامبەر هەریەکێ لەم حوکمدراوانە وەستاو فەرمانی دەکرد کە گوللەباران بکرێن، هەموویان کوژران.

سەعات (١,٣٠) پاشنیوەڕۆی شەممە (٩)ی شوباتی ١٩٦٣ بەمجۆرە عەبدولکەریم قاسم و حکومەتەکەی کۆتایی پێ هات.



عەبدولکەریم قاسم و هاوڕێکانی دوای گولەباران کردن

## کورتەیەك لە ژیان و کەسایەتی
## عەبدولسەلام محەمەد عارف


عەبدولسەلام محەمەد عارف

عەبدولسەلام عارف ناوی (عەبدولسەلام محەمەد عارف)ە، ١٩٢١/٣/٢١، لە گەڕەکی (سوق حمادە) لە بەغدا لە دایکبووە.

باوکی لە عەشیرەتی (الجمیلی) بووە، کە لە شارۆچکەی (عانە) لە پارێزگای ئەنبارن، دایکی ناوی (ستە)بوو، کچی (جاسم الرجب)بووە کەخەڵکی رمادین.

عەبدولسەلام خاوەنی سێ براو چوار خوشك بووە، براکانی بەناوی (عبدالسمیع) و (صباح) و (عبدالرحمن) کە دوای مردنی خۆی بوو بە سەرۆك کۆماری عێراق، خوشکەکانی بەناوی (سعدیە، نەزمیە، فەزیلە، صبیحە).

لە تەمەنی شەش ساڵیدا باوکی ناردویەتیە قوتابخانەی (دار السلام)ی سەرەتایی لە کەرخ لە بەغدا، دوای تەواوکردنی سەرەتایی چۆتە قوتابخانەی ناوەندی (الکرخ) و دوایی ناوەندی (مەرکەزی) لە (رصافە) بەدوایدا دێت.

له ١٩ی شوباتی ساڵی ١٩٣٣ له کۆلیجی سەربازی وەردەگیرێت له بەغداو له ٧ ئایاری ١٩٣٩ کۆلیجی سەربازی تەواو دەکات بە روتبەی ملازمی دووەم، لەساڵی ١٩٤١ بەشداری کردووە لە بزوتنەوەکەی (رشید عالی گەیلانی) کە لەدژی داگیرکەری ئینگلیز بوو، لەساڵی ١٩٤٢ له بەسرە لەگەڵ (عەبدولکەریم قاسم) چەند جارێك یەکتریان بینیوەو نارەزایی خۆیان دەربڕیوە بەرامبەر بە ڕژێم و زوڵم و زۆرییەکانی.

له ساڵی ١٩٤٤ تاوانبار کرا بە دروستکردنی حزبێك له دژی مەلیك بەڵام هیچی لەسەر نەدۆزرایەوە.

لەساڵی ١٩٤٨ لەشەڕی فەلەستین بەشداری کردووە، کە ئەوکاتە مساعد ئامر فەوجی دووی لیوای چوار بووە له دەڤەری (جنین).

له ٣١/ ئازاری ساڵی ١٩٤٩ دەچێتە کۆلیجی ئەرکان و له ٢٣/نیسانی ساڵی ١٩٥١ تەواوی کردوە، ناونیشانی نامەی دەرچوونی (اطروحه) (ثورة الزنوج) بوو، له ٣٠/ ئەیلولی ساڵی ١٩٥٤ دەکرێتە ئامر فەوجی سێ، لیوای نۆزدە، کە ئەوکاتە مقدم روکن بووە.

لەساڵی ١٩٥٦ کاتێك جەمال عەبدولناصر کەناڵی سوێسی خۆماڵی کرد و لەلایەن ئینگلیزو فەرەنساو جوولەکەوە هێرش کرایە سەر قەناتی سویس، ئیسرائیل هەڕەشەی لە ئوردنیش دەکرد، بۆیە فەوجەکەی عەبدولسەلام حەرەکە دەکات بەرەو دەڤەری (المفرق) له ئوردن، له هەمان ساڵدا لەگەڵ چەند ئەفسەرێکدا ناردیان بۆ (دەورە) بۆ ئەڵمانیا بۆ ماوەی دوو مانگ.

لەساڵەکانی ١٩٥٤-١٩٥٨ عەبدولسەلام لەگەڵ عەبدولکەریم بەیەکەوە ئیشیان کردوەو رێکخراوی ئەفسەرانی ئازادیخوازیان بیناکردووەو خۆشەویستی و برایەتییان بەهێزتر بووە.

له ١٩٥٨/٣/١ بووە بە ئامرلیوای بیست (بەوەکالەت) له جەلەولا، له هەمان ساڵدا وەك یاریدەدەری لیوای بیست حەرەکەت دەکات بۆ ئوردن و بەناو شاری بەغدا تێپەڕ دەبێت، لەم کاتەدا عەبدولسەلام چەند کۆبونەوەیەك ساز دەدا لەگەڵ

ئەفسەرە ئازادیخوازەکان و بڕیاریان دا کە ئەم کاتە مەوعدی جێبەجێ کردنی شۆڕشەکە بێت لە بەغدا.

بەرەبەیانی ١٤ی تەموزی ساڵی ١٩٥٨ لیواکەی عەبدولسەلام (لیوای بیست) سەیتەرەی کرد بەسەر ئێزگەی بەغداداو بەدەنگی خۆی بەیان نامەی یەکەمی شۆڕشی ١٤ی تەموزی بڵاوکردەوە، چەندەها بەیانی تری بڵاوکردەوە، خۆی بوو بە جێگری سەرۆکی وەزیران و یاریدەدەری فەرماندەی گشتیی هێزە سەربازیەکان و وەکیلی وەزیری ناوخۆ.

پاش ماوەیەکی کەم ناکۆکی کەوتە نێوان عەبدولکەریم و عەبدولسەلام و لە ٣٠/ ئەیلولی ساڵی ١٩٥٨ زەعیم بڕیاری دا بە دەرکردنی عەبدولسەلام لەسەر هەموو ئیشەکانی و کرا بە باڵیۆزی عێراق لە بۆن لە ئەڵمانیا.

لە ١٩٥٨/١٢/٤ عەبدولسەلام گەڕایەوە بۆ بەغدا بەبێ ئەمری زەعیم، بەڵام پاش رۆژێك دەستگیر کراو لە ١٩٥٩/٢/٥ بە بڕیاری دادگای باڵای سەربازیی تایبەت (المحكمة العسكرية العليا الخاصة)، فەرمانی ئیعدامی بۆ دەرکرا، بەڵام زەعیم بڕیارەکەی ڕاگرت و پاش ماوەیەك عەبدولسەلامی عەفو کرد و لە بەندیخانە دەری هێنا و عەبدولسەلام چووە ماڵی خۆی.

رۆژی هەینی رێکەوتی ٨/ی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ بەعسیەکان کودەتایان کرد لەدژی عەبدولکەریم و لەرۆژی ٩/ی شوباتی ١٩٦٣ عەبدولکەریم کوژراو عەبدولسەلامیان کرد بە سەرۆك کۆماری عێراق، لەبەر ئەوەی عەبدولسەلام پاڵەوانی شۆڕشی ١٤/ی تەموزی ١٩٥٨ بوو.

رۆژی ١٩٦٣/١١/١٨ بەعسیەکانی لەناوبرد و هەموو شتێك کەوتە ژێر دەستی خۆی.

لە ١٩٦٥/٩/٢١ بە فەرمانی عەبدولسەلام، (د.عبدالرحمن البزاز) کرا بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، ئەمە بۆ یەکەمجار بوو کە مەدەنییەك بکرێت بە سەرۆك وەزیران پاش شۆڕشەکەی ١٤ی تەموز.

عەبدولسەلام لە ٨/ی ئازاری ساڵی ١٩٤٥ ژنی هێناوە بەناوی (ناهیدە حسین فرید) و شەش منداڵی لێ بووە، سێ کوڕ بەناوی (أحمد و محمد و محمود)، و سێ کچ بە ناوی (وەفا و سەنا و جەلا).

رۆژی چوارشەممە رێکەوتی ١٩٦٦/٤/١٣، لە باشوری عێراق لە بەسرەو لە دەڤەری (النشوە) فرۆکەکەی (عەبدولسەلام) دەکەوێتە خوارەوەو خۆی و هاورێکانی هەموویان دەستبەجێ سوتان.

بەم جۆرە عەبدولسەلام سێ ساڵ و دوو مانگ و شەش رۆژ سەرۆک کۆماری عێراق بوو، کە دەکاتە ١١٦٢ رۆژ.

## عەبدولسەلام داوای فەتوای حەلاڵیی خوێنی کورد دەکات

کاتێك عەبدولسەلام عارف بوو بە سەرۆك کۆماری عێراق لەساڵی ١٩٦٣، داوای کرد لە مەرجەعی شیعەکان، ئایەتوڵا سەید موحسین ئەلحەکیم لە نەجەف، کە فتوا دەربکات بە حەلاڵیی کوشتنی هەموو کوردێك لە عێراقدا، چونکە لە ئایینی ئیسلام وەرگەڕاون و بوونەتە کۆمۆنیست، وادیارە ئەویش باوەڕی بەو قسانە کردبوو.

بەر لە دەرکردنی ئەم فتوایە، هەواڵەکە گەیشتە لای خوالێخۆشبوو جەنابی مەلا مستەفای بارزانی، ئەویش هەواڵی نارد بۆ بنکە دڵسۆزەکانی بەغداو وتی: با وەفدێکی ئایینی بچن بۆ نەجەف بۆ لای سەید موحسین ئەلحەکیم و ئەو زانیارییانە بە درۆ بخەنەوە.

ئەفسەرێك بە ناوی مستەفا ڕەزا، ناسراو بە مەولانا، هات بۆ لای من و کاك محەمەد شەریف و کاك محەمەد عەلی کوڕی مەلا محەمەدی ڕەئیس، کە ئەوسا ئێمە هەرسیانمان ئیمام بووین لە سوپای عێراقدا، راسپاردەی مەلا مستەفای پێ ڕاگەیاندین و داوای لێکردین ئێمە بەو ئەرکە هەستین، بەو مەرجەی هەرسێکمان بەجلی سەربازییەوە واتا بە جبەو عەمامەوە بڕۆین، ئێمەش قبوڵمان کرد.

لە ڕێگای نەجەف، هەر چوار پێنج کیلۆمەتر، بنکەیەکی حەرەس قەومی تیا دانرابوو، خەڵکیان تەفتیش دەکرد، تەنانەت دەسەڵاتی کوشتنی هەر کەسێکیان هەبوو کە گومانی لێبکەن.

سەرەڕای ئەو ترس و لەرزە، بەیانییەکی زوو ڕووەو نەجەف بەڕێکەوتین، لە هەموو بنکەیەك تەفتیش کراین، کاتێك گەیشتینە نەجەف، چووین بۆ جێگا تایبەتییەکەی سەماحەتی سەید موحسین، کە لە باڵەخانەیەکی دوونهۆمیدا بوو، ئەو لە نهۆمی سەرەوە بوو، سی کەس زیاتر لە دەوروپشتی دانیشتبوون.

پاش ئەوەی دەستیمان ماچ کرد و دانیشتین، داوامان لێکرد کە کارێکی تایبەتمان هەیەو دەمانەوێت بە تەنها لەگەڵی بدوێین، با ئەم پیاوانە بچنە دەرەوە، ئەویش هەموویانی نارده دەرەوە، تەنیا یەك پیاو مایەوە، کە لام وابوو قائیم مەقامی نەجەف بوو.



وتمان ئێمە سێ ڕۆژە لە ڕێی شاخەکانەوە بەڕێوەین، لەلایەن مەلا مستەفای بارزانییەوە هاتووین بۆ لای جەنابت، ئینجا بەدرێژی باسی کردەوە نامرۆییەکانی میرییمان کرد کە بەرامبەر بە کورد ئەنجامی دەدات، پێمان وت: لە دەستدرێژی و تاوانکاریدا، جیاوازی لەنێوان گەورەو بچووك و نێر و مێ ناکەن، هەموو بەری کشتوکاڵەکانی سوتاند، دێهاتەکانی ڕوخاند، ئێمەیان دەربەدەر کرد، تەنانەت منداڵی ناو بێشکەش دەکوژن، هەموو ئەمانەش بە تۆمەتی کافربوون و بوون بە کۆمۆنیستی.

سەید موحسین وتی: من وایان تێگەیاندم کە ئێوە لە دژی ئایینی ئیسلام وەستاون و هەمووتان بوون بە کۆمۆنیست.

ئەو پیاوە کە مابووەوە لەلای وتی: سەماحەتی سەیید، ئەگەر خۆیان

کۆمۆنیستین، ئایا کشتوکاڵەکەشیان هەر کۆمۆنیستە؟ منداڵەکانی ناو بێشکەش هەر کۆمۆنیستین؟!

قسەکەمان کاریگەریی زۆری لەسەر دروست کرد، وتی: عەبدولسەلام داوای فتوای حەڵاڵی خوێنی کوردی لێکردووم، بەڵام تا ئێستا هیچ فتوایەکم نەداوە، هەتا ماوم فتواش نادەم، سڵاو و ڕێزم بە مەلا مستەفای بارزانی بگەیەنن و پێی ڕابگەیەنن کە هەتا بۆم بکرێت بە نهێنی پشتیوانیتان دەکەم و، دڵنیابن بە خۆم و بەوانەوە کە دوای من کەوتوون، لە دوور و لە نزیک یارمەتی دەرتان دەبین.

دوای ئەوە دەستمان ماچ کرد و خواحافیزیمان لێکرد.

نزیکەی سێ چوار کیلۆمەتر دوورکەوتبووینەوە، یەکێك لە پیاوەکانی هات بە دواماندا، وتی: سەماحەتی سەیید داوای لێبوردن دەکات کە نانتان نەخوارد، هەندێ پارەی ناردووە بۆتان بچنە چێشتخانەیەك نانی نیوەڕۆ بخۆن.

پارەکەمان وەرگرت و چووین نانمان خوارد، لەپاشان ڕێگەمان گرتەبەر ڕووەو بەغدا، ڕێگا زۆر بە ترس و لەرز بوو، ئەگەر حەرەس قەومیەکان لە ڕێگەدا تۆزێك گومانیان بکردبایە لە هۆی هاتنەکەی ئێمە، دەسەڵاتیان هەبوو کە هەرسیانمان بکوژن.

کاتێك گەڕاینەوە بەغدا، چووین بۆ لای کاك مستەفا مەولانا، بەدرێژی باسەکەمان بۆ گێڕایەوە، ئەویش کردی بە نوسراوێکی نهێنی و ناردیەوە بۆ جەنابی مەلا مستەفای بارزانی.

لەو ڕۆژەوە کە سەماحەتی سەید موحسینی حەکیم ئەو بەڵێنەی بە کورد دا، برا شیعەکانمان هیچ کارێکی ناڕەوایان بەرامبەر بە کورد و شۆڕشی کورد نەکرد.

Scanned by CamScanner

## پەیوەندیم لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی

سەردەمانی پێشوو و ئێستاش ناوی بارزانی و بارزانییەکان لەناو کوردو کوردەواریدا زۆر ئاشکرا بوو، هەموو گەورەو بچووکی کورد لەو سەردەمەدا ڕێزیان دەگرتن، چونکە دەیانزانی کە ئەوان دڵسۆزی کوردن و بەهەموو جۆری هەوڵ ئەدەن بۆ مافی گەلی کوردو بۆ پاشەڕۆژ و ئایندەیەکی گەش بۆ نەتەوەی کورد، بەڵام ناسراویم بەشەخسی یا ئاشنایەتیم لەگەڵ جەنابی مەلا مستەفا بارزانی، لەدوو خاڵدا چڕ دەکەمەوە کە پەیوەندیم هەیە پێوەی ئەو کاتە من لەجەیشدا بووم و ئیمامی فەوج بووم.

**یەکـــەم:** کاتێک لەڕووسیاوە بۆ بەغدا گەڕایەوە لەشاری بەغدا عەبدولکەریم قاسم تاقمە خانوویەکی باشی دابوویە، بەخۆیی و پاسەوانەکانی لەبەرامبەر ئێزگەی بەغدا و لەوێ نیشتەجێ بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کە خانووەکان بەشیانی نەدەکرد داوای کرد کە هەندێک خێمەی عەسکەری بدرێتێ بۆ پاسەوانەکانی لەناو خانووەکانیدا، ئەو کارەیان ئاراستەی لیوای ئێمە کرد کە وەختێ خۆی لیوای عەبدولکەریم قاسم بوو، ئێمە لەسەکەنەی پاسەوانی کۆماری بووین، لەوێ ئامر فەوجەکەمان بەمنی گوت: هەندێك خێمە دەنێرێن بۆ جەنابی بارزانی بۆ پاسەوانەکانی بەڵکو تۆ بۆی بەری، ئیتر منیش خێمەکانم بردوو لەخزمەتی بارزانیدا دانیشتم و وێنەیەکیشم بۆ یادگاری لەگەڵیدا گرت و بارزانیش فەرمانی کرد کە پسوڵەیەکم بدەنێ کە ئەوان خێمەکانیان لەمن وەرگرتووە، بەداخەوە ئەو وێنەمان لەناوبراو فەوتا،



زیاتر لەدوو کاتژمێر لەخزمەتیدا مامەوە، ئەوە یەکەمین جار بوو کە گفتوگۆم هەبوویێ لەگەڵیدا.

هەتا لەبەغدا بوو سێ جار بەخزمەتی بارزانی گەیشتم، هەر سێ جارەکەش بۆ کاروباری سەربازی بووە، شتێك بوایە لەنێوان بارزانی و سوپای ئێراقدا لەرێگەی منەوە کە دەیان ناردم بۆ ڕاییکردنی ئیش و کارەکان، ئەو سێ جارە بەدانیشتن و گفتوگۆ بەخزمەت بارزانیی گەیشتووم.

دووەم: لەساڵی١٩٦٣ لەپاش کودەتاکەی کرا بەسەر عەبدولکەریم قاسم دا و عەبدولسەلام عارف هاتە سەر حوکم، عەبدولسەلام داوای کردبوو لە محسن حکیم کە فتوایەك دەربکات بۆ حەڵاڵکردنی خوێنی ڕۆڵەکانی گەلی کورد، لەبەر ئەوەی لەدین وەرگەڕاون، لەسەر راسپاردەی جەنابی مەلا مستەفا من و د.محەمەد شەریف و کاك حەمەعەلی محەمەد رەئیس چووین بۆ لای سەید موحسن ئەلحەکیم تا تێیبگەیەنن کە ئێمەی کورد زۆر پەیوەندیمان بەئاینی ئیسلامەوە هەیە و هیچ گۆڕانکاری و لادانێکمان نەبووە لەئایینی ئیسلامدا، وەك بەدرێژی باسم کردووە.

وەك من هەستم کرد، بارزانی پیاوێکی زۆر هەڵکەوتوو بوو، کەمدوو بوو، قسەی کەم دەکرد، کە قسەی دەکرد قسەکانی هەمووی حیکمەت بوو، هەمووی لەعەقلێکی قوڵەوە بوو، جارێکیان باسی عەبدولکەریم قاسمی کرد، گوتی: من و عەبدولکەریم قاسم براین و خۆم بەبرایەکی ئەو دەزانم وەکو خۆم دڵسۆزە بۆ میللەتی کورد، وا دەزانم عەبدولکەریمیش دڵسۆزە. بەڵام دوایی لایەنی تر تەدەخولی کردو ئەو کێشەیەی دروست کرد، ئەو کێشەیەی کەوتە نێوان عەبدولکەریم قاسم و بارزانی زیاتر پەیوەندی بەهەندێك لە ئاغا کوردەکانەوە هەبوون و ئەوان سەبەبی کێشەکە بوون.

هەڵوێستی بەرامبەر بەپیاوانی ئاینی زۆر باش بوو، من بەو سیفەتەی پیاوێکی ئاینی بووم هەر جار چوومەتە خزمەتی بارزانی زۆر رێزی لێگرتووم و هەڵساوەتەوە لەبەرم، من ئەمزانی کە عقیدەیەکی زۆر پاك و سافی هەیە لەدوو

ڕێوە، یەکێکیان پێی ناخۆش بوو یەکێك پێی بگووتایە مامۆستا یا بڵێ گەورەم و پێی نەگوتایە مەلا مستەفا، ئەوەندە شانازی بەمەلا مستەفاوە دەکرد، وشەی مەلای ئەوەندە لەلا بەرێز بووە. دووەمیش: خۆیان خانەوادەیەکی ئاینزان و شێخن ولەبنەچەوە لەشێخایەتیەوە هاتوون، لەم دوو ڕێگەیەوە ڕێزو حورمەتی پیاوی ئاینی دەگرت، چ مەلا بوایە چ شێخ بوایە زۆر ڕێزی دەگرتن.

لەڕووی دینداریشەوە، ئەوەی ئاشکرابێ لەدینی ئیسلامدا ڕۆژ و نوێژە، ئەم دوانەی زۆر بەباشی دەکردو هەرگیز لەژیانیدا نەبیستراوە کەوا مەلا مستەفا شتێکی لێ دەرکەوتبێ کەوا پەیوەندی بە شتێکی خراپەوە هەبێ بەرامبەر بەئاینی ئیسلام، یا گوناهێ یا شتێکی دژ بەئاین نەبیستراوەو نەبینراوە کە پەیوەندی بە ئەوەوە هەبێ، مەلا مستەفا کەسایەتییەکی پلە بەرز بوو لەو کاتەی سەرکردەیی کوردی کردووەو کۆشش و خەباتی بۆ کورد کردووە، نەبیستراوە ئەو پیاوە لەڕووی ماددییەوە بڕی یەك دینار بۆ خۆی بەکاربهێنێ لەسەر حیسابی میللەت و شۆڕش، لەئاستی ماددەیا تەبیعەتی بەرز بوو.

بارزانی خۆی بەڕێزبوو لەگەڵ خەڵکی، عەرەبی عێراق لەسەرەتای دەرکەوتنی مەلا مستەفا هەتا ئێستاش هەر بەچاوی ڕێزەوە لێی دەڕوانن، ئەو ماوەیەی کە شەڕ بوو لەنێوان کوردو عەرەبدا وەکو سوپای عێراق و دەسەڵات نەك نەتەوەی عەرەب، من چل و نۆ ساڵ لەناو عەرەبدا ژیاوم لەهیچ عەرەبیکم نەبیستووە کە نەقدی مەلا مستەفا بکەن یا هی میللەتی کورد، تەنانەت لەکاتی شەڕیشدا، یا قسەیەکی ناشیرین بە میللەتی کوردو مەلا مستەفا بڵێن، هەمیشە جنێویان بەحکوومەتی خۆیان دەدا بۆ ئەو شەڕو ماڵوێرانکاریانەی کە حکوومەت دژی کورد دەیکات و ئۆباڵەکەیان دەخستە ئەستۆی حکوومەت، عەرەبەکان هەمیشە بەڕێزەوە باسی مەلا مستەفایان دەکردو خۆشیان دەویست.

بارزانی پیاوێك بوو کە هەموو ژیانی بۆ کوردایەتی تەرخان کردبوو هەتاکو ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد، زۆر بەئیخلاس بوو بەدڵسۆزانە هەوڵی دەدا بۆ نەتەوەی کورد، هەموو توانای خۆی و ژیانی خۆی بەخت کرد لەڕێگەی کوردو

کوردایەتیدا، لەگەڵ ئەو هەڵوێستە پیاوانەیەی کە لەمێژوودا زیاتر دەردەکەوێ، ئەوەبوو لەگەڵ پێشەوا قازی محەمەد هەوڵی پێکهێنانی کۆماری کوردستانیان دا، لەو بارودۆخە ناسکەی پێشەوادا بارزانی چوو پشتگیری و یارمەتیدا، هەتا کاتی نسکۆی کۆمارەکە، ئیتر بارزانیش بەرژەوەندی وابوو کە ئێران بەجێ بهێڵێ و بڕوات بۆ وڵاتی شوورەوی، چەند ساڵ لەغەریبیدا وڵات وکەسوکاری بەجێ هێشت لەپێناو کوردایەتیدا، وەکو دەگێڕنەوە لەدانیشتنیدا لەهەڵسوکەوتیدا لەقسەکردندا لەپەیوەندیکردنی لەگەڵ بەرپرسەکانی ئەوێدا مەلا مستەفا هەر هەوڵ و کۆشش و تەقەلای بۆ کورد بووە، تاکو بیگەیەنێت بەئامانج، هەوڵی داوە پاشەرۆژی کورد روون وگەش بکات.

## دەستکەوتی زیاتر
## لە (١٧) ساڵ لە برادەرایەتی



بەغدا / قەسری نهایە - ١٩٦٣/١١/١٨

بەداخەوە (١٧) ساڵ و (٢٠) ڕۆژ لە تەمەنی خۆم لە سوپای عێراقدا بەسەربرد، بە سەدان برادەرم هەبوو لە ئەفسەرو جێگری ئەفسەرو عەریف و نائیب عەریف و سەرباز، بەڵام ئەوانەی برادەری ڕاستەقینەیان لەگەڵم بەست تەنها (٣) کەس بوون، یەکێك موسڵمان و یەکێك مەسیحی و یەکێك (صابئی)، واتە ڕاستی لەناو ناموسڵمانەکاندا، دوو ئەوەندەی موسوڵمانەکان بوو، چونکە لەم ماوە زۆرەدا یەك موسڵمانم بەڕاستی بینی کە بەوەفابێت و متمانەی پێ بکرێت، برادەرییەکەی لە کانگای دڵەوە بێت، کەچی دوو ناموسڵمانم پەیدا کرد یەکێکیان دکتۆر فەهمی

جەزراوی بوو، کەدواتر بەدرێژی باسی دەکەم، ئەمە بە پلەی (لیوا) پزیشك بوو لە سوپادا، پسپۆڕی نەخۆشی سیل بوو، هەر نەخۆشێکم ئەبردە لای، بانگی ئەکردمە دەرەوەو سوێندی ئەدام کە تا چ ڕاددەیەك دەسەڵاتی هەیە، واتە نەخۆشەکە هەژارە یان نا، ئەگەر بموتایە هەژارە پارەی بینینی نەخۆشەکەی لێ نەئەسەند، ئەو دەرمانانەی بۆی ئەنووسی خۆی پێی ئەدا.

دووەم برادەری ناموسڵمانم کە (د. ئەسعەد ناسر) بوو (صابئی) بوو، ئەم پزیشکە کاتێك گوێزرایەوە بۆ ئەو شوێنەی منی تیادا بووم لە بەغدا لە کۆشکی ناوبراو، دوو ڕۆژ بوو هاتبوو، ڕۆژی سێیەم من پێم ڕاگەیەنرا کە گوێزراوەمەتەوە بۆ ئوردون، کاتێك کە سوپای عێراق لەوێ بوو، ئەو ئیمامەی لەوێ بوو گوێزرابووەوە بۆ جێگەکەی من، منیش ئەو ساڵە -کە ساڵی (١٩٦٧) بوو- لە ماجستێری (شەریعە) وەرگیرابووم، ئەگەر بڕۆشتمایە بۆ ئوردن ئەو خوێندنەم لە کیس ئەچوو، (د.ئەحمەد سبتی) کە ئامیری نەخۆشخانەکە بوو، وتی: من هەوڵ ئەدەم کە گواستنەوەکە بەتاڵ بکەمەوە. د.ئەسعەد وتی: ئەگەر ئەم گواستنەوەیەی تۆ بەتاڵ بکرێتەوە من نان و کەباب بۆ هەموو ئەفسەرەکان و بەڕێوەبەرەکانی ئەم نەخۆشخانەیە ئەکرم.

ئەم پیاوە دوو ڕۆژ بوو منی بینیبوو، تەنها سەلامامان لە یەکتر دەکرد، بەو دوو ڕۆژە بوو بە برادەرێك کە لەبرای دایك و باوك دڵسۆزتر بوو.

د. ئەحمەد سبتی ڕۆیشت بۆلای (رئيس أركان الجيش)، گواستنەوەکەی منی بەتاڵ کردەوە، لە پاشا د.ئەسعەد ناردی نان و کەبابیان هێنا، کە بەشی زیاتر لە (١٠٠) کەسی ئەکرد، هەر لەو ڕۆژەوە تا ئێستا ئەو پیاوە بە ڕاستی بۆتە برادەر، هەمووجار یەکتر ئەبینین ئەڵێ: "تۆ قیبلەی ژیانی منی"، ئەم ڕاستگۆییەی تەنها بەرامبەر بەمن نەبوو، بەڵکو هەرکەسی خۆش بویستایە بە ڕاستی ئەیوت من تۆم خۆش ئەوێت، ئەوەشی نەیوستایە ڕووبەڕوو بە ڕاستی ئەیوت من برادەری لەگەڵ هەموو کەس ناکەم، ئەگەر یەکێ ڕاست بوایە ڕووبەڕوو ئەی وت تۆ ڕاستی، هەروەها ئەگەر چەوت بووایە ئەی وت تۆ چەوتیت.

لە پێش چەند ساڵێ تاقمە ددانێکی بۆ کردم، چونکە پزیشکی ددان بوو، تا ئێستاش هیچ کەس هەستی بەوە نەکردووە کە ئەمانە ددانی دروستکراون، هەموو کەس ئەڵێت: تۆ تەمەنت زۆرە کەچی ددانەکانت بە ساغی ماونەتەوە.

باوکی ئەم پزیشکە هەرچەند موسڵمان نەبوو، بەڵام ڕەوشتی گەلێك جوان و ڕاست بوو، بە ڕاستی خۆی موسڵمان نەبوو بەڵام وتن و کردەوەی هی پیاوی موسڵمانی ڕاستەقینەبوو، لە پێش مردنیدا بە (٣) ڕۆژ بە د. ئەسعەدی وتبوو لەم نزیکەداماڵئاواییتان لێ دەکەم، کوڕێکی تریشی ئەبێت ئەفسەر ئەبێت لە سوپادا، د. ئەسعەدیش بە باوکی وتبوو با بچم بۆ بەسرە براکەم بهێنمەوە تا بیبینیت، پێی وتبوو پێویست ناکات من نامرم هەتا ئەو ئەبینم، د. ئەسعەد ئەڵێت: براکەم هاتەوە، لە پاش دیتنی ئەو بەیەك کاتژمێر کۆچی دوایی کرد.

ئینجا ئێمە بیروباوڕەمان ئەمەیە کە تەنیا موسڵمان پیاوی چاکەو بەهەشت هەر بۆ ئەو دروست کراوە، بەڵام تەنیا خوا خۆی ئەو حسابانە ئەزانێت، هەر خۆی ئەزانێ لە چ بەندەیەك ڕازییەو چ کەسێك ئەو لێی ڕازی نییە.

سێیەم کەس برادەرە موسڵمانەکەم بوو، دەستکەوتی (١٧) ساڵ و (٢٠) ڕۆژی ژیانم لە سوپادا بریتی بوو لە عەبدوڕڕەحمان مەحمود دوری، لە سوپادا بووین بە برادەرو وەك یەك خێزان تێکەڵاویمان هەبوو، بە ڕاستی پیاوێکی زۆر موسڵمان و زۆر ڕاست بوو، ئەم پیاوە کە ساڵی (٢٠٠٠) کۆچی دوایی کرد، ئەوەندەی چاکەی لەسەر منە بڕواناکەم هیچ کەسێکم لەم جیهانەدا ئەوەندە چاکەی لەگەڵ کردبم.

سێ ساڵ لە قاهیرە بووم ئەمخوێند، ئەم پیاوە لەو ماوەدا هەموو ساڵێك پێنج فەردە برنجی لە (شامیە) کە هەر فەردەیەکیان سەد کیلۆ بوو کڕیویەتی و هێناویەتی بۆ ماڵ و منالی من، هەر بەو پێیە ڕۆن و شەکرو چایی و تایتی بۆ کڕیبوون، هەمووی لە دەفتەرێکدا نووسیوە، پاش (٣) ساڵەکە کە هاتمەوە بە قیست پارەکەی وەرگرتەوە.

لێرەدا ئەمەوێت ئەو راستیەی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە بڵێم، کە خوای گەورە رێزی لە نەوەی ئادەم گرتووە بەگشتی، بەو مانایەی رەوشت و ئاکار و هەڵس و کەوتی جوان مەرج نیە تەنیا لەکەسی موسڵماندا هەبێت، بۆیە دەبێت لەوە بەباشی تێبگەین ئەخلاق شتێکە بەهەموو مرۆڤێك دراوە، ئەوەشمان لەیاد نەچێت وەك ئیمامی عەلی (رەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: با کردەوەی تاك بەپێی ئاین هەڵبسەنگێنین، نەك ئاین بەپێی کردەوەی ئەو تاکەی بەناو پابەندە پێوەی.

## هەموو موسڵمانێك مەرد نییەو
## هەموو ناموسڵمانێك نامەرد نییە

ساڵی ١٩٦٧، کاتێك ئیمام بووم لە نەخۆشخانەی کۆشکی (امیرة راجعە) نزیکی کۆشکی ریحاب، ماڵمان لە (عواضیة) بوو، هەموو بەیانییەك ئۆتۆمبێلێکی سوپا ئەهات بە دوای من و ئەفسەرێکی تر کە پزیشکی دەرمانسازی بوو، پێیان ئەوت (ابو یعقوب)، لەگەڵ ئەم ئەفسەرە زۆر برادەریمان خۆشبوو، کاتێ نزیکی نیوەڕۆ ئەبوویەوە لە پێش نوێژدا ئەهات بۆ ژوورەکەم ئەیوت خۆت ئامادە بکە با نوێژەکە بە جەماعەت بکەین، هەمووجار پێش نوێژ چوار ڕکات سوننەتی ئەکرد، پاش نوێژیش چوار ڕکات، مانای ئەمە ئەوەیە کە ئەم پیاوە موسڵمانێکی ڕاستەقینەیە، بەڵام دیارە موسڵمانێتی هەر بە نوێژو ڕۆژوو نییە، چونکە پێویستییەکانی سەرشانی مرۆڤ بەسەدانە و زیاترە لەو نوێژو ڕۆژووە.

جارێکیان، چوار تا پێنج ڕۆژی مابوو بۆ سەری مانگ، میوانمان هەبوو، دایکی موحەممەد وتی: پارەمان نەماوە شتێك بۆ میوانەکان ئامادە بکەین بۆ خواردنی نیوەڕۆ، وتم: ئێستا ئەبو یەعقوب دێت پێنج دیناری لێوەردەگرم، کاتێك بە ئۆتۆمبێلەکە هات لەبەردەرگا وتم: ئەبو یەعقوب چوار ڕۆژی ماوە بۆ سەری مانگ کە موچە وەربگرین، پێنج دینارم بدرێ بەقەرز تا سەری مانگ، ئەویش ماتبوو وەك تووشی شتێکی ناهەموار بووبێ وای لێهات، وتم: بۆچی واتێکچوویت؟ وتی: ئەبو موحەممەد تۆ زۆر لام خۆشەویستی، بەڵام من سوێندم خواردووە پارە بەقەرز بەکەس نەدەم.

ئەمەش لەبەر ئەوەبوو ئەم ئەفسەرە موچەکەی (١١٠) دینار بوو هەموو مانگێك (١٠٠)ەکەی ئەخستە بانکەوە، تا سەری مانگ بەو (١٠) دینارە دەژیا، ژنی نەهێنابوو بە خۆڕایی لەیانەی ئەفسەرەکان دەنووست و کرێ خانووی نەئەداوماڵی باوکی لە موسڵ بوو.

ئینجا چووین بۆ دەوام، زانی کە من پێم ناخۆش بوو هات بۆ ژوورەکەم، وتی: لەبەر خاتری تۆ پارەی سوێندەکەم دەدەم، پارەکەم بۆ هێناوی.

وتم: سوپاست ئەکەم، پری ئەم ژوورە پارەم بدەیتێ بە خۆڕایی فلسێکت لێ وەرناگرم، بەڵام پێم بڵێ تۆ بۆچی ئەوەندە سووری لەسەر نوێژکردن، چ سودێکی لێوەردەگری؟ خوا نوێژی وای بۆچییە؟ نوێژ و ڕۆژوو بۆ ئەوە دانراوە کە مرۆڤ بکات بە پیاو، هەردەم پیاوەتی بکات لەگەڵ ئەم و ئەودا، من نزیکترین دۆست و برادەری تۆم، ناتوانی (٥) دینارم بدەیتێ بە قەرز بۆ ماوەی چوار ڕۆژ، ئیتر چۆن موسڵمانێکی !؟

جا ئەم موسڵمانە نوێژکەرە بەراورد بکەین لەگەڵ ئەفسەرێکی تری (گاور) لە هەمان نەخۆشخانە، ئەمیش بریتیی بوو لە برادەرێکی تر کە دکتۆر (فەهمی جەزراوی) بوو.

ئەم خانووەی کەوا تێیدابین لە (زیونە) لە بەغدا زەوییەکەی (٦١٨) مەترە، ساڵی ١٩٦٨ لە سوپام وەرگرت، بەڵام پارەم نەبوو بیکەم بە خانوو، هەرچۆن بوو (مقاول)ێکی کوردم دۆزییەوە وتی: من خانووەکەت بۆ ئەکەم بەڵام پیشەکی (٧٠٠) دینارم بدەرێ، منیش تەلەفزیۆنێك و دووفەرشم نارد بۆ سلێمانی هەموویان دا بە (٤٠٠) دینار، ئینجا پێویستم هەبوو بە (٣٠٠) دیناری تر، هیچ ڕێگایەکم نەبوو ئەم پارەیە پەیدا کەم، چونکە لە پاش دانانی بناغەکە کۆمەڵەی ئەفسەران (٣٦٠٠) دیناری ئەدا بە قەرز بەو ئەفسەرەی کە خانوو بکات، منیش بەیانی چووم بۆ نەخۆشخانە، زۆر بێ تاقەت و زیز بووم، هەر بیرم لەوە ئەکردەوە کە ئەم (٣٠٠) دینارە چۆن پەیدا بکەم، لەوکاتەدا دکتۆر فەهمی هاتە ژوورەکەم تەماشای ناوچاوی کردم کە من بێتاقەتم، وتی: چیتە؟ وتم

هیچم نییە، زۆری لێکردم کە ڕاستی پێ بڵێم، منیش باسەکەم بۆ کرد، دەستی گرتم و چووین بۆ لای ئامر و پێی وت: من و باوکی موحەممەد ئەڕۆین بۆ (وەزارەتی بەرگری) بۆ ماوەی یەك سەعات، ڕۆیشتین بۆ لای ژمێریاری سەربازی، کە ئەوکاتە لەناو وەزارەتی بەرگری بوو، بەڕێوبەری ژمێریاری (جەلیل جەزراوی) بوو، ئەویش هەر گاور بوو، وتی: جەلیل، ئەمەوێ بە زووترین کات (سلفە)م بۆ بکەیت بە (٣٠٠) دینار هەموو مانگێك لە مووچەکەم بیبڕن، تا ئەو سلفەیە تەواو دەبێ، ئینجا هەتا چامان خوارد ئیشەکەیان تەواو کردو (٣٠٠) دیناری وەرگرت، هاتینە دەرەوە پارەکەی پێدام، منیش وتم: بەمەرجێك وەری ئەگرم هەموو مانگێك قیستەکەی ئەدەم بەتۆ کە (١٥) دینارە، چونکە ئەو بۆ ئەو سلفەیە مانگی (١٥) دیناریان لێ ئەبڕی، ئەویش وتی: زۆرباشە، سەری مانگ مووچەکەم وەرگرت (١٥) دینارەکەم بۆ برد، تەماشای کردم و وتی ئەوە بەڕاستتە؟ وتم: من لەسەر ئەو مەرجە پارەم لە تۆ وەرگرت، وتی: بەو خوایەی کە هەردووکمان بڕوامان پێیەتی، هەتا زیاد نەبێت لە ماڵ و منداڵت من ئەو پارەیە وەرناگرمەوە.

شایەنی باسە ئەم ئەفسەرە کاتێ ئەم پارەی دا بە من، تا تەوقی سەری نوقم بوو لە قەرزاری، چونکە برایەکی هەبوو ئەندازیاربوو، تازە کۆچی دوایی کردبوو، هەموو ئەرکی منداڵەکانی کەوتبووە سەرشانی ئەم.

کاتێك لە ساڵی ١٩٧٢ لە سوپا چوومە دەرەوە بۆ ئەوەی بچم لە میسر خوێندنی باڵا تەواو بکەم، (٨٠٠) دیناریان پێدام بە (اکرامیە)، ئینجا (٣٠٠) دینارم لەوە خستە زەرفێکەوە بردم بۆ (د. فەهمی جەزراوی) وتم: ئەم پارە زیادەیەم وەرگرتووە لە سوپا، هیچ لەم هەلە باشتر نییە، پارەکەم هێنایەوە بۆت، زۆر سوپاست ئەکەم. ئەویش وتی: "یەکەم بە قورئان، دووەم بە ئینجیل، سێیەم بە موحەممەد، چوارەم بە عیسا، هەتاکو خوێندن تەواو نەکەی و نەگەڕێیتەوە، من ئەو پارەیە لە تۆ وەرناگرم"، زۆرم هەوڵدا هیچ سوودی نەبوو.

لە ساڵی (١٩٧٥) کە دکتۆرام وەرگرت و گەڕامەوە بۆ عێراق و لە زانکۆ دامەزرام، (٥٠٠) دیناریان بە سلفە دایە من بۆ کڕینی ئۆتۆمبێل، چونکە

ئەوکاتە هەرکەسێ لە دەرەوە خوێندنی تەواو کردبایە، ڕێگەیان ئەدا ئۆتۆمبێلێک بێنێت لە دەرەوەی عێراق بەبێ گومرگ و سلفەشیان پێ دەدا. منیش (٣٠٠) دینارم لەم پارەیە برد بۆ دکتۆر فەهمی بەهەزار سوێندو تکا وەری گرت، لەپاش حەوت ساڵ (١٩٦٨ ـ ١٩٧٥).

لە بەراوردکردنی نێوان ئەبو یەعقوب کە (٥) دیناری نەدامێ بۆ ماوەی چوار ڕۆژ بە قەرزو ڕۆژی (٢٠٠) ڕکات نوێژی دەکرد، لەگەڵ ئەم دکتۆرە گاورە کە (٣٠٠) دیناری دامێ بە قەرز بۆ ماوەی (٧) ساڵ، لەپاش ئەم ماوەیەش هێشتا بە زۆر وەریگرتەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە هەموو موسڵمانێک مەرد نییە، هەموو ناموسڵمانێکیش نامەرد نییە، ئەم سیفەتە لە پەروەردەی خێزانییەوە دەست پێدەکات، هەرچەندە ئایینی ئیسلام گەورەترین هۆیە بۆ ئەوەی مرۆڤ لەسەر ڕێڕەوێکی ڕاست و مەرد دروست بێت، بەمەرجێك موسڵمانێکی ڕاستەقینە بێت، فێری نوێژو ڕۆژوو نەبێت هەروەك چۆن فێری جگەرەکێشان دەبێت. زۆرکەس هەیە نازانێ نوێژ بۆچی دەکات، بەڵکو خووی پێوە گرتووەو هەروەك خووگرتن بە جگەرەکێشانەوە.

پیاوێکم دەناسی چوارجار چوو بوو بۆ حەج، هەرجارێك نەخۆش بکەوتایە ئەهات بۆ بەغدا بۆ ماڵی ئێمە بۆ ئەوەی بیبەم بۆلای پزیشك، ڕۆژی هەینی کە پشووی مناڵەکان بوو ئەوانەی ئەچوون بۆ قوتابخانە تۆزێك دەرەنگ هەڵدەستان، ئەم پیاوە زۆر لۆمەو سەرزەنشتی من و دایکی موحەممەدی ئەکرد کە بۆچی مناڵەکان لەگەڵ بانگی بەیانی هەڵناسێنین نوێژەکانیان بکەن.

لە ساڵی ١٩٧٩ کە میری دێهاتی کوردستانی گواستەوە بۆ ناو (مجەمەعەکان)و قەربووی دا بە دانیشتوانی هەردێیەك کە زەمین و باخ و ئاویان هەیە، بۆ هەر دۆنمێکی باخ (٢٠٠٠) دیناری ئەدا، ئەم حاجییە بەشی خوشکەکەشی وەرگرتبوو، کە خوشکەزاکەی داوای بەشی دایکی دەکرد لەو قەرەبووە، ئەویش پێی نەئەداو ئەیوت: برۆ ئیسپاتی بکە کە دایکت خوشکی منە! ئەم پیاوە کە هەموو ڕۆژێك بەلای کەمەوە (٥٠) نوێژی سوننەتی دەکرد، خوشکەکەی خۆی دانا بە (زۆڵ)! بۆ ئەوەی بەشەکەی نەدا بە خوشکەزاکەی.

بەداخەوە -وەك لەوەوپێش باسمان کرد- زۆر لە موسڵمانەکان وائەزانن کە ئیسلام تەنها بریتییە لە (نوێژو ڕۆژووا!)، ئەگەر پارەی هەبوو، زەکات بدات و بچێت بۆ حەج و دوایی کەشیدەیەکی زەرد بکڕێت و بیبەستێ بەسەریەوە یا بیبەستێتە پشتی.

ڕاستە ئەم چوارە بنچینەی ئایینی ئیسلامن، بەڵام قورئانی پیرۆز کە (٦٦٠٠) ئایەت زیاترە، ئەو ئایەتانەی کە باسی ئەم چوار بنچینەیە دەکەن هەموویان ژمارەیان لە (٥٠) ئایەت زیاتر نییە، ئیتر هیچ موسڵمانێك نییە بپرسێت بڵێ ئایەتەکانی تر چییە؟ باسی چی دەکەن؟ خوایەك هەموو ئەم گەردوونەی دروست کردووە، کە تا ئێستاش زاناکان کە ئەچن بۆ بۆشایی ئاسمان، سەرسام ماون و نازانن ئەم سەرو ئەوسەری کوێیە، خوایەك ئەم دەستەڵاتەی هەبێت چ پێویستییەکی بەوە هەیە کە موسڵمانێك دوو ڕکات نوێژ بکات یان نا، ئەوەی نوێژ ئەکات نوێژەکەی بۆ خوا نییە، بەڵکو بۆ خۆیەتی، بۆ ئەوەی ببێ بە پیاوێکی ڕاست و زیان بە کەس نەگەیەنێت، مافی کەس نەخوات و ئەندامێکی بەکەڵك بێت لە ناو خەڵکدا.

## کوردایەتی بە دەم نیە

لەساڵی ١٩٦٣، لە جەنگی نێوانی پێشمەرگە و سوپای عێراقدا لە چۆمان، پێشمەرگەیەك بەناوی (کاك عبداللە) یان (کاك عبدالرحمن)، کە داخەکەم ناوەکەم بەتەواوی لەیاد نەماوە، بریندار بوو، گوللەکە لەلەشیا مابووەوە بەشێکی زۆری گۆشتی سمتی فڕێدابوو، بردیانە سلێمانی، لای دکتۆر جەمال، وتبووی لێرە چارەسەر ناکرێت، بە هەر جۆرێك بێت بیگەیەننە بەغدا.

ئەوانیش لەژێر ناوی کەسێکی تر هێنایان بۆ بەغدا، بە سەرپەرشتی کاك (ئەسعەد خەیلانی) کە ئەوکاتە بەرپرسی ڕێکخستنی پارتی بوو لە بەغدا، ڕۆشتبوون بۆ زۆر ماڵ تا جێگەی بکەنەوە هەتا پزیشك بێت و تەداوی بکات، لەترساندا کەس نەیوێرابوو وەری بگرێت.

کاتێکی درەنگی شەو هێنایان بۆ ماڵی ئێمە، کە ئەوکاتە ماڵمان لە تۆپچی بوو، کرێچی بووین، هیچ ژووری زیادەمان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا وەرمان گرت، ژورێکی بچووکمان هەبوو شتومەکی تێدابوو، خاڵیمان کرد و قەرەوێڵەیەکمان بۆ داناو پێویستیەکانمان بۆ دابین کرد، بەو مەرجەی کاك (ئەسعەد خەیلانی) هەموو شەوێك پزیشکی پسپۆڕی نەشتەرگەری لە نەخۆشخانەی (راهبات) بێنێت تەواویی بکات.

لە پاش چەند ڕۆژێك، دوو شەو لەسەر یەك، نە کاك ئەسعەد هات، نە پزیشکەکە، بریندارەکەش کەوتە حاڵێکی زۆر ناهەموارەوە، ئەگەری مردنی لێ دەکرا، من و دایکی محەمەد قورئانێکمان هێناو دەستمان کرد بە قورئان خوێندن و پاڕانەوە لە خودا، کە نەمرێت، چونکە لەو کاتەدا، ئەگەر لە ماڵی ئێمە بمردبایە، تێزابیان دەکرد بەسەر هەمووماناا.

دوای سێ ڕۆژ کاك ئەسعەد پزیشکەکەی هێنا، وتی دەبێ بیگوازینەوە بۆ نەخۆشخانە، چونکە بارەکەی زۆر مەترسیدارە. بردیان بۆ نەخۆشخانەی راهبات، شەوێك لەوێ مایەوە، نەشتەرگەرییان بۆ کرد و گوللەکەیان دەرهێنا، لە پاشان هێنایانەوە.

تا نزیکەی مانگێك لە ماڵی ئێمە مایەوە، شەوانە پزیشکەکە دەهات و تەداوی دەکرد، هەتا چاك بووەوە، دەستێ جلمان بۆ کرد و پارەی ئۆتۆمبێلمان پێدا، ئینجا گەڕایەوە بۆ چەمی ڕێزان.

مەبەستم لە گێڕانەوەی ئەم سەربردەیە ئەوە نیە، کە من ئەو ڕۆژە ئەو کارەم کردووە بۆ کورد، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کوردایەتی تەنها بە زبان و قسە نیە، چەندەها ماڵ کە خۆی زۆر بە کورد دەزانی، نەیوێرا ئەم بریندارە بگرێتە خۆی، کوردایەتی بە دەم نیە بەڵکو بە کردەوەیە، لە کردەوەدا پیاو دەناسرێت کە بایی چەندە.

لەم ماوەیەی دواییدا (لەساڵی ٢٠١٣) کاك ئەسعەد خەیلانی، کە ئێستا لە ئەمریکا دەژی، بە سەردان هاتەوە کوردستان و سەردانی کردم، بۆیە ئەم بەسەرهاتەم بیرکەوتەوەو بە پەسەندم زانی لە یاداشتەکانمدا تۆماری بکەم.

# شەڕی جولەکە

عەقیدی پزیشك (عەبدولخالق) لە مستەشفای سەدری، ژنەکەی دانیمارکی بوو، بۆ خۆی شارەزاییەکی زۆری هەبوو لە سیاسەتدا، دیاربوو پەیوەندی هەبوو بە لایەنێکی دەرەکیەوە، زۆر قسەی لەلا دەکردم، دەیوت لەبەر ئەوەی متمانەم بەتۆ هەیە، ئەو قسانەی لا من دەیکرد، لای ئەفسەرێکی تر باسی نەئەکرد.

لەپێش شەڕە (شەش ڕۆژیەکە)ی نێوان جولەکەو میسر، ڕۆژێك پێی وتم: ئەبێ بۆچی من بچم بۆ جەنگ بۆ فەڵەستین و منداڵی خۆم هەتیو بکەم، دەبێ یەکێك لەم هۆیانە پاڵم پێوە بنێت:

**یەکــەم:** قەزیەی نەتەوایەتی، ئێمە نزیکەی ٢٤ دەوڵەتمان هەیە، پێویستمان نیە بیکەین بە ٢٥ بە گێڕانەوەی فەڵەستین، ئەگەر کوردێك خۆی بدات بە کوشتن چونکە کیانێکی نیە ئەوە جێی خۆیەتی، بەڵام عەرەب ئەو هەموو کیانانەی هەیە چ پێویستییەك دەکا من بچم شەڕ لەگەڵ جولەکە بکەم.

**دووەم:** هۆی چونەکەم هۆیەکی ئایینی بێت، لەسەر ئەو ئەساسەی من مسوڵمانم و جولەکەش مسوڵمان نیە، بەناوی جیهادەوە بچم بۆ فەڵەستین، خۆت دەزانی من ئەو ئیمانە بەهێزەم نیە پاڵم پێوە بنێت لەسەر ئایین لەگەڵ جولەکە بجەنگم.

**سێیەم:** لەبەر نیشتمانپەروەری، من لەژیانمدا پرتەقاڵێکی فەڵەستینم نەخواردووە، چ نیشتمانپەروەرییەك هەیە لەنێوان من و فەڵەستیندا، پاڵم پێوە بنێت بچم بۆ جەنگ لەگەڵ جولەکەدا.

**چـوارەم:** ئەگەر بە تەهریجی عەبدولناصر و عەبدولسەلام عارف پاڵم پێوە بنێن بچم بۆ جەنگی فەڵەستین، وەکو خۆمان دەڵێین _واتە عەرەبەکان- جولەکەمان هەڵگرت و خستمانە ناو زەریای سپییەوە، شوێنەکەیان نابێت بە بەتاڵی بمێنێتەوە، ئینجا مەلیك حوسێن دەڵێ ئەمە لە ئەسڵا هی ئوردن بووەو باپیرم داویەتی بە جولەکە، دەبێ بیخەینەوە سەر ئوردن، جەمال عەبدولناصریش دەڵێ من پێشەنگی نەتەوایەتی عەرەبیم، دەبێ بخرێتە سەر میصر، چونکە هەر منم پاڵ دەنێم بەم و بەودا بچێت بە گژ جولەکەدا. شوقەیری -کە ئەوکاتە لەباتی یاسر عەرەفات سەرکردایەتی فەڵەستینیەکانی دەکرد، دەڵێ: من سەرۆکی فەڵەستینیەکانم، من هانم داون بۆ ئەم سەرکەوتنە، دەبێ دەوڵەتێکی فەڵەستینی دروست بکرێت من ببم بە سەرۆکی ئەم دەوڵەتە.

هەر لەپاش ئەوە شەڕی حەوتی حوزەیران بەرپا بوو لەنێوان جولەکەو میصردا، هەروەها ئوردن و فەڵەستینیش، جولەکە لە جەنگەکەدا سەرکەوت و کەناری رۆژئاوای داگیرکرد و خستیە سەر دەوڵەتی جولەکە.

**جولەکە چۆن سەرکەوت بەسەر میسر و فەڵەستیندا لە حەوتی حوزەیران، کە پێی دەوترێت جەنگی شەش رۆژە؟**

ئارام جولەکەیەك بوو رەگەزنامەی میسری هەبوو خزمەتی نەتەوەکەی خۆی دەکرد، زیاتر لە ١٥ ساڵ لەنێو میسردا مایەوە، خۆی زۆر نزیك خستەوە لە جەمال عەبدولناصر، بەجۆرێك لە هەر گەشتیدا بۆ دەوڵەتە ئەوروپیەکان ئارامی لەگەڵ خۆی دەبرد، لەسەر ئەو بنەمایەی کە پسپۆڕی هەیە لە چەك و پێداویستیە جەنگیەکاندا. تەواو پشتی بە قسەو ئامۆژگارییەکانی دەبەست، هیچ کەسێك هەستی بە جاسوسیەتی ئەم کابرایە نەدەکرد، تەنها یەك کەس نەبێت، کە ئەوکاتە وەزیر بوو پێیان دەوت (عەلی وەردی)، کە شیوعی بوو، چەند جارێك دای بەگوێی عەبدولناصردا کە ئەم کابرایەی پشتت پێ بەستووە پیاوێکی راست نیەو لەژێرەوە بۆ لایەنێکی بیانی کاردەکات.

ئارام لە جەنگی حوزەیراندا هەڵسا، ئاهەنگێکی دروست کرد، هەرچی ئافرەتی مەلهاکان بوو هێنابوونی و هەرچی فڕۆکەوانی میسری بوو داوەتی کردن، لە خەیاڵم نیە بە چ بۆنەیەك بووە، خواردنەوەی سەرخۆشکەری زۆری بەسەر فڕۆکەوانەکاندا دابەش کرد، ئینجا لەنیوەی شەودا هەرچی گڵۆپ و روناکی بوو کوژانیانەوە، ئینجا وتی: (ئێستا فڕۆکەکانی میراج هێرشیان کردە سەر فڕۆکەکانی مێك)، (میراج) هی جولەکە بوو و فەرەنسی بوو، (مێك)یش هی میسر بوو رووسی بوو.

ئینجا فڕۆکەوانەکان هەڵمەتیان بردە سەر ژنەکان و هەر کەس یەکێکی بردە پەنایەك و تا بەیانی لەگەڵی رایبوارد.

هەر لەو کاتەدا ئارام پەیوەندی کرد بە جولەکەوەو پێی راگەیاندن کە ئەم شەوە باشترین هەلە بۆ ئەوەی فڕۆکەکانی جولەکە هێرش بکاتە سەر فڕۆکەکانی میسری، جارێکی تر هەلی واتان دەست ناکەوێت و لەکیسی خۆتانی مەدەن.

ئەم ئارامە لەسەر راسپاردەی (عەلی وەردی) ژنێك دانرابوو لەبەر دەستیدا کار بکات و چاودێری بکات، ژنەکە هەستی کرد ئارام پەیتاپەیتا پەیوەندی دەکات بە جولەکەوەو زانیاریی دەداتێ، ئارام هەستی کرد ئەم ژنە بە نهێنیەکەی ئەوی زانیوە، بۆیە بردی بۆ ژورەکەی خۆی و گلاسێك بێهۆشکەری پێدا، ئەویش خواردیەوە بەو پێیەی کە ویسکییە و لەهۆش خۆی چوو، ئینجا خستیە نێو بەتانیەکەوەو پێچایەوەو خستیە نێو سندوقی ئۆتۆمبێلەکەیەوەو بردی فڕێی دایە ناو ئاوی نیل.

ئینجا ئەم ئارامە پسولەی فڕۆکەی بڕیبوو بۆ تورکیا، کە ئەگەر لە ئەرکەکەیدا سەرکەوتوو بوو سواری فڕۆکە دەبێت و دەچێت بۆ تورکیا، هەندێك حەبی خۆکوشتنیشی خستبووە مشتیەوە.

کە هاتە دەرەوە، هەرچی شوێنەوار بوو لە ماڵەکەدا، نەیهێشت، رۆیشت بۆ فڕۆکەخانەو حەبەکان لە مشتیدا بوو، هەتا چووە نێو فڕۆکەکەوە، دوا هەڵسانی

فرۆکە میسریەکە هەڵسا و لە سنوری میسر دەرچوو، وتی: (ئێستا ئەرکەکەم بەجێ هێنا).

ئەم چیرۆکەم بۆیە گێڕایەوە، بۆ ئەوەی کورد لە پاشەرۆژ سودی لێ وەرگرێت لە دڵسۆزیدا بۆ نەتەوەکەی بەرامبەر بە دوژمن.

ئارام پێش ئەوەی ئەرکەکانی خۆی جێ بەجێ بکا، بۆ ماوەی ١٥ ساڵ رەگەزنامەی میسری وەرگرتبوو، کەسی هەستی پێ نەکرد، تەنها یەکێك نەبێت، ئەویش کەس بەقسەی نەدەکرد.

ئەمە هۆی سەرکەوتنی جولەکە بوو بەسەر میسر و فەڵەستیندا.

## سەرەتای خوێندنم لە زانکۆدا



ساڵی ١٩٥٩ لە جەلەولا، پۆلی چوارەمی ئامادەییم لە قوتابخانەیەکی ئەهلی تەواو کرد کە لەسەر نەفەقەی خۆمان پێکمان هێنا، کە نزیکەی دە کەس دەبووین.

پۆلی پێنجەم لە ئامادەیی نەقابەی مامۆستایان لە بەغدا لە (باب موعەزەم) تەواوکرد. ئەوکاتە پۆلی شەشی ئامادەیی نەبوو.

لە ساڵی (١٩٦٠) لە کۆلێجی یاسای زانکۆی بەغدا وەرگیرام، بەشی ئێواران، ڕۆژی ١٩٦٠/٩/١٥ بۆ یەکەمجار چوومە هۆڵی وانە وتنەوە، دوای


بطاقة جواز الاشتراك فى الامتحانات العامة

١٩٦٠ - ١٩٦١

الدراسة الاعدادية ـ الفرع

الاسم واسم الاب واللقب

الرقم الامتحانى ..................

المدرسة ..................

اللواء ..................

ناجح / اكمال فى المعدلات السنوية

للصف الثانى الاعدادى (الخامس الثانوى)

التاريخ ..................

مدير ..................

١٩٦١/٦/١



ئەوەی دانیشتم، سەیری ئەملاو ئەولای خۆمم کرد دیم نزیکەی سەد فێرخواز دانیشتوون، وەك من چاوەڕوانی مامۆستا دەکەن، کاتێك کە مامۆستا هات هەموو هەڵساین لەبەری، دەستی کرد بە وتنەوەی یەکەم وانە لە یەکەم ڕۆژی ساڵی خوێندن، ماوەی وانەکە (٥٠) دەقیقە بوو لە پاشا هاتینەوە دەرەوە، بۆ ماوەی (١٠) دەقیقە پشوومان‌دا، دیسان چووینە ژوورەوە، هەر بەو جۆرە لە سەعات (٤) تا سەعات (٨)ی شەو چوار وانەمان خوێند هەر یەکێك لە جۆرێ.

هەفتەی یەکەم بە جبەو مێزەرەوە دەچووم بۆ کۆلێجی یاسا، لە نێوان قوتابییەکاندا تەنها من بووم ئەو جۆرە بەرگەم لەبەردا بێت، لەبەر ئەوە سەرنجی قوتابییەکانم ڕاکێشابوو بۆ لای خۆم، هەموو سەیریان دەکردم، دوام دەکەوتن و بانگیان دەکردم مەلا، منیش پێم ناخۆشبوو چونکە لەبەغدا بە کوێرەکان و قورئانخوێنەکانی سەرقەبران دەڵێن (ملا) و بەوەی خوێندەوار بێت دەڵێن (شیخ)، بڕیارمدا جبەو مێزەرەکەم بەکار نەهێنم، هەروەك لە داخی مەلاکانی سلێمانی ڕیشەکەم تاشی، تا ئێستاش کە تەمەنم (٧٧) ساڵە ڕیشم نەهێشتۆتەوە.

دیاره بۆ هەموو زانایەك كە خوای گەورە تەماشای مێزەری زل و جبەی پان ڕیشی درێژی ناکات، بەڵکو تەماشای ناو دەرونی مرۆڤ و ڕەوشتی باشی دەکات.

لە هەفتەی دووەمدا لە پاش دەست پێکردنی خوێندن سێ برادەرم پەیدا کرد، یەکێکیان عەرەب بوو بەناوی (موحەممەد مەهدی التكريتي)، دوانەکەی تر تورکمان بوون بەناوەکانی (فتحي كمال) و (فخري دباغ)، هۆی یەکگرتنمان ئایینی ئیسلام بوو، چونکە ئێواران نوێژی مەغریبمان پێکەوە دەکرد لە کۆلێجی یاسا، ئەم چوار برادەرە نموونەیەك بووین بۆ سێ نەتەوەکەی عێراق کوردو عەرەب و تورکمان، بە ڕۆح و گیان ڕێزی یەکترمان دەگرت و هەر چوار ساڵەکەمان پێکەوە بەسەر برد، پێکەوە دەمانخوێند، هیچمان هەستی بەوە نەدەکرد کە ئێمە هەریەکە لە نەتەوەیەکی جیاوازین، تەنها هەستمان بەوە دەکرد کە هەموومان موسڵمانین، هەموومان لەیەك نیشتماندا دەژین، هەموومان ئامانجمان یەکە کە بە خۆشبەختی و دڵخۆشی خوێندەواری و پێشکەوتن ماوەی ژیانمان بەسەر بەرین.

خوێندنی ئێوارانمان لە کۆلێجی یاسا لە کاتژمێر (٤ بۆ ٨) بوو، هەموومان لە گەڕەکێك بووین، کە ئێستا پێی دەوترێت (مدينه السلام) (طوپچی)، کۆلێجی



هاوڕێکانم لە کۆلێجی ماف - ١٩٦١

یاسا لە (باب المعظم) بوو، کاتێك لە کۆلێج دەهاتینە دەرەوە بە پاسی (مصلحە) دەگەڕاینەوە، لە ڕێگا لە (کاظمیة) دادەبەزین و دەچووینە گازینۆیەك، هەر چوار دەرسەکەمان دووبارە دەکردەوە، من بەهۆی خوێندنی مزگەوتەوە باشتر لە بابەتەکان تێدەگەیشتم، سەرلەنوێ بۆم ڕوون دەکردنەوە، تاوەکو کاتژمێر دەبوو بە نزیکی (١٢)ی شەو ئینجا دەگەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، بەمجۆرە توانیمان زاڵ بین بەسەر خوێندنەکەماندا، بەهۆی ئەم جۆرە خوێندندنەوە تێکڕای نمرەی هەر چوار ساڵەکەم (٨٦,٥) بوو.

بۆ یەکەمجار کە پلەی ماجستێر کرایەوە وەرگیرام لەم پلەیە، بەهۆی یەککگرتنم لەگەڵ ئەم برادەرانە، ئەگەر نەتەوەکانی عێراق (کوردو عەرەب و تورك) وەك ئێمە ڕەوشت و ڕێزی یەکتریان بگرتایە کەس خۆی بە زیاتر نەزانیایە لەوی تر، هیچ کەس دەست درێژی نەکردایەتە سەر مافی نەتەوایەتی ئەوی تر، هەموو گەلی عێراق بەشادی و ئاسایش و خۆشبەختی دەژیان، وڵاتەکەی خۆیان پێش دەخست لە پیشەسازی و کشتوکاڵ و بازرگانی و جۆرەکانی تری پێویستی ژیان، بەڵام بەداخەوە نەتەوەکانی عێراق ئەم ڕێگە ڕاستەیان نەگرت، بەڵکو ئەوەی بەدەسەڵات بوو بە چاوی کەمایەتی تەماشای بێدەسەڵاتەکەی دەکردو نەتەوەیەك لە نەتەوەکان خۆی بە خاوەنی وڵاتەکە لەقەڵەم دەدا و دەیوست نەتەوەکانی تر خزمەتکارو مووچەخۆری ئەوان بن، هەروەها جۆرە شتەکانی تر کە پەیوەندی هەیە بەڕەگەزپەرستییەوە، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی بەر ببینە یەك و یەکتر بکوژین، خراپترین چەکی ناڕەوا لە دژی یەکتر بەکار بهێنین، وڵاتەکەمان پارچە پارچە بکەن، بەچاوێکی دوژمنایەتی تەماشای یەکتر بکەن، بەروبومی وڵاتەکەمان ببێت بە پاروویەکی چەورو دوژمنەکانمان لە دەرەوە سوودی لێوەربگرن، خۆشمان بە هەژاری و دواکەوتوو لە شارستانێتیی بژین.

لە جیاتی ئەوەی کە هاوینەهەوارەکانی کوردستان ڕێك بکرێت وەك هاوینەهەوارەکانی ئەوروپا، هەموو دێهاتەکانی وێران کران، دانیشتوانەکانیان دەربەدەر کرا، بەندیخانەیان بۆ دروستکردن و ناویان نا (مجمع)، بەشێکی زۆری

خوێندەوارەکانی کوردو عەرەب و تورکمان ئاوارە بوون، هەریەکەیان رووی کردە وڵاتێك و ئێستا خزمەتی بێگانە دەکەن.

تاقیکردنەوەی ژیان لەم جیهانەدا بە باشی ڕوونی کردۆتەوە بۆ مرۆڤ کە هیچ وەخت کەس ناتوانێت لە ڕێگای زوڵم و زۆری و ناڕەواییەوە ئامانجەکانی بهێنێتە دی، بۆنموونە جولەکەو فەڵەستینییەکان زیاتر لە (٥٠) ساڵە دوژمنایەتی دەکەن و لەیەکتر دەکوژن، ئێستا هەردولا بیریان کردۆتەوە هیچ چارەیەك نییە بۆ لەناوبردنی ئەم ناکۆکییە جگە لە ئاشتی و برایەتی نەبێت.

ئێران و عێراق هەشت ساڵ ڕۆڵەی گەنجیان دا بەکوشت، بە هەزاران ماڵیان وێران کرد، بە هەزاران ژنیان بێ مێرد کردو منالیان هەتیو کرد، ئاوەدانییان وێران کرد، لە پاش ئەم هەموو کارەساتانە ئینجا بیریان کردەوە کە جگە لە ئاشتی لە نێوان دوو دراوسێ هیچی تر بەکەڵك نایەت، ئەگەر هەر لەسەرەتاوە بیریان لە دراوسێیەتی و چاك و خراپی بکردایەتەوە ڕێگای ئاشتییان دەگرت و ئەو هەموو کارەساتەیان بەسەر خۆیاندا نەدەهێنا.

## جۆری ڕۆشتنم بۆ کۆلێج

سەعات دووی پاش نیوەڕۆ دەوامەکەم لە سوپا تەواو دەبوو، بە ئۆتۆمبێلێکی سەربازی دەهاتمەوە بۆ ماڵ، سەعات دوو و نیو دەگەشتمەوە ماڵ، لە ماوەی نیو سەعاتدا خۆم دەگۆڕی و نوێژم دەکردو نانم دەخوارد، سەعات سێ دەچوومە دەرەوە، تاکو سێ و نیو بەپێ دەڕۆیشتم، چونکە لە (مدينە السلام) تا (کاظمیة) ئۆتۆمبێل نەبوو، ئەو ماوەیە، بەسەرماو گەرما، بە باران و قوڕ، بە گورجی بە پێ دەڕۆشتم، لەبەر ئەوەی دڵم لای خوێندنەکە بوو، هەستم بە گەرماو سەرماو ماندووبوون نەدەکرد، لە کازمیەوە بە پاسی مەصڵەحە دەچووم بۆ (باب المعظم)، هەموو ڕۆژێك پێنج دەقیقە پێشتر دەچوومە ژووری وانە وتنەوە، لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا ڕۆژێك دوانەکەوتم، مەگەر تووشی نەخۆشییەك بووبم.

لە قۆناغی سێیەم وانەیەکمان هەبوو پێیان دەوت (المواریث)، واتە جۆری دابەشکردنی میرات بەسەر میراتگراندا، من لەم بابەتەدا لە ساڵی ١٩٥١ لە سلێمانی کتێبێکم بە زمانی کوردی دانا لە ژێر ناونیشانی (تەرازووی میرات)، لە ساڵی ١٩٦٣ لە قۆناغی سێ کە ئەم بابەتەمان خوێند، من گەلێك لە مامۆستاکەمان باشتر بووم، لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژێك لەو دەرسە دوانەکەوتم، یەکەم لەبەر ئەوەی فێری جۆری دەرس وتنەوە ببم، دووەم لەبەر برادەرەکانم، سێیەم لەبەر ئەوەی فێری دواکەوتن نەبم.

مامۆستای ئەم بابەتە (د. حسین خلف) بوو (خوا لێی خۆشبێت)، ڕۆژێك وتی: گرانترین دەرس لەم بابەتە بەشکردنی میراتە بەسەر باپیرو خوشك و برای مردوودا، کەوا کاتێك ئەمانە یەکبگرن. منیش وتم: با لێکۆڵینەوەیەکتان بۆ بنووسم لەم بابەتەوە. وتی: با بیخوێنین تێی دەگەیت ئەوکاتە لێکۆڵینەوەکە بنووسە، وتم: ئەگەر ڕازی بیت ئێستا دەینوسم: وتی: باشە. منیش پانزە لاپەڕەم لەسەر نووسی و چاپم کرد و دام بە مامۆستا، لە پاش هەفتەیەك وتی: مستەفا ئیبراهیم کێیە؟ منیش دەستم بەرزکردەوە، وتی: ئەمشەو گوێم گرت لە وتارەکەی جەمال عەبدولناسر، لە پاشدا لێکۆڵینەوەکەی تۆم خوێندەوە، مژدەت بدەمێ ڕۆژێك لە ڕۆژان تۆ لەم جێگەیەی من دادەنیشیت ئەم وانەیە دەڵێیتەوە.

بەڕاستی وتەکەی هاتە دی، دوای ئەوەی لە قاهیرە دکتۆرام وەرگرت و گەڕامەوە، ١٩٧٦/١/١ لە کۆلێجی یاسای بەغدا دامەزرام، بۆیەکەمجار پێیان وتم دەبێت لە قۆناغی سێ دەرسی (مواریث) بڵێیتەوە، لەو ڕۆژەوە دەستم کرد بە وتنەوەی (دابەشکردنی میرات).

ئێستا خۆم دانراوێکم هەیە لەژێر ناونیشانی (أحكام الميراث والوصية وحق الانتقال في الفقه المقارن والقانون) لە ساڵی ١٩٨٦ەوە تا ئێستا کتێبی مەنهەجە بە ڕەسمی لە هەموو کۆلێجەکانی یاسای عێراق.

لە (مالية العامة) کە گرانترین وانەیە، لە هەر چوار پۆلەکەدا نمرەکەم لە کۆتایی ساڵدا (٩٩٪) بوو، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەبوو مامۆستاکەمان

خوالێخۆشبوو (د. مەجید عزەت) وتی: کێ لێکۆڵینەوەیەکم بۆ دەنووسێت لە بابەتی نەوتی عێراقەوە (٢٠) نمرەی لەسەرە ئەگەر باشبێت، دوان سیانێک دەستمان بەرزکردەوەو ناوەکەی نووسین.

من کتێبێکم هەبوو لە ژێر ناونیشانی (معرکة نفط العراق)، ساڵی ١٩٥١ کە هاتم بۆ بەغدا بۆ بڕینەوەی موچەکەم ئەم کتێبەم کڕی بە (٥٠) فلس، کاتێک گەڕامەوە لە تاسڵوجە لە بنکەی شورتە گیرام لەسەری، هەروەك لەمەو پێش بە درێژی باسم کردووە، دوای ئەوە منیش کتێبەکەم لەناو کتێبخانەکەدا هەڵگرت، ساڵی ١٩٦٣ کە داوامان لێکرا لێکۆڵینەوەیەك بنووسین لەسەر نەوت، لەم کتێبە دەرم هێناو بە جوانی و ڕێکو پێکی تەواوم کردو دام بە مامۆستاکەم. لە کۆتایی ساڵدا کاتێك نمرەمان وەرگرت من نمرەکەم (٩٩٪) بوو، چونکە (٨٠٪)ی نمرەی تاقیکردنەوە بوو (٢٠) نمرەی لێکۆڵینەوەکە بوو.

جا لەم بەسەرهاتەی مندا دەردەکەوێت هیچ کەس نازانێت چاکی و خراپی لە چیدایە.

# بەراوردێك لە نێوان خوێندنی زانكۆ و مزگەوت

دوای ئەوەی خوێندنی زانكۆم دەستی پێكرد، پاش ماوەیەك بیرم كردەوەو لەگەڵ خوێندنی مزگەوت بەراوردم كرد دیم جیاوازییەكی زۆر هەیە لە نێوان ئەم دوو جۆرە خوێندنەدا.

لەم كۆلێجی یاسایەدا بە ماوەی (٤) ساڵ (٤٠) بابەتی یاسام خوێند، كە هەر یەكێك باسی جۆرێكی ژیان دەكات، مرۆڤ لە هەموو جۆرە ژیانێك شارەزا دەكات.

بەڵام لە مزگەوت، من كە خۆم بە فەقێیەكی زیرەك دەزانی، بە دوانزە ساڵ دوانزە بابەت فێر بووم، كە هیچ یەكێك لەوانە پەیوەندی بە ژیانی دونیاوە نەبوو، سودەكەشی بۆ ئایینی ئیسلامیی پیرۆز زۆر كەم بوو.

لە ماوەی (١٢) ساڵدا فەقێی مزگەوت هەر فێری ئەو شتانە ئەبوو كە بریتیبوو لە كلیلێك دەرگای قورئانی پیرۆزو فەرموودەكانی پێغەمبەر خوا (درودی خوای لەسەر بێت) پێ ئەكرایەوە، لە پاشان ئیجازەی دوانزە عیلمەیان وەردەگرت لەسەر هەمان جۆر، ئەویش هەمان ئەو وانانەی دەوتەوە، ساڵەهای ساڵ بەدەگمەن ڕێی دەكەوتە نزیكی قورئانی پیرۆز، یان فەرموودەكانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)، ئەگەر مەلایەك پرسیارێكی لێ بكرایە لە بابەت حوكمە شەرعییەكەیەوە دەچوو پەنای دەبردە بەر یەكێك لە كتێبەكانی مەزهەبی شافیعی، ئینجا وەڵامی ئەدایەوە، دەیوت ئیمامی شافیعی وای

فەرمووە، ئیتر ئاگای لەوە نەبوو کە ئیمامی شافیعی لەکاتی خۆیدا کە بوو بە موجتەهیدو بە بیروڕای خۆی فەتوای دەداو حوکمەکانی لە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) وەردەگرت، هێندەی ئەو مەلا نەبوو، هێندەی ئەو شارەزایی مەنتیق و فەلسەفە و فەلەکیات و ئاداب و وانە عیلمییەکانی تر نەبوو، بەڵام ئیمامی شافیعی هەروەك پیاوێکی زیرەك بوو پیاوێکی ژیریش بوو، تەمەنی خۆی لە شتی بێ هودەوە بەخت نەکرد، بەڵکو هەر لەڕێوە چووە سەر قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا و ئەو ئیمامانەی لەپێش ئەوەوە بوون، لەم هەموو سەرچاوانە مەزهەبێکی بۆ خۆی دروست کرد کە ئێستا لەناو میللەتی کوردو کوردستاندا لەپاش قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) هیچ شتێك لە مەزهەبی شافیعی باشتر نییە بەلایانەوە، بە درێژایی ساڵ مەلا لە کوردستان دەیوت شافیعی وای فەرمووە، یان شێخی ئیبن حەجەر لە توحفەدا وای فەرمووە، لە مەلایەکت نەدەبیست لە فەتواکەیدا بڵێت خوا لە قورئانی پیرۆزدا وای فەرمووە، یان پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لە فەرموودەکانیدا وای فەرمووە، هەر بەم شێوەیە بە سەدان مەلا پەیدابون لە شافیعی مەزنتربوون، کەچی کاتێك کۆچی دواییان کرد وەك چرایەك کوژانەوە، هیچ ڕووناکییەکیان بۆ گەلەکەیان یان بۆ ئاینی ئیسلام بەجێ نەهێشت، باشترین مەلایان هەندێ حاشیەی لەسەر کتێبەکان بەجێ دەهێشت کە ئێستا کەس بەدینارێکی عێراقی نایانکڕێت، شایەنی باسە ئەمڕۆ لە عێراقدا هیچ شتێك نییە ئەوەندە هەرزان بێت بە دینارێك بیفرۆشن.

دوانزە ساڵ لە مزگەوت خوێندم، شەوو ڕۆژ خەریك دەبووم، کاتێك بووم بە مەلا نەمدەزانی ژن چۆن مارە دەکرێت، یاخود چۆن تەڵاق دەدرێت، یاخود چۆن تەڵاقەکەی چاك دەکرێتەوە، یان ناکۆکییەك کەوتە نێوانی کڕیارو فرۆشیارێك نەمدەزانی چۆن وەڵامی ڕاستەقینەیان بدەمەوە، بەپێی ئاینی ئیسلام. نەمدەزانی ئەگەر یەکێك تاوانێکی کرد گوناهی تاوانەکەی چییە، کەچی لە هەمان کاتدا وانەی بورهانی گەلەنبەوی (مطول)ی سەعددینی تفتازانی و (جمع الجوامع) و کتێبەکانی ترم لە پلە بەرزەکاندا بە وانە دەوتنەوە.

زۆر مەلا بووە لە کوردستاندا تەمەنی خۆیان تەواو کردووە لە خوێندن و وانەوتنەوەدا هەروەك من کۆڵەوار بووە لە شارەزایی سەرچاوەکانی ئیسلام کە قورئان و فەرموودەیە، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە (مدرس)، کە جێگەی فەخرو شانازی بوو بۆ کوردو کوردستان، لە هەموو جۆرە زانستێك دانراوێك یان زیاتری هەیە بە عەرەبی یان کوردی یان فارسی، گەلێ گەلێ خوێندەوارترە لە ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەبوحەنیفەو ئیمامی مالیك و ئیمامی ئەحمەد لەو زانستانەدا کە پێیان دەوترێت کلیلی کردنەوەی دەرگای قورئان و فەرمووده. کە پرسیارێکت لێدەکرد، دەچوو بەناو کتێبەکانی مەزهەبی شافیعیدا دەگەڕا بۆ وەڵامەکەی، یان دەفەرموێت ئیمامی شافیعی یان نەوەوی یان ڕافیعی وای فەرمووە.

ئەو ئیمامانەی باسمان کردن هەریەکە سەر زەوی پڕ کرد لە فیقهی ئیسلامیی، هەریەکە بەملیۆنەها خەڵك دوای ئەوان دەکەوێت، حەڵاڵ و حەرام لەسەر مەزهەبی ئەوان لەیەك جیا دەکاتەوە، کەچی مەلای تری کوردستان وەك مەلای قزڵجی و مەلای پێنجوێنی و مەلای نوتشێ و مەلا قادری گەورەی بیارەو مەلای ئیبن ئادەم، گەلێك گەلێك خوێندەوارتر بوون لەو زانستانەدا کە دەبنە هۆی دەرهێنانی حوکم لە قورئان یان فەرموودەدا، ئەمانە (خوا لێیان خۆش بێت) هەموو کۆچی دواییان کرد، جگە لە هەندی حاشیەی سەر کتێبەکان نەبێت هیچ بەرهەمێکیان بۆ ئیسلام و کورد بەجێ نەهێشت، لەبەر ئەوەی تەنها خەریکی دروستکردنی کلیل بوون، ڕۆژێك لە ڕۆژان بیریان لەو دەرگایە نەدەکردەوە کە بەم کلیلە دەکرێتەوەو هەموو گەنجینەیەکی ژیان و دونیاو قیامەت لەو ژوورەدایە کە ئەمان دەیانویست دەرگاکەی بکەنەوە، تەمەنیان تەواو بوو و ئەو دەرگایەیان نەکردەوە.

من ناڵێم خوێندنی فەقێیەتی مزگەوت بێ سوودە، بەڵام جۆری خوێندنەکەو جۆری وانەوتنەوەی وای لێ دەکرد کە سوودێکی زۆری نەبێت لە بابەت ژیان و ئایینەوە، چونکە هەر مەلایەك بەپێی پلەی زانیاری خۆی قوتابخانەیەکی هەبوو، بە درێژایی ڕۆژ وانەی بەدوو یان چوار یان شەش فەقێ دەوتەوە لەوە زیاتر نەبوو، هەریەکە بە جیاواز دووسەعات لەگەڵیان خەریك دەبوو، تا ئێوارە خۆی ماندوو

دەکرد، وەرگێڕانی کتێبەکەی دەکرد لە عەرەبییەوە بۆ کوردی، فێری وتەی خاوەن کتێبەکەی دەکردن، بیری لەوە نەدەکردەوە ئەو قسانە ڕاستن یان هەندێکیان هەڵەن، چونکە ئەم نوسراوانە هەمووی بە (اجتهاد) دانراون، هەموو موجتەهیدێك وەك ڕاستی هەیە هەڵەشی هەیە، مەلای وا هەبوو ئەگەر کتێبەکەیان لێ بگۆڕیایە لەهەمان کتێب دانەیەکی تریان بدایەتێ نەیدەزانی وانەکەی تیا بڵێتەوە، چونکە کتێبەکەی خۆی وەك خۆیان دەڵێن خۆش کردووە بە سەرو بۆرو ژێر و نیشانەکانی تر، ئەگەر وشەکەی (مبتدأ) بوایە لە ژێریدا دەینووسی (م)، ئەگەر (خبر) بوایە لە ژێریدا دەینووسی (خ)، واتە مامۆستا بە درێژایی ساڵ کتێبی دەوتەوە، ئەو بیروڕایەی کە لەناو کتێبەکەدایە نە خۆی فێری دەبوو نە فەقێیەکەی، مەگەر مەلایەکی زۆر چاك بوایە، بۆ ماوەیەکی زۆر دەرسی بوتایەتەوە.

ئەم جۆرە خوێندنە تەنها سوودی ئەوەیە کە بیروڕای مرۆڤی تیژدەکردەوەو فێری وردەکاری دەکرد، ئەم جۆرە سودەش مرۆڤ هەستی پێ ناکات تا نەچێتە ناو خوێندنی زانکۆوە.

بەڕاستی من سوودم زۆر لێ وەرگرت لە خوێندنی یاسادا، بەڵام ئەگەر هەر مەلا بومایە تا ئێستایش هیچ سودێکم لە خوێندنەکەم و وانە وتنەوەکەم وەرنەدەگرت، چونکە من بۆ خۆم (جمع الجوامع)م لای باشترین مەلا خوێندووە، هەشت جار لەلاپەڕەی یەکەم تا دوالاپەڕە بەدەرس وتمەوە، کەچی فێری زانستی (أصول الفقه) نەبووم، تا بۆخۆم چووم (اصول الفقه)ی هەشت مەزهەبم خوێندەوەو لەگەڵ یاسادا بەراوردم کرد، توانیم ناوەڕۆکی هەموویان کۆبکەمەوە لە کتێبێکدا کە ناوم نا (اصول الفقه الاسلامی في نسیجة الجدید).

داخی زۆر لە دڵمدایە لە بابەت خوێندنی مزگەوتەوە، چونکە باوەڕ ناکەم لە چەرخی بیستەمدا هیچ ڕۆڵەیەکی کورد هێندەی من ناخۆشی و ماندووبوونی دیبێت لە ڕێگای ئەم خوێندنەدا -هەروەك لە بەشی یەکەمی ژیاننامەکەمدا باسم کرد-، ئەگەر هەر لە مەلایەتی بمامایەتەوە هیچ سودێکم نەدەبوو بۆ ئایینی ئیسلام و بۆ کوردو کوردستان، چونکە هەر دوای قسەی ئەم و ئەو دەکەوتم، خۆم هیچ بیروڕایەکم نەدەبوو، هیچ کاتێك باوەڕم بە خۆم نەدەبوو کە وتەیەك یان بیروڕایەك بخەمە سەر لاپەڕەی مێژوو، بۆ موسڵمانەکان و نەتەوەکەم سوودی هەبێت.

## نرخی کات لە ژیاندا

گرنگترین شتێك کە مرۆڤ دەسەڵاتی هەبێت بەسەریدا بریتییە لە کات، پێشینان وتوویانە: (الوقت کالسیف ان لم تقطعة یقطعك)، واتە: کات وەك شمشێرێکی تیژە ئەگەر تۆ نەیبڕی ئەو تۆ دەبڕێت. لە کاتی خوێندنەکەمدا لەسەر ئەم بنچینەیە بناغەی ژیانم دانا، لە ماوەی ئەو چوارساڵەدا لە کۆلێجی یاسا بووم و، ئیمامیش بووم لە سوپا کە بەپلەی ئەفسەر دادەنرێت، هەموو ڕۆژێك لە کاتژمێر حەوتی بەیانییەوە تا دووی پاش نیوەڕۆ لە فەرمانگە بووم، ئیش و کاری فەرمانگەم تەواو دەکردو لە پاشاندا دەچوومە شوێنێکی کەنار کە کەس نەمبینێت، ئەو وانانەی کە ڕۆژی پێشوو خوێندبووم بە مانا لەبەرم دەکرد نەك بە (عبارة الفاظ)، چونکە شت لەبەرکردن بە مانا باشتر مرۆڤ لە بابەتەکە دەگات و درەنگتریش لە بیری دەچێتەوە، هەر بەم جۆرە خۆم فێرکرد کە بیروباوەڕی یاسایی تێبگەم، نەك خۆم فێری کتێبی مامۆستاکان بکەم، چونکە ئەگەر لەسەر کتێب بڕۆم خوێندنەکەی کۆلێجم هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ خوێندنی حوجرە نابێت، بەدرێژایی ساڵ دەبێت هەر فێری کتێب ببم و، دووربم لە ڕاست و چەوتی ئەم کتێبانەوە، بیروباوەڕم وابێت کە هەرچی نوسراوە هەمووی ڕاستە، باوەڕم بەخۆم نەبێت کە منیش بیروباوەڕێکی تایبەتیم هەبێت لەم بابەتەدا.

هەرچیم دەخوێندەوە لە کتێبەکانی یاسا لە هەموو جۆرە بابەتێك پێشەکی لە دڵی خۆمدا بڕیارم دەدا کە ئەمە ڕاست نییە، ئینجا دوایی دەستم دەکرد بەلێکۆڵینەوەی، تا چاك و خراپەی بکەوێتە بەرچاوم بۆ ئەوەی چاکەکەی

بگرم و خراپەکەی لە خۆم دوور بخەمەوە، ئەمجۆرە کردەوەیەشم لە فەرموودەی ئیمامی غەزالی (خوا لێی خۆشبێت) وەرگرت کە دەفەرموێت: "من لم یشك لم ینظر ومن لم ینظر لم یبصر ومن لم یبصر بقی في العمی والظلال". واتە: هەرکەسێك نەکەوێتە گومانەوە لە شتێکدا بە قوڵی تەماشای ئەو شتە ناکات، ئەگەر بەمجۆرە تەماشای نەکرد ڕاستییەکە ناکەوێتە ناو مێشکییەوە، ئەگەر نەگا بەم ڕاستییە هەر بە کوێری و سەرلێشێواوی دەمێنێتەوە.

جگە لە قورئانی پیرۆزو فەرمودە ڕاستەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)، بۆ بوارەکانی تر ئەم فەرموودەیەی غەزالی لە هەموو شتێکدا بەکاردەهێنم کە بمەوێت لێی تێبگەم.

هەر شتێك بخوێنمەوە یان ببینم پێشەکی تەماشای وتەکە دەکەم، تەماشای خاوەنەکەی ناکەم بە پێی فەرموودەی پێشینان وتوویانە: (انظر الی ما قیل ولا تنظر الی من قال)، واتە: تەماشای وتراوەکە بکەو تەماشای خاوەنی وتەکە مەکە، تاوەکو پێشەکی خۆت نەبەستیتەوە بەو وتەیەوە ڕاست بێت یان چەوت بێت، هەروەك ئێستا باوە لە نێوان مامۆستاکانی ئایینی ئیسلامدا، کاتێك گفتوگۆی لەگەڵ دەکەیت لە بابەت هەر شتێکەوە، پێشەکی پێت دەڵێت فلان زانا یان فلان مەزهەب وای فەرمووە، ئەمەش گەورەترین هۆی دواکەوتنی نەتەوە موسڵمانەکانە لە ژیانی ئەم جیهانەدا.

# پەیوەندیم لەگەڵ کوردەکانی بەغداساڵی ١٩٦٣

من لە ماوەی ژیانمدا بەڕەسمی پەیوەندیم بە هیچ حزبێك نەکردووە، خۆم نەخستۆتە ژێر دەستی هیچ سیاسییەکەوە، بەڵام پەیوەندیم بووە بەو کەسانەوە کە بڕوام هەبووە پێیان کە ئامانجەکانیان بۆ سوودی گەلی کوردە، لە (١٩٥٦-١٩٥٧) تا (١٩٥٨) لەگەڵ ئەفسەرە ئازادیخوازەکان پەیوەندیم هەبوو، بەشداریم کرد لە شۆڕشی ١٤ی تەمموز - وەك لەمەوپێش باسمان کردووە -، بەڵام پەیوەندیەکەم لەسەر بنچینەی حزبایەتی نەبووە، بەڵکو لەسەر بنچینەی خزمەتی گەلی عێراق و بەتایبەتی گەلی کورد بووە.

ساڵی ١٩٦٣ کە کودەتا کرا بەسەر عەبدولکەریم قاسم دا، بە ناڕەواییەکی ئاشکرا ستەم و دوژمنایەتی کرا لەکوردەکانی کوردستانی عێراق، هەستم بەوە کرد کە پێویستە هەموو کەسێك لایەنگری ئەو کەسانە بکات کە جەوریان لێ دەکرێت، بەپێی توانای خۆم لەم ڕووەوە من پەیوەندیم هەبوو بە کوردەکانی بەغداوە، نەك لەسەر بنچینەی حزبایەتی، بەڵکو لەسەر بنچینەی خزمەتی گەلی کورد.

هەر لەبەر ئەم پەیوندییە، لە پاش خۆپیشاندانەکانی کورد لە بەغدا ڕۆژی (١٩٦٣/٧/٢٠) منیشان گرت، کاتێك چووم بۆ بینینی دکتۆر فوئاد بابان و کاك ئەکرەم لە شوێنێك کە دیاربوو پێشتر گیرابوو و چاودێری لەسەر شوێنەکەی بوو، کاتێك گەیشتمە بەردەرگاکە لوولەی کلاشینکۆفیان خستە سەر پشتم وتیان: (فوت جوه والا نقتلك)، واتە بچۆرە ژوورەوە ئەگەر نا دەتکوژین،

چوومە ژوورەوە ئازارێکی زۆریان دام، باڵ بەستیان کردم و خستمیانە ژێر دەستی تاوانباری گەورە (نازم گوزار) هەزار لەعنەت لە گیانی پیسی بێت، لەو شوێنە کە جاران پێیان دەوت (محكمة الشعب)، بردمیانە ژوورێك کە جێی ئەشکەنجەدان بوو، کاك (د. فوئاد بابان)م دی لە سوچێکدا دایاننابوو، هەموو گیانی خوێن بوو، ئینجا بەربوونە منیش لە چەپ و ڕاست، لەو کاتەدا (ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر) کە سەرەك وەزیران بوو، لەگەڵ (تاهیر یەحیا) کە (ڕئیس ارکان الجیش) بوو، هاتنە ژووری ئەشکەنجەدان، ئەوانیش هەردوکیان منیان باش دەناسی، (تاهیر یەحیا) لە جەلەولا بۆ ماوەی سێ ساڵ دراوسێمان بوو، (ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر) کاتێك ئامر فەوج بوو، بەسەدەها جار لە پشتی سەری منەوە نوێژی کردووە، کە من دەبووم بە ئیمام لە نوێژەکەدا.

تاهیر یەحیا وتی: (أنت مصطفی؟) وتم: نعم، وتی: چی تۆی گەیاندۆتە ئێرە؟ وتم: تەنها ئەو گوناهەم هەیە چووم بۆ دیدەنی برادەرێکم، ئەو گیرابوو منیشیان لە جێگەی ئەودا گرت.

ئەحمەد حەسەن وتی: انت مسلم؟ وتم: أنت تعرف.

لە پاشا تاهیر یەحیا چوو نازم گوزاری بانگ کرد، کە سەرۆکی لیژنەی ئەشکەنجەدان بوو، پێی وت: دەست و باڵی بکەنەوەو ئەشکەنجەی مەدەن و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەن، بەپێی قانون گوناهی چییە سزای بدەن.

لە پاشا دەست و باڵیان کردمەوەو ئەوان ڕۆیشتن، نازم گوزار پێی وتم: ئەی تاوانبار وادیارە هەموو پیاوە گەورەکان دەتناسن، تۆ دەبێت مرۆڤێکی زۆر تاوانبار بیت، منیش وتم: لە پاشەڕۆژدا هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەبێتەوە، کەلەپچەیەکیان کردە دەستی من و دکتۆر فوئاد بابان و بردنیان بۆ ئەو ژوورەی کە بەندکراوە کوردەکانی تیابوو، تەماشام کرد ژوورێکی بچووك بوو بەشی شەش کەس نەدەکرد، کەچی نزیکەی (٦٠) کوردی تیایە، هەموو سەروچاوو باڵ و قاچیان شکاوە، لەوانە کاك ڕەئوف ڕەشید (حاکم ڕەئوف) و کاك ئەکرەم، بە

تایبەت کاك ئەکرەمی فەقێ مەحمود کراسەکەی یەك پارچە خوێن بوو، وتم: ئەگەر من پێش تۆ چوومە دەرەوە ئەم کراسە دەبەم لە چوارچێوەی دەگرم.

لە پاشا من و دکتۆر فوئادو دوو کوردی تر بردینیان بۆ بەندیخانەی (فضل)، دایکی موحەممەد چووبوو بۆ ماڵی تاهیر یەحیا، ئەویش یارمەتی دام و بەریاندام، لە پاش سێ ڕۆژ دووبارە گرتمیانەوە، لە پاش نزیکەی مانگێك دووبارە تاهیر یەحیا بوو بەهۆی ئەوەی بەرم بدەنەوە.

خوا لە دوو لاوە ڕەحمی کرد، یەکیان کە هیچم لەسەر نەدۆزرایەوە، چونکە خۆم پاکبووم، لە ڕێگەی پاکیدا دەجووڵامەوە، دووەم ئەم کارەساتەی بەسەرمدا هات لە کاتی پشووی هاوین بوو، هیچ زیانێکی نەبوو بۆ خوێندنەکەم.

لەساڵی (١٩٦٤ - ١٩٦٥)بڕوانامەی کۆلێجی یاسام بەدەست هێنا.

## کورتەیەك لە ژیانی

## دکتۆر فوئاد احمد بابان



ساڵی ١٩٤٠ لەشاری هەڵەبجە لەدایك بووەو هەر لەوێ سەرەتایی و قۆناغی ناوندی تەواو کردوە، بۆ خوێندنی ئامادەیی چووەتە کەرکوك، لەساڵی ١٩٥٨ چوەتە کۆلیجی پزیشکی لە بەغداو لە ساڵی ١٩٦٥ تەواوی کردوە. لەو ماوەیەدا دوو جار گیراوەو چەند جارێ بەناچاری خۆشاردنەوە بووە.

١٩٦٦/٧/١ چوەتە کۆلیجی احتیات و پاش چەند رۆژێك گیراوەو نزیکەی شەش مانگ لە بەندیخانە بووە، پاش بەربوونی لە (معاملی شهدا جیش) دانراوە وەك دکتۆر.

لە ١٩٦٧/١/٢٣ تەسریح کرا.

سەرەتای ١٩٨٠ گەڕایەوەو داوای کرد لە سلێمانی دابنرێت، وارێکەوت ئەوکاتە (عزیز عەقراوی) وەزیری تەندروستی بوو بە وەکالەت، بۆیە بەئاسانی لەسلێمانی دانرا، چونکە ناسیاوی لەگەڵیا هەبوو.

ساڵی ١٩٨٨ بۆ دەورەیەکی کورت چووە بەریتانیا بۆ بەشداری لە دەورەیەك لە خەستەخانەکان لەسەر ئەرکی (مجلس سەقافی بەریتانی) بۆ راهێنان لەسەر نازور و سۆنەر.

ساڵی ٢٠٠٠ بڕوانامەی (FRr.P) وەرگرت لەلایەن کۆلیجی شاهانەی بەریتانیا. کە ئەوە یەکەم جار بوە دکتۆرێکی هەناو ئەم بڕوانامەیە وەردەگرێت لەم ناوچە پارێزراوەدا.

لەسەرەتای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی وانەبێژ بوە لە کۆلیجی پزیشکی تا ئەو رۆژەی زانکۆ گوێزرایەوە بۆ هەولێر، پاش گەڕانەوەی زانکۆ دوبارە گەڕایەوە بۆ وانەوتنەوەو ساڵی ١٩٩٦ کرایە سەرۆکی بەشی هەناو.

لە مانگی ٢٠٠٢/١ فەرمانی زانکۆی دەرچوو بۆ بەرزکردنەوەی پلەی زانستیی بۆ (پرۆفیسۆری یاریدەدەر).

## کورتەیەك لە ژیانی

## کاك ئەکرەم فەقێ مەحمود



ناسراوە بە ئەکرەم بەحری، ساڵی ١٩٣٩ لەسلێمانی گەڕەکی شێخان لەدایك بوە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە سلێمانی تەواو کردووە.

ساڵی ١٩٥٩ چوەتە پەیمانگای رادار لە بەغدا، لە هێزی ئاسمانی عێراق، پاش دووساڵ خوێندن بە پلەی نائب زابت رادار دەرچووە.

ساڵی ١٩٥٥ پەیوەندی کردووە بە یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوەو ساڵی ١٩٦١ پەیوەندی بە رێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەناو سوپا کردووە.

ساڵی ۱۹٦۳ دوای شکستی کودەتایەکی سەربازی لە (معسکر رشید) دەستکرا بە رەشبگیری لەناو سوپاداو ئەکرەم یەکێك بوو لە گیراوەکان، پاش دوو هەفتە لە ئەشکەنجەدان لە (معسکر تاجی) توانی هەڵبێت و لەگەڵ (فوئاد بابان) لە خانویەکی قوڕی بچووك خۆیان شاردەوە و دواتر دەستگیر کرانەوەو بران بۆ (هیئة تحقیق خاصة) لە (مەحکەمەی شەعب) و لیژنەیەکی تایبەت تەحقیقی لەگەڵ دەکردن. خانووەکەش کرایە کەمینێك بۆ ئەوانەی پەیوەندی پێوەدەکردن، کە یەکێك لەوانە من بووم گیرام.

چەند هەفتەیەك لەژێر ئەشکەنجەدا بوون، ئەکرەم توانای بەرگریی زۆر لاواز دەبێت و هەوڵی خۆکوشتن دەدات، لەهۆش خۆی دەچێت و دەگوێزرێتەوە نەخۆشخانەی (عیوازیە) و لەوێ دەمێنێتەوە تا کودەتاکەی تشرینی ۱۹٦۳ بە سەرکردایەتی عبدالسلام عارف، ئینجا گوێزرایەوە بۆ مەرکەزی پۆلیسی وەزیریە و دوبارە درایەوە لیژنەی تەحقیقی پۆلیس و درا بە مەحکەمەی عورفی دوو بە تۆمەتی خیانەتی گەورە، دوای ماوەیەك بە کەفالەت بەربوو.

لە ۱۹٦٥ دووبارە گیرایەوەو درایەوە مەحکەمەی عورفی دوو و حوکمی سێدارەی بۆ دەرچوو، بەڵام کەوتە بەر لێبوردی گشتی و بەربوو. گەڕایەوە نا سوپا، ئێستا لە سلێمانی دەژی و پەیوەندیمان بەردەوامە و سەردانم دەکات.

# پلەی ماستەر

لە ساڵی ١٩٦٦ لە زانکۆی بەغدا بۆ یەکەمجار پلەی ماستەر لە شەریعەتی ئیسلامیی کرایەوە، لەم پلەیەدا دە کەس وەرگیرا، مامۆستاکانمان پێنج کەس بوون سیانیان میسری بوون، (شێخ عبدالرحیم الکشك، شێخ محمد ابوسنە و شێخ عبدالمقصود شلتوت)، دووانیان عێراقی بوون، یەکێکیان سونی بوو بەناوی (شفیق العاني) ئەوی تریان شیعە بوو بەناوی (موحەممەد تقی الحکیم)، ئەمانە هەریەکەیان دەرسێکیان پێ ئەوتین، بەڵام هیچ شتێکی تازە نەبوو لەم پلەیەدا بەرگوێمان بکەوێت.

مامۆستاکانی زانکۆی عێراق تا ئێستایش -کە ساڵی (٢٠٠١)ە - هەر ئەوە دووبارە دەکەنەوە کە لە پۆلی یەك و دوو و سێ و چواری کۆلێج بە قوتابییان وتووە، ئەمەش بەهێزترین هۆیە بۆ دواکەوتنی گەل، موسڵمانەکان بەتایبەتی عەرەبەکان هەموویان دوژمنن بە عەقڵ، هەروەك توتی ئەوانەی پێشوو چییان وتووە دەیڵێنەوە بۆ نەوە نوێکان، بەتایبەتی مامۆستاکانی (الشریعة الاسلامیة) ئەو شتانە بە قوتابی ئەڵێن کە هەزار ساڵ لەمەوپێش وتراوە، بەبێ ئەوەی بیربکەنەوە لەوەی کە ئەوان لەسەردەمێکدا ژیاون کە جیاوازە لە سەردەمی ئەمڕۆو پاشەڕۆژ، عێراق هەزار ساڵ لەمەوپێش گەلێك پێشکەوتووتر بوو لە ئێستا، کاتێك ئاڵای ئیسلام دەشەکایەوە لەسەر چواریەکی گۆی زەوی، لەوکاتەدا ئەمریکا هێشتا نەدۆزرابووەوە، وەکو کێوی ئەژیان، کەچی ئێستا هەموو شتێك بە پێچەوانەیە، وڵاتە ئیسلامییەکان بوون بە کێوی و گەلی ئەمریکی گەیشتە ئەستێرەی مەریخ و مانگ.

لەم ڕۆژانەدا هەواڵێکی ڕادیۆ وتی کە نزیکی ساڵی ٢٠٨٤ ژمارەی دانیشتوانی مانگ دەبنە (١٢) ملیۆن، کەچی ئێمە وەك گێژ هەر بەدەوری خۆماندا دەسوڕێینەوە، وەك (توتی) قسەی پێشینان دەگێڕینەوەو لە هەموو بابەتێکی ژیانمان لەسەر ئەو قسانە دەجوڵێینەوە.

ئەو پێنج مامۆستایە کە وانەیان پێ دەوتین هەموویان وەك توتی وەهابوون، بەڵام یەکێکیان بەناوی (شێخ عبدالمقصود) زۆر هەوڵی دەدا و زۆری پێ خۆشبوو کە شتێکی تازەمان پێ بڵێ بە کەڵکی ئەو قۆناغە بێت کە ئێمەی تیادا دەژین، بەڵام بەداخەوە لە خوێندەواریدا هیچ ڕەصیدێکی نەبوو.

هەرجۆرێك بێت خوێندنەکەمان باشتر بوو لە دانیشتنیماڵەوە، ساڵ تەواو بوو تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ کرا، هەرکەس نمرەی خۆی وەرگرت من بەیەکەم دەرچووم نمرەکەم (٨٩٪) بوو.


بسم الله الرحمن الرحيم

جامعة بغداد

الشعبة :

الرقم

التاريخ

بۆ ساڵی دووەم دەبێت کتێبێك (رسالە)یەك دابنێین لە ژێر چاودێری یەکێك لەسەرپەرشتیارەکان، من ئەم بابەتەم هەڵبژارد بۆ نووسین: (مدى سلطان الارادة في الطلاق خلال أربعة الاف سنة في الشرائع والقوانين والأعراف)، سەرپەرشتیارەکەم (شێخ عبدالرحيم كشك) بوو، لەم بابەتەم کۆڵیيەوە لە (٢٠٠٠) ساڵ پێش زایین تا ساڵی (١٩٦٧م)، لە هەموو ئاینەکانی ئاسمانی وەك ئایینی موساو عیساو موحەممەد (درودی خوایان لەسەر بێت) دابەشم کرد بەسەر پێنج (باب)دا.

یەکەم: بۆ نەتەوە کۆنەکان، وەك فیرعەونییەکان و ئاشوورییەکان و هندییەکان و ئەوانی تر لەو نەتەوانەی کە (٢٠٠٠) ساڵ پێش زاین دەژیان.

بابی دووەم: بۆ باسی رێنمایی (تعاليم)ەکانی موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە بابەت تەلاقەوە.

بابی سێیەم: بۆ باسی رێنمایی (تعاليم)ەکانی عیسا (سەلامی خوای لەسەر بێت).

بابی چوارەم: بۆ ئایینی ئیسلام.

بابی پێنجەم: بۆ یاساکانی هەموو وڵاتەکانی جیهان تا ساڵی ١٩٦٧.

مانگی نۆی ساڵی ١٩٦٨ ماستەرم وەرگرت.

ساڵی ١٩٦٨ ماستەر کرایەوە لە یاسای بەغدا، پێش تەواوکردنی ماستەرەکەم پێویستی وەرگرتنی ئەم پلەیەم دا بە کۆلێجی یاسا لەوێش وەرگیرام، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ماستەرەکەی ترم تەواو نەکردبوو، پێیان وتم یان تنازل بکە لەو ماستەرە یان قوتابییەکی تر لە جێگەکەت دادەنێین، وتم: تەنازول ناکەم، چونکە خەریکە تەواو دەبێت، لەبەر ئەوە قوتابییەکی تریان لە جێگەی من دانا.

لە ساڵی ١٩٦٨ کە ماستەرەکەم تەواو کردبوو، جارێکی تر داوام کرد بۆ وەرگرتن لە کۆلێجی یاسا، ئەم جارەش وەرگیرام لە یاسای گشتی (القانون العام)، ساڵی پێشوو وەرگیرابووم لە یاسای تایبەتی (القانون الخاص)، کاتێك دەستمان کرد بە وانە خوێندن، بۆم دەرکەوت کە مامۆستاکانی یاسامان باشترن لە

ماموٚستاکانی شەریعەتی ئیسلامی لە بیروباوەڕو لێکوٚڵینەوەی ئەو بابەتانەی کە دیاری کرابوون بوٚ ئەوەی بیانخوێنن.

ماموٚستاکانمان هەموویان میسری بوون (د. عەلی ڕاشید) فەلسەفەی جینائی پێدەوتین، (د. سلیمان مرقس) کە باشترین زانای یاسابوو لە میسر فەلسەفەی یاسای پێ دەوتین، (د.محمد فوئاد مهنی) یاسای ئیداری پێدەوتین، (د. محمد ڕەئوف) یاسای دەستووریی پێ دەوتین، تەنها یەکێکیان عێراقی بوو کە بریتی بوو لە (د. حسن چلبی) یاسای نێودەوڵەتی پێ دەوتین، بەڕاستی زوٚر سوودم وەرگرت لەم خوێندنە، بەڵام بەداخەوە لە پاش سێ مانگ خوێندن گوێزرامەوە بوٚ هێزی سەڵاحەدین لە ئوردن لە (ف٣، ل٦)، زوٚرم هەوڵدا سوودی نەبوو، چونکە ئەوکاتە ئیمام بووم لە سوپا هیچ ڕێگەیەکی تری ژیانم نەبوو هەتا واز لە کارەکەم بێنم و خوێندنەکەم تەواو بکەم، ئەوساڵەشم هەروا لە دەست چوو.

ساڵی ١٩٧٠ گوێزرامەوە لە ئوردنەوە بوٚ وەزارەتی بەرگری، لەبەر ئەوەی من یەکەم ئیمام بووم لە سوپای عێراقدا ماستەرم هەبێت، لەوێ لە بنکەی وەزارەتی بەرگری دانرام، خولیان دەکردەوە بوٚ ئەفسەرەکان وانەی فارسیم پێ دەوتن، هەروەها خولیان دەکردەوە بوٚ ئیمامەکانی سوپا وانەی ئایینی ئیسلامم پێ دەوتن، هەر چاپەمەنییەك چاپ بکرایە من سەرپەرشتیم دەکرد، هەڵە (نحوی) یەکانم چاك دەکردەوە.


ختم الكلية
اسم الطالب مصطفى ابراهيم الزلمي
السنة الدراسية ٧٢/٧١
القسم
الشعبة
بيانات أخرى
سداد رسوم الدبلومات

لە هەمان ساڵدا ئیجازەی مانگێکم وەرگرت و چووم بوٚ قاهیرە بڕوانامەی ماستەرەکەم برد بوٚ ئەوەی لەوێ دکتوٚرا توٚمار بکەم، چونکە ئەوکاتە لە عێراقدا دکتوٚرا نەبوو، کاتێك چوومە زانکوٚی ئەزهەرو

زانکۆی قاهیرە، هەردوولا پێیان وتم: ئێمە باوەڕ بە ماستەری عێراق ناکەین، بەڵام دەتوانین بە جۆرێکی تر یارمەتیت بدەین، ماستەرەکەی عێراق بە دبلۆمێك وەردەگرین، دبلۆمێکی تر وەربگرە لێرە لە (فقه المقارن) لە زانکۆی ئەزهەر یان یاسای تایبەتی، ئەوکاتە لە دکتۆرا وەرت دەگرین، بەهەر دبلۆمێك تۆ لێرە وەری دەگریت.

منیش لە هەردوو زانکۆکە دبلۆمم تۆمارکرد، هەر زانکۆیەك (٦٠) پاوەنی ئیستەرلینی لێ سەندم کە پێی دەوترێت (رسم الدراسة)، لە دڵی خۆمدا وتم لە هەر دبلۆمێك دەرچووم لەو زانکۆیە دکتۆرا تۆمار دەکەم، کتێبەکانم لە هەردوولا وەرگرت و گەڕامەوە عێراق، بەڵام نەمتوانی بۆ دەوری یەکەم ئامادە ببم، بۆ دەوری دووەم چووم لە تاقیکردنەوەی دبلۆمەکەی زانکۆی ئەزهەر بەشداریم کرد، لەگەڵ هەندێ قوتابی عێراقیدا کە ئەوان لە دەوری یەکەم دەرنەچووبوون، کاتێك کە نمرەمان وەرگرت لە عێراقییەکان تەنیا من دەرچووم لەو دبلۆمەدا لە پاشدا ماستەریان پێدام لە (فقه المقارن).

بەمەبەستی بەشداری کردن لە تاقیکردنەوەی دبلۆمەکەی زانکۆی قاهیرە،ساڵی ١٩٧٢ لە مانگی نۆدا جارێکی تر چوومەوە بۆ قاهیرە، تاقیکردنەوەی دەوری دووەم لە (١٩٧٢/١٠/١) بوو، واتە من تەنها یەك مانگم هەبوو بۆ خۆئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەی دبلۆمەکەم، کاتێك کتێبەکانم بەتەواوەتی وەرگرت سەیرم کرد کە (١٠) کتێب دەبێت، پێنجیان تاقیکردنەوەی سەر کاغەزو پێنجیان تاقیکردنەوەی زارەکی دەبێت، کاتێك گەڕامەوە بۆ شوقەکەم دیم بە هیچ جۆرێك من ناتوانم لە ماوەی یەك مانگدا خۆم ئامادە بکەم لەم (١٠) کتێبەدا، ئینجا کتێبەکانم یەکە یەکە تەماشا کرد، لە هەر کتێبێك شەش جێگای زۆر گرنگم دیاری کرد، وتم خۆم و بەختم ئەگەر پرسیارەکان لەم شوێنە دیاریکراوانە بن ئەوا دەردەچم بەیارمەتی خوا، ئەگەر لەوانە نەبن دەفتەرەکەم بەسپێتی دادەنێم و لە هۆڵی تاقیکردنەوەکە دێمە دەرەوەو ڕووبە عێراق دەگەڕێمەوە.

ئێمە عێراقییەکان حەوت کەس بووین، بەیانیان پێش کاتی تاقیکردنەوە لە زانکۆ یەکمان دەگرت، ئەوان هەموویان لە دەوری یەکەم دەرنەچووبوون، لە منیان

دەپرسی چۆنی لە خۆئامادەکرندا، دەموت ئەو شوێنانەم دیاری کردووەو خۆم ئامادە کردووە ئەگەر بێنەوە لە پرسیارەکاندا ئەوا ئومێدم هەیە باش بم، ئەگەرنا دەفتەرەکە بە سپێتی دادەنێم و دێمە دەرەوە.

لوتفی خوای گەورە وەهابوو لەهەر پێنج ڕۆژەکەدا پرسیارەکانی تاقیکردنەوەکە لەو شوێنانە هاتنەوە کە من دیاریم کردبوو بۆ خۆم و تیایدا ئامادە بووم.

لەدوای تاقیکردنەوەی سەرکاغەز، نۆرەی تاقیکردنەوەی زارەکی هات، یەکێك لە ئەندامەکانی لیژنەی سەرپەرشتی تاقیکردنەوەی زارەکی (شیخ فرج سنهوری) بوو، کە ئەوکاتە محازر بوو لە کۆلیجی ماف لە زانکۆی قاهیرە، ئەم پیاوە مرۆڤێکی زۆر خوێندەوار و زۆر قوڵ بوو لە نووسیندا، زۆر شارەزا بوو لە فیقهی ئیسلامیدا، هەردەم لەگەڵ ڕاستیدا بوو، پەیوەند نەبوو بە یەك مەزهەبەوە، قسەی کامیان ڕاست بوایە ئەوەی پێش دەخست.

کاتێك نۆرەی من هات و چوومە ژوورەوە بۆ تاقیکردنەوەی زارەکی، دیم ئەو لەنێو لیژنەکەدایە، لێی پرسیم: تۆ خەڵکی کوێیت؟ وتم: خەڵکی عێراقم، کوردم لە باکوری عێراق. وتی: لەباتی ئەوەی لە یاسادا تاقیکردنەوەت بکەیت، تاقیکردنەوەکەمان لە شەخسی مەلا مستەفای بارزانییە، ئەو پرسیارەی لێت دەکەین بە ڕاستی وەڵاممان بدەرەوە، تعصبی عنصری کارت تێنەکات لە وەڵامدا.

پرسیارەکە ئەوەبوو وتیان: پەیوەندی مەلا مستەفا لەگەڵ ئیسلامدا تا چ ئاستێکە و ئاستی ڕۆشنبیریی خۆی چۆنە؟ منیش ئەوەی ڕاست بوو وتم، هیچ ئەملاو ئەولام نەکرد لە وەڵامدا، هیچ زیاد و کەمییەکم نەوت.

ئەم پرسیار و وەڵامە زۆری خایاند، لەپاش لێبونەوە وتیان ئیتر بچۆرە دەرەوە، وتم ئەی تاقیکردنەوەم ناکەن لە یاسادا؟ وتیان ئەمە بەسە. من هەر سوربووم لەسەر تاقیکردنەوەکەی یاسا، پێیان وتم بەرزترین نمرەت وەرگرتووە، هەژدەمان داویتێ لە بیست.

ئینجا چوومە دەرەوە.

ئەوەی وتم -خوا دەیزانێ- کە هەمووی ڕاست بوو.

شێخ فەرەج سەنهوری ئەوکاتە لە هەموو زاناکانی قاهیرە ئاستی زانیاریی زۆرتر بوو. ئەوکاتە زاناکانی زانکۆی ئەزهەر و زاناکانی زانکۆی قاهیرە لە ئایین و لە یاسادا ئاستیان زۆر بەرز بوو.

لە پاش چل ساڵ، جارێکی تر چوومەوە قاهیرە، کە شێخی ئەزهەر خەڵاتی ئەزهەری پێ بەخشیم، دیم جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان زانا کۆنەکاندا کە کاتێ من لەوێ قوتابی بووم، وە زاناکانی ئەم دواییەدا کە لە هەردوو زانکۆکەدا هەن. واتا ئاستی زانیاریی لە هەموو وڵاتە عەرەبییەکاندا، بە تایبەتی لە عێراقدا زۆر دابەزیوە.

لەپاش تاقیکردنەوە وتیان فلان ڕۆژ ئامادەبن لە کۆلێج ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەکەتان وەربگرن، ئێمە هەموومان (٦٣) کەس بووین بەشداریمان کردبوو لە تاقیکردنەوەی دبلۆمی تایبەتی، ئەوان هەموو لە دەوری یەکەم کەوتبوون، ئێمە عێراقییەکان بە کۆمەڵ لە شوێنێك لەبەردەمی ژووری (ڕاگر - عەمید)دا ڕاوەستابووین چاوەڕوانیمان دەکرد، سکرتێرەکەی ڕاگر کە ناوی (کەریمە) بوو، هاتە دەرەوە ڕووی کردە ئێمە و دەستی ڕاکێشا تەوقەی لەگەڵ من کردو وتی: (الف مبروك)، وتم: ئەی هاوڕێکانم؟ وتی: هەموویان کەوتوون.

لە هەر هەموویان هەشت کەس دەرچووبوون، لە تاقیکردنەوەی زارەکی یەکێکی تر لە هەشتەکە دەرنەچوو، ماینەوە حەوت کەس، هەریەکە لە وڵاتێك، لە پاشا ئەنجومەنی زانکۆی قاهیرە ماستەریان دامێ لە یاسای تایبەتی (قانون الخاص)، وتیانساڵێکی تر وەرەوە دکتۆرا تۆمار بکە، چونکە لەو کاتەدا تەنها لە مانگی نۆدا دکتۆرا تۆمار دەکرا.

کە گەڕامەوە بۆ عێراق داوام کرد لە وەزارەتی بەرگری کە ئیجازەی دوو ساڵم بدەنێ بچم بۆ قاهیرە بۆ تەواوکردنی دکتۆرا، بەڵام ڕازی نەبوون لەبەر ئەوەی ئیجازەی دراسی تەنیا بۆ بابەتەکانی سوپا دەبێت، منیش داوام کرد کە خانەنشین بکرێم، بۆ ئەوەی بتوانم بچم خوێندنەکەم تەواو بکەم، لە پاش هەوڵدانێکی زۆر لە ١٩٧٣/٢/٧ خانەنشینیان کردم.

موچەی خانەنشینیەکەم (٦٨) دینار بوو، (٨٠٠) دیناری ئیکرامیەیان پێدام، لە خانەنشینیەکەم دەبوو هەموو مانگێك (٣٠) دیناری بدرێت بە قیستی (جمعیة بناء المساكن للضباط)، چونکە (٣٦٠٠) دینارم لێوەرگرتبوون، (٣٨) دیناری دەمایەوە بۆ خێزانەکەم کە پێکهاتبوو لە ژنێك و نۆ منداڵ، خۆشم هیچ هۆیەك نەبوو لە قاهیرە پێی بژیامایە بۆ ئەوەی خوێندنەکەم تەواو بکەم، دایکی موحەممەد خوا لێی رازی بێت، کە زۆر یارمەتی دام لە ژیانمدا وتی: تۆ (٨٠٠) دینارەکە ببە لەگەڵ خۆت، ئێمە بەم (٣٨)دینارە هەر جۆرێك بێت دەیبەینە سەر، لەسەر ئەم بڕیارە ڕۆیشتم بۆ قاهیرە، لە زانکۆی قاهیرە دکتۆراکەی قانونم تۆمار کرد، ڕاگری کۆلێجی یاسا دکتۆر جمیل شرقاوی بوو بە سەرپەرشتیار، بابەتی دکتۆراکەم ئەمەبوو (نظرية الالتزام برد غير المستحق)، بابەتی دکتۆراکەی زانکۆی ئەزهەرم ئەمەبوو (اسباب اختلاف الفقهاء في أحكام الشريعة)، ئەم کارەی من دژی یاسای میسری بوو، چونکە بەپێی یاسا هیچ کەس ناتوانێت لەیەك کاتدا لەوێ دوو دکتۆرا تۆمار بکات، بەڵام شتەکەم ئاشکرا نەکرد و هیچ کەس نەیدەزانی کە من لە هەردوو زانکۆکە دکتۆرام تۆمار کردووە، ئەو برادەرانەی کە دەیانناسیم لە زانکۆی ئەزهەر وایان دەزانی من هەر لەم زانکۆیە دکتۆرام تۆمار کردووە، برادەرەکانی زانکۆی قاهیرەش هەر بەو جۆرە وایان دەزانی هەر پەیوەندیم بەوێوە هەیە.

## ژیانی کۆمەڵایەتی میسر

**ئەوەندەی کە شارەزاییم هەیە لەبارەیانەوە، گەلی میسری جیاوازییان هەیە لەگەڵ گەلەکانی تری عەرەب، لەم جۆرە شتانەی خوارەوەدا:**

١- پەیوەندییان لەگەڵ هەموو کەسێك لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی دادەنێن، تەنانەت کە نوێژ دەکەن بۆ خوا، هەر لەسەر ئەو بنچینەیە دایدەنێن، ئەگەر یارمەتییان بدەیت بە پارەو بەشتی تر لە هەموو کەس خۆشەویستترو لەپێش تریت، بەپێچەوانەی ئەوەوە پەیوەندیان لەگەڵ کەس نییەو یارمەتی هیچ کەس نادەن.

٢- جیاوازییەکی زۆر هەیە لە بابەتی ئاستی ژیانی ئابووری لەنێو گەلی میسردا، یان زۆر دەوڵەمەند یان زۆر هەژارن، لەبەر ئەم هۆیە زۆر لە ماڵە هەژارەکان ژورێك لە خانوەکەیاندا دەدەن بەکرێ بە بێگانەکان، بێ گوێدانە ئەوەی دەشێ چی ڕووبدات، بۆ ئەوەی پارەی لێ بکێشنەوە یان سوودی تری لێوەربگرن، لەبابەت ژیانەوە، ئەمەش وایکرد ئازاری زۆرم دی بەدەستیانەوە، چونکە لەبەر نەبوونی نەمدەواتونی شوقەیەك بە تەنها بگرم، دەبوایە لەگەڵ خێزانێك لەو هەژارانە دانیشم، ژوورێکیان لێ بەکرێ بگرم، هەموو جارێك ژوورێکم دەگرت پێشەکی پارەیان لێدەسەندم، بەڵام لە پاش دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ بیانوویان پێدەگرتم و ئەوەندەیان بێزار دەکردم ناچار دەبووم ژوورەکە بەجێ بهێڵم، دەچووم بۆ شوێنێکی تر، چونکە دەیانزانی من بۆ خوێندن هاتووم و بۆ ڕابواردن نەهاتووم.

جارێك پەنام بردە بەر دكتۆر شێخ مستەفا پێنجوێنی، کە ئەویش لەوێ دەیخوێند، پیاوێکی باش و گونجاو بوو، زۆر یارمەتی داوم، خوا پاداشتی بداتەوە، پێم وت: تۆ شارەزایت، تکات لێ دەکەم ماڵێکی بەدین و بەڕەوشتم بۆ بدۆزەرەوە تا بتوانم ئەم ماوەی خوێندنەم لەگەڵیان هەڵکەم، ئەویش بەدەلاڵەکەی وت باشترین ماڵ کێیە لەم گەڕەکەدا، وتیان: ئافرەتێك هەیە پێی دەڵێن مادام ئیحسان، ژنی پیاوێکی عێراقی بوە، لە پاش (١٥) ساڵ پێکەوە ژیان، لەبەر منداڵ نەبوون لەیەك جیابونەتەوە، ئێستا تەمەنی نزیکەی (٦٠) ساڵ دەبێت، بە دینە، هەموو ڕۆژێك قورئان دەخوێنێت، پێنج فەرزە نوێژ دەکات، ژورێکی هەیە دەیدات بە کرێ مانگی بە (٢٠) جنیە.

ئینجا هەرسێکمان چووین بۆ لای (مادام ئیحسان) ژوورەکەمان لێ گرت، پێشەکی پارەکەی لێوەرگرتم، لە پاشا گواستمەوە بۆ لای.

لە هەمان ڕۆژ هاتە ژوورەکەم وتی: باوەڵەکەت بکەرەوە بزانم چی تێدایە، کاتێك کردمەوە پارچە قوماشێکی تیابوو دایکی موحەممەد بە دیاری ناردبووی بۆ ژنی کاك مەحمود کە خەڵکی سلێمانییە لەوی ژنێکی میسری هێنابوو، وتی: ئەم قوماشە بدە بەمن، وتم: هی من نییە بەدیاری ناردوویانە بۆ ئافرەتێکی تر، وتی: بۆ لەمن جوانترت دەست دەکەوێت؟! لەدڵی خۆمدا وتم: یا ستار.

بەڕاستی زۆر جوان بوو، هەرچەندە تەمەنی زۆربوو، بەلام من خوێندنەکەم لا جوانتر بوو، ئەگەر لەخواش نەترسم ئەبێت من بیر لەوە بکەمەوە کە من ژنێك و نۆ منداڵم بەجێ هێشتووە، ژیانیان لەسەر (٣٨) دینارە، کە بەشی نانی وشکیان دەکات.

لە پاش ئەوەی کە زانی من ئەوە نیم کە ئەو دەیەوێت چووە ژوورەکەی خۆی.

ڕۆژی دوایی وتی: تۆ دەبێت بتڵێکی غاز بکڕیت، وتم: من (٢٠ جنیە)م داوە بە تۆ بەرامبەر بە هەموو شتێك، وتی: یا بتڵێك بکرە یان بچۆرە دەرەوە، منیش وتم پارەکەم بدەرەوە، وتی: تازە پارەکەت بووە بەهی من و بۆت ناگەڕێنمەوە، ناچار بووم بتڵە غازەکەم کڕی.

ڕۆژی سێیەم هات وتی: من گۆڤارم بۆ دێت تۆ پارەکەی بدە، وتم: خوشکم تۆ بۆ بیانووم پێ دەگریت، وتی: ئەگەر لێرە بیت ئەبێت پارەی گۆڤارەکە لەسەر تۆ بێت.

ڕۆژی چوارەم هات و وتی: قەرەوێڵەکەی لەسەری نووستویت شکاندوتە، وتم: لە پێش مندا شکابوو، وتی: نا تۆ شکاندووتە، کاتژمێر (١٠)ی شەو بوو، منیش ئەوەندە ڕقم هەستا، تفێکم کردە ناوچاوی، وتم: هەی بێ شەرم هەی بێ حەیا ئەمە تۆ ژنەکەی کە هەموو ڕۆژێك قورئان دەخوێنیت و پێنج فەرزە نوێژ دەکەیت!

ئەویش قیژاندی وتی: پۆلیس بانگ دەکەم کە تۆ دەستدرێژیت کردووەتە سەر من.

منیش لە ترساندا شتەکانم کۆکردەوەو جانتاکەم هەڵگرت، بەو شەوە دەرچووم، جامی ئاوی بەدوامدا ڕشت.

چووم بۆ لای مەلا عوسمانی مامۆستا مەلا صاڵحی هەولێری، کە ئەویش لەوێ دەیخوێند، لەوەو پێش زۆر هەوڵی لەگەڵم دا کەپێکەوە بین، بەڵام من لە ترسی خوێندنەکەم نەمدەویست لەگەڵ کەس بم، کاتێك لە دەرگامدا هاتە دەرەوە بەپێکەنینەوە وتی: بەخوا دەرگات لێناکەمەوە، دەزانم (مادام ئیحسان) بەم شەوە دەری کردوویت.

دوو ڕۆژ لای ئەو بووم، لە پاشدا چووم لە گەڕەکێکی دواکەوتووی پیس و پۆخڵ کەپێی دەوترێت (درب الاحمر) لە ژێرخانێکدا لە باڵەخانەیەکی زۆر کۆن ژوورێکم دۆزییەوە، ئەوکاتە دەیانوت زیاتر لە (٩٠) ساڵە دروست کراوە، بەڵام ژوورەکە وەکو شوقە وابوو، کەسی ترم لەگەڵ نەبوو، ژوورێکی تاریك و بۆگەن بوو، دوو ساڵ لەوێ مامەوە، هەردوو دکتۆراکەم لەوێ تەواو کرد، کە هیچ کەسێك نەیتوانیوە مانگێك لەو ژوورەدا بژی.

ئەمە مانای ئەوە نییە کە هەر ماڵێك هەژار بێت لە میسر ڕەوشتی ئەو خێزانە خراپە، لە هەموو گەڕەکێکدا بە هەزاران خێزانی بەشەرەفی تیادا دەژی، ئەو شتانەی کە باسمان کرد هۆیە گەورەکەی زۆری نەبوونی و هەژارییە.

زاناکانی یاسا دەڵێن: هۆی سەرەکی تاوانەکانی تاوانبار نەبوونی و هەژارییە، لەپێش ئەواندا حەزرەتی عەلی (رەزای خوای لێبێت) فەرموویەتی: (کاد الفقر ان یکون کفرا) واتە: نەبوونی و هەژاری زۆر نزیکە لە کافربوونەوە.

٣- جیاوازی نێوان خوێندەواری و نەخوێندەواری: لە وڵاتی میسردا بە تایبەتی لە شاری قاهیرە جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان دانیشتوانەکاندا لە خوێندەواریدا، بە جۆرێکی وا گەرەکی وا هەیە لە شاری قاهیرە منداڵیان زۆر بەکەمی دەچنە قوتابخانە، زۆریان نەخوێندەوارن، بە هۆی هەژاری و کەمتەرخەمی دەسەڵاتەوە ئیشوکاریان پێ دەکەن بۆ ژیانیان، لە هەمان کاتدا لە زانکۆکاندا زانای وا هەیە بڕواناکەم لە هیچ وڵاتێکی تردا هەبێت لە زیرەکیدا، بۆ نمونە لە کۆلێجی یاسای زانکۆی قاهیرە، لە دەرسی هەندێ لە مامۆستاکاندا دانیشتووم وەك قوتابییەك لە قۆناغی ماستەر، مامۆستاکانی یاسا لە زانکۆکانی عێراقدا بۆ ئەوە دەشێن بچن ببن بە قوتابی ئەوان، هەر لەبەر ئەوە میسر بووە بە سەنتەری هەموو وڵاتە عەرەبەکان بۆ فێربوونی خوێندەواری بەتایبەتی لە قۆناغی ماستەرو دکتۆرادا لە هەموو بابەتێکدا، لە هەموو کۆلێجی یاساکانی وڵاتە عەرەبییەکاندا زیاتر دانراوی میسرییەکان بەدەرس دەڵێنەوە.

٤- جیاوازی لە نێوان رێزگرتنی ئایینی ئیسلام و کردەوەی نارەوا، لە قاهیرە کاتێك رەمەزان دێت ئەو شارە هەمووی تا بەیانی ناخەوێت، بە دەوڵەمەندو هەژارەوە هەموو شاد و دڵخۆشن، هەموو رۆژێك لە رۆژەکانی رەمەزان وەکو جەژن وایە، کاتژمێرێکی دەمێنێت بۆ بانگی مەغریب لە مەیدانی ئەزهەرو مزگەوتی حوسەین بە هەزاران مێز ریز دەکرێت، بە هەزاران خواردنی جۆراو جۆر لەسەری دادەنرێت، هەموو رۆژووگرەکان لە دەوری ئەو مێزانە رادەوەستن و چاوەڕوانی بانگی مەغریب دەکەن، بۆ ئەوەی هەموو پێکەوە دەست بکەن بەنانخوارن، لە پاش بانگی شێوان لە هیچ شوێنێك رێگە نابینیتەوە لەبەر زۆری نوێژکەرانی نوێژی تەراویح، لە پاش تەراویح هەر دەنگی دەف لێدانە و سرودی ئاینی و پێکەنین و وشەی خۆشی، پارشێو هەرکەس دەچێتەوە ماڵی خۆی و لە ماڵەوە پارشێو دەکات.

لە شاری قاهیرە لە پێنجی بەیانییەوە تا نۆی بەیانی یەك کەس نابینیت لە کۆڵانەکاندا هیچ دەنگێك نابیستیت، ئەگەر بتەوێت بچیت بۆ شوێنێك دەبێت بەپێ بڕۆیت، چونکە هیچ ئۆتۆمبێلێکت دەست ناکەوێت.

لە مانگی ڕەمەزاندا کاتی ئیشکردنی فەرمانگەکان لە دوو سەعات زیاتر نییە، من بۆ ماوەی سێ ساڵ لە شاری قاهیرە ژیاوم، تێکەڵیم لەگەڵ زۆر کەسدا بووە، ئاگام لە زۆر شەڕ و ئاژاوە بووە، یەکجار وشەیەکی کفرم نەبیست لە هیچ کەسێك، وەك عێراق نییە دوو کەس ناکۆکیان دەبێت لە پێشا جوێن بە ئایین و خوا دەدەن.

وەك دەیانگێڕایەوە لە مانگی ڕەمەزاندا هەموو ئەو ئافرەتانەی کە ئیشی خراپە دەکەن وازیان لە هەموو کردەوەی خراپ دەهێناو خۆیان دەکرد بە فریشتە، تا ڕەمەزان تەواو دەبوو، دوایی دەچوونەوە سەر ڕەوشتەکانی جارانیان.

ئەو برادەرانەی کە دەچوونە یانەی شەوانە (مەلها) دەیانوت لەوێ ژوورێکی تایبەتی پڕ فەرش کراوە بۆ نوێژکردن، لەسەر دەرگاکە نووسراوە (المصلی)، لەمەوە دەردەکەوێت کە میسرییەکان لەسەر ئەم پەندە دەڕۆن، (ساعة لربك وساعة لقلبك) واتە: کاتژمێرێك بۆ خواو کاتژمێرێك بۆ دڵ، مەبەست لە دڵ نەفسی خۆیەتی، ئیشی نارەوای وای لێدەکرێت لەبابەت بێڕەوشتی سێکسییەوە، باوەڕ ناکەم لە فەرەنسادا شتی وا هەبێت، جارێك لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندمەوە، ڕەخنەی توندی لە گەلی میسری دەگرت دەیوت بێگانەکان پێمان دەڵێن (أصغر بنت باصغر عملة) واتە: بچوکترین کچ کە یەکێك لەگەڵی ڕابوێرێ بەکەمترین پارە.

لەگەڵ ئەم هەموو جۆرە جیاوازییانە لە نێوان گەلی میسریدا، گەلێکی ئازاو ئیشکەرو زیرەکن، زۆر لە گەنجەکانیان بەلای کەمەوە پێنج شەش پیشە دەزانن، زۆر دڵسۆزی وڵاتەکەیانن لە دەرەوەو یان ناوەوە، مرۆڤێکی میسری هەزار جوێن بدەیت بەکەسوکاری و خێزانی نایەت بە گژتدا، تورە نابێت، بەڵام یەك جنێو بدەیت بە وڵاتەکەی یان توانجێکی تێ بگری، ئەگەر بکرێت و چەکی پێ بێت یەکسەر دەتکوژێت، ئەم خووە جوانە لە نێوان گەلەکانی تردا زۆر کەمە.

# جۆری خوێندنەکەم لە قاهیرە

وەکو باسم کرد، دوو دکتۆرام تۆمار کردبوو، یەکێك لە یاسادا لە زانکۆی قاهیرە، یەکێك لە (فقه المقارن) لە زانکۆی ئەزهەر، بۆ ئامادەکردنی ئەم دوو دکتۆرایە، کاتەکانی خۆم بەم جۆرەی خوارەوە دابەش کردبوو:

هەموو بەیانییەك لە کاتی بانگی بەیانییەوە یان لەپێش بانگی بەیانی هەڵدەسام نوێژم دەکردو دەستم دەکرد بە نووسین تا کاتژمێر (٩)ی بەیانی، لە پاشدا دەچووم کولێرەیەك و پارچەیەك پەنیرم دەکڕی، پەرەمێزەکەم دەخستە ئیش و قۆریەکەم لەبەر دادەنا و یەك پەرداخ ئاوم تێدەکردو تۆزێك چا، لە پاشدا دەمخواردەوە.

ڕۆژێکم دانابوو بۆ دکتۆرای یاساکەم دەچووم بۆ کتێبخانەکەی کۆلێجی یاسای زانکۆی قاهیرە، ڕۆژێکیشم دانابوو بۆ دکتۆرای (فقه المقارن) دەچووم بۆ کتێبخانەکەی زانکۆی ئەزهەر، هەندێك جار دەچووم بۆ (دار الکتب) کە کتێبخانەیەکی زۆر گەورەیە سێ چوار ئەوەندەی کتێبخانەکەی مەرکەزی بەغدا دەبێت.

ڕۆژێك هەوڵم دەدا بۆ کۆکردنەوەی ئەو شتانەی پەیوەندییان هەیە بە یاساوە، ڕۆژێکیش بۆ (فقه المقارن)، هەتا کاتژمێر چوار لە دەرەوە دەمامەوە، هیچم نەدەخوارد.

کاتێك دەگەڕامەوە تۆزێك تەماتەو پەتاتەم دەکڕی دەمهێنایەوە، لە ژوورەکەم لەناو قابلەمەیەکدا هەڵم دەکزاندو دوو کولێرەم پێوە دەخوارد و چایەکم لەگەڵ

دەخواردەوە، نوێژم دەکردو دەنوستم، تا بانگی مەغریب، لە پاش مەغریب دەستم دەکردەوە بەنووسین تا نزیکەی کاتژمێر (١٢)ی شەو.

لە ماوەی کەمتر لە دوو ساڵ هەردوو دکتۆراکەم تەواو کرد بە نووسین، بەڵام ژیانم لەگەڵ سەرپەرشتیارەکەی زانکۆی ئەزهەر زۆر خراپ بوو، بەپێچەوانەی سەرپەرشتیارەکەی زانکۆی قاهیرە.

لەوێ قوتابی دکتۆرا مانگی جارێك یا بیست ڕۆژ جارێك، کاتێکی تایبەتی بۆ دیاری دەکرێت دەچێت بۆ ماڵەوە بۆ لای سەرپەرشتیارەکە، چی نوسیوە بۆی دەخوێنێتەوە.

سەرپەشتیارەکەی زانکۆی ئەزهەر هەرچەندە جبەو مێزەری لەبەر دەکرد، ڕیشێکی هێشتبووەوە بەناوی ئەوەوە کە پێشەوای ئایینی ئیسلامە، هەرچەند بچوومایە بۆلای دەبوو شتێکم لەگەڵ خۆم ببردایە، وەك جگەرە یان چا یان شیرینی یان میوە، ئەگەر بەدەستی خاڵی بڕۆشتمایە هەرچیم بخوێندایەتەوە دەیوت ئەمە هەڵەیە بڕۆ بیگۆڕە، زۆر جار ناوی کتێبەکەم دەدایە ئەگەر هی خۆم بوایە دەیوت بیهێنە بۆ خۆم با بیبینم، کە دەمبرد دەیوت ئەمە بۆ من بڕۆ یەکێکی تر بۆ خۆت بکڕە، ئەگەر بموتایە لە کتێبخانەی زانکۆی ئەزهەر وەرم گرتووە، دەیگوت سبەینێ کاتژمێر (١٠)ی بەیانی لەبەردەم کتێبخانەکەدا بوەستە بۆ ئەوەی بێم بچینە ژوورەوە بزانم سەرچاوەکەت ڕاستە، بەیانی دەچووم کاتژمێر (١٠ تا ١١)ی بەیانی دەوەستام نەدەهات، هۆی ئەم ئازاردانەش هەمووی ئەوەبوو بە دەستی خاڵی ئەچومە لای، ئەم کردەوانەی بەکاردەهێنا لەگەڵمدا، بەڵام ئەگەر شتێکم پێبوایە هەرچییەکم دەخوێندەوە دەیوت (ماشی).

بە پێچەوانەوە سەرپەرشتیار(مشرف)ەکەی زانکۆی قاهیرە، کە بۆ خۆی ڕاگری کۆلێجی یاسابوو، ڕۆژێك ڕۆیشتم بۆ ماڵیان شتێکم کڕیبوو بۆم برد، کاتێك دەرگاکەی لێکردمەوە پرسی ئەوە چییە؟ وتم: هیچ نییە شتێکی سادەیە. وتی: مستەفا جارێکی تر کردەوەی وا بکەیت دەرگات لێناکەمەوە، ئەمە دواجارە لێت قبوڵ ئەکەم، شت بێنیت لەگەڵ خۆت.

ئەمەش هۆی ئەوەیە ئەو مامۆستایە لە کاتی خوێندنی باڵادا چووبوو لە فەرەنسا خوێندنی تەواو کردبوو، لەوێ مابۆوەوە، ڕەوشت و خووی گەلی فەرەنسی وەرگرتبوو، بەپێی مامۆستاکانی ئەوێ دەجوڵایەوە، چونکە ئەوان ئەو جۆرە کردەوە ناشیرینەیان لەگەڵ قوتابییەکاندا نەدەکرد.

پەیڕەوی ئایینی ئیسلام نە بە جبەو نە بە مێزەرەو نە بە ڕیشی پانەو نە بە تەسبیحی سەدو یەك دەنکە کە سڵاواتی پێدەکەن، بەڵکو موسڵمان ئەوەیە ڕەوشتی جوان بێت، کردەوەی پیاوانە بێت لەگەڵ ئەم و ئەودا، هەروەکو لەمەوپێش باسمان کرد کە یەکێك لە زانا گەورەکانی میسر (محمد عبده) دەڵێت: "وجدت الاسلام في اوروبا ولم اجد المسلمين، واجد المسلمين في بلادنا ولا اجد الاسلام"، واتە: لە ئەوروپا ئاینی ئیسلامم دی کە ڕەفتاری پێدەکرا، بەڵام موسڵمانم نەدی، چونکە هەموویان گاور بوون، لە وڵاتەکەی خۆمان موسڵمانان زۆر دەبینم بەڵام کردەوەی ئیسلامیان لێ نابینم، بە ڕاستی مرۆڤ سەرسام دەبێت لەم جیاوازیە کە هەیە لەنێوان ڕووکەشی زۆر لە موسڵمانەکان و کردەوەکانیان.

لەو ماوەیەدا کە خەریکی خوێندن بووم، لەبەر دەستکورتی ژیانێکی زۆر ناخۆش و تاڵم بەسەر دەبرد، هاوڕێکانی من لە عێراقییەکان هەریەکە شوقەیەکی گرتبوو بە (١٠٠ ـ ١٥٠ جنیە)، منیش ئەو ژوورە تاریکە ناهەموارەم گرتبوو بە (٨ جنیە)، کە هیچ کەس نەیدەتوانی هەشت ڕۆژ تیایدا بژی، ئەو پارەیە کە بردبووم لەگەڵ خۆم تەواوبوو، ئەو شەوە وارێکەوت بۆ بەیانییەکەی ماوەی کرێی ژوورەکەشم تەواو بوو، دەبوایە تازەی بکەمەوەو پێشەکی پارەیان بدەمێ، منیش ئەو شەوە دوا فلس کە لەگەڵ خۆم هێنابووم تەواو بوو، لە هەمان کاتدا بۆ ڕۆژی دوایی ئیقامەکەم تەواو دەبوو، لەوێ (اقامة) لە پاش سێ ڕۆژ دواکەوتن ئەگەر تازەی نەکەیتەوە دەرت دەکەن و دەبێت بچیتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆت، مەرجی تازەکردنەوەی ئیقامەش ئەوەیە کە بچیت پارەی وڵاتەکەی خۆت یان بە دۆلار یان بە پاوەند، ئەوەندە بگۆڕیتەوە لە بانق کە بتوانیت لە ماوەی ئیقامەکەدا پێی بژیت.

ئینجا ئەو شەوە تا بەیانی لە خەفەتاندا خەوم لێ نەکەوت. ئەو شەوە شەوێکی ڕەش بوو لە ژیانمدا.

بۆ بەیانی چووم بۆ لای قوتابییەکی عێراقی بۆئەوەی بزانم برێ پارەم ناداتێ بەقەرز، کاتێك گەیشتم برادەرێکی تری عێراقی لابوو کە دەمناسی، پێی وتم کە سەد دۆلاری بۆ هێناوم لە ماڵی خۆمانەوە، لە خۆشیاندا خەریکبوو شادی مەرگ ببم، بڕوام نەکرد تا سەد دۆلارەکەی دەرهێنا.

ئەم پارەیەش زەینەدینی برام بۆی نادربووم کە ئەفسەربوو لە سوپای عێراق، تا مامەوە لەوێ هەر مانگی جارێك یان دوو مانگ جاری (١٠٠) دۆلاری بۆ دەناردم لە بازاڕی ڕەش دەمگۆڕییەوە بە(٨٠) جنیەی میسری دەکرد، دەمتوانی دوو مانگ پێی بژیم، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە لە هەردوو جیهان.

شێخ مستەفا پێنجوێنی بۆ من لە قاهیرە گەلێك لە برا زیاتر بوو، کاتی وا هەبوو کاتژمێر دەی شەو دەهات بۆلام پێی دەوتم پارەت هەیە؟ دەموت بەڵێ، دەیزانی پارم نییە یان کەمە هەندێك پارەی دەدامێ، پێی دەوتم: ئەگەر یەکێك پارەی پێ نەبێت نازانێ بشچێ بەڕێگەدا.

# کورتەیەك لە ژیانی
# شێخ مستەفا پێنجوێنی



٢٠١١/٤/٢٤ لە ماڵی خۆمان

شێخ مستەفا کوڕی شێخ مەحمود پێنجوێنیە، ساڵی ١٩٣١ لەپێنجوێن لە خانەوادەیەکی ئاینپەروەردا لە دایکبووە، لەتەمەنی شەش ساڵیدا چۆتە خوێندنی مزگەوت و ئەو کتێبانەی خوێندووە کە لەو سەردەمەدا باو بووە، چەندین شوێن گەڕاوە بۆ تەواوکردنی خوێندن، لەساڵی ١٩٥١ دا شاری پێنجوێنی بەجێ هێشتووە.

لەو مامۆستایانەی کە لەخزمەتیاندا خوێندویەتی مامۆستا (مەلا ئیسماعیل شێخ عەبدولڕەحمان بانەیی) و مامۆستا (مەلا عوسمان شێخ عەبدولعەزیز)

و (شێخ عەبدوڵا کشێنی) و مامۆستا (مەلا محەمەدی شێخ لمارەین) و مامۆستا (مەلا عەبدولڕەحیم محەمەد)ی ناسراو بەقازی، لەخزمەت مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی مودەریس) ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە.

ساڵی ١٩٥٨ رۆشتوە بۆ بەغدا و لەسەر رێنوێنی شێخ ئەمجەد زەهاوی چۆتە مەدرەسەی قادرییە، دواتر چۆتە شاری موسڵ و لەمزگەوتی نەجیب جادر بۆتە ئیمام، ساڵی ١٩٥٩ بۆ تەواوکردنی خوێندن چۆتە وڵاتی میسر و لەکۆلێجی شەریعە و قانون لەزانکۆی ئەزهەر ساڵی ١٩٦١ دەستی پێکردووە و ساڵی ١٩٦٥ خوێندنی تەواوکردووە و گەڕاوەتەوە بۆ عێراق و چۆتەوە شاری موسڵ، ساڵی ١٩٧٢ بۆ خوێندنی ماستەر چۆتەوە بۆ زانکۆی ئەزهەر لەبابەتی ئوصولی فیقهدا، بەهەمان شێوە ساڵی ١٩٧٨ هەر لەزانکۆی ئەزهەر بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێناوە.

چەندین مامۆستای ناسراو لەخزمەت بەرێزیاندا خوێندویانە و پێگەیشتوون و لەزانستەکەی بەهرەمەند بوون.

خاوەنی چەندین دانراوە، ئێستا لەوڵاتی قەتەر دادەنیشێت، خوای گەورە بەرەکەت بخاتە تەمەنی.

## پەیوەندی نێوان ژیان و زانایی

ژیانی پڕ لەخۆشی و ڕابواردن مرۆڤ دوور دەخاتەوە لەزانیاری و گەیشتن بە پلەی بەرزی زانین، ئەم دەستکورتیەی من و ناخۆشی ژوورەکەم هۆیەکی بەهێز بوو کە پاڵم پێوە بنێت بۆ ئەوەی زۆرتر کۆشش بکەم بۆ ئەوەی ئامانجەکانی خۆم بهێنمە دی، لە بابەت خوێندنەوە.

هاوڕێکانم زۆریان بەبێ ئەنجام و بە شکستی گەڕانەوە بۆ عێراق، زۆربەیان دوای من تا سێ چوار ساڵ مانەوە، ئەوەش لەبەر ئەوەی هەریەکێ شوقەیەکی دەگرت بە (١٠٠) جنیە، کارەکەرێکی ڕادەگرت بۆ خواردن و هەندێ جاریش بۆ ڕابواردن لەگەڵیدا، بەڵام من کە ژوورەکە کرێیەکی (٨) جنیە بوو، زۆر ناخۆشبوو، نەمدەهێشت لە ماوەی دوو ساڵدا پشیلەش بێتە ناوی، بۆخۆم لە نێوان ئەو ژوورەدا وەك لە ئەستێرەیەکی تردا بژیم و هیچ کەس نەناسم، نەدەچومە لای کەس و کەس نەئەهاتە لام.

ڕۆژێك چووم بۆ زانکۆ برادەرێك نامەیەکی پێدام وتی: ئەمە هی خزمێکتە هاتووە بۆ قاهیرە، منیش کە کردمەوە تەماشام کرد کاك (صلاح احمد فهمی ) لە سلێمانییەوە چووە بۆ لەندەن، لەوێوە گەڕاوەتەوە بۆ قاهیرە، ناونیشانی ئۆتێلەکەی تیادا نووسیوە تا بچم بۆلای، کە ڕۆشتم بۆ لای وتی: دەمەوێت بێم شوێنەکەت ببینم، وتم: شوێنەکەم هی ئەوە نییە کەس بێت بیبینێت، ئەویش زۆری لێکردم کە بەیەکەوە بڕۆین بۆ ژوورەکەم، وتم: کاك صلاح ژوورەکەم لە گەڕەکێکی دواکەوتوودایە، کۆڵانەکانی تەسك و تروسکن، ئۆتۆمبێلی پێدا ناڕوات، دەبێت بۆ ماوەیەك بەپێ بڕۆین، ئەوەشت پێ بڵێم کە کارەکەری جوانم نییە، خۆم جل

دەشۆم و خۆم چێشت لێ دەنێم، لە پاشدا هێنام بۆ ژوورەکەم کە دانیشت بۆ ماوەی سێ چوار دەقیقە قسەی بۆ نەئەکرا، لە خەفەتی ناخۆشی شوێنەکەم، لە پاشدا پێی وتم: ئەوە لێرە دەژیت؟ وتم: بەڵێ، چونکە زانست و زانین لەم جۆرە شوێنانەدا دەست دەکەوێت، ئەگەر مێژووی زانا گەورەکان بخوێنینەوە زۆریان لە من خراپتر ژیاون، ئەو ژیانە تاڵەیان بووەتە هۆی پێشکەوتنیان لە زانستدا.



هاوڕێ کوردەکانم لە قاهیرە
صلاح أحمد فهمی، د. کامل بصیر، ...، د. فوئاد معصوم، زەڵمی

# گفتوگۆی دکتۆراکەم
# لە زانکۆی ئەزهەر



پێش تەواوکردنی دکتۆراکەم لە یاسادا بەدوو مانگ دکتۆرای (فقه المقارن)م تەواو کرد، ڕۆژی (١٩٧٥/٩/٩) لە زانکۆی ئەزهەر گفتوگۆی دکتۆراکەم دەستی پێکرد، بڕوانامەی دکتۆرام وەرگرت لە (فقه المقارن) بە پلەی (شەرەف).

لەپاش سێ ڕۆژ قوتابییەکی عێراقی پێی وتم لە زانکۆی قاهیرە داوات دەکەن لەلایەن سەرپەرشتیارەکەتەوە (د. جمیل شرقاوی) ڕاگری کۆلێجی یاسا، کاتێك چووم بۆلای وتی: تۆ دزیت کردووە، تاوانی دزی دەبێت چی بێت؟ وتم: دزی چی؟! وتی: تۆ لە دوو زانکۆ دکتۆرات تۆمار کردووە، یەکێکیانت وەرگرتووە لە زانکۆی ئەزهەر، ئەمە بەپێی یاسای ئێرە ناڕەوایە، لەبەر ئەوە بڕیارمانداوە هەرچیت کردووە لەم بابەتەوە بەتاڵی بکەینەوە، لەبەر ئەوەی بە پێچەوانەی


ڕۆژی بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا
لە قاهیرە ١٩٧٥/٩/٩

یاساوە کردووتە، هەرچەند هەوڵم لەگەڵدا هیچ سوودی نەبوو، وتی: تۆ خۆت دابنێ ئێستا قوتابییەك نیت لەم زانکۆیەدا.

شەو چووم بۆ ماڵیان زۆر ڕێزی گرتم لە پاشاندا وتم: ئەگەر یارمەتیم بدەیت با تۆزێك باسی خۆمت بۆ بکەم، وتی: باشە.

وتم: من نۆ منداڵ و ژنێکم لە عێراق بەجێ هێشتووە، جگە لەخوا کەسیان نییە، ئەوەی بۆم بەجێ هێشتوون بەشی نانی وشکیان ناکات، من تەمەنم (٥٠) ساڵ زیاترە، بۆ ئەوە نەهاتووم بڕوانامەی (دکتۆرا) وەربگرم بچمەوە لە پلەیەکدا دامبنێن، بەڵکو تەنیا هیوام خوێندن و وانە وتنەوەیە، کە بچمەوە وڵاتەکەی خۆم لە زانکۆیەکدا خزمەتی ڕۆڵەی وڵاتەکەم بکەم، من لە سوپای عێراقدا ئیمامی (درجه ممتاز) بووم، واتە پلەی (مقدم) بووم و موچەکەم لە مووچەی تۆ کە ڕاگری یاسایت زۆرتر بوو، وازم لێهێنا بۆ ئەوەی خوێندنەکەم تەواو بکەم. ئێستا لە جیاتی ئەوەی (تقدیر)م بکەن، کە توانیم لە ماوەی دوو ساڵدا، پێویستی دوو دکتۆرا تەواو بکەم ئێستا فەصلم دەکەن!.

ئەم وتانەم کاریگەری هەبوو دڵی زۆر سوتا بۆم، وتی: کەواتە ئەمساڵ ناتوانیت گفتوگۆی دکتۆرای یاسا بکەیت، دەبێت بچیتەوە بۆ عێراق ساڵێکی تر ئەم کاتە بێیتەوە بۆ ئەوەی ساڵێك بڕوات بەسەر دکتۆرای پێشوودا، منیش کە دڵنیابووم بڕیارمدا بەپێی قسەکەی ئەو بڕۆم.

## هاتنی دایکی موحەممەد

## بـۆ قـاهـیرە

لەپاش ئەوەی بڕوانامەی دکتۆراکەی زانکۆی ئەزهەرم تەواو کرد، پەیوەندیم کرد بە دایکی موحەممەدەوە کە بێت بۆ سەردانی قاهیرە، ئەویش ئەو ڕۆژە کە لە بەغدا دەرچوو بروسکەیان بۆ کردم بۆ ئێوارە چووم بۆ پێشوازیی بۆ فڕۆکەخانە، سەعات هەشتی ئێوارە بەیەکگەیشتین، پاش ئەوەی کە دووساڵ بوو لەیەکتر دابڕابووین.

مانگێك لەوێ مایەوە، سەردانی هەموو شوێنە بەناوبانگەکانی میسرمان کرد، سەردانی مۆزەخانەی قاهیرەمان کرد، چوینە ئەو ژوورەی کە تەرمی فیرعەونەکانی میسری کۆنی تێدابوو کە هەریەکەیان لە سندوقێکی شوشەدا دانرابوون، بە خۆیان و کفنەکەیانەوە، واگومان دەکرا کە هەمووی ڕۆژێك یان دوو ڕۆژە ئەمانە مردوون، بەڵکو کە تەماشای دەموچاوت دەکردن وات دەزانی یان خەوتوون یاخود وەك تۆ تەماشا دەکەن، ئەمەش بەهۆی ماددەیەکەوە پارێزراون، بەم کردارەش دەوترێت مۆمیا، ئەم ماددەیە لە میسر زۆرە بەکاریان دەهێنا بەجۆرێکی وا لە یەکێ لە شارەکاندا کەمردووەکانیان دەنێژن پاش ساڵەهای ساڵ لاشەکانیان شی نابێتەوە، چونکە خاکەکەی ئەم ماددەیەی زۆر تیادایە.

یەکێکی تر لەو شوێنانە ئەهرامەکان بوو، کە یەکێکن لە حەوت شتە سەرسوڕهێنەرەکەی جیهان، ئەو بەردانەی کە ئەو ئەهرامانەی لێ دروست کراوە لەکاتی خۆی لە (اسوان)ەوە بەسەر ئاوی ڕووباری نیلدا هێناویانن، بەهۆی ئەو شتانەوە کە لەوکاتەدا هۆی هاتوچۆ بوون، ئەسوان بە شەمەندەفەر نزیکەی

(٩) سەعات ڕێ لەقاهیرە دوورە. مرۆڤ کە ئەوانە دەبینێت سەرسام دەبێت، چۆن ئەو بەردانە لەڕێگەی ڕووبارەکەوە گەیشتوەتە ئەو شوێنە، کێشی هەر بەردێك لە سێ تەن زیاترە، بەجوانی تاشراون، چوار گۆشەن و هەر چینێك لەسەر چینەکەی تر (١سم) چووەتە دواوە لەبەر ئەوە وردە وردە تەسك ئەبێتەوە تا دەگاتە لوتکەکەی. ڕێگایەك هەیە بۆسەرکەوتن، لە پاش سەرکەوتن بۆماوەی سێ مەتر بەڕێگەیەکدا دەچیتە ژوورەوە گۆڕی یەکێك لە فیرعەونەکانی تیادا بووە، کە هەمووی لە مەڕمەڕ دروستکراوە، بەڵام لاشەی فیرعەونەکە دەرهێنراوەو براوە بۆ مۆزەخانە.

یەکێك لە شوێنەکانی تری قاهیرە بورجی قاهیرەیە، کە لە لوتکەکەیدا چایخانەیەك دروستکراوە، هەموو شاری قاهیرەی لێوە دیارە.

یەکێکی تر لەو شوێنە بەناوبانگانەی قاهیرە (باخچەی ئاژەڵانە)، هەموو جۆرە دڕندەیەکی تیادابوو، دارستانێکی زۆر چڕو سەرسوڕهێنەر بوو، هەندێك گۆماوی گەورەی تێدابوو پڕ بوو لە سەگی ئاوی، باوەڕ ناکەم لە جیهاندا لەو باخچەی ئاژەڵە گەورەتر هەبێت و لەو جۆرە دڕندانە زیاتر هەبن.

# قوتابییە کوردەکان لە شاری قاهیرە

لە قاهیرە زیاتر لە سەد قوتابی کورد دەیانخوێند، هەندێك دکتۆرای دەخوێندو هەندێك ماستەر و هەندێك هێشتا کۆلێجی تەواو نەکردبوو، بەڵام بەداخەوە هەروەك کوردی هەموو شوێنێکی تر بوو بوون بە دوو پارچەوە، هەندێکیان دڵسۆزی نەتەوەی کوردبوون، هەندێکیشیان پەیوەندییان هەبوو بە باڵیۆزخانەی عێراقەوە، موچەیان هەبوو لەم باڵیۆزخانەیە، بۆ ئەوەی زانیاری لە دژی گەلەکەی خۆیان و ئەوەی پەیوەندی بەکوردەوە هەیە ڕۆژ بەڕۆژ بۆیان ببەن.



لەوانەی کە خۆمان بە دڵسۆزانی گەلەکەمان دەزانی من و کاک (د. فوئاد مەعسوم) بوو کە دکتۆرای دەخوێند لە فەلسەفەو کاک (د. کامل بصیر) کە دکتۆرای وەردەگرت لە ئەدەبی عەرەبیدا، کاک (د.ئەکرەم جاف) کە لە ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی ئیشی دەکردو ماڵی لەوێ بوو، خوا لێخۆشبوو کاک (نجیب بابان) دادوەری شۆڕش بوو.

کاک (د. فوئاد مەعسوم) بەرپرسی کوردەکانی ئەوێ بوو، پەیوەندی بە سەرکردایەتی شۆڕشەوە هەبوو، ئەو کوردانە زۆر دڵسۆزی کورد بوون، بەتایبەت کاک (د. فوئاد مەعسوم) پیاوێکی زاناو سیاسیی و دڵسۆز بوو بۆ کورد، پەیوەندی هەبوو بە دەسەڵاتدارانی میسرەوە کاتی سەرۆکایەتی ئەنوەر سادات.

من پەیوەندیم بە (د. فوئاد مەعسوم)ەوە هەبوو، بەڵام حزبی نەبووم، وەك لەوەو پێش باسم کرد، هیچ کات نەبووم بە حزبی، لەگەڵ ئەوەشدا هەردەم دڵسۆزی گەلەکەم بووم، لەبەر ئەوە نەبوو کە کوردم، بەڵکو لەبەر ئەوەی کورد دوژمنی زۆرە، دابەشکراوە بەسەر چوار دەوڵەتدا هەرچواریان دوژمنی گەلی کوردن و هەر چواریان هاوکاری یەکتر دەکەن بۆ لەناوبردنی ئەم گەلە بێ بەش و بێ کەسە ستەم لێکراوە، جگە لەمەش کوردەکە هەر خۆی دوژمنی خۆیەتی.

ئەگەر ئەو دوژمنایەتییە ناوخۆییە نەبوایە، کورد لەپێش عەرەب دەبوو بە دەوڵەت، چونکە مێژووی کورد زۆر پرشنگدارە، پڕە لە ئازایی و چالاکی، لەبەرەبەیانی مرۆڤایەتییەوە کاتێك گۆتییەکان (کوردەکان) لەگەڵ ئاشورییەکان ژیاون لە باکوری ئەم شوێنەی ئێستا پێی دەڵێن عێراق، هەروەها لە پێش تورکەکان ژیاون لە خاکی تورکیای ئێستادا.

**هۆی مانەوەم لە قاهیرە لە پاش وەرگرتنی دکتۆرای زانکۆی ئەزهەر دوو شت بوو:**

**یەکەم:** هەندێك لە دکتۆرای یاساکەم مابوو بڕیارمدا تەواوی بکەم، ئینجا بگەڕێمەوە بۆ عێراق.

**دووەم:** لەسەر داوای کوردەکانی ئەوێ بوو.

لەبەر ئەوە لەگەڵ کاك (د. فوئاد مەعسوم) ئەوەی پێویست بوایە لەسەرشانم درێغیم نەدەکرد، لەسەر ئەرکی ئەوان شوقەیەکیان بۆ گرتم، کاتێك نوێنەرێکی کورد بهاتایە لەلایەن شۆڕشەوە دەچووم بە پیرییەوە بۆ فرۆکەخانە، دەمهێنا لە شوێنێکی تایبەتی کەشایانی ئەوبێت دامان دەناو لەگەڵ کاك (د. فوئاد مەعسوم) ئەوەی پێویست بوایە بۆمان دەکرد.


دکتۆر ئەکرەم جاف

هەروەها کاك (د. ئەکرەم جاف) بەڕاستی ڕۆڵەیەکی دڵسۆزی کورد بوو، کاتی حوکمی عەبدولسەلام عارف کرا بە وەزیر، بەڵام لەبەر کردەوە ناشیرینەکانی عەبدولسەلام بەرامبەر بە کورد، دەستی لەکار کێشایەوە، عەبدولسەلام ناردی بەدوایداو پێی وت: (سوینا‌ك آدمی!) ئەویش لە وەڵامیدا پێی وت: (أنا کنت آدمیا قبل أن أکون وزیرا، لأننی أول عراقي حصلت علی الدکتوراه في أمریکا).

جێگەی شانازییە، من کە دوو ساڵ لەوێ بووم لەیادی ڕۆژی نەورۆز قوتابییە کوردەکانی کۆدەکردەوە لەسەر ئەرکی خۆی دەیبردین بۆ سەیران و یادی جەژنی نەورۆزی دەکردەوە.

## کورتەیەك لە ژیانی
## دکتۆر فوئاد مەعصوم



١٩٣٨/٣/٢١ لە کۆیە لەدایك بووە.

باپیری مەلا خدری هەورامی، کە خەڵکی خەرپانی بوە، چوەتە کۆیە و لەوێ ئیجازەی علمی وەرگرتوەو ژنی هێناوەو هەر لەوێش وەفاتی کردوە.

بەشێکی خوێندنی لە قوتابخانەو ئەوی تر لای باوکی خوێندویەتی، لە ساڵی ١٩٥٨ چووەتە قاهیرەو لە کۆلیجی شەریعەو یاسای زانکۆی ئەزهەر

وەرگیراوەو لەساڵی ١٩٦٢ تەواوی کردوە.

لە ١٩٦١ تا ١٩٦٨ لە (دەنگی قاهیرە- بەشی کوردی) کاری کردووە.

لە ١٩٦٧ ماجستیری لە عەقیدەو فەلسەفەدا لە ئەزهەر وەرگرتوە.

لە ١٩٦٩ لە زانکۆی بەصرا بە موعید دامەزراوە لە بەشی (تربیە وعلم النفس)ی کۆلیجی ئاداب.

لەساڵی ١٩٧٢ بووە بە مدرس و ئیجازەی دیراسی پێدرا لە زانکۆی بەصراو چووەتەوە قاهیرە.

لەساڵی ١٩٧٣- ١٩٧٥ نوێنەری شۆڕشی کورد بووە لە میسر.

لەساڵی ١٩٧٤ دکتۆرای وەرگرتوە لە فەلسەفە، ریسالەکەی بەناوی (اخوان الصفا، فلسفتهم وغایتهم) بوو.

لەساڵی ١٩٧٥ یەکێك بووە لە دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان.

لە ١٩٩٢/٧/٤ تا ١٩٩٣/٣/١٧ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بووە.

ئێستا سەرۆك کۆماری عێراقە.

# ڕەگەزپەرستی هەندێك لە عەرەبەکانی عێراق لە قاهیرە

هەندێك لە عەرەبەکان لە عێراق لە دەستی ڕژێمی عێراق هەڵهاتبوون، حوکم درابوون بە (لەسێدارەدان) وەك: (صبحی عبدالحمید کەپێشتر وەزیری ناوخۆ بوو لەعێراق و لەلایەن بەعسەوە فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرکرابوو، عبدالله رکابی ئەمیش پێشتر وەزیر بوو ئەمیش لەترسی بەعس هەڵهاتبوو، أحمد حبوبی کەئەمیش بەهەمان شێوە وەزیر بوو هەڵهاتبو و مصلح کەئەم بەڕێوەبەری گشتی ئاسایشی ناوخۆ بوو) ئەمانەو هەندێکی تر پەناهەندەبوون لە قاهیرە، هەندێك جار لەگەڵ کاك (د. فوئاد) دەچووین بۆ لایان، لەو هاتوچۆیانەدا بۆم دەرکەوت ڕژێمی عێراق، لەگەڵ ئەو هەموو تاوانانەی کە دژی گەلی کورد دەیکرد، گەلێك باشتر بوو لەو عەرەبە ڕەگەزپەرستانەی کە پەناهەندەبوون لە قاهیرە.

سەرۆك کۆماری عێراق (ئەحمەد حەسەن بەکر) دانی بەوەدا نا کە کەرکووك بۆ کوردو عەرەب بێت، بەیەکەوە سەرپەرشتی بکەن، بەڵام ئەو پەناهەندانەی هەڵهاتبوون لە عێراق نارەزایی خۆیان دەردەبڕی بەرانبەر بەو هاوبەشییە لە شاری کەرکووکدا، هەموویان تێکڕا دەیان وت کەرکووك شارێکی عەرەبیە، مافی کوردی تێدا نییە، ئینجا لەمەوە من دڵنیابووم ڕژێمی بەعس لەو ڕەگەزپەرستانە باشترە چ لە دەرەوە چ لەناوەوە.

هەروەها شیعەکان یان ئیسلامییەکان خوانەخواستە ئەگەر ڕۆژێك حکومڕانییان بکەوێتە دەست، دوژمنانیەتی یەکەمیان بەرانبەر بە کورد دەبێت.

من کە ئەم بیرەوەرییەی خۆم دەنووسم لە کاتژمێر (٦)ی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی (٢٠٠١/٧/٢٦)ە یە، ڕۆژێك دێت دێتە بەرچاوی کوردەکان ئەزانن بە بەعسیشەوە، ڕەگەزپەرستە نەتەوەییە عەرەبەکان و شیعەکان و کۆمۆنیستەکان بەهەمان شێوە نابنە دۆستی کورد، ئەگەر دەسەڵات بگرنە دەست ماف بە کورد نادەن.

## هاتنی کاك حەبیب کەریم

## بـۆ قـاهـیرە

ڕۆژێك قوتابییەکی کورد هات بەدوامدا وتی کاك حەبیب لەلایەن شۆڕشەوە هاتووە لە عێراقەوە، لە ئۆتێل (شبرد) دابەزیوە کە ئوتێلێکی گەورە بوو لەسەر رووباری نیل، داوای کوردەکان دەکات، بە من و کاك دکتۆر فوئادی وت با بێن بۆ لام، کاتێك چووین دەبینم کوردە دڵسۆزەکان نزیکەی (٢٠) کەس دانیشتوون لە پێش هەموویاندا مام جەلال، چونکە ئەوکاتە ئەویش بۆ ماوەیەك لە قاهیرە بوو، لەوکاتەدا جەنگ لە نێوان ڕژێمی عێراق و شۆڕشگێڕانی کوردستان دەستی پێکردبوو، شای ئێران یارمەتییەکی زۆری کوردەکانی ئەدا، هەموو شتێکی بۆ ئامادەکردبوون بۆ بەردەوامییان لەسەر جەنگ لەگەڵ سوپای ڕژێمی عێراق، کە ئەمەش پەیوەندی هەبوو بە سیاسەتی ئەمریکاوە.

کاك حەبیب وتارێکی دوورو درێژی دا بۆمان، وتی: ئێستا شای ئێران خۆی بە کوردێك دەزانێت و بۆ مافی کورد هەوڵدەدات، لەسەر بیروباوەڕی (ئاری)یەتی دەڕوات، ئێستا پێی دەوترێت (ئاریا میهر)، ئێمە سەدی سەد


حەبیب کەریم

بەسەر رژێمی عێراقدا سەردەکەوین بەهۆی شای ئێرانەوەو، مافی خۆمان لە چوارچێوەی عێراقدا دەچەسپێنین، بەسەر سوپای ڕژێمی عێراق و ڕژێمی سوشیالیستی بەعسی زاڵ دەبین.

کاتێك لێبووەوە وتی: کێ پرسیاری هەیە با بیکات.

منیش وتم: بەناوی برادەرانەوە کە هەمووومان خۆمان بە دڵسۆزی کورد دەزانین پرسیارێکت لێدەکەم، هەر ڕۆژێك شای ئێران لەگەڵ سەددام حوسێن ڕێککەوتن و دەستیان کردە ملی یەکتر، ئەوکاتە کێتان هەیە پشتی پێ ببەستن بۆ ئەوەی شۆڕشەکە بەردەوام بێت، وەك جاران نەکەوینە کۆسپی سەرلێشێواوییەوە؟ وتم: لاولاو کە پێچ ئەخوا بەدارێکدا، ئەگەر دارەکەیان بڕیەوە، ئەویش ئەکەوێتە بەرپێ.

وتی: موستەحیلە، ئەم دوانە ڕۆژێك لە ڕۆژان بگەن بە یەکترو ئاشت ببنەوە، چونکە دوژمنایەتیەکەیان زۆر قوڵە.

وتم: کاك حەبیب تۆ ئەندامێکی لە مەکتەبی سیاسیی، دادەنرێیت بە مرۆڤێکی سیاسیی کورد، سیاسەت لەم جیهانەدا لەگەڵ بەرژەوەندی دەگەڕێ و دەگۆڕێ، هەرکات بەرژەوەندی ئێران و عێراق پاڵی نا بەم دوو کەسەوە نزیکیان بخاتەوە، دەست دەکەنە ملی یەکتر، لەسەر حیسابی گەلە بێکەسەکەمان.

وتی: بەڵێ هەیە، پشتیوانی ترمان هەیە، ئەوکاتەی ئەم مەحاڵەی تۆ هاتە دی، ئێمە پشتیوانی ترمان هەیە کە نەیەڵێت وەك لاولاو دارەکە ببڕێت و بکەوینە سەر زەوی و پێمان پیابنێن، وەکو تۆ دەڵێیت.

وتم: ئێمە ئەم قوتابیانە هەمووومان خۆمان بە دڵسۆزی کورد دەزانین، بۆیە هاتووین بۆ لای تۆ، دەتوانین بزانین پشتیوانەکەی ترمان کێیە لە جێی شای

ئێران، کە هەرکاتێك عێراق و ئێران ڕێککەوتن یارمەتیمان بدات؟

وتی: ئەوە هەر (قیادە) دەیزانێت.

وتم: ئێمە هەر ئەوەمان دەوێت کە ببێت، ئیتر زۆر گرنگ نییە کە ئێمە بیزانین.

مام جەلال و برادەرەکانی تر ئەم پرسیارەیان زۆر زۆریان پێ خۆشبوو.

بەداخەوە پاش ئەوە هەموو مانگێکی نەبرد وتەکەی من هاتە دی، پشتیوانەکەی کورد - وەك کاك حەبیب وتی -، لە جەزائیر لەگەڵ سەددام لە ١٩٧٥/٣/٦ دەستیان کردە ملی یەکترو ڕێککەوتننامەی جەزائیریان مۆر کرد، کورد وەك لاولاوێك چووبێت بە درەختێکدا، درەختەکە ببڕنەوە و ئەویش لەگەڵیدا بکەوێتە سەر زەمین، هەروا کوردەکە بە سەرلێشێواوی مایەوە، هیچ پشتیوانییەکی نەبوو لە جێی (شا)دا یارمەتی کورد بدات، وەك کاك حەبیب بەئێمەی وت کەهەیە و قیادە دەیزانێت.

# ڕێککەوتننامەی جەزائیر

لەپاش مانگێك لە دوای کۆبوونەوەکەمان کە لەگەڵ کاك حەبیب کەریم، ڕێککەوتننامەی جەزائیر ئەنجام درا، لە پێش ئەم ڕێککەوتننامەیە بە هەفتەیەك کاك (د.فوئاد مەعسوم) وتی: مامۆستا موحەممەد ئیسماعیل کە بەڕێوەبەری زانیاری کوردستانی عێراقە چووە بۆ فەرەنسا (زماله) وەربگرێت بۆ قوتابییە کوردەکان، بەیانی بۆ هەمان مەبەست دێت بۆ قاهیرە، تۆ بچۆ لە فڕۆکەخانە پێشوازی بکە، کاتژمێر هەشتی ئێوارە دەگاتە ئەوێ، منیش لەو کاتەدا ڕۆیشتم و لەوێ پێشوازم لێکرد و هێنام بۆ شوێنەکەی خۆم، بۆ بەیانی لە باڵەخانەکەی کە شوقەکەی منی تیادابوو، شوقەیەکمان بۆ ئەویش گرت، بەڵام بەشەو هەر لەلای من دەخەوت.

ئینجا کاك (دکتۆر فوئاد) پەیوەندی هەبوو بە (عبدالرحمن فرید)، پێی وتم سەرۆك ئەنوەر سادات دەڵێت پەیام بنێرن بۆ مەلا مستەفا با وەفدێك بنێرێت بۆ ئەو کۆنگرەیە کە لە جەزائیر دەکرێت، کە شای ئێران و سەددام بەشداریی تیا دەکەن.

هەواڵەکە نێردرا بۆ خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا، بەڵام ئەو هیچ بایەخێکی پێ نەدا.

ئەو ڕۆژە کە ڕێککەوتننامەکە ئیمزا کرا لە نێوان عێراق و ئێران، بۆ ڕۆژی دووەم بەیانی زوو لە خەو هەڵسام ئێزگەی لەندەنم کردەوە هەواڵی ڕێککەوتننامەکەی بڵاوکردەوە، لەپاشدا کاك موحەممەد ئیسماعیل لە خەو هەڵساو وتی دەنگوباس چییە؟ وتم: دەنگوباس ئەوەیە شای ئێران هەموتانی هەڵخەڵەتاند و ئێستا بنەماو بنچینەی کوردی لەبن هەڵوەشاندو نەتەوەی کوردی برد بەقوڕدا.

ئەویش قسەکەی زۆر پێ ناخۆش بوو، وتی: قسەی وا چۆن ئەکەیت؟ وتم: بە ماوەیەکی زۆر نزیک هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەبێتەوەو دەزانی کە هەموو قسەکانم ڕاستە.

لە هەمان ڕۆژدا کاتژمێر (١٠)ی پاش نیوەڕۆ کاك دکتۆر فوئاد هات، ئەویش هەواڵەکەی بیستوو، زۆر بە پەرۆشەوە گێڕایەوە، بە منی وت: دەچم بۆ لوبنان - لەوێ بنکەیەکی شۆڕشی لێبوو - بۆ ئەوەی بزانم شۆڕشەکەمان چی لێهاتووە، ئەوکاتە لە لوبنانەوە تەلەفۆنت بۆ دەکەم.

لە پاش دوو ڕۆژ تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی: بەداخەوە هەموو شتێك تەواو بوو، شۆڕشەکەمان کوێر بوو، پێشمەرگە چەکەکانی تەسلیمی سوپای عێراق کردووە، شای ئێران بە مەلا مستەفای وتووە: بۆ کوێ دەڕۆن بڕۆن، بچن لەگەڵ سەددام ڕێك بکەون، ئیتر یارمەتیتان نادەم و نایەڵم لە خاکی مندا بمێنن.

وادەردەکەوێت بنچینەی کارەکە ئەمریکا بووبێت، کە ویستی سوپای عێراق لە دەستی شۆڕشی کورد ڕزگار بکات و بیکات بەگژی سوریا یان ئێراندا.

ساڵی (١٩٨٠) کتێبێك بەناونیشانی (کیسنجر والصراع الدولي) دەرچوو، چەند لاپەڕەیەکی لەسەر کوردو ڕێککەوتننامەی جەزائیر تیابوو، کیسنجەر ئەوکاتە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بووە، لە کتێبەکەیدا نووسیبووی: کۆنگرێسی ئەمریکی لەکاتی کۆبوونەوەیدا بە کیسنجەری وت: ئەو ئیشەی کە بەرامبەر کورد کردوتانە لە ڕێککەوتننامەکەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ شتێکی نارەواو بێ رەوشتی نەبوو؟ لەوەڵامدا وتبووی: بەڵێ بێ ڕەوشتی بوو، بەڵام ئێمە پێغەمبەرەکان نین بە دوای ڕەوشتدا بگەڕێین.

کوردی ساویلکە هەروا نەیزانیوە دۆست و دوژمنی خۆی لەیەك جیا نەکردۆتەوە، هەردەم دوژمن هەڵی خەڵەتاندووەو ئیشی خۆی پێکردووە، ئینجا چەپۆکێکی داوە بەسەریدا.

نووسەرێکی ئەمریکی دەڵێت: "بۆچی کورد لە بەرەبەیانی مێژووەوە نەبووە بەهیچ، لەگەڵ ئەوەی دوو هەزار ساڵ پێش زایین گەلێکی ئازاو زاڵ بووە

بەسەر گەلەکانی تردا لەباکوری عێراق وەك ئاشورییەکان و سۆمەرییەکان و ئەوانی تر".

ئەم نوسەرە خۆی وەڵامی پرسیارەکەی خۆی دەداتەوە دەڵێت: هەموو گەلێك کە قەوارەیەك بۆ خۆی دروست دەکات پێویستی بە چوار مەرجە هەیە:

**یەکـــەم:**

خاك و ئاوێکی هەبێت لەسەری دانیشێت نەچووبێتە سەر خاك و ئاوی یەکێکی تر، کورد ئەمەی هەبووە، هەمیشە دوژمن هاتۆتە سەر خاکی ئەو، ئەو نەچۆتە سەر خاکی یەکێکی تر.

**دووەم:**

بەڕێوەبردنێکی هەبوبێت بەپێی ئەو ڕۆژە کە تیایدا ژیاوە، کورد هەردەم ئەمەشی هەبووە، بەپێی ژیانی ڕۆژی خۆی لە هەموو چەرخێکدا.

**سـێیەم:**

حسابێکی بۆ دوژمن کردبێت، هەردەم ئامادەبووبێت بۆ بەرگری لە خۆی و لە خاکەکەی لە دژی دوژمنەکانی، کورد هەردەم ئەمەی بووە، کاتێك جەنگاوە لەگەڵ دوژمنەکەی زاڵ بووە بەسەریدا، بەڵام خیانەتی خۆی وای کردووە کە دوژمنەکەی خۆی زاڵ بێت بەسەریدا بۆ نموونە دەڵێت:

ئیبراهیم پاشای بابان شاری سلێمانی ڕووەو شارستانێتی و پێشکەوتن برد، لەبەر ئەوە والی بەغدا ئەوەی بەمەترسی لەقەڵەمدا، سوپایەکی بەهێزی نارد لە تورك و عەرەب بۆ سەر سلێمانی و گرتنی ئیبراهیم پاشا، کاتێك ئیبراهیم پاشا بەمەی زانی هێزێکی برد لە دەربەندی بازیان بەرهەڵستی کرد، بۆ ماوەیەك دوژمنەکەی نەیتوانی لەو دەربەندە زاڵ بێت بەسەر کوردەکانداو ڕووەو سلێمانی بڕوات، ئینجا سوڵتانی ئەستەمبوڵ بە براکەی ئیبراهیم پاشای وت، کە ناوی (عبدالرحمن پاشا) بوو: ئەگەر بچیت لە دواوە لە براکەت بدەیت، ئێمە دەتکەین

بە پاشا لە جێگای ئەو، ئەویش هێزێکی هێنا لە دواوە هێرشی بردە سەر براکەی و هێزەکەی لە پێشەوەش تورکەکان و عەرەبەکان یارمەتییاندا تا ئیبراهیم پاشایان شکاند.

نووسەرەکە دەڵێت: ئیبراهیم پاشا ئەوەندە رق چووە دڵیەوە دەمی پڕبوو لەکەف و چەکەکەی دا بە بەردێکداو وتی: ئەگەر براکەی خۆم پشتم نەشکێنێت هیچ وەختێك دوژمن ناتوانێت بەسەرمدا زاڵ بێت.

**چــوارەم:**

هەرگەلێك کە توانیویەتی کیانێ بۆ خۆی دروست بکات لەسەر بنەما (مبدأ) جولاوەتەوە، ئەو بنەمایە کردوویەتی بەیەکپارچە بەرامبەر بە دوژمنی خۆی وەستاوە، بەڵام کورد هیچ کاتێك ئەوەی نەبووە، بۆیە هەردەم دواکەوتوو بووە، کورد کە لەگەڵ دوژمنەکەی جەنگاوە یەکگرتنەکەی لەسەر بنچینەی حزبایەتی یان ئاغایەتی یان شێخایەتی بووە، ئەم سێ شتە سەرکردایەتی کردووە، لەبەر ئەوە هەردەم پارچە پارچە بووە یەکی نەگرتووە بۆیە لەکاروانی ژیان هەردەم بەجێماوو دواکەوتووە.

## ئاشنایەتیم لەگەڵ مام جەلال

پەیوەندیم لەگەڵ بەڕێز مام جەلال دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٣، کاتێ من و هەندێ لە کوردەکانی نیشتەجێی بەغدا لەماڵی لیوا مستەفا ڕەزا کە ناسراو بە مەولانا دەعوەت بووین، مام جەلالیش دەعوەت کرابوو، بەو شێوەیە یەکترمان ناسی و بەیەکتر ئاشنا بووین.


مام جەلال

لە ساڵی ١٩٦٤ سەردانی تایبەتی کردم لە ماڵی خۆمان لە گەڕەکی (حی السلام) لە بەغدا.

لەوکاتەوە بەردەوام پەیوەندیمان هەبووە، هەندێ جار نوێنەر یان برادەرێکی دەنارد بۆ لام.

لەساڵەکانی حەفتاکاندا کە لەمیسر لە زانکۆ ئەمخوێند بۆ ماستەرو دکتۆرا جارێکی تر بەیەك شادبوینەوە، پەیوەندیمان زۆر خۆش بوو، هەرکاتێ سەردانی قاهیرەی بکردایە لەگەڵ (د. فوئاد معصوم) دەچووین بۆ لای، لەکۆشکی (مەلیك فاروق) چاوپێکەوتنمان دەبوو.

لە ساڵی ١٩٧٥کە شۆڕشی کورد بە هۆی دەست وەردانی دەرەکی و ناکۆکی ناوخۆ توشی نسکۆ بوو، مام جەلال پەیوەندی کردبوو بە (معمر قەزافی)

سەرۆکی لیبیاوە تا کوردە خاوەن بڕوانامەکان لەزانکۆکانی لیبیادا جێگەو ڕێگەیان بۆ بکاتەوە، ئەویش بەڵێنی دابوو، بۆیە داوای لێکردم نەگەڕێمەوە بۆ عێراق، بەڵام من داوای لێبوردنم لێکرد، لەبەر کەمی مووچەو بارگرانی ژیانی خێزانم لە بەغدا ناتوانم لەگەڵ ئەوان بڕۆم بۆ لیبیا، لەبەر ئەوە من گەڕامەوە بۆ بەغدا.

١٩٨٢/٦/٩

برای خۆشەویستم کاک د. مستەفا

سڵاوێکی گەرم

شادی و خۆشبەختیتان داوایە و ئێمەش باشین.

ئەم دەرفەتەم قۆزتەوە تا بەم نامەیەم بە گەرمی هەواڵتان بپرسم و هیوای سەرکەوتنتان بۆ بکەم. و تکاتان لێ بکەم کە ئێوەش لە لای خۆتانەوە هەر بەردەوام بن لە خەباتی ڕێکوپێکدا. پێمان وایە جەنابت ئاگاداری بیروباوەڕ و ناوەڕۆکی (ی. ن. ک) بیت. بۆیە لام وایە ڕەوایە هەقە کە زۆر بە چالاکی لە ڕیزیا بۆی کار بکەن. هەروەک زۆر مەمنوون دەبم گەر ناو بە ناو لە ڕەئی و ڕەخنە و پێشنیار و دەنگوباسی لای خۆتان ئاگادارم بکەنەوە.

هەمیشە شاد و هەر سەرکەوتوو بن.

و هەر شاد بن

برای کوردستان

جەلال

نامەیەکی تایبەتی بەڕێز مام جەلال

لە هەشتاکانیشدا متمانەیەکی باشی بەمن پەیداکردبوو، زۆر جار نوێنەری خۆی دەنارد بۆ لام بۆ هەر کارێك پێویست بوایە، ئەم نامەیە نمونەی ئەو متمانەیەیە کەبەدەستی (د.دلاوەر عەلادین) خوشکەزای (د. فوائد مەعسوم)، ناردویێتی بۆم.

لەپاش راپەڕینە مەزنەکەی کوردستان، بەردەوام هەواڵی دەپرسیم، لە ٢٠٠٢ مەسعودی کوڕم نارد بۆ سەردانی بەڕێزیان لە قەڵاچۆلان.

لە ٢٠٠٤ دوای بەشداریم لە کۆنگرەکەی تورکیاو گەڕانەوەم، سەردانی بەڕێزیانم کرد و باسی کۆنگرەکە و ئەنجامەکانی و سەرەنجەکانی خۆم بۆ کرد.

دوای بوونی بە سەرۆك کۆمار هەندێك لە مامۆستا کوردەکانی زانکۆی داوەت کردبوو، منیش یەکێك بووم لەوان، لەکاتی نان خواردندا کاك بەرهەم ساڵح وتی: (هەندێك لە مامۆستا کوردەکانمان کوردستان پێویستی پێیان هەیە و لێرە دانیشتوون و ناگەڕێنەوە)، مام جەلالیش وتی: (ئەوانە مەگەر شەقی زەمانە بیانگەڕێنێتەوە)، منیش وتم: وامەزانە هەموو ئەوەی لە شاخ بووەو چەکی هەڵگرتووە، بۆ کورد ئیش دەکا، واش مەزانە هەرکەسێك لە بەغدا دانیشتووە لەدژی بەرژەوەندی کورد ئیش دەکا.

دوای ئەوە هەوڵم دا پەیوەندی بە مام جەلال بکەم بە مەبەستی گەڕانەوە بۆ کوردستان، چومە لای بەرپرسێك (نامەوێت ناوی بەرم) پێم وت دەمەوێت بگەڕێمەوە کوردستان، بەڵام لەبەر ئەوەی سەددام بە مەرسومی کۆماری منی گەڕاندۆتەوە بۆ زانکۆ هەتا لە ژیاندا بم، بۆیە پێم خۆشە لەسەر داوای سەرۆك کۆمار بگەڕێمەوە بۆ کوردستان، بەڵام ئەو کەسە هیچی بۆم نەکرد.

دوای گەڕانەوەم بۆ هەولێریش پەیوەندی ناڕاستەوخۆمان هەر هەبوو، لە نەشتەرگەریی قاچ شکانەکەم هاوکاریەکی باشی کردم.

## گەڕانـەوەم بۆ عـێراق

لە پاش چەند ڕۆژێك لە ڕێکەوتننامەی جەزائیر پەیوەندیمان بە بەڕێز (مام جەلال)ەوە کرد، کە ئەوکاتە لە قاهیرە بوو، وتمان: ئێمە چ بکەین؟ وتی: مۆڵەتم بدەن بۆ ماوەی هەفتەیەك، لە پاش هەفتەکە وتی: بە (قەزافی)م وتووە - سەرۆکی لیبیا - کە هەندێ مامۆستای کورد هەن دەیاننێرین بۆ ئەوێ لە زانکۆکانی خۆتاندا دایانمەزرێنن، منیش وتم: ئەگەر ڕێگای من بدەن من دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ عێراق، چونکە ژنێك و نۆ منالْم بەجێهێشتووە، دەگەڕێمەوە بۆلایان، ئەگەر هەر شتێکم لەگەڵ کرا لە عێراقدا لەسەر ئەستۆی خۆم، وتیان: پێمان خۆشە بگەڕێیتەوە بە مەرجێك نەچیت بۆ هەولێر، لەوێ لە دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمیی (الحكم الذاتي) دابمەزرێیت، منیش وتم: دەچمە کۆلێجی یاسا لە زانکۆی بەغدا، ئەگەر دایان مەزراندم باشە ئەگەرنا ئەوە کەوەر دەفرۆشم، هیچ جۆرە پلەیەك وەرناگرم.

چووم بۆ باڵیۆزخانەی عێراق تا بڕوانامەکەم (تصديق) بکەن، ئەم باڵیۆزخانەیە دوو پرسگەی پێشوازیکردنی هەبوو، یەکێکیان لە دەرەوە بوو پیاوێکی ئەمن بەڕێوەبەری بوو، ئەمە ئەگەر پیاوێك کە گرنگ نەبوایە لای ئەم ئەمنە دادەنیشت چاوەڕوانی دەکرد تا ڕێگەی بدەن بچێتە ژوورەوە، پرسگەکەی تر لە ژوورەوە بوو، ئەمە پیاوێك پیاوانە بوایە دەچوو لەوێ چاوەڕوانی دەکرد ڕێگای بدەن بچێتە ژوورەوە.

کاتێك چوومە ژوورەوە دەبینم کاك حەبیب کەریم کە بە دووەم کەس لەقەڵەم دەدرا لە دوای خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا لە شۆڕشدا، لە پرسگەی دەرەوە

لای ئەمنەکە دانیشتووە، منیش حەپەسام تەنانەت سڵاویشم لەبیر چووەوە لەبەر ئەو دیمەنەی کە بینیم، زۆرم پێ ناخۆش بوو، بەڵام ئەو هەڵسایەوە ئەم لاو ئەولای ماچ کردم، وتی: کاک مستەفا چۆنی، وتم: لە سایەی سەری ئێوەوە زۆر باشین، لێرە چی دەکەیت دانیشتوویت؟ وتی: چاوەڕوانی دەکەم (سفیر) ببینم بچمەوە بۆ عێراق، منیش ڕۆیشتمە ژوورەوە بڕوانامەکەم (تصدیق) کرد.

لە پاشدا چووم بۆ ماڵی کاک (د. فوئاد مەعسوم) وتم: کاک فوئاد خەوێکم دیوە هیوادارم ڕاست نەبێت، لە خەوما کاک حەبیب کەریم لای ئەمنەکەی دەرەوەی باڵیۆزخانەی عێراق دانیشتبوو، چاوەڕوانی سەرەی دەکرد بچێتە ژوورەوە بۆ لای سەفیر، وتی: خەوەکەت ڕاستە، چونکە پێش تۆ (صبحی عبدالحمید) کە پەناهەندەیە لێرە ئەویش ویستوویەتی بچێتە ژوورەوە بۆ باڵیۆزخانەی عێراق بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ عێراق، وتی لە سەفارەت چاوم بە حەبیب کەریم کەوت.

بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژە کاک (نجیب بابان) تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی: بۆ ئێوارە بۆ نانخواردن لە ماڵی ئێمە دەبێت. منیش ڕۆیشتم دەبینم کاک حەبیب کەریم لەوێیە، هەر دانیشتم وتم: کاک حەبیب مانگێك لەوەپێش لە ئوتێل (شبرد) پێم وتیت ئێوە پشتتان بە شا بەستووە ئەگەر سەددام و (شا) دەستیان کردە ملی یەکتری لە دژی کورد کێ پشتیوانی ئێوە دەکات، یەکەمجار وتت (مستحیل)ە، دووەمجار وتت پشتیوانمان هەیە ئەگەر ئەویش ڕۆیی، بۆچی باوەڕتان بە شا کرد، پشتیوانەکەی تریان کوانێ؟ بە عەرەبی وتی: (غیر صوچ من الجماعة).

کاك نەجیب چاوێکی لێ هەڵتەکاندم و وتی: بەسە.

ڕۆژێك پێش ڕۆیشتنەوەم چووم ماڵئاوایی لە کاك (د. ئەکرەم جاف) بکەم، پێی وتم: (حەبیب محمد کەریم)م دەعوەت کرد بۆ ماڵی خۆمان بۆ ئەوەی داخی دڵی خۆمی پێ بڕێژم، پێم وت ئێوە لەبەر ساویلکەیی خۆتان پشتان بە دوژمنی خۆتان بەست کە شای ئێران بوو، ئەمە تەنها ئێمە تیانەچووین، بەڵکو نەوەی نەوەمان تیاچوو، تا ماوە ئەم قوڕەی ئێوە دەشێلێ لە ژێر چەپۆکی ستەمکارو دوژمندا.

ئینجا ماڵئاواییم کرد لە بەڕێز مام جەلال و کاك (د. فوئاد مەعسوم) و برادەرانی تر و، گەڕامەوە بۆ عێراق، لە فڕۆکەخانەی بەغدا تۆزێك گیریان

دام، چونکە ناوێك هەبوو وەك ناوەکەی من مەترسییان لێی هەبوو، هەر جۆر بوو وازیان لێ هێنام و بەسەلامەتی هاتمەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵ.

لە پاش سێ ڕۆژ کاك بابەکر پشدەری کە سەرۆکی ئەنجومەنی تەشریعی بوو لە دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی و کاك موحەممەد شەریف کە جێگری ئەمینداری گشتی (نائب أمین عام) بوو لە ئەوقاف لە هەولێر، هاتبوون بۆ بەغدا، هاتن بۆ ماڵی ئێمە وتیان وەرە بۆ هەولێر، پلەیەکی پاشت دەدەینێ یان دەتکەین بەسەرۆکی زانکۆ.

منیش وتم: بیروباوەڕم بەو دەسەڵاتە ئۆتۆنۆمییە نییە هەرچەندە هەنگاوێکی باشە بۆ پێشەوە بۆ گەلی کورد، ئەو دەسەڵاتە وا دێتە بەرچاوم وەك یەکێك میوانێکی بێت و خاوەن ماڵەکە بیەوێت بیخنکێنێت، دۆشەکێکی بۆ ڕادەخات دەڵێت بۆ خۆت تۆزێك پشوو بدە، لە پاشا چەرچەفێکی ڕەنگاوڕەنگ دەدات بەسەریداو دەڵێت با مێش نەتخوات، ئینجا کە میوانەکە خەوی لێ دەکەوێت بە ئەسپایی لە ژێر چەرچەفەکەوە دەست دەبات بۆ ملی و دەیخنکێنێت. من ئەو دەسەڵاتە ئۆتۆنۆمییە وا دێتە بەرچاوم، وەك ئەو پەردە ڕەنگاوڕەنگە.

ئەوانیش گاڵتەیان بە قسەکەم هات.

لێرەدا شایەنی باسە ئەمە وەبیر بهێنینەوە کە لە ساڵی ١٩٧٠ ئۆتۆنۆمی درا بە کوردی عێراق، لە پاش ماوەیەکی کەم لە ١٩٧١/٩/٢٩ میری سێ چوار مەلای نارد بۆلای خوالێخۆشبوو جەنابی مەلا مستەفا لە حاجی ئومەران، یەکێکیان ئامێرێکی تەسجیلی مینرێژکراوی پێبوو، بۆ تەقاندنەوەی بارەگای بارزانی و سەرکردایەتیەکەی، بێ ئەوەی مەلاکان خۆیان بزانن کە مینرێژکراوە، پێیان وتبوو: ئەم (تەسجیل)ە لە پاڵ مەلا مستەفا دابنێ، کاتێك کەوتە قسەکردن دەستی پیا بنێ وتارەکەی تۆمار دەکات.

کە جەنابی مەلا مستەفا هات بۆ لایان، مەلاکە دەستی نا بە تەسجیلەکەوەو تەقیەوە، سێ کەس لە وەفدەکەی حکومەت و ئەو کەسەش کە چای دادەنا گیان لەدەست دەدەن، بەڵام خوای گەورە جەنابی مەلا مستەفا بارزانیی ڕزگار کرد.

ئەمەش سەلمێنەری وتەکەم بوو بۆ کاك بابەکر و کاك محمد شەریف.

## دەست بەکاربوونم لە
## کۆلیجی یاسا لەزانکۆی ( مستنصرية )

لەساڵی ١٩٧٦ بڕوانامەکەم برد و چووم بۆ کۆلیجی یاسا، بینیم ئەو مامۆستایانەی پێشتر دەرسیان پێوتبووم لە کۆلیجی یاسا لە زانکۆی بەغدا، هەموویان ماون، زۆر خۆشحاڵ بوون کە من دکتۆرام وەرگرتووە و هاتومەتەوە لەگەڵ ئەوان لەرووی زانستیەوە خزمەت بە ڕۆڵەکانی وڵاتەکەم بکەم، لەگەڵم هاتن بۆ لای راگر (عميد)ی کۆلیجەکە، وتیان: ئەمە کاتی خۆی قوتابی ئێمە بووە و تۆزێك پیایان هەڵدام، ئەویش وتی: بەسەر چاو، دوو دەرسمان



هەیە مامۆستایان نیە، لەدەرەوەی زانکۆ مامۆستامان هێناوە، لەبەر ئەوە بڕۆ پێداویستی دامەزراندنت ئامادەبکەو پێشکەشی بکە.

منیش چووم پێویستیەکانم ئامادەکرد، کە هاتمەوە تەماشا دەکەم راگرەکە هەڵگەڕاوەتەوە، دەرکەوت ئەوانەی کە یەکەمجار هاتن و مامۆستام بوون، دوای من چووبوون بۆلای راگرەکەو پەشیمانیان کردبۆوە.

کاتێك چووم بۆ لای وتی: تۆ بۆ ناچی بۆ سلێمانی لەوێ دەرس بڵێیتەوە؟

وتم: من عێراقیم، بۆچی، بەسرەو سلێمانی و بەغدا چ جیاوازیەکیان هەیە بۆ من؟

وتی: لەسەر چی لەسوپا دەریان کردی؟

وتم: دیارە پیاوێکی خراپ بووم بۆیە دەریان کردم، وتم: کێ پێی وتی دەریان کردووم؟ من چوار مانگ هاتووچۆم کرد تا وازیان لێهێنام و چووم بۆ قاهیرە بۆ خوێندن. ئینجا وتم: دەچم فایلەکەم لەوەزارەتی بەرگری دەهێنم پڕ لەسوپاسە، (١٧)ساڵ و(٢٠) رۆژ خزمەتم کردووە، یەك جار کەمتەرخەمیەکی وام نەکردوە کە شایەنی باس بێت.

ئینجا وتی: بۆ ناچیت بۆ ئەوقاف؟

لێرەدا لەم قسەیە زۆر پەست بووم، وتم: (انا دکتور وانت دکتور) تۆ بۆ ناچیت، من مامۆستای ئاینی نیم؟

وتی: مەبەستم ئەوەیە لەوێ ببیت بەراوێژکار.

لەکۆتاییدا وتی: جێگەمان نیە ئەو دوو دەرسە دراون بەمامۆستا و ناتوانم لێیان بستێنمەوە تا ساڵ تەواو دەبێت.

لەپاشدا چووم بۆ لای سەرۆکی زانکۆ، ئەویشیان بەهەمان شێوە تێگەیاندبوو، رازی نەبوو لەسەر دامەزراندنم.

لەو کاتەدا زۆر قەرزاربووم، کەم دەرامەت بووین، جگە لەمووچەی خانەنشینیم (تقاعدی) کەوەك باسمکرد (٦٨) دینار بوو، (٣٨) دیناری بۆ ئێمە دەمایەوە و

(٣٠) دیناریان دەبرد بۆ قیستی خانوەکە.

ڕۆژێك لەبنکەی وەزارەتی بەرگرییەوە تەلەفونیان بۆ کردم وتیان: وەرە بۆ ئێرە، کاتێك چووم پێیان وتم: کاتێك تۆ لێرە نەبوویت دەورەمان دەکردەوە بۆ ئەفسەرەکان، ئێستاش دەورەیەکی پێنج مانگیمان هەیە بۆ ئەفسەرەکان ئەتوانی دەرسی فارسییان پێ بلێیت؟ منیش زۆرم پێخۆش بوو، چونکە زۆر پێویستم پێ بوو، لەو کاتەدا پێویستم بە پارەو پڕکردنەوەی کاتیش بوو.




هەموو ڕۆژێك دەچووم دووسەعات دەرسی فارسیم دەوتەوە بەئەفسەرەکان، ڕۆژێك شیعرێکی فارسیم نووسیبوو لەسەر تەختەرەشەکەو ڕوونم دەکردەوە بۆیان، لەوکاتەدا بیرم لە وەزعی خۆم دەکردەوە زۆر تێك چووم، لەکاتی دەرسەکەدا دەستم کرد بەجنێودان بەمیری و بەوکەسانەی ئەچنە دەرەوە بۆ خوێندن و دەگەڕێنەوە بۆ عێراق، ئەفسەرەکان سەریان سوڕما، وتیان: بۆ وا تۆڕە بوویت؟ وتم: من دوو دکتۆرام هەیە یەك لەیاساو یەك لەشەریعەتی ئیسلامی، هەرچەندە دکتۆرای یاساکەم گفتوگۆی بۆ نەکرا، داوام کرد لەزانکۆی موسەنتصریە و بەغدا دایان نەمەزراندم، لەکاتێکدا زۆر پێویستیان بەمن هەیە لەگەڵ ئەوەشدا ئەو وانەیە پەیوەندی بە پسپۆڕی خۆمەوە هەیە، کەچی چوون لەجیاتی من دوو موحازریان لەدەرەوە هێناوە، ئەفسەرێکی نەقیب لەکۆشکی سەرۆك کۆمار بوو وتی: ئیشەکەت لای من ئاسانە ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت.

وانەکەم تەواو کرد، ئەفسەرەکە داوای یەك کاتژمێر پشووی کرد لەسەرۆکی دەورەکە، پێی وتم: وەرە لەگەڵ مندا بچین بۆ زانکۆی مستنصریە، کاتێك چووین

دەرکەوت لەگەڵ سەرۆکی زانکۆ برادەرن، کاتی خۆی بەیەکەوە لەبەندیخانەیەکدا بەهۆی چالاکی ڕامیارییەوە بەند کرابوون، بەسەرۆکی زانکۆی وت: مستەفا زەڵمی وا دابنێ کە منم یان برای منە، دەبێت دایمەزرێنی، وتی: بەسەر هەردووچاوم، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە ڕۆژێك پێشتر نەیاندەهێشت بچمە ژوورەوە بۆ لای.

لە ڕوداوێکی لەم شێوەیەدا نەفسیەتی زۆربەی کاربەدەستانی وڵاتت بۆ دەردەکەوێت، لەماوەی ٢٤ کاتژمێردا لەمرۆڤێکەوە گۆڕا بۆ مرۆڤێکی کە، پێی وتم مەچۆرەوە بۆ لای راگری کۆلێج تا فەرمانی دامەزراندنت لەلایەن وەزارەتی خوێندنی باڵاوە بۆ دەردەچێت، بەڵام هەفتەیەکی تر داواکاریەك لەگەڵ بڕوانامەکەتدا بێنە.

لەپاش ماوەیەك چوومەوە بینیم فەرمانی دامەزراندنم دەرچووەو لەسەر مێزەکەی دانراوە، کاتێ منی بینی لەجێگەکەی هەستایە سەر پێ و بەرەو پیرم هات و ماچی کردم و وتی: (غیر احنا منعرفك) واتە: داوای لێبوردن دەکەین چونکە ئێمە تۆمان نەناسی، وای دەزانی من حزبیەکی زۆر گەورەم، چونکە زۆر بەزوویی فەرمانی دامەزراندنم دەرچوو.

ئەمەش دووبارە نمونەیەکی ترە بۆ دووڕوویی هەندێ کەس، کە زۆر جار لەڕێی ڕاست و دادوەرییەوە نارۆن، بەڵکو ئەو جۆرە کەسانە هەمیشە چاویان لەوەیە تۆ پەیوەندیەکت بە لایەکەوە هەبێ، بەداخەوە تا ئێستاش ئەم جۆرە شێواز و مامەڵەیە بەردەوامە.

**لە ١٩٧٦/٦/١ لە زانکۆی مستنصریە دامەزرام.**

**ئەو بابەتانەی پێم سپێردرا ئەمانە بوون:**

١- اصول الفقه. ٢- احکام المیراث.

ئینجا لێرەدا وتەی مامۆستاکەمم بیرکەوتەوە کە ساڵی (١٩٦٣) پاش ئەوەی راپۆرتێکم پێشکەش کرد، پێی وتم: مژدەت دەدەمێ ڕۆژێك دێت تۆ لەم جێگەیەی مندا دادەنیشیت (احکام میراث) بەدەرس دەڵێیتەوە، وتەکەی لەپاش ١٣ ساڵ هاتەدی، من لەشوێنەکەی دانیشتم و ئەو وانەیەم پێشکەش کرد.

لەساڵی ١٩٧٧ کۆلیجی یاسای زانکۆی مستنصرییە لەگەڵ کۆلیجی یاسای زانکۆی بەغدا لێکدرا، بۆیە منیش گواسترامەوە بۆ زانکۆی بەغدا.

لەو ماوەیەدا لەبەر ناهەمواری باری ئابووری زۆربەی مامۆستاکان چوونە دەرەوەی عێراق بۆ وانەووتنەوە، بەو هۆیەوە زۆربەی وانەکان بەبێ مامۆستا مانەوە، وانەکانیان بەمن سپارد، بۆیە لەکۆلێج لەهەر چوار پۆلەکە وانەم دەوتەوە، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی مۆڵەتم نەدەنێ بگەڕێمەوە بۆ قاهیرە بۆ گفتوگۆی دکتۆراکەم لە یاسا.

بەهەرحاڵ ساڵی ١٩٧٧ سەفەرێکی دیکەم کرد بۆ قاهیرە بۆ ئەوەی گفتوگۆکە دوا بخەم، پێیان وتم: یا گفتوگۆ (مناقشة) لەسەر دکتۆراکەت بکە، یان ساڵانە (١٠٠) جونەیهی ئەسترلینی بدە بەزانکۆی قاهیرە بۆئەوەی دوای بخەن، منیش بۆ ئەو دانوستانە بەلای کەمەوە سێ مانگم کات دەویست، چونکە لەقاهیرە بڕوانامەی دکتۆرا دەبوایە چاپ بکرێت وەك کتێب ئینجا گفتوگۆی لەسەر بکرێ.

گەڕامەوە بۆ عێراق، هەتا ساڵی (١٩٨٠) بۆ ماوەی سێ ساڵ لەرێگەی بانکەوە (١٠٠) جونەیهی ئەسترلینیم دەنارد بۆ زانکۆی قاهیرە، ساڵی دواتر نەمنارد، لەبەر ئەوەی موچەکەم کەم بوو، لە زانکۆی قاهیرە (فصل)یان کردم، ئیتر هەر بەوجۆرە ئەو هەلەم لەکیس چوو، بەڵام سەیر ئەوەیە بۆ جارێکی تر هەلم بۆ هەڵکەوت بەڵام دووبارە خوا گۆڕی بە بارێکی تر.

ساڵی (١٩٩٠) من کرام بە راگری کۆلیجی صدام، هەروەك دواتر باسی دەکەم، ئەم کۆلێجە سەر بەدیوانی سەرۆکایەتی کۆمار بوو، پەیوەندی نەبوو بەوەزارەتی خوێندنی باڵاوە، لەو کاتەدا جێگری سەرۆکی زانکۆی قاهیرە (د.فتحي والي) بوو، لەسەر داوای سەرۆکی عێراق هات بۆ کۆلێجەکەی ئێمە بۆ ئەوەی بزانێت پێویستیەکانی کۆلیجەکە چیە، چونکە کۆلیجەکە تازە کرابۆوە، لەوکاتەشدا من راگری کۆلیج بووم، ئیتر بە هەلم زانی و دەعوەتم کرد لەگەڵ هەندێ مامۆستای کەی زانکۆی بەغدا، کاتێکیش کە گەڕایەوە لەگەڵیدا

چووم بۆ فرۆکەخانە، کاتێ ماڵئاوایی کرد وتی: من زۆر سوپاسی تۆ ئەکەم لەسەر ڕێزگرتنی من، ئاواتم ئەوەیە ئیشێکت بەمن هەبێ بتوانم بۆتی جێبەجی بکەم، وتم: ئیشێکی زۆر گرنگم هەیە بە تۆ، بەڵام شەرمم کرد پێت بڵێم، وتی: چیت پێویستە پێم بڵێ، وتم: من قوتابی ئێوەبووم و بەدرێژی بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی: سەری ساڵ مۆڵەت وەربگرە لەدیوانی سەرۆکایەتی و وەرەوە بۆ قاهیرە، من وادەکەم گفتوگۆی دکتۆراکەت بەئەنجام بگەیەنم، منیش زۆر ستایشم کرد لەسەر ئەو هەڵوێستەی، بەڵام بەختەکەی منیش وەك بەختەکەی مەولەوی وابوو کە دەڵێت :

خەیلێ وەن خەریك زاکەی زەحمەتم
بەڵکو وەڕابۆ نـــە بـــۆ عوســـرەتم
فەلەك وە بەختم مـــەگەز مەکیانۆ
وە ڕاکەی ڕەحمەت مـــەڕیۆ دیسانۆ

واتە: زۆر هەوڵ ئەدەم پیتی (ز)ی (زەحمەت) بگۆڕم بیکەم بە ڕێ (ڕەحمەت) بەڵام مەخابن گەردوون مێشێك دەنێرێ وپیسی دەکات بەسەر ڕێی (ڕەحمەت)ەکەداو دەیکاتەوە بە زەحمەت.

(ر)ی زەحمەتەکەی من صدام حسین و بۆش تێکیان دا، چونکە شەڕی کەنداوی دووەم بەرپابوو لەنێوان عێراق وئەمەریکادا، میسریش یەکێك بوو لەو وڵاتانەی هاوکاری ئەمریکا بوون، بۆیە پەیوەندی نێوان میسر و عێراق بڕاو وتوێژی دکتۆراکەی منیش بۆ جارێکی تر دواخرا. ئێستا کە ڕۆژی (٢٠٠١/٧/٢٧) هەرچەندە بارودۆخەکە تۆزێك ئارامە، بەڵام لەم دواییەدا ئەو هیوایەش کۆتایی هات.

Scanned by CamScanner

## ( اصول الفقه ) بوو بە
## ( فلسفة الشريعة )

لەپاش ئەوەی بۆ ماوی ساڵێك لە کۆلێجی یاسای زانکۆی بەغدا دەرسی (اصول الفقه)م دەوتەوە، هەندێك لەقوتابیەکان لەبەشی ئێواران دەوامیان دەکرد و لە کەسوکاری بەرپرسە حکومیەکان بوون وتیان بابەتی (اصول الفقه) زۆر گرانە، بۆمان بگۆڕن بەبابەتێکی تر، ئینجا کرا بە (فلسفە الشريعة)، مامۆستایەکیان هێنا لە (اسیوت)ی میصرەوە ناوی دکتۆر سەروەت ئەسیوتی بوو، ئەم مامۆستایە فەلسەفەی یاسای دەوتەوە، منیش فەلسەفەی شەریعەم دەوتەوە، هەردوو بابەتەکە بە یەك بابەت دانرابوون، هەر یەکی (٥٠) نمرەی بۆ دانرابوو، منیش کتێبێکم دانا لەژێر ناونیشانی: (فلسفە الشريعة).

لەو رۆژەوە من لەزانکۆکانی عێراق دەرس دەڵێمەوە کتێبی کەسم بەدەرس نەوتۆتەوە، هەر بابەتێکیان پێ سپاردبم بۆ خۆم کتێبێکم بۆ دادەنا، ئێستاش ئەو کتێبانە بوون بەمەنهەج لە هەرچوار قۆناغەکانی خوێندنی کۆلیجەکانی یاسا لە زانکۆکانی عێراق و هەندێك زانکۆی عەرەبی دەرەوە بە وانە دەوترێنەوە، بەم جۆرە:

**قۆناغی یەکەم:** المدخل لدراسة الشريعة.

**قۆناغی دووهەم:** المنطق القانوني، ئەو کاتە ئەم کتێبە دەوترایەوە، دواتر بوو بەکتێبی (احکام الزواج والطلاق - دراسة مقارنة بالقانون).

**قۆناغی سێهەم:** احکام المیراث والوصیة وحق الانتقال.

**قۆناغی چوارەم:** اصول الفقه.

له (١٩٨٠/١/١٦) پلەی (أستاذ مساعد)یان پێ دام، ساڵی (١٩٨٣) بۆ یەکەمجار بووم بە سەرپەرشتیاری بڕوانامەی ماجستێر و دکتۆرا، یەکەم سەرپەرشتیاریم لەسەر دکتۆرای قوتابی (حسێن نەدا) بوو کە ژن برای (احمد حسن بکر) بوو، سەرۆك کۆماری پێشووی عێراق، بەناوی (الاسلام والقانون الدولي الانساني).

**لەو ماوەیەدا ژیانی مامۆستاکانی زانکۆکانی عێراق بەرەو خراپی دەچوو، چونکە:**

**یەکەم:** مووچەیان کەم بۆوە، بەتەواوەتی بەشی ژیانی رۆژانەی نەدەکردن، بەپێچەوانەی مامۆستاکانی زانکۆکانی وڵاتانی تری ناوچەکە، ئەمە وای کرد زۆرێك لەمامۆستا زۆر باشەکان خۆیان خانەنشین بکەن بۆ ئەوەی کارێکی کە بکەن و زۆریشیان رۆشتنە دەرەوەی عێراق.

**دووهەم:** قوتابییەکان بەهۆی حیزبایەتیەوە زۆر بێشەرم بوون بەرانبەر بەمامۆستاکانیان لەلایەك و لەلایەکی کەشەوە هی وای تیابوو هەڕەشەی لەمامۆستاکەی دەکرد یان داوای یارمەتیان دەکرد لەتاقی کردنەوەکاندا، یان هەندێك لەکاربەدەستەکان لەکاتی تاقی کردنەوەکاندا بەئاشکرا قۆپیان دەکرد و مامۆستاکان نەیان دەوێرا قسە بکەن.

جارێك لە قۆناغی چوارەم وانەم دەوتەوە، باسی ئەوەم کرد کەعەرەب بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە گەلێك سەقامگیر بوون، بەڵام کە دەستبەرداری ئیسلام بوون ئاوەها پەرتەوازە و بێ دەرەتان بوون، ئەوەش بوە هۆی ئەوەی بەهۆی رەگەزپەرستیيانەوە متمانە لەدەست بدەن و ملکەچ کەن بۆ دەست تێوەردانی وڵاتە زلهێزەکان.

لەکۆتاییدا قوتابیەکی چاو شین قژ زەرد کە لەعێراقی نەدەچوو دەستی بەرز کردەوە، وام زانی پرسیار دەکات، وتم: چیە؟ وتی: ئایینی ئیسلام بوو بەهۆی ئەوەی وڵاتە عەرەبیەکان لەوڵاتانی تر دوابکەون و بێبەش بن لەشارستانێتی و پێشکەوتن.

بەبێ شەرمانە ئەم قسەیەی کرد، لەبەر ئەوەی بوارێکی فراوانیان هەبوو لەڕێگەی حیزبی بەعسەوە.

منیش پێم وت: هەستە بچۆرە دەرەوە، چونکە قوتابی ئەگەر کردەوەیەکی ناشرین بکات سزاکەی ئەوەیە لەبەرچاوی قوتابیەکان دەری کەیت.

وتی: ناچمە دەرەوە.

وتم: ئەگەر نەچیتەدەرەوە پێڵاوەکەم دادەکەنم و هەموو دەموددانت ئەشکێنم.

ئینجا چوە دەرەوە، چوو بۆ لای راگر شکاتی لێکردم، ئەویش لەترساندا مامۆستایەکی کوردی نارد بۆ لام کە بچم داوای لێبوردن لەو قوتابیە بکەم.

مامۆستا کوردەکە (د.سعید مبارك) بوو، هات وتی: ماڵ کاول تۆ چیت کردوە!

وتم: خۆ پیاوم نەکوشتوە؟

وتی: تۆ ئیشێکی زۆر گەورەت کردوە.

وتم: چیە؟

وتی: ئەو قوتابییەی دەرتکردوە و قسەت پێ وتوە ئەزانی کێیە؟

وتم: نازانم و ناشمەوێت بیزانم.

وتی: ئەوە مرافقی (عبدالمجید الرافعی)ە، کە خۆی بەدووهەم کەس لەقەڵەم دەدات لەپاش سەرۆك کۆمار (صدام حسین).

عبدالمجید رافعی لام وایە سورییە، لەبەر ناکۆکی خۆیان لەوێ هەڵهاتوە و لێرە بووە بەئەندام (قیادة القومیة).

وتم: بڕۆ بە ڕاگر بڵێ ئەگەر لەجیاتی ئەو قوتابیە عبدالمجید بوایە هەمان رەفتارم لەگەڵ ئەکرد، چونکە ئەو بێشەرمانە هێرشی کردە سەر ئاینی ئیسلام و، من خۆم ئامادەم بۆ هەر ئەنجامێك، من تەنها بۆ خوام کردوە و خواش لەهەموو کەس گەورەترە و بەهێزترە.

لەپاش هەفتەیەك قوتابییەکە هات بۆ ژوورەکەم و دەستی ماچ کردم و داوای لێبوردنی لێکردم.

لەدڵی خۆمدا وتم: ئەگەر داوای لێبوردنم لەم قوتابیە بکردایە ملی ئەشکاندم.

من پاڵم دا بەخواوە خواش ئەوی ناچار کرد کەبێت دەستم ماچ کات و لێی ببورم، باوەڕناکەم هیچ کەسێك لەم جیهانەدا توشی خراپەببێت ئەگەر لەگەڵ خوادا ڕاست بێت.

## كۆنگرەی زانكۆی (بكر)

لەهەمانساڵدا (١٩٨٣ز) كۆنگرەیەك گیرا لەزانكۆی بكر، كە زانكۆیەكی سەربازییە، هەر ئەفسەر وانەی تێدا دەخوێنێ، سێ ماموٚستایان دەستنیشان كرد بۆ ئاخاوتن لەو كۆنگرەیەدا، یەكێك لەو سیانە من بووم، كاتێ سەرە هاتە سەرم و وتاری خۆم پێشكەش كرد، بەڵام هەندێ لە وتەكانم زۆر بەدڵی گوێگران نەبوو، هەر بۆیە پێم وتن دەكرێ هەندێ تێبینی زیاتر بخەمە پێش چاوتان؟ وتیان: فەرمووً؟

منیش وتم:

**یەكەم:** ئەمەندەتان داوە بەدەم قوتابییەوە بوون بەسەگی هار بەرانبەر بە ماموٚستاكان، ئەمە ئەنجامێكی زۆر زۆر خراپی هەیە لەسەر زانیاری پاشەڕۆژی عێراق، ئەگەر ئەمە چاك نەكرێ هەموو ماموٚستاكان عێراق بەجێ دەهێڵن و دەچنە دەرەوەی وڵات.

**دووهەم:** وەرگرتنی قوتابی كۆلێجی پەروەردە لەسەر بنچینەی حیزبایەتی یە و بەنمرە نیە، قوتابی بەبێ هیچ زانیاریەك دەڕوات خۆی دەكات بەحیزبی و لە كۆلێجی پەروەردە وەردەگیرێ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی رۆژێك لەرۆژان هەندێك لەو قوتابیە نازیرەكانە دەبن بەماموٚستا لەعێراقدا و دەبنەهۆی ئەوەی ئاستی زانیاری كەم كەنەوە لە وڵاتەكەدا، چونكە وەك دەڵێن: (فاقد الشيء لا يعطيه)، واتە یەكێك خۆی فێری خوێندەواری نەبێت ناتوانێت یەكێكی كە فێربكات.

**سێهەم:** ئێوە ئێستا کەقوتابی هەڵدەبژێرن بۆ ئەوەی بنێردرێت بۆ دەرەوەی وڵات، لەسەر بنچینەی حزبایەتی یە نەك نمرە و زیرەکی، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو قوتابیە زیانێکی زۆر لەگەنجینەی عێراق بدات بەبێ ئەوەی خۆی سوود لەخوێندنی دەرەوە وەربگرێت و بەبێ ئەوەی زانکۆکانی عێراق سوودی لێ وەربگرێ، بەبڕوانامەیەکی ساختەوە دەگەڕێتەوە.

هەندێك شتی ترم لەم بابەتە باس کرد، کەئیستا بیرم نەماوە، بەڵام ئەم وتانەیان زۆر پێ ناخۆش بوو، دوایی چووین بۆ پشوو، کە گەڕاینەوە جێگەی خۆمان بۆ بەردەوام بوونی کۆنگرە، دەبینم هەموویان روویان کردۆتە من، چونکە قسەکانی من بەئارەزووی ئەوان نەبوو، من لەرووی دڵسۆزیەوە قسەکانم کرد ئەوانیش دژی هەموو دڵسۆزییەك بوون ئەگەر زیانی هەبێت بۆ بەرژەوەندی خۆیان، چونکە حزبی بوون، یەکێك پلەی زۆر بەرزی هەبوو لەحیزبی بەعسدا پێی وتم: تۆ لەقسەکانتدا زۆر لەسنوری خۆت تێپەڕیت، ئێمە بۆیە کۆشش و خەباتمان کرد بۆ ئەوەی ئێستا بەرەکەی بخۆین.

وتم: بەداخەوە دیارە تا ئیستا جەنابتان لەمانای خەبات نەگەیشتوون، چونکە خەبات ئەوەیە مرۆڤ خۆی بکات بە مۆمێك خۆی بسوتێنی رێگا روناك بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەوانەی لەپاش خۆیان رێگەیان دیار بێت.

لەپاش تەواو بوونی کۆنگرەکە هەر کەس گەڕایەوە شوێنی خۆی، هەندێك لەبەرپێوەبەرانی زانکۆ کۆبونەوەو گفتوگۆی ئەوەیان دەکرد سزام بدەن لەسەر ئەو وتانەی من کەلای ئەوان ڕەوا نەبوو، دیارە هەندێك لەوانە خوا خستبویە دڵیانەوە وتبویان ئەم وتانە لەکانگای دڵسۆزیەوەیە، هیچ کەس پاڵی پێوەناوە بۆ باس کردنی ئەم شتانە، لەبەر ئەوە لەجیاتی سزا دەبێت رێزی لێ بگیرێت.

لە دواییدا سوپاسنامەیەکم بۆ هات لەگەڵ دیارییەك کە سەعاتێك بوو.

ئینجا بەم بۆنەیەوە دەڵێم کە هەر مرۆڤێك لەگەڵ خوا و خەڵکدا راست بێت، مەبەستی بەرژەوەندی گشتی بێت، خودا پشتی بەر نادات. من لەو ماوەی (٧٧) ساڵەی تەمەنما بۆم روون بۆوە کەس لەرێگەی راستیدا نەکەوتووەو

سەرگەردان نەبووە، وەك شاعیری مەزن (سەعدی شیرازی ) دەڵێت:

راستی موجب رچای خداست

کس ندیدم که گم شد از ره راست

واتە: راستی هۆکاری رازیبونی خودایە، کەسم نەدیوە لەسەر رێگەی راستی وون بێت یان داببڕێت.

لەساڵی١٩٨٥ لەکاتی تاقی کردنەوەدا ئیستمارەیەکیان بەسەر قوتابیانی قۆناغی چواردا دابەش کرد، وتیان بەقوتابیەکان: بنووسن لەماوەی ئەم چوار ساڵەدا ئێوە سوودتان لە چ مامۆستایەك وەرگرتوە بەبێ ئەوەی ناوی خۆتان بنوسن، لە ٩٠٪ نووسیان (مصطفی زلمی ) لەبەر ئەمە لە ئاهەنگی دەرچوونی قوتابیەکان لەوەزارەتی خوێندنی باڵا نازناوی (استاذ متمیز)یان پێ بەخشیم.

ساڵی ١٩٨٧ لەشەش پۆلدا وانەم دەوتەوە، لەقۆناغی یەك تا قۆناغی چوار، لەگەڵ ماستەر و دکتۆرا، دەرسەکانم هەمووی لەبواری شەریعەت و یاسادا بوو.

سەرەتا کە چومە ئەو کۆلیجە ئەگەر باسی شەریعەتی ئیسلام بکرایە، زۆر کەس لەدژی دەوەستا، دەیانوت ئیسلام باوی نەماوە، بەڵام بەیارمەتی خوای گەورە توانیم ئەوجۆرە بیروبۆچوونە لەمێشکیاندا بسڕمەوە و لەدڵیاندا بیچەسپێنم کەئاینی ئیسلام بۆ خزمەتی ئادەمیزاد هاتووەو، گەلێك باشترە لەو یاسایانەی لەوڵاتە ئیسلامیەکاندا پەیڕەو دەکرێت. ئێستا کۆلێجی یاساکانی عێراق وایان لێهاتوە هەرچی ماستەرو دکتۆرا هەیە ئەگەر بەشێکی تەرخان بکرێ بۆ بەراوردکردنی لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام، ئەوەی لێکۆڵینەوەکەی ئامادکردوە لەگەڵ قوتابیەکە سەرزەنشت ناکرێ لەلایەن ئەو کەسانەوەیە کەگفتوگۆی نامەکەی دەکەن.

# جارێکی تر میسر

لەساڵی ١٩٨٧ جارێکی تر چوومەوە بۆ میسر، چونکە بەتەمابوون لەزانکۆی قاهیرە (فصل)م بکەن لەپلەی دکتۆرای بەشی یاسا، کاتێ گەڕامەوە بۆ میسر چوار کیلۆ چام لەگەڵ خۆم برد بۆ قاهیرە بەدیاری، چونکە ئەو کاتە چای باش لە قاهیرەدا نەبوو، بۆ بەیانیەکەی چووم بۆ زانکۆی قاهیرە، تا هاتمەوە کرێکاری ئوتێلەکە کە دەرگای ژورەکەیان کردبۆوە، بەچەقۆ جانتاکەمیان لەژێرەوە دڕیبوو، منیش چوم بەخاوەن ئوتێلەکەم وت شتێکی وا رویداوە، ئەویش وتی: (٢٠) کرێکار لەئوتێلەکەدا هەیە کامیان بگرم و پرسیاری لێ بکەم، ئەمە لەوڵاتێکدا بوو کەبەسەرچاوەی ئیسلام دەناسرێت و زانکۆی ئەزهەری تێدایە کەهەموو موسڵمانێك بەشانازییەوە رووی تێ دەکات و بە (الازهر الشريف) ناوی دەبات.

هەر جۆر بوو ئیشەکەی خۆم تەواو بوو لەگەڵ زانکۆی قاهیرە و(١٠٠) پاوەندم دا بۆ رەسمی ساڵی تازەی دکتۆرای یاساکەم، کاتێ گەڕامەوە وا رێککەوت کە فڕۆکە نەبوو بۆ عێراق بەڵکو دەبوو بچمە ئوردن و لەوێوە بە ئوتۆمبێل بگەڕێمەوە بۆ عێراق، کاتێ لەفڕۆکەخانەی (عمان) دابەزیم هەرکەس جانتای خۆی وەرگرت و رۆیشتەوە، ئێمە سێ عێراقیماینەوە و جانتاکانیان نەدداینەوە چونکە نێوانی عێراق ئوردن خراپ بوو زۆر عەزیەتیان داین.

شایانی باسە لەساڵی ١٩٨١ لەگەڵ دایکی محمد سەفەری پۆڵەندامان کرد، لەشاری وارشۆی پایتەخت لە ئوتێلێك دابەزین، کە چوین بۆ بازاڕ کلیلی ژوورەکەمان برد لەگەڵ خۆماندا، کە هاتینەوە بینیمان شێوەی ژوورەکە گۆڕابوو

و خاوێن کرابوەوە، خەممان بوو، کە دەستمان برد بۆ جانتاکەی دایکی محمد کە لە ژوورەکە بەجێی هێشتبوو، هەزار دۆلار لەگەڵ هەزار وەرەقەی تریفل چەکی تیادابوو، دەستکاری نەکرابو و لە شوێنی خۆی مابووەوە.

لێرەدا بەراورد ناکرێ لەنێوان وڵاتێکی ئیسلامی کە سەرچاوەی وەرگرتنی بڕوانامەی باڵایە لە ئایینی ئیسلام و شەریعەتدا، لەگەڵ وڵاتێك کە دانیشتوانەکەی مسوڵمان نین، بەڵام دەست پاکن.

**چــەند تێبینیــی گرنــگ:**

**یەکەم:** دەڵێن شوێنی عەیب لەلای موسڵمانان لە ناوك بە خوارەوەیە و، لای مەسیحیەکان لە ناوك بەسەرەوەیە، بۆیە درۆ و غەیبەت و فیتنە و کوشتن و دزی و شتی دیکە عەیب نیە، چونکە ناکەونە ژێر ناوکەوە، بەڵام هەموو ئەوەی پەیوەستە بە کاری سێکسیەوە، بچوك بێت یان گەورە، عەیبە.

**دووەم:** ئیسلامی سیاسی هۆکارێك لەهۆکارەکانی شکست هێنانی لە پێکهێنانی نیزامێك حوکمی موسڵمانان بکات، ئەوەیە تەرکیزی کردۆتە سەر حکومەتی ئیسلامی و گرنگی دان بە پێکهاتەکانی فەرامۆش کردووە کە بریتییە لە مرۆڤی چاك، لەجیاتی گرنگی دان بە چاککردنی مرۆڤ، زۆرجار حیزبە ئیسلامیەکان گرنگییان داوە بە پێکهێنانی حکومەتێکی ئیسلامی ئەگەرچی ژێردەستەکانی گەندەڵ بن، ئاشکرایە ئەگەر رەگەزەکان گەندەڵ بن ئەوەشی کە لێیان پێك دێت هەر گەندەڵ دەبێت.

**سێیەم:** ناکۆکیی مەزهەبی بووە هۆی ئەوەی یاسا نا ئیسلامییەکان جێگای شەریعەتی ئیسلامی بگرنەوە.

**چوارەم:** شێوازی توتیانە لە وتنەوەی قسە و بیروڕا و وتەی کەسانی دیکە بووە هۆی ئەوەی جیهانی ئیسلامی پاش بکەوێت، لەوانە جیهانی کوردی لە کاروانی شارستانی مرۆڤایەتی دواکەوت، چونکە ئەو شارستانییە پێکهاتووە لە

بەدەستهێنانی زانیارییە نەزانراوەکان و گۆڕینی بۆ زانیاریی تازە و زیادکردنی بۆ ئەو میراتە زانستییەی بۆ نەوەی دوای خۆی جێی دەهێڵێت.

**پێنجــەم:** زۆر لە موسڵمانان بتپەرستن، هەندێکیان مەزهەبەکەیان کردۆتە بت، هەندێکیان شێخێك لە شێخەکانی تەصەوف دەپەرستێت، هەندێك کەسایەتییەکی سیاسی و فەرمانڕەوای کردۆتە بت، چونکە ئەوان بڕوایان بەو فەرمایشتەی خوای گەورە نیە کە ڕۆژانە دەیان جار دوبارەی دەکەنەوە (اياك نعبد واياك نستعين)، هەروەها بڕوایان بە خاوەنی ئەو وتانە نیە، مەگەر لەڕێی لاسایی کردنەوەی باوانەوە. وتاربێژەکان خەڵك فێرناکەن کە سامانی گشتی بەزایە نەدەن وەك ئاوو کارەبا و دارستان و کانزاکان و بە تایبەتی نەوت، هەروا فێریان ناکەن شەقام و ڕێگا و سەیرانگاکان و هی دیکە بە پاکی رابگرن، بەڵکو فێری ئیسرائیلیات و پڕوپوچیان دەکەن و فەرمودەی هەڵبەستراو بە زمانی پێغەمبەریان بۆ دەخوێننەوە.

# گەشتێک بۆ وڵاتی پۆڵۆنیا

ساڵی ١٩٨٠ شەڕی ئێران و عێراق دەستی پێکرد، ئەو ساڵە لەکاتی هاویندا بەغدا زۆر گەرم بوو، لەگەڵ دایکی محەمەد سەفەرێکمان کرد بۆ پۆڵۆنیا، ئەو رۆژەی رۆیشتین دوارۆژی رەمەزان بوو، پلەی گەرمی لە بەغدا زیاتر لە (٥٠) پلەی سەدی دەبوو، کاتێک سەعات (٨)ی بەیانی لە فرۆکەخانەکەی شاری وارشۆ دابەزین، کابرای فرۆکەوان وتی ئێستا پلەی گەرمی ١٢ پلەی سەدییە، کە دابەزین باران بوو، وەکو لە دۆزەخەوە بچین بۆ بەهەشت، بەو جۆرە دەهاتە بەرچاومان.

ئەم شارە جوانە لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا وێرانکرا، لەپاشاندا سەرلەنوێ کۆشك و باڵەخانەکان دروستکرابوونەوە، نێوانی باڵەخانەو باڵەخانەیەکی تر (١٠٠) مەتر زیاتر بوو، کرابوو بە گوڵ و گوڵزار، هەموو جۆرە گوڵێکی گەرمیان و کوێستانی تیادابوو، (مێزەمێزە)ی کوێستان و (گوڵاڵە حاجیانە)ی گەرمیان دەستیان کردبووە ملی یەکتر. (بەڵاڵۆك)ی کوێستان لەگەڵ (هەڵوژە) ی گەرمیان لەیەك ئاڵابوون، بەجۆرێکی وا دیمەنە جوانەکەی، نە قەڵەم دەتوانێ بینوسێ نە زمان دەتوانێت باسی بکات.

چوینە ئوتێلێکی پلەیەك، کە چوینە ئەو ژوورەی بۆمان دانرابوو، ئەمەندە پاك و پوختەو فێنك بوو، ئێمەش زۆر ماندوو بووین، نوستین تا دوای نیوەڕۆ. ئینجا هاتینە خوارەوەو نانمان خوارد و چووین بەپێ بەشارەکەدا گەڕاین، بەڵام کلیلی ژورەکەمان نەدایەوە بە خاوەن ئوتێلەکە، چونکە جانتاکەی دایکی محەمەد

(٢٠٠٠) دۆلاری تێدابوو، لەسەر مێزی ژوورەکە دامانابوو، لامان وابوو ئیتر کلیلی تر نیە ئەو دەرگایەی پێ بکرێتەوە.

کاتێك گەڕاینەوە ناو ژورەکە، دەبینین شت و مەکی ناو ژورەکە هەمووی گۆڕاوە، جانتای سەر مێزەکە بەرزکراوەتەوەو ژێرەکەی سڕاوەتەوەو دانراوەتەوە، بە گورجی دەستمان دایە جانتاکەو ترس چووە دڵمان کە ئەو کەسەی هاتوەتە ئێرە پارەکەی دەرهێناوەو بردویەتی، کە پارەکەمان ژمارد وەکو خۆی بوو، ئەگەر ئەو کەسە سەد دۆلاریشی ببردبایە ئێمە گومانی ئەوەمان دەکرد کە لە حسابدا بە هەڵەداچووین.

ئەمە لەکاتێکدا بوو کە ئەو ژن و پیاوانەی لەو ئوتێلە کاریان دەکرد، موچەی ساڵانەیان نەدەگەیشتە (٣٠٠ زەلوتی) کە پارەی ئەوانە، (١٠٠) دۆلار کە لە بازاڕی رەش دەمانگۆڕیەوە (٣٦٠٠) زەلوتیان پێدەدایین.

لەو کاتەدا بەراوردێکم کرد لەنێوان دەستپاکی و رەوشتی ئەم گاورە شیوعیانەو لەگەڵ ئەو کرێکارانەی کە لە ئوتێلەکەی قاهیرە بە چەقۆ لەژێرەوە باوڵەکەیان دڕیبوو، چوار کیلۆ چای تیادابوو دزیبوویان، کە میسر کانگای ئیسلامەو هەموو وڵاتان لە زانیاری موسڵمانەکانی ئەوان فێری ئایینی ئیسلام دەبن.

راستە ئیسلامی راستەقینە مرۆڤ پاك دەکاتەوەو دەیکات بە ئاڵتون، بەڵام بەداخەوە ئەو جۆرە موسڵمانە لەناو ئیسلامدا زۆر کەمە، بەڵام ئەو گاورانە کە لە منداڵیەوە فێری رەوشتی راستی کراون، کە گەورەش بوون لەسەر ئەو رەوشتە دەمێننەوە، لەبەر ئەوەیە خوالێخۆشبوو (محمد عبده) دەڵێت: (وجدت الإسلام في أوروبا ولم أجد المسلمين، وأجد المسلمين في عالمنا العربي ولا أجد الإسلام).

# (زاکرینا)ی پزیشک

بەیانیان دادەبەزینە نهۆمی خوارەوە کە چێشتخانە بوو، نانخوادنی بەیانی لەسەر ئوتێلەکە بوو، هەردەم بەلای کەمەوە چوار جۆر خواردەمەنییان دادەنا، جگە لە ساردی و کوپێك چایی.

لەپاش نانخواردنی بەیانی، وەکو نەدی و بدی دەکەوتینە ناو ئەو گوڵ و گوڵزارانەی لەو شارە جوانە هەبوون، تا نیوەڕۆ بەپێ دەگەڕاین، چونکە تەماشاکردنی ئەو دیمەنانە زیاتر سودی هەبوو کە مرۆڤ بەپێ ڕێی بکردابە، زیاتر لەوەی کە بە ئۆتۆمبێل یان بەهۆیەکی تر.

سێ چوار جۆر هاتوچۆ هەبوو لە شارەکەدا، یەکێك لەوانە شەمەندەفەری ناوشار بوو، کە پێی دەوترێت (میترۆ)، لە هەر شوێنێکدا بوەستایە بۆ چاوەڕوانی هۆی هاتوچۆ، پێنج دەقیقە زیاتر چاوەڕێت نەدەکرد، بەڵام ئێمە زیاتر پێمان خۆشبوو بەپێ بگەڕێین.

بەهۆی ئەو گەڕانە زۆرە، دایکی محەممەد توشی ئازاری ئەژنۆکانی بوو، کە لەوەوپێش لەگەڵیدابوو، وای لێهات نەیدەتوانی بەپێ هاتوچۆ بکات، منیش بە خاوەن ئوتێلەکەم وت نزیکترین نەخۆشخانە لە کوێیە، کارتێکی پێدام کە نەخشەی ئەو نەخۆشخانەیەو ڕۆشتن بۆی تیادا دیاری کرابوو، نەخۆشخانەکە زیاتر لە سێ کیلۆمەتر دوور نەبوو لە ئوتێلەکە.

کە دایکی محەممەدم برد بۆ نەخۆشخاەکە، هەرچەندم کرد نەمتوانی بەزمانی خۆیان تێیان بگەیەنم کە ئێمە بۆچی هاتووین بۆ ئەم نەخۆشخانەیە، لەوکاتەدا

ئافرەتێك پەیدابوو بەناوی (دکتۆرە زاکرینا)، ئەم ئافرەتە کە پزیشك بوو لەو نەخۆشخانەیەدا، ئینگلیزی باش دەزانی، لەو ڕێگەیەوە توانیمان تێیان بگەیەنین کە بۆ چ مەبەستێك هاتووین.

شایانی باسە کە ئێمە ڕۆشتینە ئەم نەخۆشخانەیە، دیمان تەنها سێ پیاوی پیر لەوێ هاتبوون بۆ ئەو نەخۆشخانەیە بۆ چارەسەرکردنی ناساغیەکەیان. چونکە لەوێ ژیان ئەوەندە ڕێکوپێکەو ئاوو هەواکەی ئەوەندە خۆشە هەر کەسێ دەبینیت لە ژن و پیاو لە گەورەو بچوك، دەڵێی بوکەشوشەن تازە لە قتوەکەی هاتوەتە دەرەوە.

پاك و پوختی ئەو شارە بەجۆرێکە، ئەگەر کراسێك لەبەر بکەیت بە مانگێك چڵکن نابێت، چونکە نە تۆز و خۆڵ هەیە و نە ئارەق کردنەوەی لەش هەیە، هەروەها ئەگەر پێڵاوێك بۆیاخ بکەیت، بە پازدەڕۆژ تۆز نایگرێت، چونکە تۆز نیە، خۆڵ و با نیە تا مرۆڤ جل و بەرگ و پێڵاوی چڵکن ببێت. نە مێش هەیە نە مێشوولە.

بەیانییەك لە ئوتێلەکە نانمان دەخوارد، یەك مێش کەوتە بەرچاوم، وتم ئەم مێشە عێراقییە، بزانە چ عێراقییەك هاتووە بۆ ئێرەو ئەم مێشەی لەگەڵ خۆی هێناوە، چونکە یەك مانگ لێرەبووین لە هیچ شوێنێکدا چاوم بە مێش نەکەوت و هەستم بە بوونی مێشولەیەك نەکردووە.

بەکورتی ئەمە بەهەشتێکە لە ڕوی دونیا.

بگەڕێینەوە سەر نەخۆشخانەکە، (زاکرینا) بەگورجی ئەشیعەی گرت بۆ دایکی محەمەد و دەرمانی بۆ نووسی، ئینجا منیش بە ئینگلیزی پێم وت دەمانەوێت هەموو شارەکانی پۆڵۆنیا بگەڕێین، ئافرەتێکمان دەوێت کە زمانی ئینگلیزی یان عەرەبی بزانێت هەرچییەکی بوێت دەیدەینێ. ئەویش وتی: من مۆڵەت وەردەگرم لە نەخۆشخانە بۆ ماوەی (٢٠) ڕۆژ لەگەڵتان دێم.

ئینجا لەگەڵمان هاتەوە بۆ ئوتێلەکە، ژوورەکەی ئێمەی دی کە لەکوێیە، نانی نیوەڕۆمان پێکەوە خوارد، پێم وت: سبەینێ ئیشێکم هەیە تەواوی دەکەم دووسبەی دەست دەکەین بە گەڕان.

ڕۆژی دوایی چووم بۆ (ملحق الثقافي العراقي) بۆ ئەوەی قبوڵ وەربگرم بۆ ئەسعەد و شاهۆ کە خوێندن لەوێ تەواو بکەن، هەموو پێویستییەکم لەگەڵ خۆم بردبوو، زۆر ڕێزیان لێگرتم، بەڵام وتیان: ناتوانین، چونکە ئێستا جەنگ هەیە لەنێوان عێراق و ئێراندا، ئەم منداڵانەی تۆ لەم تەمەنەدا نابێت لەعێراق بچنە دەرەوە بۆ هیچ مەبەستێك.

پاش ئەوەی لەوێ نائومێد بووم، نامەیەکم هێنابوو لەعێراقەوە بۆ کارگێڕێك لە سەفارەتی عێراق، ئیتر نازانم ئەو نامەیە چی تێدابوو، بەڵام لەسەرم پێویست بوو بچم بیگەیەنم بەو کەسە، کاتێك چووم دەرگای سەفارەتەکە داخرابوو، لەبەر جەنگی عێراق و ئێران وردبینیان زۆر دەکرد، دەرگاکەیان بۆ نەدەکردمەوە، منیش لەو کاتەدا کە چاوەڕوانیم دەرکرد ئەو پیاوە بێت نامەکەی بدەمێ، دیم سەفیری عێراق هاتە بەردەرگاکە، لەوێ دابەزی، کاتێك دەرگاکەیان بۆ دەکردەوە تەماشای منی کرد، هەڵمەتی داو هات بۆ لام، باوەشی پیاداکردم، ئەملاو ئەولای ماچ کردم، وتی: من قوتابی تۆ بووم لە کۆلیجی یاسای عێراق، لە پۆلی یەك و چوار دەرست بەمن وتووە، بردمیە ژوورەوەو وتی: ئیش و کارێکت نیە؟

وتم: ئیشی منداڵەکانم هەبوو بۆ قبوڵ، بەڵام ملحقی سەقافی ڕازی نەبوون.

تەلەفۆنەکەی هەڵگرت وتی: (استاذ درويش)، ملحقەکە ناوی (دەروێش) بوو، وتی: ئەو دوو کوڕەی مستەفا زەڵمی، دایان بنێ کە برازای منن و لەسەر بەرپرسیارێتی من ڕەزامەندییان بۆ وەربگرە.

ئینجا وتی: پاش دوو هەفتە سەرمان لێبدەرەوەو ڕەزامەندیەکە وەربگرە و لەگەڵ خۆت بیبەرەوە.

منیش زۆر سوپاسم کرد و ماڵئاواییم لێکرد.

بۆ ڕۆژی دوایی (دکتۆرە زاکرینا) بەیانی زوو هات بۆ لامان، نانی بەیانیمان خوارد، پارەی ئوتێلەکەمان دا، بردینی بۆ شارێکی گەشتیاری، لە هەمان کاتدا مێژوویی بوو، بەناوی (زاکۆپانا)، جێگەقەبری مەلیکە کۆنەکانی ئەو وڵاتەی لێبوو.

ڕۆشتین لە ئوتێلێکی گەشتیاری، لە قەراغی شار لەناو باخێکدا بوو، حەوت ڕۆژ ماینەوە، لەگەڵ شوفێرێك ڕێکەوتین هەموو بەیانییەك کاتژمێر (٩) بێت بە دواماندا و بمانبات بۆ کوێستانەکان، لە ماوەی ئەو حەوت ڕۆژەدا ئەم شوفێرە نە دوو دەقیقە دواکەوت، نە دوو دەقیقەش پێش دەکەوت، بەیانیان کاتژمێر (٩) لەبەردەم ئوتێلەکە رادەوەستا، ئێمەش لە پەنجەرەی ئوتێلەکەوە سەیرمان دەکرد و دەهاتینە خوارەوە.

کەچی لە عێراق و هاوشێوەکانی، زۆر بە دەگمەن دەبینیت یەکێك بەڵێنت بداتێ بۆ کاتێکی دیاریکراو، لەوکاتەدا بەڵێنەکەی بەجێ بهێنێت. زۆرجار لە فڕۆکەخانەی (صدام) لە بەغدا دەیانوت فڕۆکەکە لەکاتی ئەوەندە دەڕوات یان دەگاتە فڕۆکەخانە، کەچی بەلای کەمەوە سێ چوار کاتژمێر چاوەڕوانیت دەکرد. ئەگەر لە فەرمانگەیەك کۆبونەوەیەك هەبێت و کاتی بۆ دیاری بکرێت، کاربەدەستی ئەو کۆبونەوەیە بەلای کەمەوە نیو کاتژمێر دوادەکەوێت.

هۆی دواکەوتنی وڵاتە موسڵمانەکان زیاتر ئەوەیە ڕێکخستنێك نیە ژیانیان ڕێکبخات لەهەموو رویەکەوە، نەك تەنها لەرووی کاتەوە.

دانیشتوانی ئەمریکا و یابان و ئەڵمانیا و ئینگلیز لە کورد و عەرەب و فارس و گەلانی تری جیهانی سێیەم زیرەکتر نین، بەڵام ئەوان ژیانی خۆیان ڕێکخستووە بۆیە پێشکەوتوون.

لەماوەی یەك مانگ لە پۆڵۆنیا بووین، هەشت کاتژمێر کاتیان بۆ کارکردن بوو، هەشت کاتژمێر بۆ خەوتن، هەشت کاتژمێر بۆ رابواردن، هەموو ڕۆژێکی شەممەو یەکشەممە پشوو بوو، دانیشتوانی ئەو دەوڵەتانە کە سەر بە یەکێتی سۆڤیەتی بوون، بەبێ پەساپۆرت و ناسنامە، بە شەمەندەفەر دەچوون بۆ دەوڵەتەکانی تری سەر بە یەکێتی سۆڤیەت. کەچی لە بەغدا یەکێك بچێت بۆ سلێمانی، لە دە جێگا لە ئۆتۆمبێل دایدەبەزێنن و پشکنینی بۆ دەکەن و باجێکی لێ وەردەگرن ئینجا ڕێگەی دەدەن بڕوات.

لە شاری (زاکۆپانا) ڕۆژانە لە ئوتێلەکە دەردەچوین و دەچوین بۆ ناو کوێستانەکان، ئەوسا مانگی هەشت بوو، کە گەرمترین مانگەکانی هاوینە لە عێراق، دەچوینە ناو شاخەکانەوە، هەمویان تازە خاڵ خاڵ بووبوون، هارەی بەفراو دەهات، زۆر زەریا هەبون لەناو قوڵایی شاخەکاندا کە هەمووی لە ئاوی ئەو بەفرە پێکهاتبوون.

لەپاش ئەو حەوت ڕۆژە بردینی بۆ شاری (کدانگز) کە لەسەر زەریای بەلتیقە، شارێکە بەدرێژایی کەناری زەریاکە باڵەخانە دروستکراوە، چونکە لەوێ ژیان هەر لەناو ئەو باڵەخانانەدایە. هەر کەسێك لە بەڵکۆنەی ژورەکەی خۆیدا گوڵی ڕواندبوو، بەسەر دیوارەکاندا، بەڕووی ماڵەکاندا هاتبووە خوارەوە، کاتێك سەیری ئەو باڵەخانانەت دەکرد دەتوت ئەوانە روەکەیان هەمووی یەك پارچە گوڵن.

پاشان چوین بۆ باخچەی ئاژەڵان، ئەمە سروشتی بوو، پێنج دۆڵ هاتبوونە سەر دەشتاییەك، هەمووی درەختی سنەوبەر بوو، ئاژەڵەکان هەمویان لەناو ئەو دارانەدا بڵاوبوبونەوە، بەڵام دەورەکەیان گیرابوو بەجۆرێکی وەها، نەیاندەتوانی بێنە دەرەوە.

باخچەیەکی گوڵ لەبەردەمی ئەو شوێنەدا بوو، گوڵێکی زۆر جوانی تیادابوو، سەرنجی ڕاکێشام، منیش سەرم دانەواند و گوڵێکم پچڕاند بۆ تۆوەکەی، کە لەگەڵ خۆم بیبەمەوە بۆ عێراق، (زاکرینا) لەدواوە توند ملی گرتم، وتی: ئەوە چی دەکەیت؟

وتم: ئەم گوڵە بۆ تۆوەکەی لێمکردەوە.

وتی: ئەوە موڵکی هەموو گەلە، تۆ چۆن دەتوانی کاری وەها بکەیت.

وەکو پیاوێکم کوشتبێت بە ناهەق، ئەو ژنە وەهابوو.

لە وڵاتی ئێمەش، کاتێك ئینگلیز نەخۆشخانەی ڕەشیدی بەجێ هێشت، کە هەمووی بە باخچەی جوان ڕازابووەوە، هەرچی درەختی تیادابوو ئەفسەرەکان هەموویان دزی و بردیان بۆ ماڵەکانی خۆیان.

لەشەڕی نێوان عێراق و ئێراندا ئەفسەرەکان بە هەزاران دارخورمایان هەڵدەکەند و دەیانبرد بۆ ماڵی خۆیان.

ئێمەی گەلی عێراق کە خۆمان بە موسڵمان دەزانین، ئەگەر هەلمان بۆ هەڵبکەوێت بۆ دزینی سامانی دەوڵەت، بەهیچ جۆر بەناڕەوای نازانین.

لەپاش ئەو شارە، زاکرینا بە شەمەندەفەر بردینی بۆ ئەو شارەی مۆزەخانەی کوژراوەکانی پۆڵۆنیای تیادایە، کە لەکاتی خۆیدا ئەڵمانیای نازی لەناوی بردوون. کاتێك گەیشتینە دەرگای مۆزەخانەکە، هەرچەندم کرد خۆم پێ نەدەگیرا، فرمێسك خوڕخوڕ بەچاومدا دەهات، کە ئەو کارەساتەم دی، بە هەزاران کەللەسەری ئافرەت بە قژە زەردەکانیانەوە دانرابوون. بەسەدان پیاویان خستبووە ناو (فرن - محرقة)ەوە، هەروەکو چۆن نان دەکەیتە تەنورەوە، بۆ سوتاندنی دانیشتوانی ئەو وڵاتە، بە سەدان پەیکەری ئەوانە کرابوون کە بە زیندوویی خوێنەکەیان لێ دەگرتن.

یەکێك ئەو کارەساتە ببینێ دەزانێت دڕندەیی و دڵڕەقی ئادەمیزاد تا چ ڕادەیەکە، ئادەمیزاد ئەگەر ترسی یاسا و خوای لەدەڵدا نەبێت، لە هەموو دڕندەیەکی ئاژەڵ خراپترە بەرامبەر یەکتر.

پاشان گەڕاینەوە بۆ وارشۆ، چوم بە سەر دەمی ڕەزامەندی منداڵەکانەوە، چومەوە لای سەفیر، پێی وتم: هێشتا ڕەزامەندیەکە نەهاتووە، هی ئەوانیش و هی قوتابیەکانی تری عێراقیش. بڕۆ، بە بروسکە قبوڵەکەت بۆ دەنێرم.

کە گەڕامەوە بۆ عێراق، پاش پێنج ڕۆژ ڕەزامەندیەکەم وەرگرت، بردم بۆ سکرتێری وەزیری بەرگری (عدنان خیرالله)، ئەو سکرتێرە ماستەری دەخوێند و منیش سەرپەرشتیاری ماستەرەکەی بووم. دواتر وەزیر ناردی بەدوامدا، منیش چووم، پێی وتم: ئەو دوو کوڕەی تۆ ئێستا سەربازن، من ناتوانم تەسریحیان بکەم، ئەوە هەر دەسەڵاتی سەرۆك کۆمارە، بەڵام دایان دەنێم بە برازای خۆم، هەر ڕۆژێك شەڕ وەستا، کارەکەت بۆ جێبەجێ دەکەم.

بەڵام بەداخەوە، شەڕ هەشتساڵی خایاند و خوێندنی منداڵەکانیشم دواکەوت، ئەوەبوو دوای تەواوبوونی شەڕ خوێندنیان تەواوکرد.

## سەردانی ئەستەنبول

لەساڵی ١٩٨١ لەگەڵ دایکی محەمەد بیتاقەی فڕۆکەمان کڕی و چووین بۆ ئەستەمبول. لە ئوتێلێکی دەرەجە یەك دابەزین، کە پێی دەوترا (ئیتاب اوتیل) ئەم ئوتێلە (٢٠) قات بوو، قاتی (١٩) مەلەوانگە بوو، بەجۆرێکی وا بناغەکەی لە بناغەی ئوتێلەکەوە داڕژرابوو، کە ئەو گۆمە گەورەیەی لەسەر دروست کرابوو بە هەرچۆنێك بیرت لێ ئەکردەوە جێی سەرسامی بوو، سەربانی قاتی (٢٠)ەم هەمووی کرابوو بە گوڵ و گوڵزار، کاتێك ئەچوویتە نێو ئەوگوڵانەوە، ئەتووت پارچەیەکە لە بەهەشت لەرووی دنیادا، بەتایبەتی بەشەوا، هەموو شاری ئەستەنبول دیاربوو، هەمووی بەهۆی گڵۆپەکانی کارەبا هەموو شوێنەکانی شارەکە دیاربوو، بەشێوەیەکی زۆر جوان، بەتایبەتی دەریای (مەڕمەڕە) شارەکەی کردبوو بە دوو کەرتەوە، باکوری شارەکە بەشێکە لە ئەوروپا و باشوری شارەکە (ئەوبەری دەریاکە) بەشێکە لە ئاسیا، واتە یەك شار نیوەی ئەوروپایەو نیوەی ئاسیایە، ئەم دوو لایە بە پردێکی زۆر دووردورێژەوە پەیوەند کراون بە یەکترەوە.

ئێمە لە قاتی (٧) بووین، هەموو جار دائەبەزیم بۆ قاتی ژێرەوە کە جێگەی نان خواردن بوو، لای چایچیەکان (ترمۆز)ی چاکەم پڕ ئەکرد لە ئاوی گەرم، هەمووجار بە سێ قات پارەی لێ ئەسەندم ئینجا ئاوی ئەدامێ.

رۆژێك چووم بۆ ئاوی گەرم، هەندێك لە چایچیەکان بەکوردی قسەیان دەکرد، منیش پێم وتن منیش کوردی عێراقم، یەکێکیان هات بەلامەوەو ماچی کردم، وتی: هەموو رۆژێك خۆم ئاوە گەرمەکەتان بۆ دێنم، بەس کاتێکم بۆ

دیاری بکە، تۆ هەتا لەم ئوتێلە بیت ئامادەم بۆ هەموو خزمەتێکت بەگیان و بەدڵ.

ئەم کوردانەی تورکیا لەگەڵ ئەوەش یاسای ئەم دەوڵەتە ڕەگەزپەرستە قەدەغەی کردووە لەسەر هەموو کەسێك کە بەکوردی قسە بکات، لەگەڵ ئەوەش لەوێدا کوردێك نیە لەگەڵ کوردێکدا بە تورکی قسە بکات، بەڵام بەداخەوە دانیشتوانی هەولێر و سلێمانی کە دێنە بەغدا، زۆریان لە ماڵەوەش بە عەرەبی قسە ئەکەن، بەجۆرێکی وا ئەو منداڵەی لە بەغدا لەدایك ئەبێت کوردی نازانێت.

بۆ نمونە ڕۆژێك چووم بۆ ماڵی کاك (ی. چ)، نۆ منداڵی هەبوو، یەکێکیان کوردی نەدەزانی، لەگەڵ ئەوەش ئەم برادەرە لەکاتی خۆی پێشمەرگە بووەو کوردایەتی کردووە لەگەڵ کۆمەڵە، کاتێك خوالێخۆشبوو قازی محەمەد پێشەواو سەرۆکی دەوڵەتی کوردی بوو لە مەهاباد.

منیش بۆ ئەم برادەرەم گێڕایەوە، وتم: خوالێخۆشبووی باوکت جارێك بۆی گێڕامەوە، وتی: کاتێك میجەرسۆن حوکمڕانی سلێمانی بوو، پیاوێکی هەبوو ناوی حەمەبۆر بوو، هەموو جارێك کە ئەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە سەگێکی هەبوو، حەمە ئەیگرت بەباوەشیەوە، ئینجا ئەچوو دەرگاکەی بۆ ئەکردەوە. ڕۆژێك میجەرسۆن پێی ئەڵێت: حەمە، بەسیەتی ئەوەندە دەست مەهێنە بەسەر پشتی سەگەکەدا، بەخوا بچیتە نێو قنی ئەم سەگەشەوە نابیت بە ئینگلیز.

ئینجا وتم: کاکەگیان، منداڵەکان هیچیان کوردی نازانن، بەخوا هەرچی کوردێك خۆی و ماڵ و منداڵی کە بە عەرەبی قسە دەکەن لە ماڵەوە بچنە ناو قنی (قەحتان و عەدنان)ەوە کە باپیرەگەورەی عەرەبەکانە نابن بە عەرەب.

## باخچە دۆڵمە

ڕۆژێك پێیان وتین باخچە دۆڵمە شوێنێکی گەشتیاریی زۆر جوانە، کۆشکەکەی سوڵتان عەبدولحەمید لەنێو ئەم باخەداو لەسەر روبارێکی گەورەیە، کراوە بە مۆزەخانە. ئێمەش ڕۆژێك لەپاش نانخواردنی بەیانی ڕۆشتین بۆ ئەم شوێنە، کە لە نێو شاری ئەستەنبوڵدایە.



کاتێك چوینە باخچەی کۆشکەکە، بەجۆرێك دروستکرابوو، مرۆڤ سەری سوڕئەما لەو هونەرەی کە ئەو جێگەیەی بەو جۆرە رازاندۆتەوە، کە ساڵ لەپاش ساڵ هەروەکو خۆی ماوەتەوە، لە زۆر شوێن پەیکەری شێر و ئاژەڵی تر کرابوو، جۆرە درەختێکی تیابوو من لەماوەی ژیانما درەختی وام نەدیوە.

کاتێك چووینە نێو کۆشکەکەوە وێنەی سوڵتان عەبدولحەمید و ژنەکەی هەڵواسرابوون، بەجۆرێك ئەم کۆشکە ڕازابووەوە بەبەردی (مەڕمەڕ) و ئەو

نیگارەی بۆی کێشرابوو، ئەو ژورانە کە دروستکرابوون بەجۆرێك هیچ ئەندازیارێکی ئەمڕۆ باوەڕ ناکەم نەخشەی وا بکێشێ.

درێژەی نەدەمێ، گەڕانی ناو کۆشکەکە بەتەنیا یەك کاتژمێری برد.

لێرە بیرم لەوە کردەوە کە ئەمە خۆی بە خەلیفەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) داناوە، سەرۆکی ئیمبراتۆریەتی عوسمانی بووە، کە چەند دەوڵەتی ئیسلامی وەکو عێراق لەژێر حوکمڕانی ئەودا بووە. لەگەڵ ئەم مەسئولیەتە گەورەدا هەردەم بیری لەوە کردۆتەوە چ کەنیزەکێك جوان بێت شەو سەمای بۆ بکات یان گۆرانی بۆ بڵێت، چ بەردە مەرمەڕێك جوان بێت بیهێنێت بیخاتە ناو کۆشکەکەوە، چ شێرێك یان ئاژەڵی تری دڕندەی نایاب هەبێت لەجیهان بیهێنێت بیخاتە ناو باخچەکەیەوە.

خەلیفەکانی عوسمانی لەگەڵ خەلیفەکانی عەباسی و ئەمەوی زۆریان بیریان لەم جۆرە شتانە ئەکردەوە لەکاتی حوکمڕانی دەوڵەتی ئیسلامدا، کەچی سەرۆکانی وڵاتانی ئەوروپا هەمووی بیریان لەوە کردۆتەوە چۆن وڵاتەکەیان پێش بخەن لە پیشەسازی و زانیاری و تەکنەلۆژیا و بابەتەکانی تری شارستانیەوە.

هەر بەو جۆرە وڵاتە نائیسلامیەکان پێشکەوتن لە هەموو پیشەسازیەکدا بۆ وڵاتە ئیسلامەکان هەموو دواکەوتن و بوونە ژێردەستەی ئەوان و هەرچی بەرهەمی وڵاتە ئیسلامیەکانە (ئینگلیز و ئەمریکا و روس) سودی لێ وەردەگرن، هەتا ئینگلیز نەهاتە عێراق بە کەرکوکیان دەوت (باباگوڕگوڕ)، وایان ئەزانی ئاگری نەوتەکە (شەخس)ەو جێگە نەزرگەی پیاوی خوایە، ژنێك منداڵی نەبوایە ئەچووە سەری، داوای منداڵی لێ ئەکرد، یەکێك نەخۆش بوایە ئەچوو داوای شیفاو چاك بوونەوەی لێ ئەکرد.

هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو بە ئیمبراتۆربەتی عوسمانییان ئەوت (پیاوە نەخۆشەکە)، ئەمەش لەبەر دواکەوتن و نەزانین و بەخت کردنی کاتی خۆیان لەگەڵ کەنیزەك و دروستکردنی کۆشکی جوان و کۆکردنەوەی ئاژەڵی دڕندە.

خەلیفەکانی عوسمانی، لەبەر ئەوەی خەریکی ئەم جۆرە شتانە بوون، زەویەکانی دەوڵەتە ئیسلامیەکانیان دابەش کردبوو بەسەر ئەو پیاوانەی کە بە دەسەڵات بوون لەبەر شێخایەتی یان ئاغایەتی، بۆ خاتری ئەوەی حوکمەکە ڕابگرن و ڕێگە نەدەن ئاژاوە بەرپا ببێ لەدژی حوکمی ئەوان.

بۆ نمونە عوسمانیەکان لە شارەزوورەوە تاکو حەمرین هەرچی زەوی و زاری دێم و بەراو بوو، دای بە مەحمود پاشا لە هەڵەبجە، بۆ ئەوەی ئیدارەو کاروباری ئەوان جێبەجێ بکات لەو شوێنانە کە ئەکەوتنە ژێر حوکمڕانی ئەوەوە، هەروەها بە سەدانی وەك مەحمود پاشا زەوی کوردستانیان بەسەردا دابەشکرا، بۆیە ئەوانیش بەرامبەر بەوە بەگیان و بەدڵ خزمەتی عوسمانیەکانیان دەکرد، ڕۆژێك لەڕۆژان بیریان لە نەتەوەی خۆیان نەدەکردەوە، هەتا کاتێك کە (بەعس) هاتە سەر حوکم لەساڵی ١٩٦٨، هەرچی زەویی جافەکان بوو لێی سەندن و دابەشی کرد بەسەر عەرەبەکاندا لە (خزرئاباد) و (جەلەولا) و (خانەقین) و شوێنەکانی تر.

هەروەها خەلیفەکانی دەوڵەتی عوسمانی هەر ڕۆژێك یەکێك لە کوردەکانی ئەکرد بە پاشاو ئیدارەی شارەکەی دەخستە بەردەست وەك بابانەکان، هەریەکێ لەو پاشایانە ئەگەر بەگیان و بەدڵ خزمەتکاری دەوڵەتی عوسمانی نەبووایە، بەبرای یان ئامۆزای خۆی دەیانکوشت، یان دەربەدەریان دەکرد و برا یان ئامۆزاکەیان لەجێگەی دائەنا. مێژوو بەدرێژی باسی ئەمانەی کردووە کە چۆن کورد لە هەموو هەلێکدا هەر خەریکی بەرژەوەندی خۆی و کەس و کارەکەی بووە، یان ئەگەر حوکمڕانی کردبێ تەنیا بیری لە شارەکەی خۆی کردۆتەوە، ڕۆژێك لەڕۆژان بیری لە کوردستانی گەورە نەکردۆتەوە.

بەهەمان شێوە لەسەردەمی ڕژێمی بەعس، لەکاتی شەڕی سوپای عێراق لەگەڵ کوردەکاندا، موستەشارەکان هەمان دەوریان ئەبینی کە لەکاتی خۆی ئاغاکانی کوردستانی سەردەمی عوسمانی ئەیانبینی بۆ داگیرکردنی زەوی و زاری ئەو ناوچەیەی کە ئەیانپاراست بۆ خزمەتی ڕژێم.

## مۆزەخانەکەی ئەستەنبوڵ

ڕۆژێك ڕۆشتین بۆ مۆزەخانەی ئەستەنبوڵ، کە هەمووی بریتیی بوو لە شمشێری دەسك ئاڵتون و جل و بەرگی خەلیفە کۆنەکان و، شتی نایابی تیابوو، بەتایبەتی هەموو شتەکان لە ئاڵتون دروست کرابوون، نمونەیەك بۆ ئەو شتانە:

(جبە)یەکی تیابوو ئەیانوت هی پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم)، دیارە ئەم وتەیە ڕاست نیە، چونکە جبە و مێزەر و عەبای ئافرەت لە زەمانی عەباسیەکاندا هاتە ناو ئیسلامەوە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کە لەناو یارەکانیدا دائەنیشت، ئەگەر کەسێك بهاتایە بۆ لای و لەوەپێش ئەوی نەدیبێت، ڕادەوەستاو تەماشای دانیشتوەکانی دەکرد و دەیوت: (أیکم محمد) واتە کامتان محەمەدە؟ لەبەر ئەوە چونکە پێغەمبەر وەکو شێخەکان بەرماڵێکیان بۆ ڕانەدەخست و دوو پشتی لە پشتی و خەرقەیەك لەبەرکاو مێزەرێك بە پشتی و یەکێ بەسەریەوەو یەکێك لەملی، یان وەکو خەلیفەکانی عوسمانی و عەباسی و ئەمەوی، خۆی برازێنێتەوە بە جلی جوان و لەسەر کورسییەك دابنیشێ ئەم و ئەو بچن کڕنۆشی بۆ ببەن، بەڵکو پێغەمبەر وەکو مرۆڤێکی ئاسایی دادەنیشت لەنێو یارەکانی و جل و بەرگی هیچ جیاوازی نەبوو لەگەڵ ئەوانی تردا، هیچ نیشانەیەکی وەهای هەڵنەئەگرت کە جیاوازی هەبێت لەگەڵ دانیشتوانی ئەو شوێنەدا.



## مزگەوتی ئەیا سۆفیا

ئەم مزگەوتە لەکاتی خۆیدا پێش ئیسلام کەنیسە بووە، لام وایە کۆنترین بینایە کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا وەکو خۆی مابێت، مرۆڤ کە ئەچێتە ناوی سەری سوڕئەمێنێ، هێشتا وێنەکانی مریەمی دایکی عیسا هەر بەدیوار و بنمیچەکاندا سەر و شوێنیان ماوە، نزیکەی نیو ملیۆن کەس ئەتوانێت نوێژی تیابکات، لام وایە سێ دەرگای هەیە بۆ چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوە.

ئەگێڕنەوە ئەڵێن لەکاتی خۆی (ئیبن حاجب) کە زانایەکی گەورەی زۆر زیرەك و بلیمەتی کورد بووە لەکاتی عوسمانیەکاندا نازانم لەسەردەمی چ خەلیفەیەکدا بووە، هێرشی بردۆتە سەر ئەو خەلیفەیەو وتویەتی ئەم پاشایە خەلیفەی پێغەمبەر نیە، چونکە ڕەوشتەکانی ژیانی ناچێتەوە سەر ڕەوشت و ژیانی پێغەمبەر، ئەویش فەرمان ئەدات بە بەندکردنی، ئەویش دیارنامێنێت و خۆی ئەشارێتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەچێت بۆ نوێژی هەینی، زۆر ئەگەڕێن بەدوایدا نایدۆزنەوە، پیاوێکی ژیر بە سوڵتان ئەڵێت: من ڕێگەیەکت پیشان دەدەم بۆ دۆزینەوەی ئیبن حاجب، ئەم پیاوە هەموو ڕۆژێکی هەینی



مزگەوتی ئەیا سۆفیا

ئەچێت بۆ نوێژ، تۆ لە هەر دەرگایەك پیاوێك دابنێ و سوزنێکی بدە بە دەستەوە و فەرمان بدە کە یەکەیەکە نوێژکەرەکان بێنە دەرەوە، هەریەکێ دێتە دەرەوە سوزن بەدەستەکە سوزنەکەی پیشان بدات و پرسیاری لێ بکات بڵێ ئەمە چیە؟ ئەگەر وتی سوزنە، ئەوە هیچ، ئەگەر سوزنەکەی وەرگرت و لێی کۆڵیەوە، باسێکی دوورودرێژی کرد، ئەوە ئیبن حاجبە، چونکە ئەوەندە زانایەکی ورد و تێگەیشتووە، هەرشتێکی زۆر ئاسانیشی لێ بپرسین وا قوڵی ئەکاتەوە مرۆڤ سەرسام ئەمێنێت. ئەڵێن بەم جۆرە ئیبن حاجبیان دۆزیەوە، لە یەکێك لە دەرگاکانی (ئایا سۆفیا)، کە بەدوورودرێژی باسی سوزنەکەی کرد و گرتیان و بردیان بۆ لای خەلیفە.





ڤـارنـا

## ڤارنا، شاره جوانەکەی بولغاریا

ڤارنا شارێکی زۆر جوانی گەشتیارییە لە بولغاریا، کەوتۆتە سەر زەریای رەش، لە ئەستەنبولەوە بە ئۆتۆمبێل ١١ کاتژمێر دووره.

بەیانی لە ئەستەنبول دەرچوین، کاتێك گەیشتینە سنوری بولغاریا، پێنج دەقیقە لە سنور دوانەکەوتین، کاتێك داخلی بولغاریا بووین هەتا گەشتینە ڤارنا، ئەو شوێنەی دەشتیایی بوو، ئەمبەر و ئەوبەری جادەکە هەمووی باخە هەرمێ و باخەسێو و باخە هەڵوژە و باخە قۆخ بوو، لە دەشتاییەکە دەرچوین کەوتینە ناو شاخ و دۆڵەوە، ئەمبەرو ئەوبەر تا چاو بڕەکا ترێ بوو، درەختی ترێکە لە مەتر و نیوێك زیاتر بەرز نەبوو، هەر لقێکی بارێکی گرتبوو، منیش بە شوفێرەکەم وت کە خەڵکی بولغاریا بوو: ئەم هەموو ترێیە چی لێ ئەکەن؟ وتی: هەمووی ئەکەین بە ئارەق و شەراب و ئەیفرۆشین بە وڵاتە موسڵمانەکان.

## بـەلگـراد

لەپاش ئەوەی **٣-٤** رۆژ لە بولغاریا ماینەوە، چوین بۆ بەلگراد لە یۆگسلافیا، لەم سەفەرەدا دوو شتم بەرچاو کەوت، کە ئەمەوێ باسی بکەم:

**١-** لە سنوری نێوانی بولغاریا و یۆغسلافیا لە ئۆتۆمبیلەکە دایان نەبەزاندین، بەس تەماشای پاسەپۆرتیان کرد و مرۆیان پێدەنا هەریەکێ پێنج دەقیقە زیاتر دوایان ئەخستین، کەچی هەر وڵاتێکی عەرەب یان ئیسلامی ئەچێت بۆ وڵاتێکی عەرەب یان ئیسلام لە سنورەکەدا بەلای کەم پێنج کاتژمێر دوات ئەخەن و خەریکی پشکنین دەبن.

**٢-** ئەمبەرو ئەوبەری ئەم رێگەیە هەمووی گوێز بوو، گوێزەکان زۆر بەرز نەبوون، لقەکانیان نزیك بوو لە زەوی، هێندەی گەڵاکان بەریان گرتبوو، هەموو گوێزەکان پێگەیشتبوون، یەك منداڵ یان یەك کەس دەستی نەئەبرد بۆ گوێزێك لێی بکاتەوە. کەچی لەعێراقدا لە ماڵەکەی خۆت، ئەگەر درەختێکی بەردار بەری گرتبێ، هەموو منداڵە وردکەی دراوسێکانت بەبەرد لق و پۆپی ئەشکێنن بۆ ئەوەی بەرەکەی بخەن و بیخۆن. ئەمەش یەکێ ترە لە بەراوردکردن لەناوەندی منداڵی موسڵمانێك کە باش پەروەردە نەکرابێ و لەسەر رەوشتی ئیسلام نەبێت و، لەگەڵ منداڵە گاورێکی شیوعی کە ئەوەندە پەروەردەکردنەکەی بەجێگەو رێگەیە، هەر لە منداڵییەوە هەست بە بەرپرسیاریەتی دەکات. بەداخەوە ئەبوایە شتەکە بە پێچەوانەوە بوایە، چونکە هەروەکو چەندجار باسم کردووە، ئیسلام ئەگەر بەڕاستی بیگری وەکو ئاڵتونی پاڵفتەکراوت لێ ئەکات.

## یۆبێلی زێڕینی دامەزراندنی کۆلیجی یاسا لەعێراق

کۆلێجی یاسا لەعێراق لەساڵی ١٩٠٨، لەکاتی حوکمداری عوسمانیەکان بۆ عێراق دامەزراوە، یەکەم کۆلێژ بووە لە عێراقدا، ئەوکاتە خوێندنەکەی چوار ساڵ و شەش مانگ بووە.

لەساڵی ١٩٧٨ بەبۆنەی تێپەڕبوونی (٧٠) ساڵ بەسەر دانانی ئەم کۆلێجەدا، بڕیاردرا ئاهەنگێکی بۆ بگێڕدرێت و سەرۆکی زانکۆی وڵاتەعەرەبیەکان و بەڕێوەبەرەکانی یاسا بانگ بکرێن بۆ ئەم ئاهەنگە، هەروەها بڕیاردرا شەش مامۆستا هەریەکی باسێکی یاسایی بنوسێت بۆ ئەوەی هەموو باسەکان بکرێن بە گۆڤارێك و لەکاتی ئاهەنگەکەدا بەسەر میوانەکاندا دابەش بکرێت.

راگری کۆلێجی یاسا (د.محمد دوری) پێی وتم: تۆ یەکێکیت لەو شەش مامۆستایە کە دەبێت باسێك بنوسیت لە یاساو ئایینی ئیسلام، بەو مەرجەی نوسینەکەت لەسەر لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی یەکێك لە وتارەکانی سەرۆك کۆمار (صدام حسین) بێت.

منیش پێم وت: ئێستا تەمەنم لە (٦٠) ساڵ زیاترە، تا ئێستا دوڕوویم نەکردووە، بەڕاستم وتوە ڕاست، بە هەڵەم وتووە هەڵە، ئەگەر من لە نووسینی ئەم باسەدا باسی هەڵەی سەرۆکم کرد و منیان خستە ژوورەوە، دەتوانیت قوتارم بکەیت.؟

وتی: وتارەکانی هەڵەیان تیادا نیە.

وتم: هەموو کەسێك لەم جیهانەدا هەڵەی کردووەو هەڵەش دەکات، هیچ کەسێك نیە وەحی بۆ بێتە خوارەوە، هەتا توشی هەڵە نەبێت.

زۆر لەسەر وتەکەی ڕۆشت، منیش ناچاربووم پێم وت: بچۆ یەکێك لە وتارەکانی بێنە، ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی تێدا بێت، یان یەکێك لە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوای تێدا بێت، من سی لاپەڕەی لەسەر دەنووسم.

وتی: ئەوە زۆر ئاسانە.

چوو گەڕا، وتارێکی هێنا بۆم نزیکەی (٧٠) لاپەڕەی قەبارە بچووك دەبوو، پێشکەشی یەکێتی ئافرەتانی کردبوو، لێم وەرگرت و دام بە گەلاوێژی کچم، وتم: بیخوێنەرەوە، لە هەر شوێنێك توشی ئایەتێك یان فەرمودەیەك یان وشەی شەریعەتی ئیسلامی بوویت، دیاری بکە.

کە خوێندیەوە وتی: هیچ کام لەو سیانەی تێدا نیە.

ئەمەش لەبەر ئەوەبوو، چونکە تا ساڵی ١٩٩٠، بەڕێوەبەرەکان لە وتارەکانیاندا باسی ئایینی ئیسلامیان نەدەکرد، بەڵام لەپاش گەمارۆی ئابووری سەر عێراق و ئەو کارەساتانەی بەسەر عێراقدا هات لە ماوەی هەشت ساڵی شەڕدا لەگەڵ ئێران و کارەساتی جەنگی کەنداوی دووەم، کە عێراقی پەنجا ساڵ بردە دواوە، ئەوا هەموویان روویان کردە خوا.

بەداخەوە وڵاتە عەرەبیەکان هەموویان لەسەر ئەم رەوشتە دەڕۆن، لەکاتی تەنگانەدا دەگەڕێتەوە سەر ئیسلام، بەڵام لەکاتێکدا هەست بەهێز و توانای خۆیان بکەن زۆر لە ئایینی ئیسلام دووردەکەونەوە، کەچی دەبوو پێچەوانە بێت، هەروەکو باووباپیریان ئایینی ئیسلامیان بڵاودەکردەوە بەناو هەموو جیهاندا، دەبوایە ئەوانیش پەیڕەوی ئەوانیان بکردایە.

ئینجا هەر ئەم جۆرە کردەوەیە کە دەوڵەتە عەرەبیەکان دوژمنی نێوخۆیان و دوژمنانی ئیسلام بەشی کردوون و ناکۆکی و ناهەمواری پەیدا کردووە لە نێوانیاندا.

بێینەوە سەر نووسینی باسەکە، وتارەکەم بۆ بردەوە، وتم: هیچی تیادا نیە لەوەی کە من داوام کردووە، من ناتوانم لە کۆتایی ژیانمدا ناوی خۆم بخەمە

ناو لیستی ڕەشی مێژووەوە، بە هەموو چاك و خراپێك بڵێم چاکە، یان بە هەموو ڕاست و هەڵەیەك بڵێم ڕاستە.

ئەویش ڕقی هەڵسا لێم بۆ ماوەی هەفتەیەك قسەی لەگەڵ نەدەکردم، منیش ترسم پەیداکرد کە لەسەرم بنووسێ، ئەوسا بە تاوانێکی خراپ بمخەنە زیندانەکانیانەوە، هەرچەندە بیرم دەکردەوە لەوە بزانم لەسەری نووسیوم یان نا، نەمدەزانی چ ڕێگەیەك بگرم، چونکە ئەو شتانە بە نهێنی دەکرێت، هەتا خوا خستیە دڵمەوە داوایەکم پێشکەش کرد بە وەزیری خوێندنی باڵا لەڕێگەی ڕاگری کۆلێژی یاسا، داوام کرد خانەنشینم بکەن بەبۆنەی ئەوەوە پیربووم و زۆر ماندوو بووم، لەدڵی خۆمدا وتم: ئەگەر داواکەمی نارد بۆ لای وەزیر، مانای ئەوەیە لەسەری نوسیووم، ئەوکاتە بە زوترین کات خۆم دەگەیەنمە کوردستان، ئەگەر نەینارد، مانای وایە هیچی لەسەر نەنوسیووم.

داواکەم نارد بۆی، ئەویش لەپاش ماوەیەکی کەم داوای کردم بچم بۆ لای، کاتێك چووم، زۆر بە ڕوخۆشیەوە پێشوازی کردم و داواکەی خستە بەردەستم و وتی: ئەمە چیە؟

وتم: ئەوەیە کە تیایدا نوسراوە.

وتی: (بكل عقلك)، واتە بە هەموو ژیرییەکتەوە؟

وتم: بەڵێ.

وتی: منیش و سەرۆکی زانکۆ بڕیارمان داوە، ئەگەر سەرۆکیش خانەنشینت بکات، ئێمە دەست لەکارکێشانەوەت بۆ ناکەین لەم کۆلیجەدا، چونکە تۆ یەکێکیت لە کۆڵەکە بەهێزەکانی ئەم کۆلێجە.

داواکەمی دڕاند لەبەردەممدا.

ئینجا منیش دڵنیابووم کە ئەم پیاوە لە دڵ و دەروندا پیاوێکی پاکە و نایەوێت زیان بەکەس بگەیەنێت، بەتایبەتی پیاوێکی تێگەیشتبوو بوو، هەرچەندە سەر بە میری بوو، بەڵام لەدڵی خۆیدا دەیزانی من ڕاستم و دەمەوێت لەسەر ڕاستی بژیم و هەر بە ڕاستی دواکۆچ بکەم.

# پلەی پرۆفیسۆری

ساڵی ١٩٨٠، پاش ئەوەی کە پلەی ماموٚستای یاریدەرم وەرگرت، دوای شەش ساڵ بۆم هەبوو کە پلەی پرۆفیسۆریم پێ بدرێت، بەمەرجێ دانراوەکانم بەلای کەمەوە دووانیان (اصیل) بن، منیش ئەو کاتە ژمارەی دانراوەکانم (١٠) دانراو بوون، ناردنیان بۆ لای سێ پرۆفیسۆر هەرسێکیان بڕیاریاندا کە من شایستەی ئەم پلەیەم، لەپاشاندا بابەت و کتێبەکانم نێردرا بۆ زانکۆکانی سێ وڵاتی عەرەبی کە میسر و قەتەر و کوەیت بوو، ئەنجامەکەی زۆر باش گەڕایەوە، هەروەك لەنوسراوەکەی زانکۆی بەغدا دەرکەوت کە بەم جۆرەبوو :

**یەکەم :** هەشت نوسراویان کۆلێجی قانون لە زانکۆی قەتەر پلەی (اصیل)ی پێدا.

**دووهەم:** لە کۆلێجی قانون لە زانکۆی قاهیرە چواریان (اصیل) بوون سیانیان نەبوون.

**سێهەم :** لە کۆلیجی قانون لە زانکۆی کویت پێنجیان (اصیل) بوون سیانیان نەبوون.

لە (١٩٨٧/٩/٢٧) نازناوی (استاذ - پرۆفیسۆر)م وەرگرت، بڕیاردەری ئەنجومەنی زانکۆی بەغدا پێی وتم: ئەندامەکانی ئەنجومەنی زانکۆ بەهەموویانەوە وتیان تا ئێستا ئەمە یەکەم کەسە کەزیاتر لەوەی پێویستە پێشکەش بکات، چونکە ئەوەی پێویستە دوو لێکۆڵینەوەی (اصیل)ە، ئەم چواری هەیە، لەبەر ئەوە یەکەم کەسی لەعێراقدا کە بە شایستەیی خۆی ئەم پلەیە وەرگرێت.

SECRETARIAT GENERAL
OF UNIVERSITY COUNCIL
THE UNIVERSITY OF BAGHDAD
Baghdad,IRAQ

جامعة بغداد
الامانة العامة لمجلس الجامعة

م ش العدد ١٦٢٩٣ التاريخ ١٩٨٧/١١/٨

امر جامعي

الموضوع/ ترقيه علميه

استنادا الى قرار مجلس الجامعه المتخذ بجلسته الثانيه المنعقده بتاريخ في ١٩٨٧/٩/٢٧.

تقرر ترقيه الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي الاستاذ المساعد في كليه القانون الى مرتبه الاستاذيه اعتبارا من ١٩٨٧/٩/٢٧ على ان لا يترتب على ذلك ايه تبعات ماليه قبل صدور امرنا هذا .

السيد رئيس الجامعة
المتفضل بالتوقيع
مع التقدير

مرقم / طه العيسى
حمدى عبد العزيز الفياض
رئيس جامعه بغداد وكالـه

نسخه منه الى :-
١٩٨٧/١١/٥
عماده كلية القانون/٢
امانه مجلس الجامعه.
الاستاذ الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي متمنين لك دوام الموفق

صلاح ١١/٣/

University of Baghdad, Al-Jadiriya, Baghdad, IRAQ. Telex 2197 JAMAT IK.

# ئاهەنگی مەولود

لەساڵی ١٩٧٩ زۆر لە مامۆستاکان چوون بۆ دەرەوە بۆ زانکۆکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان، چونکە موچەی مامۆستا لەو زانکۆیانە زیاتر بوون لە موچەی مامۆستاکان لە زانکۆکانی عێراقدا، منیش مامەوە لە هەر چوار پۆلەکەدا دەرسم دەوتەوە، زۆر ماندوو دەبووم، بە راگری کۆلێجم وت: من ناتوانم ئەم هەموو ئەرکە بگرمە سەر شانم. وتی: چی بکەین ناچارین، کەس نیە.

رۆژێك لە قۆناغی چوار بەپێوە راوەستابووم دەرسم دەوتەوە بە قوتابیان، لەپڕ سەرم گێژی خوارد و کەوتمە خوارەوە سەر کاشیەکان و لەهۆش خۆم چووم، هەر ئەوەندەم گوێ لێبوو قوتابیان بەدیارمەوە بە کچ و کوڕەوە دەستیان کرد بە گریان، هەر جۆر بوو بەبێ هۆشی منیان گەیاندبووە نەخۆشخانەی (نعمان).

ئێوارە کە چاوم کردەوە دەبینم وام لەژێر بوژانەوە(انعاش)دا، هەر بەو جۆرە سێ رۆژ مامەوە، پزیشکێکی ئافرەتی کورد کەخەڵکی خانەقین بوو بەداخەوە ناوەکەیم لەیاد نەماوە ئەو سێ رۆژە بە شەوو بەرۆژ بەجێیی نەهێشتم، دیارە هەستی نەتەوایەتی هەروەك هەست خزمایەتی وایە، لەکاتی تەنگانەدا یارمەتی یەکتر بدەن، ئەو کەسەی توشی کۆسپەکە بووە ئێش و ئازاری خۆی لەبیر دەچێتەوە، کاتێك کە دەبینێت لە خزمەکانی یان نەتەوەکەی کەسانێك هەڵدەستن بەخزمەتکردنی.

لەو ماوەیەدا مامۆستا کوردەکان رۆژی دووجار بەیانی و ئێوارە سەریان لێ دەدام، هەر ئەوەبوو بەهۆی ئەوەی کە خوا شیفای بۆ ناردم و زوو چاك بوومەوەو گەڕامەوە سەر وانەوتنەوە.

پاش ئەوەی لە نەخۆشخانە هاتمە دەرەوە، هێشتا هەستم دەکرد بەوەی بەتەواوی چاك نەبومەتەوە، بۆ ماوەی چەند رۆژێك مۆڵەت و پشویان پێدام.

لەوکاتەدا بەڕێوەبەری (دفاع مدنی) داوای لێکردم بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) وتارێك پێشکەش بکەم بۆ ئەوانەی کە پەیوەندییان بەو شوێنەوە هەیە.

منیش باسێکم نووسی لەبابەتی ئەوەوە کە پێغەمبەر لە ماوەی ژیانیدا چۆن جێگەنشینەکانی خۆی پێ گەیاندن بۆ ئەوەی لە پاش خۆی ئەو بناغەیە کە دانراوە بۆ ئیسلام تێك نەچێت.

کاتێك چووم زۆر بە گەرمی پێشوازی کردم، ئینجا پێی وتم: تۆ مامۆستای چیت؟

وتم: مامۆستای شەریعەتی ئیسلام و یاسام.

وتی: جا چۆن تۆ لە بابەت مێژووەوە وتارمان بۆ دەدەیت؟

وتم: من بۆ ئەوە نەهاتوم باسی ئەوەت بۆ بکەم کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) چۆن کۆچی کرد لە مەککەوە بۆ مەدینە، چونکە لە پۆلەکانی سەرەتاییدا ئێوە ئەوەتان خوێندووە.

وتی: ئەی باسی چیمان بۆ دەکەیت؟

وتم: باسی ئەوەتان بۆ دەکەم کە پێغەمبەر کۆشك و باڵەخانەی دروست نەکرد، ڕێگەوبانی قیرتاو نەکرد، بەڵام توانی شتێکی لەوە گرنگتر بکات، کە ئەمەش ئەوەبوو یارەکانی لەژێر یاسایەکدا پەروەردە کردن کە هەتاهەتایە ئادەمیزاد سوود لە رەوشتی ئەوان وەردەگرێت و، دوای ڕێگەی ئەوان دەکەوێت.

وتی: ئێمەش لەدوای وتارەکە گفتوگۆی لەسەر دەکەین.

وتم: زۆرم پێ خۆشە.

ئینجا توانیم لەنێو وتارەکەدا بەراوردێك بکەم لەنێوان پێگەیاندنی پێغەمبەر بۆ گەل و پێگەیاندنی ئەم رژێمە تازانە بۆ گەلەکانیان، لەبەر ئەوەی کە من تۆزێك

زیاد ڕۆیشتم، کە لێبوومەوە هیچ کەس پرسیاری لێ نەکردم، کاتێك هاتینەوە ژوورەکەی بەڕێوەبەر، وتم: بۆ پرسیارتان نەکرد؟

وتی: لەترسی ئەوە تۆش و ئێمەش توشی گێچەڵ نەبین، چونکە تۆ لەژێرپەردەوە هێرشت بردە سەر ئێمە.

لەپاشان سەعاتێکی دەستی دانا لەبەردەمم و وتی: ئەمەت پێشکەش دەکەین.

منیش وتم: زۆر سوپاستان دەکەم، من بۆ ئەوە نەهاتووم سەعاتم بدەنێ، تکاشم ئەوەیە ئەم جۆرە عورف و عادەتە هەڵگرن، ئەمە شتێکی ناشرینە، چونکە ئەوە دەگەیەنێت من بەرانبەر بە شتێك یان بەرژەوەندییەکی خۆم هاتووم، ئەم وتارە دەدەم، بەڵام ئەگەر لەمەولا شتێکی واتان کرد بەجۆرێکی تر بیکەن، سەعاتەکە یان دیارییەکی تر بنێرەماڵەوە بۆ کەسەکە، ئەمەش مانای ئەوە نیە تۆ سەعاتەکەم بۆ بنێری بۆ ماڵەوە.

## گوێزرانەوەم لەکۆلێجی یاسای زانکۆی بەغدا بۆ زانکۆی صدام

لەمانگی (١١)ی ساڵی (١٩٨٧) کۆلیجی یاسای زانکۆی صدام بۆ یەکەمجار دامەزرا، رۆژێك لەزانکۆی بەغدا دەرسم دەوتەوە، یەکێك هات وتی: راگر داوات دەکات، کە چووم بۆلای وتی لەجادریەوە داوات دەکەن، لەکۆلیجی یاسای زانکۆی صدام کە تازە کراوەتەوە، منیش کە رۆشتم سەیر دەکەم مامۆستا خانەنشینکراوەکان هەندێکیان هێناون بۆ ئەوەی لەم کۆلێجە تازەیەدا دەرس بڵێنەوە، وەك (د. حسن ذنون) و (م. ضیاء شیت خطاب).

نوێنەری دیوانی سەرۆکایەتی نووسراوێکی دا بە من ناوی پێنج مامۆستای تێدابوو، یەکەم ناو ناوی من بوو، کەبڕیاردراوە ئەمانە بۆ ماوەی یەك ساڵ بۆ وانەووتنەوە لەم کۆلێجە تازەیەدا (تنسیب) بکرێن.

منیش پێم وت: من لەکۆلێجی یاسای زانکۆی بەغدا لەشەش قۆناغدا وانە بەزیاتر لەهەزار قوتابی دەڵێمەوە و دەرسەکانم بەراورد کردنە لەنێوان یاساو شەریعەتدا، ئەوی دێتە جێگەی من ئەگەر شەریعەت بزانێ ئەوا یاسا نازانێت و ئەگەر یاسا بزانێ ئەوا شەریعەت نازانێ.

وتی: خۆمان باشت ئەناسین بۆیە تۆمان هەڵبژاردوە بۆ ئێرە، با ئەوان بچن یەکێکی تر پەیدا بکەن بۆ جێگەی تۆ.

منیش هاتمەوە بە ڕاگرم وت ئەوا من و چوار مامۆستای تر (تنسیب) کراوین لە زانکۆی صدام، ئەویش وتی: شتی وانابێت، تۆ کۆڵەکەی یاسای

زانکۆیت، هەوڵ دەدەم نەچیت، وتم: منیش پێم خۆشە نەچم لێرە خزمەت بکەم، پاشان بەتەلەفون قسەی کرد لەگەڵ وەکیلی سەرۆکی دیوان، ئەویش بەتوندی وەڵامی دایەوە، بەمنی وت: دەسەڵات نیە، برۆ.

من و چەند مامۆستایەکی کە بۆ وانە ووتنەوە لە زانکۆی سەدام بۆ ماوەی ساڵێك (تنسیب) کراین، یەکێ لەوانە (د. سامی فوزی) بوو، کرا بە ڕاگری کۆلێجەکە، لە ١٩٨٧/١١/٢٨ پەیوەندیمان کرد. ژمارەی قوتابییەکان (٦٠) قوتابی بوون. لەگەڵ هەر یەك لەو مامۆستایانە یاریدەدەرێکیان دانا، ئەو قوتابیانەی کە ماستەریان وەرگرتبوو لەکاتی وانەوتنەوەدا، کاتێ وانەکە تەواو دەبوو، یاریدەدەرەکە دەمایەوە لەگەڵ قوتابییەکان بە وانەکەدا دەچوونەوە لەو شتانەی کە لێی تێنەگەیشتبوون.

لەسەر بڕیاری دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار، ئەم زانکۆیە پەیوەندی بەدیوانی سەرۆکایەتی کۆمارەوە هەبوو، لەماوەی ئەو ساڵەدا ئێمە هەمومان بە نهێنی لەژێر چاودێریدابووین، کە ساڵەکە تەواو بوو منیان بەتەواوەتی گواستەوە، بەڵام ئەوانی دیکەیان گەڕاندەوە بۆ زانکۆی بەغدا، یەکێك لەو چوارە ڕاگرەکەی کۆلیجی یاسای زانکۆی صدام بوو.

الجمهورية العراقية
كلية صدام للحقوق
رقم الهاتف ٤١٩٤٢٣٠
مكتب السيد العميد

(( سري ))
(( امر اداري ))

الرقم س/٢٠
التاريخ ١٩٨٧/١١/٢٨

م/ [illegible]

اشارة الى كتاب ديوان الرئاسة السري المرقم ع/ ٤١١٩٧ في ١٩٨٧/١١/٢٢ المتضمن تنسيب التدريسيين المبينة اسماؤهم ادناه .
باشروا العمل في كليتنا يوم السبت الموافق ١٩٨٧/١١/٢٨ ق . ظ

١- د. مصطفى ابراهيم الزلمي — كلية القانون / جامعة بغداد
٢- د. اياد عبد الجبار ملوكي — كلية القانون / جامعة بغداد
٣- د. رعد الجدة — كلية القانون / جامعة بغداد
٤- د. عبد المنعم السيد علي — كلية الادارة والاقتصاد / الجامعة المستنصرية
٥- د. هاشم الحافظ — [illegible]

فوزي محمد سامي
عميد كلية صدام للحقوق

نسخة منه الى/
رئاسة ديوان الرئاسة / كتابكم اعلاه . مع التقدير
وزارة التعليم العالي والبحث العلمي / للعلم . مع التقدير
كلية القانون / جامعة بغداد
كلية الادارة والاقتصاد / الجامعة المستنصرية — للعلم . مع التقدير
الاضبارة
الحسابات / [illegible]

بوو.

له ١٩٨٨/١٠/٨ فەرمان دەرچوو کە لەجێگەی ئەو راگرەی ناردیانەوە من ببم بە راگری کۆلیجی یاسای زانکۆی صدام، کاتێك راگرەکەی پێشوو نوسراوی دیوانی سەرۆکایەتی پێدام کە من کراوم بەراگر زۆرم پێناخۆش بوو.

ئەویش وتی: بۆ چی وا مات بوویت.

وتم: لەبەر ئەوەی دوژمنی من لەژیاندا پلەو پایەیە، ئەوەی هەوڵ بۆ کورسی ئەدات زۆر نەزانە، چونکە نرخ و بایەخی بەکورسییەوەیە، هەر رۆژێك لایان برد وەك لەبەرزاییەوە بکەوێتە خوارەوە وایە، ئەگەر قاچ و باڵی نەشکێت ئەوا خەفەت و خەم زۆر دەخوا بۆ لەکیس چوونی پلە بەرزەکەی.

وتی: ئەوان باوەڕیان بە تۆ هەیە بۆیە ئەم ئیشەیان بە تۆ سپاردوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

الجمهورية العراقية
ديوان الرئاسة

// سري //

كلية صدام للحقوق
سري
العدد/ ٣٢٢
التاريخ ٨-١٠-١٩٨٨

العدد / ت/ك ه ص/ ٢٦٠٧٦
التاريخ / ١٠ / ١٠ / ١٩٨٨

الى/ عمادة كلية صدام للحقوق

م/ تكليف

نشير الى كتابنا المرقم ت/٣٥٦٢٦ في ١٩٨٨/١٠/٨ .
تقرر قيام الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي بمهام عمادة الكلية وكالة أضافة الى مهامه التدريسية وحتى أشعار آخر .

لاتخاذ مايلزم .. مع التقدير .

طه ابراهيم العبدالله
م/ رئيس ديوان الرئاسة

د. مصطفى الزلمي
للتبلغ مع تهانينا القلبية .

تبلغت
د. مصطفى الزلمي
١٠/١٠/١٩٨٨

وتم: سوپاسیان دەکەم، بەڵام وەك پێم وتی تا بۆم بکرێ ئەم کارە ناکەم، من دەمەوێت جگە لەمامۆستایەتی ماوەی ژیانم لەشتی تردا بەفیرۆ نەدەم.

لەپاش سێ رۆژ وەکیلی سەرۆك دیوان (طه عبدالله) هات بۆ لام لەژوری راگر پێکەوە دانیشتین و پێی وتم: پیرۆزبایت لێ دەکەم، وتم: زۆر سوپاستان دەکەم بەڵام ئەمە ئیشی من نیە، من خوا خەڵقی کردوم بۆ مامۆستایەتی، دەمەوێت

بژیم هەر مامۆستابم و ئاواتم ئەوەیە دوا ساتی ژیانم تەواوبێت من لەهۆڵی وانەوتنەوەدا بم.

وتی: ئێمە دەتوانین کەسێك بێنین بیکەین بەڕاگر، بەڵام ناتوانین هەموو کەسێك بێنین وانەکانی تۆ بڵێتەوە، لەبەر ئەوە بەڵێنت ئەدەمێ کە لە زوترین کاتدا یەکێك لەجێگای تۆ بە راگر دابنرێت.

پاش مانگێك جارێکی تر هاتەوە، پێم وت: ئێوە بەڵێنتان پێدام کە لەزوترین کاتدا راگرێکی تر بێنن، من رزگار بکەن لەم ئیشە، تەماشایەکی کردم وتی: (انت انسان شاذ) زۆر کەس هەن یەن پێڵاو ماچ دەکەن ئێمە شوێنێکی وەهایان بەینێ.

وتم: من لەو کەسانە نیم، چونکە دەمەوێت پێویستیەکانی مرۆڤایەتیم لە خودی خۆمدا بێت لە کورسی و پایەدا نەبێت، چونکە گەر بەپلەو پایە گەورە بیت رۆژێك دێت بچوك دەبیتەوە.

دووبارە بەڵێنی پێدام بەزووترین کات یەکێکی تر بهێنن، هەر بەو جۆرە پێنج مانگ و دە رۆژ مامەوە، هەموو جار لەپاش نوێژ دەمووت خوای گەورە گوناهێکم کردوە کە ئەم ئیشەت توش کردووم.

**شایەنی باسە من هەر لەئەوەڵەوە دژی ئەم پلەیە بووم، چونکە:**

**یەکەم:** دەبێت پیاوێکی دووڕوو بیت، خۆم بکەم بەپیاوێکی روو گەش، لەدڵمدا بیروباوەڕم بە شتێك بێت و بە زمانیش پێچەوانەی ئەوە خۆم پیشان بدەم، بەتایبەتی لە بۆنەکاندا (المناسبات) هەردەم دەبێت راگر وتەیەك بدات نیوەی باسی چاکی و ستایشی درۆ بکات، ئەگەر نا زوو پلەکەی لێ دەسێننەوە.

**دووهەم:** لەپاش باوەڕ بەخوا و پێغەمبەر و قورئان، هیچ شتێك نیە بەنرختر بێت لەزانیاری و زانست، چونکە زانا بیت هەموو کەس دۆستتە و دوژمنەکەت ناچار ئەبێت ریزت بگرێ، ئەگەر ئەم شارەی بەغدا هەمووی هی من بێت لەوساتەدا کە رۆحم دەردەچێ دەبێتە موڵکی یەکێکی تر پێی دەوترێ میراتگر، بەڵام لاپەڕەیەك نووسین بەجێ بێڵیت هەتا هەتایە موڵکی خۆت دەبێت و

دەمێنێتەوە، لەکاتی ژیان و پاش مردنیشت، جگە لەوە ئەو زانیاریەی کە دەستمایەتە دەتوانی لەهەموو شوێنێك پێی بژیت و بۆ هاتووچۆ بارێکی قورس نیە، هەموو دەستمایەیەك لەوانەیە بزر ببێت یان داگیر بکرێ جگە لەدەستمایەی زانین، هەر دەستمایەیەك ئەگەر بتەوێ یارمەتی خەڵکی پێبدەیت کەم دەکات، تەنها زانیاری نەبێت تا بیبەخشی زیاتر دەبێت، بەزانیاری مەیدانی خوێندن پان و پۆڕ دەبێت، ئەمەش مایەی خۆشحاڵیمە.

درێژەی نەدەینێ پێنج مانگ و دەرۆژ راگر بووم، بیست رۆژ مابوو کە ئۆتۆمبێلێکی ئاخر مۆدێلم بدەنێ، چونکە هەموو راگرێك پاش شەش مانگ لەدامەزراندنی ئۆتۆمبێلێکی دەدرێتێ، منیش مامۆستاکان دەیان وت: زۆرت نەماوە ئوتۆمبێلەکە وەرگریت، منیش دەمووت: لەخوا داواکارم کە بەنسیبم نەبێت.

لەخوا بەزیاد بێت، لە ١/٢/ ١٩٨٩ (د.رشدی خالد) لەجێگەکەم کرا بە ڕاگر و منیان لابرد، کـاتێ هـات بـۆ کـۆلـیـج چـووم بەرەوپیریـەوە، ئەمـلاو ئەولام مـاچ کرد و پیرۆزباییم لێ کرد، وتـم: خۆزگـە ئێستا مەڕێکم هەبوایە سەرم ببڕیایە لەبەردەمـتا، چـونکە بویـت بەمایەی ئاسوودەیی من.

سەرسام بوو لەو خۆشیەی مـن، چـونکـە ئـەوەی لەو کورسـییە لادەبـرێ چـەند شـەوێك خەوی لێ ناکەوێت و لـەوانەیە لەخەفەتدا توشی نەخۆشی ببێت.

بسم الله الرحمن الرحيم

الجمهورية العراقية
ديوان الرئاسة
كلية صدام للحقوق

الرقم: ١٨٩/٧/٢
التاريخ: ٨٩/٢/٤

الى / الاستاذ الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي المحترم

م / شكر وتقدير

بمناسبة انتهاء تنسيبكم من مهام عمادة الكلية وكالة اضافة الى مهامكم التدريسية لا يسعنا الا ان نقدم لكم جزيل شكرنا وتقديرنا على الجهود التي بذلتموها اثناء توليكم منصب عميد الكلية .

متمنين لكم دوام الموفقية .. مع جزيل الشكر والتقدير

رشدي خالد رشيد
العميد وكالة

نسخة منه الى /
الاضبارة الشخصية
ملفة الكتب الصادرة

نداء ٢/٢

SADDAM COLLEGE OF LAW
Tel: 7760201
Telex: SRC - IK 214230
Baghdad, P.O. BOX. 47002

هاتف : ٧٧٦٠٢٠١
تلكس : ٢١٤٢٣٠
بغداد : ص . ب : ٤٧٠٠٢

## یەکەم ڕۆژم لەکۆلێجی صەدام

لەیەکەم وانەی یەکەم ڕۆژی دەست بەکاربوونمدا کەچوومە پۆلەوە پێش ئەوەی دەست بەوتنەوەی وانەکە بکەم، قوتابییەك دەستی هەڵبڕی، وتم: جارێ من قسەم نەکردووە تۆ پرسیاری چیت هەیە؟

وتی: پرسیارەکەم لەبابەتی وانەکەوە نیە، وتم: ئەی لەبابەتی چیەوەیە؟ وتی: من باوکم و دایکم زۆر موسڵمانی چاکن، بەڵام خۆم مولحیدم، باوەڕم بەخوا نیە، هەرچی دەخوێنمەوە و لەهەرکەس پرسیار دەکەم نامگەیەنێتە باوەڕبوون بەخوا، وەڵامی ئەوەم دەوێت، وتم: پەلە مەکە ئێستا بەپێنج دەقیقە بۆت ڕوون دەکەمەوە کەخوا هەیە.

ئەمجا وتم: ئەم هۆڵە بچوکە کەئێمە تێیدا دەخوێنیین ئەچێتە عەقڵەوە بە صودفە بێتە وجودەوە، بەبێ ئەوەی کەوەستا و چەند کرێکارێك کاری تێدا بکەن، وتی: نەخێر، وتم: ئەی عەقڵ تەصەور ئەکات ئەم گەردوونە گەورەیە کە تائێستاش زانایانی فەلەکناس سەرسام ماوون کەلەکوێ دەست پێدەکات و لەکوێ کۆتایی دێت لەخۆیەوە بەصودفە بێتە وجودەوە بەبێ بوونی بەدیهێنەرێك، وتی: نەخێر، وتم: ئەی چۆن هاتۆتە دی و دروست بووە، وتی سروشت دروستی کردووە، وتم: منیش ئەو وەڵامەم دەویست، ئایا سروشت مەوجوودە، یان مەعدوومە، ئەگەر مەعدووم بێت چۆن مەوجوود دروست دەکات، وتی: مەوجوودە، وتم: ئایا ئەو سروشتە بەشێکە لە گەردوونەکە یان جیاوازە لێی، چونکە ئەگەر بەشێك بێت لەگەردوونەکە چۆن خۆی دروست دەکات، وتی: جیاوازە لێی، وتم: دارتاشێك کەزۆر لێهاتوو بێت ئەتوانێت تەختەیەکی دار بکات

بەتەپڵەکێك بەبێ ئەوەی مشار و بزماری هەبێت، وتی: نەخێر، وتم: ئەو سروشتە ئەتوانێت ئەو گەردوونە گەورەیە دروست بکات بەبێ ئەوەی دەسەڵاتی هەبێت یان زانیارییەکی هەبێت یان ئیرادەیەکی هەبێت؟ وتی: نەخێر، وتم: ئەوەی کە تۆ پێی ئەڵێیت سروشت ئەوە خوایە، بەڵام جیاوازییەکە لەناوەکەدایە، موسڵمان پێی دەڵێت خوا، مولحیدەکان پێی دەڵێن سروشت، یەکسەر وتی: اشهد ان لا الله الا الله واشهد وان محمدا رسول الله.

دوای ئەوە سەردانی دەکردم و دەیوت: هەموو بەیانیەك بەشێك لەقورئان دەخوێنم ئینجا دێم بۆ کولیە.

لەمەوە دەردەکەوێت خوا ناسین زۆر ئاسانە و زۆر ئاشکرایە بەڵام پیاوی نەزان گرانی دەکات و ناتوانێت بیخاتە مێشکی یەکێکی نەزانەوە.

## خانەنشین بوون و گەڕانەوە

لەپاش ئەوەی لەڕاگری لادرام تەمەنم گەیشتە ئەوەی خانەنشین بکرێم، بەڵام لەپێش خانەنشینییەکە پێیان وتم: دەبێت کۆلیجەکە بەجێ نەهێڵیت و بەگرێبەست لەگەڵمان بمێنیتەوە، منیش بەڵێنم پێدان.

ئەوەبوو لە ١٩٩٠/٦/٣٠ خانەنشین کرام و بە گرێبەست وانەم دەوتەوە.

بسم الله الرحمن الرحيم
وزارة التعليم العالي والبحث العلمي

الجمهورية العراقية
ديوان الرئاسة
كلية صدام للحقوق

الرقم: ١١٠٦/٢٤/٧
التاريخ: ٢٣/ذو الحجة/١٤١٠ه
١٩٩٠/٧/١٦م

امـــــر اداري

تنفيذا لكتاب ديوان الرئاسة المرقم ص ع/١٨٦٢٨ في ٢٠ ذي الحجة ١٤١٠ الموافق ١٩٩٠/٧/١٢م ، واستنادا للمادة العاشرة (أ) من قانون الخدمة الجامعية رقم ١٤٢ لسنة ١٩٧٦ المعدل بدلالة المادة الثالثة من (تعليمات خدمة اعضاء الهيئة التدريسية والموظفين في كلية صدام للحقوق) النافذة المفعول .

تقرر احالة الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي ، الاستاذ في هذه الكلية على التقاعد اعتبارا من ١٩٩٠/٦/٣٠ بعد الظهر .

رعدي خالد
العميد
١٩٩٠/٧/١٦

نسخة منه الى :-
دائرة التقاعد العامة
السيد المعاون / للتفضل بالاطلاع
قسم القانون الخاص / للعلم
الحسابات
الذاتية
ملفة الكتب الصادرة
الملفة الشخصية

هاتف: ٥٢٢٠٤٠٧
تلكس: ٢١٤٢٣٠
بغداد: ص.ب: ٩٠٧٢

SADDAM COLLEGE OF LAW
Tel: 5220407
Telex: SRC - IK 214230
Baghdad P.O. BOX 9072

ئەوکاتە دوای خانەنشین بوون مامۆستای زانکۆ دەیتوانی بەرهەمەکانی پێشکەشی ئەنجومەنی زانکۆ بکات بە مەبەستی وەرگرتنی ناونیشانی (استاذ متمرس)، ئەگەر ئەنجومەن ڕەزامەندی دەربڕی ئەوا ناونیشانەکەی پێ دەبەخشرا. منیش بەو شێوەیە لە ١٩٩١/٥/١ ناونیشانی (استاذ متمرس)م پێ بەخشرا، شایانی باسە ئەم پلەیە کاتێک دەدرێت کەمامۆستاکە خانەنشین

بێت و دەبێت لەبواری نووسیدا کاری هەبێت و لەلایەن ئەنجومەنی زانکۆوە تەصدیق بکرێت و ئیمتیازەکە تەنها نەعنەویە و لەدوای ئەمە پلەی زانستی بەرزتر نیە.

لە ١٩٩٠/٩/١٥ گرێبەستم لەگەڵ کۆلیج ئیمزاکرد و بەگرێبەست وانەم دەوتەوە.

ساڵی (١٩٩٣) بڕیارمدا بچم بۆ دەرەوی عێراق بۆ دەوڵەتێکی عەرەبی، چونکە لەسودان سەرۆکی زانکۆی خەرتووم خۆی بەوەفد هاتبوو بۆ عێراق، گرێبەست نامەیەکی بۆ هێنابووم کەمووچەی پرۆفیسۆریم ئەدەنێ لەگەڵ هەزار دۆلار بۆ هەر مانگێك و خانویەکم دەدەنێ بەهەموو پێداویستیەکانیەوە لەگەڵ ئۆتۆمبێلێك بۆ هاتووچۆ.

منیش نامەیەکم نووسی بۆ سەرۆکایەتی کۆماری، داوامکرد بمبەخشن لە تازەکردنەوەی گرێبەستەکە، بەڵام لە وەڵامدا سەرۆکایەتی کۆمار بڕیاری دا کە (یعاد للوظیفة مدی الحیاة) بەم جۆرە گەڕامەوە بۆ مامۆستایی لەکۆلیجەکە بەجۆرێکی وا هەتا لەژیاندا بم خانەنشین نەکرێم، ئەمە بۆ من ڕێزێکی گەورەبوو، چونکە یەکەم مامۆستا بووم لەزانکۆکانی عێراق کە خانەنشین نەکرێم تا مردن، لەوەفای ئەوەدا پاساوم هێنایەوە بۆ سەرۆکی زانکۆی خەرتووم لە سودان.



بسم الله الرحمن الرحيم

جمهورية العراق
ديوان الرئاسة

العدد / ٤٠٤ / ٦٤٨
التاريخ / ١٥ / رمضان / ١٤١٣هـ
٨ / ٣ / ١٩٩٣م

كلية صدام للحقوق

م / الدكتور مصطفى الزلمي

كتابكم س/٢٩ في ١٩٩٣/٢/١١ .
حصلت الموافقة على دعوة المتقاعد الدكتور مصطفى الزلمي الى الخدمة وفقا لما ورد بالفقرة (٢) من كتابكم اعلاه .

.. مع التقدير .

منير عبد العزيز النعيم
م رئيس ديوان الرئاسة

لە ١٩٩٣/٣/٢٠ دووبارە گەڕامەوە بۆ کۆلیجی سەدام.

لەپاش ئەو زانکۆی ئوردون داوایان کرد کەتەنها دەرس بەماستەر و دکتۆرا

بلێمەوە، مانگی بەهەزار دیناری ئوردنی، کە ئەو کاتە زیاتر بوو لەملیونێك دیناری عێراقی، منیش بەمجۆرە وەڵامی راگری یاسای زانکۆی ئوردنم دایەوە: زۆر سوپاست دەکەم، رۆڵەی وڵاتەکەم حەقی زیاترە بەسەرمەوە، باخچەی خانوەکەم لەلا شیرینترە لە باخچەی کۆشکی (مەلیك حوسین).

لە ١٩٩٤/١/٩ کرام بە سەرۆکی بەشی (القانون الخاص).

لەو کاتەوە تا ئێستا کە ئەم یاداشتنامەیە دەنووسم کە رۆژی (٢٠٠١/٧/٢٨) هەر لەو کۆلێجە ماومەتەوە، وانەوتنەوەکەم تەنها بۆ ماستەر و دکتۆرایە،

بسم الله الرحمن الرحيم
وانزلنا معهم الكتاب والميزان

جمهورية العراق
الجمهورية العراقية
ديوان الرئاسة / جامعة صدام
كلية صدام للحقوق

الرقم ٧/ ٢٢/ ٢٦
التاريخ ١/ ٩/ ١٩٩٤

امـــر اداري

م/ رئيس قسم

استنادا الى احكام الفقرة ٢ من المادة ٧ من قانون جامعة صدام رقم ١٧ لسنة ١٩٩٣ وبناء على ماجاء بالامر الجامعي المرقم ج/١٦٨٦ في ١٩٩٣/١٢/٢٨ • تقرر تعيين الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي الاستاذ في هذه الكلية رئيسا لقسم القانون الخاص بها اعتبارا من تاريخ الامر الجامعي اعلاه •

رشدي خالد
العميد
١٩٩٤/١/٩

نسخة منه الى /
السيد المعاون / برجاء الاطلاع • مع التقدير
الافراد
الحسابات / حيث ان الاستاذ الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي بقي في رئاسة قسم القانون الخاص واستمر على تأدية المهام المنوطة به بهذا الاعتبار من ١٩٩٣/١١/١٥ تاريخ العمل بقانون جامعة صدام رقم ١٧ لسنة ١٩٩٣ ولغاية صدور الامر الجامعي المنوه به اعلاه • تعتبر هذه المدة استمرارا فعليا في رئاسة القسم • لاجراء اللازم في ضوئه رجاء •
الاستاذ الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي مع التبريكات •••

SADDAM COLLEGE OF LAW
Tel: 5220407
Telex: SRC - IK 214230
Baghdad P.O. BOX 9072

هاتف: ٥٢٢٠٤٠٧
تلكس: ٢١٤٢٣٠
بغداد: ص.ب: ٩٠٧٢

هەفتەی سێ ڕۆژ دەچم بۆ کۆلیج، ڕۆژێك بۆ سەرپەرشتی، ڕۆژێك بۆ ماستەر و ڕۆژێك بۆ دکتۆرا، ئۆتۆمبێلێکیان تەرخان کردوە دەمبات بۆ کۆلێج و ئیشەکەم تەواوکرد دەمگەڕێنێتەوە بۆ ماڵەوە، قوتابی و مامۆستاکان زۆر ڕێزم دەگرن.

پێنج جار سەرۆك کۆمار دیاریی بۆ ناردووم، لەساڵی ١٩٩٥ ئیشارەی نوسەران (شارة الکتاب)یان پێدام.

١٩٩٤/٩/١٤ لە کۆشکی کۆمارییەوە تەلەفۆنیان بۆ کردم و وتیان سەرۆك دیارییەکی بۆ داناوی، لەکوێ وەری ئەگری؟ منیش زۆر سەرم سوڕما، چونکە هەر لەدورەوە ئەمزانی و شتێکی وەهام نەکردووە

باسم الشعب
مجلس قيادة الثورة
رقم القرار : ٦٢
تأريخ القرار : ٢٦ / ذي الحجة / ١٤١٤ هـ
٦ / ٦ / ١٩٩٤ م

استنادا الى احكام الفقرة ( ا ) من المادة الثانية والاربعين من الدستور .
قرر مجلس قيادة الثورة اصدار القانون الاتي :

رقم ( ٨ ) لسنة ١٩٩٤
قانون تعديل قانون الاحوال الشخصية
ذي الرقم ١٨٨ لسنة ١٩٥٩

المادة الاولى :

تضاف الفقرة الاتية الى المادة ( ٤٣ ) من قانون الاحوال الشخصية ذي الرقم ١٨٨ لسنة ١٩٥٩ وتصبح الفقرة ( رابعا ) لها : - -

رابعا : ١ - لزوجة المفقود الثابت فقدانه بصورة رسمية ان تطلب من المحكمة التفريق عن زوجها بعد مرور اربع سنوات على فقدانه ، وعلى المحكمة ان تتثبت من استمرار الفقدان بالطريقة نفسها التي ثبت بها فقدانه ثم تصدر حكمها بالتفريق .

٢ - تعتد زوجة المفقود بعد الحكم بالتفريق اربعة اشهر وعشرة ايام .

٣ - اذا عاد المفقود تستمر زوجيته لها ما لم تتزوج ويتم دخول الثاني بها حقيقة غير عالم بحياة الاول .

المادة الثانية :

ينفذ هذا القانون من تاريخ نشره في الجريدة الرسمية .

صدام حسين
رئيس مجلس قيادة الثورة

السيد رئيس ديوان الرئاسة الاستاذ حاتم العزاوي المحترم

بعد تقديم احترامات وتحيات لائقة بمقامكم ...

ان الواجب الديني والواجب الوطني يحتمان علي ان ارفع الى سيادتكم هذه المذكرة التي تتضمن الاتي :
صدر قانون رقم (٨) لسنة ١٩٩٤ في ٢٦/ ذي الحجة / ١٤١٤ هـ المصادف ١٩٩٤/٦/٦ وهو قانون تعديل قانون الاحوال الشخصية ذي رقم (١٨٨) لسنة ١٩٥٩ والخاص بزوجة المفقود .

اولا - ان هذا التعديل كان ضروريا وعملا انسانيا لرفع الضرر المادي والمعنوي عن زوجة المفقود كما انه تطبيق لقوله تعالى ( ولا تمسكوهن ضرارا ) ولقول الرسول صلى الله عليه وسلم ( لاضرر ولاضرار ) .

ثانيا - مع أهمية هذا التعديل فان الاثار التي يرتبها على التفريق في الفقرتين ( ٢ و ٣ ) من ان عدة الزوجية اربعة اشهر وعشرة ايام وان الزوجية تعتبر مستمرة اذا رجع المفقود قبل الزواج او بعده وقبل الدخول : مخالفة للشريعة الاسلامية ولقوانين جميع البلاد العربية وللقانون والقضاء العراقيين للاسباب الاتية :

١. في اقرار هذه الاثار خلط بين التفريق القضائي وبين الحكم بوفاة المفقود فهي اثار للحكم بالوفاة . اما التفريق فهو طلاق او فسخ للزواج فالعدة عدة المطلقة وليست عدة الوفاة والزوجية تنقطع بالتفريق مباشرة اذا اعتبر طلاقا بائنا او بعد انتهاء العدة اذا اعتبر رجعيا .

٢. نص المادة (٤٥) من قانون الاحوال الشخصية العراقي المعدل المذكور على الاتي ( يعتبر التفريق في الحالات الواردة من المواد الاربعين ، الحادية والاربعين ، الثانية والاربعين ، الثالثة والاربعين طلاقا بائنا بينونة صغرى ) وبهذا يقوم التناقض بين هذه المادة وبين التعديل المذكور الذي هو جزء من المادة (٤٣) .

٣. بعد التفريق بين المفقود وزوجته الامر لا يخلو من حالتين اما ان تنقطع العلاقة الزوجية وفقا للمادة (٤٥) او تبقى الزوجية مستمرة على تقدير رجوع المفقود قبل الزواج او بعده وقبل الدخول وفق هذا التعديل الجديد فاذا كانت العلاقة منقطعة كيف تستمر الزوجية واذا كانت مستمرة فكيف يجوز للزوجة ان تتزوج ؟ هذا تناقض لا يقبله العقل ولا المنطق ولا اية شريعة . ثم ان الاحكام الشرعية لا تبنى على الافتراض وانما تبنى على الواقع .

کە ئەو دیاری بۆ من بنێرێ، دوایی زۆر بیرم کردەوە زانیم هۆکەی ئەمەیە: ١٩٩٤/٦/٦ یاسایەك دەرچوو لەبابەت حوکم بە تەفریقی ژنی ونبوو(مفقود)، یاساکە هەڵەی زۆری تیابوو، منیش پێشنیازێکم نارد بۆ دیوانی سەرۆکایەتی، باسی هەڵەکانم تیاکرد، دیارە دابویان بە سەرۆك، ئەویش سوپاسنامەیەکی بۆ ناردم لەگەڵ پەنجا هەزار دینار.

جمهورية العراق
ديوان الرئاسة



العدد: ق / ١٦٧٥٢
التاريخ: ١٢ / صفر /١٤١٥ هـ
١٢ / ٧ /١٩٩٤م

( سري )

( امر ديواني )

تقرر تشكيل لجنة برئاسة الدكتور حسن علي الذنون وعضوية السادة كل من القاضي عبدالقادر ابراهيم علي والدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي – رئيس قسم القانون الخاص في كلية صدام للحقوق والدكتور احمد عبيد الكبيسي والقاضي مدحت المحمود – المستشار في مجلس شورى الدولة . لدراسة الموضوع المعروض بمذكرة الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي . بشأن القانون ذي الرقم ( ٨ ) لسنة ١٩٩٤ قانون تعديل قانون الاحوال الشخصية ذي الرقم ١٨٨ لسنة ١٩٥٩ وبيان الرأي والحل المناسب الذي يؤدي الغرض من التشريع المشار اليه دون تقاطع مع احكام الشريعة الاسلامية والقانون النافذ .

ترفع اللجنة توصياتها الى ديوان الرئاسة .

حاتم حمدان العزاوي
رئيس ديوان الرئاسة
١٢ / ٧ / ١٩٩٤

نسخة منه الى :

الدكتور حسن علي الذنون المحترم
السيد عبدالقادر ابراهيم علي المحترم
الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي المحترم
الدكتور احمد عبيد الكبيسي المحترم
القاضي مدحت المحمود المحترم

مع صورة قانون التعديل وصورة المذكرة . يرجى الاطلاع .. مع التقدير .

المرفقات / صورة قانون تعديل
صورة مذكرة

( ١ – ١ )

رۆژی ١٩٩٤/٩/١٥ چووم بۆ کۆشکی سەرۆکایەتی و پارەکەم وەرگرت، هەرچەندم کرد نەمتوانی بڵێم سوپاسی ئەکەم، چونکە پارەم لەکەس وەرنەگرتووە و سوپاسی کەسم نەکردووە لەسەر پارە، بەڵام لەسەر شتێکی کەم لەلایەنێکی ترەوە سوپاسی هەموو کەسم کردووە.

شایانی باسە کەپێشتریش لەساڵی ١٩٨٥ کۆلێژی یاسا بۆ زانکۆی بەغدای نوسی کە د.مستەفا زەڵمی مامۆستایەکی جیاوازەو باڵایە لەناو مامۆستاکانی تردا، وەزیری فێرکردنی باڵا (٥٠٠) دیناری بۆ ناردبوم، ئەوکاتە زۆر بوو، منیش زۆرم پێ ناخۆش بوو، وتم: قەڵەمێکی بۆم بناردایە سوپاسم ئەکرد و گەلێ لەم پارەیە پێم خۆشتر ئەبوو.

## بەشداریکردنم لە کۆنگرەیەکی تایبەت بە مافی مرۆڤ لەشەریعەت و یاسادا لەوڵاتی ئوردن




لەسەر بانگهێشتێکی فەرمی زانکۆی ئەلزەرقائی ئوردنی، لەرۆژانی ٨-٩ مانگی ئابی ساڵی ٢٠٠١ بەشداری دووەمین کۆنگرەی یاسایی کۆلیجی یاسای زانکۆی زەرقا بووم، بەناونیشانی: "مافی مروف لەشەریعەت و یاسادا. رووبەرووبوونەوەو چارەسەر".

**ئەم کۆنگرەیە لەژێر چاودێری مەلیك عەبدوڵای پادشای ئوردندا ئەنجام درا، سێ تەوەری سەرەکی لەخۆ دەگرت:**

**تەوەری یەکەم:** مافی مرۆڤ لەروانگەی ئیسلام و یاسا دانراوەکانەوە، ئەمەش بابەتەکانی (کۆرپەلە و مناڵ و مافی ئافرەت و مافی مرۆڤ لەکاتی جەنگدا و ئەو سزایانەی ئازادی سنووردار دەکەن)ی لەخۆ گرتبوو.

**تەوەری دووەم:** مافی مرۆڤ لەنێوان تیۆر و پراکتیکدا، ئەمەش بابەتەکانی ) مافی مرۆڤ و ئابلۆقەی سەرگەلان و جیاکاری لەدژی مافەکانی مرۆڤی عەرەبی و موسڵمان و پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ و هۆکار و شێوەکانی و راپۆرتەکانی رێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی و مافەکانی مرۆڤ و رەهەندە تیۆری و پراکتیکیەکانی ڤیتۆ لە میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان و کاریگەری

لەسەر مافەکانی مرۆڤ و، جیهانگیری و شوێنەوار و کاریگەریەکانی لەسەر مافەکانی مرۆڤ لەبواری کۆمەلایەتی و شارستانیەوە) و چەندین بواری دیکەی دەگرتە خۆی.

**تەوەری سێهەم:** گرەنتیەکانی مافی مرۆڤ بوو، ئەویش بابەتەکانی (تا چەند یاساکان بەسە بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و، میتۆدی حوکم و هۆکارەکانی لەپێناو پاراستنی مافەکانی مرۆڤ، رۆڵی چاودێری دادگا لەپاراستنی مافەکانی مرۆڤدا) و چەند بوارێکی تری لەخۆ گرتبوو.

بۆ ئەم کۆنگرەیە لەزۆر وڵاتەوە میوانی بۆ بانگهێشت کرابوو، چەندین کەسی پسپۆڕ بانگهێشت کرابوون، لەعێراقەوە من و دکتۆر عەبدولواحد زەنون و دکتۆر عەبدولستار دەباغ و دکتۆر خەلیل حەدیسی و دکتۆر موحسین عەبدولحەمید و دکتۆر هاشم مەللاح، لەوڵاتی قەتەرەوە دکتۆر یوسف قەرەزاوی و دکتۆر محەمەد شەلال عانی، لەسوریاوە دکتۆر وەهبە زوحەیلی، لەفەڵەستین دکتۆر مستەفا بەرغوسی، لەئیماراتەوە دکتۆر حەمید عبید کوبەیسی و دکتۆر محەمەد زوحەیلی، لەیەمەنەوە دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان و، لەبەحرەینەوە دکتۆر نزار عانی، لەئەمریکاوە دکتۆر تەها جابر عەلوان، لەمالیزیاوە دکتۆر عەبدولقەهار داود عانی.

لەم کۆنگرەیەدا، باسێکم پێشکەش کرد لەژێر ناونیشانی (حقوق الانسان وقت الحرب بین الشریعة والقانون) تایبەت بە دیلی جەنگ و ڕۆڵی ئیسلام لە لابردنی ڕژێمی کۆیلایەتی.

لێرەدا پێم خۆشە بەراوردێکی کورت لەنێوان سەفەری پێشووم بۆ ئوردون و ئەم سەفەرەم بکەم، دواجار کەپێش ئەم سەفەرەم چووم بۆ ئوردن ساڵی ١٩٧٧ بوو کە لە قاهیرەوە گەڕامەوە، لە عەممان دابەزیم، عەممان وەکو دێیەکی گەورە وابوو، زۆر دواکەوتوو بوو، گەلەکەی لە برساندا دەمرد.

٢٠٠١/٨/٧ کە داواکرام بەشداری بکەم لەم کۆنگرەیەدا رۆژی ٧-٨ لەگەڵ مامۆستایەکی تر گەیشتینە عەممان و جێگەیان بۆ دیاری کردبووین لە

ئوتێلێکی دەرەجە یەك (فندق ئوورکیدا)، بۆ ئێوارەی ئەو رۆژە چووین بۆ ماڵی (د.أحمد) کە کوڕی ئەو مامۆستایە بوو کە لەگەڵمدا، ئێوارە بە ئۆتۆمبیلەکەی گێڕاینی بەشاری عەمماندا تەماشام کرد سەد چەندانە ئەم شارە زیادی کردووە و بە هەزاران باڵەخانەی تازەی تیادا دروست کراوە، لەم شارە گەورەیەدا سەیارەیەکی کۆن نابینی و بەسەدان جۆر میوەی خۆیان و وڵاتەکان هەبوو دەتوت شارێکە لە شارەگەورەکانی ئەوروپا، ئەم گۆڕانەش لە ئوردوندا لە دواکەوتنەوە بۆ پێشکەوتن لە هەژاریەوە بۆ دەوڵەمەندی، هەمووی لەسەر حیسابی گەلی عێراق بووە. هەر زیانێك توشی ئێمە بوو بە قازانجی ئەوان تەواو بوو، چونکە لەساڵی ١٩٩١ تا ئێستا (واتە ٢٠٠١) گەمارۆی ئابوری هەیە لەسەر عێراق، تەنها ئەو دەرگایە ماوە لە بەینی عێراق و ئوردوندا، عێراق نەوتێکی بێ شومار دەدات یان بەبەلاش یان بەنیوەقیمەت بە ئوردونیەکان، ئەوانیش بە سێ قات دەیفرۆشنەوە بە جولەکەکان، هەروەها هەر شتێك دەهێنن بۆ عێراق بە سێ قات دەیفرۆشنەوە، هەرشتێك ئوردنیەکان لە عێراقەوە بیبەت بۆ ئوردن بە سێقات دەیفرۆشن. ئەمەش مانای ئەو وتەیەیە کە پێشینان وتویانە (مصائب قوم عند قوم فوائد) واتە کارەساتی گەلێك زۆرجار دەبێتە هۆی سودی گەلێکی تر.





شاری عەمان لە ڕابردو و ئێستادا

# بڕوانامەیەکی تری دکتۆرا
# لە تەمەنی ۸۲ ساڵیدا

دکتور عبدالحمید العانی هەبوو کە دەڵێن کوڕەکەی بەخوێنی صەدام قورئانی نووسیبێتەوە، کوڕەکە و باوکەکە لەلایەن صەدامە بانگکرابوون خەڵات بکرێن، لەوێ بەصەدامی وتبوو کێشەیەکم هەیە داواکارم بۆم چاك بکەیت، دکتۆرایەکم هەیە لەزانکۆی ئەزهەر داوا دەکەم بۆم نەقڵ بکەیت بۆ جامیعەی بەغدا، ئەمریان دەرکرد نەقڵیان کرد، بەبێ ئەوەی ئاگادارم منیان کردبوو بە موشریفی، هات بۆ لام کتێبێکی گەورەی بەدەستەوە بوو وتی: ئەمە ریسالەی دکتۆراکەمە و تۆش کراوی بەموشریفم، وتم: ئەدەبیەن تۆ ئەبوو پرسم پێ بکەیت، وتی: تەنەزولم نەدەکرد کەس ببێت بە موشریفم تەنها بەوە رازی بووم تۆ موشریفم بیت، منیش ڕەزامەندیم دەربڕی.

وتی: ئەوە ریسالەکەیە موافەقەی لەسەر بکە چونکە عەقدم هەیە لەگەڵیاندا دەچم بۆ یەمەن بۆ مامۆستایەتی.

وتم: لەنوکەوە دەست پێدەکەین، ئەگینا موشریفیەکەت قبوڵ ناکەم.

فەرزم کرد لەسەری هەفتەی دووجار بێت بۆ لام بۆ تاوتوێی بابەتەکەی.

ڕۆژێك باسی کێشەی دکتۆراکەی خۆم لەزانکۆی قاهیرە بۆ کرد کەبەهەمان شێوەی دکتۆراکەی زانکۆی ئەزهەری ئەوە، وتی: زۆر ئاسانە، وەرە ئەتبەم بۆ لای سەرۆك کۆمار وەکو قەراری بۆ من دەرکرد بۆ تۆش قەرار دەردەکات.

وتم: دکتۆر عبدالحمید، متمانەم بەتۆ هەیە بۆیە ئەو قسەیە دەکەم، بەینی خۆمان بێت، صەدام حسین هەموو بەغدام لەسەر تاپۆ بکات ئامادەنیم دەست بخەمە ناودەستی، چ جای ئەوەی بۆ دکتۆرایەك.

وتی: باشە با بڕۆین بۆ لای دکتۆر هومام عبدالرزاق وەزیری تەعلیم عالی.

وتم: مانعم نیە.

ڕۆشتین و بەگەرمی پێشوازی کردین، ویستم خۆم بناسێنم، وتی: (انا اعرفك، انت علم من اعلام العراق)، وتم: ماڵت ئاوا بێت گومان باشی خۆتە، وتی: فەرموو چیت دەوێت بۆت دەکەم، منیش وتم: هەمان ئەو کێشەی دکتۆر عبدالحمید هەیبووە و سەرۆك کۆمار بۆی چارەسەر کردووە، ئێستا تۆش وەك (سابقة قضائية) بۆ منی بکە، دەست بەجێ مدیر عامی بانگکردو فەرمانی پێکرد کارەکەم بکات و کتابیان بۆ کردم بۆ زانکۆی بەغدا، بڕیارێکی تازەش دەرچوو بوو هەرکەس ماجستێری هەبێت و دەساڵ بێت پلەی پرۆفیسۆری هەبێت ئەوا ساڵی ئامادەکاری پێویست نیە، لەبەر ئەوە دەستم کرد بەگەڕان بەشوێن موشریفدا، هەرکەسم سەیر دەکرد تەلەبەی خۆم بوو، ئاخری دکتۆر حەسەن زەنون کە عالمێکی بەرزە و لەهەمان کولیەی من بوو.

وتم: ئوستاز نابیت بەموشریفم.

وتی: خێر ئیشرافی چی؟.

وتم: ریسالەیەکی دکتۆرام هەیە.

وتی: (مو عيب عليك انت استاذ الاساتذة).

وتی: موشەرەف دەبم.

سەرلەنوێ دەستم کردەوە بەنوسینی ریسالەی دکتۆراکە و دووبارە پێیداچوومەوە و گۆڕانکاریم تێدا کرد.

لە **٢٠٠٥/٦/٢٠** لە هۆڵی کۆلیجی یاسای زانکۆی بەغدا، بە ئامادەبوونی سەرۆکی زانکۆی نەهرەین و سەرۆکی زانکۆی ئیسلامی و بەڕێوەبەری گشتی سەرپەرشتیاری پەروەردەیی وەزارەتی خوێندنی باڵا، گفتوگۆی نامەی دکتۆراکەم

لەبواری یاسادا کرا بە ناونیشانی (نظرية الإلتزام برد غير مستحق/ دراسة مقارنة).

لیژنەی گفتوگۆ پێکهاتبوو لە بەڕێزان: (م. زیا شیت خەتاب) و (د.عبدالستار حامد دباغ) و (د.عیصمەت عبدالمجید) و (م.ی. د.جمال ابراهیم حەیدەری)، لەگەڵ (حەسەن عەلی زەنون) وەك سەرپەرشتیار.

پاش گفتوگۆیەکی زانستی، وەك خۆی و بێ دەستکاری بە پلەی (بالا) پەسەند کرا.

شایانی باسە کە من هەر بەشێکم لەنامەی دکتۆراکە دەنووسی لەگەڵ حەقی سەرپەرشتیاریەکە مانگی جارێك دەمبرد بۆی، کەبەشی یەکەمی خوێندنەوە وتی زۆرم سوود وەرگرت لەم بەشە، جاری دووەم لەبەر ئەوە ئەوەی رەخنەم لەدکتۆر حەسن زەنون و سەنهوریم کردبوو، کاتێ چووم میوانێ: ی لە لابوو، زۆر بەتوڕەییەوە وتی: ئەم بەشەی هێناوەتە هیچ پەیوەندییەکی بەباسەکەتەوە نیە، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە من رەخنەم لێ گرتووە و ئەویش لەو کەسانە بوو کەرەخنەی زۆر پێ ناخۆش بوو، جاری سێیەم کەچووم پێم وت کردومە بەچوار بەشەوە و قسەکەی تۆ هەڵەیە و ئەوەی من راستە، پاش خوێندنەوە و هەمووی پێی وتم: (أنت على الصواب وانا على الخطا)، منیش پێم وت: لەمەولا هیچت بۆ ناهێنم بیخوێنیتەوە لەسەر مەسئولیەتی خۆم نامەی دکتۆراکە تەواو دەکەم هەر هەڵەیەکم بوو لەکاتی موناقەشەدا رەتی بکەنەوە، وتی: نابێت، وتم: دەبێت، ئەویش رازی بوو، وەك جاران مانگانە پارەی حەقی ئیشرافیەکەم بۆ دەبرد و دەموت نووسینت بۆ ناهێنم تاکاتی موناقەشەکە، ئەوە بوو سوپاس بۆ خوا پاش موناقەشە بەئیمتیاز قبوڵ کرا.

لەو دانیشتنەدا یەکێك لەو شتانەی لەپێشکەکیەکەدا باسم کرد ئەم دێڕە شیعرە بوو کە پێم خۆشە لێرەدا بۆ ئێوەی خوێنەری بەڕێزیشی تۆمار بکەم:

سنـي بـروحي لا بعـدّد. سـنين
فلأسـخـرنّ غـداً من التسـعين
عمري من الثمانين يركض مسرعا
والـروح ثـابته علـى العشـرين

احمد صافي النجفي

# پەیوەندیم لەگەڵ قوتابیاندا



لەو رۆژەوەی وانە بە قوتابیان دەڵێمەوە لەرێکەوتی (١٩٤٦/٦/٧) تا ئەمرۆ کە رێکەوتی (٢٠٠١/٧/٢٨)ە وانەم بەهەر قوتابییەك وتبێتەوە وەك منداڵی خۆم تەماشام کردوە، زۆر بەدڵسۆزی وانەکەم پێ وتۆتەوە، هیچ کاتێك وازم لێنەهێناوە هەتا ئەو شتانەی پێیان دەڵێم تێنەگەن.

لەماوەی وانەوتنەوەمدا تەنها یەك قوتابی زیانی بەدەستی من وەرگرتوە، ئەویش گوناهەکەی لەخودی خۆیەوە بوو، لەکاتی تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵی (١٩٨٦) من چاودێر بووم لە هۆڵی تاقیکردنەوەی قوتابیاندا، بینیم قوتابییەك کاغەزێکی لایە هەندێ شتی لەسەر نوسیووە پەیوەندی بەو وانەیەوە هەبە کە تاقیکردنەوەی تێدا دەدرێ، کاتێك چووم بۆلای کاغەزەکەی خستە ژێر

دەفتەرەکەیەوە، وتم: کوڕم کاغەزەکەم بدەرێ با کەس نەزانێ هیچ شتێکت لەگەڵ ناکەم، ئەویش کاغەزەکەی دەرهێناو خستیە دەمیەوەو قوتی دا، ئیتر شتەکە لەلای قوتابیەکانی تر ئاشکرابوو نەمتوانی بیشارمەوە، بەسەرهاتەکەم نووسی بۆ ڕاگر، بڕیار درا کە ئەو ساڵە ئەو قوتابیە (راسب) بێت لەهەموو دەرسەکاندا، شەو کەنووستم ئەو قوتابیەم دەهاتەوە بەرچاو زۆر خەفەتم خوارد کە من ساڵەهای ساڵە قوتابی بەدەستی من هیچ زیانێکی لێ نەکەوتوە، بۆ وام کرد، دیارە قوتابیەکەش گوناهی خۆی بوو.

لە (١٩٧٦/١/١)ەوە تا ئێستا وانە دەڵێمەوە لە کۆلیجی یاسا ولەکۆلیجی شەریعەت لەبەغدا و، لەپەیمانگای قەزایی (معهد القضائي) ئەوە ١٤ ساڵە دەرس دەڵێمەوە لە کۆلیجی یاسای صدام، هەر قوتابیەکم لەهەر دائیرەیەك یان لەرێگەوباندا ببینمەوە باوەشم پێدا دەکات وئەملاو ئەولام ماچ دەکات و پێم دەڵێت: تۆ مامۆستایەکی تا مردن لەناو دڵماندایت و هیچ کاتێك لەبیرمان ناچی، ئەم نوسراوانەی خوارەوە بەزمانی عەرەبی بەڵگەیە کەتا چ رادەیەك قوتابی رێزی دەگرتم، ئەمەش کە باسی ئەکەم بۆ ئەوەی هەموو مامۆستایەك هەمان رێگای من بگرن، بەدڵسۆزی دەرس بڵێنەوە و قوتابیەکان بەمناڵی خۆیان بزانن.

**ئەمانەش نمونەیەکە لە نامەی دەربڕینی سۆز و رێزی قوتابییەکان بۆم:**

اجلك بنافسه الوقار بوقره
وتشتاق وصل علومه الاعلام

اجلك تحلى بالخلائق كلها
من كل ما سمع العباد و راموا

* ١ وشفعت من عز الاله بدينه
قوماً تربوا في القفار وناموا

* ٢ فيجود نادوماً بما تفيض علمه
وبجوده فوق الهموم سقام

ويدك ما خص الاله عبادة
فيقول انذب او يقول: حرام

هو ذاك منه قد لمتني في مدحه
وتلومني في ذمه الاقوام

عجزت وشعري ان نحيط بوصفه
وتكسرت في مدحه الاقلام

---

* ١ اشاره الى اسم استاذي العزيز مصطفى وهو احد اسماء النبي محمد (ص)
* ٢ اشاره الى تقصيرنا تجاهك

الى استاذي العزيز مصطفى الزلمي

احد طلبة المرحلة الاولى

[signature]

١٤/٣/١٩٩٢

مەزنی

مەزنی بۆ مەزنی بەرزی خاوەن مەزنترین و بەرزترین مەزنی و بەرزی
کە مەزنێکی وەك تۆی مەزن لە نێو نەتەوەیەکی مەزن مەزنکرد ،
تاڵ و مەزنی و بەرزی مەزنی بەرز بە مەزن و بەرز بەرزیکەیتەوە
بۆ مەزن و نامەزن ، تاکو ئەوەی مەزنە مەزنتربێت بە بەرزبوونەوەی
زیاتری بەرەو مەزنی بەرز وە ئەوەی نامەزنە بەرزبێتەوە بەرەو
مەزنی بەرز وە بە مەزنی و بەرزی بزانێت .

پێشکەشە بە بەڕێز پرۆفیسۆری ئەزموودار دکتۆر مصطفى زلمی

سنورفێق - تەنکەفێق

لله درُّك من رجل

وكان الزهاويُّ في دنيا العلم قائدها
تباركَ ظلكَ اينما ارتسمَ

نهرٌ من العلم لا وقوفَ له
ولا صدودٌ ولا ضيقٍ ولا سقمُ

يا ليتَ شعري ما اقولُ له
قد بلي الشعرُ في شكرهِ وانعدمُ

وذابَ الكلامُ حتى لا يُساعدني
كانَّ الكلامُ نملٌ وموصوفهُ الهرمُ

وقد اضافَ لبحرِ العلمِ حكمتهُ
فامتنت له الاعرابَ والعجمُ

وشمّر عن ساعدِ الجدِّ مُخبرنا
انَّ الحياةَ مماتٌ بفقدِها القلمُ

بوركتَ يا نوراً من الانوارِ يرشدنا
وشمساً بكلِّ الخيرِ يحتدمُ

وارجو اللهَ باخرِ الكلامِ سائلهُ
ان يطيلَ عمرهُ بلا حزنٍ ولا سقمُ

وان يديمَ نورهُ لاجيالِنا
حتى تشتدَّ بذكرهِ الهِمَمُ

الطالب
صلاح مصطفى توفيق
١٢-٦-١٩٩٥
[signature]

## هەندێك لەیاداشتەكانم لەزانكۆدا



**بەپێی رووداوەكانی یەك لەدوای یەك بەم شێوەیە دەینووسمەوە:**

**یەكـــەم:**

ساڵی ١٩٧٦ دەرسێك هەبوو لەقۆناغی چوارەمی یاسا، ئەویش بابەتی (اصول الفقه الاسلامي) بوو، ئەم دەرسە زۆر گران بوو، بریار وابوو كە من بیڵێمەوە، بەڵام قوتابییەكان وتیان ئەمە زۆر گرانە دەبێت بگۆڕدرێت بە بابەتێكی تر، ئەم داواكارییە لەقوتابییەكانی بەشی ئێوارانەوە بوو، كە بریتی بوون لەئەفسەری سوپا و ئەمن و موخابەرات، لام وایە هەندێكیان لەئاستی دواناوەندیشدا نەبوون، بەڵام لەساڵی (١٩٧٥) تا (١٩٨٥) هەموو ساڵێك لیستێك بۆ كۆلیج دەهات، كە داوا دەكرا ئەوانە وەربگرین و لەكۆلیجی یاسای ئێواران دەوام بكەن، ئەمانە

ئاستی خوێندەواریان نزم بوو، ئاستی گشتی زانکۆیان بەرەو دواوە برد، بەشێکی ئەم قوتابیانە کاربەدەستی گەورە بوون، پشتیان بەستبوو بە (قۆپی و واستە).

لەسەر داوای ئەمانە، بابەتی (اصول الفقه) گۆڕا بە (فلسفة القانون والشريعة)، بەمەرجێ کە من (فلسفه الشريعة) بڵێمەوە، مامۆستایەکی میسرییان هێنابوو، مەسیحی بوو ناوی (د. ثروت الاسيوطي) بوو تا (فلسفة اﻻلقانون) بڵێتەوە، هەر بابەتێکیان (٥٠) نمرەی بۆ دانرابوو، کاتێ تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵ تەواو بوو، دەرکەوت زۆربەی قوتابیەکان (٥٠) نمرەی تەواویان لەبابەتەکەی لای مامۆستا میسریەکە وەرگرتوە و لەبابەتەکەی مندا دەرنەچوون، منیش سەرم سوڕما بۆچی وایە؟

لەپاش دووساڵ ئەم نهێنیەم بۆ دەرکەوت، ئەم مامۆستایە ئیشێکی تری هەبوو هاتبوو بۆ عێراق بۆ ئەوەی (موبەشیر) بێت و وانەی ئاینی مەسیحی بڵاو بکاتەوە نەك دەرس بڵێتەوە، ئەو موچەیەی وەری دەگرت بەسەر قوتابیە هەژارەکاندا بەشی دەکرد و خۆی لەلایەکی ترەوە موچەی تایبەتی هەبوو.

شایەنی باسە من سێ ساڵ لەمیسر خوێندومە، ئەگەر قوتابییەك لەمیسردا بمرێت کەس نیە خواردنی بداتێ، من ژورێکم گرتبوو لەگەڵ خێزانێك دادەنیشتم، رۆژی جەژن فەرموویان لێ نەکردم بۆ ئەوەی نانی جەژنیان لەگەڵ بخۆم.

لەکوردەواریدا دەڵێن: (لەرۆژی جەژندا نان بۆ میوان دابنێیت وەك ئەوەیە لەرۆژی باراندا ئاو بۆ مریشك دابنێیت).

ئەم مامۆستایە لەوتنەوەی (فلسفة القانون)دا لەسەرەتاوە دەستی دەکرد بەمەدحی ئیسلام، لەپاشان وورددەوردە ئەهاتە سەر ئەوەی کە ئیسلام بەکەڵکی ئادەمیزاد نایە و خزمەتی سەرمایەدارەکان دەکات و هۆی دواکەوتنی مرۆڤە، بەمجۆرە وەك شوشەیەك سەرەکەی هەنگوین و ژێرەکەی ژەهر وابوو، کەس بەم کارەساتەی نەزانی تا دوای دووساڵ، ئەوەبوو میری دەریکرد، من مامەوە بۆ ساڵی داهاتوو (فلسفة الشريعة)م بەدەرس دەوتەوە کە خۆم دامنابوو لەجیاتی (فلسفة القانون).

رۆژێك ماموٚستایەك بەناوی (ضیاء شیت الخطاب) کە لەئەمەریکا ماستەری وەرگرتبوو هات بوو بە (محاضر)، لەپاشان بوو بە سەرۆکی مەحکەمەی تەمییزی عێراق، وتی بەماموٚستاکانی کۆلیج بە راگرەوە: زۆر عەیبە ئێوە بابەتی (اصول الفقه الاسلامي)تان لابردوە، کە لە هەموو کۆلیجەکانی یاسای وڵاتە عەرەبیەکان دەوترێتەوە، چونکە پەیوەندییەکی زۆری هەیە بەدەرهێنانی یاساوە، وتی: من کە خۆم لە زانکۆی (هارڤارد) بووم لەئەمەریکا، دەرسێکی (اصول الفقه)یان هەبوو بەئینگلیزی بەداخەوە ماموٚستایەکی جولەکە دەیوتەوە، دوایی بۆم دەرکەوت کە کتێبەکە هی ئیمامی شافعییە لە (اصول الفقه) کراوە بەئینگلیزی و لەقۆناغی چواردا لە کۆلیجی یاسای ئەم زانکۆیە بەدەرس دەوترێتەوە.

لەپاش ئەوە بۆ ساڵی تازە (فلسفة الشريعة)یان لابرد، لەبەر ئەوەی هەندێك شتی تیابوو بەدڵی رژێمی ئەو سەردەمە نەبوو، داوایان لەمن کرد کتێبی (اصول الفقه) بڵێمەوە، منیش لەماوەی ژیانی زانکۆمدا وەك ماموٚستا کتێبی کەسم بە وانە نەوتۆتەوە، بەڵکو خۆم کتێبێکم لەو بابەتەدا داناوە، لەبەر ئەوە لەماوەیەکی کەمدا کتێبی (دلالات النصوص وطرق استنباط الاحکام في ضوء اصول الفقه الاسلامي)م دانا و کرا بەمەنهەج لەهەموو کۆلیجەکانی یاسادا لە بەغدا، تا ساڵی ١٩٩٠ کە کتێبی (اصول الفقه الاسلامی فی نسیج الجدید)م دانا، ئەم کتێبە زۆر شتی تازەی تیادابوو کە لە کتێبە کۆنەکاندا نیە، بەجۆرێکی ئاسان دامناوە لەدووبەرگدا و زۆر لەنمونەکانی لە یاسا هێناومەتەوە و ئێستا کراوە بە کتێبی مەنهەج لە هەموو کۆلیجەکانی یاسا لە عێراق و هەندێك لە زانکۆکانی ئوردون و یەمەن.

**دووهـــەم:**

ساڵی ١٩٧٧ لەکۆلیجی یاسا لەزانکۆی بەغدا بۆ یەکەمجار پێیان وتم کە دەرس بڵێمەوە لە پلەی ماستەر، کتێبێکم دانا لەژێر ناونیشانی (اسس المسؤولية الجنائية في الشريعة الاسلامية والقانون)، قوتابیەکانی ئەم پلەیە زۆریان لەموخابەرات بوون و بیروڕایان بە ئاینی ئیسلام کەم بوو، هەر جار کەدەرسێکم دەوتەوە لەم بابەتە شتێکی تازەم دەخستە بەرچاویان کە لەئیسلامدا

هەیە و یاسا هێشتا ڕێگەی پێنەبردوە، زۆر سەرسام دەبوون، چونکە نەیان دەزانی زۆر شت هەیە لەئیسلامدا یاسا سودی لێ وەرگرتوە، وای لێ هات کە هەوڵیان دەدا شتی زیاتر فێربن لەبارەی قورئانی پیرۆز و ئاینی ئیسلام و فەرمودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت)، هەندێك لەوانە من بووم بەسەرپەرشتیاری ماستەرنامەکانیان لە پلەی ماستەردا، دواتر لە پلەی دکتۆرادا لەبابەت بەراورد کردن بوو لە نێوان (شەریعەت و یاسای وڵاتاندا)، لەهەمان کاتدا لەوتنەوەی وانەکانی تردا لە قۆناغی یەك وسێ و چوارەمدا بەراوردم دەکرد لەنێوان شەریعەتی ئیسلام و یاسادا، یەکەمجار زۆر لەوانەی کە سەر بەحیزبی بەعس بوون پێیان ناخۆش بوو، بەڵام توانیم تێیان بگەیەنم کە زۆر شت هەیە لە ئاینی ئیسلامدا کەپەیوەندی هەیە بەژیانی ئادەمیزاد و لەیاساکانی ووڵاتاندا نیە، ئێستا وای لێهاتوە ئەوەی لەپلەی ماستەر و دکتۆرا دا بەراورد نەکات لەنێوان شەریعەت و یاسادا نامەکەی لێ قبوڵ ناکرێ.

# جەڵتەی دڵ

ڕۆژی ١٩٩٥/١٠/٢١ لەکاتی دەرس وتنەوە بە قوتابیانی دیراساتی علیا (دکتۆرا) لە کولیەی صەدام للحقوق، توشی جەڵتەی دڵ بووم، بردمیانە نەخۆشخانەی صدامی تعلیمی، خستمیانە ژێر جیهازی ئینعاشەوە، لەپاش دوو ڕۆژ، سەعات دووی شەو دووبارە توشم بوەوە، لە دوای ماوەیەکی تر کە هاتمەوە، دوبارە هاتەوە سەرم، جاری سێهەم چوار ڕۆژ لەژێر ئینعاش دا بووم، دایکی محەمەد - خوا پاداشتی چاکەی بداتەوە - تا بەیانی لەسەرم بوو.

پاشان (٨٢) ڕۆژ ئیجازەیان پێدام و لەماڵەوە بووم.

بۆ جاری سێیەم خەبەری مردنم چووبوو بۆ سلێمانی، کوڕ و کچەکانم لە سلێمانییەوە هاتن، سەرەڕای ئەوەی ڕێگا زۆر ناخۆش بوو، سەعات دەی شەو گەیشتن.

مەلا حەمەئەمین دزلی، کە لەساڵی ١٩٤٣ لە سنندح (کوردستان) لەئێران لەلای من ئەیخوێند، ئەوکاتە من لەلای مەلا محمود مفتی لە دار الإحسان ئەمخوێند، پاش دوو هەفتە بە گریان هات بۆ لام وتی هەواڵی مردنت هات بۆ سلێمانی.

# عــەبد و جــاریە

لەساڵی ١٩٨٢ بووم بە سەرپەرشتیاری نامەی دکتۆرای (حسێن نەدا)، کەبرای ژنەکەی (احمد حسن بکر)بوو سەرۆك کۆماری پێشووی عێراق، بۆ ماوەی دوو ساڵ، بابەتی نامەکەی ئەمەبوو (القانون الدولي الإنساني في الشريعة والقانون)، لەم نامەیەدا بەشێك تەرخان کرابوو بۆ باسی دیلی جەنگ لەپێش ئیسلام و پاش ئیسلام.

شایانی باسە لەپێش ئیسلامدا ژمارەی (عبد و جاریە) زۆرتر بوو لە مرۆڤی ئازاد، کاتێك ئیسلام هات ئەم رژێمە ناڕەوایەی دانا بە گۆمە ئاوێکی بۆگەن، لە چەند جۆگەیەکەوە ئاوی بۆ ئەهات، ئینجا رێگەی دانا بۆ وشککردنی ئەم جۆگانە یان بەرهەڵستییان، بۆ ئەوەی ئاوەکە نەچێتە ئەو گۆمەوە، تا پاش ماوەیەك گۆمەکە وشك بێت.

بەمجۆرە ئیسلام ئەم رژێمە پیسەی لەناوبرد، بەڵام بەداخەوە تا ئێستاش ٩٩٪ی خوێندەوارانی عەرەب بیروباوەڕیان وایە کە ئیسلام دانی ناوە بە عەبد و جاریە و هەتاهەتایە مرۆڤ ئەتوانێ برای خۆی بکا بە عەبد یان خوشکی خۆی بکات بە جاریە،

هەربەم بۆنەیەوە یەکێك لەو مامۆستایانەی کاتی خۆی لە ١٩٦٤ دەرسی پێ وتم، کە لەنێو موسڵمانانی عێراق و وڵاتە عەرەبییەکاندا بە پیاوێکی خوێندەوار و شارەزا دائەنرێ و زانایەکی بەرزە لە شەریعەتی ئیسلامدا، ئەویش (د.عبدالكريم زيدان)ە.

هەر نامەیەکی دکتۆرا کە تەواو بێت ئەینێرت بۆ لای پسپۆڕ(خبیر) بۆ ئەوەی بزانێت ئەم دانراوە هی ئەوەیە پلەی دکتۆرا بدرێ بە خاوەنی یان نا. لەبەر ئەوە نامەی دکتۆراکەی (حسێن نەدا)یان نارد بۆ (د.عبدالکریم زێدان)، ئەویش راپۆرتێکی نووسیبوو، تیادا وتبووی بەشێکی تیایە تەرخان کراوە بۆ باسی عەبد و جاریە، ئەبێت هەڵبگیرێت، چونکە عەبد و جاریە لە ئیسلامدا تا رۆژی قیامەت ئەمێنێت، هەر موسڵمانێك لەگەڵ هەر ناموسڵمانێك کەوتە جەنگەوە، ئەگەر زاڵ بوو بەسەریدا، ئەتوانێ ژن و کچەکانی بکات بە جاریەو بێ مارەکردن بۆی حەلاڵ دەبێت، پیاوەکەش دەتوانێ بەپێی فەرمانی سەرۆك یان بیکوژێت یان بیکات بە بەندە یان سەرانەی لێ بسێنێ.

دیارە ئەم کارە ناڕەوایە کە بەندە پەسەندی ئەکات هیچ کاتێك خوای گەورە حەلاڵی ناکات، ئینجا بۆ روونکردنەوەی ئەم باسە بەگرنگی ئەزانم کە تۆزێك روونی بکەمەوە بۆ هەموو زاناو ژیرێك بۆ ئەوەی دوای ئەو خاوەن مێشك وشکانە نەکەون.

## بەندایەتی، سەرچاوەکانی چین و چۆن ئیسلام لەناوی برد؟

### سەرچاوەکانی پەیدابوونی بەندایەتی (عبد و جاریە):

**١- جـــەنگ:** گەورەترین هۆی پەیدابوونی عەبد و جاریە، جەنگ بوو، هەر هۆزێك لەگەڵ هۆزێکی تر بکەوتایەتە جەنگەوە، یان هەر دەوڵەتێك لەگەڵ دەوڵەتێکی تر بجەنگایە، ئەوەی کە زاڵ ئەبوو بەسەر ئەوی تر، پیاوەکانی یان ئەکوشت یان ئەیکردن بە بەندە، ژن و کچەکانی ئەکرد بە جاریە، یان ئەیانفرۆشت لە بازاڕ یان ئەیانکردن بە خزمەتکار، کاری پێ دەکردن و لە هەمان کاتدا لەگەڵیاندا ڕایئەبوارد، چونکە وەك ژنەکەی بوو بۆی. لەبەر ئەم هۆیە لەنێو عەرەبەکاندا باوبوو کە کچ زیندەبەچاڵ بکرێ، کاتێك کە گەورە ئەبوو، هەستی بکردایە کە رۆژێ لەرۆژان لە جەنگ بەدیل ئەگیرێ، زیندەبەچاڵی ئەکرد، خوای گەورەش دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴿٩﴾ ﴾ التکویر:٨-٩.

واتە: هەر کاتێك کچی زیندەبەچاڵکراو پرسیاری لێکرا لەرۆژی قیامەت کە بە چ تاوانێك زیندەبەچاڵ کراوە، تاوانکارەکەی هەست ئەکات بە تاوانەکەی و بەوەی کە شایانی ئەوەیە سزا بدرێت. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ ﴾ النحل : ٥٨.

واتە: هەرکاتێك بە یەکێك لە عەرەبەکان بوترایە ژنەکەت کچی بووە، دەم و چاوی ڕەش و تاڵ ئەبوو لە خەفەت و ڕق خواردنەوەی خۆی، چونکە ئەیزانی پاشەڕۆژ ئەگەر هۆزەکەی کەوتە جەنگەوە لەگەڵ هەر هۆزێك و لاکەی تر زاڵ بوو، ئەم کچەی بەدیل ئەگیرێ و ئەکرێ بەجاریە، ئەم و ئەو ئەیکڕێ و ئەیفرۆشێ و ناموس و شەرەفی ئەو ئەبات بە ناخی زەویدا.

هەر بەم بۆنەیەوە خوای گەورە دەفەرموێ لە بابەت دیلی جەنگەوە:

﴿ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ﴾ محمد : ٤.

واتە: ئەگەر لە جەنگدا هەرکەسێك گیرا بەدیل، نێرینە یان مێیینە، لەپاش ئەوە جەنگەکە تەواو ئەبێت بەرەڵا بکرێت بەبێ بەرامبەر یان بەرامبەر بەو دیلانەی کە لایەکەی تر گرتویانە یان بەرامبەر بە ماڵ و سامان یان شتی تر، وەکو پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بە دیلەکانی جەنگی بەدری فەرموو: هەرکەسێ لەئێوە دە منداڵی موسڵمان فێری خوێندن و نوسین بکات ئازاد دەبێت بڕواتەوە شوێنی خۆی.

ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾ یەکەم ئایەتە لە قورئانی پیرۆز کە بڕیاری پاشەڕۆژی دیلەکانی جەنگی داوە، کە ئەوەش یەك شتە، بەرەڵاکردنیان، هەر بەم بۆنەیەوە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ یارەکانی دیلەکانی جەنگیان نەئەکوشت و نەیانئەکردنە عەبد و جاریە، جگە لە جەنگی هۆزی بەنی مستەلەق، ئەویش لەبەر هۆیەکی تایبەتی بوو، لە پاشان هەموویانی ئازاد کرد.

بەڵام بەداخەوە هەتا ئێستاش لەنێو عەرەبەکاندا عەبد و جاریە ماوە، بەتایبەتی دەوڵەتەکانی کەنداو، خەلیفەکانی ئیسلام لەپاش خەلیفەکانی راشیدین هەموویان لە ماڵەوە بەلای کەمەوە سەد جاریەی جوانکیلەی هەبوو بۆ خزمەت و رابواردن، زیاتر بەداخەوە ئیمامەکانی وەکو (ئەبو حەنیفە) و (مالیك) و (شافیعی) و مەزهەبەکانی تر، هەموویان دانیان ناوە بە کردن و بوونی دیلی جەنگ بە عەبد و جاریە.

**٢- رفـــانـدن:**

هەروەکو چۆن دزی باوە، یەکێك ئەچێت ماڵی یەکێتی تر ئەدزێت، هەروەها هەندێ بووبوون بە جەردە، کوڕ و کچیان ئەرِفاند، کوڕەکە ئەبوو بە بەندە و کچەکە بە جاریە و، ئەیانبرد لە بازاڕ ئەیانفرۆشتن.

خوای گەورەش ئەم کردەوەیەی حەرام کرد و قورسترین سزای بۆ دانان، وەك دەفەرموێ:

﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ ﴾

المائدة : ٣٣.

**٣- قـــەرزاری:**

هەرکاتێك قەرزارەکە نەیتوانیایە قەرزەکەی بداتەوە بە خاوەنی، بۆ خاوەن قەرزەکە هەبوو کە قەرزارەکە و ژن و منداڵەکانی بکات بە عەبد و جاریەو بیانبات لە بازاڕ بیانفرۆشێت، خوای گەورە ئەمەی حەرام کرد و بڕیاری دا لە قورئانی پیرۆزدا کە هەر قەرزارێك ئەگەر نەیتوانی قەرزەکەی بداتەوە، ئەبێت خاوەن قەرزەکە چاوەڕوانی بکات تا رۆژێك بتوانێت ئەو قەرزە بداتەوە، ئەگەر هەر نەیتوانی هەتا مرد، پێویستە میری لە بیت المال (خەزێنەی گشتی) ئەو قەرزە بداتەوە، ئەگەر خاوەن قەرزەکە زۆر پێویستی هەبوو بەو قەرزە، ئەگەر نا

گەردنی ئازادی بکات و پاداشتی خۆی لە خوای گەورە وەربگرێتەوە. قورئانی پیرۆز ئەفەرموێت:

﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ﴾ البقرە:٢٨٠.

واتە: ئەگەر قەرزارەکە هەژار بوو توانای نەبوو قەرزەکە بداتەوە، پێویستە لەسەر خاوەن قەرزەکە چاوەڕوانی بکات هەتا پاشەڕۆژ، وەکو باسمان کرد لە پێشەوە. واتە دروست نیە قەرزارێك نەتوانێ قەرزەکەی بداتەوە، هیچ سزاو ئازار بدرێت یان بخرێتە بەندیخانەوە یان هەر جۆرە سزایەکی تر.

**٤- ســـزای تـــاوان:**

سزای هەندێك لە تاوانەکان ئەوەبوو کە تاوانکارەکە بکرێ بە بەندە (عەبدو جاریە). لەپێش ئیسلامدا لەنێو هەندێ گەل باوبوو کە ئەگەر یەکێ پیاوێکی بکوشتبایە بە ناحەق یان دزی بکردایە، یان زینای بکردایە، سزاکەی ئەوەبوو ئەکرا بە عەبد یان جاریە، یان بۆ دەوڵەت، یان بۆ تاوانلێکراوەکە، یان بۆ میراتگرەکان لەکاتی کوشتندا، خوای گەورە بۆ هەر یەکێ لەم گوناهانە سزایەکی تایبەتی دانا، لەبەر ئەوە دروست نیە تاوانکارەکە بکرێت بە عەبد یان جاریە.

**٥- هـــــەژاری:**

هەندێ جار مرۆڤی وا هەبوو لەبەر هەژاری خۆی ئەفرۆشت بە یەکێك بیکات بە بەندە ئەگەر نێر بوایەو بە جاریە ئەگەر مێینە بوایە بۆ ئەوەی کڕیارەکەی بەخێوی بکات، خوای گەورە کڕین و فرۆشتنی مرۆڤی حەرام کرد و فەرمووی:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ ﴾ الإسراء:٧٠.

واتە: ڕێزی ئادەمیزادمان گرتووە، وە بایەخ و پایەیەکمان پێداوە کە شایەنی ئەوە نیە شتی ناڕەوا بەرامبەری بکرێت، یەکێك لەوانە کڕین و فرۆشتنیەتی.

**٦- فرۆشتنی باوك بۆ منداڵەکانی خۆی:**

ماوەیەك لەژیانی ئادەمیزاددا باوك کردەوەی لەگەڵ منداڵی وەك کردەوەی وابوو لەگەڵماڵیا، هەروەکو ئەیتوانی ماڵەکەی بفرۆشێ ئەیتوانی منداڵەکانی (کوڕ یان کچ) بفرۆشێت، دیارە فرۆشراوەکەش ئەو کاتە ئەبوو بە (عەبد و جاریە)، ئەمەش خوا حەرامی کرد وەکو لە خاڵی پێنجەمدا باس کرا.

**٧- منداڵی عەبد و جاریە وەکو باوك و دایکی ئەوانیش دائەنران بە عەبد و جاریە:**

ئایینی ئیسلام ئەم ڕێگەیەشی بڕی کە فەرمووی هەر پیاوێك چووە لای جاریەی و منداڵی بوو، ئەو منداڵە نابێت بە بەندە، بەڵکو ئازادە وەکو باوکەکەی.

زۆر هۆی تر هەبوو کە ئەم ڕژێمە بۆگەنەی لێ پەیدا ئەبوو، برا برای خۆی ئەکرد بە بەندەو خوشکی خۆی ئەکرد بە جاریە. هەروەکو لەم خاڵانەدا باسمان کرد، خوا ئەو هۆیانەی عەبد و جاریەی کە هەبوون لەپێش ئیسلامدا هەمووی لەناوبرد و حەرامی کرد.

ئینجا ماوەیەکی دانا کە لە یاسادا پێی ئەوترێ (فترة انتقالیة) بۆ نەمانی ئەم ڕژێمە بۆگەنە، ئەو ماوەیەش بریتی بوو لە سەدەی یەکەمی پاش ئیسلام، کە ئەو جیلە تەواو ئەبن، عەبد و جاریە لە پاش ئەوە ئیتر دروست نیە کەس هیچ کەسێك بتوانێت یەکێك بکات بە عەبد و جاریە.

**بەڵام بۆچی بۆ یەکەمجار خوا ئەمەی حەرام نەکرد و نەیفەرموو هەرچی عەبد و جاریەیە یا ئازاد بن؟**

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەمانەی خوارەوەیە:

**یەکەم:** کاتێك ئیسلام هات و ژمارەی عەبد و جاریە زۆرتر بوو لەوانەی کە پێیان ئەوترا (احرار و أسیاد)، ئەگەر ئیسلام بە یەکجار ئەمانەی ئازاد بکردایە بە ملیۆنەها عەبد و جاریە کە لە ماڵی (سەیدەکان) ئەژیان و بەبێ ئەوەی کە هۆیەکی ژیانیان هەبێت، لە کاتێکدا لە (بیت المال)ی ئیسلام هیچی تیا نەبوو، نەیئەتوانی ئەم هەموو عەبد و جاریەیە بەخێو بکات لە پاش ئازادکردنیان بەیەك

جار، ئەگەر ئیسلام ئازادی کردنایە بە یەکجار، هەموو ئەو عەبد و جاریەیە لە دژی بڕیاری ئیسلام ئەوەستانەوە، چونکە هۆیەك نەبوو بۆ ژیانیان.

**دووەم:** لەو ڕۆژەدا ئیسلام هات زۆرترین شتێك کە بازرگانی پێوە ئەکرا کڕین و فرۆشتنی لەسەر بوو، عەبد و جاریە بوو، لە مەککە و مەدینە بازاڕی تایبەتی هەبوو، کە عەبد و جاریەی تیا ئەفرۆشرا، پیاوی وا هەبوو هەزاران عەبد و جاریەی ڕاگرتبوو بۆ فرۆشتن بە قازانج.

ئەگەر ئیسلام بە یەکجار عەبد و جاریەی ئازاد بکردایە و کڕین و فرۆشتنی حەرام بکردایە، خاوەن عەبد و جاریەکان لەدژی ئایینی ئیسلام ئەوەستان، جا لەبەر ئەوە ڕێگەی دانا بۆ لەناوبردنی ئەم ڕژێمە بۆگەنە و ماوەیەکی دانا بۆ نەمانی، ئەویش کە بریتییە لە سەدەی یەکەمی پاش ئیسلام.

**سێیەم:** هەندێ کەس هەیە بەندایەتی ئەبێتە خوو بۆی، هەر پێی خۆشە خزمەتکار بێت و ژێردەستە بێت، هەروەکو لە وڵاتی کوردەواری هەندێ کەس خزمەتکاری ماڵی ئاغاو ماڵە شێخەکانە، ئەو خزمەتکارییەی نەئەگۆڕیەوە بە هیچ ژیانێکی تری باشتر، ئەگەر ئیسلام ئەم ڕژێمەی بە یەکجار لاببردایە، زۆر لە بەندەکان لەدژی ئیسلام ئەوەستان و مانەوەیان بە بەندایەتی لەلا باشتر ئەبوو.

بۆ نمونە (ابراهام لنکۆلن) شازدەهەمین سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، کاتێك بۆ یەکەمجار یاسای دەرکرد بۆ ئازادکردنی عەبد و جاریە و قەدەغەکردنی کڕین و فرۆشتنیان، زۆر لەو عەبد و جاریانە لەدژی یاساکە وەستان و لەلایان ستەم بوو، هاتنەوە بۆ ماڵی سەیدەکانیان پێ باشتر بوو، ئینجا لەبەر ئەمە ئیسلام ماوەیەکی دووورودرێژی دانا کە زیاتر نەبێت لە سەد ساڵ بۆ لەناوبردنی ئەم ڕژێمە بۆگەنە.

لەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئیسلام هیچ کات دانی نەناوە بەوەدا کە مرۆڤ برای خۆی بکاتە بەندە و خوشکی خۆی بکات بە جاریە و بەبێ مارەکردن بچێتە لای، بەڵکو وەکو باسمان کرد ئیسلام ئەم ڕژێمەی وەکو گۆمە ئاوێکی بۆگەن پیشان داوە، لە چەند جۆگەیەکەوە ئاو ئەهات بۆ ئەم گۆمە،

ئەم جۆگەلانەی وشك كرد و لە ئەنجامدا بۆ هەتاهەتایە گۆمەكەش وشك بوو.

ئەو مامۆستایانەی ئایینی ئیسلام وەك دكتۆر عبدالكریم زێدان و چەندانی تر، ئەگەر بەوردی لەم بابەتە ورد ببونایەتەوە و بچونایە ناو جەرگەی كارەكەوە، ئەیانزانی خوای گەورە هیچ وەخت ئەم كردەوە پەسەند ناكات، چونكە كردەوەیەك بۆ بەندە ناشیرین بێت چۆن خوا بڕیاری چاكەی ئەدات.

ئێستا ساڵی ٢٠٠١، سەدەی ٢١، (١٩١) دەوڵەت ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكانن، هەریەك لەم دەوڵەتانە كڕین و فرۆشتنی عەبد و جاریەیان پێ تاوانی گەورەیە، كەوابوو چۆن مرۆڤ بڕیار ئەدا كە خوای گەورە ئەم تاوانە ناهەموارە بە شتێكی دروست و باش بزانێت بۆ ئادەمیزاد.

جگە لەوەی كە باسمان كرد، بە سەدان ئایەتی پیرۆز هەن لە قورئانی پیرۆزدا هەمووی دژی بەندایەتین، هەندێ لەوانە وەكو:

﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ﴾ الحجرات : ١٣.

واتە: بەڕێزترینی كەس لای خودا ئەو كەسەیە كە لە خوا نزیك بێت و سودی بۆ ئادەمیزاد هەبێت.

هەروەها هەموو رۆژێك چەند جار لە نوێژدا دەڵێین (إياك نعبد) واتە: بەندایەتی تەنها بۆ تۆیە، هیچ كەسی تر شایەنی ئەوە نییە ببێ بە كۆیلەی و ملی بۆ كەچ بكات.

بەڵام بەداخەوە لە پاش خەلیفەكانی راشیدین، خەلیفەكانی ئیسلام جگە لە عمر كوڕی عبدالعزیز، هەر خەلیفەیەك بەلای كەمەوە سەد جاریەی جوانی رائەگرت لە ماڵەكەیدا و لەلای حەڵاڵ بوو وەكو ژنەكەی، بە درێژایی ساڵ لەگەڵ ئەمانە رایئەبوارد و سەماو گۆرانیان ئەوت، موسڵمانانیان لە هەموو زانایی و شارستانیەت و پێشكەوتنێك دواخست.

بۆ نمونە كاتێك كە ئەمریكا هێشتا نەدۆزرابوەوە، گەلەكانی ئەم وڵاتە وەكو ئاژەڵ ئەژیان، یاساكەیان یاسای ئاژەڵی دڕندەبوو، ئەوكاتە ئاڵای ئیسلام

لەسەر چواریەکی ئەرز ئەشەکایەوە، هەمووی لەژێر دەسەڵاتی ئیسلام بوو، یەکێ لەو وڵاتە گەورانە ئەندەلوس بوو، ئێستا پێی دەڵێن ئیسپانیا، یەکێك لە نمونەکانی ئەمڕۆ بۆ دواکەوتنی موسڵمانەکان ئەوەیە کە ملیارێك موسڵمان و ٣٠٠ ملیۆن عەرەب گیری خواردووە بەدەست سێ ملیۆن جولەکەوە، سەرۆکی وڵاتە عەرەبیەکان وڵات وڵات ئەگەڕێن دەست و قاچی سەرۆکی دەوڵەتەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا ماچ ئەکەن بۆ ئەوەی جولەکە لەگەڵ گەلە لێقەوماوەکەی فەلەستین رێك بکەوێت و دەستدرێژی نەکاتە سەر ئەم گەلە بەدبەختە، کە پەنجا ساڵە دەربەدەر و شاربەشار بووە و لە شێواوی و کوشتن و ستەمدا ئەژی، لەوان بەدبەختتر مەگەر هەر گەلی کورد بێت.

ئینجا با بگەڕێینەوە سەر دکتۆراکەی حوسێن نەدا، بە عەمیدی کۆلیجی یاسای زانکۆی بەغدام وت من یان لە ئیشراف ئەچمە دەرەوە یان بایەخی ئەم نامەی دکتۆرایە لەوەیە کە باسی بەشی عەبد و جاریەی تێدابێت، کە روونی کردۆتەوە لای خوا عەبد و جاریە نیە، هەموو ئادەمیزاد وەك یەك وایە، تەنیا بە چاکەکردن جیاوازییان هەیە، هەروەك پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (الناس سواسیة کأسنان المشط) واتە: هەموو ئادەمیزاد وەك یەك وانە لە رێز و نرخدا وەکو ددانی شانە، چۆن زیاد و کەمی نیە، ئەوانیش هەروانە.

ئینجا ڕاگرەکە بڕیاری دا کە هیچ بایەخ نەدرێ بە بڕیارەکەی مامۆستا عبدالکریم زێدان و لیژنەیان تەرتیب کرد و دکتۆرامان دا بە حوسێن نەدا بەبێ ئەوەی بەشەکە لابرێت لەنامەکە.

# چەند دیدار و
# سەردانێکی لەیاد نەچوو

## دیدەنـی دۆســتان و یـــاران
## لەپاش ٤٠ ساڵ لەیەك دابڕان

رۆژی شەممە ١٩٩٠/٩/٨ هات بەسەرما وتم بە دایکی محەمەد خۆت خازر بکە ئەچین بۆ رانیە، بۆ دیدەنی ماڵی ئیسماعیل ئاغا، کە لەساڵی ١٩٤٧-١٩٥٠ لە دێکەی ئەو مەلابووم، بەقەد توکەسەرم چاکەو پیاوەتی لەسەرمە، بەڵام چیبکەم تەنگ و چەڵەمەی رۆژگاری ناهەموار نەیهێشت تا ئێستە بچین بۆ لایان.

ئێوارە چوینە سلێمانی، لە ١٩٩٠/٩/٩ چوین بۆ رانیە، چونکە مناڵەکانی ئیسماعیل ئاغا چوبونە ئەوێ، لەپاش ئەوەی دێی سەرسیان بوو بەژێر بەنداوەکەوە، لەپاش بەستنی بەری ئاوەکەی زێی بچووك لە کونەکۆتر کە میرزا رۆستەمی کۆنە.

سەعات یەك گەیشتینە رانیە، چوینە ماڵی کاك حەسەن ئاغا کوڕی ئیسماعیل ئاغا، کە خۆی وەفاتی کردبوو، سێ کوڕی بەجێ مابون (حەسەن و محەمەد و خدر). زۆریان پێ خۆش بوو، ئەتوت شتێکی گەورەیان ونبووەو دۆزیویانەتەوە.

شەو چوین بۆ ماڵی کاك حسێن ئاغا کوڕی حاجی ئاغای برای ئیسماعیل ئاغا، خۆی وەفاتی کردبوو، بەڵام هەرسێ ژنەکەی مابوون، زەمانە جوانی

و گەنجیەکەیانی بردبوو، لە ساڵی ١٩٥٠ کە لەوێبووین، دایکی محەمەد و ئەوانیش لە گەرمەی گەنجیدا بوون، ڕەحمەت لەوەی کە وتویەتی:

(أشاب الصغير وأفنى الكبير، كرُّ الليالي ومَرُّ العشي)

واتە: دوبارە بوونەوەی ئێوارەو بەیانی ڕۆژ، گەنجی پیرکردووەو بیری لەناوبردووە.

دایکی محەمەد چووە دیوەخانی ژنان لەگەڵ ئاغاژنەکان و منیش چومە دیوەخانی پیاوان، لای کاك حوسێن ئاغا، ئەو شەوە خۆشترین شەوانی ژیانم بوو، لەگەڵ ئەو دۆستە خۆشەویستە بەڕێزانەم، هەرچەندە خۆیان نەمابوون، بەڵام کە دیم جێگەیان خاڵی نیە، کوڕانی پیاو و مەردیان لەپاش بەجێ ماوە و جێگایان روناکە، زۆر دڵشاد بووم.

ڕۆژی دوایی بەناو بێتواتەیا گەڕاینەوە، چوینە سەرچاوەی بێتواتە، تەماشام کرد وێنەیەکە لە دێ خۆشەویستەکەم، (دێی زەڵم)، زۆر دڵم کرایەوە، تێر ئاوی ساردم خواردەوە، هەندێ هەنار و هەنجیر و گوێزمان خوارد، ئینجا ڕووەو خەلیفان بەڕێکەوتین، دواتر گەیشتینە هەولێر و چوینە ماڵی شێخ بەشیر عبدالرحمن، شەوێکی خۆشم لەگەڵ ئەم زاتە پاکە ڕەوشت جوانە تێگەیشتووە بەسەربرد.

ڕۆژی ١٩٩٠/٩/١١ گەڕاینەوە بۆ بەغدا.

## دووبــاره

## سەردانی گۆشەی پرد

٢٠٠٦/١١/٢٨ لەگەڵ دایکی محەمەد لە بەغداوە بەڕێکەوتین بەرەو سلێمانی و لەوێوە بۆ خورماڵ، رۆژی دواتر گەیشتینە خورماڵ، شەوی ١١/٣٠ لەماڵی عوسمان محەمەدی ئامۆزام، لەگەڵ خزم و کەسوکار و دۆست و برادەرانی زەڵم و ئەحمەداواو خورماڵ کۆبوینەوەو قسەی خۆشی کۆنمان دەگێڕایەوە.



بۆ بەیــانی لەگــەڵ خزمـان و دۆستان بە شـەش سـەیارە لە رێــگە تــازەکەی پشتی ئەحمەداواوە بــەرێکەوتین بۆ زەڵم، هەتا گەیشتینە هەوارگای هـاوینەهەوارەکەمـان کە بە گۆشەی پرد بـەناوبانگە، چوینە سـەر جێگە کەپرەکەی مـن و دایکی محەمەد، کە هەفتەیەك دوای ژنهێنـانـم، نوێــژی مـەغریبمان دەکـرد، بومەلەرزە دەسـتی پێکرد و بۆ مــاویەکی کەم بەردەوام بوو، پارچە شاخێك کەوتە سەر کەپرەکەمان.

لەپاش تێپەڕبوونی (٦٠) ساڵ، چومە سەر بەردەکە و وتارێکم بۆ خزمەکانم داو و وتم: ئەی بەردەکە، ئەو حەلەی تۆ هاتیتە ناو کەپرەکەمانەوە، تەمەنم (٢٣) ساڵ بوو، ئێستاش تۆ هەروەکو خۆت ماوی، بەڵام من تەمەنم (٨٣) ساڵە.

زۆر دڵم پڕ بوو، بیرم لە ژیانی ئەم جیهانە دەکردەوە، کە چۆن چین لەدوای چین پیر ئەبن و ماڵئاوایی ئەخوازن و ئەبنەوە بە خاك و خۆڵ، بەڵام دنیاکە هەروەکو خۆی ئەمێنێتەوە، تا ئەو رۆژەی خوا بڕیاری داوە بە گۆڕینی.

دوای بەسەربردنی رۆژێکی خۆش، پاش عەسر گەڕاینەوە بۆ سلێمانی، بۆ ماڵی مەسعودی کوڕم.

شەوی ٢٠٠٦/١٢/١ ژمارەیەك مەلای شارەکە دەستە دەستە هاتن بۆ لام، منیش پێم ئەوتن هەموو شتێك گۆڕاوەو پێشکەوتوە، جگە لە مەلا، ئێوەش هەوڵ بدەن بۆ گۆڕان و پێشکەوتن، چونکە ئێوە پێشەوای ئایینی گەلەکەمانن، ئەگەر پێش نەکەون لە زانین و شارستانیدا، گەلەکەش هەر دواکەوتوو ئەبێ.

شەوی ٢-٢٠٠٦/١٢/٣ حاکمەکان هاتن بۆ لام و باسی دواکەوتویی یاسامان کرد لە عێراقدا، کە یاسای هەموو گەلێك گۆڕاوەو پێشکەوتووە، جگە لە یاسای عێراق و دەوڵەتە عەرەبیەکان، کە بەرەو دواوە ئەگەڕێنەوە.

٢٠٠٦/١٢/٣ چوین بۆ رانیە بۆ ماڵی حەسەن ئاغای پشدەری، کە لەساڵی ١٩٤٧ مەلای باوکی بووم بۆ ماوەی سێ ساڵ.

٢٠٠٦/١٢/٤ گەڕاینەوە بۆ بەغدا.

## دەستوری حوکمڕانی لە عێراق

**لەمێژووی عێراقدا بەپێی ئەم دەستورانەی لای خوارەوە حوکمڕانی کراوە:**

**القانون الاساسي العثماني (١٨٧٦-١٩٠٨ز):** پرۆژەی ئەم دەستورە لە ساڵی (١٨٧٦ز) لەلایەن لیژنەیەکەوە دانرا بەسەرۆکایەتی (مدحت پاشا) و بیست و هەشت ئەندام کە شانزە کەسیان فەرمانبەری مەدەنی بوون و دە کەسیان زانای ئاینی و دوو کەسەکەی تریش لەسوپا بوون، لەناو هەمووشیاندا تەنها یەکێکیان عێراقی بوو بەناوی (محمد امین افندی) الزندی، (لەم ناوەوە دەردەکەوێت کورد بوە)، ئەم دەستورە بریتی بوە لە (١١٩) مادده لە پاشانا سوڵتانی عوسمانی هەندێك گۆڕانکاری تیادا کرد .

**القانون الاساسي العراقي (ساڵی ١٩٢٥ز ):** لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم عێراق کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز، لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لە ساڵی ١٩٢١ز (فیصل)ی یەکەم دانرا بە پاشای عێراق و لە وتارەکەیدا لە (٢٣/آب/١٩٢١ز) داوای کرد کە لیژنەیەك پێك بێت بۆ دانانی پرۆژەی دەستوری عێراق.

**ئەم پرۆژەیە بە چەند لیژنەیەکدا تێ پەڕی:**

**یەکەم:** لە ساڵی ١٩٢١ز. هەندێ لە کاربەدەستانی بەریتانی بەشدارییان لە دانانی ئەم پرۆژەیەدا کرد، یەکەم راوێژکاری وەزارەتی دادی عێراقی (مستەر دراوەر) و سکرتێری یاسایی (مندوب السامی) بەریتانی (نیجل داڤیدس) و سەرچاوەی ئەم دەستورە دەستورەکانی (ئوستوراليا و هۆڵەندا وتورکیا) بوو.

**دووهەم:** ساڵی ١٩٢٢ز. پرۆژەکە درایە لیژنەیەکی تر کە پێکهاتبوو لە (ناجی سویدی) وەزیری داد بوو و (ساسون حزقیل) وەزیری دارایی و (ڕۆستەم حیدر) سکرتێری مەلیك، ئەم لیژنەیە چاوی خشاندەوە بە پرۆژەی یەکەم و هەندێ شتیان لە سەرچاوەی تر وەرگرت، وەك دەستوری یابانی.

**سێهەم:** (مقدم یۆنگ) لە دەزگای مەندوبی سامی بەریتانی پرۆژەکەی نارد بۆ بەریتانیا بۆ وەزیری (مستعمرات)ی بەریتانیا لە لەندن و لەوێش هەندێك گۆڕانکاری تیا کرا.

**چوارەم:** پاش گۆڕانکاریەکان لە (١٥/ شوبات/١٩٢٣ز) پرۆژەکە دووبارە گەڕایەوە بۆ عێراق .

**پێنجەم:** گۆڕانکاری دووهەم لە لایەن وەزیری (مستعمرات)ی بەریتانی لە (١٩/ نیسانی/ ١٩٢٣ز) کرا.

**شەشەم:** لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق بە شێوەیەکی کۆتایی گفتوگۆی لەسەر کرا و بڕیاریان دا ئەم پرۆژەیە ئامادەیە بۆ ئەوەی ئاڕاستەی ئەنجومەنی دامەزراندن (تأسیس) بکرێت.

ئەو کاتە ئەندامانی ئەنجومەنی دامەزراندن هەڵبژێردرا لە (٢٥/ شوبات/ ١٩٢٤ز) لە پاشانا بڕیاری پاشایانە درا بە کردنەوەی کاری ئەنجومەن ڕۆژی (٢٧/ئازار/ ١٩٢٤ز). لەسەرەتاوە ئەنجومەنی دامەزراندن (عبد المحسن السعدون)ی هەڵبژارد بە سەرۆکی ئەنجومەن کە هاوکات سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بوو.

هەژدە جار گفتوگۆ لە سەر ئەم پرۆژەیە کرا و بەڕەزامەندی ئەنجومەنی دامەزراندن لە (١٠/تەموز/ ١٩٢٤ز) کۆتایی هات، پاشا ڕەزامەند نەبوو لەسەری تاکو(٢١/ازار/ ١٩٢٥ز) واتە پاش هەشت مانگ.

ئەم دەستورە بریتی بوو لە (١٢٣) مادە، لە پاش هەندێك ڕاستکردنەوە بوو بە ١٢٥ مادده.

**دەستووری کۆماری:** کە ڕژێمی پاشایەتی ڕووخا لە (١٤/تەموزی/ ١٩٥٨ز) کۆتایی هات بەڕژێمی پاشایەتی و بوو بەکۆماری، کاربەدەستان داوایان کرد لە (مامۆستا حسين جميل) کە بەشداری بکات لە دانانی دەستوری نوێی کۆماری، لە (٢٠/ تەموزی/ ١٩٥٨ز) وەزیری ڕاگەیاندن (محمد صديق شنشل) و وەزیری ئابوری (محمد حديد)، پەیوەندیان کرد بە (حسين جميل) بۆ دانانی پرۆژەی کاتی بۆ دەستور، بە مەرجێك ڕەچاوی دوو خاڵ بکرێت بە تایبەتی، یەکەم عێراق بەشێکە لە وڵاتانی عەرەبی، دووهەم عەرەب و کورد هاوبەشن لەم نیشتمانەدا. پێکهاتنی ئەم پرۆژەیە دوو ڕۆژی خایاند و لە پاشانا ئاڕاستەی ئەنجومەنی وەزیران کرا.

ئەم پرۆژەیەی (حسين جميل) دایناببوو بریتیبوو لە (٣٠) بەند (مادده)، لە پاشانا ئەم پرۆژەیە هەندێك گۆڕانی تیادا کرابوو .

لە ساڵی (١٩٦٣ز) یاسای ئەنجومەنی نیشتمانی دانرا.

**دەستوری (٢٩/ نیسانی / ١٩٦٤ز)(کاتی ):** سەرۆکی کۆمار وەزیری دادی ڕاسپارد بۆ دانانی پرۆژەی دەستوری کاتی وئەم وەزیرە لیژنەیەکی پێکهێنا لە گەورە دادوەرەکان و لە ئەندامانی دەزگای نوسینەوەی یاسایی (ديوان القانوني ) و ئەم پرۆژەیە پێك هات لە (٦٠) بەند .

**دەستوری (٢١/ ئەیلولی/ ١٩٦٨ز) (کاتی) لە گەڵ ڕاستکردنەوەی لە (١٧/ تەموزی / ١٩٦٨ز):** کۆماری سێ هەم ڕووخا و ڕژێمێکی تازە هاتە جێگایی و ئەم دەستورە دەرچوو لە (٢١/ ئەیلولی/ ١٩٦٨ز) و ئەوانەی کە ڕژێمیان ئەبرد بەڕێوە لیژنەیەکیان پێکهێنا لە دادوەرانی (مەحکەمەی تەمیز) و هەندێك فەرمانبەری سەرۆکایەتی کۆماری بۆ دانانی پرۆژەی دەستوری تازە و ئەم دەستورە لەلایەن ئەنجومەنی سەرۆکایەتی شۆڕشەوە دانرا لە( ٢١/ ٩/ ١٩٦٨ز) واتا لە پاش (٦٥) ڕۆژ لە گۆڕینی ڕژێمی پێشوو، ئەم دەستورە بریتیبوو لە (٩٥) بەند (مادده).

**دەستوری (١٩٧٠/٧/١٦ز) کاتی لەگەڵ ڕاستکردنەوەی،** ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لیژنەیەکی پێکهێنا بۆ دانانی پڕۆژەی ئەم دەستورە کە پێکهاتبوو لە سەرۆکی دەزگای یاسایی لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و دوو پرۆفیسۆر لە مامۆستایانی کۆلیجی یاسا لە زانکۆی بەغدا. لەدواییدا دوو مامۆستای کەشیان دانا لە هەمان کۆلیج بۆ لیژنەکە، دواتر ئاراستەی جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کرا، لە پاشاندا کەسانی کەیان دانا بۆ لیژنەکە کەیەکێکیان سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی بوو بەسەرۆکایەتی سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش وئەندامانی ئەنجومەن کۆبونەوەیان لەسەر کرد و بە بڕیاری (٧٩٢) لە (١٦/ ٧/ ١٩٧٠ز ) بڕیاریان دا لە سەر دەستورەکە، ئەم دەستورە بریتیبوو لە (٦٧) بەند (مادده) لە پاشدا چوارده جار ڕاستکرایەوە و بوو بەهەفتا بەند.

پڕۆژەی دانانی دەستوری ساڵی (١٩٩٠ز) چاو پیاخشاندنی پرۆژەی دەستوری ساڵی (١٩٧٠ز) پڕۆژەیەکی تازە دانرا لە ساڵی ١٩٩٠ز کە بریتیبوو لە هەشت ئەندام لە دوو وەزیر و سێ مامۆستای زانکۆی تیادابوو و ئەندامێکی دادگای تەمیز و دوو فەرمانبەری یاسایی گەورە لە وەزارەتی دەرەوە بە سەرۆکایەتی (د. منژر الشاوی) کە وەزیری خوێندنی باڵا بوو و مامۆستای یاسای دەستوری پێشووبوو لە زانکۆی بەغدا . (٣٢) کۆبونەوە کرا بۆ ئەم مەبەستە لە (١١/ ئاب/ ١٩٨٩ز) کۆتایی پێ هات، کە پڕۆژەکە بریتیبوو لە (٢١٧) بەند (مادده) و، جگە لەو یاسانەی کە لە دەستورە پێشوەکاندا هاتبوو ئەم خاڵانەی بۆ زیاد کرا:

١- فرە بوونی حیزب.

٢- ڕفراندۆم (الاستفتاء).

٣- لامەرکەزی کارگێری (لامرکزیه الاداریه) .

٤- یاسای دەوڵەت.

٥- مافەکان و سەربەستی.

پاش ئەوەی لیژنەکە کۆتایی بەکارەکانی هێنا، ئاراستەی جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەوکاتە کرا و، لەگەڵ سەرکردایەتی ئەنجومەنی شۆڕش سەرکردایەتی سیاسی ئەوکاتە لێکۆلینەوەیان لەسەر کردو بانگهێشتی (الاعلان) پڕۆژەی دەستوریان کرد و ئاراستەی ئەنجومەنی نیشتمانی (مجلس الوطني)یان کرد بۆ ئامادەکردنی کە بخرێتە ڕوو، میللەت ڕفراندۆمی لە سەر بکات، بەڵام لە بەر نالەباری بارودۆخی ئەو کاتە لە پاش (٢/اب/ ١٩٩٠ز) و شەڕی کەنداوی دووهەم و ئابڵوقە (الحصار)یان خستنە سەر عێراق، لەلایەن وەزارەتی داد نەخرایە ڕوو و بڵاونەکرایەوە، تا کۆتایی بە ڕژێم هات لە (٩/ ٤/ ٢٠٠٣ز) و عێراق ڕزگار کرا لە دەستی ڕژێمی بەعس.

ئەم دەستورانە هیچیان مافی عێراقیەکانیان جێ بەجێ نەکرد بە جۆرێك وا کە هەرکەس مافی خۆی وەکو عێراقیەك و هاوولاتیەك وەربگرێت و چاودێری ڕەگەز و ئاینی بکرێت. بۆیە بیر کردنەوە لە دانانی پڕۆژەی دەستورێکی بەردەوام بۆ عێراق کەئاواتی هەموو لایەك بەدی بهێنێت لە دوای سەرنگومبوونی ڕژێمی بەعس و صدام دەستی پێکرد.

لە (١٣/ ٧/ ٢٠٠٣ز) لە لایەن ئەمەریکاوە ئەنجومەنی کاتی حوکمی دانرا، ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە سیانزە کەسیان شیعە بوون وە پێنج کەسیان کورد و پێنج کەسیان عەرەبی سوننە ویەکێکیان نوێنەری ئاشوریەکان و یەکێکی تریان نوێنەری تورکمانەکان بووە، ئەم ئەنجومەنە هەستی بەوە کرد کە هیچ تەنگوچەڵەمەیەکی عێراق چارەسەر ناکرێت تاکو دەستور دانەنرێ کە مافی هەموو لایەك دیاری بکات، لەبەر ئەوە بڕیاردرا بۆ لیژنەیەك کە ئەو ڕێگانە ڕوون بکاتەوە، بۆ چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەو کەسانەی کە ببنە ئەندامی پڕۆژەی دەستوری عێراق، بەو مەرجەی لەو (٢٥) کەسەی کە ئەندامی ئەنجومەنی حوکمن هەریەك کەســێکی تر هەڵبژێرن بۆ ئەندامێتی ئەم لیژنەیە.

ڕۆژی (١٣/ ٨/ ٢٠٠٣ز ) ئەندامانی ئەنجومەن کۆبونەوە و هەریەك لەئەندامەکان لە کاتی کۆبونەوەکەدا چەند ناوێکیان پێشکەش کرد، هەرچەندە لەوەوپێشتر دوو جار سەردانیان کردم لە بەر تەندروستیم داوای لێ بوردنم لێکردن،

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناوی من خرایە ناو لیستی کوردەکان کە بەشداری ئەم لیژنەیە بکەم، و (د. محسن عبد الحمید) کە نوێنەری ئیسلامیەکانی عێراق بوو ناوی منی هەڵبژاردبوو، باسی ئەو هۆیانەی کردبوو کە بۆ چی ناوی منی هەڵبژاردوە.

لەو کاتەدا کەناڵی ئاسمانی (الجزیرة) پەیوەندیان پێوەکردم و داوایان لێکردم کە باسی ئەو ئەرکە بکەم کە لیژنەکە پێی هەڵدەستێ، من وەڵامم دانەوە کە هێشتا من بەڕەسمی ئاگادار نەکراوم، لە بەر ئەوە نازانم ئامانجی ئەم لیژنەیە چیە، بەڵام ئەم لیژنەیە هەرکارێك بکات و هەر بڕیارێك بدات وەك سەرەتایەك و بناغەیەك وایە بۆ قۆناغەکانی دانانی دەستور و، هەر بڕیارێك بدرێت بڕیاری کۆتایی بۆ گەلانی عێراق دەبێت.

بەو شێوەیە لەگەڵ (٢٥) کەسدا ناومان دەرچوو بۆ ئەندامێتی لیژنەی ئامادەکاری بۆ دانانی شێوازی دەستور، لە ٢٠٠٣/٨/١٨-٢٠٠٣/٩/٣٠.

ڕۆژی (١٨/ ٨/ ٢٠٠٣ز ) لیژنەکە لە دیوانی وەزارەتی پیشەسازی کۆبووەوە.

ئەو ڕێگایانەی کە بەکاردەهێنرێت بۆ دیاری کردنی لیژنەی دانانی دەستوور بریتی بوون لە سێ ڕێگا.

١- ریگای هەڵبژاردنی گشتی.

٢- هەڵبژاردنی نوێنەرێك کە تەمەنی لە هەژدە ساڵ کەمتر نەبێت . کە پێی ئەوترێت ئاماری دانیشتوان (التعداد السكانی العام) .

٣- ئەگەر دەوڵەت نەبوو، لیژنەکە لە لایەن ئەنجومەنی حوکمەوە دابنرێت، هەروەکو دەستورەکانی ڕابردوو کە هەڵبژاردنیان لە لایەن میللەتەوە نەبووە بەڵکو لە لایەن دەسەڵاتەوە بووە.

**لایەنی باش و خراپی ئەم ڕێگایانە :**

**لایەنی باشی:** ئەمە باشترین ڕێگەیە لە وڵاتە شارستانیەکان و دیموکراسیەکان، چونکە هەر لایەك نوێنەری خۆی هەڵدەبژیرێت وە ئەو کەسەی کە هەڵ

دەبژێردرێت پێویستە خوێندەوارێکی باش بێت و بەتایبەت لە یاسادا شـارەزا بێت و کار بەپێویستیەکانی وولات بکات، نەك بیروبۆچونی خۆی، بەڵام ڕێگاکە کێشەو گرفتی زۆری تێدایە، کە هەندێکیان ئەمانەن:

أ- هەڵبژاردنی گشتی ماوەی ١٨ مانگ تا دوو ساڵ ئەخایەنێت و بڕی (١٠٠ ملیۆن بۆ ١٥٠ ملیۆن) دیناری عێراقی خەرجیی پێویستە، عێراق لەم کاتەدا پێویستییەکی زۆری بە دەستور هەیە و ناتوانرێت چاوەڕوانی بکرێت.

ب. یاسای هەڵبژاردن دەبێت سەرلەنوێ دابنرێتەوە و حکومەتێك نیە ئەو یاسایە دابڕێژێت.

ج- هەڵبژاردنی گشتی پێویستی بە ئامارێکی گشتی (الاحصاء العام ) هەیە و ئەمەش یاسای نوێ بەبێ بوونی حکومەتێك نابێت.

د- لە رووی باری ئاساییشەوە بارودۆخی عێراق گونجاو نیە لەم کاتەدا.

هـ- لە کاتی خۆیدا ڕژێمی ڕابردوو گۆڕانکاری کردوە سەبارەت بە دانیشتوان بە تایبەتی دانیشتوانی پارێزگای هەولێر و کەرکوك موصل و هەندێك لە شارەکانی باشووری عێراق . شایەنی باسە لەو ناوچانەی کەلەسەرەوە باسمان کرد هەندێك ڕەگەزی کوردو عەرەب وکوردو تورکمان دەبێت کێشەکانی نێوانیان چارەسەر بکرێت پێش کاتی هەڵبژاردنە گشتیەکە .

**ڕێگایی دووهەم :** ئەویش وەك هەڵبژاردنی گشتی باشە، بەڵام گیروگرفتی زۆرە هەروەك لەڕێگەی یەکەمدا باسمان کرد.

ئەمە پێویستی بەئاماری گشتی هەیە بۆ ئامادە کردنی پسوڵەی خێزانی و، ئەم پسوڵەیەش تەنها ناوی سەرۆکی خێزانی تێدابێت .

وە دەبێت دوبارە پیاچونەوە بکرێت لە تۆماری وەزارەتی بازرگانی بۆ ڕێکخستنی ناوەکان وەك پێویست بکرێت. چونکە لەڕێگای دووەم دا پێویستی بەهەڵبژاردن هەیە بەواتای مافی هەڵبژاردنیان هەیە.

**ڕێگای سێ هەم:** هەڵبژاردنی ڕێگایی دامەزراندن دەبێت ئەو کەسە جێی متمانەو باوەڕ بێت، هەروەك لە دەستورەکانی پێشووی عێراق دا، چونکە ئەم جۆرە ڕێگایە ئامانجی چینەکانی میللەت نایەنێتەدی و هەڵبژاردنن بەدامەزراندنی ئەندامەکانیان بە پێی ویستی دەسەڵات بووە.

ئێمە تاکو مانگی (٨ / ئاب) گفتوگۆی تەواومان لە سەر ئەم سێ ڕێگایە کرد لە ئەنجومەنی حوکم، برا شیعەکان سوور بوون لەسەر ڕێگای یەکەم وقایل نەبوون بۆ دووهەم و سێهەم. لە سەر بۆچوونی مەرجەعی باڵای شیعە لە عێراق دا (آیة الله علی سیستانی) کە ڕێگای یەکەمی لا گونجاوتر بوو.

لیژنەکە بڕیاری دا کە ڕۆژی (٣٠/ ٢٠٠٣/٨ز ) سەردانی بەڕێز (سیستانی) بکەین لە شاری نەجەف.

بەڕاستی ئەم پیاوە ناوداره کەسێکی زۆر ڕۆشنبیر و زانایە لە ڕووی ئاینی و سیاسیەوە، خواناس و ڕاستگۆ و(متواضع )ـە، پاش گفتوگۆکردن لە گەڵی ووتی: ئێوە بڕیاری چی ئەدەن منیش لەگەڵ ئێوەدام .

لەپاشان ئەنجومەنی حوکم بڕیاری دا لەگەڵ کەسایەتی و سیاسیە دیارەکانی بەغدا کۆ ببینەوە و بیروڕایان وەربگرین، هەروەها سەردانی پارێزگاکانی تریش بکەین ڕای گشتی میللەت وەربگرین.

لەسەر ئەو بڕیارە لیژنەیەك هەڵبژێردرا بۆ سەردانی پارێزگاکانی دیالە و کەرکوك و سلێمانی کە بریتی بوون لە (٥) ئەندام، خۆم یەکێکیان بووم، ڕۆژی ٩/١٦ سەردانی پارێزگای دیالەمان کرد و لە ١٧/ ٩ سەردانی پارێزگای کەرکوك و دواتر لە ڕۆژی ٩/١٨ سەردانی پارێزگای سلیمانی مان کرد.

لەئەنجامی سەردانەکانمان دا بۆمان ڕوون بوەوە کە گەلی عێراق ئەوەی مەبەست نەبوو کە هەڵبژاردن چۆن دەبێت، بەڵکو مەبەستیان ڕوونکردنەوە و دیاریکردنی مافەکانیان بوو لە دەستوردا. لە پارێزگای دیالە داوای دەوڵەتی ئیسلامی یان دەکرد و لە پارێزگای کەرکوکیش داوای فیدراڵییان دەکرد بۆ عەرەب و تورکمان، لە پارێزگای سلیمانی داوای فیدراڵییان دەکرد بۆ گەلی

کورد و دەیان ووت باوەڕیان نیە بەهیچ دەستورێك ئەگەر دان نەنێت بە مافی فیدراڵیدا.

لە پاش گەڕانەوەمان بەراووردمان کرد لە نێوان ئەنجامی سەردانەکانمان و بڕیارماندا بەوەی کە هەر سێ ڕێگاکە کە پێشتر باسمان لێوەکرد لایەنی (سلبی و ایجابی) لە بۆچونەکان دا بنوسینەوە و لێکۆڵینەوەو و گفتوگۆی لەسەر بکرێت.

بەو جۆرە ئەنجامی کاری لیژنەکە لەماوەی(٤٥) ڕۆژدا بەڕاپۆرتێك ئامادەکراو ئاڕاستەی ئەنجومەنی حوکم کرا.

تاکو ئێستا ئەنجومەنی حوکم بڕیاری نەداوە چ ڕێگایەك بگرێتەبەر، بەڵام وا دیارە دەستورێکی کاتی (دستور انتقالی) بۆ لابردنی ئەو کۆسپانەی کەدووچاری عێراق بوون دابنرێت .

من داوام کرد کەرێگای دامەزراندن بگیرێتەبەر، بەڵام دامەزراندنەکە فراوان بێت و هەر پارێزگایەك نوێنەری خۆی هەڵبژێرێت بۆ بەشداری کردن لە دانانی دەستوری (انتقالی)دا، بە تایبەت کوردەکان دژی ئەو بۆ چوونە وەستان، چونکە لە پاشەڕۆژ دەترسان نەوەك ببێتە هۆی ئەوەی فیدراڵیان لە دەست بچێت.

بەڵام وا دیارە کە ئەنجومەنی حوکم و ئەمەریکا بڕیاربدەن بۆ دانانی دەستورێکی (ئینتقالی ) بۆ دامەزراندنی حکومەتێك و هەڵبژاردنی پەرلەمان، ئەو کاتە ئەو دەستورە بخرێتە بەردەم میللەت بۆ دەنگدان لە سەری و لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی کە بە دڵی میللەتە.

## بەسەرهاتی نووسین و چاپکردنی کتێبی
## (التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن)

کاتێك کە لە قاهیرە دەمخوێند، ڕۆژێکیان لای یەکێك لەو کتێبفرۆشانەی کتێبیان لەسەر جادە دەفرۆشت، کتێبێکی ڕۆژهەڵاتناسێکم بەرچاوکەوت بەناوی (الناسخ والمنسوخ في القرآن)، زۆرم بەلاوە سەیربوو کە ڕۆژهەڵاتناسێك کتێبێك لەبارەی قورئانەوە دابنێت، کە خوێندمەوە لەسەرەتا تا ئاخیری کتێبەکە دەڵێت دەلیل لەسەر ئەوە کە قورئان وەحی نیە و محمد خۆی دایناوە، ناسخ و مەنسوخی تێدایە، چونکە ئەگەر کەسێك ئیمڕۆ حوکمێك دابنێ و سبەینێ لێی پەشیمان بێتەوە، نیشانەی نەقس و ناتەواویە، خوایش منەزەهە لە هەموو نەقسێك، واتە بوونی ناسخ و مەنسوخ لە قورئاندا گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە قورئان وەحی نییەو دانراوی محەمەدە. هەر ئەو کاتە لە قاهیرە بڕیارمدا دوای گەڕانەوەم بۆ عێراق،



ماوەیەك لە ژیانم تەرخان بکەم بۆ دیراسەی ئەم مەوزوعە.

لەساڵی ١٩٩٥ تووشی نەخۆشی دڵ بووم، وتم نەخۆشی دڵ ئینزاری مردنە، با بگەڕێمەوە سەر ئەو وەعدەی داومە لەبابەت دیراسەی نەسخ لە قورئاندا.

بۆ یەکەمجار چوومە شارع متنبی، هەرچی دەستم کەوت لە تەفسیرەکانی قورئان، کریم، هەرچیش لەبابەت نەسخ نووسرابوو، یان کڕیم یان استنساخم کرد. لەپاش ئەوە سێ مانگ تەنیا ئەم تەفسیر و کتێبانەم خوێندەوە، هیچ شتێکم نەنووسی لەبابەت نەسخەوە.

دوای ئەوە بۆم دەرکەوت کە هەڵەی موسڵمانەکان و ئیجماعیان لەسەر ئەوەی کە قورئان بەشێکی نەسخ کراوەتەوە، سەرچاوەکەی ئەوەیە، لە زەمانی پێغەمبەر((صلی الله علیه وسلم)) و سەحابەکانی و تابیعین و تابیعی تابیعین، بە تەخصیصی نەصی عامیان دەوت نەسخ، وە بە تەقیدی نەصی موتڵەقیان دەوت نەسخ، وە بە بەیانی موجمەلیان دەوت نەسخ، وە بە تەدەڕوجیان دەوت نەسخ، وە بە ڕوخسەتیان دەوت نەسخ، بەڵام لەپاشاندا زانایانی ئوسولی فیقهی ئیسلامی مەعنای نەسخیان گۆڕی بەم جۆرە کە بریتییە لە ئیلغاکردنەوەی حوکمێکی شەرعی سابق بە دەلیلێکی شەرعی دواتر.

ئینجا لەسەر ئەمە هەموو بڕیاریان دا کە نەسخ لە قورئاندا هەیە و، ئیستدلالیان دەکرد بە قسەی صەحابەکان و تابیعین، نەیاندەزانی کە مانای نەسخ لای صەحابەو تابیعین غەیری ئەم مەعنا تازەیەیە، هەر بەم جۆرە هەموو زاناکانی ئوسولی فیقهی ئیسلامی ئیتفاقیان کرد لەسەر ئەوە کە زیاتر لە (٢٥٠) ئایەت لە قورئاندا نەسخ کراوەتەوە.

لەلایەکی ترەوە هەڵەیەکی تری زانایانی ئوسوڵ ئەوەبوو فەرقیان نەدەخست لەبەینی مەرجەکانی نەسخی قورئان و مەرجەکانی نەسخی سوننەتی پێغەمبەر((صلی الله علیه وسلم)).

منیش بە پشتیوانی خوا دەستم کرد بە دانانی کتێبێك، تا بە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی بیسەلمێنم کە یەك ئایەت نییە لە قورئاندا نەسخ کرابێتەوە بە مانای

(ئیلغا)، سێ ساڵ هەر خەریکی ئەم ئیشە بووم، کاتی وا هەبوو رۆژی سێ سەعات لەسەری ئیشم دەکرد، سەرەڕای نەخۆشیی دڵەکەم، کەچی هەستم بە ماندوبوون نەدەکرد، بەڵام ئەگەر لاپەڕەیەك لە شتێکی ترم بنووسیایە بۆ ماوەی بیست دەقیقە، ماندوو دەبووم، دەبوایە بچم ئیسراحەت بکەم.

لەپاش ئەوەی کتێبەکەم تەواو کرد، دوو نوسخەم برد بۆ وەزارەتی ئیعلام و داوای ڕەزامەندی لەسەر چاپکردن و بڵاوکردنەوەیم کرد لەسەر ئەرکی خۆم، لەبەر ئەوەی ئەمە کتێبێکی ئاینییە، وەزارەتی ئیعلام ناردی بۆ ئەوقاف، لە ئەوقاف لیژنەیەکیان گرت لە پێنج مەلا، کە کۆبونەوە بۆ بڕیاردان لەسەر کتێبەکەم، وتیان پێویستە ئەم کتێبە بسوتێنرێنت بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەردەستی خەڵك و بڵێن لە قورئاندا نەسخ نییە.

وەختی خۆی (ابو مسلم الاصفهانی) تەفسیرێکی داناوە بیست بەرگ بووەو باسی ئەوەی کردوە کە نەسخ لە قورئاندا نیە، زانا مسوڵمانەکان لەدژی وەستاون و تەفسیرەکەیان سوتاندووە، بۆئەوەی ناوی نەبوونی نەسخ بڵاو نەبێتەوە، هەر بەو جۆرە لیژنەی ئەوقاف بڕیاریان دا کتێبەکە بسوتێنن، یەکێك لە ئەندامانی لیژنەکە پێشتر قوتابی خۆم بوو، سەرپەرشتیاری بڕوانامەی دکتۆراکەی بووم، ئەو معارز دەبێت و دەڵێت بینێرنەوە بۆ خاوەنەکەی.

دوای چوار مانگ کە مراجعەی وەزارەتی ئیعلامم کرد، وتیان کتێبەکەتمان نارد بۆ ئەوقاف و لیژنەی ئەوقاف رەفزیان کرد کە بڵاوبکرێتەوە، چونکە مخالیفی ئیجماعی مسوڵمانانە.

منیش چووم بۆ لای وەزیری ئەوقاف، (د.عبدالمنعم)، کە ئەوسا تازە لە حەج هاتبووەوە، وتم: یەکەم هاتووم بەخێرهاتنەوەت بکەم، دووەم کتێبێکم داناوەو زۆر ماندوو بووم پێیەوە، لیژنەی ئەوقاف بڕیاری داوە کە بڵاو نەکرێتەوە، لەبەر ئەوەی مخالیفی بیروڕای هەموو مسوڵمانانە، تکایە لیژنەیەکی تر پێك بهێنە بۆ لێکۆڵینەوە لەم کتێبە، بەڵام با لیژنەکە کەسانی تێگەیشتوو بن، لە قسەکانم تێبگەن. هەر کاتێك کە کۆبوونەوە تا بڕیاری لەسەر بدەن، خەبەرم بدەنێ تا خۆشم ئامادەبم.

وتی: منیش بڕیار دەدەم لەگەڵ تۆ حازر بم.

لیژنەیەکی تری پێکهێنا، سەرۆکی لیژنەکە زانایاکی کورد و پیاوێکی تێگەیشتوو بوو، بەڵام زۆر ترسنۆك بوو، وەعدیان پێدام کە جارێکی دیکە سەر بدەمەوە لە ئەوقاف و ئەنجامی کتێبەکە وەربگرم. کە ڕۆیشتم دەبینم دووبارە بڕیاریان داوە لەسەر مەنعکردنی بڵاوکردنەوەی لەنێو جیهانی ئیسلامیدا، منیش قورئانێکم لەگەڵ خۆم بردبوو، وتم بە سەرۆکی لیژنەکە: (هل توجد في القرآن آيتان متناقضتان؟) واتە: ئایا لە قورئاندا دوو ئایەتی دژیەك هەن کە پێکەوە کۆنەبنەوە؟ وتی: (استغفر الله)، وتم: نەسخیش استغفر الله، نەسخ بۆ لابردنی دژایەتی و (تناقض)ی نێوان دوو ئایەتە، ئەگەر دژایەتی نەبێت نەسخیش نییە.

وتم: من هیچ شتێکم نییە لە دنیادا جگە لە خانوویەك کە خۆم و ماڵ و منداڵم تیایدا دەژین، ڕووبەرەکەی (٦٢٠م)، لە ناوەڕاستی بەغدایەو دوو تابقە، بەلای کەمەوە ئێستا بیفرۆشم (٥٠٠) ملیۆن دینارم بۆ دەکا، من وەعد دەدەم لەلای خوا، بۆ هەموو زانایانی ئیسلامی لە ناوەوەو دەرەوەی عێراق، ئەگەر بیسەلمێنێت دوو ئایەتی دژیەك هەن لە قورئاندا، ئایەتی دوایی پێشوەکەی ئیلغا کردۆتەوە بۆ نەهێشتنی دژیەکیەکە، من ئەو خانووەی لەسەر تاپۆ دەکەم لە دائیرەی تەسجیلی عەقاری بەبێ موقابل.

ئەوانیش وتیان: ١٥ ڕۆژ مۆڵەتمان بدەرێ. وتم: بڕۆن مانگێك مۆڵەتتان دەدەمێ.

ئەوانیش لەو ماوەیەدا نوسخەیەك لە کتێبەکەو عەریزەیەکیان نارد بۆ (صدام حسین) کە مامۆستایەك لە زانکۆکەی تۆ کتێبێکی داناوە موخالیفی ئیجماعی هەموو عالەمی ئیسلامییە. سەرۆکایەتی کۆماریش بڕیاری دەکرد لەسەر قەدەغەکردنی چاپکردنی ئەم کتێبە لە ناوەوەو دەرەوەی عێراق.

دوای ئەوەی خەبەریان دامێ، منیش نامەیەکم نووسی بۆ کاك موخلیص یونس خاوەنی نووسینگەی تەفسیر لە هەولێر، نوسخەیەکی کتێبەکەم بۆ ناردو داوام لێکرد کە چاپی بکات و، پێم وت: مامۆستا هەولێر نە ناوەوەو نە



خۆم و حاجی مخلص خاوەنی نوسینگەی تەفسیر

دەرەوەی عێراقە، چونکە ئەوکاتە ئەمریکا بەشێك لە کوردستانی لە عێراق جویێ کردبوەوەو مەنعی حکومەتی عێراقی کردبوو کە تەدەخولی ئەو شوێنانە بکات، کە یەکێکیان هەولێر بوو.

ئەویش پیاوانە کتێبەکەی چاپ کرد و بڵاوی کردەوە.

رۆژێکیان لەمزگەوتی جەلیل خەیات لەشاری هەولێر سەردانی دکتۆر بەشیر حەدام کرد، کە مامۆستایەکی بەڕێزە، لەو کاتەدا ژمارەیەك مامۆستای رۆژهەڵاتی کوردستان لەلای میوان بوون، کاتێ منی بەمیوانەکان ناساند و ووتی ئەمە فڵانە کەسە، میوانەکان وتیان: زۆرجار غەیبەتت دەکەین دکتۆر، وتم: بۆچی؟.

وتیان: تۆ دەڵێیت نەسخ لەقورئاندا نیە، چۆن شتی وا دەبێت.

منیش وتم: من لەخۆمەوە وام نەوتووە، ئەوەی پێویست بکات لەبەڵگە خستومەتە روو لەوبارەیەوە.

مامۆستایەکیان وتی: سوێند بەخوا ئەگەر نەسخ لەقورئاندا نەبێت ئەوا من جوبە و عەمامەکەم لادەبەم و دەیخەمە ژێر پێم.

لەدڵی خۆمدا وتم قوڕ بەسەر ئەو موسڵمانانەی مامۆستای ئاینی لەم شێوەیە رابەرایەتیان بکات.

مامۆستایەکیش کە کوردی زانێکی باش بوو لێی وەرگرتم وتی تەرجەمەی دەکەم بۆ کوردی، دوای ماوەیەك بینیمەوە وتی خوێندمەوە بەڵام بەخوا لەترسی قسەی مامۆستایانی ئاینی نەموێرا تەرجەمەی بکەم.

# پەیوەندیم بە کەسایەتییە کوردەکانەوە لە بەغدا

بەو پێیەی بەغدا پایتەخی هەموو عێراق بوو، کۆمەڵێك کەسایەتی ناوداری جۆراوجۆر لەوێدا کۆبوبونەوە، یەکانگیر بووبوون، پەیوەندی تۆکمەی باش لەنێوانیانا هەبوو، لەگەڵ ئەوەی جیاوازی لە جۆری کار و ئەندازەی زانیارییان دا هەبوو، هەر بەو هۆیەوە پەیوەندیەکی زۆر باشم هەبوو لەگەڵ ئەم کەسایەتیانە بۆ گۆڕینەوەی زانیاری و تێگەیشتن لە بارودۆخی ژیان و گوزەرانی ناوشاری بەغدا و دەوروبەری، بێجگە لە کەسایەتی عەرەب و نەتەوەکانی تر و ئاینیەکانی تر، بەتایبەتی لەگەڵ کەسایەتییە کوردەکان پەیوەندیەکی باشم هەبوو، هەمیشە خەریکی ئاڵوگۆڕی فیکری و زانیاری نەتەوایەتی بووین، لەوانە:

**کەسـایەتی ئـاینی :**

شیخ لطیف عبد الله بەرزنجی

ملا سید حکیم خانەقینی

شیخ امین نەقشبەندی

ملا علی قوجە بلباس

ملا محمد قزلجی

ملا سعد الله محمد امین هەوائی

شیخ زین الدین نەقشبەندی

دکتۆر صلاح الدین سەنگاوی

دکتۆر عوسمان حەمە غەریب هەڵەبجەیی

ملا عمر دیبەگەیی
شیخ محمد بالیسانی
دکتۆر حسین بالیسانی
دکتۆر احمد بالیسانی
ملا علی لەیلانی
شیخ لطیف شیخ اسلام

**کەسـایەتی دیـکە:**

نجیب بابان
د. حسین خلیقی
ابراهیم میرانی
عبد الرحمن بەگی قورەتوو
نجم الدین محمدعلی عەونی
علی کمال احمد فهمی
احمد گەردی
محمد جاف
شیخ طیب سید عارف
م. نوری ئاغجەلەری

**نووسـەرو ئـەدیب:**

م. ملا عبد الکریم مدرس
م. علا الدین سەجادی
مسعود محمد
جمیل رۆژبەیانی
ملا شکور مصطفی
عبد الرحمن زەبیحی

خەسرەو جاف
محمد مەلا کریم مدرس
فاتح مەلا کریم مدرس
عبد الرحمن مەلا مارف
م. لطیف گلی
شێخ محمد علی قەرەداغی

**دادوەرو یـاسـایـی:**

ووریا کانی مارانی
دادوەر نوردین علی
شیخ لطیف شیخ طه
پارێزەر عبد الله کانی مارانی
پارێزەر حسن اسماعیل پشدەری
دادوەر چەتو عبدالله علی
پارێزەر جمال بابان

**مـامۆسـتـای زانـکـۆ :**

د. کمال مظهر
د. نوری طـالبانی
د. سعدی بەرزنجی
د. فاضل عبد الواحد عبد الرحمن
د. اکرم یـاملکی
د. نسـرین فخـری
م. نظـام الدین گلی
د. محسن عبد الحمید
د. نظام الدین عبدالحمید

**ئەفسەری سوپا :**

عبد الله سعید
مستەفا عزیز
جلال احمد فهمی
نامق حەوێزی
سید عبد الله عازەبانی
نجم الدین نەقشبەندی
مصطفی رضا {مەولانا}
محمد شریف سندی
عبد الخالق معروف
محمد علی ملا محمد رەئیس
محمد سعید ملا محمد رەئیس
یحیی چرۆستانی
کمال موفتی
عبد الرحمن موفتی
هیوا موفتی
محمد علی دەربەندی فەقەرە
علی مصطفی
عبد المجید شیروانی
عزالدین جباری
عبدالرحمن یاسین مجید

**پلە و پایە :**

فوئاد عارف
بابکر پشدەری
د. محمد شریف
دادوەر بەشیر ئەتروشی
قازی عبد الحمید ئەتروشی
سیدا صالح یوسفی
صالح پێداوی

## دکتۆرە نەسرین فەخری

یەکێکە لەنوسەرە کوردە چالاکەکان کەلەبەغدا دادەنیشت، یەکەم رۆژی شۆڕشی چواردەی تەموزی ساڵی ١٩٥٨ لەئێزگەی کوردی لەبەغدا یەکمان ناسی، ئەو کاتە ئەو لەبەشی کوردی ئێزگەی کاری دەکرد، پەوەندی و هاتوچۆی خێزانیمان هەبوو، ئەو پەیوەندیەمان هەر بەردەوام بوو، لەبەر ئەوەی ئافرەتێکی دڵسۆز بوو بۆ کورد زۆرم خۆش دەویست و تا ئێستاش بەردەوام سەلامم بۆ دەنێرێت.

## بابەکر پشدەری

لەم گەڵ کەسایەتیەدا پەیوەندییەکی زۆر باشمان هەبوو، لەساڵی ١٩٦٣ەوە یەکتر دەناسین، ماوەیەکیش دراوسێی یەکتر بووین لەشاری بەغدا، لەهەفتەیەکدا چەندینجار یەکمان دەبینی، ئەو پێش ئەوەی پاڵ بداتەوە بەحکومەتەمەوە لەگەڵ شۆڕشی کورددا بوو، پێشمەرگە بوو، زۆر خزمەتی شۆڕشی کردبوو، جارێکیان بۆی باس کردم وتی: رۆژێك لەپشدەر رێم کەوتە هەندێك دێهات، پیاوێکی پیرو بینی لەم شاخ ئەچوو بۆ ئەو شاخ، لێم پرسی: مامە ئەوە بۆچی دەگەڕێیت؟ وتی: دەمەوێت خواحافیزی لەم شاخ و بەردە بکەم.

متمانەی بەمن زۆر بوو، رۆژێکیان پێم وت: بۆچی وازت لەشۆڕشی کورد هێناو هاتیە بەغدا و پۆشتی وەزیریت قبوڵ کرد لەحکومەتی بەعسدا، لەوەڵامدا وتی: خوا ئەو کەسە بگرێت کەپاڵی نا بەمنەوە لەپێشمەگە و شاخ دوور بکەومەوە و بێمە ژێر سێبەری ئەم حکومەتە کە زۆرترین کردەوەکانی دژی بەرژەوەندی کوردە.

یادەوەریەکی ترم، ئەو رۆژەی لەباخچەی ماڵەکەی خۆی ئاهەنگی ژنهێنانەکەی بوو، کوردێك لەوێ ئامادەبوو لێی پرسیم: لەباخچەی ماڵەکەتدا چ دارێکت چاندووە؟ وتم: هەموو دارێکی تیایە جگە لەدارخورما، وتی: ئەی بۆ دارخورمات نەچاندووە؟ وتم: وتم چونکە رەمزی عەربە.

کەچوومە ئەو لاوە برادەرێکی کورد پێی وتم: ئەو پیاوە لەموخابەرات کار دەکات بۆ ئەو قسەیەت لای ئەودا کرد، بۆ کاك بابەکرم گێڕایەوە وتی: راست دەکات لەموخابەرات کار دەکات بەڵام نەفسیەتی ئەوەند پیس نیە راپۆرت لەسەر ئەوە بنووسێت.

## کەمال مفـتی

کەسایەتێکی سەربازی دڵسۆز بوو، پەیوەندیمان بەیەکەوە زۆر پتەو بوو، لەیەك گەڕەکدا بووین، ئەو کاتەی من لەسوپادا بووم ئەویش لەسوپادا بوو، لەساڵانی شەستەکاندا وەك لەبیرم مابێت ماوەیەك سەرۆکی دادگای تەمیزی سەربازی بوو، بەماوەیەکی کەم پاش ئەوە وازی لەوەزیفە هێنا و چووەوە بۆ کوردستان و پەیوەندی کردووە بەشۆڕشی کوردەوە.

هات و چۆمان بۆ لای یەك زۆر بوو، هاوسەرەکەشی کوردێکی زۆر موخلیص بوو، جارێکیان بۆ تازییەك هاتینەوە بۆ سلێمانی چووم سەردانی کاك کەمالم مفتیم کرد.

## عبدالرحمن مفتی

لەساڵی ١٩٥١ەوە کەبۆیەمجار چوومە بەغدا ئەوکاتە ئەو لەکۆلیجی سەربازی دەیخوێند، شەو لای مەلا موحسین کەمزگەوتێکی بچوکی هەبوو لەوێ لەحوجرەکەدا دەمایەوە، منیش بەو بۆنەیەوە کەبۆ چاککردنی مەعاشەکەم شەو لایان مامەوە، لەوەوە یەکترتان ناسی.

دواتر کاتێ ماڵی هەردووکمان لەبەغدا بوو دەورێکی باڵای هەبوو لەخزمەتی کورد، بەخێزانی هاتوچۆ لەنێوانماندا هەبوو، پیاوێکی دیندار و سەر راست بوو.

## دکتۆر موحسین عبدالحمید

بەڕاستی دکتۆر موحسین عبدالحمید یەکێ بوولە لەکوردە دڵسۆزەکانی کەلەشاری بەغدا دادەنیشت و مامۆستای زانکۆ بوو، پەیوەندییەکی زۆر پتەومان بەیەکەوە هەبوو، لەبواری نووسیندا دکتۆر موحیسین خزمەتی زۆری کردووە و ئێستاش بەردەوامە، خوای گەورە تەمەنی پڕ بەرەکەت بکات.



ئەو یەکێك بوو لەوانەی هەڵسەنگاندنی کتێبەکانی منی پێ سپێردرابوو بۆ وەرگرتنی پلەی پرۆفیسۆری، زۆر سوپاسی دەکەم کەبەجوانی هەڵسەنگاندنی بۆ کردبوو.

تا ئێستاش پەیوەندی و هاتوچۆمان بەیەکەوە هەیە.

## دکتۆر نوری تاڵەبانی

لەو کەسایەتیە ناسراوانەی کوردە کەماوەیەکی زۆرە پەیوەندی و هاتوچۆی خێزانی لەنێوانماندا هەیە، چەندساڵێك لەیەك کۆلێژدا وانەمان وتۆتەوە، ئەو لە شاری کەرکوك لە دایك بووە، هەر لەوێ خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی تەواوکردووە.

بەکالۆریۆسی لە قانوون لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە، پاشان لە فەرەنسا لە زانکۆی پاریس دکتۆرای دەوڵەتی لە قانوون لە ٢٦ی حوزەیرانی ١٩٦٨ وەرگرتووە.

مامۆستا بووە لە زانکۆکانی بەسرە و بەغدا و سلێمانی، لەو ماوەدا سێ

کتێبی بە زمانی عەرەبی لەسەر قانوونی عێراقی بەچاپکردن گەیاندووە، کە یەکێکیان کراوەتە (مرجع) بۆ خوێندکارانی ساڵی دووەم لە کۆلێجەکانی (کارگێڕی و ئابووری - الادارة والاقتصاد) لە زانکۆکانی عێراق.



لە دیسەمبەری ساڵی ١٩٨٢دا خانەنشینکراوە و ڕێگای دەرس وتنەوەی لێ قەدەغەکراوە لە هەموو زانکۆکانی عێراق لەبەر هۆی سیاسی و سەفەرکردنیش بۆ دەرەوەی عێراق.

لە ناوەراستی ساڵی ٢٠٠٤ بووە بە سەرۆکی کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردن لە هەرێمی کوردستان.

ئەندامێکی سەربەخۆ بووە لە پەرلەمانی هەرێمی کوردستان (خولی دووەم ٢٠٠٥ - ٢٠٠٩) و ئەندامی (لیژنەی قانوونی) و (لیژنەی دەستووری) بووە لەو خولە.

لە ١٨ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٧ هەڵبژێراوە بە ئەندامامی کارا لە ئەکادیمیای کوردی لە هەرێمی کوردستان.

لە ١٣ی ئەیلولی ٢٠١١ لەلایەن ئەنجومەنی ئەکادیمیای کوردیەوە هەڵبژێراوە بە سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بەرۆڵی دکتۆرە عەتیە حەمەسەعیدی

هاوسەری دکتۆر نوری تاڵەبانی بکەم کەئافرەتێکی زۆر لێهاتوو دڵسۆزە و خزمەتی زۆری کردووە لەبواری تەندروستیدا.

**مەسعود محەمەد**


مەسعود محەمەد

لە حەفلەی تەکریمی انتاجی علمی کە سەرۆکایەتی کۆمار سازیدابوو، تەکریمەکە لەلایەن (عدی صدام) پێشکەش کرا، لەوێ مـەسعود محەمەدم بینی و هەردوولام مـاچ کرد، ئەویش وتی: کچـێکی جـوانکیلەت دەسـت نەدەکەوت ماچـی بکەی، وا من ماچ دەکەی!

دواتر یەکترمان نەدیوە تا بووە سەرۆکی کۆڕی زانیاری کورد.

هەرچەندە ئەویش لە ئاهەنگی وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتیکەم کاتی خۆی لەکۆیە ئامادەبوو، بەڵام ئەوسا یەکترمان نەدەناسی.

پیاوێکی عاقڵ و زیرەك و خوێنەوار بوو، عەرەبیزانێکی باش بوو، بەبەلاغەیەکی جوان شتی دەنوسی، جارێکیان کتێبێکی بۆ گۆرباتشۆف دانا. یەکێکە لەو پیاوانەی کورد دەبێ فەخری پێوە بکات.

لەو چەند جارەشدا کە سەردانیم کردووە لە ماڵ خۆیان، زۆر میوان دۆست بوو، متوازع بوو، خۆی چای بۆ لێدەناین و بۆی دەهێناین.

## سامی عبدالرحمن


سامی عبدالرحمن

سامی عبدالرحمن کە بوو بە وەزیر لە حەفتاکان، ئیشم هەبوایە دەچوم بۆ لای و کارەکەی بۆ دەکردم.

دوای روخانی رژێمی صەدام کرا بە ئەندامی لیژنەی دانانی دەستور، من و ئەو لەپاڵ یەك دانیشتین، ٤٥ رۆژ لەپاڵ یەکا بووین، قسەی زۆر بەجێ و عاقڵانەی دەکرد.

## صـالح یوسـفی


صـالح یوسـفی

صالح یوسفی: هەر ئیشێك عاید سەرەوە بوایە، معلوماتەکەم لەو وەردەگرت، بەهەمان شێوە هەر مەعلوماتێك هەبووایە لەرێگەی ئەوەوە بەسەرکردایەتی کوردمان دەگەیاند، بۆ نمونە ئەفسەرێك عەقیدی پزیشك بوو لە مستشفای ئەمرازی سەدری ناوی عبدالجبار حاجی موسی بوو، زۆر حەزی بە وەزیفە بوو، ژنێکی بێوەژنی هێنا، خوشکی ژنەکە ژنی وەزیری بەعسیەکان بوو، ئەمەشی بۆ نزیك بوونەوە بوو لەو ماڵەو گەیشت بە مەنصەبێك.

عبدالجبار هاتە لام وتی: ئیشێکی نهێنی هەیە، کێ مومەسیلی مەلا مستەفایە با بیگەیەنێت، ئەو زانیاریانەی لێم وەرگرت لەرێگەی صالح یوسفیەوە ناردمەوە.

لە زۆر شتا لەگەڵ صالح یوسفی یەکترمان دەگرت.

لە بەیانی ١١ ئازار چووم بۆ لای و پێ وت: ئەو بەیانە ئەگەر کەلیمەی سیاسی تێ نەکەی، ئەوە دەبێتە لامەرکەزی ئیداری، ئەو لامەرکەزیەش لەزەمانی مەلەکی و ئێستاش هەیە، ئەویش تورەبوو وتی: تۆ نازانیت، منیش وتم: من قانون دەخوێنم، ساڵی یەکەم لە دەستوریدا لامەرکەزی دەخوێنین.

جارێکی تر بەشەو چووم بۆلای بۆ ئیشێکی گرنگ تا بەمەکتەبی سیاسی بگەیەنێت، من بۆ رۆژی دوایی تاقیکردنەوەم هەبوو، تا درەنگ چاوەڕوانم کرد تا هاتەوە و مەعلوماتەکەم پێگەیاند، بەڵام بەوهۆیەوە نەمتوانی بەباشی وانەکەم بخوێنم، سوپاس بۆ خوا دەرچووم لەئیمتیحانەکەدا.

بەکارەساتی تیرۆر کردنیشی زۆر نیگەران بووم.

### زەبیحی



لەسەرەتای شۆڕشی چواردەی تەموزی (١٩٥٨) دوە یەکمان دەناسی، جارێکیان چووم بۆ لای مامۆستا زەبیحی، وتم: ئەزانی بۆچی هاتووم؟، وتم: بەعزێ لە کوردەکان خەریکی کوردایەتین، منیش لەگەڵیان دادەنیشم، تۆ عەلاقەت زۆرە لەگەڵ ئەو کوردانە، دەڵێن گوایە تۆ شیوعی و ئەوانە، وتی: منیش و ئەوانیش زۆر دوورین لە شیوعیەتەوە، لەسەر کوردایەتی لە ئێرانەوە هاتومەتە ئێرە تا کەس نەمناسێت.

زۆرجاری تر لەگەڵ یەك دانیشتووین، بەداخەوە دوایی لە تەل محەمەد لە بەغدا زەبیحی ژورێکی گرتبوو، بەعسیەکان لەوێ کوشتیان.

## هــێـمـن


هــێـمـن

هێمنی شاعیریش هاوڕێی کاک حەمەعەلی مەلا محەمەدی رەئیس بوو، کەئەویش ماڵی لەبەغدا بوو، دوو سێ جار داوەتی کرد بۆ ماڵی خۆیان و منیشی داوەت دەکرد، بەو شێوەیە مامۆستا هێمنی موکریانیم ناسی.

لە فـزەن و مەعـنەن یەك بوو، وەکو ناوەکەی هێمن بوو، لەقسەکردنیش زۆر زیرەك و هێمن بوو، لەسەرخۆ قسەی دەکرد، بەقووڵی چووبووە ناو کوردایەتیەوە، لەو دانیشتنانەدا شیعری جوانی بۆ دەخوێندینەوە، هیچ تەماعێکی مەنسەب و پایەی نەبوو، ماوەیەك لە عێراق مایەوەو دواتر گەڕایەوە بۆ مەهاباد و لەوێ وەفاتی کرد.

## هـــەژار


هـــەژار

هەژار دەهات بۆ نوێژی جومعە لە مزگەوتەکەی مەلاعەلی قوچە بلباس لەشاری بەغدا، لەسەر جادەی ملتەقای شارع جمهوری بوو، رۆژێك وتی: نابێت داوای حەقی خۆمان بکەین تا مەراکیش و جەزائیر حەقی خۆیان وەردەگرن، منیش توڕەبووم وتم: ئەم قسەیە قسەی شیوعیەکانە.

بەداخەوە لەگەڵ ئەم شاعیرە دەرەفەت نەبوو بەیەکەوە زیاتر دابنیشین، یەکتر

بینینمان رۆژانی جومعه بوو لەو مزگەوتە.

## عەلادین سەجادی


عەلادین سەجادی

تێکەڵیمان زۆر بوو، سەردانی ماڵی یەکمان دەکرد و زۆر بەیەکەوە دەماینەوە.

یەکەمجار کە کرام بە مەلای مزگەوتی بن تەبەق و مەعاشە رەسمیەکەمیان راگرت، ئەو عەریزەیەی بردم و لە بەغدا چوومە لای مامۆستا سەجادی کە مزگەوتەکەی لە کۆتایی شارع رەشید بوو رووەو وەزارەتی دیفاع.

زۆر قسە خۆش بوو، هەرکەس بچوایەتە لای دەیوت چ قسەی خۆشت هەیە بۆم بگێڕەوە، هەتا یەك دوو شتی لەمنیش وەرگرت، لەبیرم نەماوە چی بوون بۆ کتێبی رشتەی مرواری.

حەدیقەیەکی گەورەیان هەبوو، درەختی زۆری تیابوو، من و دایکی محەمەد و مامۆستا سەجادی و دایکی دانا، ئەو چوارە دادەنیشتین و مامۆستا قسەی خۆشی بۆ دەکردین.

ئاخر جار چووینە ماڵیان خەوێکی بۆ گێڕامەوە وتی: تەیرێك هات قوتی دام، وەك ئەوەی پێیان وتبێت کە وەفات بکات.

بەر لە وەفاتی بە چەند رۆژێك تەلەفۆنی بۆ کردم وتی: زۆر بێ تاقەتم حەزدەکەم سەرێکم لێ بدەی، منیش وتم: دایکی محەمەد چووەتەوە بۆ ماڵی باوکی، کە هاتەوە دێین بۆ خزمەتت، دوای سێ رۆژ یان چوار رۆژ بە جەڵتە وەفاتی کرد، لە نوێژی مەغریب لە سوجدە هەڵنەسایەوە.

ماموٚستا عەلادین سەجادیش پیاوێکی دڵسۆز بوو، پاش ئەوەی بوو بە ئەمین عامی ئەوقافی ناوچەی حوکمی زاتی، پێم وت: ماموٚستا تۆ لەنێو کورددا سومعەیەکی زۆر باشت هەیە چۆن ئەمەت قبوڵ کرد چونکە ئەم حوکمی زاتیە درۆینەیە و تەنها فێڵە لەکورد، ئەویش وتی: بۆیە قبوڵم کرد من لەوێدا بم باشترە لەیەکێکی تر بەو ئومێدەی بتوانم خزمەتێك بکەم.

هەموو کتێبەکانی کەچاپ دەکرد نوسخەی بەدیاری پێدەدام.

## فوئـاد عـارف



فوئـاد عـارف

لەو کەسایەتیە کوردییە ناسراوانەیە کەلەنزیکەوە ئاشنایەتیمان پێکەوە هەبوو.

یەکەمجار نازانم کەیبوو یەکترمان ناسی، لام وایە هەر لە سلێمانی بوو.

لە بەغدا هەرچی شەخصیاتی کورد بوو مانگی یەك دوو جار دەچوون بۆ لای، دیوەخانێکی گەورەی هەبوو، منیش هەر بەو مناسەبەوە دەچووم، تێکەڵیەکەمان بووە تێکەڵییەکی مەحەببەت، زۆرجار هاتوەتەماڵی ئێمە.

زۆرجار دەچووین بۆ ماڵی یەکتر.

جارێکیان وتی: برادەرێکی خۆشەویست سەعاتێکی باخەڵی بۆ هێناوم، پێم وت: من سەعاتی دەست هەڵدەگرم و سەعاتیشم هەیە، وتی: من بە دیاری بۆیان هێناوم و بڕیارم داوە تەنها بە فوئاد عارفی بدەم، منیش بڕیارم داوە کە هەر بە مستەفا زەڵمی بدەم، منیش وتم: سەعاتی باخەڵ هەڵناگرم، وتی: دەزانم

بەڵام لەو ڕۆژەوە بۆیان هێناوم بۆ تۆم هەڵگرتووە، ئێستاش لەنێو ئەو دیارییانەی پێم بەخشراون پاراستومە.

فوئاد عارف ساڵی ١٩١٣ لەشاری عەمارە لەدایك بووە، دایك و باوکی هەردووکیان کوردن[1].

تەمەنی کەمتر لەساڵێك بووە باوکی کۆچی دوایی کردووە و ماجد مستەفای خاڵی بەخێوی کردووە، ساڵی ١٩١٧ پێش ئەوەی ئینگلیز بەغدا داگیربکات هاتونەتەوە بۆ سلێمانی، سەرەتای خوێندنی بەفێربوونی قورئانی پیرۆز دەست پێکردووە، پاش ئەوە چۆتە قوتابخانەی حکومی، ساڵی ١٩٢٨ چۆتە کۆلێژی سەربازی، لەگەڵ مەلیك غازی و عەبدولکەریم قاسمدا پێکەوە لەیەك کۆلێژ خوێندویانە، ساڵی ١٩٣٤ بەپلەی ملازمی دووەم خوێندنی تەواو کردووە و، دواتر بۆتە یاوەری تایبەتی مەلیك غازی، لەیاداشتەکانیدا ئامۆژگارییەکی بەکر صدقی باس دەکات ئەو کاتەی کە لەلایەن مەلیك غازیەوە هەڵبژێردراوە ببێتە یاوەری تایبەتی مەلیك و، دەڵێت:

(هەڵبژاردنت بۆ ئەم پایەیە لەلایەن مەلیك خۆیەوە بووە، ئەمەوێت سێ ئامۆژگاریت بکەم کە زۆر پێویستت پێیەتی چونکە شوێنەکەت زۆر حەساسە، **یەکەمیان:** ئامۆژگاریە بۆت، دووەم و سێیەمیش ڕێنمایی گرنگن، وتم: فەرموو گەورەم، وتی: یەکەم تۆ لەپلەیەکدا دەست بەکار دەبیت کە ماڵ و ناوبانگ (شەرەف) رووت تێبکات، ناتوانیت هەردووکیان پێکەوە بەدەست بهێنیت، یا ئەوەتا ماڵ و سامان بەدەست دەهێنیت و دەوڵەمەند دەبیت و ڕێز و ناوبانگ بەدەست ناهێنیت، یا ئەوەتا ڕێزو ناوبانگ بەدەست دەهێنیت بەتەنها و بیر لەماڵ و سامان مەکەرەوە، تۆ ئازادی کامیان هەڵدەبژێریت تا لەم پلەیەدا بەدەستی بهێنیت، بەڵام تەنها دەمەوێت بەیادت بهێنمەوە کە ماڵ و سامان لەدەستیش بچێت دەتوانرێت بەدەست بهێنرێتەوە، بەڵام ڕێزو ناوبانگ کە چوو بەدەست نایەتەوە.

---

(١) مذكرات فؤاد عارف: تقديم وتعليق: الدكتور كمال مظهر. الجزء الاول / مطبعة خبات - دهوك، الطبعه الثانية - ٢٠٠٢.

**دووەم:** غازی ئێستا مەلیکی عێراقە و ئەو کەسە نیە کەهاوڕێی قوتابخانەت بێت و بەیەکەوە گاڵتە بکەن، ئەو ئێستا مەلیکی عێراقە و تۆش یەکێکی لەهاوڵاتیانی ژێر دەستی، دەبێت هەردەم ئەوەت لەیادبێت.
**سێیەم:** دەبێت ئەوە بزانیت هەر قسەیەك ئەمڕۆ غازی بیکات بە ئیرادەی مەلەکی دادەنرێت و پێویستە جێ بەجێ بکرێت، بەڵام هەندێ جار هەست دەکەیت کە مەلیك لەحاڵەتی هەڵچووندایە و داوای ئەنجامدانی کارێکت لێدەکات و جێبەجێکردنەکەی دواتر بە زیان دەگەڕێتەوە بۆی، لەبەر ئەوە هەوڵ بدە بەپێی توانا دڵی مەلیك رابگریت و هەوڵ بدەیت نەکەوێتە هەڵەوە و کارەکەی کە داوای کردووە جێبەجێی بکەیت دوای بخەیت بۆ رۆژی دواتر تا بۆچوونەکەی بگۆڕێت).

ساڵی ١٩٣٨ فوئاد عارف کاتێك دڵنیا دەبێت مەلیك دەستەڵاتی لاواز بووە و توانای ئەوەی نیە رێگە لەلابردنی ئەم لەپۆستەکەی بگرێت، لەلایەن جەمیل مەدفەعیەوە کە سەرۆك وەزیران بوو بانگ دەکرێت و پێی رادەگەیەنرێت کەداوای هەر شتێك دەکات لەدەرەوەی کۆشك پێی دەدەن، ئەویش داوا دەکات بچێتەوە بۆ سلێمانی، دوای ئەوە لەبواری سەربازی و مەدەنیدا چەندین پۆستی باڵای پێ سپێردراوە، ساڵی ٢٠١٠ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە.

لە کۆتایی ئەم کورتە باسانەی لەسەر ژیانی چەند کەسایەتی و شاعیر و نوسەر کەلەماوە ژیانمدا لەشاری بەغدا بەخزمەتیان گەیشتووم و لێرەدا بۆ ئێوەم تۆمار کرد، دەمەوێت ئەوە بڵێم هەموو ئەوانەی تریش کەسانی بوون دڵسۆز بۆ کورد، پەیوەندییمان بەیەکەوە هەبووە و کەسانی خۆشەویستن لام، بەداخەوە زۆر شتم لەیاد نەماوە لەم کاتەدا کەپێداچووونەوەی کاروانی ژیانم دەکەم، دەنا هەموویان ئەوە هەڵدەگرێت لەسەریان بنووسم، ئەمانەش کەنووسراون لێرەدا لەکاتی جیاوازدا کەمیوان هاتۆتە لام باسم کردووە و تۆمار کراوە و ئەو میوانە بەڕێزانە بەپەس زانیوە بیخەمە ناو ژیانمەوە.

# ئەو کۆنگرەو کۆڕ و کۆبونەوانەی بەشداریم تێداکردووە

لەو ساڵانەی کە مامۆستا بووم لە کۆلیجی یاسا لە زانکۆکانی بەغدا، لە زۆربەی ئەو کۆبونەوەو کۆنگرانەی ناو عێراق بەشداریم کرد، کەلەبوارەکانی زانستی ئایینی و یاسادا، لەسەر داوای ئەو ڕێکخراوانەی کۆنگرەکەیان دەبەست یان سازیان دەکرد، لەوانە:

لەساڵی ١٩٧٨ هەندێك گۆڕانکاری کرا لە یاسای باری کەسێتی عێراق، منیش باسێکی فراوانم نووسی سەبارەت بە چاکی و خرای ئەم یاسایەو لە کۆبونەوەی وەزارەتی داد خوێندمەوەو گفتوگۆی لەسەر کرا.

لەساڵی ١٩٧٩ بەشداریم کرد لە کۆنگرەی سوپایی لە زانکۆی بەکر، سەبارەت بە بابەتی کۆمەڵایەتی.

لەساڵی ١٩٨٠ لە کۆنگرەی زانایانی کۆمەڵایەتی وڵاتە عەرەبییەکان لە بەغدا، لە زانکۆی بەغدا منیان راسپارد کە بەشدار بم، کۆنگرەکە سێ رۆژی خایاند و باسێکم تیادا خوێندەوە بە ناونیشانی (الشريعة الإسلامية والتنمية الاجتماعية).

لەساڵی ١٩٨٣ بەشداریم کرد لە کۆنگرەی پزیشکان لە موسڵ.

لەساڵی ١٩٨٥ بۆ ماوەی دوو مانگ بەشداریم کرد لە کۆنگرەی لێکۆڵینەوەی پرۆژەی یاسای شارستانی عێراقی نوێ، کە (١٠٨) کەسایەتی بەشداربوون،

بریتی بوون لە دادوەر و پارێزەر و مامۆستای یاسا و هەر لە یەکەم رۆژدا بە پشتیوانی خوا لە تێبینیەکانمدا لەسەر ئەو یاسایە سەرکەوتوو بووم.

لەساڵی ١٩٨٩ بەڕێوەبەرایەتی بەرگری شارستانی ئاهەنگێکیان گێڕا لە یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و داوام لێکرا کە بەوبۆنەیەوە وتارێك پێشکەش بکەم.

لەساڵی ١٩٨٩ بەشداریم کرد لە کۆنگرەی پزیشکانی عەرەب کە لە هوتێلی رەشید سازکرا و لێکۆڵینەوەیەکم پێشکەش کرد بە ناونیشانی رای یاساو ئایین سەبارەت بە جگەرە و چاندنی پارچەکانی مرۆڤ.

١٩٨٩/٢/١٥ بەشداریم کرد لە کۆنگرەی وەزارەتی دادی عێراقی و باسێکم پێشکەش کرد لە (٥٣) لاپەڕەدا لەسەر بابەتی (هەموارکردنی یاسای باری کەسیەتی عێراقی).

لە ١٢-١٩٩٠/٢/١٥ بەشداریم کرد لە کۆنگرەی وەزارەتی دادی عێراقی سەبارەت بە هەموارکردنی یاسای باری کەسێتی عێراقی، بۆ ئەو بابەتە لیژنەیەك لە پێنج کەس پێکهێنرا بە سەرۆکایەتی وەزیری داد، منیش یەکێك بووم لە ئەندامانی ئەو لیژنەیە.

لەساڵی ١٩٩٠ بەشداریم کرد لە دانانی پرۆژەی دەستوری عێراقدا، کە لیژنەیەك پێکهێنرا بە سەرۆکایەتی (دکتۆر منزر ئەلشاوی) کە وەزیری خوێندنی باڵا بوو، لەگەڵ دوو وەزیر و سێ مامۆستای زانکۆی بەغدا، کە یەکێکیان من بووم، لەگەڵ دوو فەرمانبەری یاسایی پلەبەرز لە وەزارەتی دەرەوەی عێراق. پرۆژەکەی من بریتی بوو لە (٢١٧) مادده، ئەو لیژنەیە (٣٢) کۆبونەوەی ئەنجام دا و لە ١٩٩٠/٨/١١ کۆتایی بە کارەکانی هێنا، بەڵام بەهۆی شەڕی دووەمی کەنداوەوە نەچووە بواری جێبەجێ کردنەوە.

لە ١٩٩٩/١١/٨ بەشداریم کرد لە کۆنگرەی یەکێتی گشتی ئافرەتانی عێراق، نوێنەری ئافرەتانی زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکانی تێدابوو، دکتۆرە نەوال ئالوسی

سەرۆکی یەکێتی گشتی ئافرەتانی عێراق داوای کرد وتەیەکیان پێشکەش بکەم، منیش خۆم ئامادە نەکردبوو، بەڵام وتەیەکم پێشکەش کرد و تیایدا وتم: خوا هەموو شتێکی داوە بە ئافرەت بەڵام ئافرەت خۆی رەفزی دەکات و نایەوێ، وتیان: وەکو چی؟ وتم: وەکو ئەوە کە مارگرێت تاتشەر سەرۆك وەزیرانی بەریتانیایە، کە دووەم دەوڵەتە لە جیهانا لەپاش ئەمریکا و ناسراوە بە (ئافرەتە ئاسنینەکە)، کاتێك بانگهێشت دەکرێت بۆ کۆنگرەیەك لەپێش هەموو شتێکدا بیر لە مکیاجەکەی دەکاتەوە کە بیبات لەگەڵ خۆی و لەبیری نەچێت. ئەمەش مانای ئەوەیە ژن هەردەم بە پیاو ئەڵێ من دروست کراوم بۆ ئەوە لەزەت و تەمەتوعم پێ بکەیت. ئینجا دکتۆرە مەنال وتی: وەڵا تا ئێستا کەس ئەو قسەیەی پێ نەوتوین، قسەکەت زۆر راستە، منیش زۆر ماندووم بەدەست ئەو ئافرەتانەوە کە قاچ و باڵیان دەردەخەن بۆ پیاو لە هەموو مناسەبەیەکدا. بە هیچ جۆر لەو کردەوە ناشیرینە وازناهێنن.

# کۆنگرەی رابیتەی ئیسلامی موسڵ

رۆژی ١-٢٠٠٢/٥/٢ بەشداربووم لە کۆنگرەی ئیسلامەکان و رابیتەی زانایان لە موسڵ لەژێر ناونیشانی (الشريعة والفقه والقانون والصلة بين هذه المصطلحات) وتارێکم دا، من یەکەم کەس بووم قسەم کرد، لەپاش باسکردنی ئەم وشانەو پەیوەندیمان بە یەکترەوە وتم: بۆچی موسڵمانەکان دواکەوتن لە کاروانی شارستانی ئەم جیهانە، گەلەکانی تر کە موسڵمان نین بۆچی پێچەوانەن. کەچی ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ هەزار ساڵ لەمەوپێش موسڵمانەکان لە هەموو گەلێك پێشکەوتوتر بون.

**وتم لەبەر ئەم هۆیانە بوو:**

١- حوکمڕانەکانی عەرەب و ئیسلام ئایین و دەوڵەتیان لە یەك جیاکردنەوە، حوکمڕانەکان هەوڵیان دا کە هەرکەس لە ماوەی حوکمی خۆیان ئارەزوی بەخۆی ئەم جیهانە بەسەر بەرێ و ژیانی خۆی بە هەواو هەوەسی خۆی تەواو بکات.

٢- خوێندەوارە موسڵمانەکان (علماء الدين) ژیانی جیهانیان جیاکردەوە لە ئایین کاتێ مەلاکان و خەتیبەکان لەسەر مینبەرەکان وتار ئەدەن بۆ موسڵمانان و فێری رەوشتی ئاینیان ناکەن هەر باسی پاش مردن دەکەن کە مرۆڤ پاش ئەوە مرد چی لێ دەکەن لە قەبرەکەیدا، قورئانیش هەر بۆ فاتیحە دانراوە کە لە ماوەی سێ رۆژدا لەپاش مردنی هەر مرۆڤێك بخوێندرێت. واتە قورئان دەستورێکە بۆ مردوو هاتوەو ئاینی ئیسلام بۆ ئەوە هاتوە ژیانی پاش مردن باس بکات، ئیتر پەیوەندی بەژیانی جیهانەوە نیە؟!.

قورئانی پیرۆز ٥٪ باسی نوێژ و رۆژو و زەکات و حەج دەکات، موسڵمانەکان

تەنیا عەمەل بەم ٥./یە ئەکەن، ئیتری ئەوی تری کە بریتییە لە ٩٥٪ کەس نازانێ باسی چی ئەکات و بۆچی هاتووە. ئیسلام لای موسڵمانەکان تەنیا نوێژ و رۆژ و زەکات و حەج و جیهاد(غەزا)یە، ئەوەنیە کە ئەم پێنجەمینەیان (جیهاد)ە نەماوە، ئیتر ئەگەر دزی بکات، داوێن پیسی بکات، درۆودەلەسە بکات، هەروەها هەر ئیشێکی تری نارەوا بکا دروستە و چاوی لێ ئەقوچێنن، چونکە نوێژکەرەو حازری نوێژی جەماعەت ئەبێ لە مزگەوتدا یان چووە بۆ حەج و بووە بە حاجی، وەکو پەپولەی بەهەشت پاك بۆتەوە.

پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی: (بنی الاسلام علی خمس) واتە: ئیسلام لەسەر پێنج کۆڵەکە دانراوەو بیناکراوە، کە بریتییە: لە نوێژ و رۆژ و زەکات وحەج و جیهاد فی سبیل الله، موسڵمانەکان بە کەموکورِی کۆڵەکەکان دروست ئەکەن بەڵام بیناکە بۆخۆی دیار نیە. نوێژ و رۆژوو بۆ ئەوە دانراوە کە رەوشتی مرۆڤ باش ببن بۆ ئەوەی ژیانی جیهانی لەسەر دروست بکات و لە شارستانی خۆی پێش بخات.

٣- مەلاکان کە خۆیان بە میراتگری پێغەمبەر دائەنێن، کاتێ وتار ئەدەن بەناوی ئایینی ئیسلام و فەرمودەکانی خوا و پێغەمبەرەوە، وەکو ئەوە وایە قسە لەگەڵ ئەوانە بکەن کە هەزار ساڵ لەمەوپێش ژیاون، هیچ بیر لەوە ناکەنەوە کە لە چەرخی ئەنتەرنێت و ئیستنساخ و غەزوی فەزا و چون بۆ ئەستێرەکاندا ئەژێت.

خوێندەوارە موسڵمانەکان هیچ وەخت فێری شارستانی تازە نابن و هیچ وەخت لەم جیهانە تێ ناگەن چونکە لە هەر شوێنێ دانیشتن چوار کەسی تیابێ قسە نادەن بەکەس، هەر خۆیان قسە دەکەن و هەژار و نەزانیش وەها ئەزانن ئەم مامۆستایە ئاگای لە عەرش و قورش هەیە، جا کەسێك هەر بفرۆشێ و نەکرِێ لەناو کۆمەڵدا هەردەم نەزانە و لەجیهان تێ ناگات.

٤- هەرچی موسڵمانە بەتوندی ئایینی ئیسلامی گرتووە دوژمنی علم و عەقڵەو هەرچی علمی تازە بیڵێ ئەوە بە گومرِایی ئەزانێ و هەرچی ژیری بیڵێ ئەو بە رەوشتی شەیتانی ئەزانێ.

کەواتە چۆن موسڵمان پێش ئەکەوێت و چۆن قوتاری ئەبێ لەژێردەستی دوژمنی خودا؟

## بەشدارییم لە کۆنگرەیەکی
## تاییەت بە داهاتووی عێراق لەئەنقەرە

کاتێك مامۆستا بووم لەزانکۆی (النهرین)، رۆژی ٢٠٠٤/٣/١٥ لەباڵیۆزخانەی تورکیاوە داوا کرام، کاتێ رۆیشتم وتیان کۆنگرەیەك ئەبەسترێت لە شاری ئەنقەرە لەبابەت پاشەڕۆژی عێراقەوە لەپاش لەناوچوونی صدام حسێن، هەندێك لەحکومەتەکان بەشداری ئەم کۆنگرەیە دەکەن، لەوانە ئەمریکا و بەریتانیا و ئەڵمانیا و جولەکە، لەسەر داواکردنی وەزیری دەرەوەی تورکیا عەبدولا گوڵ ئێمە پێنج مامۆستای یاسازان هەڵمانبژاردون بۆ بەشداریکردن لەو کۆنگرەیەدا، لەرێگای حکومەتی عێراقەوە نا، بەڵکو لەرێگای سەفارەتمانەوە، ئەو مامۆستایانەش دەبێت یەکێکیان کورد بێت، یەکێکیان تورکمان و، یەکێکیان شیعە و، دووانیان عەرەبی سوونە بن.

لەکوردەکان منیان بانگهێشت کردبوو، لەشیعەکان دکتۆر غازی فەیسەڵ بانگهێشت کرابوو کەعەمیدی کۆلیجی یاسای زانکۆی (النهرین) بوو، لەسونەکان دکتۆر ماهر جبوری کە یاریدەدەری عەمید بوو لەگەڵ دکتۆر ابراهیم فەیاز، لەتورکمانەکانیش دکتۆر عصمەت عەبدولمەجید کە راوێژکار بوو لەوەزارەتی داد.

سەفیر پێی وتین رۆژی ٢٠٠٤/٣/١٩ سەردانی باڵیوزخانە بکەین بۆ ئەوەی کارئاسانیمان بۆ بکرێت. کە ئامادەبووین فیزەیان پێداین و وتیان رۆژی ٢٠٠٤/٣/٢١ کاتژمێر شەشی بەیانی لە باڵوێزخانە ئامادەبین بۆ سەفەر کردن.

ئێمە لەکات و شوێنی دیاریکراو ئامادەبووین، بە ئۆتۆمبێلی باڵیۆزخانە بەڕێکەوتین بەرەو زاخۆ و لەسەر پردەکەی خابوور لەنێوان عێراق و تورکیا پێشوازییان لێ کردین، بەرەو دیاربەکریان بردین، لەوێوە کاتژمێر شەش و چارەکی ئێوارە بەفڕۆکە چووین بۆ ئەنقەرە، کاتژمێر حەوت و نیو گەیشتینە ئەنقەرە، لە فڕۆکەخانە پێشوازییان لێ کردین، بە ئۆتۆمبێل بردینیان بۆ ئوتێلی (بیلْ کنك - زانستی شار) و سەرۆکی کۆنگرە بەخێرهاتنی لێ کردین، پاش نانخواردن پێی وتین کە کاتژمێر نۆی بەیانی لە هەمان ئوتێل کۆنگرەکە دەست پێ ئەکات.

رۆژی ٣/٢٢ لەهەمان ئۆتێل کۆنگرەکە دەستی پێکرد، ئەوانەی بەشدارییان دەکرد لەو کۆنگرەیەدا زیاتر لە سەد کەس بوون، نوێنەری (ئەمریکا و بەریتانیا و ئەڵمانیا و فەرەنسا و تورکیا و ئیسرائیل و عێراق)ی تێدابوو، زمانی دایەلۆگ لە کۆنگرەکە زمانی ئینگلیزی بوو، بۆ تورکی و عەرەبی وەردەگێڕدرا وە بە پێچەوانەوە.

ماوەی کۆنگرەکە دوو ڕۆژ بوو، رۆژی یەکەم بەشی بەیانی باس لە لایەنی کۆمەڵایەتی عێراق کرا، بەشی دووەم پاش نیوەڕۆ باس لە بارودۆخی رامیاریی عێراق کرا، رۆژی دووەم بەشی بەیانی باس لە یاسای کاتیی عێراق کرا و وتووێژی لەسەر کرا، بەشی ئێوارە گفتوگۆ لەسەر ئاکام و ئەنجامی کۆنگرە کرا.

لە بەشی یەکەمی رۆژی یەکەم، سەرۆکی کۆنگرەکە وتەیەکی پێشکەش کرد، لەپاش ئەو نوێنەری ئەمریکا وتاری دا، دوای ئەوان سێیەم کەس داوایان کرد لەمن وتەیەك لەبارەی بابەتی کۆنگرەکەوە پێشکەش بکەم.

منیش وتارێکم خوێندەوە کە تیایدا بەکورتی ئەم خاڵانەم روونکردەوە:

**بەناوی خوای گەورەو میهرەبان**

رووی دەمم دەکەمە بەڕێزان بانگهێشتکراوانی ئەم کۆنگرەیە، بەناوی مامۆستایانی عێراقەوە سوپاسی دەوڵەتی تورکیایی دراوسێ و خۆشەویستمان دەکەین، بەتایبەتی بەرپرسانی پەیمانگای تورکیا بۆ رامیاری دەرەوە، لە زانکۆی بیپکنت بۆ ئەم میوانداریيەو ئامادەکردنی ئەم کۆنگرەیە بەم شێوەیە، کە تیایدا گفتوگۆ لەسەر کێشە هەنوکەییەکان بکرێت.

بۆیە داوا لە خوشك و برایانی بەڕێزی ئامادەبوو دەکەم، ڕێگەم بدەن بە کورتی سێ خاڵ، کە پەیوەند و پەیوەستە بە ئێستاو داهاتووی عێراقەوە بخەمە ڕوو:

**یەکەم: بواری کۆمەڵایەتی لە عێراقدا:**

گەلی عێراق لە چەند نەتەوەو چەندین ئاین و مەزهەبێك پێك هاتووە، بێگومان ئەم جیاجیاییەش هیچ کاریگەرییەکی سلبی ناکاتە سەر ئایندەی عێراق، لە هەمان کاتدا هیچ زیانێك بە ڕەوتی عێراق و یەکگرتوویی ناگەیەنێت، چونکە یەکانگیر و پابەند و پتەوو بەهێزە:

**١- یەکانگیری یەکگرتویی ئایینی:** کە یەکگرتووی ئاینی لە هەر کۆمەڵگایەکدا، کە تیایدا ئیسلام پایەدار بێت، بە بەهێزترین یەکگرتوویی تەماشا دەکرێت، ئاشکراشە کە ٩٠٪ی گەلی عێراق موسڵمانن.

**٢- یەکگرتوویی و نزیك بونەوەی لە ڕێگای پێکەوەگونجان و ژن و ژنخوازی،** کە گەلانی عێراق لەم ڕێگایەوەو لەو ڕوانگەیەوە ئایین کۆڵەکەو ڕاگرێکی گرنگ و بەهێزە کە دەوری خۆی هەیە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی و بەرز ڕاگرتنی لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلدا.

**٣- بەرژەوەندیە هاوبەش و مێژوویی و نیشتمانیەکان،** کە عێراق هاوبەشە لەنێوان ڕۆڵەکانیدا بەبێ جیاوازی ڕەگەز و ئاینزا.

**٤- یەکگرتوویی پەیوەندیی کەسایەتی:** دەستە دەستەی کەسایەتی عێراق، لە هەموو پارێزگاکاندا وەك یەك دابەشکراوە، بەبێ بوونی یەکتری ناژین، ئەم هاوبەشی دەستەدەستەییەی خەڵکی عێراق لە هاوبەشی بازرگانی و هاوڕێیەتی زانکۆ و دانیشتن و نیشتەجێ بوون، کە ئەم پەیوەندییە کەسایەتییانە پایەندیی و یەکڕیزی دەبەخشێت.

**٥- هوشیاری و ڕۆشنبیری:** گەلی عێراق بە گەلێکی ڕۆشنبیر و هوشیار ناوزەد دەکرێت، کە لە ژیان دەگات و لەگەڵ پێداویستیەکانیدا هوشیارانە مامەڵە دەکات، توانای بەسەر چارەسەرکردنی کێشەکاندا هەیە، بە دیالۆگ و گفتوگۆ و دانوسان

و ڕێکەوتن. بۆیە لە داهاتوودا ڕوو ناکاتە ئەوەی توندوتیژی بەکاربهێنێت، کاتێک دەسەڵاتی دەکەوێتەوە دەست و خۆی کاروباری وڵات بەڕێوە دەبات.

**دووەم:**

لێکچونێکی گەورە لەنێوانی باری ئێستای عێراق و باری دوای جەنگی جیهانی یەکەمدا هەیە، ئەوکاتەی ئیمبراتۆرێتی عوسمانی (کە مەڵبەندی خیلافەتی لە ئەستانبوڵ بوو) کەوتە ژێر دەستەڵاتی ئینتدابی بەریتانی، کە نە حکومەت و نە دەستوور هەبوو، هەروەها یاساو سوپاش و بەڕێوەچوون و ئیدارەشی نەبووە، هیچ دیاردەیەکیش لە دیاردەکانی دەسەڵاتی تەواو دیار نەبووە.

پاشان بەریتانیا فەیسەڵی یەکەمی هێناو کردیە مەلیك و خاوەن شکۆ لە عێراقدا، ئەوکات داوای لە شێخ محمود کرد کە کوردێك بوو لە سلێمانی، کە بێتە مەلیکی کوردستانی عێراق، بەڵام کوردەکان بەم داخوازییە ڕازی نەبوون، بەڵکو حەزیان بە پێکەوەژیانی هاوبەش لەگەڵ برا عەرەب و تورکەکان و هەموو کەمە نەتەوەیەکانی تردا دەکرد، زیاتر لە سەربەخۆیی و بوونی کیانێکی سەربەخۆ، لەگەڵ فەیسەڵی یەکەمدا بوون و پشتگیرییان پیشاندا بۆ حوکمڕانی فەیسەڵ، یەکەم هۆکاریشی کە کاریگەری هەبوو لەم پشتگیرییەدا ئیسلام بوونە.

کە لە ٢٣/ئابی ١٩٢١ هاتە سەر تەخت و دەستور مۆرکرا، بوویە (یاسای بنەڕەتی ) لە ٢/ئابی ١٩٢٤دا، ئەوسا عێراق بووە خاوەنی دەسەڵاتی سەربەخۆی خۆی و بوە ئەندامی (عصبة الامم)، پاشان ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان، گەلی عێراقیش لەژێر سێبەری حکومەتێکی نیشتمانیدا، بەخۆشی و برایەتی نێوان هەموو نەتەوەکانی بەسەرفرازی دەژیا.

ئێستاش گەلی عێراق داوا لە هاوپەیمانان دەکات کە بەخێرایی دەسەڵات بگەڕێتەوە دەستی عێراقیەکان، تا خۆیان ئەو رووکار وبارودۆخە ناخۆشەو دڵتەزێنانەی، کە بەهۆی تیرۆریستانەوە وڵاتەکە دووچاری ناخۆشی و تێکچوون بووە، بپارێزن.

ماوەی ساڵێکە ئەمریکا بەناوی چارەسەرکردن و بەرگری و لەناوبردنی تیرۆرەوە، خەڵك دەگیرێن، هەتا ئێستاش گەلی عێراق نازانن ئەو تیرۆریستانەی گیراون کێن؟ ناونیشان و شوێنیان کوێیە! نە ئامانجیان دەزانرێت نە دەشزانرێت لە چ لایەنێکەوە پاڵپشتیان لێدەکرێت، کە بۆتە هۆی کوشتن و برینی کەسانی بێ تاوان.

**سێیەم: یاسای دەسەڵاتی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتقالی:**

١- ئەم یاسایە کە بە کۆتایی قۆناغی ئینتقالی کۆتایی دێت و دەستوری هەمیشەیی جێگەی دەگرێتەوە.

٢- ئەم یاسایە بە ئیجابی و سەلبیاتیەوە، کە گەلی عێراق دەیەوێت لە رێگای دیالۆگ و گفتوگۆ ئەم یاسایە بگۆڕێت و راست بکاتەوە.

٣- لەم یاسایەدا هەندێك ئیجابیات بەرچاو دەکەوێت، کە هیچ دەستورێکی جیهانی سێهەم پەیرەوی نەکردووە، وەك پارێزگاری لە مافی ئافرەت و ئیشکردنیان لە ئیدارەی دەوڵەتدا کە رادەیان لە ٢٢٪ کەمتر نەبێت، بە تایبەت لە کۆمەڵەی نیشتمانیدا.

هەروەها لێپرسینەوە لە دەسەڵاتی جێبەجێ کردن، لێپرسینەوەی ئەندامەکانی، وەك هەر کەسێکی تری ئاسایی، ئەگەر تاوانێکی کردبێت، هەروەها بڕیاری دادگایی بۆ چاودێری دەستور و یاساکان و جیاکردنەوەی کێشەکانی دادگا لە وەزارەتی داد. زۆر شتی تر کە بواری باسکردنیان نیە.

ئەو مرۆڤەی کە لە دەمارگرژی رەگەزی و تایفەگەری دوربێت، دڵشاد و دڵخۆش دەبێت، دەبینێت کە عێراق دەبێتە نمونەیەکی دیموکراتیانەی واقیعی دەوڵەتانی تر چاوی لێدەکەن، پەیوەندی باش و توندوتۆڵ و بەهێز لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێدا دەبەستێت، بەتایبەتی لەگەڵ دەوڵەتی تورکیای دراوسێی ئازیزدا.

لەگەڵ ئەوپەڕی رێز و سوپاسدا.

دکتۆر مستەفا ئیبراهیم زەڵمی

ئوستاذ لە کۆلێژی (النهرین) ٢٠٠٤/٣/٢٢

ئەم وتە کورتەیان زۆر پێ خۆش بوو، لەهەمان کاتدا وەردەگێڕا بۆ سەر زمانەکانی ئینگلیزی و تورکی.

**ڕۆژی دووەم ٢٠٠٤/٣/٢٣ نۆرەی وتاری هاوڕێکانم بوو:**

دکتۆر عصمەت عەبدولمەجید وەك نوێنەری تورکمانەکان بەکورتی داوای کرد لە دەوڵەتی تورکیا فریای تورکمانی عێراق بکەوێت، چونکە هیچ مافێکیان نەداونەتێ و پاشەڕۆژیان نادیارە.

دکتۆر ماهر جبوری کە نوێنەری عەرەبی سوننە بوو، پسپۆڕییەکەی یاسای دەستوری بوو، ئەم یاسایەی دەوتەوە لەکۆلیجی یاسا، داوای کرد لە تورکیا کە پشتیوانی عەرەب و تورکمان بکات دژی کورد، وتی ئەگەر تورکیا پشتگیریمان نەکات کورد ئەیەوێت عێراق بکات بەدوو پارچەوە، پارچەیەکی بۆ خویان و پارچەکەی تری بۆ هەموو گەلەکانی تری عێراق.

کاتێ لێ بووەوە، وتم ئەم مامۆستایە پسپۆڕیەکەی یاسای دەستورییە لەگەڵ ئەوەش تا ئێستا نازانێت کەفیدراڵیەت جیاوازە لەجیابوونەوە.

لەپاشان دکتۆر غازی فەیسەڵ کە نوێنەری شیعەکان بوو، وتی: ئێمە کەشیعەی عێراقین داوا ئەکەین حکومەتی عێراق حکومەتێکی ئیسلامی بێت و لەژێر ئالای ئیسلامدا بژین بەبێ جیاوازی و، دژی فیدراڵیەتین.

کاتێ لێ بووەوە، وتم: حکومەتی ئیسلامی لەزەمانی خولەفای راشیدین و ئەمەوییەکان و عەباسیەکان و عوسمانیەکاندا جۆری حکومڕانیەکەی فیدراڵی بووە، ئێمەش کە کوردین لە فیدراڵیەت زیاتر داوا ناکەین.

لەپاش ئەوەی هەرسێکیان تەواوبوون، من زۆر نیگەران بووم بە ووتەکەیان، پێم وتن: من نەمویست سەبارەت بە رەگەزایەتی و نەتەوایەتی هیچ بڵێم، بەڵام وتویانە (لکل فعل رد فعل)، لەبەر ئەوە ئەمەوێ وەڵامتان بدەمەوە بە ئایینی ئیسلام و بە مێژوو و بە یاسا:

١- لە بەرەبەیانی مێژووی حکومەتی ئیسلامیدا لە خەلیفەکانی راشیدینەوە تاکو کۆتایی خەلافەتی عوسمانی، دەوڵەتی ئیسلام لەژێر ئاڵای خەلافەتدا فیدراڵی بوە.

بۆ نموونە لە عێراقدا دەسەڵاتی یاسادانان بەدەستی زاناکانی مەزهەبی (حەنەفی و جەعفەری) بووە و دەسەڵاتی دادگا بەدەستی عێراقییەکان بوە، هەروەها (والی) وڵاتەکە عێراقی بوە لە میسردا دەسەڵاتی یاسادانان بەدەستی زاناکانی شافیعی بوە دادگاکان مەزهەبی شافیعییان پەیڕەوکرد لەجیاتی یاسا، هەروەها سەرۆکی وڵات میسری بوە.

مەغریبی عەرەبی، مەراکش، جەزائیر، تونس، دەسەڵاتی یاسادانان مەزهەبی ئیمامی مالك بوە، سەرۆکیان لە وڵاتی خۆیان بوە.

ئەمە هەمووی ئەوپەڕی جێبەجێ کردنی فیدراڵیەتە.

٢- لەبابەت مێژوو، دوو هەزار ساڵ پێش زایینی کورد سەربەخۆیی خۆی بوە کە میدیەکان، زۆرجار لەگەڵ ئاشورییەکان ناکۆکی کەوتوەتە نێوانیان و کوردەکان زاڵ بوون.

لەمێژووی پاشاکانی فارسەکانی ئێران ئەردەلانیەکان ٦٠٠ ساڵ حوکمڕانی کوردستانی عێراق و ئێران بون و موسڵ لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بوە.

لەپاشاندا ٥٠٠ ساڵ خەلافەتی عوسمانی لە تورکیا بابانیەکان حوکمی کوردستانی عێراقیان کردوە.

٣- لە بابەت یاساوە، بەڵێن نامەی نەتەوە یەکگرتوەکان (میثاق الأمم المتحدة) بڕیاری داوە کە هەموو گەلێك کە خاوەن ئاو و خاکی خۆی بێت، مافی سەربەخۆیی هەیە، کورد لەسەر ئاو و خاکی خۆیەتی و هیچ وەختی نەچۆتە سەر خاکی کەس و هەردەم دوژمن چوەتە سەر خاك و ئاوی ئەوان.

گەلی کورد کۆنترین گەلە لەسەر خاکی عێراقدا، ئەوەی یاسای نوێی داوە بە کورد لەسەر بنەمای جوگرافیە هەمان یاسای (صدام)ە، ئەوانەی کە ئەگرین

بۆ دابەشکردنی عێراق لە کوێ بوون کە کاتێ زیاتر لە پێنج هەزار کورد کوژرا لە هەڵەبجە، لەکوێ بوون کە (صدام) بە هەزاران کوردی زیندەبەچاڵ کرد و ئەنفالی کردن و کچ و ژنی کوردیان برد بۆ خەلیج، نە لە عێراق و نە لە خارجی عێراق بەرپەرچی ئەویان نەدایەوەو نارەزاییان نیشان نەدا.

پاش کۆنگرە بۆ ئێوارە عەبدوڵا گوڵ، کە لەو کاتەدا وەزیری دەرەوە بوو، بۆ نانخواردن دەعوەتی کردین بۆ کۆشکەکەی مستەفا ئەتاتورك کە کراوە بە مۆزەخانە بۆ میوان و نانی لێدەخورێت، بۆ نانخواردن هەر گروپێك بەجیاواز لەلای یەکتردا دانیشتن، ئێمە عێراقیەکان کە گروپێك بووین لەسەر یەك مێز بووین بۆ نانخواردن، عەبدوڵا گوڵ لەگەڵ ئێمە دانیشت، لەو کاتەدا دکتۆر ئیبراهیم فەیاز لێی پرسی و وتی: تۆ هیچ پەیوەندیەکت هەبوو لەگەڵ صدام حسێن پێش لەناوچوونی، ئەویش وتی: بەدیتن یەکترمان نەدیوە، بەڵام سێ مانگ پێش روخانی رژێمەکەی نامەیەکم بۆ نووسی، لەنامەکەدا بۆم رونکردەوە ئەگەر سیاسەتی خۆی نەگۆڕێت ئەوا خۆی و وڵاتەکەی تەسلیمی دوژمنەکەی خۆی دەکات. لەوەڵامی ئەم نامەدا تەها جەزراوی، کەدووەم کەس بوو پاش صدام لەحکومڕانی عێراقدا، ناردی بۆ تورکیا و پێی وتم: سەیدولرەئیس سەلامی لێ دەکردی و وتی بەدەمی پێی بڵێ با باسی پەیوەندی ئابووری بکەین، چونکە ئەو کەسەی کەوا بیەوێ رژێمی صدام حسێن بڕوخێنێت هێشتا لەدایك نەبووە.

کاتێك گەڕاینەوە بۆ عێراق، چووم سەردانی بەڕێز مام جەلالم کرد و بەسەرهاتی کۆنگرەکەم بۆ باس کرد و ئەویش زۆر پێی خۆشحاڵ بوو.

## خانەنشین بوونم

لەسەرتایی ساڵی ٢٠٠٧ سێ دکتۆر لەکۆلێجەکەمان (كلية الحقوق / جامعة النهرين) لەبەغدا شەهید کران، لەگەڵ کوڕی یەکێك لەمامۆستاکان کاتی کۆتایی دەوام سەیارەکەی لێدەخوری و ئەگەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان، تیرۆرستان فڕاندیانن و ڕۆژی دوایی شەهیدیان کردن، لەوکاتەوە مامۆستاکانی کۆلیجەکەمان هەموویان لەخۆیان دەترسان کەپاشەڕۆژی ئەوانیش وەك ئەوان وابێ، دەستیان کرد بەبڵاوبوونەوە و بەجێ هێشتنی کۆلیجەکە، لەوانە: د.عوض قاضی کە پڕۆفیسۆر بوو لەوێ ڕۆیشت بۆ زانکۆی دهۆك کۆلیجی یاسا. ڕاگری کۆلیجەکە پڕۆفیسۆر غازی فیصل، ڕۆیشت بۆ سوریا، پڕۆفیسۆر سعد



علوش رۆیشت بۆ ئەردەن و پرۆفیسۆر دکتۆر ابراهیم فیاض هەر لەوێ مایەوەو کۆچی دوایی کرد، من بەتەنها لە بەغدا لە کۆلیجەکە مامەوە.

منیش وەك ئەوان لەبارودۆخەکە ئەترسام و نەم ئەتوانی بچمە دەرەوەی عێراق، ناچار داوام کرد خانەنشینم بکەن، لەو کاتەدا تەمەنم ٨٣ ساڵ بوو، ئەمتوانی ئەو داوایە بکەم. داوایەکەم لەرێگەی کۆلێجەوە ئاراستەی وەزیری خوێندنی باڵا کرد، کاتێ داواکەم گەیشتە زانکۆ، سەرۆکی زانکۆ داوای کرد کە چاوی پێم بکەوێت، کاتێ رۆیشتم بۆ لای وتی: ئیستا تۆ چوار وانە بە قوتابی قۆناغی دکتۆرا لە یاسادا دەڵێیتەوە، دوو لە بەشی تایبەت و دوو لە گشتی، ئەگەر تۆ خانەنشین بکرێیت کێ ئەو وانانە بڵێتەوە، منیش لەوەڵامدا وتم: بەڵێنت پێئەدەم تا ساڵی خوێندن کۆتایی نەیەت کۆلێجەکە بەجێ نەهێڵم و دەست لە وانەووتنەوە هەڵنەگرم تا کاتی تاقیکردنەوە سەری ساڵ، لەپاش تاقیکردنەوە نمرەکانیان دەدەم بەکۆلیج، ئەوکاتە دەست لەکار هەڵدەگرم .

داواکەمی نارد بۆ وەزیری خوێندنی باڵا، نزیکەی حەوت مانگ مایەوە، چونکە نەیان ئەویست کۆلێجەکە بەجێ بهێڵم، هەرچەندە تەمەنم تێ پەڕیبوو لە تەمەنی خزمەت کردنم، ئەمە لەکاتێکدایە من کاتی خۆی بڕیارێ دەرچووبوو لەسەرۆکایەتی کۆمار بۆ مانەوەم تا لە ژیاندابم خانەنشین نەکرێم.

دوای ئەو ماوەیە داوام کرد کە چاوم بەوەزیر بکەوێت و لەچاوپێکەوتنەکەدا رازیم کرد کە تەمەنم زۆر زۆرە و ناساغم، رەزامەند بوو بەخانەنشین کردنم.

# هاتنم بۆ هەولێر

لەبەرواری ٢٠٠٧/٧/١دا بەرەسمی لەلایەن (دکتۆر حسێن بالیسانی) داوام لێکرا بەشداری بکەم لە کۆنگرەی کۆڕبەندی هزری ئیسلامی لە هەولێر، یەکەمجار داوای لێبوردنم کرد لەبەر پیری و نەخۆشی، دووبارە پەیوەندیی پێوە کردم و وتی: محازەرەکانی ئەم کۆنگرەیە چوار محازەرەیە لە دوو رۆژدا تایبەت بە کێشەی خێزانە، هەرچواریان بۆ تۆ دانراون، منیش بە پێویستێکی شەرعی و نەتەوایەتیم زانی کە بەشداری بکەم، بەتایبەتی کە تایبەت بوو بە کێشەی خێزان.

لەرۆژی ٢٠٠٧/٧/٨دا لەگەڵ دایکی محەمەد سەفەرمان کرد بۆ هەولێر و لە هوتێل ئاڤیستا ماینەوە لەسەر خەرجی کۆنگرە.

کۆنگرەکە رۆژانی (١١و٢٠٠٧/٧/١٢) بوو لەشاری هەولێر، سەرەتا کاک (دکتۆر محمد شریف) سەرۆکی کۆربەندی هزری ئیسلامی منی بە میوانەکان ناساند و لەرووی ناسینی خۆیەوە وەسفێکی باشی کردم، کە جێگای سوپاسە.

وتاری ئەو دوو ڕۆژە هەمووی بۆ من دانرابوو، چونکە پەیوەندی بەکێشەی خێزانەوە بوو، لە بابەت سێ تەڵاقە و کچ بەشوودان بەمنداڵی و شووکردن بەزۆرە ملێ و ژن بەژن و کوشتنی ئافرەت بەناوی (غسل العار) لەبەر رەوشتی ناڕەوا.

رۆژی یەکەم (٢٠٠٧/٧/١١) وتارەکانم بەدووجار پێشکەش کرد، بەیانی و ئێوارە، رۆژی دووەم (٢٠٠٧/٧/١٢) پێش ئەوەی لە بەشی بەیانیدا وتار بخوێنمەوە، پێیان راگەیاندم کە وتارەکەی بەیانی و ئێوارە بکەم بەیەك، لەبەر ئەوەی ئەبێ

کاتژمێر ١٢ نیوەڕۆ لەئەنجومەنی وەزیران ئامادەبم، بۆیە هەردوو وتارەکەم کرد بەیەك و ١٢ نیوەڕۆ کۆتاییم پێهێنا.

پاشان چووم بۆ ئەنجومەنی وەزیران، پێیان وتم: سەرۆك وەزیران داوای کردوە بەتەنها بچیت بۆ ماڵیان لە هاوینەهەواری سەلاحەدین.

بەئۆتۆمبێلێکی تایبەت بەرەو هاوینەهەواری سەلاحەدین بەڕێکەوتین بۆ ماڵی کاك نێچیرڤان بارزانی سەرۆکی حکومەت.

لەوێ بەڕێزیان بەگەرمی وەك هاوڕێیەکی خۆشەویستی خۆی پێشوازی لێکردم، ئەمە یەکەمجارم بوو چاوم پێی بکەوێت، لەدانیشتنەکەدا چەند پرسیارێکی لێکردم، دوای ئەوەی وەڵامم دایەوە وتی: ئێمە پێویستیمان بە تۆ هەیە لەبابەت فتوای ئاین و راوێژکاری یاساییەوە، لەبەر ئەوە داوات لێدەکەم کە نەگەڕێیتەوە بۆ بەغدا و لێرە هەموو پێداویستیەکانت دابین دەکەین.

لەسەر ئەو داوایە مامەوە، داواکەم زۆر پێخۆش بوو، لەبەر ئەوەی ئاواتم ئەوە بوو رۆژێك بەر لە مردنم بگەڕێمەوە کوردستان بۆ خزمەتی نەتەوەکەم.

پاش ئەوە لە هوتێل شیراتۆن ماینەوە لەسەر بودجەی سەرۆکی حکومەت، کە نایابترین هوتێلی شارەکەبوو، ماوەی ٢٢ رۆژ لەوێ ماینەوە.

ئەوەی کە پێویست بوو بۆ هاتنەوەی یەکجاریم بۆ هەولێر لەرێگەی کاك (دکتۆر نوری تاڵەبانی) و (دکتۆر مصلح موستەفا) و (حاجی یوسف) ئەگەیشت بە سەرۆك وەزیران، هەر کێشەیەکم بوایە لەرێگای ئەوانەوە ئەمگەیاند بە سەرۆك وەزیران، ئەوەبوو لە ٢٠٠٧/٨/٥ کارئاسانیمان بۆ کرا کە بە ماڵ و خێزانەوە بگەڕێینەوەو لە شاری هەولێر نیشتەجێ بین و، بە ڕاوێژکاری سەرۆك وەزیران بۆ کاروباری یاسایی لە ئەنجومەنی وەزیران دامەزرام و، لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧دا بە تەواوەتی بە خاووخێزانەوە لە هەولێر جێنشین بووم.

لەمانگی ئەیلولی ٢٠٠٧ لە سەر داوای وەزیری ئەوقاف وکاروباری ئاینی حکومەتی هەرێم، سێ رۆژ وتارم پێشکەش بە مامۆستا وتار خوێنەکانی

مزگەوتەكان كرد، لە هەمان كاتدا خولی فێربونیان هەبوو لە وەزارەتی ئەوقاف، دوو خول كرایەوە بۆ كاربەدەستانی حكومەتی هەرێم و لەهەر خولێكدا سێ رۆژ وانەم پێشكەش دەكرد، زۆر پێخۆشحاڵبوون و سوودیان لێوەرگرتم، هەروەها دادوەران و پارێزەران كۆبونەوەیان بۆ ساز درا و وتارم تێیدا پێشكەش كرد.

لە ٢٠٠٨/١/١٠دا داوام لێ كرا بەشداری بكەم لە وانەوتنەوە بەكادیرانی سیاسی لقی ٢، هەر بەو جۆرە سێ رۆژ بەشداریم كرد و باسەكەم (سیاسەت لەئیسلامدا و كردەوەی كاربەدەست و دەسەڵاتدارە ئیسلامیەكان لەپێغەمبەرەوە ((صلى الله عليه وسلم)) تا كۆتایی هاتنی حوكمی ئیسلام لەخەلافەتی دەوڵەتی عوسمانیەكاندا بەهۆی جەنگی جیهانی یەكەم ١٩١٤-١٩١٧).

پاش كۆتایی هاتنی خولەكە داوام لێ كرا مانگەكە تا خولەكە تەواودەبێت وانە بڵێمەوە، وتیان چونكە زۆر سوودمان لێت وەرگرت، بەڵام من داوای لێ بوردنم كرد لەبەر ئەوەی وانەكان دابەش كرابوو بەسەر زۆر كەسدا و هەندێكیان لەوەزیرەكان بوون.

لەبەشداریكردنم لەم خولەدا بۆم دەركەوت زۆر لەئەندامانی حیزب كەناسراون بەعەلمانی و دژی ئایینن، هۆكارەكەی نەزانین و تێنەگەیشتنە لەئاینی ئیسلام و رۆڵی ئاین لەژیانی رۆژانەدا، لەلایەكی دیكەوە وا تێگەیشتبوون كەئیسلام ئەوەیە كەرژێمی پێشوو جێبەجێی دەكرد لەسەر كورد وەك ئەنفال و كوشتن و دەربەدەری، بۆم روون كردنەوە كە چەند زەوی لەئاسمانەوە دوورە، ئەوندە رژێمی پێشوو لەئیسلامەوە دووربووە، هەر كردەوەیەكیان بەرانبەر كورد كردوە بەپێچەوانەی ئیسلامەوەیە.

## پێداچونەوەی

## یاسای باری کەسیی

لەسەرەتای مانگی نیسانی ساڵی ٢٠٠٨ سەرۆکی حکومەتی هەرێم داوای کرد لیژنەیەك پێك بێت لەپیاوان و ئافرەتان بۆ پێداچوونەوەی پرۆژەی یاسای باری کەسیی هەموار کراوی پەرلەمان، لیژنەکە لەژێر چاودێری و سەرپەرشتی راستەوخۆی بەڕێزیان و ئەندامێتی ئەم بەڕێزانە:

١- د. مصطفی زەڵمی.
٢- د. نوری تاڵەبانی.
٣- د. محمد شریف.
٤- د. بەشیر خەلیل حداد.
٥- د. مصلح مصطفی.
٦- خاتوو مهاباد قەراخی.
٧- خاتوو پەیمان عزالدین.
٨- خاتوو پەخشان زەنگەنە.
٩- خاتوو د.کوردستان موکریانی.
١٠- خاتوو امیرە حسن.
١١- خاتوو شاناز أحمد.

بۆ یەکەمجار کە کۆبوینەوە بڕیاردرا کە من سەرۆکی لیژنەکەبم، لەو روەوە کە من تەمەنم لەهەموویان زیاتر بوو، لەلایەکی ترەوە من شارەزاییم لەوان زیاتر بوو لەم بابەتەوە چونکە لە (٣-٤) کونفرانس لەم بابەتەدا لە بەغدا بەشداریم کردبوو، جگە لەوەی نامیلکەیەکم هەیە لەژێرناونیشانی (مقترحات لتعديل قانون الاحوال الشخصية رقم / ١٨٨ لسنة ١٩٥٩).

نزیکەی هەشت مانگ خەریك بووین و بە سەرپەرشتی سەرۆکی حکومەتی هەرێم (کاك نێچیرڤان بارزانی) کۆبوینەوە بۆ لێکۆڵینەوە و وتووێژ و باسمان لەسەر کرد بەجۆریکی وەها کە پێچەوانەی قورئانی پیرۆز و فەرمودەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەبێ و تارادەیەکی زۆریش چاودێری مافی ئافرەت بکرێ.

یەکێك لەئیشە گرنگەکانمان ئەوەبوو پێنج مەرجمان دانا بۆ فرەژنی و هەروەها سزامان دانا بۆ یەکێك کەژنی دووهەم بێنی و یەکێك لەو مەرجانەی تیانەبێ.

**مــەرجــەکان ئـەمــانەن بـوون:**

١- بەڵگەی پەسەندکراوی هەبێ کە ژنی یەکەمی نەخۆش بێت بەجۆریکی وا کە کەڵکی ژن و مێردایەتی نەمابێ.

٢- بوونی توانایەکی وا کە هەردوو ژنەکە رەزامەندبن لەسەر ژیانیان.

٣- بەڵێن بدا بە جێبەجێ کردنی دادپەروەری لەنێوانیاندا بەبێ هیچ جیاوازیەك.

٤- ژنی یەکەم مەرجی نەکردبێ کە ژنی بەسەردا نەهێنری لەکاتی مارەکردندا.

٥- ژن هێنانەکە لە دادگادا بێت.

پێچەوانەی ئەو خاڵانەی سەرەوە ئەگەر یەکێك ژنی دووهەمی هێنا و یەکێك لەو مەرجانەی تیادانەبوو، سزا دەدرێ بەبەند کردن لەشەش مانگەوە تا ساڵێك لەگەڵ پێدانی غەرامە بە بڕی (١٠) ملێون دیناری عێراقی.

یەکێکی تر لە کارە گرنگەکان کە چارەسەرمان کرد (میرات)ی ژن و مێرد بوو، چونکە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت ئەگەر ژنەکە مرد و مناڵی نەبوو لەمێردەکەی یان لەمێردی پێشوو مێردەکەی ٢/١ نیوەی میراتەکەی ئەگرێ و ئەگەر مناڵی هەبوو ٤/١ میراتەکەی ئەگرێ، پیاوێك مرد مناڵی نەبوو لەو ژنە یان لەژنێکی تر ژنەکە ٤/١ میرات دەگرێ و ئەگەر مناڵی هەبوو ٨/١ دەگرێ.

ئافرەتەکان داوایان کرد کە دەبێ میراتی ژنیش وەك پیاو بێت. ئێمە نەمانتوانی ئەم داوایە جێ بەجێ بکەین، چونکە پێچەوانەی دەقی قورئانی پیرۆزە، بەڵام خودا خستیە دڵمانەوە چارەسەر بۆ ئەم کێشەیە بدۆزینەوە، ئەویش بریتی بوو لەمە: ئاشکرایە کە هەموو ژنێك یارمەتی مێردەکەی دەدات زۆر یان کەم لەپێکهێنانی میراتەکەی لەژیانیدا بەمووچە یان بەیارمەتی کارەکانی، هەرنەبێ ژیانی رۆژانەی بۆ دابین دەکات، ئەگەر ئەو یارمەتیە نەبێ مێردەکە ناتوانێ پاشەکەوت بکات، لەبەر ئەوە لەپرۆژەکەدا بڕیارماندا ئەگەر ژنێك مێردەکەی مرد دەبێ لیژنەی بۆ بگیرێ بۆ بڕیاردانی ئەندازەی کۆششی ژنەکە لە پێکهێنانی ئەم میراتە، بەو ئەندازەیە بەشی ژنەکە لەو میراتە جیا بکرێتەوە و بدرێ بەژنەکە و لە پاش ئەوە ٤/١ و ٨/١ ی لێ دەربکرێ.

بۆ چارەسەرکردنی یەکسانی لەنیوان کوڕو کچ لەمیراتدا، یان لەنێوان خوشك و برادا، ئەوەمان بڕیاردا بۆ میرات لێگیراو هەیە پێش کۆچی دوایی ماڵی خۆی دابەش بکات لەنێوانیاندا بەیەکسانی، یان وەسێت بکات لەپاش خۆی میرات وەك یەك لەنێوانیاندا دابەش بکرێ، وانەبێ جیاوازی هەبێ، ئەمە پێی دەوترێ (هبە)، دژی ئایەتی: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ نیە، لەپاش مردن پێی دەوترێت (وصیە)، ئەمیش وەك (هبە) دژ بە ئایەتی ناوبراو نیە.

**هەندێ لەو مافانەی داوایان کرد ئەمەبوو:**

١- ولایەت دان بەدایك پاش مردنی باوك یان نەمانی توانا (أهلیە)، لەکاتی نەبوونی باوکدا لەجیاتی باپیر، کە بەپێی هەموو مەزهەبەکان ئەیدەن بە باپیر، ئەگەر ئەو نەبوو ئەیدەن بە برا، برا نەبوو ئەیدەن بە مام، بەڵام ئێمە دامان بەدایك چونکە لەهەمووان دڵسوزترە بۆ منالْ.

٢- ژنمان بردە ریزی پیاو بۆ خەرجی پەروەردەی منالْ و خێزان بەپێی توانای ئابووری، لە کاتێکدا پیاوەکە دەستی کورت بێ و ژنەکە توانای ئابووری هەبێت خەرجی پیاو ئەکەوێتە ئەستۆی ژن.

هەندێ ماف هاتە ئارایەوە لەم پرۆژەیەدا کە پێچەوانەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر نەبوو پەسەندمان کرد، بەڵام ئەوانەی کەبەپێچەوانەوە بوون رەتماندایەوە.

لەرۆژی ٢٠٠٨/٧/١٦دا لیژنەکە لەگەڵ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم کۆبوینەوە لەئەنجومەنی وەزیران لە هەولێر، لەبەر ئەوەی من سەرۆکی لیژنەبووم، ئەو گۆڕانکاریانەی کردبوومان لە یاسای باری کەسیی باسمان کرد بۆ سەرۆکی حکومەتی هەرێم، ئەویش زۆر پێخۆشحاڵ بوو.

زیاتر لەدوو کاتژمێرو نیو لەگەڵ لیژنەکەدا دانیشت، هەندێ قسەوباسی بۆ کردین سەبارەت بە باری کۆمەڵایەتی.

رۆژی ٢٠٠٨/٧/٢١ لەلایەن ئەنجومەنی وەزیران داوا کرا کە وەك سەرۆکی لیژنە بەشداری کۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیران بکەم و باسی گۆڕانکاریەکانیان بۆ بکەم.

لەکاتژمێر ١١ بەیانی لە کۆبونەوەکە بەشداربووم، بەئامادەبوونی سەرۆك وەزیران و جێگری سەرۆك وەزیران هەموو وەزیرەکان، ئەو گۆڕانکاریانەی کە کردبومان لە یاساکەدا باسم کرد لەکۆبونەوەی ئەنجومەندا، وەزیرەکان زۆریان پێ خۆش بوو هەموویان بڕیاریان لەسەر گۆڕانکارییەکان دا، تا لەمانگی (ایلول) ڕەوانەی پەرلەمانی کوردستان بکرێت، بەو مەبەستەی لەپاش کۆتایی پشووی هاوینە پەسەند بکرێت.

لەو کۆبوونەوەیەدا بەڕێز کاك عومەر فەتاح جێگری سەرۆکی حکومەت پرسیاری کرد وتی: باشە بۆچی پیاو ئەتوانێت چوار ژن بێنێت بەڵام ژن بۆی نەبێت لە مێردێك زیاتری هەبێت؟ لەوەڵامدا وتم: چۆلەکە بەو بچوکیەی خۆی کەقورسایی مێشکی لەیەك غرام کەمترە قبوڵ ناکات نێرینەیەك نزیکی مێینەکەی ببێتەوە ئیتر چۆن مرۆڤ قبوڵی ئەوە بکات.

رەنگە وەڵامەکەم توند بووبێت بەڵام زۆر لەجێی خۆیدا بوو، پێم وایە ئامادەبوانیش پێیان ناخۆش نەبوو.

لەپاڵ کاری لیژنەدا داوامان لێکرا کەچەند کۆڕێك بگرم سەبارەت بە روونکردنەوەی گۆڕانکارییەکانی یاسای باری کەسیی، بەم شێوەیە بوو:

١- ٢٠٠٨/٧/١٠، کۆڕێك لە هۆڵی وەزارەتی گەشت وگوزار بۆ فەرمانبەرانی وەزارەت.

٢- ٢٠٠٨/٧/٣١، لەهۆڵی رێکخراوی هاوکاری لێکۆڵینەوەی ئیستراتیژی لە بارەگای رێکخراو لە عەنکاوە، سێ جار چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنیم لەگەڵ کرا سەبارەت بەم پرۆژەیە.

٣- کۆڕێك لە مانگی تەموزی ٢٠٠٨ لە هۆڵی هۆتێل هەورامان، بۆ یاساناسەکان سەبارەت بە بەراوردکردنی یاسا نێو دەوڵەتیەکان.

٤- لە هەمان مانگدا، لەبەر ئەوەی چەندین ساڵە میللەتەکەمان دەناڵێنێ بەدەست سێ تەڵاقەی ژنەوە کە لای زۆرێك لە مامۆستا ئاینیەکانی کوردستان وایە کە تەڵاق بەیەکجار هەرسێکی دەکەوێت، لە سەر فتوای ئیمام شافعی (خوا لێی رازی بێت)، وام بەباش زانی رونکردنەوەیەك بڵاو بکەمەوە سەبارەت بەم کێشەیە و بیسەلمێنم سێ تەڵاقە بە یەك جار و لە یەك شوێندا یەك تەڵاقی پێ دەکەوێت، هەروەها سوێندخواردن بەتەڵاق بەتاڵە و ئەم دوو بابەتە لەسەردەمی ئەمەویەکان پەیدابوو لەبەر بەرژەوەندی سیاسی خۆیان، لەپاشدا چووە ناو مەزهەبەکان و وەك شەرعی ئیسلامی کاری پێکرا، بەهاوکاری وەزارەتی ئەوقافی هەرێم ئەم فتوایەم لەکوردستاندا بڵاو کردەوە.

٥- کۆڕێك لەشاری سۆران بۆ مامۆستایانی ئاینیی و ئەندامانی پارتی سەبارەت بەچەند شتێکی گرنگ لە ئاینی ئیسلامدا کە پەیوەندی هەیە بەژیانەوە.

دوای لێبونەوە لە کاری لیژنەکەمان سەرۆکی زانایانی سلێمانی، خوالێخۆشبوو (دکتۆر محەمەد گەزنەیی)، سەرۆکی زانایانی هەولێر، (مامۆستا مەلا محمدی ئاکرەیی)، یاداشتێکیان نووسی بۆ سەرۆکی حکومەت و سەرۆکی پەرلەمان،

تیایدا باس لەوە کرابوو کە ئەو گۆڕانکارییانە دژ بە قورئان و شەریعەتی ئیسلامە، لە ڕەتدانەوەی یاداشتەکەیان داوامان کرد لە سەرۆکی پەرلەمان کاک (عدنان موفتی)، کە لیژنەیەك پێك بهێنرێت لە پەرلەمان بە سەرۆکایەتی خۆی و بە ئامادەبوونی هەردوو سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئایینی، بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکرێت لەسەر بۆچونەکەیان.

کەهەردوو سەرۆکی یەکێتی زانایانی هەولێر و سلێمانی لەگەڵ شاندی یاوەریان ئامادەبوون، یەکێك لە ئەندامانی پەرلەمان لە لیژنەی یاسا، دەقی هەمواركردنی یاساکەی خوێندەوە، لە هەر بڕگەیەك یا ماددەیەك، ڕووی دەکردە نوێنەری زانایان و پرسیاری لێ دەکردن کە ئایا پێچەوانەی قورئان و شەریعەتە؟ لە وەڵامدا دەیانوت (نەخێر)، بەمجۆرە لیژنەکە کاری خۆی ئەنجام دا بێ ئەوەی کە شتێك بدۆزنەوە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێت.

هەروەها توانیم چەند نامیلکەیەك لەسەر ئەرکی خۆم بەچاپ بگەیەنم و بڵاوی بکەمەوە و بەسەر مامۆستایانی ئایینیدا دابەشی بکەم، لەوانە:

١- الطلاق في القرآن.

٢- خطوات الطلاق في القرآن.

٣- الطلاق مرتان في تفاسير القرآن.

٤- الطلاق في الإسلام قبل المذاهب.

## وانەوتنەوەم لە
## زانكۆی صلاح الدین

دوای ئەوەی لە ٢٠٠٨/١/١ لە زانكۆی نەهرەین لە بەغدا دەستم لە وانەوتنەوە هەڵگرت، هەر لەو ساڵەدا، لەسەر داواكردنی سەرۆكی زانكۆی صلاح الدین، بەڕێز پرۆفیسۆر (د. محمد صدیق) و راگری كۆلێژی یاسا، پرۆفیسۆر (د. حسێن فەیزوڵا)، بەشداریم كرد لە وانەوتنەوەی دكتۆرا لە یاسا لە هەردوو بەشی (تایبەت) و (گشتی).

لەبەشی یاسای تایبەت وانەی (الالتزامات في ضوء المنطق والفلسفة)م دەوتەوە، دواتر كردمە كتێبێك كەچوار سەد لاپەڕە زیاترە و هەمووی باسی ئەو هەڵانەیە كەلەیاسادا لەبەرەبەیانی مێژووەوە تا ئێستا كراوە، لەبەشی یاسای گشتی (قانون العام) بابەتی (المبادیء الدستورية في القران الكريم)م وتەوە و دواتر ئەمیشم كردە كتێبێك.

لە ساڵی خوێندنی ٢٠٠٨-٢٠٠٩ بە ئەركی سەرشانم هەڵسام.

دوای وتنەوەی دوا محازەرەی ئەو ساڵە قاچم شكا و ئیتر لە وانەوتنەوە دابڕام.

من لەشاری بەغدا سی و پێنج ساڵ وانەوەم وتەوە بۆم دەركەوت قوتابیانی ئەوێ زۆر بەوەفاترن لەوانەی ئێرە، ئەمە بەدرێژایی مێژوو رەوشتی كورد بووە كەهیچ وەخت رێزی یەكێكی نەگرتووە كەلەنێو نەتەوەكەیدا هەڵكەوتوو بێت.

بۆ نمونە من لەزانکۆکانی موسڵ وانەم نەوتوەتەوە بەڵام کتێبەکانم لەهەر چوار قۆناغەکەی زانکۆ لەبەشی یاسا بەوانە وتراونەتەوە، لەبەر ئەوە سەرۆکی کۆلێژی حەدبا داوا لێکردم بڕۆمە ئەوێ و درعی کۆلێژەکەیان پێدام، کاتێ چووم هەموو مامۆستا و قوتابی بەرێز لەمبەر و ئەوبەری ڕێگاکە راوەستابوون بۆ پێشوازیم، یەکێك لەوانە پارێزگاری موسڵ بوو، ئەملا و ئەولای ماچکردم و زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم، دواتر هۆڵێکی گەورەی خوێندنیان بەناوی منەوە ناونا، کاتێ سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان دکتۆر ئەرسەلان بایز سێ کتێبی بۆ چاپ کردم و مەنهەج بوون لە زانکۆی موسڵ هەزار و پێنج سەد کتێبمان کردە دیاری بۆ کۆلیژی یاسای زانکۆی موسڵ و ئەوانیش سوپاسنامەیان ئاراستەی سەرۆکی پەرلەمان و من کرد.

بەداخەوە لەپاش قاچ شکانەکەمەوە کەسێجار نەشتەرگەریم بۆ کرا تائێستا لەو قوتابیانەی دکتۆرا کە لە زانکۆی سەلاحەدین وانەم پێوتن لە بیست و یەك قوتابی تەنها یەك دوانێکیان هاتوون بۆ سەردان و هەواڵپرسیم.

شایانی باسە عەرەبەکان کەلای من خوێندویانە کاتێ بەسەردان دێنە هەولێر هەوڵیداوە ناونیشانم پەیدا بکەن و سەردانم بکەن.

ئەوەی تێبینیم کردووە ئەو قوتابیە کوردانەی لەشریعە و یاسا دەخوێنن و هیچ رۆژێك وانەم پێ نەوتوون زیاتر دێنە سەردان و هەڵپرسیم دەکەن.

## چیرۆکی قاچ شکانەکەم

لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٩، لە بەرەبەیاندا بەهۆی کەوتنم قاچم لەنێوان سمتم و ئەژنۆم شکا، یەکسەر منیان گەیاندە بەشی فریاکەوتنی نەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری، دوای وەرگرتنی تیشك و پشکنین، دەرکەوت شکانم هەیە، دەبێت بچم بۆ یەکەی شکان لە نەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری، کە چووم، ئەو شوێنەم بەدڵ نەبوو، چونکە جێگایەکی پاك نەبوو، کەس بە هاناتەوە نەدەهات، ژوورەکان وەك ژوورەکانی ساڵانی پەنجاکان بوو، هیچ ئامێری خۆشگوزەرانی تێدا نەبوو، هیچی ڕانەخرابوو. داوام کرد ڕەوانەی نەخۆشخانەیەکی تایبەتم بکەن، وتیان لەتوانای ئێمەدا نیە، دەبێت ئەو دکتۆرە پسپۆڕەی کە بەرپرسی تۆیە بتنێرێت.

دواتر پەیوەندیم بە ناسیاوێك کرد، تا ڕێگایەکم بۆ بدۆزێتەوە، ئەویش برادەرایەتی لەگەڵ پزیشکێکی پسپۆڕی شکان هەبوو، وتی بیبەن بۆ نەخۆشخانەی (ن.ش)، لەوێ بردمیانە ژوورێکی تەسك، وتم ژوورێکی گەورەم بدەنێ، لەبەر ئەوەی خەڵك زۆر سەردانم دەکەن، هەرچەند تێچوونی هەیە دەیدەم. داوام کرد بەنجی مەوزعیم لێ بدەن، چونکە نەخۆشی دڵم هەیە، هەتا ئەو ساتە دکتۆرەکە نەهات بمبینێت. بردمیانە ژووری نەشتەرگەری، ماوەی پێنج کاتژمێر و دە دەقیقە لەوێ مامەوە، پاش نەشتەرگەرییەکە بردمیانەوە ژوورەکەی خۆم، بەبێ ئەوەی دشداشەکەم بگۆڕن، هەمان ئەو دشداشە بوو کە لەکاتی نەشتەرگەرییەکە لەبەرم بوو، هەمووی خوێن بوو، تا سێ ڕۆژ نەیانگۆڕی.

ڕۆژی سێیەم خێزانەکەم گوتی: بۆنی زۆر ناخۆشی لێ دێت و شتێکی عەیبە تا ئێستا دشداشەکەی نەگۆڕاوە، ئینجا موزەمیدەکە هات و دشداشە و سەرچەفەکەی گۆڕی.

ڕۆژی چوارەم گوتیان دەتوانیت بڕۆیتەوە.

لەو ماوەی لەوێ بووم، بەشەو کەسێك نەدەهات سەرم لێ بدات تا بزانێت دەرەجەی حەرارەت یان زەختم چۆنە؟ تەنها بەیانی و ئێوارە دەرزییان لێدەدام.

کە بەیانیان هەرکە دکتۆر دەهات بۆ لام، دەیوت چۆنی؟ موزەمیدەکان هەموو بەدوایەوە بوون، بەڵام کە دەڕۆیشت، ئەوانیش ون دەبوون. بەر لەوەی نەشتەرگەریم بۆ بکەن، وتیان تێچوونی نەشتەرگەریەکە چوار ملیۆن و نیوە، دوای نەشتەرگەری کە چوومەوە، نە ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن، نە گرنگیدان، هیچ شتێك نەبوو، بەڵکو بە ئۆتۆمبێلی تایبەتی خۆم گەڕامەوە.

لەماڵەوە هەتا سێ مانگ و دە ڕۆژ میوانم زۆر دەهات، هەندێك لەوانە پزیشکی پسپۆڕ بوون، هەبوو تەماشای دەکرد و دەیگوت نەشتەرگەرییەکەت تەواو نیەو غەڵەتە.

دە ڕۆژ دوای گەڕانەوەم، لە نەخۆشخانە تایبەتیەکەوە زەنگیان بۆ لێدام، وتیان وەرەوە بۆ ئەوەی تەقەڵەکانت بۆ دەربێنین، وتم: کەسم نیە بمهێنێت، ئۆتۆمبێلێکی فریاکەتنم بۆ بنێرن، گوتیان: ئێمە هەقی ئەوەمان نیە، بۆ خۆت وەرەوە.

کە بردمیانەوە نەخۆشخانەکە، بردمیانە ژووری نەشتەرگەری، دوو موزەمید هاتن بۆ لام، پرسیم: دکتۆر خۆی کوا؟ گوتیان دکتۆر مەشغوڵە و ئیشی هەیە، نەکرا بۆ خۆی بێت. گوتم: ئەی بۆ یەکێکتان نەهاتن بۆ ماڵەوە؟ هیچ وەڵامێکیان پێ نەبوو. کە تەواوبوو هیچ پارەیان لێ وەرنەگرتم.

پاش یەك مانگ ئەشیعەی تازەم گرت و چوومە عیادەی دکتۆرەکە، عیادەکەی هەتا تەسەورکەی پیس بوو، یەك کاتژمێر لەبەر ئەو سەرمایە

دانیشتم، سۆبەیەکی کۆنی سالآنی سییەکان دانرابوو، گوتم: بمبەنە دەرەوە، باشترە لەبەر سەرما بم نەك لەدیار ئەو سۆبەیە!

کە نۆرەم هات و بردمیانە ژوورەوە، ژورەکەی دکتۆریش زۆر پیس بوو، تەماشایەکی ئەشیعەکە و تەماشایەکی برینەکەی کرد و گوتی: زەختت خستۆتە سەر قاچت و یەکێك لە بورغوەکان لەجێی خۆی ترازاوە، وامان لێ مەکە دوبارە نەشتەرگەریت بۆ بکەینەوە.

سێ مانگ و دە ڕۆژ خەوم نەبوو، لە هەولێر بەیانیان دوو جار بانگ دەدەن، گوێم لە هەردوو بانگ دەبوو.

دواتر دەرکەوت کە ئەو بورغوە بە هەڵە دانراوە و کورت بووە.

کە زانیم دکتۆرەکە خەتابارە، چووم بۆ لای دکتۆرێکی تر، ئەویش وتی: واباشە نەشتەرگەرییەکی ترت بۆ بکرێت، چووم بۆ لای دکتۆرێکی تر لە هەمان نەخۆشخانەی تایبەتی پێشوو، دکتۆرەکە وتی: نەشتەرگەرییەکەت بە هەڵە بۆ کراوە، نەشتەرگەرییەکی ترت بۆ دەکەم و هەڵەکە ڕاست دەکەمەوە، وتم: بەمەرجێك بەنجی نیوەم لێ بدەن، لەبەر ئەوەی نەخۆشی دڵم هەیە.

ئەوەبوو نەشتەرگەییەکی ترم بۆ کراو ئەو پلاتینەی بە هەڵە دانرابوو، دەریهێنا، لەوێش سێ چوار ڕۆژ مامەوە، ئەمجارەیان گرنگی زۆریان پێدام، دوای دەرچوون سێ ملیۆن دیناریان لێ وەرگرتم.

دواتر هەتا ساڵێك و چوار مانگ سەردانی دکتۆرەکەم دەکرد و دەمووت: هیچ فەرقم نەکردووە؟ دەیوت: من بەرپرسی ئەوە نیم کە لەسەر پێ بڕۆیت، من تەنها لە خراپیی نەشتەرگەرییەکەی پێشوو رزگارم کردیت!

بەرپرسانی پلەدار دەهاتن بۆ لام و منیش پلاتین و بورغوەکەم دەخستە بەردەمیان و دەمگوت: قەبووڵ دەکەن ئەو جۆرە تاوانانە لێرە بکرێت و ئێوە لێی بێدەنگ بن!؟ هیچ سودی نەبوو. هەتا زۆرجار دەهاتە سەرم دکتۆرەکەی یەکەم عەمەلیاتی بۆ کردم و لەهەولێردا زۆر ناسراوە فەزحی بکەم، بەڵام دواتر دامە دەست خوا.

جارێکیان نوێنەرێکی پەرلەمان هات بۆ سەردانم و گوتی: ئەگەر دەتەوێت بچیت بۆ دەرەوەی وڵات کارئاسانیت بۆ دەکەین، وتم با پرس بە دکتۆرەکەم بکەم. چومەوە بۆ لای دکتۆرەکەی پلاتینەکەی بۆ دەرهێنام، کە هەموو جارێك چل و پێنج هەزار دیناری لێ وەردەگرتم، وتم: ئەرێ بچم بۆ ئەڵمانیا یان هیند سودی لێ دەبینم؟ وتی: تۆ بەرگەی نەشتەرگەری دیکە ناگریت، لەبەر سێ هۆ: یەکەمیان دووجار نەشتەرگەری کراویت، دووەمیان نەخۆشی دڵت هەیە، سێیەمیان تەمەنت زۆرە.

بەڵام من وام بۆ دەرکەوت کە بۆ ناوبانگی دکتۆرەکە خراپە!

پاش ئەوە بەڕێز دکتۆر تاهیر هەورامی وەزیری تەندروستی سەردانی کردم، داوام لێکرد لیژنەیەکی پزیشکیم بۆ دابنێت، بۆ ئەوەی بڕیارم بۆ بدەن، کە ئایا دەتوانم بچم بۆ دەرەوە نەشتەرگەری بکەم؟ چونکە خۆشم ئەو بڕوایەم بۆ دروست بووبوو کە لە دەرەوە باشترە. ئەویش وتی: بەیانی کاتژمێر هەشت دەتبەین بۆ نەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری.

کە چووم، لیژنەکە لە چوار کەس پێکهاتبوو، پێم وتن: بۆ ئەوە هاتووم بڕیارم بۆ بدەن دەتوانم بچم بۆ دەرەوە نەشتەرگەریم بۆ بکەن؟ وتیان: سوودی نییە.

پاش ماوەیەك، (مامۆستا محمد ئیسماعیل) زەنگی بۆ لێدام و گوتی: تیمێکی فەرەنسی هاتووە بۆ هەولێر لەو نەخۆشخانەیە، من سەرەم بۆ گرتوی و کاتێکیان بۆ دیاری کردویت. لەکاتی خۆیدا لەوێ ئامادە بووم، دکتۆرە فەرەنسیەکە دوای بینین بڕیاری دا کە نەشتەرگەریی سودی نییە.

دواتر برایەکم لە بەغدایەو خانەنشینە، زەنگی بۆ لێدام و ناوی پزیشکێکی ئوردنی دامێ (............)، کە مانگی دوو ڕۆژ دێت بۆ هەولێر و لە فلانە شوێن دادەنیشێت، منیش لەکاتی دیاریکراو چووم سەردانم کرد و نمونەی کتێبەکانی خۆم بۆ برد، ڕێزی زۆری لێگرتم، بەوردی پشکنینی بۆ کردم و وتی: پێش ئەوەی قاچت بشکێت چەند کیلۆمەتر ڕێت دەکرد؟ منیش وتم: زۆر بەپێ دەڕۆیشتم، تۆ بڵێ حەوت کیلۆمەتر. وتی: بەدەنت باشەو بەرگەی

نەشتەرگەری دەگرێت، نەشتەرگەریەکەت بۆ دەکەم و دوای چوار مانگ لە نەشتەرگەری وەکو خۆت لێدێتەوە، بەڵام لێرە نایکەم، بەڵکو دەبێ سەفەری ئوردن بکەیت، گوتم: چەندی تێدەچێت، وتی: دوو دەفتەر دۆلار. یەکیان بۆ هاتوچۆ، ئەویتریشیان بۆ نەخۆشخانە.

بەڕێز مام جەلال سەرۆك کۆماری عێراق، دەفتەرێك دۆلاری بۆ ناردم و خۆیشم دەفتەرێکم قەرز کرد، لەو کۆمەڵگا پزیشکییەی دکتۆرەکەی لێبوو، پارەکەم دا، کە بەڕێوەبەرەکەی مافپەروەرێکی کورد بوو، بڕی سەد دۆلاری لێ وەرگرتم، دواتر وتی: دەبێ دووسەد دۆلاری دیکەش بدەیت بۆ ئەوەی پارەکەت ڕەوانە بکەین، ئەویشم پێدا، بەبێ ئەوەی پسولەی وەرگرتنم بداتێ.

ڕۆژی دواتر لەکاتی دیاریکراودا چوین بۆ فڕۆکەخانە، بەمەبەستی سەفەرکردن بۆ ئوردن، لەوێ پێیان وتین دەبێت یانزە وەرەقە بدەن، وتم: بۆ؟ ئەی بە دوو دەفتەر پێك نەهاتین؟ وتی: جێگای تایبەتمان بۆ گرتووی. بەو شێوەیە (١٤) وەرەقە زیادکرا، کەچی لەناو فڕۆکەکە هیچ شوێنی تایبەت نەبوو.

کە گەیشتینە ئوردن، ئۆتۆمبێلی فریاکەتن هاتن و بردمیان بۆ ئەو نەخۆشخانەیەی دکتۆرەکەی لێیە، یەکسەر دکتۆرەکە هاتە لام و پاش هەواڵ پرسین وتی: تا سێ ڕۆژ بۆ خۆت بگەڕێ و سەردانی شوێنە گەشتیارییەکان بکە.

دوای سێ ڕۆژ گەڕامەوە نەخۆشخانەکە، لە ماوەی دوو کاتژمێردا چەند پشکنین هەیە هەمووم بۆ کرا لەسەر حیسابی دوو دەفتەرەکە، بردمیانە ژوورێکی پوختە و پاك و خاوێن، ڕایەخ ڕاخرابوو، قەرەوێڵەکان نوێ بوون، ئامێری خۆشگوزەرانی تێدابوو.

٢٠١١/٣/٢١، کاتژمێر نۆ چوومە ژووری نەشتەرگەری، دوو کاتژمێری خایاند، دوای دەرچوون، یەکسەر دشداشەکەیان گۆڕیم، ڕۆژانە بەیانی و ئێوارە خواردنی تەواو و باشیان بۆ خۆم و دوو هاوەڵەکەم دەهێنا، دکتۆرەکە ڕۆژی دوو جار سەردانی دەکردم، لەکاتی ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵ و شەویش سەری لێ دەدام.

ده ڕۆژ لەوێ مامەوە، پێی وتم: واباشە لە نزیك نەخۆشخانە شوقەیەك بەکرێ بگریت هەتا کاتی ڕۆیشتنەوە، من خۆم دێم بۆ لات، شەش ڕۆژیش لە شوقە مامەوە، پێش عیادە و پاش عیادە دەهات و هیچ پارەی وەرنەدەگرت.

دواجار پێی وتم: پێویستت بە ئێرە نەماوە، هەندێ ڕێنمایی دامێ و چارەسەرکەرێکی سروشتی هێنا بۆ ئەوەی فێری هەندێك ڕاهێنانمان بکات.

ڕۆژێکیان پێم وت: دکتۆر قسەیەکم هەیە، ئەو برادەرەی هەولێر چواردە وەرەقەی زیادەی لێم سەند، تکات لێدەکەم، لەوانەیە ساختەیی لەگەڵ خەڵکانی تریش بکات. کە هەڵسا بڕوات، زەرفێکی دا خێزانەکەم و وتی: ئەوە لە عەمەلیاتەکە زیادە. بەزۆر خێزانەکەم وەری گرت.

دوای گەڕانەوەم، لە هەولێر سێ جار سەردانیم کرد، هەرسێ جار سەد دۆلارەکەی دامەوەو هیچی لێ وەرنەگرتم. پێشی وتم کە نەشتەرگەرییەکەم زۆر سەرکەوتووە.

بەپێی قسەی دکتۆرەکە، مەفروز بوو پاش حەوت مانگ لە نەشتەرگەریەکەی، بەپێ بڕۆم، بەڵام وا دەرنەچوو، هات بۆ لام و داوای لێبوردنی کرد، پێی وتم: ئەو نەشتەرگەرییەی لە هەولێر بۆت کرابوو، هی شەستەکانە، بۆیە نەتتوانی بەپێ بڕۆیت.

دواتریش تەلەفۆنی بۆ کردم و پێی ڕاگەیاندم کە شوێنەکەی خۆی گۆڕیوە، لەبەر ئەوەی بە لێکۆڵینەوە بۆی دەرکەوتووە کە ئەو کوردەی ساختەی لەگەڵ من کرد، ساختەی لەگەڵ خەڵکانی دیکەش کردووە.



## هاتنی ژمارەیەك
## مامۆستای میسری بۆ سەردانم

ڕۆژی ٢٠١٢/٤/٢٧ بەڕێزان شێخ جەمال قوتب سەرۆکی پێشووی لیژنەی فەتوا لەزانکۆی ئەزهەر و، دکتۆر عەبدولڕەحمان نەقیب مامۆستای زانستەکانی پەروەردە و، دکتۆر عەبدولخەبیر عەتا مامۆستای زانستە سیاسیەکان و، دکتۆرە حەنان عەبدولمەجید مامۆستای زانستی کۆمەڵناسی و، دکتۆر جەمال جبریل مامۆستای قانونی دەستوری و، دکتۆر صەلاح عەبدولسەمیع مامۆستای پرۆگرامەکان، لەگەڵ دکتۆر صەباح بەرزنجی ئەندامی پەرلەمانی کوردستان سەردانیان کردم لەماڵەوە.

دانیشتنەکەم لەگەڵ ئەو مامۆستا میسریە بەڕێزانەدا، کەهەریەکەیان پسپۆڕییان لەبوارێکدا هەبوو، زۆر خۆش بوو، لەبارەی زۆر بابەتەوە قسەمان کرد، لای خۆمەوە ژمارەیەك لەکتێبەکانم بەدیاری پێدان.

هەر لەم دانیشتنەدا شێخ جەمال قوتب کە لە زانا ناسراوەکانی میسرە و پێشتر سەرۆکی لیژنەی فەتوای ئەزهەر بووە، داوای کرد لەسەر چوار بابەت بنووسم

کەوەك خۆی وتی موسڵمانان پێویستیان پێیەتی، قەدەری خوای گەورە وابوو کە لەسەر سێ لەو بابەتانەم نووسیبوو، یەکەمیان نەسخ، دووەمیان کوشتنی مورتەدی بێ زیان، سێ هەمیان رەجم، ئەو دوو دانراوەی ئەخیریان ئەو کاتە لەچاپخانە بوون، ئەمەش شێخ جەمال قوتبی زۆر خۆشحاڵ کرد و وتی لەجیاتی "في القرآن" بنووسە "في الاسلام".

جێی ئاماژەیە لەکاتی سەردانیم بۆ قاهیرە بۆ رێزلێنانەکەی شێخی ئەزهەر دووبارە بەدیداری شێخ جەمال قوتب و دکتۆر جەمال جبریل و دکتۆر صەلاح عەبدولسەمیع شاد بوومەوە و بۆ نانی ئێوارە لەکەناری رووباری نیل میوانداریيان کردین و لەو دیدارەشدا شێخ جەمال قوتب وتی: دەبێت شێخی ئەزهەر فەخر و شانازی بکات بەوەی خەڵاتی تۆیان کردووە، نەك تۆ شانازی بەوەوە بکەیت کە شێخی ئەزهەر خەڵاتی کردوویت.

منیش وتم: گەورەترین خەڵات بۆ من ئەوەیە خوای گەورە ئەو کارانەم لێ وەربگرێت و پاشان سوودێکیان هەبێت بۆ موسڵمانان.



## ماستەر نامەیەك لەسەر بیروڕا ئوصولییەکانم




لە ئەکادیمیای باڵای دیراساتی زانستی و مرۆیی بەشی شەریعە، قوتابی مەدیحە صالح مەهدی هەستا بەنووسینی ماستەر نامەیەك بەناونیشانی "الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي و آراؤه الاصولية"، بەسەرپەرشتی دکتۆر محيي هلال السرحان، بە سوپاسەوە ماندووبوونی زۆری بینیوە بۆ تەواوکردنی ئەم ماستەر نامەیە.

لەم ماستەرنامەیەدا لە بیروڕا ئوصولیەکانمی کۆڵیوەتەوە، هەروەها رای چەند مامۆستا و زانایەکی لەبارەی بەرهەمەکانمەوە وەرگرتووە و بەکورتی لەسەر هەر دانراوێکم شتێکی نووسیوەوە.

٢٠١٦/١/٧ لە زانکۆی سلێمانی، گفتوگۆی نامەی ماستەری قوتابی (عبدالله مەلا ئەحمەد) کرا بەناونیشانی (جهود الدكتور مصطفى الزلمي و منهجه في الدراسات القانونية). لیژنەی گفتوگۆ پێکهاتبوو لە: سەرۆکی لیژنە د. کامەران اورحمان - د. ئاراس محمد صالح - د. اسماعیل محمد جلال.

شایەنی باسە ئێستا لە چەند زانکۆیەکی مالیزیا و تورکیا و سودان و عێراق قوتابی لە نوسینی ماستەرنامە و دکتۆران لەسەر کتێبەکانم.

# سەرلەنوێ
# سەردانی سەرسیبیان

ماوەیەك بوو مامۆستایانی ئەو دەڤەرە داوایان دەكرد سەردانییان بكەم، هەر جارێك لەبەر كارێك یان نەخۆشی نەدەكرا، حەزیشم دەكرد دوای ئەو هەموو ماوەیە سەردانی ناوچەكە و مامۆستایانی بەرێزی بكەمەوە.

سەرلەبەیانی رۆژی ١٣-٤-٢٠١٣ لەهەولێرەوە بەرەو رانیە بەرێكەوتین، چووینە گوندی بۆسكێن بۆ ماڵی مامۆستا مەلا سەید مەحمود كەكاتێ من لەوێ مەلا بووم ئەو سوختە بوو، لای مامۆستا مەلا سەید سلێمان كەلای من موستەعید بوو دەیخوێند، ژمارەیەكی زۆر مامۆستای ئاینی میوانداری



کردبوو، سەرەتا من وتەیەکی کورتم پێشکەش کرد و هەندێ رای خۆم لەبارەی بابەتە فیقهیەکانەوە خستە روو، دواتر پێم وتن هەر پرسیارێکتان هەیە بیکەن، ئەو مامۆستا بەڕێزانەش لە زۆر بابەتدا پرسیارییان کرد، کۆڕەکەمان تا کاتی نیوەڕۆی خایاند، زۆر شتمان تێدا باس کرد، بەراستی کۆبوونەوەیەکی خۆش و باش بوو، بەگشتی مامۆستاکان هەستت دەکرد کەمامۆستای باشن.

نیوەڕۆ هەموو میوانەکان لەوێ نانمان خوارد، پاش نانخواردن لەگەڵ چەند مامۆستایەك و کاك حەسەن کوڕی سمایل ئاغا، کەئەو پاش نانخوارد گەیشتە لامان، چووین بۆ سەرسییان، ئەو گوندەی ساڵی ١٩٤٧ لێی بووم بەمەلا و سێ ساڵ لەوێ مامەوە.

سەرسییان گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، جێگای ماڵەکەی ئێمە بەهۆی دروستکردنی ئەو بەنداوەوە بوو بوو بەژێر ئاوەوە.

هەمان رۆژ پاش نوێژی عەسر لەشاری رانیە کۆڕێکمان بەست بۆ قوتابیانی پەیمانگای زانستە ئیسلامییەکان، ژمارەیەکی زۆر مامۆستا و قوتابی ئامادەی بوون، لەم کۆڕەشدا زیاتر کاتمان دا بەئامادەبووان پرسیار بکەن، بەداخەوە زۆر پرسیار و زۆر بابەتی سادە هەیە زۆرێك لەموسڵمانان کاتی خۆیان پێوەی خەریك دەکەن، کەهیچ سوودێکی ئەو تۆی نیە، چاوەڕوانی بابەت و پرسیاری بەبایەخ ترم دەکرد لەو قوتابیانە.

ئێوارەی هەمان رۆژ سەردانی ماڵی حەسەن ئاغای کوڕی سمایل ئاغامان کرد، حەسەن ئاغا کاتی خۆی لەسەرسیان دەرسم پێ وتبوو، ژیاننامەی سمایل ئاغای باوکیشی لەبەرگی یەکەمی ئەم یاداشتانەدا خراوەتە روو.

یەکێك لەو مامۆستا بەڕێزانەی ئەو رۆژە لەگەڵمان بوو (مامۆستا سەید لەشکر) بوو، بەداخەوە بەماوەیەکی کەم پاش ئەم سەردانە بەڕووداوی هاتووچۆ گیانی لەدەستدا، ئەو پێشتر لەهەولێر سەردانی کردبووم، زۆر پرسیاری وردی هەبوو بەشوێن وەڵامدا دەگەڕا بۆی، مامۆستایەك بوو بمایە دەیتوانی خزمەتی زیاتر بکات، خوای گەورە لێی خۆش ببێت و بە بەهەشتی شاد بکات، بۆ پرسەکەیشی پرسەنامەیەکم ئاراستەی بنەماڵەکەی کرد.

# ڕێزلێنانم لەلایەن
# پەیوەندی جیهانی دەرچووانی ئەزهەرەوە




بۆ من کە چل ساڵێك پێشتر لە وڵاتی میسر چەند قۆناغێکی خوێندنی باڵام تەواو کردبوو سەفەر کردن بۆ میسر خۆش بوو، بەڵام بەهۆی باری تەندروستیمەوە ئەو سەفەرە سەخت بوو، بۆیە لەسەرەتاوە کەباسی خەڵاتکرانم کرا لەلایەن شێخی ئەزهەرەوە رازی نەبووم، چونکە لای من سوود گەیاندن لەرووی زانستیەوە، لەرێی بەرهەمەکانمەوە بەموسڵمانان باشترین خەڵاتە، ئەگەر ئەو

بەرهەمانە بخوێندرێنەوەو سوودی خۆیان بگەیەنن ئەوا پێویستم بەوە نیە خەڵات بکرێم، ئەگەر واش نەبێت و بەرهەمەکان ئەو سوود و کەڵکەیان نەبێت ئەوا دیسان پێویست ناکات خەڵات بکرێم.

هەوڵی زۆردرا رازی بکرێم بەقبوڵکردنی خەڵاتەکە، لەوانە بەڕێزان مامۆستا (مەلا عەبدوڵا سەعید وەیسی) سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی کوردستان، کە ئەوان خاوەنی فیکرە و هەماهەنگکاری خەڵاتەکە بوون و (دکتۆر محەمەد شاکر) راگری کۆلیجی زانستە ئیسلامییەکان و (دکتۆر محەمەد شەریف) سەرۆکی کۆڕبەندی هزری ئیسلامی، لەکۆتاییدا من پێم وتن کە وەك خۆم پێویستم بەخەڵات کران نیە، بەڵام ئەگەر ئەم خەڵاتکرانەم سوودێکی بۆ کورد و زانایانی ئایینی کوردستان دەبێت ئەوا ئامادەم، ئەوەبوو هەمووڵا ئەوەیان دووپات کردەوە کەخەڵاتکرانەکە سوودی دەبێت لەو بوارەدا و بەو شێوەیە وادەی سەفەری میسر دیاری کرا.

بۆ ئەو مەبەستە نیوەڕۆی رۆژی ٨-٥-٢٠١٣ لەرێگەی فڕۆکەخانەی هەولێری نێودەوڵەتیەوە بەرەو قاهیرە بەڕێکەوتین.

لەم سەفەردا جگە لە خێزانم و مەسعودی کوڕم، هەریەك لەمامۆستا مەلا عەبدوڵا سەعید سەرۆکی یەکێتی زانایان و رێدار ئەحمەد لەسەفەرەکەدا بوون.

حکومەتی هەرێم لەکار ئاسانی سەفەرەکەدا هاوکاری کردین، بەڕێز (دکتۆر ئەرسەلان بایز) بلیتی فڕۆکەی وەفدەکەی گرتە ئەستۆ، باقی خەرجی سەفەر یەکێتی زانایان پێی هەستا، کەجێگەی سوپاسە.

دیارە مامۆستا مەلا عەبدوڵا هەماهەنگی کردبوو پێشتر، ئێوارەی ئەو رۆژە لەشاری قاهیرە لەئوتێل (تریومف) دابەزین، ناوی ئەم ئوتێلە بەزمانی فەرەنسی واتە (باڵندە).

بۆ بەیانی، واتە ٩ی مانگ، بەڕێز دکتور (عبدالفضیل القوصی) وەزیری ئەوقافی پێشتری میسر و جێگری سەرۆکی پەیوەندی جیهانی دەرچووانی

ئەزهەر و، (لیوا ئوسامە یاسین) جیگری سەرۆکی پەیوەندی جیهانی دەرچووانی ئەزهەر، لە ئوتێلەکە بەمەبەستی بەخێرهاتن سەردانییان کردین و دەعوەتی نیوەڕۆخوانێکیان کردین، لەو سەردانەدا باس لەمەراسیمی ڕێزلێنانەکە کرا.

ئێمەش لای خۆمانەوە لەهەموو دانراوەکانم ژمارەیەکی زۆر کتێبمان بردبوو وەك دیاری بۆ ئەزهەر، نمونەی ئەو کتێبانەمان پێدان.

ڕۆژی شەمە ٢٠١٣/٥/١١ لەهۆڵی مەشیەخەی ئەزهەر لەشاری قاهیرەی پایتەختی میسر، بەئامادەبوونی ئیمامی گەورەی ئەزهەر (دکتۆر ئەحمەد تەیب) شێخی ئەزهەر و سەرۆکی پەیوەندی جیهانی دەرچووانی ئەزهەر و (لیوا ئوسامە یاسین) جیگری سەرۆکی پەیوەندی جیهانی دەرچووانی ئەزهەر و مامۆستا (مەلا عەبدولا سەعید وەیسی) کوردی سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئاینیی ئیسلامی کوردستان و ژمارەیەك لەمامۆستایان و قوتابیانی ئەزهەر، کە ژمارەیەکی بەرچاویان قوتابی کورد بوون، شێخی ئەزهەر میدالیای ڕێزلێنانی پێ بەخشیم، منیش ئەو ژمارە کتێبەی باسم کرد کردمە دیاری بۆ ئەزهەر.

شێخی ئەزهەر وتەی خۆی پێشکەش کرد و جگە لەبەخێرهاتن، باسی لەکار و چالاکی خۆیان لەگەڵ هەرێمی کوردستان کرد و، هەوڵ و بەرهەمەکانی بەرز نرخاندم.

مامۆستا (مەلا عەبدولا سەعید) سەرۆکی یەکێتی زانایان ئەویش وتەی خۆی پێشکەش کرد و ئەم ڕێزلێنانەی بەکارێکی گەورەو پڕ بایەخ دایە قەڵەم.

من لەوتەکەمدا باسم لەوە کرد کە ئەمە ڕێزلێنانی هەموو ئەو زانا کوردانەیە کەخزمەتیان بەزانستی شەرعی کردووە لەکۆنەوە تا ئێستا.

هەروەها باسم لە ڕۆڵی وڵاتی میسر و پەیوەندی کورد و میسر کرد.

لێرەدا پێم خۆشە هەرسێ وتەکە وەك خۆیان بەزمانی کوردی بخەمە ڕوو:

دەقی وتەکەم، کەلەمیانی مەراسیمی ڕێزلێنانمدا پێشکەشم کرد:



بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس بۆ ئەو خودایەی دەفەرموویّت:

﴿ هَلْ يَسْتَوِي ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾

درود و سڵاو لەسەر گیانی سەروەرمان موحەمەد - درودی خوای لێبێت - کە فەرموویەتی:

(الحكمة ضالة المؤمنِ حيثما وجدها فهو أحقُّ بها).

لەسەر ئەو یار و یاوەرانەی کە لەقوتابخانەی پێغەمبەری خوادا پەروەردە بوون و ڕێگای ڕاستیان واڵا کرد بۆ ئەوانەی پاش خۆیان هاتن.

سەماحەتی پایەبەرز و مامۆستای گەورە دکتور ئەحمەد ئەلتەیب، ئیمامی گەورەی ئەزهەری شەریف.. خوا بتان پارێزێت.

مامۆستایانی ئامادەبوو و میوانە بەڕێزەکان....

سڵاوی خوای گەورەتان لێبێت....

جێگای شادی و شانازیمە کەپاش تێپەڕبوونی زیاتر لە چل ساڵ سەردانتان بکەمەوە، کە ئەو کاتە من قوتابی زانکۆی ئەزهەر بووم لەهەردوو قۆناعی ماستەر و دکتۆرا لە فیقهی بەراوردکاری و، قوتابی زانکۆی قاهیرەش بووم لەهەردوو قۆناغی ماستەر و دکتۆرا لەیاسادا.

ئەم ڕێزلێنانە تەنها بۆ من نیە، بەڵکو ڕێزگرتنە لەزانایانی دێرین و نوێی کورد، وەك ئیبن حاجب و ئامەدی و ئیبن خەلەکان و ئیبن ئادەم و ئیبن صەلاحی شارەزووری و..... زانایانی دیکە کە خزمەتی زانستە ئیسلامییەکانیان کردووە.

لەراستیدا پەیوەندی نێوان کوردستان و گەلی میسر دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خوالێخۆشبوو (صەلاحەدینی ئەیوبی)و خوالێخۆشبوو (محەمەد عەلی پاشا)و خوالێخۆشبوو (جەمال عەبدولناصر) کەپەیوەندییەکی بەتینی هەبوو لەگەڵ سەرکردەی کورد بەڕێز (مستەفا بارزانی)، لە ئەنجامی ئەو پەیوەندیانەش یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لەجیهاندا لەساڵی ١٨٩٨ لەقاهیرە دەرچووە، یەکەم ئێزگەش بەزمانی کوردی کرابێتەوە لەدەرەوەی عێراق لەمیسر کرایەوە ساڵی ١٩٥٦.

ئاشکرایە لای هەمووان کە ئیسلام زۆرینەی نەتەوەکانی بەپەیوەستکاری ئیمان و برایەتی ئاینی بەیەکەوە بەستەوە، لە بەرهەمی ئەو پەیوەندیەش هیچ گوندێك لەگوندەکانی کوردستان نیە مزگەوت و قوتابخانەیەکی ئاینی تێدا نەبێت، خویندنیش تێیدا لەسەر شێوازی خوێندنی ئەزهەری شەریفە لەگرنگیدان بەزانستە ئالیەکان بۆ دەرهێنانی حوکمە شەرعیەکان لەقورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر.

جیهانی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی قەرزداری چاکەی ئەزهەرە لەکۆن و نوێوە، ئەم زانکۆیە مەرجەعێکی سەرەکی زانستە ئیسلامییە عەقڵی و نەقلیەکانە، بەجۆرێك کە زمان ناتوانێت گوزارشت لە بایەخی ئەم مەرجەعیەتە بکات.

خوای گەورە سەرکەوتوتان بکات بۆ ئەوکارانەی خێری ئاین و دونیای تێدایە.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

دکتۆر مستەفا زەڵمی

٢٠١٣/٥/١١



**دەقی وتەی بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدوڵا مەلا سەعید وەیسی سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئاینیی ئیسلامی کوردستان:**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ﴾

بەسڵاوی عەقیدە و ئیسلام سڵاوتان لێدەکەم، سڵاوێك پاك و پیرۆزە لەلای خوداوە، سڵاو و سۆز و بەرەکەتی خواتان لێبێت:

خۆشحاڵم و جێگای ڕێزە بۆم بەناوی یەکێتی زانایانی ئاینیی ئیسلامی لەکوردستان ئەوپەڕی سوپاس و پێزانینی خۆمان بۆ پەیوەندی جیهانی دەرچووانی ئەزهەر کە زۆر بەڕێز ئیمامی گەورە شێخی ئەزهەری شەریف (دکتۆر ئەحمەد ئەلتەیب) سەرۆکایەتی دەکات و بۆ جێگرانی سەرۆك و دەستەی بەڕێوەبردن و هەموو ئەو برایانەی کاری تێدا دەکەن دەرببڕم، کە ئەو پێشنیارەیان قبوڵکردین کە ڕۆژی دووی نیسانی ئەمساڵ پێشکەشمان کردن بۆ ڕێزلێنانی ئەم کەسایەتیە زانستیە، سوپاسیان دەکەین بۆ قبوڵکردنی پێشنیارەکەمان، ئەمڕۆش بەیەکەوە

بەشداری ڕێزلێنانی ئەم کەسایەتیە دیارە ئەزهەریە کوردیە دەبین کەزانای هەرە دیار دکتۆر (مستەفا ئیبراهیم زەلْمی)یە.

ڕێگەم بدەن پیرۆزبایی زانایانی کوردستان پێشکەش بە زۆر بەڕێز شێخی ئەزهەر بکەین بەبۆنەی بەدەستهێنانی خەلاتی شێخ زاید بۆ کەسێتیی نووسەر و، پێی دەڵێین: پیرۆز بێت لێت، تۆ شایستەی ئەم خەلاتەی، ئێمە وەك شورەی بەتین بۆ جیهانی ئیسلامی سەیرت دەکەین هەروەك شورەی بەتینیت بۆ میسر و زانایانی.

### ئامادەبووانی بەڕێز:

شاراوە نیە لاتان کە پەیوەندی مێژوویی نێوان کورد و ئەزهەر پەیوەندیەکی بەهێزە، کەپەیوەندی زانست و بەخشینە، خۆ گەر پەیوەندی نێوان ئەزهەر و جیهانی ئیسلامی یەك لایەنە بێت، ئەوا بە فەزڵی خوا پەیوەندییەکانی لەگەڵ کورددا لەدوو لایەنەوەیە، یەکەمیان بەو پێیەی مەرجەعیەتی سوننەیە لەجیهانی ئیسلامیدا، دووەمیش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەرکردەی ئیسلامی صەلاحەدینیی ئەیوبی کەئەزهەری گێڕایەوە بۆ سەر ڕێگا ڕاستەکەی.

ئەزهەری شەریف لەو کاتەوە و ئێستاش ڕۆڵی گەورەی هەبووە لەبڵاوکردنەوەی گیانی میانڕەوی و راسترەوی لە کۆمەڵگەی کوردستانیدا، لە ساڵانی سیەکانی سەدەی بیستدا قازی ڕەشاد مفتی وەك یەکەم کورد لە ئەزهەر خوێندن تەواو دەکات، و دواتر وەك کەسێکی بە توانا لە کوردستان هەڵدەکەوێت، ئەمڕۆش ئەو پەیوەندییە مێژوویە لەگەڵ ئەزهەری شەریفدا قوڵتر دەبێت یەکەم بەپشتیوانی خوا، پاشان بەهەوڵی پەیوەندی جیهانی دەرچووانی ئەزهەر کە بەدڵسۆزییەوە لەهەوڵ و کۆششدایە بۆ کۆکردنەوەی ئەزهەرییەکان لەهەموو جیهانی ئیسلامیداو، گەیاندنی پەیامی ئەزهەر بۆ هەموو نەتەوە و گەلە موسڵمانەکان.

یەکێتی زانایانی ئاینیی ئیسلامی لەکوردستانیش کاری هاوبەشی هەبووە لەگەڵ ئەم پەیوەندییەدا لەپێناو بڵاوکردنەوەی پەیامی ئەزهەر لەوڵاتەکەماندا، ئەو پەیامەی کە ماموّستا و زانایانی دێرینمانی لەسەر پەروەردە بووە، سوپاس

بۆ خوا توانراوە سێ خولی ڕاهێنان لەئەزهەر بۆ نەوەد و پێنج ئیمام و خەتیب ئەنجام بدرێت، ئەمە سەرەڕای هەبوونی ژمارەیەکی زۆر لەقوتابی کورد لەزانکۆی ئەزهەر تا ببنە بانگخوازی میانڕەوی و ڕاستڕەوی لە سەر ئەو زەوییەی کە خوای گەورە بە"منزل مبارك" باسی کردووە، لەکاتێکدا کەشتیەکەی نوح - سەلامی خوای لێبێت - لەوێ لەنگەری گرت، ئەمە سەرەڕای هەبوونی پەیمانگایەکی ئەزهەر لەشاری هەولێر - پایتەختی هەرێم - تا نەوەی نوێ هەر لەمنداڵیەوە بەگیانی ئەزهەر پەیوەست بن و هەڵگری پەیامەکەی بن لەئایندەدا.

بەپشتیوانی خوا کار دەکەین کە پەیوەندی جیهانی دەرچووانی ئەزهەر لقی چالاکی هەبێت لەهەرێم، چونکە هەرێمی کوردستان ئێستا لەرابوونێکی میانڕەوانەدایە و، ویستی بەرەنگاربوونەوەی بیرۆکە توندڕەوەکانمان هەیە لەڕێگەی پەیامی میانڕەوی و ڕاستڕەوییەوە کەئەویش پەیامی ئەزهەرە، ئەو ئەزهەرەی کە بەقیبلەی زانست و، تاکە مەرجەعیەتی لە فیقە و فیکری ئیسلامی دادەنێین.

## زانایان و مامۆستا و برا بەڕێزەکانم:

ئەمڕۆ ئەزهەری شەریف یەکێك ڕۆڵەکانی لەئامێز دەگرێت کەلەو زانا و لێکۆڵەرە پێشەنگانەیە لەئاسمانی هەردوو سەدەی بیست و بیست و یەکدا درەوشاونەتەوە، ئەویش زانای ناودار و پایەبەرز و مامۆستای سەنگین دکتۆر (مستەفا ئیبراهیم زەڵمی) بەنەتەوە کورد و بەشوێنی لەدایکبوون زەڵمی و بەزانست و ڕۆشنبیری و پەروەردە ئەزهەری.

## زەڵمــی کــێ یە؟

بەڵێ، لەسەر زەوی کوردستان زانایانێکی پایەدار پێگەیشتوون، کەبەڕاستی وەك مانگی چواردە و گەشاوە و پرشنگداربوون، خەسڵەتەکانی زانا خواویستە دڵسۆزەکانیان تێدا کۆبووبووەوە، خوای گەورە کردبوونیە مایەی سوود بەخشین و، بەرەکەتی خستبووە کارەکانیان، هەموو هەوڵ و زۆربەی کاتەکانیان بەخشیبووە ئیسلام و موسڵمانان، ژیانی خۆیان بەخوێندن و وانە وتنەوە و نووسین و فتوا و کاری بەجێ بۆ ئەم شەریعەتە بەرزە نەزر کردبوو، لەسەر دەستی ئەوان سەدان

زانا پێگەیشتن کە ڕۆڵیان هەبوو لە بونیاتنانی بواری زانست و مرۆڤایەتی و پێشکەوتن لەهەرێمی کوردستان، کتێبخانەی ئیسلامییان بەباشترین شێوە دەوڵەمەند کردووە و، لەزۆربەی زانست و هونەرەکاندا کتێبیان نووسیوە، بەتایبەت لە فیقهی ئیسلامیدا.. ئەم کەسایەتیە ناودارەی لەبەر ئەو کۆبوونەتەوە خاوەنی دانراوە لە زانستە جۆربەجۆرەکاندا و، کتێبخانەی ئیسلامییان دەوڵەمەند کردووە، سەرەڕای ڕۆڵی پێشەنگانەیان لەپەروەردە و پێگەیاندنی زانایانێك کەبەچەکی زانست و ئیمان و بیروباوەڕی ڕاست و دروست و فیکری میانڕەوی بۆ خزمەتی ئەم ئایینە پڕ چەك بوون، لەبەر ئەوە هیچ مەدرەسەیەك لەهەرێمی کوردستاندا بگرە لەعێراقیشدا نابینیت شوێنەواری ئەوی لەسەر نەبێت، ئەویش زانای پایەبەرز دکتۆر مستەفا زەڵمی یە.

ساڵی ١٩٢٤ لەگوندە زەڵم لەنێو شاخەکانی کوردستان لەدایکبووە و، لەخزمەت گەورە زانایانی کوردستاندا زانستە شەرعیەکانی خوێندووە، پاشان بکالوریوسی لەیاسادا ساڵی ١٩٦٥ لەزانکۆی بەغدا بەدەست هێناوەو، ماستەر لەزانکۆی بەغدا ١٩٦٨ و، ماستەر لەفیقهی موقارەن لەئەزهەر ساڵی ١٩٧١ و، ماستەر لەیاسا لەزانکۆی قاهیرە ١٩٧٣ و، دکتۆرا لەفیقهی موقارن لەئەزهەری پیرۆز ١٩٧٥ و، دواتریش دکتۆرا لەیاسا لەزانکۆی بەغدا ٢٠٠٥ز.

زیاتر لەپەنجا دانراوی لەشەریعەتدا (فیقە و ئوصول) و یاسا و توێژینەوە قورئانی و فەلسەفیەکاندا هەیە، سەرەڕای چل توێژینەوەی زانستی لەهەمان ئەو پسپۆڕیانەدا، ئەمە وێڕای سەرپەرشتیکردنی زیاتر لەسەد نامەی زانکۆیی دکتۆرا و ماستەر لە فیقە و فەلسەفە و یاسا و شەریعەتدا، ئەمرۆش لەگەڵ زۆری تەمەنیدا کە لە نەوەد ساڵ نزیك دەبێتەوە بەردەوامە لەوانە وتنەوە و نووسین و زۆرێك لەفێرخوازانی زانست لێی سوودمەند بوون، کتێبەکانیشی بوونەتە مەنهەجی خوێندن و لەزۆرێك لەزانکۆکانی عێراق و هەرێمی کوردستاندا دەخوێندرێت و، ئەمرۆش زیاتر لەپێنج سەد کتێب لەدانراوەکانی دەکاتە دیاری لە ڕێی شێخی ئەزهەرەوە پێشکەش بە ئەزهەر و زانکۆیەکەی دەکات.

خەڵاتی بەرهەمی زانستی لەعێراق ساڵی ١٩٩٣ بەدەست هێناوە، هەروەها نیشانەی نووسەری عێراقی ساڵی ١٩٩٥ پێدراوە، خەڵاتی نیشانەی زانستی ساڵی ٢٠٠٢ پێدراوە، لەلایەن دیوانی سەرۆکایەتیەوە لەکۆماری عێراق ڕێزی لێنراوە، ئەوەی ئەمڕۆش زۆر بەڕێز ئیمامی گەورە لەڕێزلێنانی دکتۆر مستەفا زەڵمی پێی هەڵدەستێت مەزنترین ڕێزلێنانە بۆی ئەمەش بەهۆی پێگەی ئەزهەر لەدڵیدا و خۆشەویستی بۆ ئەو مەزنەی لەئامێزیدا پەروەردە بوو، ئێمەش وەك زانایانی ئاینیی ئیسلامی لەکوردستان ئەم ڕێزلێنانە تەنها بۆ زەڵمی دانانێین، بەڵکو بەرێزلێنانی گەلی و کورد و زانایانی دادەنێین و، شانازی بەم ڕێزلێنانەوە دەکەین و جیگای فەخرمانە.

لەکۆتاییدا، جارێکی تر سوپاسی پەیوەندی جیهانی دەرچووانی ئەزهەر دەکەین، خوای گەورە بەرەکەت بخاتە هەوڵەکانتانەوە و، هەنگاوەکانتان لەسەر چاکە بەگوڕتر بکات و، خوای گەورە ئەزهە و مامۆستایانی و زانکۆکەی لەچاوی کینە لەدڵ و ئیرەی بەران بپارێزێت ...

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

Scanned by CamScanner



**دەقی وتەی ئیمامی گەورە شێخی ئەزهەری شەریف دکتۆر ئەحمەد ئەلتەیب:**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

زۆر بەڕێز دکتۆر مستەفا ئیبراهیم زەڵمی

مامۆستای موتەمەرس لەشەریعەت و یاسا لەزانکۆکانی کوردستان

زۆر بەڕێز مامۆستا عەبدوڵا کوردی سەرۆکی یەکێتی زانایانی ئاینیی ئیسلامی کوردستان

برای بەڕێز لیوا ئوسامە یاسین جێگری سەرۆکی پەیوەندی جیهانی دەرچووانی ئەزهەر

برایان و هاوڕێ و کوڕ و میوانە بەڕێزەکانم

سڵاوی خوای گەورەتان لێ بێت

هەروەها خوشکان و کچانم سڵاوی خوای گەورە لەئێوەش بێت

بەخێر بێن بۆ مەشیەخەی ئەزهەر و ئەزهەر خۆی بەمزگەوت و زانکۆیەوە

ئەمرۆ بەیەك دەگەین لەم دەرفەتە چاکە خۆشەدا بۆ رێزلێنانی ئەزهەر و مەشیخەی ئەزهەر لەم زانا پایەبەرزە دکتۆر مستەفا زەڵمی کە بەشێك لەقۆناغەکانی ژیانی زانستی لەئەزهەری شەریفدا بەسەر بردووە و لە ئەرویقەکانیدا دانیشتووە و لەسەر دەستی زانا و مامۆستایانیدا فێربووە و بڕوانامەی باڵای لەکۆلیجی شەریعەی ئیسلامی بەدەست هێناوە. بەخێرهاتنی دەکەین و لەخوای گەورە داواکارین تەمەن درێژی بکات و بەرکەت بخاتە زانست و کار و چالاکیەکانیەوە بەویستی خوا.

ئەم دەرفەتە بەهەل دەزانم تا داوا لەبەرپرسیان بکەم هەوڵەکانی لەپێناو یەکڕیزی موسڵمانان و یەکێتی گەلانی عەرەب و بەیەکگەیشتنیان بەوەی خێریانی تێدایە و بەرژەوەندییەکانیان لەرووی ئاینی و دونیا و قیامەتەوە بەدی دەهێنێت.

هەروەها ئومێدمان لەمامۆستای پایەبەرزمان ئەوەیە، کەتەمەنی لەنەوەد ساڵی نزیك بووە و بەویستی خوا سەد ساڵ زیاتر تەمەن دەکات بەتەندروستیەکی باش و هێز و گوڕ و تینەوە، کەپەرە بە رۆشنبیری ئەزهەر بدات لەهەرێمی کوردستان، کەدیارە سونینو و پەیوەندی بەتینتر و بەردەوام هەبێت لەنێوان قوتابیانی کوردستان و زانکۆی ئەزهەر یان خوێندنی باڵا لەئەزهەری شەریف.

ئەمەش یەکەم چالاکیی هاوبەش نیە لەنێوان هەرێمی کوردستان و پەیوەندی جیهانی دەرچووانی ئەزهەر، چونکە چوار ساڵ پێش ئێستا سێ خولی راهێنانی زانایان و مامۆستایانی ئاینیی کوردستانمان بینی و یەکێ لەو دەورانەش لەرۆژانی شێخی کۆچکردوومان (شێخ محەمەد سەید تەنتاوی) بوو کە کۆمەڵێك لەرۆڵەکانی کوردستانی خەڵات کرد کەبڕوانامەی دەرچوونی خولەکەیان بەدەست هێنابوو.

نامەوێت هاریکاری نێوان ئەزهەر و هەرێمی کوردستان لەم ئاستەدا بوەستێت، بەڵکو دەروازەکانی ئەزهەر لەهەموو روویەکەوە والایە بۆ هەموو هاریکارییەکی زانستی و رۆشنبیری و چالاکی خولی راهێنان لەنێوان ئەزهەر بەزانکۆ و

مزگەوتیەوە لەگەڵ هەرێمی کوردستان. لەو بڕوایەدام و وەك لەشێخ عەبدوڵام بیست، ئەزهەر پەیمانگای بۆ هەردوو قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی هەیە، ئومێدەوارم بە پشتیوانی خوا زیاتر لەپەیمانگایەك هەبێت و ئەزهەریش ئەوپەڕی ئامادەیی هەیە دەرفەتی خوێندن بداتە رۆڵەکانی کوردستان تا لێرە بخوێنن، هەروەها ئامادەیە کەلەسەر خەرجی ئەزهەر مامۆستا بنێرێت تا لەو پەیمانگایانەدا وانە بڵێنەوە، هەروەك ئێستاش هەیە، ئێمە ئامادەین دەرفەتی خوێندنی قوتابیانی هەرێمی کوردستان زیاتر بکەین لەزانکۆی ئەزهەر.

سوپاسی بێ پایانم بۆ هەموو لایەك دووپات دەکەمەوە بەتایبەت بۆ مامۆستای پایەبەرز زۆر بەڕێز دکتۆر مستەفا ئیبراهیم زەڵمی و ئەم رێزلێنانەش کارێکی بچوکە لەبەرانبەر ئەو بەرهەمە بەپێز و پێزانراوانەی پێشکەشی کردووە و لای خوای گەورەش پاداشت کراو دەبن.

جارێکی دیکەش سوپاستان دەکەم و والسلام علیکم ورحمة الله وبركاته

## بایەخی راگەیاندنی میسری بەم رێزلێنانە

لەراستیدا راگەیاندنی میسری بایەخی تایبەتیان بەم رێزلێنانە دا، هەر ئەو رۆژەی سەفەرمان کرد لەفرۆکەکەدا لەو رۆژنامانەی میسری کەبەسەرماندا دابەش کران هەواڵی ئەو رێزلێنانە بەبایەخەوە خرابوویە روو کە شێخی ئەزهەر رێز لەزانایەکی کورد دەگرێت کەدەرچووی ئەزهەرە.

بەداخەوە راگەیاندنی کوردی ئەو بایەخەی پێویست بوو بەم رێزلێنانە نەیدا، لەکاتێکدا زۆر شتی کەم بایەختر لەمە گرنگی پێدەدرێت، من وەك خۆم پێویستم بەوە نیە راگەیاندن بایەخم پێ بدات یان نەدات، بەڵام وەك وتم ئەو رێزلێنانە من بە هی هەموو زانایەکی کوردی دەزانم.



لەگەڵ قوتابیانی کورد، کە لە زانکۆکانی میسر دەیانخوێند.

# سەردانی
# دکتۆر تەها جابر عەلوان

لەکاتی سەردانم بۆ شاری قاهیرە بەمەبەستی ڕێزلێنانم لەلایەن شێخی ئەزهەرەوە، یەکێك لەو کەسانەی زۆرم حەز دەکرد سەردانی بکەم دکتۆر تەها جابر عەلوان بوو.

ڕۆژی ٢٠١٣/٥/١٣ لەشاری قاهیرە سەردانی ماڵی دکتۆر تەها جابر عەلوانم کرد، کە یەکێکە لەزانا ئاینییە ناسراوەکانی عێراق و جیهانی ئیسلامی، ئەو کاتی خۆی بەناچاری عێراقی بەجێ هێشتبوو، پێشتر سەردەمی عەبدولکەریم قاسم ئەویش لەسوپادا بوو.



لەگەڵ دکتۆر تەها جابر عەلوان

ساڵی ١٩٣٥ لەعێراق لەدایکبووە، دکتۆرای لە ئوصولی فیقهدا ساڵی ١٩٧٣ لەزانکۆی ئەزهەر بەدەستهێناوە، ساڵی ١٩٧٥ بۆتە مامۆستا لە زانکۆی ئیمام محمد بن سعودی ئیسلامی لە شاری ریاز، ساڵی ١٩٨١ بەشدار بووە لەدامەزراندنی پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی لە ئەمریکا، ساڵی ١٩٨٣ چۆتە ئەمریکا، ئێستاش سەرۆکی زانکۆی قورتوبەیە لەئەمریکا و خۆی لەشاری قاهیرە دادەنیشێت.

تەها جابر عەلوان یەکێ بوو لەو ئەفسەرانەی کە خاوەن هەڵوێست بوو، ساڵی ١٩٦٢ ئەفسەری (احتیاط) بوو لە سوپای عێراقیدا، هەروەها وانەبێژ بوو وانەی ئاین و زمانی عەرەبی لە کۆلیجی سەربازی دەوتەوە، بەشداری کرد لە پێشبڕکێ بۆ وانەوتنەوە لە کۆلیجی ئەندازە، بەڵام سەرەڕای سەلماندنی تواناى، بواریان نەدا بەو کارە هەستێت و لەسوپادا هێشتبوویانەوە.(١)

لەو دانیشتنەدا زۆر قسە کراو یادەوەری زۆر لەبارەی شۆڕشی چواردەی تەمموزو ژیانی ئەو کاتەی سوپاوە گێڕدرایەوە، لەوانە دکتۆر تەها باسی لەوە کرد کاتێ بڕیاری جەنگ دژی کورد دەردەکرێت، ئەو وەك موسڵمانێك بەو بڕیارە رازی نابێت کە کورد بەناپاك و نۆکەری بێگانە بناسێنرێت و بڕیاری جەنگ لەدژیان بەشەرعی نازانێت، لەمبارەیەشەوە پەنا دەباتە بەر ناردنی بروسکەیەك بۆ (عەبدولکەریم قاسم)، ئەویشیان نەگەیاند بوو بەو بیانوەی ئەمە مانای وەستان لەدژی بڕیاری سوپا دەگەیەنێت، هەر کارێکی لەمجۆرەش دەبێتە هۆی سزادانی بەشێوەیەکی توند، ناچار خۆی دەڕوات بۆ لای عەبدولکەریم قاسم و بیروڕای خۆی لەوبارەیەوە پێ رادەگەیەنێت بەونیازەی خۆی دەرباز بکات لەو ئەرکەی بۆیان داناوە قوتاری ببێت، ویستبویان بینێرن بۆ کوردستان تا وتار بخوێنێتەوە بۆ سەربازەکانی سوپا لەدژی کورد.

دکتۆر تەها جابر پێشتریش کاتێ لەناوچەکانی نزیك کوردستان وتاری بۆ سەربازەکانی سوپا دابوو ووتبوی: خۆزگە ئێستا ئێوەم لەسەر سنووری

---

(١) ئەم زانیارییانەم لەخۆی وەرگرت.

فەڵەستین ببینیایە و ئەوشەڕەی کەلەگەڵ کوردا دەیکەن لەگەڵ جولەکەدا بتانکردایە کە فەڵەستینیان داگیر کردوە، نەك کورد کە وەك ئێوە موسڵمانن و نەوەی سەلاحەدینی ئەیوبی رزگارکاری قودسن.

وتی: خۆم دڵم پڕ بوو، سەربازەکانیش دەستیان کرد بەگریان، ئەمە بوە هۆی گرژی و ناڕەزایی ئەو ئەفسەرەی ئاسایش کە لێپرسراوی ئەم کارەبوو، داوای لێکردم کە چیتر ووتار نەخوێنمەوە.

دکتۆر تەها دەڵێت: بە عەبدولکەریم قاسمیشم وت: چۆن موسڵمان موسڵمان دەکوژێت؟ عەبدولکەریم پێی وتم: ئەوان هاوکاری بێگانە دەکەن دژی ئێمە، منیش ووتم: ئاخر کوردەکانیش دەڵێن ئێوە چەك و تەقەمەنی لەبێگانە وەردەگرن بۆ کوشتنی کورد.

لەدوایدا ووتی: دەبێ لێرە بمێنیتەوە، لە ژورێکی نزیکم دانیشەو دەست بە (تصحیح)ی نوسینەکانم بکە.

ئەوە بوو یەکەم نوسراویان بۆ هێنام سەرەتاکەی بە ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەستی پێکردبوو، لە جیاتی {مَن يَعْمَلْ سُوءاً يُجْزَ بِهِ} نوسیبووی {من يعمل صالحاً يجز به} منیش ووتم: بەڕێز ئەمە هەڵەیە، وتی : نەخێر هەڵە نیە، ناردی دوو قورئانی هێنا هەر بەهەمان شێوە بو کە من ووتم، قەناعەتی نەکرد وتی: قورئانێکی دەست نووسم هەیە بڕۆن بیهێنین، ئەویشیان هێنا هەر نووسرابوو {يَعْمَلْ سُوءاً} پێی ناخۆش بوو. بۆم دەرکەوت کە ئەم کابرایە بەکەڵکی ئەوە نایەت بەرپرسیارێتی بگرێتە ئەستۆ و کاری وڵات ببات بەڕێوە، چونکە پیاوێکی ئینکارە و دان بەراستیدا نانێ.

لە هەڵوێستێکی دیکەی دکتۆر تەها جابر عەلوان کەلەیادم ناچێت کاتێ ئاهەنگی یادی لەدایك بوونی پێغەمبەر بوو (صلى الله عليه وسلم)، ئەو کاتە (عەبدولسەلام عارف) سەرۆك کۆمار بوو، بە ئامادەبوونی سەرۆك و دەست و پێوەندی حکومەت وتارێکی خوێندنەوە، تێیدا باسی لەوە کرد کە دەبێ عەرەب شانازی بە ئاینی ئیسلام بکات نەك بەخۆی، چونکە لە پێش هاتنی ئیسلام

بتیان دەپەرست، لەوانە هەندێکیان بتیان لە خورما دروست دەکرد، کاتێ برسییان دەبوو خورماکەیان دەخواد و دەیانوت ئای خودایە چەند بەلەزەت و خۆشی، بە مانای ئەوەی خوایان نەناسیوە تا ئیسلام نەهات، وەك دابونەریتی عەرەب (١٠) پیاو ژنێکیان ئەهێنا، ئەگەر بهاتایە منالێکی ببوایە کەسێکی شارەزایان دەهێنا پێیان دەوت (قوافی) واتە شوناسی، ئەو بڕیاری دەدا کە لە شێوەی کامیان دەچێت و دەبوو بە باوکی، لەهەمان کاتدا دەبینی چۆلەکەیەك کە یەك مسقاڵ مێشکی هەیە، ئەوە قبوڵ ناکات کە نێرێکی کە نزیك مێکەی بکەوێت.

ئەمە بووە هۆی ناوچاوگرژی و دڵتەنگی لێپرسراوان، بەڵام ئێمەی دانیشتوان هەندێکمان زۆر پێی خۆشحاڵ بووین و دەست خۆشیمان لێکرد، چونکە راستی ووت.

## کۆلیجی حەدبا لەموسڵ
## هۆڵێکی وانەوتنەوەی کرد بەناوی منەوە

لەو رۆژەوەی دەستم بەخوێندن کردووە تا ئەو کاتەی خوای گەورە بەفەزڵی خۆی توانای نووسینی پێدام بیرم لە ناو و ناوبانگ نەکردۆتەوە، هەمیشە خزمەتکردنم لەبەر چاو بووە نەك ناو و پۆست و ناوبانگ، بەڵام کارێکی باشە هەر میللەتێك قەدری زانا و کەسایەتیەکانی خۆی بگرێت.

ئەوەی من چاوەڕێم دەکرد زانکۆکانی کوردستان پێی هەستن و نەیانکرد، لەموسڵ کۆلیجی حەدبائی زانکۆیی کە کۆلیجێکی ئەهلیە، لە مانگی ئایاری ٢٠١٢، هۆڵێکی وانەوە وتنەوەیان ناونا هۆڵی دکتۆر مستەفا زەڵمی.

شایانی باسە کە پێشتر کۆلیجی حەدبا درعی زانکۆیان پێشکەش کردم.

لەکۆلیجی یاسای زانکۆی موسڵیش لەهەر چوار قۆناغەکەی خوێندن دانراوەکانی من دەوترێتەوە، کەچی بەداخەوە تا ئێستا لەبەشێك لەزانکۆکانی کوردستان دانراوی عەرەبەکان دەڵێنەوە.



## سەردانی
## تورکیا بۆ چارەسەرکردن



نەخۆش کەوتنی ئەمجارەم زۆر سەخت بوو، بەتەواوی هیلاکی کردم، جگە لەوەی خۆم سەردانی عیادەم کرد، ڕۆژی ٢٠١٢/٩/٢ بەڕێز (دکتۆر ئەرسەلان بایز) سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان بەیاوەری (دکتور ڕێکەوت حەمە ڕەشید) وەزیری تەندروستی و تیمیکی پزیشکی لەماڵەوە سەردانیان کردم و پشکنینی پێویستیان بۆ ئەنجامدام.

سەرۆکی پەرلەمان ئامادەیی نیشاندا بۆ ناردنە دەرەوەم بۆ ئەڵمانیا بۆ چارەسەر، لەوەرگرتنی ڤیزاشدا ستافی راوێژکارانی ماندوون، بەڵام بەداخەوە

ڤیزاکەی خۆم زۆر دواکەوت، منیش باری تەندروستیم باش نەبوو.

بۆ ئەوەی بەزووترین کات چارەسەرم بۆ بکرێت، بڕیار وابوو کە لە ڕۆژی ٢٠١٢/١٠/١٧ هەردوو نەشتەرگەری پرۆستات و فیتقم بۆ بکرێت لە ژێر چاودێری بەڕێز دکتۆر بەهزاد لە خەستەخانەی وێلفێری لەهەولێر. بەڵام هەرچەندە دکتۆر بەهزاد زۆر شارەزاییکی تایبەت مەندی هەیە لەم بوارەدا فەرموی لەبەر نەبونی ئامێری پێویست کێشەی کونترۆڵی کۆئەندامی میزکردنم بۆ چارناکرێت لەهەمان کاتدا دڵنیا نیە لە کواڵیتی خزمەتی پاش نەشترگەریەکە بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی ئەو بەپێویستی ئەزانی.

لەهەمان کاتدا بەیارمەتی و پێشنیازی بەڕێز دکتۆر نوری تالەبانی و خاتوو نساری کچی لەڕێی ئۆفیسی بەڕێز کاک نێچیرڤان بارزانی سەرۆك وەزیرانەوە پەیوەندی کرابوو بەخەستەخانەی ئەمریکی لەئەستنبول پێم ڕاگەیەنرا کەئامادەی پیشاندابوو بۆ چارەسەری پێویست و لە ڕۆژی ٢٠١٢/١٠/٨ گەیشتنە شاری ئەستنبول.

لە ڕۆژی ٩-١٠ لە خەستەخانەکە دەست کرا بە ئامادەکرنم بۆ نەشتەری پێوست. بەڵام لە ئەنجامی پشکنین و وردبینی پرۆفیسور دکتور تاریق ایسن (کە بڕیارە نەشتەرگەری پرۆستاتم بۆ بکات) دەرکەوت کە ئیلتهاباتێکی زۆرم هەیە و ئەبێت چارەسەر بکرێت پێش نەشتەرگەری و بۆماوەی حەوت ڕۆژ بۆ وەرگرتنی چارەسەری تایبەت بەو جۆرە ئیلتهابەی هەمە. ئەم دواخستنە بوو بەهۆی گۆڕینی دکتۆری نەشتەرگەری فیتقم کە خۆشبەختانە ئەم کارە لەلایەن دکتۆر (عەزیز کایا) کە وەچەی حەسەن فەهمی زانایەکی ئاینی و لە هەمانکدا شارەزا بووە لە یاسادا و چەندەها بەرهەمی بەنرخی هەیە لە بواری ئاین و یاسادا. ئەم زانایە بڕیاری دابو کە پاش کۆچی دوایی لاشەکەی پێشکەش بکرێت بە کۆلێژی پزیشکی. د.عزیز وتی: پاش کردنەوەی مێشکی تەمەنی خانەکانی مێشکی مەزنە کرا بە سی ساڵ یان کەمتر، وێڕای ئەوەی کە ئەو تەمەنی پتر بوو لە نەوەت ساڵ وتی: هۆکاری گەنجی خانەکانی مێشکی ئەم مرۆڤە مەزنە ئەگەڕێتەوە بۆ زۆر بەکارهێنانی مێشکی بۆ فێربوون

و لێکۆڵینەوەی لە دوو بواری جیاوازدا کە ئاین و یاسایە.

دکتۆر عەزیز پێی ڕاگەیاندم کە نەشتەرگەری فیتقەکەم بە جۆرێکی زۆر تایبەت ئەکات بە دانانی تۆڕێك کە هەستی پێناکرێت کە نەشترگەری کراوە.

پێش دەستپێکردنی هەردوو نەشتەرگەریەکان دڵنیای کردینەوە کە هیچ جۆرە ئیلتهابێك نەماوە بە پێ ی ڕاپۆرتی زەرعەکە.

لە ڕۆژی ١٠/١٥ لەنێوان سەعات ١٢ی نیوەڕۆ هەتا ٢ی پاشنیوەڕۆ هەردوو نەشەتەرگەریەکە ئەنجامدرا لەڕێی بەکارهێنانی کامێرەو ئامێری تایبەتیەوە بەبێ ئەوەی هیچ هەڵدڕینێك کە پێوستی بە دورینەوە هەبێت بۆم بکرێت.

پاش نەشتەرگەریەکە هەموو بەیانیەك زوو کاتژمێر شەش و نیو پێش چوونی بۆ سەر کارەکەی د.عزیز ئەهات بۆ سەردانم بۆ دڵنیابوون لە تەندروستیم.

ڕۆژی ٢٠١٢/١١/٥ گەڕاینەوە بۆ هەرێمی کوردستان.

لەمەدا بەڕێز کاك نێچرڤان بارزانی سەرۆکی حکومەت هاوکاری کردین.

## چاپکردنی کتێبەکانم

ڕۆژی ٢٠١٢/٥/١٥، بەنوێنەرایەتی سەرۆکی حکومەت، هەریەك لە (کاك عیماد ئەحمەد) جێگری سەرۆکی حکومەت و (کاك نەوزاد هادی) پارێزگاری هەولێر و (دکتۆر ئامانج رەحیم) و (کاك توانا احمد) راوێژکارانی جێگری



سەرۆکی حکومەت سەردانیان کردین و دوای گەیاندنی سڵاوی کاك نێچیرڤان بارزانی ئامادەییان نیشاندا بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانم لەسەر ئەرکی حکومەت.

سەرۆکی پەرلەمانیش بەهەمان شێوە ئامادەیی پەرلەمانی دەربڕی بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانم، بەسوپاسیشەوە هاوکارمان بوو لەچاپکردنی چەند کتێبێکم کەمەنهەجی بوون و بەشێك لەوانە کرانە دیاری بۆ کۆلیجی یاسای

زانکۆی موسڵ و هەروەها ئەرکی چاپکردنی هەردوو بەشی یاداشتەکانی گرتە ئەستۆ، لەدابەشکردنی کتێبەکانیشم لەپەرلەمان زۆر هاوکار بوو لەمەشدا هەردوو راوێژکاری سەرۆکی پەرلەمان کاک ئازاد صادق و کاک لاوەند جەلال ماندوو بوون.

پاش سەردانەکەی وەفدەکەی حکومەت ئەوانیش بەهەمان شێوە ئەرکی چاپکردنی چەند کتێبێکمیان گرتە ئەستۆ.

هەڵبەت من پاش گەڕانەوەم بۆ کوردستان هەموو ئەو کتێبانەی چاپم کردوون لەسەر ئەرکی خۆم بووە، بەدیاری داومە بەزانکۆکان یان ماٌمۆستایان یان ئەوانەی سەردانیان کردووم، لای من ئەوە گرنگە بخوێندرێنەوە و سوودێکیان ببێت بۆ موسڵمانان.

شایانی باسە بەرهەمی ئەم سەردانانەی بەرپرسانی حکومەت و پەرلەمان بۆلام ئەوە بوو کۆبەرهەمەکانم بەناوی (الكامل للزلمي في الشريعة والقانون) کەپەنجا کتێبە و لەبیست و چوار بەرگدا کۆ کراوەتەوە لەسەر ئەرکی سەرۆکی حکومەت لەدەرەوە چاپکرا.

کتێبی (کاروانی ژیانم) کە دوو بەرگە لەسەر ئەرکی سەرۆکی پەرلەمان چاپ کرا.

ئەم دوو کارە گەورەیە لای من مانا و بایەخی تایبەتیان هەیە و هیوادارم ئاوڕ لەهەموو ئەوانە بدرێتەوە کەدەیانەوێت خزمەتێك پێشکەش بەئاین و ئەم گەلە بکەن.

## بەشداری ئاهەنگی
## بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژی ئافرەتان

ڕۆژی دووشەممە ٢٠١٣/١١/٢٥ لەسەر بانگهێشتی ئەنجومەنی باڵای خانمان ئامادەی چالاکییەکانی هەفتەی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژی ئافرەتان بووم کەلەشاری هەولێر سازکرا.

لەم ئاهەنگەی دەستپێکردنی چالاکییەکاندا بەڕێز نێچیرڤان بارزانی، کەماوەیەکی زۆر لەکاتی هەموارکردنی یاسای باری کەسێتیدا لەنزیکەوە بەیەکەوە کارمان کردبوو، ڕێز و حورمەتێکی زۆری بەرانبەر نواندم و سەرەتای وتارەکەی بەم قسە جوانانە دەست پێکرد، کە لێرەدا وەك خۆی تۆماریان دەکەم:

**دەقی قسەکانی بەڕێز نێچیرڤان بارزانی:**

"بەیانیتان باش، هەموو لایەکتان بە خێر بێن.

پێش ئەوەی دەست بە قسەکانم بکەم، دەمەوێ بەخێرهاتنێکی تایبەتی پیاوێکی گەورە بکەم کە ئەمرۆ لەگەڵ ئێمە دانیشتووە و تەشریفی هێناوە بۆ ئەم ڕێوڕەسمە کە ئەویش د.مستەفا زەڵمی یە.

حەز دەکەم باسی ڕۆڵی ئەو بەڕێزە بکەم، دوای ساڵەکانی ٢٠٠٤ - ٢٠٠٥ کە لە بەغدا بوو، هات بۆ هەولێر، حەز دەکەم هەموو لایەك باش بزانن ئەو یاسایانەی کە لە هەرێمی کوردستان گۆڕانکارییان بە سەردا هات، بە تایبەتی باری کەسێتی، ئەو پیاوە گەورەیە ڕۆڵێکی سەرەکی لە برواپێهێنانی کۆمەڵگا



و مامۆستایانی ئایینی بینی، پڕ بەدڵ سوپاسی دەکەین. بە ڕاستی زۆر خۆشحاڵ و شەرەفمەندم کە ئەمڕۆ ئەو بەڕێزە لەگەڵ ئێمە بەشداری دەکات.

حەز دەکەم خانمانی کوردستان بزانن ئەو پیاوە ڕۆڵێکی زۆر گەورەی بینیوە، پێکەوە کاری زۆر جددیمان کرد بە مانگ، بە ساڵ، پێکەوە کارمان کرد هەتا توانیمان، چونکە ئەو کاتە شتێکی ئاسان نەبوو، زۆر سەخت بوو، ئێمەش نەماندەویست تەنیا بڕیارێك واژوو بکەین و بڵێین ئەمە دەبێ ببێتە یاسا. ئێمە حەزمان دەکرد، ئامادەسازی بۆ بکەین، زەمینەی بۆ بڕەخسێنین، لەگەڵ مامۆستایانی بەڕێزی ئایینی، پەرلەمانتاران، لەو کاتەدا ڕۆڵێکی زۆریان بینی. زۆر بەڕێزەوە دەڕوانینە ڕۆڵی هەموو ئەو کەسانەی کە بوونە هۆی گۆڕینی ئەو یاسایانە، لە سەرووی هەمووشیانەوە بەڕێز د. مستەفا زەڵمی کە ئەمڕۆ تەشریفی هێناوە، بەخێر بێی بەسەر چاو."

پاش وتارەکەی بەڕێزیان داوا لەمن کرا وتارێك پێشکەش بکەم، لەوتارەکەمدا وێڕای سوپاس کردنی بەڕێز سەرۆکی حکومەت لەسەر ئەو تەقدیرو ئیحترامەی، بابەتێکم لەبارەی گرنگی ڕۆڵی ئافرەتەوە پێشکەش کرد و تێیدا باسی ئەوەم کرد

بەپێی ئایەتی قورئانی پیرۆز جیاوازی نیە لەنێوان پیاو و ئافرەتدا لەوەرگرتنی پۆستە باڵاکاندا و ئافرەتیش دەتوانێت ببێتە سەرۆکی حکومەت، هەروەك خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بۆمان باس دەکات و دەفەرموویت:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾

جا ئەمر بەمەعروف و نەهی لە مونکەر هەمان ئەو ئەرکەیە کە وەزیر یان سەرۆکی حکومەت ئەنجامی دەدات.

نمونەشم بە پشتگیری زانای بەناوبانگی جیهانی ئیسلامی ئەبو ئەعلای مەودودی هێنایەوە لەوڵاتی پاکستان کەپشتگیری کرد لە فاتیمە جناح بەرانبەر



ئەیوب خان و داوای لەگەڵی پاکستانی کرد بۆ سەرۆکایەتی وڵات دەنگ بە ئافرەتەکە بدەن نەك پیاوەکە چونکە ئافرەتەکە لێهاتوو تر بوو، بۆیە پێوەر توانا و لێهاتووییە نەك پیاوو ژنی.

ئەوەشم باس کرد کە بەپێی لێکۆڵینەوە زانستیەکان دەرکەوتوە ئافرەت لەپیاو عاقڵترە چونکە خاوەنی دوو (فص)ە لەمێشکیدا، لەکاتێکدا پیاو یەك (فص)ی هەیە، لەبەر ئەمەشە ئافرەت زیاتر عاتفیە و زۆرتر بە رووداوەکان کاریگەر دەبێت.

لەبەشێکی تری وتارەکەمدا وتم: ئەوەی ئێستا لەناسنامەی باری کەسێتیدا دەنووسرێت (الجنس) واتە: رەگەز تا نێر و مێی پێ دیاری بکرێت هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە پیاو و ژن یەك رەگەزن، دەبێت لەبری الجنس بنوسرێت (الصنف).

لەپاش تەواوبوونی مەراسیمەکەش سەرۆکی حکومەت هاتە لام و ئامادەیی خۆی بۆ هەموو هاوکارییەك دەربڕی کەمن لێرەدا دووبارە سووپاسی دەکەم کە هەردەم هاوکارێکی باش بووە و پشتیوانی لەکارەکانم کردووە، ئەمەش گوزارشت دەکات لەسەر دڵسۆزی ئەم پیاوە بۆ گەلەکەی و وڵاتەکەی.

Scanned by CamScanner

# ڕێزلێنانم لەلایەن سەفیری فەڵەستین لەهەرێمی کوردستان




لەیادی پەنجا ساڵەی هەڵگیرسانی شۆڕشی فەڵەستیندا ڕۆژی ٢٠١٥/٢/١٥ قونسلگەری فەڵەستین لە هەرێمی کوردستان ئاهەنگێکی ڕێزلێنانی ساز کرد و لەلایەن سەفیری فەڵەستین لەهەرێمی کوردستان بەڕێز نەزمی حەزوری خەڵاتی ڕێزلێنانم پێدرا.

پێشتر سەفیری فەڵەستین لەماڵەوە سەردانی کرد و باسی ئەوەی کرد کەئەوان وەك دەوڵەتی فەڵەستین دەیانەوێت ئەو ڕێزلێنانەم بکەن، منیش هەروەك ئەو وتەیەی کەلەڕۆژی ڕێزلێنانەکەدا پێشکەشم کرد وتم: فەڵەستین جێگایەکی تایبەتی هەیە لەدڵی هەموو موسڵمانێکدا، لەدڵی ئێمەی کورددا جێگاکەی تایبەتترە، چونکە صەلاحەدینی ئەیوبی ڕزگاری کردووە کە کوردە، لەلایەکی دیکەشەوە گەلی فەڵەستینیشی وەك کورد مەینەتی زۆری بینیووە.

# زانکۆی سەلاحەدین بڕوانامەی دکتۆرای فەخری پێ بەخشیم

بەسوپاسێکی زۆرەوە زانکۆی سەلاحەدین وەك ڕێزێك لەو بەرهەمانەی نووسیومن بڕیاریاندابوو کەبڕوانامەی دکتۆرای فەخریم پێ ببەخشن.



د. أحمد دزەیی سەرۆکی زانکۆی سەلاحەددین لە کاتی پێشکەش کردنی بڕوانامەکەدا

بەپێی ئەو نووسراوەی بڕیارەکەی تێدا هاتبوو:

"ئەنجومەنی زانکۆی سەلاحەدین لەهەردوو کۆبوونەوەی ژمارە ٨ی دانیشتنی ڕۆژی ٢٣ن حوزەیرانی ٢٠١٤و کۆبوونەوەی ژمارە ٥ی دانیشتنی ڕۆژی ١٩ ی کانونی دووەمی ٢٠١٥ بڕیاریدا بڕوانامەی دکتۆرای فەخری ببەخشێتە پرۆفیسۆر دکتۆر مستەفا ئیبراهیم زەڵمی لەبەرانبەر بوێری لەدەربڕینی بۆچوونەکانی لەسەر پرسە هەستیارەکان لەتێکستە یاسایی و هزرییەکانی لەجیهانی ئیسلامیدا".

لەدرێژەی ڕاگەیەندراوەکەدا دەڵێت:

"ئەو بیرمەندە ناسراوەی کورد بۆتە جێگەی شانازی نەتەوەی کوردو لەسەر ئاستی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامی کەسایەتیەکی دیاری هەیە.

بۆیە ئەنجومەنی زانکۆ بڕیاری داوە بڕوانامەی دکتۆرای فەخری بدات بەپرۆفیسۆری بەئەزموندار مستەفا زەڵمی.

ئەمەش دوای ئەوە دێت کەلەمایسی ٢٠١٤ زانکۆی سەلاحەدین یەکەمین بڕوانامەی دکتۆرای فەخری بەخشیە بیرمەندی گەورەی تورک و دۆستی گەلی کورد ئیسماعیل بێشکچی.

شایانی باسە ڕۆژی ٣ ی ئازار ٢٠١٥ لەئاهەنگێکدا لەزانکۆی سەلاحەدین لەشاری هەولێر کەژمارەیك لەبەرپرسان و مامۆستایانی زانکۆ و هاوڕێ و دۆستانم ئامادەی بوون ئەو بڕوانامەیەم پێ بەخشرا.

لەسەرەتای ئاهەنگەکەدا دکتۆر ئەحمەد دزەیی سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین وتەیەکی پێشەکەش کردو تێیدا وتی:

ئێمە لە ئەنجومەنی زانکۆ، ساڵی ڕابردوو لە کۆبونەوەی ڕۆژی ٢٣ ی حوزەیران بیرمان لەوە کردەوە کە چۆن ڕێز لە ماندوبون و شاکارە هزرییەکانی و هەوڵە بێ وچانەکانی پرۆفیسۆر دکتۆر مستەفا زەڵمی بگرین، کە لە ماوەی چل ساڵی ڕابردوودا بە نووسین و توێژینەوە هزرییەکانی لە بواری یاساو شەریعەتدا

ماندونەناسانە شەونخوونی کردووە، ئەوەبوو لە دانیشتنی ١٩/ کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠١٥ بە کۆی دەنگی ئەندامانی ئەنجومەن بڕیارمان دا بڕوانامەی دکتۆرای فەخری بدەین بە پرۆفیسۆر دکتۆر مستەفا ئیبراهیم محەمەدئەمین زەڵمی، لە بەرامبەر بوێری لە دەربڕینی بۆچوونەکانی لەسەر پرسە هەستیارەکان لە تێکستە یاسایی و هزرییەکانی لە جیهانی ئیسلامیدا، بە سوپاسەوە لە کۆبونەوەی ژمارە (٣)ی ئەنجومەنی وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی لە ڕێکەوتی ٢٠١٥/٢/٢ پەسندکرا، بۆ ئەو مەبەستەش لیژنەیەکمان پێك هێنا بۆ ئامادەسازی بەڕێوەچوونی ئەو مەراسیمە شایستەیە، لێرەوەش ڕێز و سوپاسمان هەیە بۆ پرۆفیسۆر مستەفا زەڵمی کە قبوڵی کرد بڕوانامەی دکتۆرای فەخری لە زانکۆی سەلاحەدین وەربگرێت، چونکە جەنابیان لەگەڵ ئەوەی چەندین بڕوانامەو خەڵاتی دیکەی وەرگرتووە لەسەر ئاستی عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەڵام زۆریشی ڕەتکردۆتەوە.

لە مێژووی زانکۆکانی جیهاندا بڕوانامەی فەخری دراوەتە کەسایەتییە ناودارەکان و سەرکردەکان و کەسانی پسپۆڕ، لە بواری جیاوازدا، لە مێژووی زانکۆکانی هەرێمی کوردستانیش، بەتایبەت لەدوای ڕاپەڕین، ئەو جۆرە بڕوانامەیە بەخشراوە، بەڵام لەمێژووی زانکۆی سەلاحەدین، بڕوانامەی لەم جۆرە ئەوە بۆ دووەمین جارە دەبەخشرێ، کە لە ٢٨/ مایسی ساڵی ڕابردوو یەکەمین بڕوانامەی دکتۆرای فەخری بەخشییە بیرمەنی گەورەی تورك و دۆستی گەلی کورد پرۆفیسۆر دکتۆر ئیسماعیل بێشکچی، هەڵبەتە ئێمە لە دەزگایەکی ئەکادیمی و زانستی بڕوانامەی لەو جۆرە وا بە ئاسانی نادرێت بە کەسێك، بێگومان لەلای ئێمە بەخشینی بڕوانامەی دکتۆرای فەخری بە گەورە ئەکادیمی تورك ئیسماعیل بێشکچی و گەورە هزرمەندی ئەکادیمی کورد پرۆفیسۆری ئەزموندار دکتۆر مستەفا زەڵمی، زۆر گرنگە و ئەوەش ئەمڕۆ بۆنەیەکی ئەکادیمی و خۆشەو شانازی بەو کارەمانەوە دەکەین. چونکە هەم بێشکچی و هەمیش زەڵمی شایانی زۆر لەوە گەورەترن بۆیان بکرێت، چونکە ئەوان ژیانی خۆیان بۆ ماوەی نزیکەی نیو سەدە تەرخان کردووە هەریەکەیان لە

بواری جیاوازدا.

ئێمە لە زانکۆی سەلاحەدین لە روانگەی ئەکادیمیەوە بەخشینی بڕوانامەی دکتۆرای فەخری بە دکتۆر مستەفا زەڵمی بە گەورەترین دەستکەوت دەزانین، هەڵبەتە ئاگادارن کە بەڕێز پرۆفیسۆر مستەفا زەڵمی ساڵی ١٩٧٥ بڕوانامەی دکتۆرای بە پلەی شەرەف لە فیقهی بەراوردکاریدا بەدەست هێناوە، لەساڵی ٢٠٠٥یش بڕوانامەی دکتۆرای لە یاسا لە زانکۆی بەغدا بە پلەی ئیمتیاز بەدەست هێناوە.

**دواتریش بەڕێز دکتۆر نوری تاڵەبانی سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی وتەیەکی پێشکەش کرد و لەوتەکەیدا ئاماژەی بەوەدا:**

کاکە دکتۆر مستەفا زەڵمی، زانایەکی گەورەی کوردە و لە سەرەتای ژیانیەوە هەموو توانایەکی خۆی بۆ خزمەتی گەلەکەی تەرخان کردووە لەڕێگای ئایینی ئیسلامی پیرۆزەوە، وەکو هەموو فەقێیەکی سەردەمی خۆی، چەندین ناوچەی بەشەکانی کوردستان گەڕاوەو لەو تەمەنەدا ئاگاداری بەشێك لە رووداوەکانی تایبەت بە دامەزراندنی کۆماری کوردستان بووە لە مەهاباد، ئەوەش گیانی کوردایەتی لەلای بەهێزتر کردووە، بۆیە روخانی ئەو کۆمارە جوانەمەرگەو لەسێدارەدرانی سەرکردەکانی، رق و کینی بەرامبەر بە داگیرکەرانی نیشتمانە دابەشکراوەکەی زیاتر کردووە، لەپاش تەواوکردنی خوێندنی مەلایەتی دەست بە خزمەت گەلەکەی دەکات لەڕێگای ئایینەوە، بەڵام بەداخەوە دژایەتی کراوەو تەگەرەی بۆ دروست کراوە لەلایەن بەشێك لە هاوپیشەکانیەوە، بۆیە بە ناچاری روو لە ژیانی غوربەت دەکات، هەمووشمان دەزانین کە ژیانی غوربەت و دووره وڵات ناخۆشەو سەرلێشێوانی لە دوایە، بەڵام ئەو بە پشتگیریی هاوسەرە ئازاکەی چوونە ناو ئاسۆیەکی تازەوە لە گەڕان بەشوێن زانست بەشێوەیەکی فراوانتر، لەپاڵ بەردەوام بوونی لە خوێندنی زانستی شەریعەت دەست دەکات بە خوێندنی قانون و دەگاتە دواپلەی خوێندن لەو دوو بوارەدا.

خوێندنی زیاتر و گەڕان بەشوێن راستیدا ئەرکی سەرشانی پیاوی سەر ڕاست و زانا قورستر دەکات، لە وڵاتێکدا کە تێیدا رێز لە حوکمی شەریعەت و

قانون نەگیرێت، مرۆڤی ئیماندار و خاوەن پرنسیپ لە مەینەتدا دەبێت.

دکتۆر مستەفای ماندوونەناس بەبەردەوامی خەریکی لێکدانەوەی بنەماکانی شەریعەت و قانوون بووە، بەراست و دروستی، ئەوەش خزمەتێکی گەورەیە بە گەلەکەی، تا کەسانی نەزان لەرێگای ئایینی پیرۆزەوە بیروباوەڕی چەوت بڵاو نەکەنەوە، لەولاتی ئێمەدا پێویستە کار لەسەر چەسپاندنی حوکمی قانون بکرێت، رێز لە بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام بگیرێت.

دکتۆر مستەفا زەڵمی وەکو چەندین زانای گەورەی کورد کە لەسەرەتای ژیانیانەوە بەناچاری نیشتمانیان بەجێ هێشتووە و روویان لە غوربەت کردووە، ئەویش وەکو مەولانا خالیدی نەقشبەندی و حەیدەرییەکان و موفتی زەهاوی و شێخ رەزا و شێخ عەبدولقادری خەتیب و مەلا محەمەدی قزلجی و مەلا عەبدولکەریمی مودەریس لەشاری بەغدا گیرساوەتەوەو رێزی لێ گیراوە، بۆتە ئەو پیاوە مەزنەی کە پاش کۆچکردنی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس زانایانی عێراق روویان لێکردووەو داوایان لێکردووە بۆ فتوادان جێگاکەی بگرێتەوە، بەڵام عوزری خواستووە چونکە بڕیاری گەڕانەوەی بۆ کوردستان دابوو، تا لە نزیکەوە خزمەتی زیاتر بە گەلەکەی بکات.

بەلای مامۆستا دکتۆر مستەفا زەڵمیەوە، خزمەتی ئایین بەستراوە بە خزمەتی گەلەکەیەوە، ئەوەی دەیلێم خوێندنەوەیەکی بابەتیانەیە بۆ هەڵوێستی راستەقینەی ئەو مامۆستایەمان، کە زیاتر لە چل ساڵە لە نزیکەوە دەیناسم و پێکەوە کارمان کردووە.

**پاش ئەوە پرۆفیسۆر دکتۆر محسن عبدالحمیدیش وتەیەکی پێشکەش کرد و تێیدا وتی:**

دەوری ٥٥ ساڵە من و دکتۆر مستەفا، برای گەورەو خۆشەویست یەکتری ئەناسین، بەڵام لەو پیاوە زۆر کەمانەی کە هەقیقەتی دکتۆر مستەفا زەڵمی بزانن من یەکێك لەوانم، چونکە پێشتر ئەمناسی، بەعزێ کتێبم ئەخوێندەوە، کە بە هەدیە منی تەقدیر ئەکرد، ئەمزانی ئەم زاتە زۆر زاتێکی گەورەیە،

عالیمێکی زۆر زۆر گەورەیە، ئەمما بە ترێکی کە کتێبەکانم خوێندەوە، کە تەرشیحیان کرد بۆ ئوستازیەت، من یەکێك بووم لەوانەی کە کتێبەکانیان بۆ من نارد، بۆ ئەوەی تەقدیمی بکەم و تەقریری لەسەر بنووسم، بەداخەوە ئەو تەقریرەم لەلا نییە، دووەمین جاریش کە دائیمەن کتێبەکانی یەك بەیەك بۆ من ئەنارد و شەرەفدار ئەبووم بەوەی کتێبەکانی بخوێنمەوە، لەساڵی ٢٠٠٢ هەموو کتێبەکانیان بۆ من نارد، کە خەبیرێك لە سێ خەبیر ئەوانی دیکە نازانم کێ بوون، چونکە هەموو سرِی بوو، لە وەزارەتی تەختیت لە بەغدا ژوورێکیان بۆ تەخسیس کردم، سەندوقێك لە کتێبەکانیان هێنا، بۆ ئەوەی تەقریری لەسەر بنووسم، بۆ ئەوەبوو کە جائیزەی سەرۆك کۆماری ئەوسای بدەنێ، دوو مانگ من دانیشتم لە وەزارەتی تەختیت لە ٩ی بەیانییەوە تا ٢ یا ٣ی ئێوارە، تەقریبەن هەموو کتێبەکانم خوێندەوە، ئەوی جاران و ئەوی تازە، تەقریرێکی زۆر موفەسەڵم لەسەر نووسی.

زۆر دڵخۆشم دکتۆر مستەفا، برای گەورەم و ئوستازم، چونکە من کە هەموو موئەلەفاتی شەخسێك بخوێنمەوەو ئیستفادەی لێ بکەم، خۆم بە تەڵەبەیەکی زۆر بچووکی دکتۆر مستەفا ئەزانم.

**دوای ئەوەش خاتوو پەخشان زەنگەنە سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای خانمانی کوردستان وتەیەکی پێشکەش کرد و کەئەمە بەشێکیەتی:**

ئاشکرایە هەمیشە زانایان خۆڕاگرانە و بە بڕوایەکی قووڵ بەو زانستەی پێی ئەگەن بە گەلێك سەختی و ڕووبەڕووبوونەوە تێئەپەڕن، لەسەر ئەو بۆچوون و ڕاستیانەی کە لە ئەنجامی لیکۆڵینەوەو شەونخونی و کۆششی بەردەواما پێیان ئەگات خزمەتی گەورەی بە گەلەکەمان گەیاندووە.

من شەرەفی ئەوەم پێ بڕا کە لەگەڵ ژمارەیەك هاوڕێدا یاسای باری کەسێتی ساڵی ٢٠٠٨ هەموار بکەینەوە و ئەندام بم لەو لیژنەیەدا، (هەر وەک لە هەستیاریی ئەو بابەتە تێئەگەین، پرۆفیسۆر دکتۆر زەڵمی، بە دانایی و زۆر بابەتیانە، ڕاجیاوازەکانی بە ناوەڕۆك و شێوازێك کۆئەکردەوە کەهەمووان بگەینە

ئەنجامێك.

**دوای ئەوەش دکتۆر حوسێن توفیق فەیزوڵا - کەلەکاتی خۆیدا قوتابیم بووە وتەیەکی پێشکەش کرد، لێرەدا کەمێکی تۆمار دەکەین:**

دێتە بیرم کە قوتابی بووم لە کۆلێژی یاسا، لەو کاتەدا لەژێر فشاری ئیتحادی بەعسیەکان، زۆر پێویستیمان هەبوو بە ماموستایەك کە بە کوردی لەگەڵمان قسە بکات، زۆر ماموستای کوردمان هەبوو، بەڵام بەداخەوە نەیان دەوێرا بە زمانی کوردی لەگەڵمان قسە بکەن، بەڵام بەڕێز کاك دکتۆر مستەفا لەگەڵ چەند ماموستایەکی تری بەڕێز بە زمانی کوردی و بە دەنگی بەرز لەگەڵ قوتابیانی کورد قسەیان دەکرد و یارمەتییان ئەداین، خۆم ریسالەی ماستەرەکەم لە ماڵی کاك دکتۆر مستەفا نووسی، کە لەوێ نانیشم ئەخوارد و، لەو کاتەشدا نەخۆش بوو، ریسالەی ماستەرەکەی چاك کردووە، ئێستاش لەبیری نییە، لەبەر ئەوەی دەهان قوتابی لەماڵی کاك دکتۆر بوونەو یارمەتی داون.

**لەکۆتــایی ئاهەنگەکەشدا وتەیەکم پێشکەش کرد کەپێم خۆشە لێرەدا بۆتانی تۆمــاربکەم:**

**بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان**

بەڕێزەکانم

خوشك و براکانم

سوپاستان ئەکەم لەسەر ئەم هاتنەو لەسەر ئەم کۆبونەوە، بەداخەوە ناتوانم قسە بکەم، هەتا ئەوەی شایستەیە عەرزتانی بکەم، لە قوڵایی دڵمەوە سوپاسی زانکۆی سەڵاحەدین ئەکەم بە تایبەتی سەرۆکی زانکۆی سەڵاحەدین جەنابی ماموستای پرۆفیسۆر دکتۆر ئەحمەد دزەیی.

بەڕێزان بە واجبێکی ئەساسی ئەزانم کە لە پێش هەموو شتێکا سوپاسی کاك نێچیرڤان بارزانی بکەم کە منی هێنایەوە ئێرەو یارمەتییەکی زۆری دام

ماددیەن و مەعنەویەن.

کاتی خۆی کە لە زانکۆیەك دەرسم ئەوتەوە، دەرسی قانون، کە ئەچوومە قاعەکەوە، ئەمدی لەنێو ئەو قاعەدا لەنێو ئەو هەموو قوتابیانە قوتابیەکی کوردی تیا نیە، وەکو سوزنێك سورەوکراو بکەی بە جەرگما وابوو، کە من لەم زانکۆیە دەست ئەڵێمەوەو رۆڵەکانم لە کوردستانا موحتاجی منن، کاك نێچیرەوان کە هاتمە ئێرە بۆ موئتەمەر هاتم، بردمیە ماڵی خۆیان، پێی وتم تۆ ناچیتەوە بۆ بەغدا، هەرچییەك پێویستی تۆیە من بۆتەکەم، ماددیەن و مەعنەویەن یارمەتی دام و پشتیوانی کردم، و نوسراوەکانم هەموویان لە تاران چاپکران و بڵاوکرانەوە لە عالەمی ئیسلامی و غەیرە ئیسلامیدا، هەروەها سوپاسی کاك ئەرسەلان بایز دەکەم، کە کتێبەکانی من لە هەر چوار پۆلی یاسا مەنهەجن لە عێراق و لە زۆر دەوڵەتە عەرەبیەکاندا، ئەو چوار کتێبەی ئەو چوار مەرحەلەیە و کتێبی کاروانی ژیانمی بۆ چاپ کردم، بە هەدیە دام بە زانکۆکانی موسڵ، زانکۆکانی موسڵیش موقابیل بەوە ناوی قاعەیەکی گەورەی قانونیان ناونا بە قاعەی مستەفا زەڵمی.

زمانم کورتە لەبەرامبەر بە ئەم رێزگرتنە و ئەم خەڵاتە، نزیکەی پانزە خەڵاتم پێدراوە، داخلی عێراق و خارجی عێراق، بەڵام ئەمەیان تامێکی تایبەتی هەیە، لەبەر ئەوە چونکی لە خاك و ئاوی کوردستانایە، لە پایتەختی کوردستانایە، لە زانکۆیەکە کە ئەناسرێ بە زانکۆی سەلاحەدین، کەوا هەموو کوردێ ئەبێ فەخر بکا بە سەلاحەدینەوە.

لە کۆتاییدا بە واجبی دەزانم کە سوپاسی هاوسەرەکەم ئەکەم کە حەفتا ساڵە لەگەڵمایە، بە بوون و نەبوون خۆمی پێگەیاند، وە نۆ منالی پێگەیاند کە سیانیان دکتۆرن ئێستا لە زانکۆکانی کوردستانا دەرس ئەڵێنەوەو ئەوانیش بە واجبی خۆیان هەڵ ئەسن. وە من کاتێك لە دەرەوە ئەمخوێند ئەیگوت ئاگات لە خوێندنەکەی خۆت بێت ئێمە هیچ کێشەیەکمان نیە، داوا ئەکەم لە هەموو خوشکێکی بەرێز لە هەموو خانمێکی بەرێز وەهابێت لەگەڵ هاوسەرەکەی، بۆ خاتری ئەوە ئەو جیلەی کە لەمەولا پێ ئەگەن بتوانن بە راستی و بە پوختی خزمەتی کورد و کوردستان بکەن، وەکو پێشمەرگە بەرێزەکانی کوردستانمان، خوا

هەموو لایەکیان موەفەق بکات.

هەیە دێتە لام بە چاوی ڕەش تەماشای پاشەڕۆژی کورد ئەکا لەبەر ئەو خیلافاتە بەسیتە هەیە لەنێو کوردا، بەڵام من نەك ئێستا دەمێکە وتوومە لە کەمتر لە پەنجا ساڵی تر کوردستان بەقوەتترین دەوڵەت ئەبێ لە شەرق ئەوسەتدا، لەبەر ئەوە ئەو سیفاتەی لە کوردا هەیە لە گەلێکی ترا نیە.

ئیعتزارەکەم ناتوانم زیاتر قسە بکەم، زۆر زۆر سوپاسی دکتۆر ئەحمەد دزەیی ئەکەم و ئەوانەی لە گەڵیان و لەژێر چاودێری ئەوان لە زانکۆکەدا، خوا هەموو لایەکتان موەفەق بکا، والسلام علیکم ورحمة الله.

**پاش بەڕێز حاکم ڕەئوف وتەیەکی پێشکەش کرد و تیایدا وتی:**

قسە زۆرە لەبارەی هاوڕێی خۆشەویستم دکتۆر مستەفا زەڵمی بیکەم چونکە ماوەیەکی زۆرە لە نزیکەوە دەیناسم، پەیوەندی زۆرمان هەبووە پێکەوە، لەوانەی لە زووەوەو لە نزیکەوە مستەفا زەڵمییان نەناسیبێت ئاگادار نەبن کە ئەم پیاوە لەرێی کوردایەتیدا چەند ماندوو بووە، بۆ نموونە باسی دەکەم، سەرەتای ساڵانی شەستەکان بوو هەردووکمان لە ڕێکخستنەکانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا کارمان دەکرد، لەلایەن حکومەتە دەستگیر کراین و زۆر ئەشکەنجەی توند دراین، مستەفا زەڵمی یەکێك لەوانە بوو کە دەستگیر کراو لە بەندیخانەدا مەعنەویاتی ئەوانی دیکەشی بەرز دەکردەوە، پاشان ئاماژەی بە ڕۆڵ و خزمەتەکانم کرد.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم، کە سوپاسی ئەو بەڕێزانە بکەم، کە ئەو وتانەیان پێشکەش کرد لەم بۆنەیەدا.

## سەردانی
## سەرۆك كۆماری عێراق

سەر لەئێوارەی ڕۆژی هەینی ٢٠١٥/٣/٦ سەردانی بەڕێز دکتۆر فوئاد مەعصوم سەرۆك كۆماری عێراقم کرد لەشوێنی مانەوەی لەشاری هەولێر.

لەو سەردانەدا هیوام خواست سەرۆك کۆماری عێراق لەئەرکەکانیدا سەرکەوتوو بێت و ماندونەناسانە کار بکات بۆ چارەسەری گرفتەکان.

سەرۆك کۆماری عێراقیش پیرۆزبایی وەرگرتنی دکتۆرای فەخری زانکۆی سەلاحەدینی لێ کردم و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی.

هەر لەو دیدارەکەدا گەلێ لەیادەوەریەکانی سەردەمی خوێندنمان لەشاری قاهیرە باس کرد.



شایەنی باسە من و دکتۆر فوئاد مەعصوم ماوەی سێ ساڵ لەشەری قاهیرە پێکەوە خوێندوومانە.

پێش ئەم سەردانەی من بۆ لای بەڕێزیان لەماڵەوە جاری دیکە سەردانی کردبووم، دکتۆر فوئاد مەعصوم هەروەك لەم ژیان نامەیەدا باسم کردووە یەکێك بووە لەهاوڕێ نزیکەکانی کاتی خوێندنم و ئێستا لەو کەسە بەوەفایانەیە کەهەردەم منی لەبیرەو سەردانم دەکات و لەهەواڵم دەپرسێت.

لەسازدانی ئەم سەردان و دیدارانەدا دکتۆر دلاوەر عەلادین کەخوشکەزای دکتۆر فوئادە ماندووبونی کێشاوە و جێگای سوپاسە و لەهەمان کاتدا کەسێکە جێگای ئومێدە کەخزمەت بەم میللەتە بکات ئەگەر کۆسپی نەیەنرێتە رێگا و دەرفەتی بۆ برەخسێنرێت.

# پێشنیارم بۆ لیژنەی ئامادەکاری دەستووری هەرێمی کوردستان تایبەت بەو مادەیەی دەستوور کەباس لەرۆڵی ئاین دەکات



رۆژی یەك شەمە ٢٠١٥/٦/١٤بەمەبەستی وەرگرتنی بۆچوونم لەسەر ئەو مادەیەی دەستتور کەباس لەرۆڵی ئاین دەکات، شاندێکی لیژنەی ئامادەکاری دەستور کەلەهەشت ئەندامی لیژنەکە پێك هاتبوو و نوێنەری هەریەك لە پارتی و گۆڕان و یەکێتی و یەکگرتوو و کۆمەڵ و تورکمان و مەسیحی و یەزیدی لەخۆ گرتبوو سەردانییان کردم، داوام لێکردن بەسنگێکی فراوانەوە ئەم کارە ئەنجام بدەن، چونکە ئایندەی کوردستان لەسەر ئەو کارەی ئەوان رادەوەستێت و دەبێتە بناغە.

**سەبارەت بەمادەی تایبەت بەئاینیش ئەم پێشنیارانەم بۆ خستنە روو:**

**یەکـــەم:** ئەوەی کراوە کە بەمادەی یازدە دانراوە کارێکی باش نیەو پێشنیارم کرد بکرێتە مادەی دووەم، چونکە ناکرێت لەوڵاتێکدا کە زۆرینەی هەر زۆری خەڵکەکەی موسڵمانە تۆ بێیت مادەی تایبەت بەئاین لەدەستووردا بکەیتە ماددەی یازدەهەم، من گلەییم لەرەشنووسەکەی پێشتریش هەبوو کەکرابووە مادەی شەشەم.

**دووەم:** من لای خۆمەوە صیاغەی ئەو مادەیەم بەئامادەکراوی خستە بەردەستیان کەئەمە دەقەکەیەتی لێرەدا دەیخەمە روو:

**الـمــادة الثـــانية:**

١- الإسلام الدين الرسمي لكوردستان العراق، والشريعة الإسلامية تعد من النظام العام، فلا يجوز تشريع قانون يتعارض مع ثوابتها.

٢- ويقر دستور كوردستان العراق الهوية الدينية للمكونات من غير المسلمين المسيحية واليزيدية والكاكائية. كما يضمن ممارسة شعائرهم الدينية ما لم تكن مخالفة للنظام العام.

# کتێبەکانم بەزمانەکانی عەرەبی و کوردی و فارسی بەشداری چەند پێشانگایەکی نێو دەوڵەتی کتێب دەکەن

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە کەبەهەوڵ و هیمەتی کەسانێکی دڵسۆز کتێبەکانم کەسەرەتا تەنها بەزمانی عەرەبی نووسرابوون - جگە لەکاروانی ژیانم - کەبەکوردی نووسیبووم، هەوڵی وەرگێڕانیان دەستی پێکرد بۆ زمانەکانی کوردی و فارسی و تورکی.






ئەوەی تایبەت بێت بەوەرگێڕانیان بۆ زمانی فارسی ئەوا لەڕێگەی دەزگای (نشر احسان) کەنووسینگەیان لەشاری تارانە و دەزگایەکی چالاك و ناسراون لەبواری چاپ و پەخشی کتێبدا و خاوەنەکەی مامۆستا عبدالرحمان یەعقوبی یە کەچەند جارێك سەردانی کردووم، پرۆژەی وەرگێڕانیان بۆ زمانی فارسی دەستی پێکرد، تا کاتی نووسینی ئەم بابەتە دە کتێبیان وەرگێردراون بۆ زمانی فارسی و شەشیان چاپ کراون و لەکتێبخانەکانی وڵاتی ئێراندا دەست دەکەوێت و ئەوانەی دیکەش لەڕێگەدا بۆ چاپکردن و وەرگێڕانی کتێبەکانی دیکەش بەردەوامە، لەو بوارەدا هەوڵی بەرێز دکتور ئەحمەدی نیعمەتی جێگای ڕێزە و مافی وەرگێڕانی کتێبەکانم داوە بەنشری ئیحسان لەگەڵ چاپکردنیان و مامۆستاش هەستێت بەوەرگێڕانیان.

سەبارەت بەزمانی کوردیش ئەوا لەگەڵ دەزگای ڕۆژهەڵات بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە کە کاك حەسەن دانیشفر بەپرسیەتی ڕۆژی ٢٠١٤/٩/١٧ گرێبەستمان واژۆ کرد و مافی وەرگیران و چاپی کتێبەکانم بۆ زمانی کوردی پێداون، سوپاس بۆ خوا تائێستا هەنگاوی باشیان ناوە و لەپێشانگای نێودەڵەتی هەولێر بۆ کتێب



ساڵی ٢٠١٥ حەوت کتێبم بەزمانی کوردی خرانە روو، لێرەدا ئەوەش دەخەمە روو کەلەم پێشانگایەدا شەش هەزار و سێ سەد و بیست و یەك کتێب لەدانراوەکانم فرۆشران و بوونە پڕفرۆشترین کتێبی پێشانگاکە کەئەمەش لەفەزڵی خوای گەورەوەیە.

جگە لەوەی کتێبەکانم بەشداری پێشانگای نێودەوڵەتی هەولێریان کرد ساڵی ٢٠١٤ و ٢٠١٥، بەهەمان شێوە بەشداری پێشانگای نێودەوڵەتی کتێبی هەریەك لەوڵاتانی قەتەر و کوەیت و بەحرەین و ئێران و تورکیایان کردووە.

هەوڵەکانیش بۆ وەرگێڕانیان بۆ زمانی تورکی دەستی پێکردووە.

## ڕێزلێنانیانم لەلایەن پەیمانگای زانستی کۆمپیوتەری هەڵەبجەی شەهید

لەرۆژی چوارشەممە ٢٠١٥/٨/١٢ لەهۆڵی مۆنۆمێنتی هەڵەبجە و لەدەستپێکی ئەو کۆنفراسە زانستیەی پەیمانگای ناوبراو پێی هەستابووئاهەنگێکی گەورەی ڕێزلێنان بوو کەتێیدا ئەم دەزگا و دامەزراوە و کەسایەتیەتیانە بەرێزلێنانەکانیان خۆشحاڵیان کردم.

لەراستیدا باری تەندروستیم هیچ باش نەبوو، توانای ئەوەم نەبوو بۆ هیچ جێگایەك سەفەر بکەم، بەڵام لەبەر خاتری شارە خۆشەویستەکەی هەڵەبجە



پەیمانگەی کۆمپیوتەری ( هەڵەبجەی شەهید ) ی ئەهلی
Halabja private Institute of Computer science

پەیمانگەکەمان هەڵدەستێ بە سازدانی مەراسیمی ڕێزلێنان
لە زانای پایەبەرزی کورد ( پرۆفیسۆر د. مستەفا زەڵمی )
لە یەکەمین کۆنفرانسی زانستی دا
لەهاتنتان ڕێز دەگرین



ڕۆژی چوارشەممە:٢٠١٥/٨/١٢
شوێن: هۆڵی مۆنۆمێنتی هەڵەبجە
کاتژمێر (١٠)ی سەرلەبەیانی

کەماوەیەکی کەمە بۆتە پارێزگا و منیش ڕۆڵەیەکی ئەو دەڤەرەم داواکەیانم پێ ڕەت نەکرایەوە، دواجار وتم: ئەگەر بزانم لەم سەفەرەدا گیان لەدەست دەدەم دێم و لەگەڵتان بەشدار دەبم، لەڕاستیشدا گەرم و گوڕی و پەرۆشی پارێزگار و کاربەدەستان و مامۆستا و هاوشاریەکان کەلەو ئاهەنگەدا بینیم تەواو خۆشحاڵی کردم.

لەم ئاهەنگەدا جگە لەپەیمانگای زانستی کۆمپیوتەری هەڵەبجەی شەهید کەهەستابوون بەسازدانی ئاهەنگەکە و ڕێزلێنانم و میدالیایەکی ئاڵتونیان پێدام، ئەم ڕێزلێنانەی تریشم پێشکەش کرا، زۆر سوپاسی هەموو لایەکیان دەکەم:

١- پارێزگاری هەڵەبجە، بەڕێز کاك عبدالله نەورۆڵی.

٢- قایمقامی ناوەندی پارێزگا، مامۆستا ئەرکان حەسەن.

٣- سەرۆکی شارەوانی هەڵەبجەی شەهید، کاك خدر کریم.

٤- بەڕێوەبەری پەیمانگای هەڵەبجە بۆ زانستەکانی کۆمپیۆتەر، مامۆستا هۆشمەند.

٥- دکتور عبدالرحمن محمد عارف، کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان.

٦- کۆمەڵەی قوربانییانی چەکی کیمیاوی هەڵەبجە، خاتوو مەریەم کەکچێکی هەڵەبجەیە و لەساڵی ١٩٨٨ لەکاتی کیمیاییبارانی هەڵەبجەدا بەساوایی لەخانەوادەکەی دابڕاوە و ئێستا هێنراوەتەوە و لەچاوەڕوانی ئەوەدایە لەڕێگەی پشکنینی پزیشکی دی ئێن ئەیەوە بزانێت کەس و کارەکەی کێیە.

٧- دەستەی خانمانی هەڵەبجە و ئەنجومەنی ئافرەتانی هەڵەبجە. خاتوو ماردین.

٨- مەڵبەندی پێنجی یەکگرتووی ئیسلامی، مامۆستا شێخ حەسەن عەبابەیلێی بەرپرسی مەڵبەند.

٩- بەڕێوەبەریی ڕۆشنبیری و هونەری هەڵەبجە،

١٠- لقی دوانزەی هەڵەبجەی پارتی دیموکراتی کوردستان،

١١- کوێستان خان جێگری سەرۆکی شارەوانی هەڵەبجە.

١٢- کاک سەرخێڵ بەڕێوەبەری مۆنۆمێنتی هەڵەبجە.

١٣- مدیر ناحیەی خورمان، کاک سمکۆ سالار.

١٤- کتێبخانەی هەژار موکریانی، کاک عەتا.

١٥- بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیریی سلێمانی، کاک بابەکر دڕەیی.

١٦- بەڕێوەبەرایەتی شەهیدان و ئەنفالکراوانی هەڵەبجە، کاک سەعدون نامدار.

لەلایەن بەڕێز مامۆستا مەلا تاهر بامۆکی لەجیاتی مامۆستایانی دەڤەرەکە وتارێکی جوان و پڕ مانای پێشکەش کرد.

**لەم ئاهەنگەدا وتەیەکی کورتم پێشکەش کرد کەلێرەدا بەشێکی دەخەمە روو:**

مامۆستا بەڕێزەکان
زۆر زۆر سوپاستان دەکەم

ئەم رێزلێنانە بۆ شەخسی من نییە، بەڵکو بۆ هەموو کەسێکە کە تەمەنی خۆی بەخت بکا لەڕێی ئایین ئیسلاما و لە خزمەتی وڵاتەکەیدا.

ئێستا من لەو حاڵەتە شعور بە دوو سەعادەت و خۆشبەختی ئەکەم، یەکەم لەپێش مردنما هاتمەوە هەڵەبجە، نەك ئەو هەڵەبجەی جاران، بەڵکو هەڵەبجەیەك کە یەکێکە لە پارێزگاکانی کوردستان، زۆر تەبریکی محافزی هەڵەبجە و ئەهلی هەڵەبجە دەکەم.

من قەناعەتم ئەوەیە رۆژێ لەرۆژان ئەم محافەزە خۆشەویستە پێش ئەکەوێ لەسەر هەموو محافەزەکانی عێراقدا، لەبەر ئەوەی کە یابان لەپاش مەئساتی ئەو دوو قومبلە نەوەویە کە ئەمریکا دای بەسەر هیرۆشیما و ناکازاکی، ئەو موسیبەتە گەورەی یابان یابانی پێشخست، ئیمڕۆ لە ئینتاجا یابان غەزوی هەموو دوەلی عالەمی کردووە، هیوادارین لەکاتێکی زۆر نزیکدا محافەزەی هەڵەبجە

غەزوی هەمووی ئەسواقی داخلی و خارجی عێراق بکا بە مەنتوجاتەکەی و بە فەزڵی محافزەکە و پیاوە موخلیسەکانی.

دووەمیان لەپێش مردنما بە خزمەتی چەند مامۆستایەك گەیشتمەوە، مشەرەف بووم پێیان.

حەقیقە داوا ئەکەم لەو مامۆستایانە کە هەموو تەمەنی خۆیان بە شەوو رۆژ لەرێگەی عیلمدا بەسەر ببەن، من ئێستا ٩٣ ساڵ عومرمە، زیاتر لە حەفتا کتێبم داناوە، زۆریان شتی تازەیان تیایە، ئەو شتە تازانە هی خۆم نین، هەمووم لە قورئان دەرهێناوە، وەکو ئیسپاتم کردووە بە قورئان تەڵاقی سێ بەسێ یەك تەڵاقی پێ دەکەوێ، کچ خەتەنە ناکرێ، جگەرە خواردن حەرامە، زۆرشتم بە قورئان ئیسپات کردووە، تکام لەو مامۆستایانەیە ئەو کتێبانە بخوێننەوە، نەك لەسەر ئەساسی ئەوەی کە کتێبی مستەفا زەڵمییە، بەڵکو لەسەر ئەساسی ئەوە کە ئەوانە هەموو فەرموودەکانی خوا و پێغەمبەرن.

لەو ماوەی عومرمە ٣٥ ساڵی لە جامیعەکانی عێراق مقارنەم کردووە لەبەینی شەریعەتی ئیسلاما و لەمابەینی قانونەکانی دوەلی عالەما، قەناعەتم پەیاکرد بەبێ تەعەسوب بە قەناعەتێکی علمی یەقینی کە بەدیل بۆ شەریعەتی ئیسلام نییە، بەدیل بۆ قورئانی کەریم نییە، جا لەبەر ئەوە داوا ئەکەم لە مامۆستاکان تەمەنی خۆیان بەزایەع نەدەن.

دوو وەسیەتی گەورەی گەورەکانی ئیسلام ئەگەیەنم بەو مامۆستایانی ئایینیە، یەکەمیان فەرموودەی حەزرەتی عەلی خوا لێی رازی بێت، ئەفەرموێ: (انظر الى ما قيل ولا تنظر الى من قال) هەرچیەکت خوێندەوە، هەرچیەکت بیست، تەماشای قسەکە بکە، تەماشای ساحێبی قسەکە مەکە، غەیری خوا و پێغەمبەر نەبێ، چونکە ئەگەر تەماشای ساحێبەکەیان بکەی غەڵەت بێ یان سەحیح بێ، تەسلیم ئەبی، بەڵام ئەگەر تەماشای قسەکەت کرد، شیی ئەکەیتەوە لە ناحیەی مەنتیقەوەو عەقڵەوەو فەلسەفەوە، ئەگەر زانیت شتێکی راستە دوای ئەکەوی، ئەگەر زانیت شتێکی غەڵەتە پاڵی پێوە ئەنێیت.

وەسیەتی دووەم وەسیەتی فەیلەسوفی ئیسلامی گەورە، ئیمامی غەزالی یە، ئەفەرموێ: هەموو شتێك غەیری قورئان و سوننەتی پێغەمبەر، بەشك وەربگرە، دایبنێ ئەم شتە راست نیە، جا هەرکەسێك هەیە، ئەفەرموێ: (من لم یشك لم ینظر) هەرکەس نەکەوێتە شکەوە لە شتێکدا کە ئەیخوێنێتەوە، نەزەر ناکا، مەبەستی تەفکیری دەماغە، (ومن لم ینظر لم یبصر) ئەوەش کە نەزەر نەکا بەصیرەت بەکار ناهێنێ، بەصیرەتی دەماغ، (ومن لم یبصر بقي في العمی والضلال) ئەو کەسەش کە بەسیرەت بەکارنەهێنێ لەنەزانیدا ئەژی.

من لەپاش ئەو هەموو عومرە، ئەو هەموو تەدریسە، پاش ئەو هەموو تەئلیفە، کە مەصدەری حوکمی شەریعەتی ئیسلام سێ شتە، مەصدەری مونشیيء، ئەو مەصدەرەی کە حوکمەکەی دروست کردووە، ئەوە تەنها قورئانە، خوا خۆی ئەفەرموێ (ان الحکم الا لله)، کەواتە حوکمی بەشەری تەنها خوا دایئەنێ، سوڵتەی بە هیچ بەشەرێ نەداوە کە بێت حوکمی شەرعی دابنێ، موجد و مونشئی حوکمی شەرعی تەنها قورئانە، تەنها خوایە.

وەزیفەی پێغەمبەر چیە؟ خوا دوو وەزیفەی داوەتێ، یەکەمیان وەزیفەی بەیان، بەیانی قورئان:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ النحل : ٤٤.

دووەم وەزیفەی تەبلیغە، (وما علی الرسول الا البلاغ).

کەوابوو لەگەڵ ئەو هەموو عەزەمەت و گەورەییە، سوڵتەی ئەوەی نەدراوەتێ حوکم دروست بکا.

مەصدەری سێیەم مەصدەری کاشیفە، کە ئیجتیهاداتی فوقەها و موجتەهیدینە. وەزیفەی ئەم مەصدەرە کەشفی حوکمەکەیە، ئەگەر حوکمەکەی خوای دۆزیەوە ئەوە موصیبە، ئەگەر نەیدۆزیەوە ئەو موختیئە.

لەبەر ئەوە، مامۆستاکان، هەمووتان گوناهبارن کە قسەی یەکێك نەقڵ ئەکەن بەبێ ئەوەی کە دەلیلەکەی بزانیت، ئەمە زۆر هەڵەبەکی گەورەیە،

چونکە ئەوانە ناتوانن حوکم دروست بکەن، ئەوانە کەشفی حوکم ئەکەن، کەوابو هەر موفتییەك یا قازییەك ئەگەر هاتو رەئی لە ئارائی موجتەهیدین هێنا دەلیلی قورئانی لەگەڵ نەبوو، دەلیلی سوننەتی پێغەمبەری لەگەڵ نەبوو، ئەوە گوناهبارە فتوا بدا بەو کتێبە یان بەو مەزهەبە.

شایانی باسە لەم ئاهەنگەدا چەند وتەیەکی جوان پێشکەش کرا بەڵام لەبەر ئەوەی زۆربەی وتەکان پیاهەڵدانن پێم خۆش نەبوو لێرەدا تۆماریان بکەم، زۆر سوپاسی هەموولایەکیان دەکەم، لەخوای گەورە داواکارم موەفەقی دونیا و قیامەتیان بکات.

هەمان رۆژ بۆ خوانی نیوەڕۆ میوانی بەڕێز کاك عەبدوڵا نەورۆڵی پارێزگاری هەڵەبجە بووین، هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم، خوای گەورە سەرکەوتووی بکات بۆ خزمەتی ئەم شارە ئازیزە.

## سوپاسێکی تایبەت

## بـۆ وەزیـری ئـەوقـاف

یەکێك لەو بەڕێزانەی کەبەپێویستی دەزانم سوپاسی بکەم کاك کامل حاجی علی وەزیری ئەوقافە، لەرۆژی ٢٠١١/٤/١٧ ەوە تا ئەمڕۆ کەساڵی ٢٠١٥یە بەرەزامەندی بەڕێزیان دوو کارمەندی وەزارەتی ئەوقاف (ڕێدار رەئوف ئەحمەد و جمعە صدیق) ڕێگەیان پێدرا لەبری دەوامی رۆژانەیان لەفەرمانگەی ئەوقافی هەولێر لەلای من دەوام بکەن و کار بۆ من بکەن، ئەم کارەش لەسەر داوای ئەو دوو کارەمەندە خۆیان بوو کە بۆ وەزیری ئەوقافیان بەرز کردبووە و وەزیریش سەردانی کردم و بۆچوونی منی وەرگرت و بەو جۆرە کاریان لای من دەستی پێکرد کەتائێستاش بەردەوامە.

بەهەمان شێوە سوپاسی بەڕێوەبەری گشتی و بەڕێوەبەری ئەوقافی هەولێر دەکەم کەهاوکار بوون لەم کارەدا، پاش کۆتاییهاتنی کاری کاك کامل حاجی عەلی وەزیری نوێی ئەوقاف بەڕێز کاك کەمال مسلم ئەویش سەردانی کردم و بڕیاریدا بەمانەوەی ئەو دوو کارمەندە لەلام.

## ئەو خەڵات و ڕێزلێنانانەی پێم بەخشراوە

١- خەڵاتی مامۆستای (متميز) لە زانکۆی بەغدا- ١٩٨٥.

٢- خەڵاتی دیوانی سەرۆکایەتی کۆماری عێراق- ١٩٩٢.

٣- خەڵاتی بەرهەمی زانستی- ١٩٩٣.

٤- خەڵاتی سەرۆکایەتی کۆمار لەگەڵ (شارە الكتاب)- ١٩٩٥.

٥- خەڵات و میدالیای کۆماری- ٢٠٠٢.

٦- وەزارەتی خوێندنی باڵای عێراق- ٢٠٠٥.

٧- خەڵاتی زانکۆی (النهرين)- ٢٠٠٦.

٨- خەڵاتی زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر- ٢٠٠٨.

٩- خەڵاتی کۆلیجی پۆلیس- هەولێر- ٢٠٠٨.

١٠- خەڵاتی کۆلیجی حەدبا، موسڵ- ٢٠٠٩.

١١- خەڵاتی کۆلیجی پەروەردە بۆ زانستی مرۆڤایەتی- هەولێر- ٢٠٠٩.

١٢- خەڵاتی زانکۆی بەغدا-٢٠٠٩.

١٣- خەڵاتی (عبدالعزیز پارەزانی)- ٢٠١٠.

١٤- خەڵاتی زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر- ٢٠١٠.

١٥- خەڵاتێك بەبۆنەی ڕۆژی جیهانیی بەساڵاچووان- ٢٠١١.

١٦- خەڵاتی گۆڤاری (چەکوشی یاسا)- ٢٠١٢.

١٧- خەڵاتی کۆنگرەی (بەرگری لە قورئان) سلێمانی- ٢٠١٢.

١٨- خەڵاتی زانکۆی تکریت- ٢٠١٢.

١٩- خەڵاتی (پەیوەندی جیهانی دەرچوانی ئەزهەر) قاهیرە- ٢٠١٣.

٢٠- خەڵاتی شێخی ئەزهەر- قاهیرە ٢٠١٣.

٢١- خەڵاتی (هەڵمەتی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژی مێیینە)- ٢٠١٣.

٢٢- خەڵاتی زانکۆی گەشەپێدانی مرۆیی-سلێمانی- قەرەداغ- ٢٠١٣.

٢٣- خەڵاتی ڕێزلێنانی فەرماندەی فەرماندەیی (سلێمانی) هێزی پێشمەرگەی کوردستان ٢٠١٥.

٢٤- بروانامەی دکتۆرای فەخری لەلایەن زانکۆی صلاحەدینەوە لەهەولێر ٢٠١٥.

٢٥- خەڵاتی پەیمانگای زانستی کۆمپیوتەری هەڵەبجەی شەهید ٢٠١٥.

ئەمە جگە لە چەند میدالییای سوپا بەبۆنەی بەشداربوون لە شۆڕشی ١٤ی تەمووز و ٦ی کانون و ١٤ی ڕەمەزانی ١٩٦٣.

## دانراوەكانم

١- أحكام الزواج والطلاق في الفقه الإسلامي دراسة مقارنة في القانون.

٢- أحكام الميراث والوصية وحق الإنتقال.

٣- أخطاء أصولية لأبن السبكي في كتابه جمع الجوامع.

٤- أسباب إباحة الأعمال الجرمية.

٥- أسباب اختلاف الفقهاء في الأحكام الشرعية.

٦- أسرار ثورة ١٤ تموز لسنة ١٩٥٨.

٧- أصول الفقه في نسيجه الجديد. ج١-٢

٨- الإلتزامات في الشريعة الإسلامية والقوانين المدنية العربية.

٩- الإلتزامات في ضوء المنطق والفلسفة.

١٠- أهمية الطاقات الروحية في الجيش.

١١- ايضاح الفوائد في شرح القواعد.

١٢- التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن.

١٣- تەرازوى ميرات (ميزان تقسيم الميراث)

١٤- تجفيف مستنقع العبيد والجواري في القرآن الكريم.

١٥- التدخين وأضراره وتحريمه في القرآن.

١٦- التعليقات على تعديل قانون الأحوال الشخصية

١٧- تفنيد مزاعم تأثر الفقه الإسلامي بالفقه الغربي.

١٨- حق الحرية في القرآن الكريم.

١٩- حقوق الإنسان وضماناته في الإسلام.

٢٠- حكم أحكام القرآن.

٢١- حكم التعامل مع الجين البشري في الشريعة الإسلامية.

٢٢- ختان الإناث وتحريمه في القرآن

٢٣- خطوات الطلاق في القرآن.

٢٤- دلالات النصوص وطرق الإستنباط الأحكام في ضوء الفقه الإسلامي.

٢٥- الدولة والمفاضلة بين النظامين الملكي والجمهوري

٢٦- الصلة بين المنطق والقانون.

٢٧- الطلاق المعلق في الشريعة الإسلامية.

٢٨- الطلاق المقترن بالعدد لا يقع به الا طلقة واحدة.

٢٩- الطلاق في الإسلام قبل المذاهب.

٣٠- الطلاق في الشرائع والقوانين والأعراف خلال أربعة آلاف سنة. ج١-٢

٣١- الطلاق في القرآن.

٣٢- الطلاق مرتان في تفاسير القرآن.

٣٣- فلسفة الشريعة.

٣٤- فلسفة القانون.

٣٥- فلسفة المسؤولية الجنائية في ضوء الفعل والأنفعال الفلسفيين.

٣٦- فلسفة المسؤولية القانونية في ضوء مقولات أرسطية.

٣٧- القانون الأصلح للمتهم في ضوء المتى الفلسفي

٣٨- القرآن وقاعدة الولد يتبع خير الأبوين دينا.

٣٩- القرآن وقاعدة تتغير الأحكام بتغير الأزمان.

٤٠- القلق- أسبابه، أنواعه، علاجه.

٤١- كاروانى ژيــانم. ج ١-٢ .

٤٢- لا رجم في القرآن.

٤٣- لا قتل للمرتد غير المفسد في القرآن.

٤٤- المبادي الدستورية في القرآن مقارنة بالدساتير الوضعية وإعلانات حقوق الإنسان.

٤٥- مجموعة الأبحاث العلمية، ٣ جلد.

٤٦- المدخل لدراسة الشريعة الإسلامية (تأليف مشترك).

٤٧- المدخل لدراسة الشريعة الإسلامية في نمط جديد.

٤٨- مركز الهمزة في لغة العرب

٤٩- المسؤولية الجنائية في الشريعة الإسلامية- دراسة مقارنة.

٥٠- معين القضاة في تحقيق العدل والمساوات.

٥١- المقارنة بين التخصيص والنسخ

٥٢- المنطق القانوني في التصورات.

٥٣- منهاج الإسلام في مكافحة الإجرام.

٥٤- موانع المسؤولية الجنائية في الشريعة الإسلامية والتشريعات الجزائية العربية.

٥٥- مولود نامة.

٥٦- نظرية الإلتزام برد غير المستحق.

٥٧- نظرية الضمان في الفقه الإسلامي والقوانين المدنية.

٥٨- تنازع القوانين في الاحوال الشخصية.

٥٩- التطبيقات القانونية على اساس الاين والكيف الفلسفيين.

٦٠- عناصر الالتزام في الشريعة الاسلامية والتشريعات المدنية العربية.

# پاشکۆی وێنەکان



باوکم - محمدی کوڕم - خۆم



دەرگای سەرەکی ف٣ ل١٩ - ١٩٥٦/٣/١٠



بێخاڵ - ١٩٥٧/٣/٥



م. عبدالخالق معروف - م. مجید شیروانی - خۆم / بەغدا - ١٩٦٠



دەرگای قەسری نیهایە - ١٩٦٠/١٠/٢٥



ئەفسەرانی فەوجی ٣ لیوای ٢٠ لە جەلەولا



ئەفسەرانی خەستەخانەی سوپا - ١٩٦٤/١/١٠



ئەفسەر و پزیشکی نەخۆشخانەی سوپا لە قەسری نیهایە - ١٩٦٤/١/١٠



م. محمد علی مەلا محمدی ڕەئیس - خۆم - د. محمد شریف / بەغدا - ١٩٦٥



د.محمد شریف - م. محمد علی - خۆم - م. نوری - ١٩٦٧/٣/١٠



لەگەڵ شێخ عدی لە شێخان و شێخی بەرشومی مصری - ١١/ئازار/١٩٧٠



کۆلێژی یاسا - زانکۆی بەغدا - ١٩٨٢



گفتوگۆی بڕوانامەی ماستەر - ١٩٨٧



بەغدا - ماڵی خۆمان - ١٩٧٩/١/٢٥



بلغـاریـا - ١٩٨٢



زێنەدینی برام - خۆم - د.گەلاوێژ - دایکی محمد - امینە خان - ٢٠٠٢/٦/٦



خۆم و دایکی محمد - ١٩٩٥

## نـــاوەڕۆك

# کاروانی ژیانم

لە بەهاری ساڵی ١٩٢٤ ز لە دێی زەڵم هاتومەتە ئەم دونیایەوە، تا ئێستا کە تەمەنم ٧٧ ساڵە و یاداشتەکانم دەنووسمەوە، نە لەم دونیایە گەیشتم و نە لەو کەسانەی لەگەڵیاندا ژیام، بیروباوەڕم بەخوای گەورە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و ئاینی ئیسلام زۆر پتەو و بەهێزە، چونکە ئەم بیروباوەڕەم لە ڕێگەی دواکەوتنی دایك و باوکەوە نەبوو - ئیمانی تەقلیدی- بەڵکو لەماوەی ژیانمدا لە نێوان بەراوردکردنی ئایینی ئیسلام و هەموو یاسای دەوڵەتان و بیروباوەڕی جیاوازو ئاینەکانی تر زیاتر لە چل ساڵ و، تێکەڵاویم لەگەڵ خەڵکی جیاوازی جۆر بەجۆر، ئەم بیروباوەڕەم بۆ دروست بوو، شتێکم نەدی ئیسلام بڵێت مەیکە ژیری بڵێت بیکە، هەروەها بە پێچەوانەی ئەوەوە شتێکم نەدی ئیسلام بڵێت بیکە ژیری بڵێت مەیکە، گەورەترین شت بۆ ژیانی ئادەمیزاد لە ئیسلامدا ئەوەیە پەیوەندیت دەبەستیت بەهێزێکی نادیارەوە کە پێی دەوترێت - خوا- تەنها ئەو نادیارە دەتوانێت ڕۆحی نادیارمان خۆشحاڵ بکاتو، هەر تەنها ئەوە دەتوانێت ڕۆحی نادیارمان لە ژەنگ و پیسی جیهانی مادده ڕزگار بکات. تەنها ئەشقی خوای نادیارە خۆشییەکانی بێ سنوورە وەك زەریاکان.

موستەفا ئیبراهیم زەڵمی





**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice




18000 دینار